

رۆمانی چیرۆکی دوورگە ٣

یاشار کەمال

# کەڵەشێرەکانی بەرەبەیان

وەرگێڕانی:

ڕێز مستەفا

# کەڵەشێرەکانی بەرەبەیان

## رۆمانی چیرۆکی دوورگە (٣)

**یەشار کەمال**

**وەرگێڕانی**

**ڕێباز مستەفا**

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

● **کەڵەشێرەکانی بەرەبەیان** (ڕۆمانی چیرۆکی دوورگە) (٣)

● **نووسینی:** یەشار کەمال

● **وەرگێڕی فارسی:** عەلی رەزا سەیفەدینی

● **وەرگێڕانی بۆ کوردی:** ڕێباز مستەفا

● **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی

● **بەرگ:** هۆگر سدیق

● **نرخ:** ٥٠٠٠ دینار

● **چاپی یەکەم** ٢٠١٣

● **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە

● **چاپخانە:** چاپخانەی موکریانی (هەولێر)

● لە بەڕێوبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٨٣٤) ساڵی (٢٠١٣)ی پێی دراوە.

**زنجیرەی کتێب (٧٥١)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# بەشی یەکەم

زۆرماندوو بوو. چەندین ڕۆژبوو بە سەوڵلێدان سەری لەدوورگەکانی ئەو ناوە دابووو ئەوەندە ماندوو بووبوو کە ئیدی تواناى جووڵاندنی دەستەکانی تێدا نەمابوو. دەیزانی پیاوەکە لەکام دوورگەیە، بەڵام بەلەمەکەی بەرەو دوورگەیەکی دی لێدەخوڕی. بەدوورگەی کارینجای دەزانی و دەیزانی پیاوەکە لەهەمان ئەو دوورگەیە، لەدوورگەکە نزیك دەبووەوەو لێیڕادەما کە لەدوورەوەڕا لەنێو تەمدا بەدی دەکرا. تا دەریا سپی هەڵدەگەڕاو تەمە تەنکەکە نەدەما، ئاوا لەوێ دەوەستاو پاشان بەلەمەکە بۆ کوێی بردبوا دەچووە ئەوێ. خواردنەکانی لەکەمیان دابوو. نەیدەتوانی بچێتە دوورگەکانی دیکە، ئەگەر ئەو پیاوەی بکوشتبوا، بەئاسانی دەیاندۆزیەوە. تائێستاش لەو دەریایەدا ڕووبەڕووی کەس نەبووبووەوە، نەبەلەمێکی ماتۆڕداری ماسیگران، نەکەلەکێك نەکەشتیەك. دەریا چۆڵ چۆڵ بوو. لافاوێکیش نەڕاسابوو تا بیگەیەنێتە کەنارێك. دەریا ئارام و هێمن بوو. نزیك نیوەڕۆ خۆی لەکەنارێکی زۆر فراوان بینیەوە. کەمێك لەولاتر، هەڵدێرگەیەکی پڕ لەدەوەنی گەز بەدیدەکرا. بەلەمەکەی ڕاکێشایە سەر لمی کەنار دەریا، کەمێك لەولاتری دەوەنە گەزەکان ڕووبارێك هەبووو دەڕژایە نێو دەریاوە. خواردنەکەی هەڵگرت و چووە دەم ئاوەکە، چۆکی دایەوەو تێر ئاوی خواردەوە، ئینجا پشتی بەپاردەی هەڵدێرگەکە داو لەژێر سێبەری دەوەنە گەزێکی پشت هەڵدێرگەکە دانیشت، پیازێکی بەمست پلیقاندەوەو بەنانی وشك و پەنیر خواردی، پاشان گۆزەکانی پڕکردن لەئاوو بردنیە نێو بەلەمەکە دانان. پاشان دیسان هاتەوە چۆکی داداو ئاوی خواردەوە. سێبەری دەوەنەگەزەکان بەسەر چەوو لمی کەنارەکە ڕاکشا بوون. نیمدەرە درێژووکانەکەی لەخوار هەڵدێرگەکە ڕاخست، کاتێك

خەریکبوو سەری دەخستە سەرخورجینەکە. لە کونێکی پاردەی هەڵدێرگەکە مەلە بارانییێکی شینباو هاتەدەرو لم و هەڵدێرگەکەو دەوەنەگەزەکانی شین هەڵگەڕاندو بەرەو لای دەریا دایە شەقەی باڵ. خۆر بەرەو ئاوابوون غلۆر بووبووەوە. سلێمان شەلاڵی ئارەقە بووبوو. لەخەو هەستا، سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد، خورجینەکەی هەڵگرت و بەکۆڵێی دادا. دەمانچەو فیشەکەکانی لەنێو خورجینەکە بوون. دەمانچەکەی لەنێو خورجین دەرهێناو چاوێکی پێدا خشاند، دەمانچەکە نوێ نوێ بووو دەبریسکایەوە. لەبەر خۆیەوە گوتی چەند جوان

دەبریسکایەوە. سلێمان بریاری دابوو تازووە کابرا گەنجەکە بکوژێت، ئەو پیاوە گەنجەی کە دەستی بەخوێنی کەس ئالوودە نەبووبوو. کەسێکی بێتاوان کە لەنێو تاریکی شەودا بەشداریی تالان و برۆی نەکردبوو، بەسەرپشتی ئەسپەکەیەوە لەدوور دوورەوە راوەستابوو، تەنانەت گوللەیەکی نەتەقاندبوو، خوێنی کەسی نەڕشتبوو، پاشان ئەسپەکەی بەرەو تاوڵی ماڵی ئەمیر تاودابوو و خۆی لەنێو شەڕو هەنگامە قوتار کردبوو. ئەو گەنجێکی چەرکەسی دوورخرایەوە بوو، کەسێکی دۆستانە. ئێمەی چەرکەسە دوورخراوەکان بووینە بکوژ. ئێمەیان هەروەك چۆن دەکوشتین دووریانخستینەوە، ئێستاش بڕیارە کوڕیژگەیەکی چەرکەس بەدەستی تۆ بکوژرێت. تۆ لەنێو شەپۆلی روشناییەکانی ئەم خۆرە شکۆدارە، بەگەشاوەییەوە بوەستە. دەریاکان لەتۆ جوانتر دەدرەوشێنەوە، بەتایبەت لەبەرەبەیاندا. دەمانچەکەی بەرز کردەوەو ختیە نێو خورجینەکە. مەگەر کلکی ئەو تەورەی درەخت دەبڕێتەوە لەخودی درەختەکە نیە؟

ئەمیر سەڵاحەدین بۆچی تا ئەو رادەیە پشتیوانی لەو کەسە کردبوو کە پەنای بردبووە بەر تاوڵەکەی. بۆچی هەموو خەڵکی گوندەکەیانی بردبووە عارەبستان. ئەوانی لەکوێ ئاکنجی کردبوون، کەس نەیدەزانی بەڵکو رەوانەی قەفقازو داغستانیشی کردبوون. مەگەر خانمی ئەمیر سەڵاحەدین خۆیشی چەرکەس نەبوو، ژنانی چەرکەس جوانترین ژنی سەر رووی زەوین. بۆچی پیاوەکانی ئەمیر بەشێخیان گوتبوو سەرکردەی ئەوانەی پەلاماری ئەوانی دابوو و پیاوەکانیانی کوشتبوو کەسێکی چەرکەسە. تازە، ئەوانەی ئەمەشیان گوتبوو هەر چەرکەس بوون. هەواڵی هاتنیشیان بۆ ئەم دوورگەیە بەکوڕەکانی خانی چەچەن دابوو. دەبێ بزانین ئایا ئەم قسانە راستن؟

شێخ بۆچی ئەوی رەوانەی ئێرە دەکرد، لەکاتێکدا کە دەیزانی خودی عەباس چەرکەسە. ئایا دەیویست بزانێت تاچ ئەندازەیەك وابەستەی ئەوە؟

ئەو چۆن دەیتوانی دوای ئەو هەموو ساڵە کەسێك بناسێتەوە کە تەنها تارماییەکەی لەنیوە شەوێکی لێواری رووباری فورات لەژێر رێژنەی گوللاندا بینیبوو. باشە ئەگەر شێخ ئەو راستیە بزانێت بۆچی ئەوی بۆ کوشتنی ناردووە، لەبەر ئەوەیە ئەو کوڕانەی رەوانەی کردبوون هیچیان نەکرد تەنها رەوشەکەیان ئاڵۆز کرد؟ ئایا لەبەر ئەوەیە تۆ بەو هەموو تاقیکردنەوانەدا تێپەڕیویت؟ لەچاناك قەڵا شەڕت کردو لەچەندین نەبەردی خوێناویدا گیانی خۆت قوتار کرد؟ یان بەهۆی ئەو شوێنانەو خەڵکی ئەو ناوچانە وەك لەپی دەستی خۆت شارەزایت و

دەیانناسیت؟ یان لەبەر ئەوەیە کە چەرکەس زۆر خوازیاری کوشتنی چەرکەسێکی دیکەیە؟ ئێستا دەبینێت، داخۆ چەرکەسێك خوازیاری کوشتنی چەرکەسێکی دیکەیە یان ویستویە ئەو هەڵبگرێت و بیباتە لای ئەمیر سەلاحەدین کە بەمزووانە دەبێتە پاشا.

چووە نێو گوندەکە، سەیریکرد خانووەکان لەخانووی گوند ناچن دوو نهۆمی بوون. دارودرەختی باخچەی خانووەکان درەختی میوەی جیاجیا بوون. دار زەیتوونەکان لەنێو تەمێکی شینباودا بەدی دەکران. لەکاتێکدا سەیری خانووەکان و باخچەکانی دەکرد بەرەو لای چناری ناو گوند رۆیشت، لەچایخانەی ژێر دارچنارەکە، دێهاتیەکان، ژن و پیاو دانیشتبوون، شوێنیان بۆ نیشانکرد، گوتیان: "فەرموو دانیشە، بەخێرهاتی."

سلێمان گوتی:

"سوپاستان دەکەم."

بانگی چایان بۆکرد. پرسیان: "لەکوێوە دێیت، دەچیتە کوێ؟ "وەڵامی دانەوە:" دەچمە نێو دەریا. لەچاناك قەڵا سەرباز بووم."

گوتیان: "دووربیت لەبەڵا، ئازاریشت بینیوە؟ "

گوتی: "بەڵێ، لەهەردوو رانم برینداربووم. ئیستاش گوللەیان تێدایە. دکتۆرەکان گوتیان واباشترە هەر لە شوێنی خۆیان بن. منیش پێمگوتن با هەر لەوێ بن. چاناك قەڵا ئەوەی وەك دیاری پێبەخشیوم."

چایەکەی خواردەوە، هەستا چووە دووکانەکەی ئەوبەر. لەدووکانەکە نانی تیری دەفرۆشرا کە ژنانی کۆچەری لەتەنوورە بچوکەکانیان دروستیان دەکرد. نان تازە لەتەنوور دەرهێندرابوو. نانو پەنیرو زەیتوون و حەلوای کڕی، ئەوەندەی کڕی کە لایەکی خورجینەکەی پڕبوو، گوتی" خواحافیز برادەرینە، من دەچمە نێو دەریا." کەوتەڕێ.

لەدوایەوە گوتیان بەخێرچی!"

بەسەر چەوەکەدا تێپەڕی و خۆی گەیاندە بەلەمەکەی، خورجینەکەی دانایە لای سەرەوەی بەلەم، بەلەمی راکێش راکێش بۆناو ئاوەکە بردو خۆی هەڵدایە ناویو دانیشت و دەستی بەسەوڵلێدان کرد.

دێ، دێی یۆنانیەکان بوو کە دوای رۆیشتنیان درابووە ئاوارەکانی ئەنەدۆڵ.

ئەوان دوورخراوە نەبوون. خانوویان دابوونێ. دوورخراوەکان چەرکەسیەکان بوون. ئەوان نەخانوویان دابوونێ و نەکێڵگەو دووریانخستبوونەوە بۆ نێو چیاکانی ئەنەدۆڵ و بیابانەکانی عارەبستانو پێیانگوتبوون بڕۆن بۆ خۆتان چارەیەك بدۆزنەوە. ئەوانیش رۆیشتبوونو بووبوونە پاسەوانی میرو پیاوە شەڕکەرەکانی عارەبان. ئەوانەیش کە کارێکیان دەست نەکەوتبوو لەبرسان مردبوون.

سلێمان نەخێرا نەئارام، سەوڵی لێدەدان. خۆری سوور لەدەمەدەمی رۆژئاوابووندا ئارام ئارام شۆڕ دەبووەوەو تا زیاتر لەدەریا نزیك دەبووەوە، سوورترو گەورەتر دەبوو.

سلێمان سەوڵەکانی زۆر بەخێرایی بەرزو نزم دەکردنەوە و ئاوا دەریای تەی دەکرد، بێئەوەی سەرنج بداتە ئەو لایەو ئەو رێڕەوەی پێیدا دەڕۆیشت. بەهەرحاڵ ئەو دەچوو تا کوڕە چەرکەسێك بکوژێت. ئەمە کارێکی بەردەوامی بوو؟ سلێمان شەرمی لە خۆی دەکردەوە. مرۆڤکوژی قێزەونترینی هەموو رفتارەکانە. ئەرکی ئەویش کوشتنی مرۆڤەکان بوو. عارەبەکانیش بەردەوام یەکدیان دەکوشت.

سلێمان کە لەسەوڵلێدان و بیرکردنەوە لەیەککاتدا ماندوو بووبوو سەوڵەکانی لەنێو ئاوەکەدا بەردانەوە.

لەنێوەڕاستی دەریای مەنددا بێئەوەی ئاگای لەخۆی بێت مابووەوە. سەیری چەپو راستی خۆی دەکرد، سەیری خۆر، ئاوێتەبوونی رەنگە نارنجی، سەوز، وەنەوشەیی، زەردو شینەکانی دەوروبەری خۆری دەم ئاوابوون و هەڵبەزو دابەزی رەنگەکان و دەریای کە هێشتا لەملاو ئەولا هەندێك جێگای دەدرەوشانەوە دەکردو رووەو تاریکی دەچوو. رووناکی ئەستێرەکان لەدەریای رووڵەتاریکبوونی دەدا. لەو حاڵەتەی کە خەریکبوو دەهاتەدەر، هەستایەوە و چووە لایەکی دیکە دانیشت و پشتی بەتەختەکانی بەشی لای سەرەوەی بەلەمەکەدا. سەری هەڵبڕی و سەیری ئەستێرەکانی کرد. ئاسمان پڕ لەئەستێرە بوو. ئەستێرەگەلێك کە تۆزقاڵێك نەدەجووڵانو هیچ نەیزەکێك رانەدەخشی. لەکاتێکدا لەئاسمانی سەرفورات هەر نەیزەك دوای نەیزەك بەرەو زەوی رادەخشین، تێکهەڵدەنگوتن، بڵاو دەبوونو هەریەك وەك گوڵێکی گەورەی رۆشنایی دەینواند.

سلێمان نەیدەتوانی چاو لەسەر ئاسمان و ئەستێران هەڵبگرێت. تا ئێستا ئاوا ئەو هەموو تۆپەڵە ئەستێرەیەی پێکەوە نەبینیبوون. تەنانەت لەئاسمانی فوراتیش. لەبیابان، ئەستیرەکان گەورەتر، درەوشاوەترو پڕجووڵە جووڵتربوون. هەمووشتێکی فەرامۆش کردبوو و تەنێ بیری

لەئەستێرە ئارامگرتووەکان دەکردەوە. تازیاتر سەیری دەکردن زیاتر سەرسام دەبوو، لەکاتێکدا لەشوێنەکانی دیکە بەردەوام نەیزەك بەدوای نەیزەك بەرەو زەوی رادەکشان وتێکدەئالآن. وەك ئەوە وابوو ئەستێرەکان بەئاسمانی ئەم دەریایە شەتەك درابن. دەیویست تا ئەو دەمەی کە نەیزەکێك لەئاسمانەوە سەرەوژێر ببێتەوە هەر لەوێ بمێنێتەوە و لەئاسمان رابمێنێت. بەهێمنی و بەوپەڕی حەوسەڵەوە چاوی بڕیبوونە ئاسمان و رۆچووبووە چاوەڕوانی داکشانی نەیزەکێك. تا نیوەشەو ئاوا لەوێدا چاوەڕوانی کرد. ئاسمان کش‌ومات بوو. خەریکبوو لەبیرەخەو رابچێت کە لەپڕ نەیزەکێکی بچوك راخشی، سلێمان خۆشحاڵ بوو. دوای ئەوە دانەیەکی دیکەش لەلای رۆژهەلاتی دەریا داکشا، رێڕەوێکی کەوانەیی تەیکردو کەوتە لای رۆژئاوای دەریاوە. سلێمان گوتی وای، تائێستا نەیزەکێکی ئاوا کەوانەسازم نەبینیوە.

سەری سوڕمابوو، یەکسەر سەوڵەکانی خستەوەکار. سەوڵ هەرجارێك بەئاوەکە دەکەوتن ئاوی دەریا بریسکەی لێهەڵدەستا. زۆر دەریای بینیبونن بەڵام ئاوی هیچ کام لەوانە رۆشنایی و درەوشاوەییەکی ئاوایان نەبوو. هەستی ماندوێتی وردە وردە لانەما.

ئێستا نەیزەکی بچوك و گەورە بەدوای یەکدا، لێرەو لەوێی ئاسمان بەرەو زەوی رادەخشین. سلێمان لەوەی دەیبینی ترس دایگرت، خێرا خێرا سەوڵی لێدان. نەیدەتوانی چاو لەسەر ئەستێرەکان بتروکێنێت، لەوە دەترسا هەرئێستا نا ئێستا نەیزەکەکان تێکهەڵبنگون.

نەرمە بایەکی فێنك هات، رەنگی دەریا سپی هەڵگەڕا، سلێمان سەوڵەکانی هەر ئاوا بەردانەوە نێو ئاوو کەوتە تەماشاکردنی دەوروبەر. لەولاتر، لەپشت تەمی سپیدا، دوورگەیەك دەردەکەوت و ون دەبوو، سلێمان لەدڵی خۆیدا گوتی نەکا ئەمە هەمان دوورگەبێت. دوورگە بەردەوام دەردەکەوت و ون دەبوو. سلێمان کەوتە سەری بگەڕێتەوە. دەزانم عەباس لەم دوورگەیەیە، ئەگەر یەکدی ببینین یان ئەو من دەکوژێت یان من ئەو دەکوژم. خافڵگیری ناکەم. من ئەگەر لەچاناك قەڵا لەنێو جۆگەلەی خوێن دەربازبووم و لەنێو هەزارو یەك بەڵا گیانی خۆم قوتار کردبێت، ئەویش لەو مەحشەرەی چاناك قەڵا بەسەلامەتی لێی دەرچووە.

کەسێك دەتوانێت ئەوسێبەرەی کە تەنها لەنێو تاریکی نیوەشەودا بینیویە لەڕۆژی رووناکیشدا بناسێتەوە؟ خۆزگە دەکرا بگەڕابوامەوە یەکسەر بچوبوامە لای ئەمیر سەڵاحەدین و پێمگوتبا ئێمە خۆ لەتۆ زیاتر کەسێکی دیکەمان نیە. شێخ شوێنەکەی دۆزیوەتەوەو منی رەوانەی دوورگە کردووە کە بیکوژم. من تارماییەکەیم بینیوە، بەڵام هەرگیز لەکاتی رووناکی

و رۆژی رۆشندا نەمبینیوە. تازە ئەو پەنای هێنابووە بەر تۆ من چۆن دەتوانم کەسێك بکوژم کە پەنای هێنابێتە بەر تۆ. ئەگەر نەشیکوژم و لەدوورگەکەی ئەو بگێرسێمەوە، تۆ ئامادە دەبیت من و منداڵەکانم لەدەستی ئەو دەرباز بکەیت و لای خۆت بمانپارێزیت؟ من چۆن دەتوانم کەسێك بکوژم کەپەنای هێناوەتە بەرتۆ؟ ئەمیر سەلاحەدین ویستویە لە شوێنی پادشاکانی عوسمانی بچێتە سەرتەخت و ببێتە پادشا. نازلی سولتان، خاتوونی ئەمیر، چەرکەسە، منیش چەرکەسم، عەباسیش چەرکەسە. مەگەر بەهۆی ئەو کەوتنەگیانی یەکدیەوە نەبوو کە چەرکەسەکان بەوحاڵ و رۆژگارە گەیشتن؟ من یەکسەر دەچمە لای ئەمیر سەلاحەدین پێیدەڵێم تۆ گەورەترین و رەسەنترین میری هەموو عارەبستانیت، پەنام هێناوەتە بەرتۆ، گیانی من و منداڵەکانم رزگار بکە، من چەرکەسم و لەچاناك قەلا گیانی خۆم لەمردن قوتارکرد، چدەڵێت ئەگەر پێیبڵێم شایستەی دەرگاوانی کۆشکی پادشام؟ سلێمان بەلەمەکەی بۆ دواوە وەسووڕاندو بەرەولای ئەستێرەکانی لێخوری. سەوڵەکان وابەخێرایی بەرزو نزم دەبوونەوە کە سلێمان کەوتە هەناسەبڕکێ. لەدڵی خۆیدا گوتی پیاوی گەمژە، ئاوارەی دەربەدەر، تۆ لەکوێی و ئەمیر سەلاحەدین لەکوێ؟ پێشتر شێخی گەورە بەو ریشە سپیەی خۆیەوە چووبووە ماڵی سەلاحەدین و سێ شەوو سێ رۆژ لەوێ پاڕابووەوە، بەڵام ئەمیر رێگەی پێنەدابوو. ئیستا تۆکێیت گەمژە، بگەڕێوەو برۆ بیکوژە، مەگەر جگە لەوە رێگاچارەیەکی دیکەت هەیە؟ ئەگەر ئەوپیاوە نەکوژی و بگەڕێیەوە، پێتوایە شێخ دەهێڵێت زیندوو بیت، بەهۆی نەکوشتنی کەسێك کە مایەی پشتیوانیکردنی ئەمیرە سەرت لەجەستەت جیاناکاتەوە؟ سەرت بەشمشێر دەپەڕێنێت و منداڵەکانت دەبات و فرێیان دەداتە نێو رووسەکان، بگەڕێوە.

گەڕایەوە، بەلەمەکەی لەکەنار ئەسکەلە راکێشایە سەرلمەکە. لەو تێڕوانینەی کە ئێرە دوورگەی کارینجایە خۆشحاڵ بوو. پێیانگوتبوو سێ درەختی گەورەی رووەو خۆری لێن، وابوو. ئاوی کانیەکە بەشوڕە شوڕ دێتەخوار، ئەمەش وابوو. نەیدەتوانی چاو لەسەر دەریا بترووکێنێت. ماوەیەك ئاوا سەیری کرد. پاشان لەپڕ هەستا، گوتی دەریا، دەریاش ئاوایە کە گوتیان، دەریا شەپۆلی دەدان. هەوا کەم کەم خەریك بوو رووناك دەبووەوە. ئەگەر دوو ئاش و دارهەرمێیەکی گەورەش ببینم ئیدی تەواوە، تێدەگەم کە ئێرە هەمان ئەو شوێنەیە. دووبارە چوو لەسەر یەکێك لەتەختەکان دانیشت، پاشان دیسان هەستا، بەرەو پشت خانوەکان چوو، دارهەرمێیە گەورەکە بەرامبەری بوو. کاتێك کە هەوا کەمێك زیاتر رووناکی کرد ئاشەکانیشی بینی.

پەروانەی دانەیەکیان دەخولایەوە. گەڕایەوە چوو لەرۆخ کانیەکە دانیشت. پاشان هەستاو چوو ئاوی خواردەوە، دەموچاوی شت، دووبارە هات لەسەر جێگای خۆی دانیشت، هێندە ماندوو بوو کە توانای رۆیشتنی نەمابوو. هیچ کەسیش لەدەوروبەری کانیەکە بەدی نەدەکرا. دەستی لەسەر خورجینەکەی تەنیشتیەوەبوو. ئارام ئارام دەچووە خەوەوە، بیلبیلەکانی دەکەوتنە سەریەك، پاشان لەهیکرِا چاوەکانی دەکردنەوە، دیسان جارێکی دیکە چاوەکانی دەکەوتنەوە سەریەك، دەیکردەوە، دووبارە یەکسەر دەکەوتنەوە سەریەك و خەو دەیبردەوە. ڤاسیلی هاتە سەر کانیەکە، سلێمان سەری کەوتبووە سەرسنگی و لەخەوێکی قووڵدا رۆچووبوو. بەلەمەکەشی لەولاتر لەسەر لمەکە بوو. ڤاسیلی چووە لای بەلەمەکەو بەوردی ناو بەلەمەکە گەڕا. ناو بەلەم دووگردێکی چنراو و خورجینێکی لە مافوور چنراو هەبوو و لەنێو خورجینەکەدا دەستە جلێکی نوێی شینباو هەبوو. چەند ژێر کراسێك، کلاوگۆرییەك، چەند دانە کراسێکی بێیاخە، عەگالێك، سێ سەرپێچ بەرەنگی جیاجیا. چەند تورەگەیەك، حاشیەی یەکێك لەتوورەگەکان زیودۆزی کرابوو و سێ خەنجەری چەرکەسی. بەوپەڕی کونجکۆڵیەوە زارکی توورەگەیەکی دیکەی کردەوە: سێ پارچە قوماشی بەجوانی دەقکراوی تیابوو و داندرابوونە سەریەك. ڤاسیلی پارچەکانی وەك خۆی بەوردی دەقکردنەوە، لە کاتێکدا نێو توورەگەکە دەگەڕاو زارکی توورەگەکانی گرێ دەدانەوە هۆشی هەرلای سلێمان بوو.

سلێمان کەخورجینەکەی لەژێر دەست بوو، بۆلای خۆی راکێشا. ڤاسیلی بەخێرایی زارکی توورەگەکانی داخست، لەبەلەمەکە دوورکەوتەوە و چووەوە لای کانیەکە. سلێمان هێشتا لە خەوێکی قووڵ دابوو. بەکپی بۆلای پۆیراز چوو. لێنا زۆر دەمێك بوو لەخەو هەستابوو و کتریەکەی دانابووە سەر ئاگر.

ڤاسیلی بەنەرمی لەلێنای پرسی: "هێشتا هەڵنەستاوە؟"

لێنا گوتی: "ئێستا هەڵدەستێت."

ڤاسیلی دانیشتە سەرکورسیەك.

"چیبووە، چیە ڤاسیلی؟ "

بەیۆنانی دەدوان.

"پیاوێك لەسەرکانیەکە نوستووە."

"کێیە؟"

"پێموایە لەوانە."

"مەبەستت کامانەیە؟"

"ئەوانەی بۆ کوشتنی پۆیراز هاتبوون."

لێنیا گوتی: "هیچت لێنەکرد؟"

"خەوتووە، ماریش لەکەسێك نزیك نابێتەوە کە خەوتبێت. منیش خۆم تێنەگەیاند. بەلەمەکەی راکێشاوەو بردویەتیە سەرلمی قەراخەکە و تەخت لێیخەوتووە."

لەم کاتەدا پۆیراز بەخەبەرهات و پرسی: "دایکە ئەوەچیە، لەگەڵ کێ قسان دەکەیت. لەگەڵ ڤاسیلی؟"

لێنیا گوتی: "ڤاسیلی لێرەیە."

پۆیراز بێئەوەی جلەکانی بپۆشێت لەژوورەکە هاتەدەر.

"چیبووە ڤاسیلی، شتێك بووە؟"

ڤاسیلی گوتی: "شتێك نەبووە. پیاوێك هاتووە لەسەرتەختی ژێر چنارەکان خەوتووە. بەلەمەکەشی راکێشاوەتە سەرلمەکە. بەمن وابێت لەوانە."

"چۆنت زانی کەسێك کە خەوتوە لەوانە؟"

"سەیری ناو بەلەمەکەیم کرد."

"ئەمەی لەنێو بەلەمەکەی نووسیبوو؟"

"بەڵێ، دروست لەناوەڕاستی بەلەمەکەی نووسیبووی. دووگردێکی کلیمی، سێ دانە توورەگەش هەبوون کە زارکی دوو لەتوورەگەکانم کردەوە. لەنێو یەکێکیان سێ دانە خەنجەری دەسکزیویی چەرکەسی و لەنێو ئەوەی دووەمیشدا عەگالێك و سێ دانە سەرپێچی رەنگاوڕەنگ هەبوون. ئێستا تێگەیشت ئەم پیاوە بەو تاریکەشەوە لەکوێوە هاتووە؟"

پۆیراز گوتی: "تێگەیشتم لەکوێ هاتووە." بەپێکەنینەوە ئەمەی بۆ زیاد کرد: "باش باش تێگەیشتم. دەمانچەشی بەنێکەوە بوو؟"

"خۆت سەیری توورەگەی سێیەم دەکەیت. من بەدەستپاچەیی تەنها دووانم کردنەوە. سەیری دەستەکانیشم کرد. لەخەودا، ئەنگوستی شادەی بەشێوەیەك بوو وەك ئەوەی داینابێتە سەر پەلەپیتکە. ئەوانەی کە هەمیشە ئامادەی تەقەکردنن لەخەویشدا ئەنگوستیان بەو شێوەیەیە."

"ئەمەم نەدەزانی. نەمدەزانی دوای ئەو هەموو ساڵە ئەنگوستم لەپەلەپیتکە جیا نەبۆتەوە، ئەم ئەنگوستەم رەنگە ئاشکرام بکات."

"ئێستا کە چووینە سەرکانی خۆت ئەنگوستەکانی ئەو پیاوە دەبینیت و تێدەگەیت کە ئەو ئەنگوستانە جگە لەداگرتنی پەلەپیتکە کارێکی دیکەیان نەکردووە."

"بابچینە سەرەوە بەرچایی بخۆین. دایکە، بەرچایی ئامادەیە؟"

"ئامادەیە کوڕم."

بەخێرایی بەرچاییان خوارد، چوونە خوارەوە، خۆیان گەیاندە ژێر چنارەکان، کابرا سەری بۆ دواوە لار کردبووەوەو خەوتبوو. لەوێ رانەوەستان و یەکسەر چوونە لای بەلەمەکە.

"ئەو توورەگەیەی سەیرت نەکردووە کامەیانە؟"

ڤاسیلی یەکێك لەتوورەگەکانی هەڵگرت و دایە دەستی پۆیراز. پۆیراز یەکسەر چووە ئەسکەلە و لەژێر فامیشەکان زارکی توورەگەکەی کردەوە، لەنێو توورەگەکە قورئانێك، سێ نوشتەی چاووزار و نامەیەك هەبوون، پۆیراز نامەکەی خوێندەوە. ئەمە نامەی ریزلێنانە. ناویشی سلێمانە. ئەفسەری بەشە وەکو من. بەم رێزنامەیە دەردەکەوێت کەلە چاناك قەلاّ قارەمانێیتی گەورەی نواندووە و ئەم رێزنامەشیان هەر لەپای ئەوە پێداوە. جگە لەمانە هەندێك خرت و پریتی دیکەش لەنێو توورەگەکە هەبوون، تاخمێکی سەرتاشی، تیسمارێکی تیژکردنەوەی چەقۆ، فلّچەیەك و سابوونێکی بۆندار. ئەو شتانەی بەدەستیانەوە بوون خستنیانەوە نێو توورەگەکەو بەخێرایی چوونەوە لای بەلەمەکە، توورەگەکەیان دانایەوە شوێنی خۆی و بایاندایەوە لای چنارەکان.

لەم کاتەدا موسا کازم ئاغا کە ئەوانەی لەپەنجەرە رابینیبوو هاتبووە خوارو خەریك بوو دەهاتە لایان. ڤاسیلی چووە پێشی و بەئەسپایی پێیگوت:

"خەوتووە."

موسا ئاغا هێواشتر لەو، لێیپرسی:

"کێ خەوتووە؟"

ڤاسیلی گوتی: "سلێمان، ئەفسەری بەشە، یەکێکە لەقارەمانانی جەنگی چاناك قەلاّ، بەلّگەنامەی رێزلێنانی هەیە. خەوتووە."

پۆیراز هەستاو بەرەو لای ئەوان چوو. موسا ئاغا هاتو چوو لەپشت سەری کابراکە وەستا. ماوەیەك ئاوا سەیری کرد کە دەمی بەشکردبووەوەو سەری بۆ لای دواوە لاربووبووەوەو خەوتبوو، پاشان بۆ لای قامیشەلانەکە چوو، ئەوانی دیکەش کەوتنە دوای. کە لەقامیشەلانەکە رەتبوو و گەیشتە نێو دەوەنەگەزەکان، راوەستاو رووی خۆی بۆ دواوە وەرگێڕا: "ئەوپیاوە چۆن دەناسن؟"

ڤاسیلی گوتی: "ئێمە نایناسین."

پۆیراز گوتی: "ئێمە هەرگیز نایناسین."

موسا ئاغا گوتی: "ئەگەر وایە کێ ناوەکەی بە ئێوە گوتوە؟" ئینجا راوەستا. ئەوانیش هاتن لەبەرامبەری راوەستان. ڤاسیلی گوتی: "بەیانی زوو لەخەوهەستام؟ هاتمە سەرکانی، بینیم پیاوێك لەسەر تەختەکان خەوتووە، سەری بەسەر سنگی شۆڕکردۆتەوە و لەخەوێکی قووڵ دایە. بەلەمەکەیشم لەسەر لمی لێواردا بینی."

هەموو شتێکی بەوردی بۆ باسکرد.

"من گومانم لێکرد."

"کە وابوو، سلێمان ئەفسەری بەشە، لە دایکبووی کوێیە؟"

" لەرێزنامەکەیدا موسڵ نوسراوە"

"کەوایە بۆچی هاتۆتە ئێرە، لەسەر تەختەکانیش لێیخەوتووە، ئاشکرایە نەیویستوە بەدزیەوە بێت."

ڤاسیلی گوتی: "ناکرێت ئەوانە بناسیت."

گەڕانەوە، بەدەم قسەکردنەوە چوونە ژێردار هەرمێیەکەو لەوێ لەسەرچیمەنەکان بەرامبەر یەك دانیشتن و بەوردی کەوتنە راوێژو شیکردنەوەی پرسەکە.

پۆیراز گوتی: " باشتر وایە لەگەڵ خۆشی بدوێین. ئاژەڵەکان بەبۆن و مرۆڤەکانیش بەیەکدی دواندن دەتوانن تێکبگەن."

هەستان و بۆ لای دارچنارەکان رۆیشتن. کە گەیشتنە ئەوێ سەیریانکرد سلێمان هێشتا هەر خەوتوە، لێیگەڕانو هەڵیاننەستاند. سەیری یەکدیانکرد، ئەمجارە بۆ لای دۆڵی دارزەیتوونەکان رۆیشتن، ئەگەر ئاوا بڕوات لەوە نەبوو سلێمان بەخەبەر بێتەوە. خەوەکەی هێندە قووڵ بوو کە

ئەگەر تۆپت لەبن گوێی بتەقاندبا بەخەبەر نەدەهات. بۆلای کانیەکە چوون، بێئەوەی دانیشن گەڕانەوە، چوونە ژێر دارچنارەکان. سلێمان هەروا خەوتبوو.

موسا ئاغا گوتی: "چی بکەین؟"

"بابچینە ماڵی ئێمە ئاغا، دایکە لێنا چایمان بۆ لێدەنێت."

موسا ئاغا گوتی: "نابێت، ئەگەر ئەو کابرایە لەخەو هەستێت، سواری بەلەمەکەی ببێت بڕوات چیبکەین؟ "

"ناڕوات ئاغا. بەرلەوەی ئێمە ببینێت ناڕوات."

"بۆچی ناڕوات، ئەو کابرایە تەنانەت ئەگەر خەڵکی موسڵیش بێت، بەڵکو وەکو دکتۆرەکان دوای شەڕ ئێرەی پێخۆش بوو بێت و هاتبێتە ئێرە."

"لەنێو یەکێك لەو توورەگانە سێ دانە خەنجەری دەسکزیوی چەرکەسی هەیە. تەنها چەرکەسەکان ئەو خەنجەرە گرانبەهایانەیان هەن."

"یانی ئەو پیاوە چەرکەسە، ها؟ "

" بەڵێ ئاغا، چەرکەسە."

پۆیراز گوتی: "تەنها وەستا چەرکەسیەکان دەتوانن ئەو جۆرە خەنجەرانە دروست بکەن و تەنها چەرکەسەکان ئەو خەنجەرانە بەکار دێنن."

"بەچی دیارە ئەمە لەعارەبستانەوە هاتووە؟"

"ئاغا، لەنێو ئەو تورەگەیەش سێ دانە سەرپێچ و عەگالێك هەیە. خەڵکی عارەبستان سەرپێچ و عەگال بەکار دێنن."

"کەوایە بابچین چایە بۆندارەکەی لێنا بخۆینەوە."

هەر لەگەڵ ئەوەی خەریکبوون بەڕێ بکەون دەنگێك لەدوایانەوە هات، ئاوڕیان دایەوەو سەیریان کرد سلێمان لەتەختەکە کەوتۆتە خوار. سلێمان بەدەنگێکی زۆر نزم کە بەئاستەم دەبیسترا بەعارەبی هەندێك شتی گوت و پاشان بە تورکی گوتی: "من نەخۆشم، خەریکم دەمرم."

پۆیراز بەڤاسیلی گوت: "بڕۆ هەڵیستێنە، لەسەر تەختەکە درێژی بکە، من دەچم بانگی دکتۆرەکان دەکەم."

کەمێك دواتر لەگەڵ دکتۆرەکان هاتەوە. دکتۆرەکان بەوردی سلێمانیان پشکنی، پاشان بە پۆیرازیان گوت: "ئەمە شتێکی نیە، نەخۆش نیە. زۆر بەبرسێتی ماوەتەوە هەروا تینووش بووە. ئەگەر چەند رۆژێك بەباشی چاودێری بکرێت و سێ رۆژ لەنێوجێدا پشوبدات دێتەوە سەر خۆی."

سەلمان سامی دەستی سلێمانی گرت و هەڵیستاندەوە:

"لەپی دەستەکانی ببینە، ئاوساون، پۆرگیان دەرداوە، ئاوا هاتۆتە ئێرە؟"

پۆیراز ئەو بەلەمەی نیشان دا کە لەسەرلمەکە راگیرابوو:

"شەو بەمە هاتووە. ڤاسیلی بەرەبەیان هاتۆتە ئێرە بینیویە لەسەر تەختەکە خەوتووە."

پۆیراز ناوی هێناو گوتی: "چەرکەسیەو خەڵکی موسڵە. لەچاناك قەڵا جەنگاوە، رێزنامەشی وەرگرتووە."

"کەوایە هەڵیبگرە و بیبەرە ماڵی خۆتان. ئەو سلێمانە، ئەفسەری بەشە، رۆژانێکی زۆر سەولی لێداوە. برسی و تینوو ماوەتەوە. هیچ کێشەی دیکەی نیە. ئەگەر باش چاودێری بکەیت و هەموو رۆژێ ماسی بدەیتێ، چاك دەبێتەوە."

پۆیراز گوتی: "ڤاسیلی، ئەم پیاوە هەڵگرە وبیبەرە ماڵەوە، یەکەمجار جوان و خاوێن بیشۆ ئینجا جێگای بۆ راخەو بیخەوێنە، هەر رابکێشێت یەکسەر خەو دەیباتەوە.

بە لێنا بڵێ خواردنی بەتامو خۆشی بۆ دروست بکات، کە لەخەو هەستا وەکو گورگ پەلاماری خواردن دەدات. خورجین و توورەگەکانیشی ببە لای خۆی دایانبنێ تاکو ئەودەمەی لەخەو هەستا ناچار نەبێت بۆیان بگەرێت."

ڤاسیلی گوتی: "باشە."

پیاوە لەرِو لاوازەکەی خستە سەرکۆڵی و بردیەوە ماڵێ و لەسەر تەخت درێژی کرد. بەیۆنانی گوتی: "دایە لێنا، مەنجەڵێك پرِ ئاو بکەو دایبنێ سەر ئاگر، دەمەوێت ئەو پیاوە بشۆم: دەمەوێ هەموو گیانی بەسابوونی بۆندار بشۆم و ئینجا بیخەوێنم، کاتێك لەخەو هەڵدەستێت دڵنیام داوای خواردنی خۆش خۆش دەکات، دەبێت تاتێر دەبێت ماسی و ساواری دەرخوارد بدەین تاکو دێتەوە سەرخۆی، باچاك بێتەوە تاچارەی ئەو پۆیرازە بکات، ئەویش بەچی بەدەمانچە حەوتخۆرەکەی، ئینجا چدەبێت بابێت."

"بەو نیوەشەوە بۆ هاتۆتە ئەم دوورگەیە. ئەو هەموو ماوەیە سەوڵی لێداون، لەپی دەستی هەڵاوساون، ئەوەندە سەوڵی لێداون کە دەستەکانی بوونەتە پۆرگ و کێم و زووخاویان هەڵێناوە."

لێنا لەڤاسیلی نزیك بووەوە، سەری نزیکی گوێی ئەو کردو بەهێواشی بەیۆنانی گوتی: "بەرلەوەی ئەو تۆبکوژێت، تۆ هەر ئێستا بیخنکێنە. ئەو نەخۆشە، خۆت دەزانیت، تۆ کەسێکی عاقڵیت، هەمووان لەو دوورگەیە رایانکرد، تەنها تۆ نەبێت. تۆ عاقڵیت، تۆ سەیرت کرد پۆیراز کەسێکی باشە، خۆت فرێ دایە نێو ئاو و رزگارت کرد. ئێستا باش بیشۆو خاوێنی بکەرەوە تائەو بێچارەیە بەو سەرو وەزعە پیس و پۆخڵەیەوە نەچێتە دۆزەخ."

"پۆیراز دەڵێت ئەو کەسەی لەخەودایە تەنانەت ماریش پێیوەی نادات."

"کەوایە ئێستا دەچمە دەرەوە، تۆ دەست لەهەوکی بنێ، فشاربدە. تازە، خۆگیانی لەبەردا نیە... سەیری روخساری بکە، رەنگی مردوانی لێنیشتووە."

"دایکە تۆش هەردەم هەربکوژە بکوژەتە... ئەو چەرکەسە کێ ناڵێت ئامۆزای پۆیراز نیە. تۆ جارێ ئاوەکە گەرم بکە."

لێنا گوتی: "ئینشاللا ئەو ئێوە دەکوژێت." بەتووڕەییەوە لەسەر کورسییێك دانیشت. تا ئاوەکە گەرم دەبێت چاوەکانی دانانە سەریەك، کەوتە بیرکردنەوە. لەسەریەك دووپاتی دەکردەوە، ئەو پیاوە بکوژە، ئەمجارە بێ ئەملاو ئەولا پۆیراز دەکوژێت. نابێت بیهێڵین بەساغی لێرە بچێتەدەر. هەر ئێستا، هەر ئێستا دەبێت بیکوژم. لەژێر لێوەوە خەریکە بەزمانی عارەبی شتێك دەڵێت، چی دەڵێت، نەکابڵێت دەیەوێت هەموومان بکوژێت."

ئەنگوستی خستە نێو ئەو ئاوەی خەریك بوو گەرم دادەهات، ئاوەکە گەرم بوو بوو. مەنجەلەکەی بردە گەرماوەکە، جلەکانی سلێمانی هەروا کە خەواڵوو بوو داکەندن، لەسەر کورسیەك دانیشت، جوان و خاوێن بەسابوون شۆردی. پاشان بەخاولی وشکی کردەوە، جلەکانی پۆیرازی کردنە بەرو بردیە نێو ئەو جێگایەی کە لێنا ئامادەی کردبوو و بۆنی قەزوانی لێدەهات، خەواندی. سلێمان هەر سەری گەیشتە سەربالیفەکە خەوی لێکەوت.

پۆیراز هات و پرسی: "چیتانکرد؟"

ڤاسیلی گوتی: "خەوتوە."

"نان و ئاوی نەخوارد؟"

"هەر لەخەویش هەڵنەستا تا داوای ئاوو نان بکات."

سلێمان رۆژی دواتر نزیکەی نیوەڕۆ لەخەو هەستا، هەر لەگەڵ هەستانی پۆیرازیش هاتە ژوورەوە. سلێمان چاوەکانی هەڵێنا، سەیری دەوروبەری خۆی کرد، بتەوێت یان نا بزەیەك کەوتە سەرلێوانی، لەکاتێکدا لەنێو جێگا دەهاتەدەر پرسی: "تۆ عەباسیت؟" چوو پۆیرازی گرتە باوەش.

"نکۆڵی مەکە عەباس، تۆم ناسی، تۆ هەمان ئەو کەسەیت، تۆ عەباسیت."

لەپڕ تێبینی کرد کە ناوی عەباسی هێناو وەك ئەوەی گوللەیەکی پێکەوتبێت هەموو گیانی لەرزی، دەست و پێی شل بوون، گەڕایەوە نێو جێگا، سەری خۆی گرتە نێو دەستەکانی و خۆی گرمۆڵەکرد. پۆیراز چووەوە. ڤاسیلی بینی.

ڤاسیلی گوتی: "بیستم."

"چیبکەین باشە؟ لەدەمی دەرچوو گوتی عەباس."

ڤاسیلی گوتی: "هی وڕێنەی خەوە، ئێستا دەبێت چی بکەین؟ بریا بەدکتۆرەکانمان نەگوتبا بێنە ئێرە. مانگامان زا، ئێستا چۆن بتوانین بیکوژین؟"

"جارێ دەبێ سەبر بگرین. هەر چۆنێك بێت رێگایەك دەدۆزینەوە بۆ کوشتنی سلێمان. ئێستا دەبێت بەهێمنی بیر بکەینەوە، ئەگەر نەمان توانی شتێك بکەین، دەیدەینە دەستی وەلی نیشانچی. وەلی نیشانچی مسۆگەر رێگایەك بۆ دەربازبوون لەدەستی پەیدا دەکات."

ڤاسیلی گوتی: "پەیدا دەکات."

"ئەو چەرکەسە، بەڵکو بشهاتبێت شتێکم بێبلێت. ئەگەر وانیە چ مرۆڤێکی عاقڵ دێت بەسەر کەسێك دا هاوار دەکات کە دەیەوێت بیکوژێت و پێیبلێت تۆعەباسیت، ناسیتم؟ ئەو جگە لە خەنجەری چەرکەسیەکان چەکیشی پێیە؟"

ڤاسیلی گوتی: "نازانم، خورجینەکەیم نەکردەوە کە."

"یاللا بابچین سەیرێکی بکەین."

ڤاسیلی گوتی: "کەمێك بوەستە با سەیرێکی ژوورەکەی بکەین."چوو سەیری کرد گەڕایەوە و گوتی: "تەخت لێیخەوتوە، بابڕۆین."

ئەو خورجینەی کە سلێمان لەژێر دارچنارەکە لەبن دەستی بوو، هەڵیانگرت و کردیانەوە. لەلایەکی خورجینەکە جانتایەکی بچوك، جووتە پێڵاوێکی نوێ، چەند دانە کراسێکی نوێ،

ئێلەگێکی شینی چل و یەك قۆپچەیی کاردەستی حەلەب، کڵاوێکی ئەرخەوانی گوڵێنگەدار و چەندین خرت و پرتی دیکە هەبوو، بەڵام لای دیکەی خورجینەکە قوفڵ درابوو. ڤاسیلی کە لەکردنەوەی قوفڵدا شارەزاییەکی باشی هەبوو لە چاوتروکانێکدا قوفڵەکەی کردەوە، بەچەشنێك کە ئەگەر کلیلیشت پێبوایە ئاوا بەخێرایی نەتدەکردەوە.

لەنێو خورجیندا سێ نان، کەمێك زەیتوون و کەمێك حەلوا هەبوو. لەبنەخورجینەکەدا پرتەقاڵێکی سەوزی وشکبووەوەی دۆزیەوە، پاشان ڤاسیلی کیسەیەکی مەخمەڵی سەنگینی لەنێو خورجینەکە دەرهێنا، قەیتانی زارکی کیسەکەی راکێشاو دەمانچەیەکی نوێ نوێی لێهینایەدەر کە پێدەچوو دەستی لێنەدرابێت. دەمانچەکە کە کەوتە بەرتیشکی خۆر بریقایەوە، ڤاسیلی جگە لەوە کیسەیەکی کەتانی گەورەتریشی لەنێو خورجینەکە دۆزیەوە کە پڕبوو لەفیشەك.

پۆیراز گوتی: "وای، هاوڵاتی خۆمە، قارەمانی چاناك قەڵایە، دەڵێی جبەخانەی پێیە. وەك ئەوەی نەك بۆ کوشتنی کەسێك هاتبێت بەڵکو بیەوێت بچێتە شەڕی ئینگلیزەکان لەئان فارتا. با ئەو کیسانە ببەین دایانبنێینە ژێرزەمینەکەی ماڵێ و بەلەمەکەی رابکێشین بیبەینە نێو دەوەنە گەزەکان."

دە رۆژ تێپەڕین، رەوشی سلێمان کەمێك باشتربوو، هاتەوە سەرخۆی، پەیوەندییێکی لەگەڵ دکتۆرەکان و پۆیرازو نیشانچیو موسا ئاغا دروست کرد. لەوەتەی هاتبووە دوورگە تەنها یەك دوژمنی هەبوو، ئەویش لێنا بوو. رۆژێك کە لێنا بەتەنێ لەماڵەوە بوو چووە لای و پێیگوت:

"لێنا وەرە لێرە دابنیشە با هەموو رووداوەکەت بۆباس بکەم، پاشان ئەگەر ویستت بمکوژە."

لێنا گوتی: "باشە، من کەسێکی بەئەزموونم، راستیەکەیم پێبڵێ."

سلێمان گوتی: "باشە، من راستیەکەیت پێدەڵێم."

سلێمان دەستی بەقسان کرد. لێنا تا ئاخیر، بێدەنگوکش‌ومات، گوێی لەقسەکان گرت.

"رات چیە لێنا خانم؟"

"بیر لەوە دەکەمەوە کاك سلێمان. تۆ زۆر لەکوشتن دەترسیت؟"

"نازانم لێناخانم. ئەگەر من بکوژرێم، بۆ کوڕەکەت خراپ دەبێت. ئەو کەسێکی زۆر باشە، لەجێماوەکانی ساری قامیشە، بەڵام مرۆڤبوونی خۆی لە دەست نەداوە."

لێنا گوتی: "ئەو مرۆڤە. ئەو قسانەی بەمنت گوتن بە ئەویشیان دەڵێیت؟"

"هەموویانی پێدەڵێم لێنا خانم."

"بجوولێ، کات بە فیڕۆمەدە."

"ئەمڕۆ، سبەی."

سلێمان لەو ڕۆژە بەدواوە، لەبارەی بەلەم خورجین و توورەگەکان هیچی لە پۆیراز و ڤاسیلی نەپرسیبوو و پێینەگوتبوون لە کوێیان داناون. وەك ئەوەی هیچ رووی نەدابێت پێدەکەنی و گاڵتەی لەگەڵ ئەوانیدی دەکرد و ڕۆژی دەکردە شەو. وەك ئەوەی بۆ میوانداری چووبێتە ماڵی کوڕی خۆی.

دکتۆرەکان دۆستەکانی سەردەمی سەربازی خۆی بوون. ئەوان کەسانێکی بێوێنە بوون. هەموو خەڵکی دوورگە شایستەی ژیانێکی باش بوون لەو شوێنە بەهەشتیە.

سلێمان بەدەم پێکەنینەوە دەستی خستە سەرشانی پۆیراز و گوتی:

"ئێستا سەیری من بکە عەباس، ئەمە دوایین جارە پێتبڵێم عەباس. ئیدی تاماوم ئەمە ناڵێمەوە. پۆیراز دۆستی من، دۆستی من، تکایەکم لێت هەیە، سبەی زوو لەگەڵ مندا وەرە بچینە لێوی ئەو کانیە بەدرێژی قسان لەگەڵ یەکدا دەکەین، رازیت؟"

"رازیم. قسان پێکەوە دەکەین، بەڵام تۆ تەنانەت جارێکیش لەبارەی بەلەم و خورجین و توورەگەکانت پرسیارت لێنەکردین."

"جا چ کێشەیەك هەیە کە پرسیارم نەکردوە؟"

"یان گوتم، بەڵکو...سبەی زوو."

سلێمان گوتی: "سبەی زوو."

بەیانی زوو زوو یەکڕاست چوونە سەرکانیەکە، بێدەنگ گەیشتنە لێواری کانیەکە. یەکێك لەملاو یەکێکیش لەولای کانیەکە بەرامبەری یەکدی دانیشتن و چاویان بڕیە ئەو زیندەوەرانەی کە لەسەر ئاوەکە خولیان دەخوارد. یەکەمجار پۆیراز دەستی بەقسان کرد:

"هەر چاوت کردنەوەو گوتت عەباس، چۆنت زانی من عەباسم؟"

"لەوەوە زانیم لەنێو کەسانێك بووم کە بەدواتەوەن. من یەکەمین کەس بووم کە روخساری تۆ بەرلەوەی بچێتە نێو ژووری ئەمیر ببینم. قەدو قیافەت هەروەك ئەو کاتە کە بینیم. لێرەش هەر لەگەڵ ئەوەی چاوم کردنەوە، دیارە هەر بەدەم وڕێنەوە ناوتم هێناوە. بەهەرحاڵ رەوشەکە

ئەوەیە. پاشان لەیەکێك لەپیاوەکانی ئەمیرم بیست کە چەرکەس بوو ئەو گوتی تۆش چەرکەسی و وەکو ئێمە دووریانخستیتەوە. جگە لەوە ئەوەشم بیست کە خاتوونی ئەمیریش لە خزمو کەسەکانی تۆیە."

"نەمدەزانی کە خاتوون لە خزمەکانی ئێمەیە."

"ئەگەر خزمی تۆ نەبا چۆن بە گوندەکەی ئێوەی دەزانی؟"

"چۆن پێیدەزانی؟"

"ئەمیر ئەمەی زانیوە و شەوێك هەموو خەڵکی گوندەکەتانی بارکردووە و بردوونیەتە عارەبستان لە جێگایەکی نادیار نیشتەجێی کردوون. ئەگەر ئەمیر ئەوەی نەکردبا، شێخ کە بەدواتەوە بوو دەچوو هەموو خەڵکی گوندەکەتانی دەکوشت و هەموو جێگایەکی دەسووتاند."

"خاتوون هەندێك دیاری وای داومەتێ کە هیچکەس نایداتە کەس، من لەکو بزانم ئەو لە خزم و خویشەکانی ئێمەیە."

"نەیدەزانی باشە، عوسمانی لە ترسی ئەوەی نەبادا ئێمە لەیەك جێگا کۆببینەوە بەچەشنێك پەراگەندەی کردین کە برا نەتوانێت برا بدۆزێتەوە. هاتووم تۆ بکوژم، بەڵام تۆم کەوتۆتە بەردڵ، بەڵکو منو تۆ خزمی یەکدیش بین. عوسمانی ئاوا لێکیکردووین و پەرش و بڵاوی کردووین. قەفقاز لەکوێ و عارەبستان لەکوێ !"

"هاتی من بکوژیت، بەڵام چما یەکسەر هاتیتە ئەم دوورگەیەو خۆت خستە نێوچنگی منەوە؟"

"هیچکەس نازانێت تۆ لەم دوورگەیەیت. رەسەنزادەکان زۆریان هاتوونەتە ئێرە، هیچکامیان نەیانزانیوە تۆ عەباسی. ئێستا کەس بەشوێنی تۆ نازانێت. هیچکەس جگە لەمن تۆی نەبینیوە. من و تۆ لەبەردەم دەرگای ماڵی ئەمیر رووبەرووی یەکدی بوینەوە."

"بۆچی لەوێ لە بەردەم دەرگا منت نەکوشت؟"

"هیچکەس ناتوانێت لەبەردەم ماڵی ئەمیر کەس بکوژێت. هەرکەس ئەوە بکات رەگ و ریشەی لەبنەوە دەکێشێت. تەنها کەسێك کە شوێنی تۆ پێبزانێت منم، ئەگەر بچم جێگاکەتیان پێبڵێم دێن لەنێو کونی ماریش بیت دەتدۆزنەوە و دەتکوژن. ئەگەر قسەی من وەردەگریت پێتدەڵێم هەر ئێستا دەمانچەکەت دەربێنەو من بکوژە. من ئەگەر هەروا بگەڕێمەوە، ئەوا تۆ وابزانە لەنێو گۆڕدایت. پێمبڵێ، دەتەوێت من بکوژیت؟ ئەگەر ئەو دەمەی

تۆم ناسیەوە ناوتم نەهێنابا، ئەوە پشیلەکەت نیشان دەدام و دەتگوت ئەمە ئەو عەباسەیە کە بەدوایەوەیت، پێمبڵێ، تۆ نووکە دەتەوێت من بکوژیت؟

دەمانچە و خەنجەرەکان و هەموو شتەکانم لای تۆن. ئەگەر من نەکوژیت مەردی. ئێستا چیدەڵێیت، دەتەوێت من بکوژیت؟"

پۆیراز سەری لە بەرخۆی نایەوەو ماوەیەك ئاوا کەوتە بیرکردنەوە.

"پێمبڵێ، دەتەوێت من بکوژیت؟ هیچکەس نازانێت من لێرەم. ئێمە جێگای خۆمان بەکەس ناڵێین. پێمبڵێ، دەتەوێت من بکوژیت؟"

پۆیراز سەری هەڵبڕی و گوتی: "نازانم، نازانم."

"رای خۆت بڵێ."

"نازانم."

"لانیکەم بڵێ دەتکوژم تا بەڵکو لێتبپاڕێمەوە، بەڵکو ریگایەکت پێنیشان بدەم کە بەعەقڵت دانایەت، ئەوسا تێدەگەیت کە منیش تۆناکوژم."

"نازانم."

"من متمانە بەتۆ دەکەم. تۆش متمانە بەمن بکە. رەوش و بارودۆخی ئێمە ئاوای لێهات، زۆری نەمابوو بتکوژم. خاتوونی ئەمیریش گوایە لە خزم و کەس و کارەکانی ئێمەیە. ئەگەر لێیوردبیتەوە دەبینیت هەموو چەرکەسە دوورخراوەکانی ئێمە خزم و کەس و کاری یەکدین. لەداغستانی بچوك کە دانیشتوانەکەی لەملیۆن و نیوێك زیاتر نیە چل زمان هەیە. (پێکەنی،) یانی بیری لێبکەرەوە هەر چەرکەسێك بۆخۆی زمانێکی هەیە. بۆیە ئەمیر بەهۆی خاتوونەوە لەخزم و کەس و کارەکانی ئێمەیە. بەو پێیە تۆش یەکێکیت لە خزمە راستەقینەکانی من، ئێستا باش تێگەیشتیت؟"

پۆیرازیش پێکەنی:

"باش تێگەیشتم، ئێستا دەمەوێت شتێکت لێبپرسم."

"بپرسە، بزانم."

"تۆ کەی لەکوشتنی من پەشیمان بوویتەوە؟"

"چەند شەوێك بەر لەئێستا، بەرلەوەی بێمە ئێرە. ئەوەندەم سەوڵ لێدابوون برستم لێبڕبوو، لەپی دەستم پۆرگیان دەردابوو، دەستەکانم بەرز نەدەبوونەوە، وەکو مردووانم لێهاتبوو. داماننا

ئەمە داخوازی شێخێکی خوێنمژە، من چۆن دەمتوانی گیانی گەنجێك لەنێو ببەم. لەپێناوی شێخ گیانی زۆرانم لەنێو برد. تەنانەت سێ جارانیش ناردمیان ئەمیر سەلاحەدین بکوژم. هەر سێ جارەکەش نەمانتوانی.

حەوت کەس بووین کە تەڵەمان بۆ ئەمیر دانایەوە، هەوا نیوە ڕۆشن بوو. لە بیابان بەسواری ئەسپەوە لەتەك خاتوونەکەیەوە دەڕۆیشت. وادیار بوو خاتوون بۆنی ئێمەی کردبوو کە قۆڵی ئەمیری گرت و لە ئەسپ هێنایە خوارو پاشان خۆی هەڵدایە سەر، لە پڕ پاسەوانەکانی ئێمەیان دایە بەر ڕێژنەی گوللان. شەش کەس لە ئێمە کوژران، تەنها من بەزیندوویی دەرباز بووم."

"پاشان، جاری دووەم و سێیەم."

"جاری دووەم هەمووومان توانیمان خۆمان ڕزگار بکەین. ئەمیر لە بەرزاییەکانی لالش خەریکی ڕاو بوو، لەگەڵ تەقاندنی یەکەم گوللەدا ئەمیر خۆی لەسەر پشتی ئەسپ فڕێدایە خوار. یەکەمجار خۆی و ئینجا پاسەوانەکانی دەستیان بەتەقەکردن کرد، خۆمان گەیاندە نێو بەردەلانەکان و توانیمان دەرباز ببین، پانزدە کەس بووین. ئەمجارەش هەمووومان هەر چەرکەس بووین. جاری سێیەم من بەتەنیابووم. دامگرتە بەر ڕێژنەی گولان. ئەمیر بەرامبەرم بوو، دەستڕێژ بەدوای دەستڕێژ دامگرت، تفەنگەکەم بەشێلکە تەقەی دەکرد، ئەمجارەش هیچ گوللەیەك ئەمیری نەهەنگاوت."

"تۆ لەمنداڵیەوە پاسەوانیت؟"

"لەمنداڵیەوە... بەڵێ. ئەگەر نەتوانی چاوی باڵندە لە ئاسمانرا بپێکیت ناتکەنە پاسەوانی شێخ."

"کاتێك نەتتوانی ئەمیر بپێکی، چی لەگەڵدا کردیت؟"

"هیچ کارێکی نەکرد. ئەگەر منداڵێکی دەساڵەش با لەجێگای من دەیتوانی ئەمیر بپێکێت."

"چۆن؟"

"ئەمیر خەریك بوو بەنێو تاشە بەردە ڕك و نووکتیژەکان ڕەت دەبوو. پاسەوانەکان لەپێش و پاشیەوە بوون، ئەمیر دروست ئەو دەمەی خەریك بوو بەبەردەممدا ڕەت بوو، سێرەم لێیگرت و هەر پێنج فیشەکەکانی تفەنگەکەمم پێوە نان. کاتێك سەری هەڵبڕی و سەیریم کرد بینیم وا

ئەمیر دەستی هەڵدەتەکێنێت و فەرمان بەپاسەوانەکان دەدات تەقە بکەن، من دیسان تەقەم لێکردەوە، دەستی ئەمیر بەهەواوە بوو. بە بەردەممدا ڕەت بوون و ڕۆیشتن."

"چی ڕوویدا؟"

"دەڵێن گوللە کار لە ئەمیر ناکەن."

پۆیراز قاقا پێکەنی.

"ڕەنگبێت ئەویش گوللە کاری تێبکات، بەڵام هەر لەدایك بووە دایکی لای گەورەترین جادووگەری عارەبستان جادووی بۆ کردبێت."

پۆیراز گوتی: "تێگەیشتم. باشە ئەگەر تۆ نەتتوانی ئەمیر بکوژیت، هیچکەس ناتوانێت ئەو کارەبکات."

"دوای ئەوە بوو کە شێخ دەستی لە کوشتنی ئەمیر هەڵگرت."

"بۆچی؟"

"ترسا. تێگەیشت کە گوللە کاری تێناکات."

"منیش پێمگوت. هەمووان دەیانزانی ئەو گوللانەی پێیدەکەون هەڵدەوەرێن و دەکەونە سەر زەوی. منیش ئەوەم بەچاوی خۆم بینی. بۆیە بە شێخم گوت شێخ وا پێدەچوو بڕیاری دابوویێت هەم تۆ بکوژێت و هەم ئەمیریش. شوێنپێیان هەڵگرتیتو تۆیان دۆزیەوە. دواجار ڕۆژێك بۆی ڕوون دەبێتەوە کە عەباس تۆیت و ئینجا ڕێگایەك هەم بۆ کوشتنی تۆ و هەم بۆ کوشتنی ئەمیر دەدۆزێتەوە."

"چۆن؟"

"ئەوانە لەوەتەی هاتوونەتە دنیا، وەستای کوشتنی دوژمنەکانی خۆیانن. ئەو دواجار بەرلەوەی بمرێت ڕێگایەك هەر دەدۆزێتەوە بۆ کوشتنی ئەمیر، کوشتنی تۆی هەر بەلاوە ئاوخواردنەوەیە، بە شەش مانگان ناتکوژێت دەزانێت تۆ عەباسی، بکوژان ڕادەسپێرێت و دەتکوژن. ئێستاش دەزانی ناوت پۆیراز نیە و ئەوە ناوێکی ساختەیە."

"کەوایە من دەبێ چیبکەم، لێرە دەتوانم بچمە کوێ. گیانی خۆمان ڕزگار کردو خۆم گەیاندە ئەم دوورگە چۆڵە، هاتن و وەك ئەوەی ئێوە خۆتان منتان لێرە دانا بێت دۆزیتانمەوە. پێمبڵێ من دەبێ چیبکەم؟ ئەم کچە ببەم و بچمە کوێ، بچمە قەفقاز یان داغستان؟"

"تۆ وازم لێدێنیت یان فڕێم دەدەیتە نێو دەریا تاماسیەکان بمخۆن؟ ئەو کەسە عاقڵە کە شەوێك لە خەودا دەست بنێتە بینا قاقام و بمخنکێنێت و بەردێکی گەورەم بە قاچەوە ببەستێتەوە فڕێمبداتە ژێر دەریایەکی دوور."

"ڕێگایەکی باشت نیشان دام. من نازانم مرۆڤ بکوژم. لە ساری قامیشیش کەسم نەکوشت، بەڵام لێرە کەسانێکی زۆر هەن کە دەتوانن تۆ بکوژن. ئەو هوسمەنە کە شەش کچی هەن، دەتوانێت نەك لە خەو بەڵکو هەر ئاوا زەق و زەق سەیرت بکات و بتکوژێت، پاشان لاشەکەت هەڵبگرێت و فڕێتبداتە بەردەم نەهەنگەکانی دەریا. مرۆڤ ئاوا بکوژن زۆر باشترە. تۆ وادەزانی وازت لێدێنم؟"

سلێمان ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا. جارێك وەك ئەوەی بیەوێت قسەبکات دەمی جووڵاندو لێوەکانی داخستنەوە، نەیتوانی قسەبکات. هەستا یەك دوو هەنگاو چووە پێش، پۆیرازیش بەخێرایی هەستا بەدەربڕینێکی زۆر ڕاشکاوو لێبڕاوانە گوتی:

"بوەستە، لەو شوێنەی لێیت بوەستە، دەنا تەقەت لێدەکەم. دەمانچەکەی دەرهێنابوو."بگەڕێوە وەرە لە شوێنی خۆت دابنیشە، دەتویست بۆ کوێ تێبتەقێنیت؟"

سلێمان گەڕایەوەو هات لە جێگای خۆی دانیشتەوە، روخساری تێکچوو بوو:

"دەچووم خورجینەکەم بێنم."

"خورجینەکەتمان نەخواردووە، توورەگەکان و بەلەمەکەشت لەشوێنی خۆیانن. ئەوانیش لەگەڵ خۆتدا دەنێرینەوە هەمان ئەو شوێنەی کە لێیهاتوویت."

هەستا، ڤاسیلی خەریکبوو بۆ لای ئەوان دەهات

"ڤاسیلی بڕۆ لای تاکوو بۆی دەرنەچووە، منیش دەچم توورەگەکانی بۆدێنم. خورجینێکیشی پێیە، وانیە؟"

"پێیەتی."

پۆیراز بەخێرایی رۆیشت و تاوێك دواتر توورەگە بەدەست و خورجین بەسەرشانەوە گەڕایەوە، وردەواڵەکانی بۆ دانانە سەربەردێك.

ڤاسیلی گوتی: "من دەچم، ئێوە لێرەبن، سەعاتێکم پێدەچێت."

پۆیراز ماوەیەك لە روخساری زەرد هەڵگەڕاوو شێواوی سلێمان راما، پاشان دەستی بۆخورجینەکە درێژکرد و یەکەمجار وردکەنانەکان و پاشانیش وردەواڵەکانی ناو خورجینەکەی

سەیرکردن، پاشان فیشەکدانێکی لەنێو خورجینەکە دەرهێنا. لەنێو توورەگە مەخمەڵیەکە دەمانچەی هێنایەدەرو لەکاتێکدا لەبەر تیشکی خۆر دەبریسکایەوە بۆلای سلێمانی رادان، خەریکبوو سەیری چاوەکانی سلێمانی دەکرد کە گوتی: "دەمانچەکە پڕفیشەکە."

سلێمان بەدەربڕینێکی دڵنیایانەوە گوتی: "دەزانم."

سلێمان دەمانچەکەی وەرگرت ماوەیەکی درێژ سەیری ئەملاو ئەولای کرد، بیری کردەوە، پاشان بەهێمنی لەولای دانا.

سەریان نایەوە بەرخۆی و ئاوا بێدەنگ بوون. سەرەنجام سلێمان سەری هەڵبڕی و گوتی: "دەمزانی ئەمە دەکەیت."

پۆیراز لەوەڵامدا گوتی: "منیش بەجۆرێکی دیکە بیرم دەکردەوە."

"چۆن؟"

"تۆ بەر لەوەی لە شێخ جیا ببیتەوە دەتزانی کە ناتوانی من بکوژیت."

"تۆ ئەمە چۆن دەزانیت؟"

"بەوەی کە دەتزانی ناتوانی ئەمیریش بکوژیت."

سلێمان بەبزەیەکەوە گوتی:

"ئێستاش دەزانیت کە دەمەوێت شێخ بکوژم؟"

پۆیراز بێدەنگ بوو..

"ئەگەر خۆم نەیکوژم، دەتوانم وابکەم وەکو ئاو خواردنەوە بیکوژن. ئەوسا دنیا لەدەستی بکوژێك کە دەستەکانی تا هەنیشکی نوقمی خوێنن دەرباز دەبێت، ئەو خۆی بە هەموو لایەکدا دەکات و ئەمڕۆ یان سبەی بۆ کوشتنت پەیدا دەبێت. ئەو ئەمیر سەلاحەدینیش دەکوژێت، من ئێستا دەمەوێت لێرە بڕۆم و یەکسەر بچمە لای ئەمیر سەلاحەدین. دەمەوێت هەموو شتێکی پێبڵێم. ئەویش سێ و دووی لێناکات و بەخزمەتی شێخ دەگات. بگرە ئەم دەمانچەو ئەو خەنجەرانە با یادگاریی من بن لای تۆ."

"تۆ ناتوانیت بەبێ دەمانچە هیچ بکەیت، بادەمانچەکەت لەلابێت، خەنجەرەکان بدە بەمن، خەنجەرەکان بۆمن یادگاریی باپیرانمن"

"هەڵیانبگرە، ئێستا دەتوانم سواری بەلەمەکەمم بم و بڕۆم؟"

"واتە وەکو ئەو رۆژەی کە هاتیتە نێو بەلەمەکەت لە ماندوویێتیان و لەبرسان بمریت و پاشان شێخیش پیاوەکانی بنێرێت بۆ کوشتنی من، ها؟"

"ئەمیر سەلاحەدین منی بینی. دەڵێن ئەو ئەگەر کەسێك تەنانەت ساتێك چیە ببینێت ئیدی لەبیری ناکات. ئەگەر بیویستبا دەیتوانیٚ هەرکاتێك من بکوژێت، بۆچی نەیکوشتم، لە دەربەندیش دەیتوانی بمکوژێت، بۆچی فەرمانی بەپاسەوانەکانی خۆی دا نەمکوژن، ئەگەر فەرمانی ئەو نەبوا پیاوەکانی لە چاوقوچاندنێکدا دەیانکوشتم."

"چۆن بوو تۆ ئەوت نەکوشت؟"

"یانی تۆ بۆیە ئیزنم دەدەیت بڕۆم کە نەمکوشتیت؟"

"نا، لەبەر ئەوەی تۆ خزمێکی نزیکی خۆمی. ئیستا دەمەوێت بە بەلەمەکەی پزیشکی ئاژەڵان بتبەمە شارۆچکە. لەو وادەکەم بەئاسانی بگەیتە لای ئەمیر سەلاحەدین."

سلێمان کە ئەبرۆکانی تێکنابوون گوتی: "کارێکی باش دەکەیت."

"سوپاس فەرماندە."

"ئێستا باش گوێم لێبگرە کوڕە. بەمزووانە ئەمیر سەلاحەدین لە مەکەو مەدینە پاشایەتی رادەگەیەنێت، بەهەرحاڵ ئەمڕۆ یان سبەی. شێخ بەر لەوەی ئەو ببێتە شا دەکوژێت. شێخ ئەوە دەزانێت هەر کە ئەمیر ببێتە شا دەگۆڕێت و پیاوەکانی رەوانە دەکات تاسەری لەجەستەی جیابکەنەوە."

پزیشکی ئاژەڵان ماتۆڕی بەلەمەکەی داگیرساندبوو و چاوەڕوانی ئەوانی دەکرد، لەنێو ئەو کەسانەی هاتبوون بۆ بەڕێکردنی موسا ئاغا، مەلەك خانم، دکتۆرەکان، عەلی دەنگبێژو ئەوانی دیکەش بەدی دەکران.

سلێمان دوای ئەوەی دەستی یەکە یەکەیانی گوشی، سواری بەلەم بوو. پۆیراز و سلێمان لەتەك یەکدی دانیشتن، قسەی زۆریان هەبوون بیکەن و لەوە دەترسان زوو بگەنە شارۆچکە.

هەندێکجار پۆیراز سووکانی بەلەمەکەی وەردەگرت و جەمیلی پزیشکی ئاژەڵان لەتەنیشت سلێمان دادەنیشت.

زوو گەیشتنە شارۆچکە، هەر لەگەڵ ئەوەی دابەزین، چوونە دووکانێکی بەرگدروو. دەستەجلێکی شینی پارچەی ئینگلیزیان بۆ سلێمان کڕی.

هەروەها کراس، چەکمەو پێڵاو. جلکەکە بەئەندازەی سلێمان بوو. سلێمان لەوێ کە پۆیراز جلی بۆ کڕیبوو زۆر خۆشحاڵ بوو. جگە لەوە باولێکیشیان کڕی کە بەڕاستی جوان بوو، هەرچی کڕیبوویان خستیانە نێو باولەکە، خورجین و توورەگەکانیش هەروا بەدەست سلێمانەوە بوون. نەیدەهێشت کەس شمەکەکانی هەڵبگرێت. دواجار پزیشکی ئاژەڵان بەخورتی خورجین و باولەکەی لێوەرگرت.

چوونە خواردنگە، نانیان خوارد. پۆیراز سات و کاتی بەڕێکەوتنی کەشتیە بچوکەکەی بۆ ئەستەنبۆڵ دەزانی. کەشتی هات و کەمێك دوورتر لەوان لەنگەری گرت. بەلەمەکان سەرنشینەکانیان لەکەشتی گواستەوە و هێنایانن، سلێمان بەچاوی فرمێسك تێزاوەوە گوتی:

"پۆیرازەکەم، خۆزگە هەموو مرۆڤەکان وەکو یەك بووان. مرۆڤ دەتوانێت گیان و هەست و نەستی خۆی بەتۆ بسپێرێت."

پۆیراز گوتی: "ئۆه، بەلەمەکەتمان لەبیرکرد."

سلێمان گوتی: "بیدە بەکەسێکی دیکە."

یەکدیان گرتە ئامێزو لەیەك جیابوونەوە.

ئەمجارە با هەوری هێنان و دوورگە نوقمی نێو تاریکی بوو، بەجۆرێك کە چاو چاوی نەدەبینی. شنەبایەکی نەرم لە دەوروبەر هەڵیکرد، دواتر دڵۆپە بارانی گەورە و پەراگەندە دایانکرد. بۆنی خەستی خاك ئەو ناوەی داگرت، بۆنێك کە لەکاتی بارانبارینداا بڵاو دەبێتەوە، من دەڵێم رەنگبێت تەنها بۆنێك بێت کە مرۆڤ دەخاتە خولانەوە، بەهەشتێکی هەزار ساڵە، هەرچەند بۆ ساتێکی کورتیش بێت، دەخاتە نێو دڵی مرۆڤەوە، مرۆڤ هەڵدەگرێ و دەیباتە نێو بەختەوەری و جیهانێکی رەنگاوڕەنگی دەستلێنەدراو و نەبیندراو.

ئەو دەمەی دڵۆپە بارانی گەورە گەورە لێرەو لەوێ بەتەپە تەپەوە بێرەو بەوێ دەکەوتن، پۆیراز موسا لە کاتێکدا ئاگای لە خۆی بڕابوو هاتە خوار، خۆی هەڵدایە دەرەوە، خۆی گەیاندە نێو بۆنی خاکەکە، تا قامیشەڵانەکە چوو، گەڕایەوە، دوای ئەوەی کە کەمێك راوەستاو بیریکردەوە، هات و لەبەردەم دەرگای ماڵی زەهرا راوەستا.

لەو دەمەی خەریکبوو پێی دەنایە سەرپلیکانەکان گەڕایەوەو رووەو لێوار بایدایەوە. تیشکی خۆر خزابووە نێو دڵیەوە. لەرۆشنیان بریسکەی دەهات.

لەو تاریکیەدا ئەو لەنێو نوورو رووناکیدا مەلەی دەکرد، قاچی لەزەوی بووبوونەوە. تا ئەوکاتەی کە باران شێتانە دایدەکرد ئاوا نوقمی نێو رۆشنایی و شادی و بەختەوەری و مەستبوون رێگای دەبڕی.

هەور لەئاسمانان تێکدەقژقژانو تادەهات هەوا تاریکتر دەبوو. لەناکاو، هەورەتریشقەیەك شریقاندی و دوورگەی لەرزاند. دەوروبەر هەندێکجار تاریك دەبوو، هەندێکجار ئەوەندە رووناك، کە چاوی لەبەر هەڵنەدەهات، پاشان دووبارە تاریك دەبوەوەو و چاو چاوی نەدەدی ماوەیەك دواتر باران لەگەڵ بروسکەو هەورەتریشقە دەستی پێکرد.

پۆیراز هەر لەگەڵ هەڵکردنی باران وەك ئەوەی کەوتبێتە نێو دەریا، ئاو لە هەموو گیانی دەچۆڕایەوە. لەلایەك گرمەگرمی ئاسمان، لەلایەکی دی بروسکەی پەیاپەی، لەلایەك بارانی بەخوڕو لەلایەکی دیکە دوورگە لە حاڵەتی هەژانە سەریەك وەك لانکە...

پۆیراز، چەند جارێك بەدەوری خۆیدا خولایەوە، پاشان قاچەکانی هەڵیانگرت و بەرەو لای پلیکانەکانی بەردەرگای ماڵی زەهرایان برد. دەرگاکە کراوە بوو، یەك دوو پلیکانەش بەسەرکەوت، دڵی کەوتە تەپە تەپ، هێزی لەئەژنۆیان بڕا، گەڕایەوە، چووە لێوار، بەرەو لای سەرەوە رۆیشت. بارانی سەربەقەپوچکە لە راست و چەپ، لە پێشو پاش دەیانکوتا، شەپۆلەکان راسابوون و هێندەی بەژنی مرۆڤێك بەرز بووبوونەوە، پۆیراز هەرچی هەوڵی دەدا خۆی بگەیەنێتە لێوار، شەپۆلەکانی دەریا هەرجارێك بەلێواریان دەکێشا ئاو تا ئەژنۆکانی دەهات.

زەهرا ئەو دەمەی بارانی سەر بەقەپوچکە دایکردبوو پۆیراز بینی کە بۆنی خاك - لەکرێتیش باران هەمان ئەو بۆنەی هەبوو- سەری خستبووە خولانەوە، بەخێرایی چووە دەرەوە، وەکو کەسێکی مەست بەلاکەلاك لە پلیکانەکە نزیك بووەوە و یەکسەر وەکو کارەبا لێیبدات گەڕایەوە، دیسان لەگەڵ خێرابوونی بارانبارینەکە بەپشتی کووڕەوە بەرەو لای پلیکانەکە رایکرد، چوار پلیکانە بەسەرکەوت و لەوێ راوەستا. هەم خۆشحاڵ دەبوو، هەم لەنیگەرانیدا خەریکبوو شێت بێت. باران هەروا دایدەبێژا، زەهرا بە راکردن لەبەردەم دەرگا بۆ پشت پەنجەرە و لەپشت پەنجەرە بۆ بەردەرگا دەهات و دەچوو.

"چیبووە زەهرا، چیبووە کچم؟"

"ئاسمان هەڵوەشایەوە بابە، ئاسمان کون بووە. سێڵاو لەئاسمانەوە راساوە. باران وەك گۆسکەی سەرنخوون دەبارێت."

تاریکیەکی ئەنگوستە چاو دوورگەی گرتبووە خۆ. بەردەوام بروسکە و هەورەتریشقە زرم و شریقەشریقیان بوو و هەرجارێك لەگەڵ ئەو هەورەتریشقە و بروسکانە ئاسمان پارچە پارچە دەبوو و هەر پارچەیەکی وەکو تۆپەڵێکی شینباو دادەرشژایە نێو دەریا و پاشان تیریژی شین لەسەر ئاوی دەریا دەخزین و بۆ دوور دوور دەڕۆیشتن و دەریا دەیهاڕاند و دوورگە رادەهەژایە سەریەك. پۆیراز سەری ناوەتەوە نێولاکی و لەنێوخۆیدا گرمۆڵە بووبووەوەو تا ئەژنۆ رۆچوبووە نێو ئاوی دەریاوە، بەرەو زنرێك کە رەگی زەردی تێدابوو دەڕۆیشت، هەنگاوێکی دەما بگاتە زنارەکە دەگەڕایەوەو لەکاتی گەڕانەوەدا سەری هەڵدەبڕیو سەیری دەرگای ماڵی زەهرای دەکرد. لەکاتێکدا دروست ئەوکاتەی دەگەیشتە بەردەم دەرگای ماڵی زەهرا، ساتێك دەوەستا، سەری هەڵدەبڕی، یەکەمجار سەیری دەرگاو پاشان سەیری پەنجەرەی دەکرد، تارمایی زەهرای دەبینی کە دروست لەنێوەڕاستی رۆشناییەکی زەرد بەدی دەکرا، لەسەر هاتوچۆکەی بەردەوام دەبوو، دەنگی باران، دەنگی هاژەی دەریا و ئاسمان ئاوێتەی یەك دەبوون، دوورگە وەکو کەشتییێکی بێکەشتیوان بەملاو بەولادا دادەکەوت.

موسا ئاغا گوتی: "بوەستە زەهرا، مەترسە زەهرا ئەم دوورگەیە ژێر ئاو ناکەوێت. دوورگە بچوکە، بەڵام مەترسە. تائێستا نەزاندراوە دوورگەیەك بکەوێتە ژێر ئاوەوە. مەترسە کچەکەم، وەرە لای من دابنیشە."

زەهرا بێئەوەی ئاگای لەخۆی بێت چووە لای باوکی دانیشت، سەری خستە نێو شانەکانی. روخساری سوور سوور هەڵگەڕابووو شەلاڵی ئارەقە بووبوو. ئەگەر دنیا رووناك بووبوایەوە و موسا ئاغا روخساری پەشۆکاوی کچەکەی بینبوا، زەندەقی دەچوو و وایدەزانی بەڵایەك بەسەر کچەکەی هاتووە. سوپاس بۆخوا کە لەبەر رووناکی لامپاکە نەیدەتوانی سیمای کچەکەی باش ببینێت. دڵی زەهرا لە روخساریشی پەشۆکاوتر بوو. دەیگوت دەمرێت، دەمرێت، لەبەر خاتری من دەمرێت. ئەگەر ئەو بمرێت من چۆن دەتوانم بژیم، هەتا رۆژێکیش چیە ناتوانم، لەپێش باوکی نەیدەتوانی بچێتە بەردەم پەنجەرەکە، نەیدەتوانی بچێتە بەردەم دەرگا. ئێستا دەبێت هەستێت و بچێتە بەرباران. ژێر ئەو هەورەتریشقە و شەڕە بروسکەیە، ژێر ئەو ئاسمانەی کە پارچە پارچە دەبێت و دادەڕژێتە نێو دەریاوە، ژێر باو بۆران، هەرکێ دەیەوێ چی بڵێت بابڵێت،

دەبێت بچێتەلای ئەو، بیگرێتە باوەش، قۆڵی بگرێت، هەڵیبگرێتو بیهێنێتە ماڵەوە، جلەکانی لەبەربکاتەوە و بیخاتە نێو جێگاوە و بیخەوێنێت و تا بەیانی لە پشت سەریەوە دابنیشێت، بەڵام ئەگەر باوکی ئەمە ببینێت، ئەگەر تێبگات کە تروسکایی ئومێدی چوونەوە بۆ کریتی خامۆش بووە، دڵگیر نابێت؟

لەتەك باوکیدا لە حەژمەتان خەریکبوو وشك ببێتەوە، بەتوندی دڵی لێیدەدا. لەپڕ هەموو ئەو فکرو خەیاڵانەی لە مێشکیدا فڕێدان، قاچەکانی هەڵیانگرت و بردیانە بەردەم پەنجەرە. باران حەشری دەکرد، لەدوورو نزیکەوە ئاسمان دەینەڕاند. پۆیراز پشتی کووڕ بووبووەوەو لەکاتێکدا قاچەکانی تێکدەئالان، بە لارەلار دەڕۆیشت. زەهرا نەیتوانی بەپێوە بوەستێت، لەسەر کورسیەك کە لەوێ بوو دانیشت، ئا لەوکاتەدا نەسیبە هات:

"هەستە، هەستە مەگری، ئەگەر باوکم هەستێت و لەدەرەوە ئەو ببینێت و هەموو شتێك تێبگات چی، ئێستاش وەك ئەوەی تێگەیبێت، گومانی کردووە، ئەگەر تێبگات و بکەوێت و بمرێت چی؟"

به دەستماڵ فرمێسکەکانی سڕینەوە.

"هەستە نابێت ببینە مایەی مەرگی باوکمان."

"بابە دەمرێت، دەزانم.سەیری بکە، ئەویش دەمرێت. باشتر وایە بەکەسێك بڵێم..."

"نەتۆ چیت بەسەردێت، نە ئەو. هیچکەس لە تاو ئەڤینێکی ئاوا بەسۆز نەمردووە، زۆریان تەمەنێکی زۆر درێژ ژیاون. ئەمە چ قسەیەکە تۆ دەیکەیت. یاللا هەستەوە!"

"مەترسە کچەکەم، هەر بینیت باران خۆشی کرد. لە کرێتی ئێمەش بارانی ئاوا دەبارین."

دروست لەم قسانە بوون کە هەورەتریشقەیەك شریقاندی و ئاسمان بەهەموو هێزی خۆی گرماندی، رۆشناییەك ناو هەموو ماڵی رووناك کردەوە کە ئاوی لە چاوان هێنا، گرمەو رۆشناییەکە ئەوەندە بەهێز بوون کە تەنانەت موسا ئاغاش لە شوێنی خۆی راپەری.

سپێدەی دا، هەوا رۆشن بوو، باران هێشتان بەخوڕ دەباری، ورگی ئاسمان دڕابوو و باران وەکو سێڵاو دەهاتە خوار. زەهرا تاوی نەگرت، بەخێرایی بەرەو لای دەرگا رۆیشت، هەر دەرگای کردەوە ئاسمان لەنزیکەوە گرماندی، تیشکی بروسکە و هەورەتریشقە تیژترو کاریگەرتر لە تیشکی خۆر ئەو ناوەی گرتەخۆ، بەچەشنێك کە تەنانەت سیمای پۆیرازی بینی کە لەنێو

ئەو رۆشناییەدا دەهات و دەچوو. وەکو منداڵێك بچوك بووبووەوە. هات و لای باوکی دانیشت. وەك ئەوەی دوایین هەناسەکانی بدات. روخساری دابزگۆڕابوو و لێوەکانی دەلەرزین.

"مەترسە کچەکەم، شتێك نیە، دوورگە هیچی لێنایەت. ئەگەر بزانم هەروا دەترسی لێرە دەڕۆین و دەچینە شارێك. دەڕۆین و دەچین لەباشترین شارو خۆشترین شوێنی ئەم دنیایە دەژین."

زەهرا لە نێو ترسدا بەخێرایی گوتی:

"نەخێر بابە، ئێمە خەڵکی دوورگەین. مەگەر دوورگەی ئێمەش بەو گەورەییەوە هەر دوورگە نەبوو؟ من لێرە ناترسم."دەنگی وەکو دەنگی گریان وابوو. "باران دەبارێت بابە، بارانێك کە تائێستا نەباریوە. وەکو لافاو و سێڵاو لەئاسمانەوە دادەڕژێتە خوار. باوکە ئاسمان هەموو دەبێتە یەك پارچە ئاوو بەسەر سەرماندا دێتە خوار. لەلافاوی نوحیشدا بارانێکی ئاوا باری، وانیە باوکە؟"

موسا ئاغا گوتی: "باری، بەڵام ئەوها نەبوو، رووبارەکان و دەریاکان راسان و هەموو دنیایان داپۆشی. ئەم بارانە بەزوویی لێدەکاتەوە. بارانی هاوینانە، بەخوڕ دەبارێت و لەپڕ لێدەکاتەوە."

"لێناکاتەوە باوکە، پێناچێت لێبکاتەوە. من ئێستا چیبکەم باوکە؟" لەوەی کە گوتبووی من ئێستا چیبکەم نیگەران بوو، لەسەر کورسییێکی نەرمدا گرمۆڵە بوو، سەری دانەواند.

موسا ئاغا پێکەنی، دەستی درێژ کردو قژی کچەکەی لاواندەوە:

"لە منداڵیشدا تۆ هەرئاوا بوویت. لەباران دەترسایت، کاتێك هەورەتریشقە و باران دەهات لە ترسی گرمەو هاڕەی ئاسمان گۆناکانت سوور هەڵدەگەران و بە سەرو قژی تێکئالاوتەوە دەهاتیت و خۆت بە ئامێزی من دادەدا."

"ناترسم باوکە."

"بابچین بنووین ئیدی."

زەهرا بەکپی هەستا، ئەوەندە خۆشحاڵ بوو کە خەریکبوو دڵی لەقەفەسەی سنگی هەڵبفڕێت.

موسا ئاغا دەستەپاچوو بوو. لەدڵی خۆیدا گوتی ئەم کچانەم چیان بەسەرهاتووە. هەمووی تەنها بارانێکە و بەس.

زەهرا گوتی: "زوو دەخەوم و لەبیر خۆمی دەبەمەوە باوکە."

موسا ئاغا کەمێك هەڵوەستەیەکی کرد، پاشان بەخێرایی بەرەو ژوورەکەی چوو، دەرگای داخست. زەهراش ڕۆیشت پەنجەرەی کردەوە، باران هێشتا دەباری. هەندێ سەیری کردو سەیری کرد نەیتوانی لە نێو تاریکیدا کەس ببینێت. باران بەخوڕ خۆی بەنێو پەنجەرەدا دەکرد، زەهرا بێجووڵە لەشوێنی خۆیدا ڕاوەستابوو. لەنێو تاریکیدا شەپۆلەکانی دەریا بەدی دەکران کە تا ژێرچنارەکان دەهاتن، تەنانەت نەیاندەهێشت چنارەکان ببینێت. لەدوورەوە ئاسمان چەخماخەیەکی دا، کەمێك دواتر گرمەیەك ئاسمانی شەق کردو هات لەسەر دوورگەدا نەما. ئا لەودەمەدا زەهرا وای هەست کرد کە پۆیرازی بینی. ئاسمان گرماندی، چەخماخەی دا، هەوا وەکو نوێژی نیوەڕۆ ڕووناك بووەوە. زەهرا پۆیرازی بینی. پۆیراز تا ئەژنۆکانی لەنێو دەریا بوو، خڕبووەوە نێو خۆی و هەوڵی دەدا هەنگاو هەڵێنێت. زەهرا بە نەسیبەی گوت کە لەتەنیشتیەوە بوو: "دەمرێت."

نەسیبە پرسی: "چیبکەین باشە؟"

"من دەڕۆم. بەبێدەنگی. لامپاکە بکوژێنەوە. بالیف بخەژێر لێفەکەم ئەگەر ئەو بمرێت، منیش ئیدی ناتوانم بژیم."

نەسیبە گوتی: "دەزانم. زوو بڕۆ."

کاتێك کپ و بێدەنگ لەپلیکانەکان دەچووە خوار، نەسیبە لەبەر خۆیەوە دەیگوت ئەگەر باوکم ئەم شتانە ببیستێت ئەویش دەمرێت.

باوکم دەتوانێت کچەکەی لە غەریبایەتی بەجێبێڵێت و بگەڕێتەوە کرێت؟ ئەگەر ئەو پیاوە بمرێت، زەهراش دەمرێت. نەسیبە چوو لەسەر تەختەکە دانیشت. لەنێو تاریکیدا خەریك بوو بیری لەدایکی دەکردەوە. گوتی زەهرا بەدایکم دەچێ بەنیگایەك عاشقی باوکم بوو ئیدی هیچ کات نەیبینیەوە. جوانترین کچی کرێت بووە، باوکیشی یەکێك لەخاوەن کێلگەکان بووە، ڕۆژێك بوخچەکەی هەڵدەگرێت بەرێگای نهێنی بەسێ ڕۆژان خۆی دەگەیەنێتە ماڵی ئێمە، لەسەر پلیکانی سەرەوە دادەنیشێت، باوکم دەبینێت و دەچێت لە تەنیشتی دادەنیشێت، پێیدەڵێت:(باشە بەخێر هاتی) ئەویش دەڵێت (سوپاس.. ساوار بۆ باوکم بنێرە تابێن و بمدەن بەتۆ.) هەڵدەستێت، باوکیشم هەڵدەستێت. دایکم وایکردووە، زەهرا دەیەوێت چیبکات!

زەهرا لەنێو تاریکیدا هێواش هێواش چووە لێوار. لەوێ راوەستا. گوێی راگرت، دڵی کەوتبووە لێدان. چاوەڕێ بوو تا لەلایەك چرپەی پێیەك دێت. جگە لەدەنگی باران و شەپۆلە هەڵچووەکان هیچ دەنگێکی دیکەی نەدەبیست. لەبەر خۆیەوە گوتی ئاه ئەگەر بروسکە لێیبدات. دروست لەبان سەریەوە ئاسمان شەق بوو، گرماندی، دنیا وای لێهات کە چاو چاوی نەدەبینی.

پاشان چەخماخەی دا، دارچنارەکان نوقمی نێو رۆشنایی بوون. لەوێ پۆیرازی بەدینەکرد، گەڕایەوە دواوە، لەچەخماخە و بروسکەی سێیەم تارماییەکی تێبینی کرد کە هەوڵی دەدا بڕوات، رایکردو باوەشی بەتارماییەکەدا کرد. پۆیراز دەلەرزی، ددانەکانی قرچە قرچیان بوو.

لەسەر وردەبەردەکان بە شێوەیەك وەك بڵێی بفڕێت ئەوی دۆزیەوەو گرتی، ئاسمان لێکلێکە چەخماخەی دەدا، دەیگرماند، دەریا دەیلوراند، پۆیرازی هێنایەوە ماڵی خۆیان. چۆن توانی پۆیراز تا ئەوێ بێنێت، چۆن لە پلیکانەکان بەسەرکەوتن، زەهرا ئەمانەی نەدەزانی، تەنها شتێك کە بۆی روون بوو ئەوە بوو کە لێنا بە فانۆسێکی مەلەوانیەوە لەسەر پلیکانەکان بەدەرکەوت.

زەهرا گوتی: "دایکە لێنا، خەریکە دەمرێت، خەریکە دەمرێت. "خۆی لە تەنیشتیەوە بەردایەوە سەرکورسیەك.

لێنا پۆیرازی گرت، بردیە ژووری نووستنەکەی، جلەکانی لەبەرداکەناند، بەخاولی بەتەواوی وشکی کردەوە، لەسەر تەخت خەواندی و داپۆشی.

پۆیراز هێشتا هەر دەلەرزی و ددانەکانی بەیەك دەکەوتنەوە. لێنا چای لەدێم نا، شیری خستە سەر ئاگر، لەسەر یەك چاو شیری دەرخواردی پۆیرازدا. لەرزین و بەریەککەوتنی ددانەکانی پۆیراز کەمێك ئارام بوونەوە.

زەهرا چووە ژوورەوە، هات و لەلای خوارەوەی پۆیراز راوەستا و چاوی بڕینە ناو چاوە داخراوەکانی پۆیراز. کەمێك دواتر داهاتەوە، دەستی خستە سەر نێو چاوانی ئەوەوە.

پاشان دەستی ئارام ئارام چووە نێو مووکانیەوە، لاواندیەوە. پۆیراز چاوی هەڵێنان. ساتێك تاساو لە هیچ نەگەیشت، سەیری کرد ئەو کەسەی مووەکانی دەلاوێنێتەوە لە زەهرا دەچێت، باوەڕی نەکرد. نیگاکانیان تێکهەڵنگوتن، زەهرا خۆی پێنەگیرا، دەستی خۆی کێشایەوە، وەرسووڕاو لەژوورەکە چووەدەر، بەرەو پلیکانەکان چوو، نەیزانی چۆن دەرگای دۆزیەوەو چۆن

لەپلیکانەکان چووە خوار. باران هەروەك خۆی دەباری. گەڕایەوە ماڵی خۆیان، نەسیبە، فانۆس بەدەست، لە بەردەم دەرگا چاوەڕێ بوو. لەو ڕێگایە بەو ماوە کورتە وەك ئەوە وابوو لەبەر ئاویان هەڵێنابێت. ڕەوشی نەسیبەش لەهی ئەو باشتر نەبوو. لەمەودای نێوان ماڵی خۆیانو ماڵی پۆیراز هاتبوو و چوو بوو. باش بوو باوکیان هەر سەری خستبووە سەر باليف خەوی لێکەوتبوو.

زەهرا دەمی بردەبن گوێی نەسیبە و بەدەنگێك کە بە ئاستەم دەبیسترا گوتی:

"نەمرد." نەسیبە گوتی: "زووبە بابچینەوە ژوورەکەمان. بابە خەوتووە. واخەوتووە تۆپی لەبن گوێدا بتەقێت بەئاگا ناهێتەوە."

چوونەوە ژوورەکەیان، جلەکانیان گۆڕی، بەدوو خاولیان جوان خۆیان وشك کردەوە. پاشان جلی خەوتنیان پۆشی و لەسەر تەختەکە و بەرامبەر یەکدی دانیشتن.

زەهرا بەوردی گێڕایەوە کە لەنێوتاریکیدا یەکەمجار ئەوکەسەی لەژێر باراندا دەڕۆیشت نەیتوانیوە ببینێت و پاشان هەرچەند گوێشی ڕاگرتووە کەچی دەنگی پێیەکەی نەبیستووە و تەنها ئەو دەمەی چەندین بروسکەو چەخماخە یەك دوای یەك ئەو ناوەیان ڕۆشن کردۆتەوە ئەوسا بینیویە. لەخۆشحاڵیان خەنی بووبوو.

پاشان سەبارەت بەباوکیان قسەیان کرد، ئەوە ئاشکرابوو کە ئەو بەهەر جۆرێك بێت لێرە گیرنابێت و نامێنێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا، دوورگەی هەڵبژاردبووو لەشارە جوان و گەورەکان دوورکەوتبووەوە. هاتبوو لێرە کێڵگەشی کڕیبوو، ئەویش بۆ بەخێوکردنی ئەسپی ڕەسەن. پارەیەکی باشی بۆ ئەمە خەرج کردبوو. کاتێکیش قەباڵەی کێڵگەکەی وەرگرتبوو ئەوەندە خۆشحاڵ بووبوو کە لەماڵێ چووبووە دەرو تابەیانی پیاسەی کردبوو. لەلایەکی دیکە دەیەویست ئیسماعیل بکاتە سەرکاری خۆی.

بەیانی داهات، لەخەو هەستان. موسا ئاغاش لەخەو هەستا بوو و لەبەردەم پەنجەرە دانیشتبوو و لەو سەرەوە دەریای ڕاساوی لەپشت بارانی پەردەئاسا بەشێوەیەکی خەیاڵاوی دەبینی.

کچەکان هەستان، حەمامیان کرد، ئاگردانیان داگیرساند، کتری و شیریان خستە سەرئاگر، چوونە لای باوکیان، گوتیان:"بەیانیت باش باوکە."موسا ئاغا لەکاتێکدا سەیری کچەکانی دەکرد گوتی:

"لەدوێنێ شەوەوە تائێستا هەر باران و باران. من لەهەموو تەمەنمدا بارانێکی وام نەبینیوە. ئەوەندە هەورەتریشقەو بروسکە چەخماخەی داوە کە ئاسمان یەکپارچە بووە بەئاگر، پاشان پارچە پارچە بووە. وامدەزانی هەموو پارچەکانی ئاسمان کەوتبنە سەرزەوی. دەمتوانی چیبکەم، نووستم."

"تۆ ئاوا دەخەوی باوکە، کاتێکیش هەواڵی دوورخستنەوەیان پێدابین ئاوا سێ شەوو سێ رۆژان خەوتیت، لەنێو نوێندا نەهاتیتەدەر."

"مەگەر گوێتان لەدەنگی لێمشتان نیە؟ شەو تاوێك بێدار بوومەوە، دەنگی گرمەی ئاسمان و هەورەتریشقە و ئەو بروسکانەی دادەکەوتن و هەروا دەنگی باران ئاوێتەی یەکدی بوو بوون، وامزانی دوورگەیان لەجێی خۆی هەڵگرتووە و خەریکن دەیبەن. رامکردو چوومە ژوورەکەی ئێوە، گوێم لەدەنگی هەناسەکانتان گرت، وەکو سەردەمی منداڵیتان بەخەیاڵی ئاسوودەوە خەوتبوون."

لەدەرگا درا. کونجکۆڵ و نیگەران بوو کە بەم بەرەبەیانە زووە دەبێت کێ بێت. زەهرا بەخێرایی چوو و دەرگای کردەوە. دایکە لێنا راچلەکی. رەنگی رووانی زەرد هەڵگەڕا، سەری سووڕا، ئەگەر دەستی بەدەرگاکەوە نەگرتبا دەکەوت. ویستی بپرسێت. پۆیراز شتێکی بەسەرهاتووە، بەڵام لە دۆخێکی وانەبوو بتوانێت بپرسێت. لێنا کە ئەمەی دەبینی و بۆی روون بووبووەوە بەخەندەوە پرسی "باوکت لەخەوهەستاوە کچم؟ پۆیراز موسا بۆ چێشتی بەیانی بانگی کردووە."

زەهرا هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشایەوە، هەستاوە: "گوتی، فەرموو دایکە، باوکم خەریکە سەیری دەرەوە دەکات، دەڵێت لەهەموو تەمەنمدا بارانی وام نەبینیوە."

لێنا بە چرپەوە پێیگوت:

"زۆر ترسام، وامزانی خەریکە دەمرێت. ئەگەر تۆ نەبایت دەمرد. هیچکەس نەیدەتوانی بیهێنێتە ژوورەوە. کەی دەیتوانی تێبگات وا لەبەر باران بەنێودەریادا دەڕوات. کوڕێژگە پێیخۆشە لەبەر باران و لەبەردەم ماڵی ئێوەدا و بەنێو دەریادا بێت و بچێت. ئەگەر تۆ نەتهێنابوایە ژووری دەکەوتە نێو دەریا و دەریا لەگەڵ خۆیدا دەیبرد. نەماندەتوانی تەرمەکەیشی بدۆزینەوە. ماسی دەیانخوارد، تەنانەت نەماندەتوانی ئێسقانەکەیشی بدۆزینەوە."

لێنا ئەوەندە بەنەرمی قسەی دەکرد کە زەهرا بەئاستەم گوێی لێدەبوو. موسا کازم ئاغا بەدەنگێکی بەرزەوە گوتی: "زەهرا، کێیە؟"

"گەورەم، ئاغای بەڕێزمان، منم لێنا. "یەکسەر بەرەو لای ئەو چوو، هەر لەگەڵ ڕۆیشتنیدا بۆلای ئاغا، ئاوڕی دایەوەو بەزەهرای گوت: "باشە، زۆرباشە."رووی کردە موسا ئاغاو گوتی: "گەورەم، ئاغای بەڕێزمان، پۆیراز بۆ بەرچایی بانگهێشتی کردوویت. دەڵێت ئەو شانازیەمان پێببەخشێت و ئەم بەیانیە نانمان لەگەڵدا بخوات زۆر خۆشحاڵ دەبم. دەڵێت ئەگەر بەرچایشتان خواردبێت هەربێت و قاوەیەکمان لەگەڵدا بخواتەوە."

لێنا کاتێك بەیۆنانی قسەی دەکرد، جوانتر دەینواند.

"هەر ئێستا دێم، مەمنونم لێنا. بەپۆیرازی کوڕم بڵێ بەرچایمان نەخواردەوە."

رووی کردە کچەکان: "کاکە پۆیراز بەدڵنیاییەوە دەیەوێت شتێکمان پێبڵێت. ببوورن دەبێت بچم."

"خواحافیزت بێت باوکە."

کاتێك باوکیان لەپلیکانەکان دەچووە خوار، رووبەڕووی یەك راوەستابوون و پێدەکەنین. هەموو شتێك لەسەر مێزی نانخواردن داندرابوو، لەشیری مامرەوە تا گیانی بنیادەم.

دوای نانخواردن موسا ئاغا گوتی:

"ساڵ و نیوێك، دووساڵ دەبێت بەرچاییەکی ئاوا مشەو پوختەم نەبینیوە."

پۆیراز لەو قسانەی موسا ئاغا تاسابووو نەیدەزانی دەبێ چی بڵێت، چەند جارێك لەسەریەك گوتی سوپاست دەکەم، سوپاست دەکەم. لێنا بەزمانی یۆنانی قسەی خۆش خۆشی دەکرد. بەو قسانەی رەسەنایەتی و شکۆمەندی خۆی بە موسا ئاغا نیشان دا، جا چەند جوان نیشانی دا."

تانزیکەی نیوەڕۆ ئاوا دانیشتن و قسەیان کرد.

دواجار پۆیراز گوتی: "گەورەم، هیوادارم نیگەرانم نەکردبن."

موسا ئاغا گوتی: " تکادەکەم..."

"ئاغا بۆ چوونەوەتان بۆ کرێت هەندێك بیرۆکەم هەن."

"بڵێ کوڕم."

"ئێوە ساڵو نیوێك دووساڵ پێش ئێستا هاتوونەتە تورکیا، وانیە؟"

موسا ئاغا بە ئەدایەکی نەرم و شیرین گوتی:
"نەهاتین کوڕم، دووریانخستینەوە."
"بەڵێ ئاغا، دوور خرانەوە. لەوساوە چاوەڕێین، بەڵام هەواڵێك نەهاتووە، وانیە؟"
"نەهات، دەبوا بۆ کوێ هاتبا، من خۆ لەسێ چوار مانگ زیاتر نەمتوانیوە لەهیچ جێگایەك گیر ببم، لەکوێ دەتوانن بمدۆزنەوە. لەو کاتەوەی دەرچووین ناونیشانێکی جێگیرمان نەبووە."
"مەگەر ناونیشانی دوورگەمان نەنارد؟"
"مەگەر ئەوەی لە بەر چاوان رۆیشت لەبەر دڵانیش ناڕوات!"
رەنگە بڕوات رەنگە نەشڕوات، پەیوەندیی بەکەسەکانەوە هەیە."
"راوەستە"
"بەڵام من بیرۆکەیەکی دیکەم هەیە. رەنگبێت بیرۆکەیەکی باش بێت."
"چ بیرۆکەیەك."
"ئاغا، لە رحا، لەسەردەمی شەڕی نیشتمانی، ئێمە فەرماندەیەکمان هەبوو کە ئێستا بۆتە نوێنەری ئەنجومەن. لەکەسە نزیکەکانی مستەفا کەمال پاشایە.
منی زۆر خۆش دەوێت و متمانەی پێم هەیە. ئێمە دەتوانین بەیارمەتی ئەو بچینە باڵیۆزخانەی یۆنان و لەگەڵ باڵیۆز قسە بکەین، بەڵکو ئەمە باشترین و تاکە رێگا بێت.
موسا ئاغا زۆر خۆشحاڵ بوو، ئەوەندە خۆشحاڵ بوو کە خەریکبوو لە خۆشیان باڵ بگرێت، بەوروژانەوە گوتی:
"کارەکە، تەواوە، تەواوە، تەواوە،." هەستاو گوتی: "تەواوە، تەواوە،." و دانیشتەوە. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا: "کەوایە بەمزوانە دەگەڕێمەوە ماڵەکەم، وڵاتەکەم، لای دۆستەکانم، چیاکانم، دەریایەکەم، لای ئەسپەکانم!"
وروژابوو کە نەیتوانی پێش بە خۆی بگرێت و گوتی: "تۆشمان لەگەڵ دێیت."
لەو قسەیە پەشیمان بووەوە. "دێیت کرێتی جوان دەبینیت و دەگەڕێیتەوە. هەر مرۆڤێك بیژێت لەم دنیایەدا ژیاوم دەبێت پێش مردنی کرێت ببینێت. ئێستا ئیدی بابڕۆین، خواحافیز. کرێت خۆت بگرە واهاتین."

بەخێرایی لەپلیکانەکان چووەخوار، بەڕاکردن و هەناسەبڕکێوە خۆی گەیاندە ماڵەوە، بەر لەوەی بچێتە سەرەوە بە هاوارکردنێکەوە گوتی:

"کچەکان، کچەکان، زووبن وەرن، رەنگبێت بەمزوانە بگەڕێینەوە کرێت."

کچەکان ئەوەندە بەخێرایی لەپلیکانەکان دابەزین کە لەچاوقوچانێکدا خۆیان لای باوکیان بینیەوە.

"دەچێتە ئەنقەرە، لای باڵیۆزی یۆنان. خوا خێری بنووسێت پۆیرازی کوڕم، عەلی پشت و پەنای بێت. ئەمە بیرۆکەی ئەو بوو. من قسە لەگەڵ باڵیۆزی یۆنان دەکەم. یۆنانیەکەی من دڵی باڵیۆز بەردیش بێت نەرم دەکات. رەنگبێت ناوشی ببیستم. هەرکەسێك بەسەرهاتی ئێمە لەزمانی منەوە ببیستێت دڵی ئەگەر ئاسنیش بێت دەتوێتەوە. ئادەمیزاد دەتوانێت ئەو بەڵاو نەهامەتیانەی بەسەر ئێمە هاتوون قبوڵ بکات؟ ماڵ و حاڵ و مەزارگەی باو باپیرانت جێبێڵە و لەو سەر عومرەدا بڕۆ وڵاتێك کە نازانی کوێیەو لەژێر فشارو سەختیدا بژی. خوا ئەمە قبوڵ دەکات، ویژدانی مرۆڤ دەتوانێت لەبەرامبەر ئەو کارەسات و بەڵایانەی بەسەرمان هاتوون بەرگە بگرێت؟ راستە من تورکم، موسڵمانم، جگە لەوە چ گوناهێکم هەیە؟ من چ خراپەیەکم لەگەڵ یۆناندا کردووە؟ لەپای چی وەکو بەچکە پشیلە پشت ملیان گرتم و لەکرێتەوەوە فڕێیاندامە ئێرە؟ من جگە لەبەخێوکردنی ئەسپگەلی رەسەن چی دیکەم بۆ یۆنان کردووە، بۆ تورکەکان، جگە لەوەی وەك تورك و موسڵمان ماومەتەوە چیمکردووە، چ خراپەیەکم دەرهەقیان کردووە؟ کێ ئەو بەڵایەی بەسەرمان هێنا؟ ئێمە لەگەڵ یۆنانیەکان لەگەڵ ئەوەشدا جارجارێك تێکهەڵچوونێکمان دەکرد، زۆرباش دەژیایین؟ ئێژن سەبەبکاری ئەونەهامەتیە مستەفا کەمال پاشا و ڤێنیزلوس بووە. نا، نا، درۆیە، درۆیە. سەبەبکاری ئەمە شارستانیەتی ئەورووپا بووە. هەموو ئەورووپا لە کۆنفرانسی لۆزان ئەو بەڵایەیان بەسەرمان هێنا. دڵی ئەورووپا لەبەردو ئاسن دروستکراوە. هەموو وڵاتانی ئەورووپا دەنگیان لەسەردا، ئێمەیان لەسەر ماڵ و حاڵو ژیانمان دەربەدەرو ئاوارە کرد. هەر بژی لێنا کە رایکردو گەڕایەوە دوورگەی خۆی. ئێستا بەئاسوودەیی لە دوورگەکەی خۆیدا دەمرێت و حەسرەتی ئاوارەیی ناخوات. ئەزیش دەگەڕێمەوە کرێت و ئەم حەسرەتە لەگەڵ خۆمدا نابەمە گۆڕەوە."

تائێستا پێشینەی نەبوو موسا ئاغا ئاوا بەرز بەرزو خێرا خێرا قسان بکات. کەس لەماڵێ نەمابوو، هەمووان چووبوونە ژێرچنارەکان، بەپێوە وەستابوون، روویان کردبووە موسا ئاغا کە

بەهاوارکردن و دەمی کەفکردووەوە قسەی دەکرد، کەس متەقی لەدەمەوە نەدەهاتە دەر، دەتگوت هەناسەش هەڵناکێشن. لێنا لەبەردەم خەڵکەکە دانیشتبووو دەستەکانی بەئەژنۆکانی دادەدان و دەگریا، موسا ئاغا بەبینینی لێنا یەکسەر بێدەنگ بوو، چوو دەستی گرت و هەڵیستاندەوە، گوتی: "وەرە لێنا وەرە بابچینە ماڵی ئێمە. تۆ، لەوڵاتی خۆتی، حەسرەت لەچی دەخۆیت. تۆ لەزێدی خۆتدا بەخاك دەسپێرن."

موسا ئاغا ئەم قسانەی بەیۆنانی کردن.

لێنا دوای ئەوەی خاچی لەسەر سنگی خۆی کێشا، بەیۆنانی گوتی: "خوا تۆ بەزوویی بۆ نیشتمانت، بۆ کرێتی جوان دەگێڕتەوە."

موسا ئاغا هەر لەگەڵ ئەوەی پشتی خۆی وەرسووڕاند، پۆیرازی بینی. پۆیراز زەرد هەڵگەڕابوو. ئەو رەوشەی پۆیراز لەبەرچاوی موسا ئاغا شاراوە نەبوو. بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

"ئێستا بابچینەوە ماڵ. زۆر خۆشحاڵ بووم، ئومێدێکی گەورەیە. زۆرم قسەکرد لـێ چیبکەم، دەزانیت کوڕم، ئەم تاراوگە ترسناکە، گەورەترین تاراوگەی مێژووە. لەو دوو ملیۆن کەسەی دووریانخستنەوە لە هیچکامیان نەپرسی دەتەوێت بچیت یان نا. ئەم دوورخستنەوەیە تایبەت بە شارستانیەتی ئەوروپایە. هەرچی بوو، بوو. خۆمان لە ئاوو ئاگردا. بەڵام هیچمان پێنەکرا. یاساکانی ئەوروپا بەهێزن، مەگەر گازی ژەهراویش هەر ئەوان دروستیان نەکرد؟ سوپاسی تۆ دەکەم کوڕەکەم. تۆ بوویتە مایەی ئەوەی ئارام ببمەوە."

لەسەر مۆبلان دانیشتن و قسەیان کرد. موسا ئاغا کەم کەم ئارام بووەوە. قسەی باش و جوانو ئومێدەوارانەیان کردن. باسی بەخێوکردنی ئەسپگەلی رەسەن لە کێلگەشیان لەبیر نەکرد. کە سەیری دەرەوەیان کرد بینیان باران وەستاوە.

موسا ئاغا گوتی: "هەر ئێستا با بچینە دەرەوە."

"هەموو جێگایەك قوڕو چلپاوە، ناتوانین بەرێگادا بڕۆین."

موسا ئاغا گوتی: "باشە، بەڵام تەختەکان تەڕن، بانگی کچەکان بکەم بێن پاکیان بکەنەوە."

"من دەچم بانگیان دەکەم ئاغا." بەڕاکردن رۆیشت و لە دەرەوە بەدەنگێکی بەرز بانگی کردن: "زەهرا خانم، نەسیبە خانم، مام ئاغا کاری پێتانە."

زەهرا هەر کە گوێی لەدەنگی بوو هاتە باڵکۆنەکە. پێکەنینی لەسەر لێوان بوو. تا زیاتر پێدەکەنی گۆناکانی زیاتر جوان دەبوون و لەقووڵدا دەچوون.

زەهرا چووە خوارەوە، دوای ئەوەی کە ماوەیەك بەرامبەر پۆیراز راوەستا، بەرەو لای چنارەکان رایکرد.

"کارێکت هەبوو باوکە."

"سەیرکە کچم ئێروکانە تەڕە، لەبەر ئەو قوڕەش ناتوانین پیاسە بکەین، ئەگەر پارچە پەڕۆیەك هەبێت..."

"هەر ئێستا باوکە."

بە راکردنەوە چووە ماڵ، پۆیراز لە دواوە سەیری کرد، لە بەر خۆیەوە گوتی، ئەی خوای گەورە.

زەهرا لەچاوتروکانێکدا بە خاولیەکەوە هاتەوە. تەختەکانی پاککردەوە، بە پۆیرازی گوت:

"فەرموون بەڕێز." رۆیشت.

جارێکی دیکە لە بارەی کرێتەوە قسەیان کرد، خەڵکی کرێت، چیاکان و دەشتەکانی، بەتایبەتی ئەسپەکانی... هیچ کەس لەوێ نەبوو. پۆیرازیش لەبارەی تورۆسیەکان، ئۆزۆن یایلا، چوکورۆڤاو دەریای میدیتەرانە قسەی کرد.

"کەوایە تۆش خەڵکی میدیتەرانەیت؟"

"خەڵکی بین بوغام. ئێمە بەچیاکانی تورۆس ئێژین بین بوغا، ئاغا."

"واتە تۆش خەڵکی میدیتەرانەییت؟ "

ئاواش دەکرێت بڵێین. چیاکانی ئێمە وەکو هیلالێکن بە دەوری چوکورۆڤاو میدیتەرانە، واتە وەکو مانگی تازە..."

"دەریای میدیتەرانە دوو دوورگەی ئێمەیشی گرتوون." موسا ئاغا چاوی بڕینە نێو چاوی پۆیراز. پۆیراز چاوەکانی بۆ ئەملاو ئەولا وەردەگێڕان، تاوێك بۆ پێشەوە، بۆ دەستەکانی موسا ئاغا، بۆ ئەو ئاوەی کە لە سەروچاوەی کانیەکە هەڵدەقوڵاو شۆڕ دەبووەوە، پاشان دیسان سەیری موسا ئاغای دەکردەوە. نیگای موسا ئاغا کە جێگیر مابووەوە، لە نیگاکانی ئەو هەڵدەنگوت. هەرچی دەیکرد سەیری هەر لایەکی دەکرد نەیدەتوانی خۆی لە دەستی ئەو چاوە سەوزە پۆڵاینیانە دەرباز بکات کە دروست لە چاوەکانی ئەو رامابوون. هەرجارێك نیگاکانیان تێکدەئالاّ، پۆیراز وەکو ئەوانەی جادوویان لێدەکرێت ئاوا لەشوێنی خۆی مات دەبوو.

بێدەستی خۆی گوتی:"فەرموو ئاغا."

"تۆش بە میدیتەرانەیی دەژمێردرێیت. ئەگەر کارەکەمان جێبەجێ ببێت تۆش لەگەڵ ئێمەدا دێیت و لە کێڵگەکەمان دەمێنیتەوە. وەك من ئاگادار بم چەرکەسەکانی قەفقاز باشترین سوارچاك و بەخێوکەری ئەسپان بوونە. ئەوان لەهەموو خەڵکی دنیا زیاتر ئەسپیان خۆشویستوە. هەموو چەرکەسەکانی ئەنەدۆڵ و عارەبستانیش دوورخراوەکانی قەفقاز بوونە."

" بەڵێ ئاغا، دوورخراوەین ئاغا."

"بۆنی میدیتەرانە لە هەموو جێگایەك هەریەك بوونە. لەکریت، چوکورۆڤا، تورۆس، یۆنان، فەرەنساو ئیسپانیا. مەبەستم ئەوەیە کە ئەگەر ڕێگایان بە ئێمەدا بچینەوە کریت تۆش لە گەڵماندا دێیت، مەگەرنا؟"

موسا ئاغا دووبارە چاوی بڕینە نێوچاوی پۆیراز، ئاوا تێکڕامان. پۆیراز نیگای وەرگێڕا. هەموو گیانی بووبووە ئارەقە.

"لەکریت نەك شێخەکانی عارەب شاو میرەکانی عارەبانیش ناتوانن بتدۆزنەوە. لەبیرنەکەیت، کریت دوورگەیەکە لە نێو دەریای میدیتەرانە.

ئەمە باوەڕ بکە پۆیراز کوڕم، کوڕم نیە، کاتێك تۆم بینی دڵم گەرم داهات، کوڕم نەبوو، خواوەند تۆی لە جیاتی کوڕ بۆمن ناردە ئەم دوورگەیە. تۆم لەکوڕی خۆم خۆشتر دەوێت و نامەوێت کوڕەکەم بەگوللەی عارەبێك بکوژرێیت."

"هەر بژیت مام ئاغا، منیش تۆم وەکو باوکم خۆش دەوێت."

خۆیان بۆ سەفەر ئامادە کرد چەند ڕۆژ دواتر بەرەو ئەنقەرە وەڕێ کەوتن. پۆیراز قەت نەچووبووە ئەنقەرە، تەنها برادەرێکی ملازمی هەبوو کە کاتی خۆی پێکەوە لە ڕحا دژی فەرەنسیەکان جەنگابوون. هەرکە گەیشتە ئەنقەرە سۆراغی ملازمیان گرت و چوونە لای. ملازم باشترین میوانخانەی ئەنقەرەی بۆ دۆزینەوە. میوانخانەکە بەرامبەر ئەنجومەنی گەورەی تورکیا بوو. دوای ئەوەی کە لە میوانخانەکە جێگیر بوون، ملازم بردنیە باشترین خواردنگەی ئەنقەرە، دووەم ڕۆژیش هاتە میوانخانە، ئەوان هێشتا لە خەو هەڵنەستابوون، چاوەڕێی کردن، فراوینیان پێکەوە خوارد. ملازم ژوانی بۆ لە فەرماندەی کاتی خۆیان وەرگرتبوون، خۆشحاڵ بوون. ملازم گوتی:

"عەباس، فەرماندە تۆی هەر بەبیرە. گوتی، کوڕە ئازاکەی من باشە. ئەوەی پێویست بوو پێمگوت. بە منیشی گوت هەر کاتێك مەدالیای سەربەخۆییت بە بەرۆکەوە دەبینم شانازی دەکەم. فەرماندە لەکەسە پلە یەکەمەکانی مستەفا کەمال پاشایە."

ملازم جلوبەرگێکی نوێ و ئوتوکراوی کردبووە بەرو مەدالیای سەربەخۆییشی بەبەرۆکەوە دەدرەوشایەوە.

بڕیاریان کاتژمێر پازدە بوو لە ئەنجوومەن. شەلوارەکەی موسا ئاغا کە پارچەکەی ئینگلیزی بوو هێشتا دەقی نەشکابوو. کراواتێکی خاڵداری بە خاڵی شین و سپی لە سەر کراسە سپیەکەی بەستبوو و پێڵاوێکی بێقەیتانی نوێی کردبووە پێ. کڵاوە گوفکەدارەکەشی مۆرێکی تۆخ بوو. ریشە ماش و برنجیەکەی شانە کردبوو و سمێڵەکانی کشت کردبوون. بەو قەدو قامەتە شلو باریك و توندو بەندەیەوە هەستی رێزگرتنی بەرامبەرەکانی دەجووڵاند. پۆیرازیش زۆر رێك و پێك دەینواند. جلوبەرگی ئەویش لە هی موسا ئاغا کەمتر نەبوو. ملازم مەدالیاکەی بەسەر سنگی چاکەتە شینەکەیەوە دەدرەوشایەوە.

دروست سەری سەعاتی یازدە، لە ئەنجومەن، لەبەر دەرگای ژووری فەرماندە بوون، ملازم لە دەرگای دا. لە ژوورەوە دەنگی فەرماندە بیسترا، گوتی وەرە ژوور. یەکەمجار موسا ئاغاو دواتر ملازم و دوای ئەوانیش پۆیراز چوونە ژوور. فەرماندە هەر لەگەڵ بینینی پۆیراز بەقەدو قەڵافەتی گەورەو ورگی بەرزبوویەوە لەپشت مێزەکەیەوە هەستا، دوو هەنگاو هاتە پێشەوە. پۆیراز یەکسەر چوو دەستی گرت و ماچی کرد. موسا کازم ئاغاش لە فەرماندە نزیك بووەوە دەستی گرت و گوشی. فەرماندە گەڕایەوە پشت مێزەکەی، شوێنی نیشاندان و دانیشتن.

"ئێ، عەباس بێژە بزانم دوای جەنگ چوویتە کوێ؟"

پۆیراز بۆی باس کرد کە دوای جەنگ چیکردووە و چۆتە کوێ و دواتر چۆن لە دوورگە جێگیر بووە.

فەرماندە پرسی: "تۆ بلێیت خەڵکی گوند کوێوە چووبن؟"

پۆیراز گوتی: "نازانم فەرماندە."

"بۆچی ناوی خۆت کردۆتە پۆیراز؟"

"ئەمەیان خۆت دەیزانی فەرماندە. ئەو کاتەی لەگەڵ فەرەنسیەکان شەڕمان دەکرد هەموومان نازناوێکمان هەبوو. ئەو نازناوەی پۆیرازیشیان دانایە سەر من."

"دەزانم ناوی تۆ پۆیرازە کوڕم. پێموابێت من ناوم نایت پۆیراز. مەدالیاکەشت لە پای ئەمەوە وەرگرت، هەروەها لەپای چالاکیە قارەمانەکانی دیکەت."

"سوپاست دەکەم فەرماندە، دەستەکانت ماچ دەکەم."

"بۆچی وازت لە سەربازی هێنا؟"

"بەهۆی کەمئەندامبوون خانەنشینیان کردم. لە شانی راستمەوە بریندار بووم. پەراسووەکانیشم لە دەست دان. من نەمدەویست، بەڵام خانەنشینیان کردم."

"خانەنشین دەکەن کورم، لەگەڵ شێخی عارەبان چیتانکرد؟"

"ئەو هۆزە کۆچەریە لایەنی فەرەنسیەکانی دەگرت. زۆریان لێکوشتین، بە تایبەت هێزەکانی بەرگری میللی."

"ئەمە دەزانم."

"ئێمەش شەوێك هێرشێکمان بۆ کردن، شەڕێکی بێئامان روویدا. ئێمە زۆرمان شەهید دان، لەکۆچەرەکانیش زۆر کوژران. پێکدادان تا بەرەبەیان بەردەوام بوو. کۆچەرەکان من و هاوڕێکانمیان ناسی."

"دەزانم، ئێوەش بەزەحمەت توانیتان خۆتان دەرباز بکەن."

"بەڵێ وایە فەرماندە."

"پاشان تۆش ون بوویت."

"شێخ هێشتا بەدوامەوەیە."

"تۆش چوویت خۆت لە دوورگە پەنادا، مەگەر نا؟."

"دوورگە زۆر جوانە. ئەم بەڕێزە خەڵکی دوورگەی کرێتە، لەوانەیە کە گۆڕدراونەتەوە. دوو دکتۆریش هاتوونەتە دوورگە. لە چاناك قەڵا، لەشەڕی سەربەخۆییدا بەشداریان کردبوو. لەدوورگە نەخۆشخانەیەکیان دروست کردبوو، بە برینداەکانی چاناك قەڵا رادەگەیشتن. ملازمێکی دووی پزیشکی ئاژەڵانیش لەوێیە. هەموویان بە هۆی کەمئەندامبوونیانەوە خانەنشین کراون."

"زۆر باشە، زۆر باشە، هاوسەرگیریت کردووە؟"

پۆیراز بە شەرمەوە:

"هێشتا نەمکردووە."

دیسان کەمێك لەو بابەتانە قسەیان کرد. فەرماندە کەمێك بیری کردەوە و ئینجا سەری هەڵبڕی پرسی:

"داواکارییێکتان هەیە؟"

"تکایەکمان هەیە فەرماندە. واتە موسا کازم ئاغا داواکارییەکی هەیە."

موسا ئاغا لەکاتێکدا لەپی دەستەکانی لێکدەخشاندن گوتی:

"داخوازیەکم هەیە رێزدار. یۆنانیەکان ئێمەیان لەسەر خاك و ئاومان دەرکرد. دەمەوێت ئەمەت عەرز بکەم کە ئەوان هیچ لەئێمەیان نەپرسی داخۆ دەمانەوێت برۆین یان نەڕۆین. من لەکرێت کێڵگەیەکی گەورەم هەبوو. لەو کێڵگەیە سەد ساڵ، بەڵکو سێسەد ساڵەیەماندا هەمیشە هەر ئەسپی رەسەنمان بە خێوکردوون. ئەسپە رەسەنەکانی ئێمە هەروەك چۆن لە یۆنان بە ناوبانگن ئاواش لەئەوروپا ناوبانگیان هەیە. فەرماندەی بەڕێز، هەموو دارونەداری من لەوێیە. مەزارگەی باو و باپیرانیشمان لەوێیە. باوك و مامەکانمان لە کرێت جەنگاون و مردن. ئەو نیشتمانی ئێمەیە. خوێنێکی زۆرمان لە پێناو کرێتدا داوە. یۆنانیەکان کاتێك بان بەلایەك و باگردان بەلایەکدا کەوت و جەنگ کۆتایی هات، گوێیان گرتین‌و فڕێیان داینە دەرەوە. ئایا رەوایە ئەو رەفتارەمان لەگەڵدا بکەن؟"

فەرماندە بە ئەدایەکی توندو تووڕەوە گوتی:

"مەگەر ئێرە نیشتمانی ئێوە نیە؟"

"هەڵبەت ئێرە نیشتمانی منە. من خوێندنی باڵام لە ئیستەنبۆڵ تەواو کردووە. ئێمە سەدان ساڵ ساتێك چیە نیشتمانی خۆمان لەبیر نەکرد. نە زمانمان و نە دین و تورکبوونمان لەبیر نەکردووە، لێ، فەرماندەی بەڕێز، ئێمە ئەمجارە بەبێهیچ جەنگێك شکستمان خوارد. ئەمە هەرگیز بۆ ئێمە بەرگە ناگیرێت. ئێمەیان وەکو سەگان راونا."

"نەخێر ئێوەیان راونەنا." دەنگی فەرماندە ئەمجارە لێبڕاوترو تووڕەتر بوو."ئێمە ئێوەمان بە بەهای خوێن لە یۆنانیەکان وەرگرتەوەو هێنامانەوە ئێرە، نیشتمانی خۆتان."

"دەریانکردین فەرماندە."

فەرماندە نەڕاندی گوتی: "نا"و هاوکات مستی لە مێزی بەردەمی داو بەورگی دەرپەڕیویەوە هەستا. "ئێمە بەهێز ئێوەمان لە یۆنانیەکان وەرگرتەوە، چونکە نەماندەویست لەوێ رووت و رەجاڵ و ئاوارە بن، سووکایەتیتان پێبکەن، بتانپلیشێننەوە. لەکۆنفرانسی لۆزان لەگەڵ هەموو ئەوروپا، لەگەڵ هەموو زلهێزەکان دەرگیر بووین تا توانیمان ئێوە بۆ نیشتمانی ئەسڵی خۆتان بگێڕینەوە. دەوڵەتی ئێمە بەو هەژاری و فەلاکەتەشیەوە جێگای بۆ دابین کردن، ورگی تێر کردن. دۆستی هێژا ئەگەر رازی نیت برۆ، بۆ هەر جێگایەك دەتەوێت برۆی برۆ، بۆ کرێت یان ئەو دیوی دنیا. ئەو وڵاتە هیچ پێویستی بە کەسانی وەك ئێوە نیە. کاتێك ژن و منداڵی ئەو کەسانەی لەپێناو ئەم نیشتمانە

گیانیان بەخت دەکرد، رووت و برسی بوون، لە گوندو شارو شارۆچکەکانی کە لەلایەن یۆنانیەکانەوە سوتێنرابوون ئاوا رووت و قووت دەمردن ئێمە بەهانایانەوە چووین و لە برسێتی رزگارمان کردن، جلو بەرگمان بۆ دابین کردن، باخ و باخچەمان دا پێیان، کێڵگەمان دانێ. ئێوە، ئێوە، ئێوە، ئێوە ئیدی نیشتمانەکەتان پەسند ناکەن، دەتانەوێت نۆکەری یۆنان بن."

فەرماندە بە تووڕەییەوە لەجێی خۆی دانیشتەوە، کورسیەکە بە توندی سووڕا و جیڕەی لێوەهات. روخساری موسا ئاغا وەك کاغەز سپی هەڵگەڕابوو و هەموو گیانی لەبەر ئارەقە هەڵاتبوو و چاوەشینەکانی بچوك بچوك بووبوونەوە.

"کەواتە دەتەوێت خاکی خۆت، نیشتمانی وەکو بەهەشتی خۆت بە جێبێڵیت، بچیتەوە لای برا یۆنانیەکانت، ها؟"

"هەر وایە فەرماندە، من لەوێ لەدایك بوومە فەرماندە. مەزاری باوو باپیرانم لەوێیە."

"کەواتە دەتەوێت ئەسپی رەسەن بۆ یۆنانیەکان بەخێو بکەیت؟"

"وایە فەرماندە، بەڵام خۆم پیر بووم. کاتێك دەهاتین ژنەکەشم لەنێو کەشتیدا مرد، تەرمەکەیم فڕێ دایە نێو دەریا تا ببێتە خۆراکی ماسیان."

"مەگەر چما هەر ژنی تۆ لەو جەنگەدا مردووە، ژنی زۆر کەس مرد. ژنان و کچان و منداڵانیان لە مزگەوتان و لە ماڵان خڕ دەکردنەوەو دەیانسووتاندن، هەمان ئەو برا یۆنانیانەی تۆ."

"ئەو یۆنانیانە برای من نین."

"ئەی بۆچی بۆ کوێ دەچیت؟"

ئەدای کەمێك نەرمتر بوو بوو، روخساری تووڕەی وەك بڵێیت کەمێك ئارامتر بووبووەوە.

"بۆ زێدی خۆم، بۆلای دراوسێکانم، دۆستەکانم."

لەپڕ حاڵەتی دەم و چاوی فەرماندە گۆڕا، دیسان بە مست بە مێزەکەی داکێشا:

"بۆ زێدەکەت؟"

"بۆ زێدەکەم"

"لای دۆستە یۆنانیەکانت؟ هەمان ئەو دۆستانەی کە ماڵەکانیان سووتاندن و ژیانی خەڵکەکەیان تاڵ کرد؟"

موسا ئاغا هێشتا ئارام و لە سەرخۆ بوو، نیگای هەمان حاڵەتی میهرەبان و سۆزدارانەی پێشتری هەبوو.

"بەڵێ فەرماندە، ئەوان دراوس و دۆستانی منن. باوو باپیرانی من لەگەڵ باوو باپیرانی ئەوان شەڕیان کرد، بێبەزییانە یەکدیان کوشت، شەڕەکان کۆتاییان هات و ئاشتی و برایەتیمان کەوتە نێوان."

"تۆ ئیدی بیدەنگ بە، قسەمەکە، قسەکانت شێتم دەکەن.."

ئەمجارە روویکردە پۆیراز:

"هەستە ئەفسەری بێکەڵك."

پۆیراز یەکسەر هەستاو چوو لە بەردەم فەرماندە ئامادە راوەستا.

"ئەفسەری سووك و چروك، تۆ سەرباز نیت، بە جێماوێکی بێکەڵك و هیچ لەدەستنەهاتوویت، تۆ شەرمەزاریت بۆ سەربازی. مخابن بۆ ئەو مەدالیایەی بەسەر سنگتەوەیە. ئەفسەری نزم و نمەکنەناس، ئەو مەدالیایەی بەبەرۆکتەوەیە تەنانەت زۆر لەو فەرماندانەیش کە چوونەتە جەنگ نیانە. من ئەو مەدالیایەم لەپای ئازایەتیەکانتان پێدەدان، دەمدایە ئەوانەی لە ژێر فەرمانی مندا کاریان دەکرد." فەرماندە تا دەیتوانی دەنگی خۆی زیاتر بەرز کردەوە:

"ئەو مەدالیایەم چۆن پێدایت، دەشزانم لێتوەربگرمەوە. ئەوانەی هیچیان لە بارا نیەو ئەو مافەیان نیە، ناتوانن ئەو مەدالیایەیان هەبێت." تا هێزی تێدا بوو نەڕاندی: "ناتوانن، ناتوانن!"

لەم ماوەیەدا کاتێك فەرماندە قسەی لەگەڵ پۆیراز دەکرد، موسا ئاغا بە ئارامی دەرگای نیوەکراوەی کردەوەو لەژوورەکە چووەدەرو چوو لەو لای خۆڵەکە راوەستا.

"تۆ هەر ئێستا بەهۆی هێنانی ئەو سەگەی یۆنان، ئەو شێت و شەیدایەی یۆنان، ئەو بێئەسڵ و نەسەبەی کە نۆکەرایەتی یۆنانی پێ لە نیشتمانی خۆی خۆشترە، دەردەکەم. سەیر بکە هاوڕێکەت بۆی دەرچووە.." لە کاتێکدا کە بە دەنگەکەیەوە هەموو ئەو ناوەی هێنابووە لەرزین، پەنجەی شایەتمانی بۆلای دەرگا کراوەکە درێژ کرد:

"ون بە، خائین. بۆ دەرەوەەەە."

پۆیراز لەکاتێکدا قاچەکانی تێکدەئالآن لە ژوورەکە چووەدەر. سەیری کرد موسا ئاغا لەو سەری هۆڵەکە راوەستاوە. لەکاتێکدا قاچەکانی تێکدەئالآن لەموسا ئاغا نزیك بووەوە. نەیتوانی سەیری موسا ئاغا بکات. بێئەوەی قسەیەك بکەن بۆلای میوانخانەکە رۆیشتن. کاتێك لەسەر مۆبلەکانی میوانخانە دانیشتن، دەتگوت چەندین رۆژە قوڕکاری دەکەن.

دوای ماوەیەك پۆیراز سەری خۆی بە زەحمەت هەڵبڕی، بەڵام ئەمجارەش نەیتوانی سەیری ئاغا بکات. گوتی:"ببوورە گەورەم" سەری خۆی نەوی کردەوە.

"دڵگران مەبە کوڕم، ئەمانە وەهان. فەرماندەکەت پلەکەی چیە؟"

"سەرگورد بوو، ئاغا."

"دڵگران مەبە، من خۆم سبەی بەتەنێ دەچمە باڵیۆزخانەی یۆنان و قسەیان لەگەڵدا دەکەم. بەڵکو هەم..."

پۆیراز گوتی:"ئینشاللا."

"من تۆم زۆر نیگەران کرد کوڕەکەم. دەتوانن مەدالیاکەت لێوەربگرنەوە؟"

"ناتوانن، بەڵام ئەگەر ویستیان وەریبگرنەوە با وەریبگرنەوە، وەریبگرنەوە چ دەبێت؟. من خۆ خوێنم لەبری مەدالیا نەداوە."

بێدەنگ بوون. پۆیراز نەیدەتوانی سەیری رووی موسا ئاغا بکات، نیگەران بوو. کارێکی چەند هەڵەی کردبوو کە بە موسا ئاغای گوتبوو بچێتە ئەنقەرە، هێنابووی و خستبوویە ئەو بارودۆخە ناهەمەوارە. خۆزگە زەوی شەق دەبوو و ئەوی قووت دەدا. مردن زۆر لەو شەرمەزاریە باشترە. چۆن دەیتوانی سەیری زەهرا بکات؟ موسا ئاغا کەسێکی پێگەیشتوو بوو، دەیتوانی ببەخشێت. هەر جارەی بەزێرەکی سەیری موسا ئاغای دەکرد، هەرجارێك ئەو روخسارە پەشۆکاوە، کە تەواو پیرو تۆراو بووبوو لە هەموو دنیا، ئازار چنگی لەجەرگی گیر دەکرد. ئێستا دەبوا چیکردبوا، چۆن دەبوا قسەی لەگەڵ خەڵك و زەهرا کردبوا؟ بەڵام زیاتر لە موسا ئاغا سوکایەتی بەو کردبوو. موسا ئاغا زیاتر لەبەر من هەراسان و دڵگرانە تا خۆی.

پۆیراز ئاوا خۆی دەخواردەوە کە لەپڕ ملازم بە حاڵەتێکی نائومێدانەو شەکەت لەچوار چێوەی دەرگاکە بەدەرکەوت، هەردووکیان هەستان، تۆقەیان لەگەڵدا کرد، فەرموویان لێکرد دابنیشێت.

"خۆزگە ئێوەم نەبردبوایەتە لای ئەو. کاتێك فەرماندە دەمی کردەوە، وەك ئەوە وابوو ئاوی کوڵاوم بەسەردا بکەن، سەیرمکرد رەنگبێت هەڵەیەك بکەم، بەرگەم نەگرت، بیرمکردەوە، ئێوەم خستە چ کێشەیەکی ناخۆش، لەوێ رامکردو هاتمە ئێرە، نەمتوانی چاوەڕێتان بکەم. پێمپێوەنا لەوێوە بۆ ئێرەو بۆ وێستگەو لە وێشەوە بۆ میوانخانە چووم و هاتم. تکا دەکەم من ببورن."

موسا ئاغا بە ئارامی سەری هەڵبڕی و گوتی:"ملازم، کوڕم، پێویست ناکات داوای لێبوردن بکەیت، لێیبگەڕێ با ئەو نەهامەتیانەی بەسەرم هاتوون بۆت نەگێڕمەوە.

تا گەیشتینە دوورگە ئەم دووچاوەی من تۆ بڵێ چیان نەبینی و ئەم گوێیانە چیان نەبیست، بەسەختی توانیم خۆم بگەیەنمە دوورگە. کاتێك بینیم دوورگە دەڵێی بەهەشتەو خەڵکەکەی هەریەکەیان فریشتەیەکە بۆ خۆی، سەرم سوڕما، بەڵام زێدی مرۆڤ شتێکی دیکەیە. وەکو ئەوە وایە کە دڵی مرۆڤیان لە شوێنی خۆی هێنابێتە دەر. هیچکات کرێتم لە هزرو خەیاڵ دەرناچێت. لەوکاتەی خۆم رادەستی ئەوە کردووە کە بمێنمەوە شەوو رۆژ هەر بیر لە خاك و زادگای خۆم دەکەمەوە. بەیانی کاتێك لەخەو هەڵدەستم واهەست دەکەم لەکرێت لەماڵەکەی خۆمم، بەڵام دواتر دەبینم لەشوێنێکی دیکەم لەغەریبایەتیم. بەیانیان کە لەو دوورگەیە لەخەو هەڵدەستم، لەو هەستەی تەنیایی کە سواری ملم دەبێت دەترسم. وەك ئەوەی خوو بە دوورگەوە بگرم و زادگای خۆم لەبیر بکەم. لە خووگرتن و لەبیرکردنەکەی خۆم دەترسم.

ببورن رۆڵە خۆشەویستەکانم، ئێوەم زۆر نیگەران کرد، بەڵام چیبکەم دڵم دەیەوێت بچمەوە کرێت و لەوێ بمرم، من داوای لێبوردن لە هەردووکتان دەکەم."

موسا ئاغا هەروەك خەریك بوو قسەی دەکرد، پۆیراز هێدی هێدی هاتەوە سەرخۆی کە بتوانێت قسە بکات.

"من داوای لێبوردنتان لێدەکەم، هەزار جار داوای لێبوردن، لەجەنابی نەقیبیش هەروا..."

نەقیب گوتی:"راستە کە فەرماندەی ئێمە هەمیشە کەسێکی وشكو رەقەکاربووە، بەڵام تا ئەم رادەیە، قەت ئاوام نەبینیوە قسەی ناشیرین بەسەربازێك بڵێت، یان ئاوا بێڕێزی بەکەسێك بکات. تۆ بڵێیت پیاو کە بووە نوێنەری ئەنجوومەن دەبێت ببێتە ئەو جۆرە پیاوەو مرۆڤایەتی لەبیر بکات؟"

"ئادەمیزادە کوڕم، هەندێك لەمرۆڤەکان ئەمڕۆ جۆرێکن سبەی جۆرێکی دیکەن. نیگەران مەبن هێشتا گەنجن، شتی زۆر زیاتر دەبینن. من تا بڵێی ئەوشتانەم بینیون، بۆیە خوا شاهیدە ئەو رەفتارەی فەرماندەکەتان ئەوەندە کاری تێنەکردم. بەسە ئێوە نیگەران مەبن."

حاڵەتی سەرو سیمای پۆیراز وەکو هی منداڵانی لێهاتبوو، فرمێسك لەچاوەکانی قەتیس مابوون، ئەبرۆ پڕەکانی تەڕبووبوون.

"ئاغا، باوکم لەسەرووی نەوەدساڵیەوە بوو کە مرد، من ئەوەندەی بزانم، باوکم لە ناوچەی قەفقازەوە بۆ هەرێمی تورۆس کۆچی کردبوو، هەرێمی تورۆسیش بەهەشتێك بوو، باوکم تا ئەو دەمەی مردیش، وەك ئەوەی چیرۆکمان بۆ بکات باسی قەفقاز، ئەسپەکانی قەفقاز، کانیاوەکانی، خەڵکەکەی، گوڵ و گوڵێلکەکانی، باڵندەکانی، جوامێریی خەڵکەکەی بە تایبەت باسی گوڵە

کێویلەکانی رۆخ کانیاوان و سیمورغ، شای باڵندان، کە لەکێوەکان کۆشکێکی هەیە، دەکردو گۆرانی داغستانی دەچڕین. تا دەمی سەرمەرگیش دەیگوت ئاااە قەفقاز ئاااە داغستان."

پۆیراز کاتێك قسەی دەکرد لۆچەکانی دەم و چاوی موسا ئاغا دەکرانەوەو چاوەکانی دەبریسکانەوەو بە هەموو هەستەکانی گوێی دابووە قسەکانی. کە قسەکانی تەواو بوون، واهەست دەکرا بزەیەك کەوتبێتە سەر لێوانی. ئا لەو ساتەدا، ملازم کە کەمێك پێشتر بە تووڕەییەوە لەمیوانخانە دەرچووبوو بەشکۆو هەیبەتێکی سەیرەوە هاتە ژوور. هەستان، دووبارە تەوقەیان لەگەڵ یەکدا کرد. روخساری ملازم هێشتا هەر ترش و نیگەران بوو.

ئەو بەر لەوەی لەسەر کورسی دابنیشێت کە بۆیان دیاریکرد گوتی:

"لەوەی کە ئێوەم بردە لای ئەو پیاوە داوای لێبوردن دەکەم، مام ئاغا دەستتان ماچ دەکەم، من ببوورە."

"تکات لێدەکەم کوڕم، تۆ تەقسیرێکت نیە، ئێمە تۆمان نیگەران کرد."

"هەر وەك پێشتر گوتم ئەو پیاوە پێشتر ئاوا نەبوو، عەباسی براشم ئەوە دەزانێت. لەو نەبەردانەی رووبەڕوومان دەبوونەوە ئەو بەدڵ و بەگیان داکۆکی لێدەکردین و هەمیشە خۆی لەپێش هەموانەوە بوو. ئێستا کە بۆتە نوێنەری ئەنجومەن گۆڕاوە. نازانم چیبڵێم، چیبکەم. کاتێك گوێم لەقسە ناشیرنەکانی بوو، بەرلەوەی تووشی کاردانەوەیەکی خراپ ببم لەوێ هەڵاتم تاکو بەڵایەکتان بەسەر نەهێت. چ مامەڵەیەکی باشی لەگەڵدا کردین! ئێوەم ئازاردا، ببورن."

"ئێستا ئێمە چۆن باڵیۆزخانەی یۆنان بدۆزینەوە، با بچین بزانین لەکوێیە."

ملازم گوتی:"دەچین بە زوویی دەیدۆزینەوە."

چوونە دەرەوە.

ملازم نزیکەی هەموو ئەنقەرەی کە وەکو شارۆچکەیەکی گەورە وابوو پێدەزانی. بە هەورازێکدا هەڵگەڕان، بە بازاڕێکی کۆندا تێپەڕین، بەسەرەوژێرێکدا شۆڕیان کردەوە و لەبەردەم باڵەخانەیەکی لەتەختە دروستکراودا راوەستان.

نەقیب گوتی:"عەباس تۆ لێرە بوەستە، من دەچم ناونیشانی باڵیۆزخانەی یۆنان دەپرسم و دەگەڕێمەوە، تۆ هەر لێرە چاوەڕێ بە."

چووە نێو باڵەخانەکەو کەمێك دواتر گەڕایەوە:

"هێشتا باڵیۆزخانەی یۆنان نەگوازراوەتەوە ئەنقەرە لەئەستەنبۆڵە."

بە نیگەرانیەوە گەڕانەوە لای موسا ئاغا. موسا ئاغا بە نێوچاوانی لۆچتێکەوتوو و حاڵەتێکی نائارام هێشتا لە شوێنی پێشوو دانیشتبوو.

"بۆ دانانیشن، دابنیشن کوڕینە."

دانیشتن، سەیری یەکدیان کرد.

پۆیراز بە دەنگێکی نیوەگیراوە گوتی:

"ئاغا، باڵیۆزخانەی یۆنان لە ئەستەنبۆڵ نەگوازراوەتەوە ئەنقەرە. دەتەوێت بچیتە ئەستەنبۆڵ..."

پۆیراز هێشتا قسەکەی خۆی تەواو نەکردبوو موسا ئاغا بەخۆشحاڵیەوە گوتی:"باشە، باشە، زۆرباشە، ئێمە..."

"ئێمە بە شەمەندۆفەر..."

"هەڵبەت، هەڵبەت. هێشتا هەر لەبیرمە وێستگەی شەمەندۆفەری حەیدەرپاشا. چ ڕۆژانێکی خۆش بوو. ئەو کاتەی لەئەستەنبۆڵ دەمخوێند دۆستانێکم هەبوون، هەر چۆنێك بێت یەکێکیان... ناوی سەعید رەحمی بوو کە باشترین دۆستم بوو. ماڵەکەیان لە کوزقونجوك بوو. کوڕێکی وریا و زیرەك بوو. ئێستاش تەنانەت بە چاوبەستراوی ماڵەکەیان دەدۆزمەوە. ئەمڕۆ ئەگەر شەمەندۆفەر هەبێت یەکسەر بەڕێدەکەوین. پلیتەکە چۆن وەربگرین؟"

ملازم گوتی:

"پێویست ناکات تۆ زەحمەت بکێشیت، من و عەباس دەچین و پلیتەکان دەکڕین و دێینەوە. تۆ هەر لەمیوانخانە چاوەڕێمان بە. وێستگەکە لێرە نزیکە، هەر لەتەنیشتمانە."

حاڵەتی روخساری موسا ئاغا لەپڕ گۆڕا، بەدەم پێکەنینەوە تا دەمی دەرگا بەڕێی کردن. "هەر بژیت کوڕەکان. خوا خێرتان بنووسێت. ئەگەر لەئەستەنبۆڵ دۆستەکانم بدۆزمەوە. زۆر باش دەبێت. سەعید رەحمی کوڕی فەرماندەیەکی گەورەیە. من لێرە چاوەڕێیان دەکەم."

ملازم و پۆیراز تا گەیشتنە وێستگە هەر باسی فەرماندەیان کرد. تووڕە بوون، نیگەران بوون. سەر سوڕماو بوون. مرۆڤ چۆن دەتوانێت لەماوەیەکی وا کورتدا ئاوا بگۆڕێت و ئاوا مرۆڤبوون لەبیر بکات؟

ملازم بەڕێوەبەری وێستگەی دەناسی. بەڕێوەبەر بە باشی پێشوازی لێکردن. ئەوانی لەسەر کورسیە دەستکردەکانی مەراکش دانیشاند، دوای چاك و چۆنی گوتی:

"ئێوه فەرموون لێره دابنیشن، من دەچمە دوای پەیداکردنی پلیت."

پۆیراز گوتی:"پله یەك بن."

بەڕێوەبەر نرخی پلەیەکی پێگوتن و پۆیراز پارەکەی دایێ. بەڕێوەبەر رۆیشت، به پلیتەوه گەڕایەوه گوتی:"پله یەکه. دوو دانه پلیت مابوون که ئەوانیشم بۆ ئێوه کڕین."

"سوپاست دەکەین بەڕێوەبەر."

که سواری شەمەندۆفەر بوون، خۆر خەریك بوو ئاوا دەبوو. موسا ئاغا کاتژمێره زێڕەکەی لەگیرفانی ئێلەگەکەی هێنایەدەرو تەماشایەکی کرد. گوتی: "هێشتا پازده خولەکی ماوه بەڕێ بکەوێت." بەلەز سوار بوون، بەرامبەری یەکدی دانیشتن. هەر لەگەڵ ئەوەی شەمەندۆفەر کەوتەڕێ، موسا ئاغا چاوەکانی دانانه سەریەك و خەوی لێکەوت، بەڵام پۆیراز نەیدەتوانی بخەوێت. موسا ئاغای باش ناسیبوو. حاڵ و وەزعی وەك پێشان نەبوو. پیاوێك بوو سەخت وەکو شاخ. فەرمانده تازیاتر دەینەڕاند، روخساری موسا ئاغا زیاتر مکوم دەبوو و وا تەماشای فەرماندەی دەکرد که وەك بڵێی تەماشای مێشێك دەکات، تا زیاتر فەرمانده دەینەڕاند، رەوش و سەروسیمای ئەویش زیاتر سووکایەتی به فەرمانده دەکرد، فەرماندەش که ئەو رەفتارەی ئەوی بینی چاوەکانی زیاتر گەوره دەبوون و رەفتاری دڕندانەتر دەبوو. هەر چەند ئەو خۆی هەڵدەزڕاند دەینەڕاند کەچی موسا ئاغا دەنگی نەدەکرد و وەك ئەوەی که هیچ شتێك رووی نەدابێت و به هێمنی و سەرسامیەوه سەیری روخساری ئەوی کرد و ئاوا درێژەی به بێدەنگی خۆی دەدا و ئەو رەوشه فەرماندەی شێت و هار دەکرد. ئەو پیاوه تەمەنێکی زۆر دەکات و هیچ کاتیش بیری گەڕانەوه بۆ کرێت لەمێشکی دەرناکات. کچەکانیش عاشقی باوکیان بوون، تا مردن، بەڵکو دوای مردنیش باولەکانی خۆیانیان نەدەکردەوه. تا بیری لەموسا ئاغا، ئەو پارچه شاخه دەکردەوه، خۆی نائومێدو بەتاڵ هەست پێدەکردو هەر جارێك بەبیرکردنەوه لەوەی که لەگەڵ ئەوان بچێته کرێت دڵی رۆشن دادەهات.

کاتێك خۆر لەناو فارگۆنەکەی دا، موسا ئاغا لەخەوهەستا، چووه ئاودەست، گەڕایەوه، لەجێگای خۆی دانیشت، چاوی بڕینه روخساری پۆیراز. لۆچ کەوتبوونه سیمای گەنجانه، چاوەکانی درەوشانەوەی جارانیان نەمابوو، وەك ئەوانەی لێهاتبوو که دەڵێن به شەوێك مووی سپی بوون و پیر بوو.

ئەمە چ ئازارێکە کە کەسێك وا لێدەکات بە شەوێك بکەوێتە ئەو حاڵ و رەوشەوە؟ شەکەت و برستلێبڕاو و رۆشنایی چاوەکانی لەنێو چووبوو. دڵی بە پۆیراز سووتا. پۆیراز بۆ ئەوەی خۆی لەدەست نیگاکانی ئەو رزگار بکات گوتی:

"تا بەیانی نەمتوانی بنووم. بابچم ئاوێك بەدەم و چاومدا بکەم کەمێك بێمەوە سەرخۆم. بمکوژن لەنێو شەمەندۆفەر ناتوانم بنووم. ئەگەرچی دەتوانم بڵێم قەت سواری شەمەندۆفەر نەبوومە."

هەرچەند چوو دەمو چاویشی شوشت و هاتەوە کەچی روخساری هەروەك خۆی بووو هیچ گۆڕانی بەسەردا نەهات. موسا ئاغا لەدڵی خۆیدا گوتی، چیمان بەسەر ئەو کوڕە هێنا. دڵی پێسووتاو لەبینینی حاڵ و سەرو روخساری نیگەران بوو.

"ئەگەر سەعید رەحمی بدۆزمەوە، هەموو شتێك بە ئاسانی چارەسەر دەبێت. باوکی فەرماندەیەکی گەورە بوو، بیستوومە لەشەڕی نیشتمانیشدا بەشداری کردوە. مسۆگەر یەکێك بووە لەگەورە گەورەکان کە ناویم تەنانەت لەکرێتیش بیستووە. ئێستا با بگەینە ئەستەنبۆڵ."

"بە ئومێدی خودا ئاغا، دەگەین ئاغا."

ئیدی هیچ قسەیان نەکرد. پۆیراز لەکاتێکدا بیری لەزەهرا دەکردەوە خەوی لێکەوت. موسا ئاغاش لەپەنجەرەکەوە خەریکی سەیرکردنی دەرەوە بوو. پۆیراز نیوەخەوتوو نیوەهۆشیار بوو، لەخەیاڵاتی خۆیدا زەهرای دەبینی. لەبەرامبەر دوورگە کەشتییێك رەت بوو کە چراکانی داگیرسابوون. کەشتی هات و هات تا گەیشتە ئەسکەلەو لەوێ لەنگەری گرت. بەتەواوی رۆچووە نێو رۆشنایی. دوورگە وا رووناك بووەوە کە هەموو شتێکی تێدا دەبیندرا، باڵندە، پەپوولە، زەردەواڵە، باڵە درەوشاوەکانی مێشەهەنگان، تەونی جاڵجاڵۆکەکان و هەمووشتێك و هەمووشتێك.

ئەو تۆپەڵە رۆشناییە کە لەئەسکەلە لەنگەری گرتبوو لەناکاو کوژرایەوە و هەموولایەك رۆچووە نێو تاریکیەکی خەست و ئەنگوستەچاو. تاریکیەکە ئەوەندەی نەبرد دوای ئەو کەشتیەی کە ون بوو یەکێکی دیکە بە دوایداهات و گەیشت کە هەموو ئەوناوەی نوقمی نێو رۆشنایی کرد، کەمێك دواتر ئەویش ون بوو. دوای ئەویش کەشتییێکی دیکە دیسان دانەیەکی دیکەو بەدوای ئەودا یەکێکی دیکە. کەشتیەکان یەك دوای یەك ریز بووبوون، وەکو کێوی رۆشنایی بەدەوری دوورگەدا دەسووڕانەوە. پۆیراز دەستی زەهرای گرتبوو لەگەڵ ئەو رۆشناییانەدا دەخولایەوە. ئەوان لەنێو کەشتی بوون، دوورگە بە دەوری کەشتیەکاندا دەخولایەوە. ئەو دوانە دەستیان خستبووە نێو دەستی یەکدی، لەدەست دوورگەی رووناکداهاتوو و لەدەست کەشتیەکان رایاندەکرد. زەهرا لەجێگایەکی

زۆر بەرزەوە کەوتە نێو دەریا، ئەویش هەروا، زەهرا شۆڕی نێو قوولاّیی دەریا بووەوە، پۆیراز هەروا ماوەیەك چوونە خوارو هاتنەوە سەر، سواری شەپۆلێکی کەفاوی بوون، خۆیان لەسەر لمەکان و لەژێر درەختێکی گەورە بینیەوە. قەدو پۆپی درەختە گەورەکە بە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگی جیاجیا داپۆشرابوون. هەرگوڵێك بۆنێکی تایبەتی دەدا. سەریان کاس بوو. چاوی بە زارکی ئەشکەوتێك کەوت لەلای خوارەوەی هەڵدێرگەکە، خۆیان گەیاندە ئەوێ، سەریان بردە نێو ئامێزی یەکدیەوە. دەترسان، تازیاتر دەترسان زیاتر خۆیان بەیەکەوە دەچەسپاند و تازیاتر خۆیان بەیەکدیەوە دەچەسپاند زیاتر دەلەرزین. پۆیراز بە دەم لەرزینەوە لەخەو هەستا، سەیری دەوروبەری خۆی کرد، زەهرا لەوێ نەبوو، موسا ئاغا لەکاتێکدا پشتی خۆی دەخوراند سەیری دەکردو پێدەکەنی. "کوڕم چەند زوو خەبەرت بووەوە، خەون دەستیان لێهەڵنەگرتی."

پۆیراز پێکەنی:

"تەواوکردنی خزمەتی سەربازیە ئاغا، خەونی پچڕپچڕ. پێموایە بەدرێژایی شەو خەوتووم، چەند جارێکیش بە گرمەی تۆپان و حیلەی ئەسپان بە ئاگا دەهاتم."

"ئێستا دیسان بنوو. لێرە نە دەنگی تۆپان دێت و نە حیلەی ئەسپان."

"ئیدی ناتوانم بخەوم. تەقە تەقی ریلی شەمەندۆفەر لە دەنگی تۆپان ناخۆشترە."

کە لە شەمەندۆفەر پیادەبوون، هەردووکیان شەکەت و ماندوو بوون. زۆری نەبرد کەشتییێك هات، چوونە قەرەکوی. تەکسێکیان بینی کەمێك لەپێشتر لەوان راوەستابوو، لە پەرپووتیەکەی زانیان تەکسیە. ڕەنگی ئوتومبێل ڕەش بووبووەوە و میچەکەی ژەنگی هەڵێنابوو. شوفێرەکە پیاوێکی بە تەمەن بوو گوتی:

"فەرموو بەڕێزینە، سواربن."

سواربوون.

"بۆ کوێ بەڕێزان؟"

موسا ئاغا و پۆیراز سەیری یەکدیان کرد.

موسا ئاغا بە ئەدایەکی فەرماندەرانە گوتی: "پێرا پالاس."

کەمێك دواتر تەکسیەکە لەبەردەم پێرا پالاس ڕاوەستا. کابرای شوفێر هەر لەئەسکەلەوە تا پێرا پالاس هەر بە ماشێنەکەی خۆی هەڵگوت.

موسا ئاغا گوتی: "پارەکەت چەندە؟"

شوفێر که خەریکبوو باسی ماشێنەکەی دەکرد، دوای ئەوەی موسا ئاغا چەند جارێك دووپاتی کردەوە، شوفێر کرێیەکەی وەرگرت. موسا ئاغا زۆر ئەو شوفێرەی کەوتبووە بەردڵ. بەخششێکی باشی دایێ.

"هەر کاتێك ئەمرێکتان هەبوو من لەئەسکەلەم. لەمیوانخانە هەمووان من دەناسن. لە خزمەتم، بەرێزان."

دوو خزمەتکار لەبەردەم دەرگای میوانخانە پێشوازیان لێکردن، جانتاکانیان لێوەرگرتن. دوو ژووریان داواکرد، ژووریان هەبوو، چوونە سەرەوە. ژوورەکان بەراستی جوان و رێكو پێك بوون. موسا ئاغا بەخششێکی باشی دایە ئەو دوو خزمەتکارانەی کە جانتاکانیان لێوەرگرتبوون. هەریەکەیان چووە ژوورەکەی خۆی. ئاوێکیان بە خۆیان داکرد، چوونە خوارەوە، قاوەیان خواردەوە. موسا ئاغا قاوەی وا خۆشی مەگەر لەدووکانەکەی خەیری ئەفەندی دەنا نەخواردبووەوە. بۆنی خەستی قاوە ئەو ناوەی داگرتبوو.

موسا ئاغا گوتی: "با تا مەیدانی تەقسیم بەپێیان برۆین. قاوەخانەیەکی لێبوو کە تەمەنی گەنجیم لەگەڵ برادەرەکانم لەوێ بردۆتە سەر."

لەشەقامی سەرەکی بەرەو لای مەیدانی تەقسیم کەوتنەرێ، گەرانەوەو هاتن چوونە ناو قاوەخانەکە و دانیشتن. موسا ئاغا گوتی:

"بێك ئۆغلو هیچ نەگۆراوە. لەوساوە تا ئێستا تەنانەت بەردێکی لـێ لانەدراوەو لێشی دانەندراوە."

لەکاتێکدا کە خەریکی پیاسە بوون و سەیری دووکانەکانیان دەکرد، هاتنەوە میوانخانە. ماندوو بووبوون. دوای کەمێك دانیشتن، دیسان هەستان، برسیان بووبوو، لەمیوانخانەدا نانیان خوارد.

"با زوو بخەوین تا زوو لەخەو هەستین. باڵەخانەی سەعید رەحمی ئەمەیە لەلای ئەنەدۆڵی بوغاز. دەبێ سبەینێ زوو بچین تاکو بەرلەوەی دەردەچێت بیبینین."

بەیانی زوو لەخەو هەستان، چوونە چایخانەیەك کە جاران قۆناغی موسا ئاغا بوو، بەرچاییەکی تێروتەسەلیان خوارد، پاشان بە پیادەیی چوونە ئەسکەلەو لەوێ سۆراغی کەشتیی بچوکی کوزقونجویان گرت. موسا ئاغا بەشانازییەکەوە گوتی: "ئەم کەشتیە سەردەمی ئێمەش دەچووە کوزقونجو. "بەرەو لای پلیتفرۆشی چوو، پلیتی کری، سواری کەشتی بوون، دوای ماوەیەك چاوەروانی وەرێکەوت.

"سەردەمی ئێمەش هەروا بەکاوەخۆ و بە تاخیریەوە وەڕێدەکەوت."

موسا ئاغا تا گەیشتنە ئەسکەلەی کوزقونجو لەبارەی سەعید رەحمی قسەی کرد. ئەویش حەزی لە ئەسپ و بە خێوکردنی ئەسپان هەبوو. لەنزیك ئەستەنبۆڵ کێڵگەیەکیان هەبوو. کاتێك کەشتی لە ئەسکەلە لەنگەری گرت، بەخۆشێکەوە گوتی: "ئەسکەلە هیچ نەگۆڕاوە باشتر." پۆیراز لەدڵی خۆیدا گوتی، ئەو کە ئەوەندە ئەستەنبۆڵی پێخۆشە بۆچی نایەت لێرە بژیت. ئەگەر بیەوێت لەدوورگەیەك بژیت بۆچی نایەت لەدوورگەیەك لەدوورگەکانی ئەستەنبۆڵ نیشتەجێ بێت؟

لەئەسکەلە هاتنەدەرو چوونە نێو شەقامێك. بەبەردەم کەنیشتێك و کلێسایەك و مزگەوتێکدا تێپەڕین کە لە ریزی یەك بوون. لە لێوار کۆشك و تەلاری جوان جوان هەبوون. لەسەرەتای رێگایەکی سەرەوژوور راوەستان. موسا ئاغا گوتی: "ئەم کۆڵانەیە" چوونە سەرەوە لەبەردەم دەرگایەکی نەخشێندراو راوەستان، موسا ئاغا لەدەرگای دا. خزمەتکارێکی رەشپێستی شیکپۆش دەرگای کردەوە.

"سەعید رەحمی بەگ لەماڵە، بڕۆ پێی بڵێ موسا کازم ئاغای دۆستە کرێتیەکەت هاتووە." کابرای خزمەتکار گوتی: "سەرچاو ئاغا." بەڕاکردن رۆیشت و لەباڵەخانەیەکی سپی بەسەرکەوت. لەچاوقوچانێکدا سەعید رەحمی هاتەدەر، یەکدیان گرتە باوەش. سەعید رەحمی دەستی پۆیرازی گوشی.

"بەخێر هاتی ئاغای من، سەفات هێنا گەورەی من. دەمزانی دێیتە تورکیا، بەڵام دەمگوت باشە بۆ نایەتە لای من. دەترسام بەڵایەکت بەسەر هاتبێت."

دەستی لەقۆڵی موسا ئاغا هەڵکێشا، بەرەو لای ماڵەوە رۆیشتن. بەڕاڕەوێکی مەڕمەڕدا تێپەڕین و گەیشتنە هۆڵێکی درێژ. ژمارەیەکی زۆر مۆبلی مەراکشی، کورسی، مێزێکی گەورە... موسا ئاغا سەری هەڵبڕی سەیری بنمیچە زێڕچنەکەی کرد. بنمیچە زێڕچنەکە دروست وەکو جاران بوو. چوونە ژوورەوە، دیسان مۆبلی سەوزی مەراکشی، مێزێکی سادە کە پڕی سەری قەڵەم بوون. تۆپێکی کریستاڵ، ژێرجگەرەیەك، پەیکەرۆکەیەکی لەبرۆنز دروستکراوی ئاسکێك، دانیشتنە سەر مۆبلەکان و تێیاندا نقوم بوون. لەنێو ژوورەکە هەموو شتێك وەکو جاران وابوو.

موسا ئاغا گوتی: "ژوورەکەت هیچ نەگۆڕاوە سەعید."

ناچار بووم مێزەکە بگۆڕم، برادەرێك زۆری پێجوان بوو. دامە ئەو، بەڵام پاشان نە لەئەستەنبۆڵ نە لەپاریس نەمتوانی لەشێوەی ئەو مێزە بدۆزمەوە. ئەم مێزەشم لەدوای چەندین ساڵ

لەکۆنەفرۆشیەك دۆزیەوەو کڕیم. ئێستا تۆ بڵێ موسا لەوکاتەی هاتوویتە تورکیا چ کارێکت کردووە؟ هەر لەبیری تۆ دابووم. هەر دەمگوت ئەمڕۆ دێت سبەی دێت، کە هیچ هەواڵێکیشت نەبوو ترسام بەڵایەکت بەسەر هاتبێت. ئەگەر بتەوێت ڕەوشی ئێمە بزانیت، باوکم لەجەنگی سەربەخۆیی بەشداری کرد، لەگەڵ یۆنانیەکان شەڕی کرد، ئێستا لەئەنقەرەیە، نوێنەری ئەنجومەنە. منیش ماوەیەك لەکێڵگەدا کارم کرد، ڕەنگبێت ساڵێکی دیکە ببمە نوێنەری ئەنجومەن. باوکم ئیدی دەیەوێت وازبێنێت‌و چیدیکە نوێنەرایەتی ناکات. شەڕو نەبەردەکان زۆریان ماندوو کردووە. من لە جیاتی ئەو دەبمە نوێنەر. پاشا بانگی کردووم. لەچاناك قەڵا هەموو ئەفسەرانی یەدەك شەهید بوون. کەسانێکی بە پەنجەی دەست بژمێردرێن ماون کە بەڵگەنامەی بەرزی خوێندنیان هەبێت. تۆبێژە، بێژە تا ئێستا چیتکردووە، ئەم چەند ساڵە لەکوێ بوویت؟"

پاشان داماو سەیری موسا کازم ئاغای کرد:

"ئێوە نانی بەیانیتان خواردووە؟"

موسا ئاغا گوتی:"واز لەنانخواردن بێنە، تۆ خواردووتە؟"

"تازە ریشم تاشیبوو و جلەکانم پۆشین کە لە دەرگا درا، کە ئێوەم بینی، بەرچایم لەبیر چوو. زووبن بابچین نان بخۆین. ببوورن کەمێك دواکەوتین."

هەستان:

"ژووری نانخواردن پێدەزانیت، پێشمان بکەوە نیشانمان بدە."

موسا کازم ئاغا وەپێش کەوت بردنیە ژووری نانخواردن.

"فەرموون."

"ئێوە بفەرموون."

"ئێوە بفەرموون. تۆ جارانیش هەر واتدەکرد. بفەرموو بۆ ژوورەوە ئاغا. کەس باری تۆ نابات، بەسە لێمەگەڕێ برسیەتی بکێشم."

موسا ئاغا گوتی:"باوابێت." قۆڵی پۆیرازی گرت و چوونە ژوورەوە. سەعید ڕەحمیش بەدوای ئەواندا چووە ژوور، لەدوولای مێزی نانخواردندا دوو کچی گەنجی سپیلکەلە ڕاوەستابوون، هەر لەگەڵ ئەوەی ئەوان دانیشتن، کچەکان چایان کردە نێو پیاڵە زێڕچنەکان، سەعید ڕەحمیش شەکردانە کریستاڵەکانی بۆلای ئەوان ڕاگرت و فەرمووی لێکردن.

موسا کازم ئاغا گوتی:"تکا دەکەم."

"کوڕە ریشت سپی بووە، بەڵام هێشتا دەستت لە نەریتە کۆنەکەی خۆم هەڵنەگرتووە."

بە نانخواردنەوە خەریك بوون و بەدەم باسکردنی رۆژگاری رابردوو نانیان خوارد، پاشان چوونە ژوورەکەی سەعید رەحمی."

سەعید رەحمی گوتی: "گۆڕینەوە."

"ترسناکە."

"دەزانم رەوشێکی ترسناکە. دەزانم، ئێمە لەقبوڵکردنی گۆڕینەوە هەڵەیەکی گەورەمان کرد. یۆنانیەکان جگە لەچەند کەسێکی وەکو تۆ، تەنها ئەو دێهاتیانەیان بۆ ناردین کە نەخوێندەواربوون. یۆنانیەکانی ئێمە کەسە هەرە خوێندەوارەکانی وڵاتی عوسمانی بوون. پیشەسازی سەرتانسەری ئەنەدۆڵ لەدەستی ئەوان بوو. زۆر لەدکتۆرەکان، ئەندازیارەکان، کەسانی پلەداری باڵا لەوانە بوون. زۆر لەبیناسازەکان لەوان بوون. دوای رۆیشتنی ئەوان دەتوانم بڵێم لەئەنەدۆڵ هیچ وەستاکارو ئاسنگەر و پێڵاودرووێك نەما. یۆنانیەکان لەسەدەی رابردوو لەئزمیرو تەرابزون تەنانەت چەندین کۆنسەو سازیان پێکهاتبوو. هەموو ئەوشتانەی کە ئێمە داهێنەرو گەشەپێدەری بووین ئەوان کردیانە هی خۆیان و بردیان. دەتوانم بە دڵنیاییەوە ئەوە بڵێم کە ئەو یۆنانیانەی لەئەنەدۆڵەوە رۆیشتن یۆنان دەگۆڕن و دەبنە مایەی پێشخستنی. هۆکارو بنەڕەتی شکست و هەستکردن بەکەمبوونمان دیسان هەر ئەو (ئیتیحادو تەرەقی)یانەن، وەکو ئەوجارەی کە ئەنوەر پاشا تووشی شکست و سووکایەتی کردین.

لەوە بگەڕێین، ئێستا تۆ باسی دوورخستنەوەکەتان بکە. ئێمە لەوەش زیاتر لەدەست ئەو ئیتیحادو تەرەقیە زەرەرمەند دەبین، مەگەر ئەوروپا نەبوو کە جەنگی یەکەمی جیهانی هەڵگیرساند و ئەو هەموو مرۆڤانەی بەکوشت دا؟ ناوی دەنێن جەنگی جیهانی و خەڵکی پێ فریو دەدەن. ئەمە جەنگی جیهانی نیە، درۆیە، یەکەمین کۆمەڵکوژی گەورەی مێژووە. دەزانی کە بڕیاری گۆڕینەوەش هەر ئەوروپاییەکان لەکۆنفرانسی لۆزان دایانهێناو بڕیاریان لە سەردا."

موسا کازم ئاغا سەری قسانی گرتە دەست، سەرەتا باسی ژیانی خۆی کرد، زۆر بەوردی، پاشان باسی ئەوەی کرد کە چۆن ئاخنیاننە ئەو کەشتیە بچوك و کۆنانە، لەنێو کەشتی چۆن لە هەمووی زیاتر بەدەست تینوێتی سەختیو ئازاریان کێشا، لەبەر بۆن و پیسایی نەیاندەتوانی سەر بە دەستشۆریەکان دابگرن، یان چۆن کەشتیە کۆنەکان بەردەوام تاسەیان دەبرد و لەگەڵ بچوکترین شەپۆڵدا کە لێیدەدان بە چەپ و راستدا دەکەوتن و بێپسانەوە سەرنشینەکان دەڕشانەوە، بە

شێوەیەك كە لەماوەی دوو رۆژدا كەشتی بۆنێكی تاقەتپروكێنی وای گرت كە نیوەی سەرنشینەكانیان دوای چەندین رۆژ بەرگەی ئەو بۆنە گەنیوەیان نەگرتو ئیدی نەخۆش دەكەوتن، ژمارەیەكی زۆر لە منداڵان لەنێوچوون. مردووەكانیان نیشانی كەس نەدەدا بۆیە تەرمەكان لەرێگا بۆنیان گرت و بە ناچاری فرێیان دەدانە نێو دەریا. كەشتی وایلێهات كە ئومێدی باشبوون مەحاڵ بوو. كاتێك گەیشتنە بەندەری ئزمیر هیمدادگەران لەبەر ئەو بۆنە نەیانتوانی بچنە نێو كەشتی و بەناچاری كەپوو لووتی خۆیان دەمامك دا و نەخۆش و منداڵ و باربەرەكانی كەشتیان دابەزاندن و ئەو كەسانەی كە مردووەكانی خۆیانیان شاردبووەوە بەسەرسەری تەرمی ئازیزەكانیانەوە راوەستابوون...

دوای بەتاڵكردنی كەشتی، ژمارەیەكی زۆر لە كۆچبەرەكان، كە شەكەت و هێز لەبەربڕاو و هەر ئێسكو پێست بوون، لەكەشتی دانەبەزین و لەبەرامبەر پۆلیس و جەندرمەكان بەرگرییەكی چاوەڕواننەكراویان نیشان دا. پۆلیس و جەندرمەكان بە زەبرو زۆر ئەو خەڵكە لەڕو لاوازەی كە هەر هێندەی كۆترێكیان لێهاتبوو بەڕاكێش راكێش لەنێو كەشتی هێنانیانە خوار. ئەوانی دی بە دادو هاوار بەرگریان كرد. دواجار داوایان لەمن كرد كە بچم و رازیان بكەم داببەزن. كە سواری كەشتی بووم بۆنێكی وام بۆهات دەتگوت شەپازللەیەك بوو بە بناگوێم كەوت، لەرزیم خەریك بووم بكەوم كە دوو پۆلیس گەیشتن و بنباڵیان گرتم و گەیاندمیانە لای ئەو دوو كەسەی لەژوورەوە بە هیچ شێوەیەك ئامادە نەبوون دابەزن، كە لێیان نزیك بوومەوە، یەكێكیان وەك بڵێی ویستی هەنگاوێم لـێ بێتەپێش، بەڵام نەیتوانی. راهەژاو پشتاوپشت بە عەرزی كەوت، سەیرمانكرد مردبوو. ئەوانی دیكەش نەیانتوانی لەشوێنی خۆیان بجوولێن. یەكێكیان كاتێك كە منی بینی ئەو بەتانیانەی لەپێشمان بوون بە زەحمەت توانی بەرز بكاتەوە، ژێر پەتۆكان پڕبوو لە تەرم. ئەو پیاوەی كە پەتۆكەی بەرزكردبووەوە، دەتگوت ئەسكلێتە. گوتی ئاغا برۆ بەوانە بڵێ ئێمە تەرمی مردووەكانی خۆمان چەندین رۆژ شاردۆتەوە و فڕێمان نەداونەتە دەریا، چونكە بەدوای دۆزینەوەی چەنگە خاكێك بووین تاكو بیانئێژین.

"بە یارمەتی پۆلیسەكان هاتمەدەر. لەدەرەوە بارانێك دەباری دەتگوت لافاوە. بارانەكە دە رۆژان درێژەی كێشا. لەبەندەرەكەش نیوەی ئەوانمان لەدەست دا كە تا ئەوكات مابوون. پاشان ئێمەیان نارده ئەنەدۆڵ. لەوەش بە دواوە هەرچی باسی بكەم هەم تۆ ئازار دەدەم هەم خۆم."

سەعید ڕەحمی بەگ گوتی: "هی باوەڕکردن نیە، ئەم جەنگەو ئەم ئەوروپایەو ئەم عوسمانیە... ئێستا هەستن بابچینە ناو شار، بچینە پێرا پالاس."

موسا کازم گوتی: "ئێمەش لە پێراپالاس شوێنمان گرتووە. خواردنەکانی ئەوێ زۆر بەتام و چێژن، جێگایەکی ئارام و ئاسوودەشە. جگە لەوە بە ئاسانیش دەتوانین سەر لە باڵیۆزخانەی یۆنان بدەین."

چوونە پێرا پالاس، داوای قاوەی سادەیان کرد.

بەڕێوەبەری میوانخانەکە هات، گوتی: "بەخێربێن بەڕێزان. ئەمرێك، فەرمانێکتان نیە؟" لەبەرامبەر سەعید ڕەحمی چەمایەوە.

"داوایەکم هەیە، زەرفێك و کاغەزێکم بۆ بێنە."

"سەرچاوان قوربان."

کوڕە گەنجێك هات و پاکەت و نامەکەی دایە دەست.

"کەمێك لێرە دادەنیشیت؟"

"قەڵەم زێڕەکەی لەگیرفانی دەرهێنا، نامەیەکی نووسی، پاکەتەکەی دایەوە دەست کوڕەکە:

"ئەمە ببە بۆ باڵیۆزخانەی یۆنان، بچۆ سەرەوە، بیدە بە خودی باڵیۆز، سڵاوی منی پێڕابگەیەنەو هەر لەوێ چاوەڕوان بکە."

کوڕە گەنجەکە زۆری نەبرد بەنامەیەك گەڕایەوە. باڵیۆز چاوەڕێی سەعید ڕەحمی بوو.

"باڵیۆز لەدۆستە باشەکانی خۆمە، فەرەنسی وەکو زمانی دایکی خۆی دەزانێت. لەبەرخاتری تۆ هەر کارێکی لەدەست بێت دەیکات. بەڵکو شەویش پێکەوە دابنیشین و شتێك بخۆینەوە. زووبن با هەستین‌و بچین."

چوونە باڵیۆزخانە. پاسەوانەکە سەعید ڕەحمی دەناسی، "یەك دەقیقە بەڕێز، باڵیۆز ئاگادار بکەینەوە." ئاگاداریان کردەوە، باڵیۆز هاتەدەرەوە، دەستی خستە نێو قۆڵی سەعید ڕەحمی، چوونە ژووری باڵیۆز. شتەکانی ژووری باڵیۆز بە شێوازێکی زۆر جوان دانرابوون سەعید ڕەحمی یەکەمجار موسا کازم و پاشان پۆیراز موسای ناساند. قاوەیان هێنا، تاوێکی باش خەریکی هەواڵپرسی و چاك و چۆنی بوون. موسا کازم لەنێو قسەکانیدا ئەو ڕووداو و کارەساتانەی کە بەسەری هاتبوون دەگێڕانەوە و باسی دەکردن. بە یۆنانی قسەی دەکرد، سەعید ڕەحمی وەکو زۆربەی دانیشتیوانی دیکەی ئەستەنبۆڵ یۆنانی دەزانی. موسا کازم ئەمجارە بەسەرهاتی خۆی وردتر و باشتر لەجارانی

دیکە باس کرد. باسەکە زیاتر لەکاتژمێرێك درێژەی کێشا. هەم باڵیۆزو هەم سەعید رەحمی تابلێیت کەوتبوونە ژێر گاریگەریەوە. فرمێسك لەچاوەکانیان قەتیس مابوون و تا موسا کازم قسەکانی تەواو کرد نەیانتوانی سەیری روخساری یەکدی بکەن، بەڵام پۆیراز، بێدەستی خۆی نوقمی ئەو هەستە خەمگین و توورە و ناچاریەی موسا کازم ئاغا بووبوو.

باڵیۆزی گەنج و سەعید رەحمی ماوەیەك چاویان بڕیە نێوچاوی یەکدی. باڵیۆز بە دەنگێکی وەك ناڵاندن گوتی:

"ئەم جەنگە مرۆڤایەتی لەمرۆڤەکان سەند. ئایا بە درێژایی مێژوو وەها دوورخستنەوەیەك روویداوە؟" توورە بوو."چۆن بیریان لەوە کردەوە کە وەها دوورخستنەوەیەك بەرنامەڕێژی بکەن و جێبەجێی بکەن؟"

سەعید رەحمی ئەم قسانەی باڵیۆزی کە بە فەڕەنسی دەریبڕین بۆ موسا کازمی وەرگێڕان. موسا کازم گوتی:

"کاتێك باسیان لەگۆڕینەوەکە کرد، نەتورکەکان باوەڕیان کردو نەیۆنانیەکان. هەموومان پێکەنین و بەهەندمان وەرنەگرت. دوای چەند رۆژێك، ئەو بەڵایە ترسناکە کەوتە واری جێبەجێکردنەوە. دیسانیش گوتمان هەڵبەت روویداوە، پیاوانی ژیرو خاوەن ئەزموونی تورك و یۆنان گوتیان بە مسۆگەری هەڵەیەك هەیە. کەسانی وەکو ئێمە تا رۆژی ئاخیر تەنانەت دەرزیەکیشمان نەفرۆشت. من ئەسپەکانم و کێڵگەو باخچەکانم بەدراوسێکانم سپارد و هاتم. هەمووان گوتیان دەچیە تورکیا و دەگەڕێیەوە. کچەکان بە ئومێدی ئەوەی ئەمڕۆ سبەی دەگەڕێنەوە تەنانەت باولەکانیان نەکردۆتەوە. هێشتا چاوەڕوانن. سوپاس بۆ خوا کە ئەو دوورگەیەمان دەست کەوت و لەگەڵ کەسێکی وەکو کاکە پۆیراز ئاشنا بووین. پۆیراز بووە هەتوانی هەموو ئازارەکانمان."

"من نامەیەك سەبارەت بە ئێوە بۆ وەزارەتی دەرەوە دەنووسم. لەوێ هەندێك برادەری وام هەن کە لەبراش هێزاترن بۆم، خزم و کەس و کار و برادەری زۆریشم هەن لەناو حکومەت کە پلەوپایە و پۆستی بەرز بەرزیان هەیە. تەنها گرفت ئەوەیە کە ئەم ماوەیە بارودۆخ زۆر ئاڵۆز بووە، پیاو نازانێت داخۆ بۆ ئەم کارە دەتوانن چی بکەن و چ هەنگاوێك هەڵێنن. بەربەستی زۆر گەورە هەن. خەریکن لەگەڵ تورکیا پەیمانی دۆستایەتی واژۆ دەکەن. ئەگەر کەسێکی وەکو موسا کازم ئاغا کە لەیۆنان کەسێکی زۆر ناسراوە، بگەڕێنینەوە تەنانەت بۆی هەیە نێوانمان تێکبچێت. تەنانەت ئەگەر نێوانیشمان تێکنەچێت، کاربەدەستەکان لەو کارە دەترسن. ترسیش برا گەورەیە. سەعیدبەگ، بەڕای

تۆ جگە لە مستەفا کەمال پاشا هیچ کەس دەتوانێت کەسێکی یۆنانی ناسراوی دانیشتووی تورکیا بگەڕێنێتەوە یۆنان؟"

"زەحمەتە."

"بەلاّم من بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەی موسا کازم ئاغا تا دەتوانم هەوڵی خۆم دەدەم. تەنانەت بیر لەوەش دەکەمەوە کە لەبەر خاتری موسا کازم ئاغا یاسایەکی تایبەت پێشنیاز بکەم."

"من و موسا کازم ئاغا هەردووکمان سوپاست دەکەین."

موسا کازم ئاغاش بە یۆنانی سوپاسی باڵیۆزی کرد.

باڵیۆز دەستی خۆی درێژکردو دەستی سەعید رەحمی گرت و بە پێکەنینەوە گوتی:

"زۆر نابات خۆت دەبیتە باڵیۆز، دەچیتە یۆنان و ئەم پرسەش دەنگ دەداتەوە و چارەسەر دەکرێت."

"راستیەکەی ئەگەر لەبەر خاتری موسا کازم ئاغاش بێت ئەسینا هەڵدەبژێرم. ئەگەر دوو باڵیۆز یەکدەنگ بن، دەتوانن تەنانەت لە پێناو کەسێك، حوکمی گەمژانەو دڕندانەی کۆنفرانسی لۆزان هەڵبوەشێننەوە."

باڵیۆز گوتی: "نیوەڕۆ میوانی ئێمەن. دەتەوێت بتانبەمە رێستۆرانتێکی نموونەیی. دیسان قسە دەکەین. دەترسم ئەو هاوڕێیەتیەی لەنێوانمان هەیە درێژە نەکێشێت."

"ئەگەر ئەو دۆستایەتیە مکوم و پایەداربێت، نیمچە دوورگەی باڵکانیش رزگار دەبێت، وەلــێ منیش دەترسم."

"کێ ئەم جەنگ و شەڕو شۆڕانەی دەوێت؟"

"کێ دەیەوێت؟"

ژ

# بەشی دووەم

بەلەمێکی ماتۆڕداری ڕەنگ شیری کە لەکەشتییێکی گەشتیاری دەچوو، پێنج پیاوی سەراپا ڕەشپۆشی لێدابەزین. هەر پێنج پیاوەکە سمێڵڕەشی قەترانی، لووتی گەورەی هەڵۆیی، گۆنای قۆپاو، ڕەنگی روخساریان بۆر و چاوانی ڕەشی زۆر گەورەیان هەبوو. هەموویان باڵابەرزو هاوقەد بوون، نە تۆزقاڵێك کورتر نە درێژتر لەیەك. دەمانچەشیان پێبوو کە لەنێو کیفی تایبەت دابوون و بەنێکیاندا شۆڕ بووبوونەوە. زنجیری زێڕی کاتژمێرەکانیشیان لەگیرفانی ڕاستیان بۆ گیرفانی چەپی ئێلەگەکانیان درێژ بووبووەوە. چەکمەی ڕەشی ئاوەزێنەدار و کڵاوی گوڵێنگەداری ئەرخەوانیان لەسەر بوو. دەتگوت هەموویان لەیەك قاڵبدا دروست کراون. هەر سێ پیاوەکە لەئەسکەلە بەرەولای خانووی چورباچیەکان ڕۆیشتن، بەتەك یەکدیەوە دەڕۆیشتن، کە گەیشتنە خانووی چۆرباچیەکان، بڵاوبوون و ماوەیەك لەو دەوروبەرەدا گەڕان. پاشان لەلێوار دەریا گەیشتنەوە یەك، بەتەنیشت یەکەوە ڕووەوە دەریا ڕاوەستان، سەیری دەریایان کرد، پاشان دووبارە بەتەك یەکدیەوە کەوتنەوەڕێ، بۆ پشت دوورگە ڕۆیشتن و خۆیان گەیاندە زارکی ئەشکەوتەکە، نەچوونە نێو ئەشکەوت، ڕێگاکەیان گۆڕی، چوونە سەرووی ئەشکەوتەکە، لەئەشکەوت تێپەڕین و چوونەوە لێوار دەریا، لەدۆڵی دارهەنجیرەکان چوونەژوور، لەوێوە چوونە نێو دارهەنارەکان. لەسەر گردەکە بەڕیز لەتەنیشت یەکدیەوە دانیشتن و چاویان بڕیە خۆر. نزیك بەخۆرئاوابوون، لەپڕ لەژێر دارچنارەکان دەرکەوتنەوە، خەڵکی دوورگە یەك یەك و دوو دوو لەماڵەکانیان هاتنەدەر و چوونە لای ئەوان.

هوسمەن گوتی: "بەخێربێن، بەخێربێن، فەرموون دانیشن."

هەر پێنج پیاوەکە یەکدەنگ گوتیان "سوپاست دەکەین" دانیشتن دەنگی ئەو پێنج پیاوە وەکو یەك دەنگ وابوو. دوورگەییەکان لەبیستنی ئەو دەنگە زۆر سەریان سوڕما. لەبەر خۆیانەوە گوتیان، چەند سەیرە دەمی هەر پێنج پیاوەکە کە پێکەوە گوتیان سوپاستان دەکەین لەیەك کاتدا بەسترا، دەنگ دەتگوت تەواو یەك دەنگ بوو.

هوسمەن پەیتا پەیتا دەیگوت سەیرە، سەیرە، سەری ڕادەوەشاند. هەر دەیگوت و سەری ڕادەوەشاندو سەیری دەوروبەری دەکرد، بێدەنگ دەبوو و ئەوانیدیکەش بە هەمان شێوە

سەرسوڕمان بەروخساریانەوە دیاربوو. بۆلای ڕاست وەردەسووڕا، سەیری ئەم و ئەوی دەکرد، نەیدەزانی چی بڵێت. هوسمەن دوای ئەوەی هێزێکی دایەوە بەرخۆی، سەیری چاوی یەکەیەکەیانی کرد. دروست لەم کاتەدا، دکتۆرەکان هاتن، هەمووان لەبەریان هەستان، بەڵام میوانەکان هەرخۆشیان نەجووڵاند. دکتۆرەکان لەسەر تەختەکان بەرامبەر میوانە ڕەشتاڵەکان دانیشتن. تاوێکی باش ئاوا سەیریان کرد، هیچ شتێك لەنیازو مەرامەکانیان تێنەگەیشتن، ئەوان قسەیان نەکرد، نیگا تیژەکانی خۆیان بڕیبووە دەریا، سەیری ئەولایان کردبووو ملیان بەرزکردبووەوە وەك بڵێی چاوەڕێی کەسێك بکەن کە لەدەریاوە دێت.

ماوەیەکی درێژ بەبێدەنگی تێپەڕی، ئەوان بێدەنگ بوون، دکتۆرەکان بێدەنگ بوون، دانیشتوانی دوورگە بێدەنگ بوون، هوسمەنیش بێدەنگ بوو، تا ئەوەدەمەی دکتۆر سەلمان سامی چیدیکە خۆی پێنەگیراو ئەو بێدەنگیەی شکاندو پرسی:

"بەڕێزان، ئێوە لەکوێوە دێن و دەتانەوێت بچنە کوێ؟ بەدوای کەسێکدا دەگەڕێن نەکا هاتبن لەدوورگە بەهەشتیەکەی ئێمە بمێننەوە."

یەکەمین کەسیان گوتی:

"لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتووین و دەچینە ڕۆژئاوا، بەدوای کەسێکدا دەگەڕێین ناوی عەباسە. نا لە ڕاستیدا مەبەستمان نیە لەدوورگە بەهەشتیەکەی ئێوە بمێنینەوە."

بەرلەوەی دکتۆر وەڵام بداتەوە پزیشکی ئاژەڵان گوتی:

"لێرە کەسێك هەیە بەناوی عەباس."

کەسی یەکەم بەدەنگێکی وەکو زیکەی مار گوتی:

"کەسێکی چۆنە، دەتوانین ببینین؟"

یەکەمجار دکتۆر سەلمان سامی و دوای ئەویش هەموو ئەوانی دیکە بزەیەکیان بۆ کرد. پیاوە ڕەشتاڵەکە لەو پێکەنینەی ئەوان دڵگران بوو و بەدەنگێکی لێبڕاوانە و فەرماندانە گوتی:"یەکسەر ئەوکەسە بهێنە ئێرە" دەستی هەر پێنج کەسەکە بۆ سەر دەمانچەکانیان چوو.

ڤاسیلی یەکسەر بۆماڵەوە رایکرد، بەدەستێك ئیپەك و بەدەستەکەی دیکەی عەباس گەڕایەوە و هێنای لەبەردەم یەکەم کەس کە دەستی دانابووە سەر دەمانچەکەی ڕاوەستاو گوتی: "ئەمە عەباس، ئەمەش ئیپەك، بووکە تازەکەی."

پیاوە ڕەشتاڵەکە یەکەمجار پێکەنی، ئەوانی دیکەش هاوکات لەگەڵ ئەودا پێکەنین. دەتگوت ئەو پێنج کەسە نین پێدەکەنن بەڵکو یەك کەسە. یەکەم کەس هەر لەگەڵ ئەوەی پێکەنینەکەی ڕاگرت، یەکسەر ئەوانی دیکەش ڕایانگرت.

پشیلەکان، عەباس و ئیپەك، بەدوای یەکدا ڕۆیشتن و قاچی هەر پێنج کەسەکانیان بۆنکرد، پاشان هەڵتووتەکان و سەیریان کردن، یەکەم پیاوە ڕەشتاڵەکە کاتێك سەیری کرد پشیلەکان لەبەردەمیان دانیشتوونو تێیانەوە ڕاماون، نیگەران بوو، سەراپای کەوتە لەرزین، هاوکات لەگەڵ ئەودا ئەوانی دیکەش لەرزین.

بەدەنگە مارئاساکەی گوتی: "کێ ناوی لەو پشیلە ناوە عەباس؟"

پشیلەکان بە بیستنی دەنگە مارئاساکەی ئەو پیاوە لەجێی خۆیان هەستانەوەو بەرەو لای ئەسکەلە ڕۆیشتن، هەرکە گەیشتنە لای پنجە بیبەرە کێویلکەیەك ڕاوەستان و خۆیان لێستەوە.

"من ناوم ناوە."

"ئەم ناوە ناوی باپیرتە؟"

"نە."

"ناوی مامەتە، باوکتە، هی خۆتە؟"

دەنگ، نیگا تیژەکەی بڕیە ناوچاوی پزیشکی ئاژەڵان.

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "ناوی هاوڕێیەکی سەردەمی سەربازیمە کە لەگیانی خۆم زیاترم خۆش دەوێت، خەڵکی ئەرزەڕۆمە."

ئەو پیاوەی کە وەکو بەردێك بێجوولە لەو ناوە وەستابوو گیانێکی هاتەوەبەر، تەنانەت دەستەکانی لەسەر ئەژنۆکانی کردنەوەو جوولاندنی. پیاوە ڕەشتاڵەکانی دیکەش وایانکرد.

"ئەو هاوڕێیەت لەکوێیە؟"

"ئێمە هەردووکمان بە دیلی کەوتبووینە دەست ڕووسەکان."

لەم ساتەدا دکتۆر سەلمان سامی لەجێی خۆی هەستاو گوتی:

"ئێستا ئاشکرایە کە ئەم پیاوانە هاتوون لێکۆڵینەوە لەبارەی ڕەچەڵەکنامەی پشیلەکەی ڤاسیلیەوە بکەن." پشتی تێکردن و یەکڕاست بەرەولای قامیشەڵانەکە ڕۆیشت. دکتۆر خەلیل ڕەفعەتیش هەستاو گوتی: "ئاشکرابوو" کەوتەڕێ.

یەکەم پیاو کە نەیزانی چیبکات، بێدەنگەی لێکرد. پزیشکی ئاژەڵان گەیشتە هانای:

"کاتێك شەڕ لەچاناك قەڵا بوو، ئەو کلێسا وێرانەیەی رووبەڕوومان کرابووە نەخۆشخانەی سەربازەکان. دکتۆرەکان کە هەستان و رۆیشتن، یەکەمیان پلەکەی سەرگوردە، دووەمیان نەقیبە. دوای ئەوەی خانەنشین کران هاتنە ئێرەو لێرە نیشتەجێ بوون. منیش پزیشکی ئاژەڵانم، لەبەر کەمئەندانبوونمەوە خانەنشین کراوم. هەموو تورکیا گەڕام، هیچ جێگایەکم ئەوەندەی ئێرە جوانم نەدۆزیەوە، هاتم و لێرە مامەوە."

"عەباس چی لێهات، تەرمەکەیت بە چاوی خۆت بینی؟"

"نەمبینی."

"ئێستا لەکوێیە؟" دەنگی وەکو زیکەی مار وابوو" ئێستا دەبێت لەکوێ بێت؟"

"کەوتبووینە ژێر بەفرەوە."

"چۆن دەربازت بوو؟"

"لەقەدپاڵی چیاکانی ئەللاهوئەکبەر، گشتمان لەژێر بەفردا مابووینەوە هەموو ئەوانەی لەسەر بەفرەکە مابوونەوە رەقبوونەوەو بوونە پارچەیەك سەهۆڵ. ئەو قەدپاڵەی چیا یەکپارچە بووە جەنگێك لەمرۆڤە بەسەهۆڵبووەکان."

"تۆ چۆن دەربازت بوو، ئەمەم پێبڵێ."

"ئێمە؟، نازانم. ئاگام لەهیچشتێك نیە. سەربازانی رووس ئاوا ئێمەیان لەژێر بەفرەکان بەوحاڵەتە بەسەهۆڵبووەیەمان هێنابووەدەر. من لەنەخۆشخانە بەئاگا هاتمەوە. قاچێکم سەرما بردبووی. شانی راستم هەلاهەلا بووبوو، یەکێك لەدکتۆرەکان تاتار بوو، ئاوا پێکەوە دەڕۆیشتین، باش ئاگایان لێم بوو و پێمڕاگەیشتن، شانیان دەرمان کردم، دەستێکم کورت بوو. قاچیان دەرمانکردم. تا بەهار داهات لەنەخۆشخانە بووم. سەرگوردە تاتارەکە منی بردە لای عەباس، یەکدیمان گرتە باوەش، گریاین. دوای ئەوەی کە لەعەباس جیا بوومەوە سەرگوردە تاتارەکە گوتی، ئەگەر دەتەوێت لێرە رابکە، ئەگەرنا بتبەنە رووسیا رەنگبێت چەند ساڵی پێبچێت تابتگێڕنەوە، ئەوەش دیار نیە. گوتم من چۆن بتوانم عەباس بەجێبێڵم گوتی تۆ خۆت قوتاربکە، دیارنیە چی بەسەر عەباس دێت، ئەو هەموو گیانی برینە و سەرما بردوویەتی، چوومە لای عەباس و هاوارم کرد، دواجار چاوەکانی کردنەوە، سەیری کردم و بزەیەك کەوتە سەرلێوانی لەپڕ حاڵەتی دەموچاوی گۆڕا، رەنگ لەبەر رووانی نەمابوو، نەمتوانی سەیری بکەم. بەدەنگێکی کزو مردەنی گوتم، دەڵێن هەموو سوپا سەرما لێیداوەو بووەتە سەهۆڵ،

قەدپاڵی ئەو چیایە لەو سەربازە بەسەهۆڵبووانە بۆتە جەنگەڵستانێك. گوتی وای چاوەکانی داخستنەوە. منیش لەعەباس جیابوومەوە، دەستی سەرگوردە تاتارەکەم ماچ کرد. پێیگوتم، خواحافیزت بێت برام. هاتمە ئەم دوورگەیە. ئەم پشیلەیەم دۆزیەوە. لەو دوورگەدا هیچ شتێکم نەبینی جگە لەباڵندەو مارو مێرووولەو پەپوولەکان. ئەم پشیلەیە بووە هاوڕێی گیانی بە گیانیم."

"عەباس ئەگەر چاك ببێتەوەو بگەڕێتەوە بۆشارەکەی دەتوانێت تۆ لەم دوورگەیە بدۆزیتەوە؟"

"دەتوانێت بمدۆزێتەوە."

"چۆن چۆنی؟"

"لەنێو مزگەوتی شاری وان دەروێشێك هەیە، ئەگەر عەباس بتوانێت خۆی دەرباز بکات، بۆ دۆزینەوەی من یەکڕاست دەچێتە وان. لەوان لە هەرکەسێك بپرسێت من دەناسێت، هەڵبەتە لەوێ تەنها دوو کەس ماون کە یەکێکیان سۆفیەو لەمزگەوتی گەورەیە. ئەگەر نەمردبێت ئەو دێتە سۆراغی من. دووەمیان گریگۆری ماسیگرە کە لەدوورگە دەژیت و لەدنیا بێخەبەرە."

"ئەم عەباسە نەمردووە، زیندووە."

پزیشکی ئاژەڵان پرسی گوتی: "لەکوێیە؟"

"لەیەکێك لەم دوورگانەیە."

"لەهەر جێگایەك بێت من دەیدۆزمەوە، دەیدۆزمەوە، دەیهێنم بۆلای ئێوە. دەتانەوێت چی لێبکەن؟"

"ئەگەر بیدۆزیەوە، هەردووکتان لەبەر زێڕ هەڵدەکێشم."

"دەیدۆزمەوە ئەگەر لەم دەوروبەرانە بێت."

هەستا، ئەوانی دیکەش هەمانکات هەستان.

"زۆرباشە، ئێوە بەچیەوە دەزانن کە عەباس لەیەکێك لەم دوورگانەیە؟"

یەکەمین پیاوە رەشتاڵەکان، قۆڵی خستە نێو قۆڵی پزیشکی ئاژەڵان، یەکڕاست بۆلای قامیشەڵانەکە رۆیشتن.

"لەئەستەنبۆڵ دەزانین. لە شای چەچەنی کە لێرەیە."

"عوزێرخان. ئەو چۆن دەزانێت؟"

"ئەو شاچەچەنیە لەئەستەنبۆڵ دوو کوڕی هەن. هاوڕێی کوڕەکانی ئەومان بینی. ئەو پیاوە کاتی خۆی شابووە، بەڵام ئێستا کارمەندی دایرەی نفوسە. ئەو گوتویە کە بۆ کوڕەکانی خۆی باسی کردووە، قارەمانێکی گەورەیە بەناوی عەباس هاتۆتە دوورگە. ئێمە عەباسمان لەدوورگەی ئێوە دۆزیەوە، بەڵام ئەوەیان پشیلەیە، بۆیە ئەو عەباسەی ئێمە بەدوایدا دەگەڕێین بەم ناوچەیەدا تێپەڕیوە."

"لەخانی چەچەنتان پرسی."

"پرسیمان. سێ شەو و سێ ڕۆژ سەیری تۆمارەکانی دائیرەی نفووسی کرد و گوتی کەسێك بەو ناوە لێرە نیە..."

"ئەگەر سەری لەم ناوچەیە دابێت، تەنانەت ئەگەر بەسەر ئاوی دەریاشدا تێپەڕیبێت، من شوێن پێی دەدۆزمەوە، دەیدۆزمەوەو دەیهێنمە لای ئێوە، ئەگەر لەماوەی مانگێکدا نەمتوانی بیدۆزمەوە، مانای وایە یان مردووە یان نەهاتۆتە ئەم دەوروبەرانە. لەجێگای دیکەدا بۆی بگەڕێن، کاتێکیش دۆزیتانەوە ئاگادارم بکەنەوە. ئەو هەم برامەو هەم قارەمانێکە. سەری گوندەکەیتان دا؟ خەڵکی گوندی (ئۆرسۆر)ی سەر بە شارۆچکەی (خینیز)ی ئەرزەرۆمە. هیچ ئەو ناوچانەی بۆ گەڕاون؟"

"مەگەر دەکرێت نەگەڕابین، پێنج جاران چووینە ئەوێ، هەر پێنج جاریش گوندەکە چۆڵ بوو. تەنانەت پشیلەیەکیشیان لەو گوندە نەهێشتبوو. گەڕابوونەوە زێدی ئەسڵی خۆیان، قەفقاز."

"ئەگەر عەباس بتوانێت چاك ببێتەوە ئەوە دەگەڕێتەوە گوندەکەی خۆی، کاتێکیش بچێت و ببینێت گوند چۆڵە..."

"کەواتە تۆ دەڵێیت چووبێتەوە قەفقاز؟"

"ئەو ناچێتە قەفقاز"

"تۆ دەڵێیت بچین لە گوندەکەیان چاوەڕێی بکەین؟"

"بەڵێ، ئەو کێوو کانیاوە پڕ گوڵ و گوڵزارەکانی زۆر خۆش دەویست. هەروەها ئەستەنبۆڵیش، عاشقی ئەستەنبۆڵ بوو. وەك چۆن مرۆڤێك شەیداو دڵدادەی کچێکی جوان دەبێت ئەویش ئاوا عاشق و شەیدای ئەستەنبۆڵ بووبوو."

هوسمەن بەرلەوەی ئەوان قسەکانیان تەواو بکەن گوتی:

"هۆی برادەرینە، ئەگەر ئەو عەباسەی کە ئێوە باسی دەکەن پشیلەکەی ئێمە نەبێت و کەسێك بێت ئێوە بۆچی ئاوا بە رشتی بەدوایدا دەگەڕێن؟"

یەکەم پیاوە ڕەشتاڵەکە مات و ماڵقماو مایەوەو ئەوانی دیکەش بە هەمانشێوە. یەکەم پیاو سەیری لای ڕاستی کرد، پیاوە ڕەشتاڵەکانی دیکەش وەك ئەو سەیری لای ڕاستیان کرد و ئینجا سەیری لای چەپیان کرد. پیاوە ڕەشتاڵەکە ماوەیەك بێدەنگ بوو و هیچ وشەیەکی بۆ گوتن نەدۆزیەوە.

هوسەمن سوودی لەو بێدەنگیەی پیاوە ڕەشتاڵەکە وەرگرت و گوتی:

"ئێوە هەموو شتێك دەزانن. سەرتاپا ڕەشتان پۆشیوە، کڵاوی ڕەشتان ناوەتە سەر، چەکمەی ئاوەزێنەداری ڕەشتان کردۆتە پێتان، هاتوونەتە ئێرە و خەریکن وەکو کێو دەنەڕێنن. هەرکەسێك بتانبینێت زەندەقی دەچێت. عەباس چ نزیکایەتی و خزمایەتێکی لەگەڵتاندا هەیە، چ کارێکتان پێ هەیە، ئەو عەباسە چ کارەیە، کەسێکە لە خزمەکانتان یان دوژمنەکانتان؟"

پیاوە ڕەشتاڵەکە کاتێك نەیتوانی وەڵامی هوسەمن بداتەوە بەدەنگە مارئاسایەکەی فیشکاندی و گوتی:

"تۆ ئیدی کێیت، بۆچی هاتوویتە ئێرە، لەکوێوە هاتوویت؟"

پیاوە ڕەشپۆشەکانی دیکەش بە چاوانی زەقیانەوە لەحاڵەتێکدا کە ڕەگی ملیان ڕەپ بووبوو، بەیەك دەنگ هاواریان کردو نەڕاندیان و هەمان ئەو ڕستەیان دووپات کردەوە.

کاتێك ئەوان بەو هەموو سەرسوڕمان و تاساویەوە هاواریان کرد، هوسەمن زیاتر هێزی دایە بەرخۆی:

"ئێوە کە هەموو شتێك دەزانن و بە هەموو هێزتان دەنەڕێنن، بۆچی ناتوانن گوندەکەی عەباس بدۆزنەوە؟ دۆزینەوەی کەسێك زەحمەتە، بەڵام دۆزینەوەی گوندێك زەحمەت نیە، ئێوە گوندێکی ئاوا گەورەتان بۆ نەدۆزراوەتەوە."

"تۆ لەکوێوە هاتوویت، کارت چیە؟"

پیاوە ڕەشتاڵەکە دەنگی خۆی نزم کردبووەوە. پیاوەکانی دیکە ئیدی قسەکانی ئەویان دووبارە نەکردەوە، بێدەنگ بوون، ملیان ڕاکێشابوو و چاوەڕوان بوون.

"من لەیۆنانەوە هاتووم، دووریانخستوومەتەوە، چیدیکەتان دەوێت، دووریان خستوومەتەوە. مستەفا کەمال پاشا ناردنیە ئەم دوورگەیە. لێرە خانوویێك، ژنێك و شەش دانە منداڵی وەك دەستە گوڵم هەن. نەتانتوانی گوندێکی بەو گەرەییە بدۆزنەوە، بەدوای کەسێکی ونبوودا دەگەڕێن، دێن پشیلەکەی دوورگەی ئێمە بدۆزنەوە. فیل نابینن، بەدوای مێشوولەدا دەگەڕێن. بێژن بزانم، ئێوە کێن، لەکوێوە هاتوون، دەچنە کوێ؟ ئەگەر بتوانم گوندەکە بدۆزمەوە پێتانی نیشان دەدەم."

پیاوە رەشتاڵەکە گوتی: "ئێمە گوندەکە پێدەزانین."

"ئێ کەوایە بۆچی ناچن بۆ ئەوێ و لەوێ بەدوای عەباسدا بگەڕێن؟"

"بەرلەوەی ئێمە بچینە گوندەکە، پیاوەکانی ئەمیر سەلاحەدین چوون دێهاتیەکانیان هەڵگرت و بردیانن. ئێستا بردوویانەتە کوێ نەمانتوانی شوێنەکەیان بدۆزینەوە. تەنانەت ئەگەر بشیاندۆزینەوە ناتوانین توخنیان بکەوین، پیاوێك هەر هیچ تەنانەت ناتوانین سەگێکیش بگرین. ئەوان لەژێر چاودێری و پشتیوانی ئەمیر سەلاحەدین دان."

پزیشکی ئاژەڵان پرسی:"خۆیەتی. ناکرێت لێی نزیك ببینەوە، ئەو شای جیهانە. ئەگەر عەباس پەنای نەبردبوایەتەبەر کۆشکی ئەو، ئێستا حەوت کفنی پۆشیبوون."

هەموان پێکەوە هەستان، بەرەولای ئەسکەلە رۆیشتن، یەکەم کەسیان لەسەر ئەسکەلە راوەستاو ئاوڕی دایەوە:

"کابرای دوورخراوە، هۆی کابرای دوورخراوە لەگەڵ تۆمە، دواجارت بێت رێگا پیشانی خەڵك بدەیت و ئەدای کەسێکی عاقڵ دەربڕیت، پێتوانەبێت هەموان وەکو ئێمە عەقڵ لە سەریاندا هەبێت. رەنگە لێرەش دوورت خەنەوە بۆ ئەو دنیا."

هوسمەن چووە ئەسکەلە و رووبەڕووی کابرا رەشتاڵەکە راوەستا:

"ببینە براکەم، من هیچ مەبەستێکی خراپم نەبوو، ویستم چاکەت لەگەڵدا بکەم. ئێستا بەهەرحاڵ لێم تووڕەبوویت، وادیارە زۆریش تووڕە بوویت. ئەگەر هەڵەیەکمان کردبێت تۆ بمانبوورە. ئێستا ئەگەر عەباسم لەم ناوانە بینی چۆن ئاگادارت بکەمەوە؟"

پیاوە رەشتاڵەکە نەرم بوو، هات دەستی دانایە سەرشانی هوسمەن، دەمی لە گوێی هوسمەن نزیك کردەوەو گوتی:

"ئەگەر بینیت بە بێدەنگی بڕۆ بە ڕەمزی کاولاکزادە بڵێ، وەکو قاروون دەوڵەمەندت دەکەم." سواری بەلەم بوو، پیاوەکانی دیکەش لەدوای ئەو سواربوون. بەلەم دوای بڕینی چەند سەد مەترێك ڕاوەستا، لەنگەری گرت و ئاوا چاوەڕێ ما. لەگەڵ تاریکبوونی هەوا چراکانی داگیرساندن، گۆڕا بۆ تۆپەڵێك ڕۆشنایی. ئاسمان پڕبوو لەئەستێران. یەکریز نەیزەك لەئاسمانەوە دادەکشانە دەریا.

کەشتییێکی بچوك لەدوورەوە، لەدەوروبەری دوورگەی کابا لەنێو تاریکیدا دەرکەوت، هەموو چراکانی داگیرساندبوو. بەلەم لەنگەری گرت، لەدوورگە نزیك بووەوە، دەستیکرد بەخولانەوە بەدەوری دوورگەدا. بەلەم کاتێك خەریك بوو بەدەوری دوورگەدا دەخولایەوە بووبووە یەکپارچە ڕووناکی. کەشتیە بچووکەکەش کەوتبووە دوای و دوورگەی نوقمی نێو نوورو ڕۆشنایی کردبوو.

بەلەمەکەو کەشتیە بچووکەکە تا بەیانی داهات بێڕاوەستان بەدەوری دوورگەدا خولانەوەو لەگەڵ ڕووناکبوونەوەی ئاسۆ لەگەڵ هەوای نیوە تاریك و ڕووندا تێکەڵ بوون و ون بوون.

کە خۆرهەڵات هەورێکی شینباوی توخی پەپوولان لەچوارلاوە بە لەرزە لەرزو لەرانەوە هات و ئاسمانی دوورگەی داپۆشی. سێبەری شینباوی پەپوولەکان هەموو دوورگەی داپۆشی و خانووەکان، لم و چەوەکان، درەختەکان، مرۆڤەکان، دەریاو هەموو شتێك شین هەڵگەڕا. تا خۆرئاوابوون هەموو دوورگە لەنێو ئەو ڕەنگە شینباوە تۆخەدا شەپۆلی دا. پەپولەکان دەوروبەری نیوەڕۆی ڕۆژی دووەم بەملاو ئەولادا بلاوەیان کرد و ڕۆیشتن.

بەلەمەکەو کەشتیە بچووکەکە بێوچان بەدەوری دوورگەدا دەخولانەوە، ئەوکاتەی کە دوورگە نوقمی نێو ڕۆشنایی بووبوو، دوورگەییەکان نەچوونە نێو خانووەکانیان، کاتێك بەلەمەکەو کەشتیە بچووکەکە بۆ ئەولای دوورگە ڕۆیشتن و ڕۆشناییەکە نەماو تاریکی گرتنیە خۆ، دوورگەییەکان لە شوێنی خۆیان نەجوولان، بێدەنگ و کڕوکپ چاوەڕێی گوللە تۆپەکان بوون. کاتێکیش بەلەمەکەو کەشتیە بچووکەکە تێکەڵی تاریك و ڕوون بوون و لەنێو تەم و مژی سەر دەریا ون بوون، ئەوان ئەوەیان بە شتێکی ئاسایی وەرگرت و هیچ قسەیەکیان لەبارەی نەگوت. ئەو کاتەیش کە پەپوولەکان ڕەنگە شینباوەکەیان بەدەوروبەردا پەرش و بلاوکردەوە و وەکو گەواڵەی هەور ڕێی خۆیان گرت و ئاسمانی دوورگەیان داپۆشی. یەکەمجار خۆشحاڵ بوون، پاشان ئەوکاتەی ئاسمانی دوورگە بەتەواوی داپۆشراو پەپوولەکان وەکو کانیەکی

بەخوڕیان لێهات سەریان سوڕماو نەیانزانی چیبکەن. کاتێك هەموو شوێنێك، روخسارەکان و دەستەکان و ددانەکانیان بە رەنگی شین هەڵگەڕاو سەریان هەڵبڕی و ئیدی نەیانتوانی چاو لەسەر ئەو پەپوولانە، ئەو کانیە بەخوڕە هەور ئاسایەی پەپوولان هەڵگرن. پەپوولەکان کە رۆیشتن ئاسمان چۆڵ و هۆڵ بوو، وایان بە زەین داهات کە ئاسمانیش لەگەڵ پەپوولەکاندا رۆیشتبێت. دوای رۆیشتنی پەپوولەکان هیچ قسەوباسێك لەنێوانیاندا نەکرا. چوونەوە ماڵەکانیان و تا هاتنەوەی موسا ئاغاو پۆیراز لەماڵەکانیان نەهاتنە دەر.

بەرەبەری بەیانی موسا ئاغاو پۆیراز لەبەلەمەکەی قەدریی بەلەموان دابەزین و پێیان نایە سەر ئەسکەلە. ئەوانەی کە ئەوانیان بینی یان هەواڵی هاتنەوەی ئەوانیان بیست لەچاوتروکانێکدا لەژێر دارچنارەکان کۆبوونەوە. قەدریی بەلەموان گونیەکان و توورەگە لەسەریەکدانراوەکانی لە بەلەم هەڵگرتن و داینانە سەر مێزەکان. زەهراو نەسیبەش بەڕاکردنەوە هاتن و باوەشیان بە باوکیانەوە کردو پاشانیش تەوقەیان لەگەڵ پۆیراز کرد. سیمای زەهرا دیسان سوور هەڵگەڕابوو و دەستەکانی دەلەرزین. کچەکان کاتێك رووخساری ئارام و چاوە پڕ لەبزەکانی باوکیان بینی، یەکەمجار تاسان، بەڵام دواتر بە پێکەنینەوە گوتیان:

"بەخێربێنەوە."

"سوپاستان دەکەین."

شادمانی لەدەنگی موسا ئاغا شەپۆلی دەدا.

"منداڵەکان هەموویان لێرەن؟"

گوتیان: "لێرەن."

منداڵەکان لەچاوقوچانێکدا دەوریان دان.

"وەرن ببینم."

موسا ئاغا بەرەو مێزەکە چوو، منداڵەکانیش بەدوای داچوون...گونیێکی بچوکی بەردەمی هەڵگرت، تاوێك بەکردنەوەی زارکی گونیەکەوە خەریك بوو، قەدریی بەلەموان داوەکەی کردەوە.

موسا ئاغا گوتی: "گونیەکە لەسەر مێز هەڵبڕێژە ببینم."

لەنێو گونیەکە قووتوی بچووك بچووك هاتنەدەر."بەلەموان بەسەر منداڵەکاندا دابەشیان بکە؟"

بەلەموان یەکسەر قووتوەکانی دابەش کرد. مندالّەکان بەو قووتوانەی بە دەستیانەوە بوون ئاوا مانەوە.

موسا ئاغا یەکێك لەقووتوەکانی دیکەشی هەلّگرت و دایە بەلەموان:

"ئەمەشیان بکەرەوە؟"

بەلەموان قووتوەکەی کردەوە، مندالّەکان لەدەستەکانی ئەو نزیك بووبوونەوە.

"یەکێك لەوانە هەلّبگرەو بیخەرە دەمتەوە."

بەلەموان زارکی قووتوەکەی کردەوە، نوقلّی پەمەیی پەمەیی لەتەك یەکدا هەلّچنرابوون، مندالّەکان کە تاسابوون، هاوکات لەگەلّ بەلەموان ئەو قووتوە بچووکانەیان کردنەوە کە لەنێو دەستیان بوون و لە موسا ئاغا رامابوون. موسا ئاغا لەقووتوەکەی بەلەموان بەسەر پەنجەکانیەوە دانەیەك لەو نوقلّانەی هەلّگرت، گەردی شەکری نوقلّەکە بە پەنجەکانیەوە نوسا، نوقلّەکەی خستە دەمیەوە، پەنجەکانی لستنەوە، مندالّەکانیش تەواو ئەوەیان کرد، قەدریی بەلەموانیش هەروای کرد. مندالّەکان کە تامی تێکەلّ بە بۆنی گولّیان لەنێو دەمیان هەست پێکردبوو وروژان و بەسەرو سەداوە بە خوار قامیشەلّانەکەدا بەرەو دەریا شۆڕیان کردەوە، بەر لەوەی کە بگەنە خوار دارزەیتوونەکان چوونە سەرووی هەلّدێرگەکە و قاچیان بە هەلّدێرگەکەدا شۆڕکردەوە، لەکاتێکدا سەیری یەکدیان دەکرد، نوقلّەکانیان بە کاوەخۆو بە مژینەوە خوارد.

موسا ئاغا بە ئەدایەکی فەرماندەرانە گوتی:

"کیسەکانی دیکەش بکەنەوە."

کیسەکانیان کردنەوە. مەرێکی کەولّکراویشیان کڕیبوو.

"خانمەکان، ئەم مەڕەتان چۆن پێباشە وای لێبنێن، بەپێی مەیلی خۆتان." کچەکان بە سەرسامیەوە سەیری باوکیان دەکرد. شێوەی وەستان و رۆیشتن و تەکاندانی دەست و سەیرکردن و هەموو شتێکی باوکیان گۆڕابوو. دەتگوت ئەمە هەمان ئەو کەسە نەبوو کە دەستەکانی دادەنانە سەر سنگی، قسەکردنی لەبیر چووبووەوە و خۆی فەرامۆش کربوو و وەك خەوالّوان دەژیا. مەلەك خانیش ئەو گۆڕانەی هەست کردبوو و دەترسا. ئایا بڕیار وایە سبەی زوو بگەڕێتەوە کرێت؟

زەهرا نەیدەتوانی ساتێك چیە چاو لەسەر باوکی هەلّبگرێت. باوکی گەنج بووبووەوە، لۆچەکانی روخساری کرابوونەوە و قسەکردنی وەکو جاران حالّەتی فەرمانەدرانەی بەخۆی

گرتبوو و تا بڵێی بووبووە مرۆڤێکی متمانەبەخۆ کە وەکو جاران کاتێك خۆشحاڵ دەبوو ئەو خۆشحاڵیەی دەگواستەوە کەسانی دەوروبەری.

زەهرا دواجار نەیتوانی خۆی بگرێت، چوو قۆڵی باوکی گرت و پێکەوە تا قامیشەڵانەکە رۆیشتن. قۆڵی باوکی گرت و ناچاری کرد بوەستێت، کەوتنە رووبەڕووی یەك، گوتی: "بڵێ باوکە، چی روویدا، چی لەو شوێنانە روویدا کە بۆی چوویت؟"

"شتگەلێکی زۆر کچم، شتگەلێکی زۆر. ئێستا ناتوانم هەموو شتێکت بۆ باس بکەم. دوایی یەکە یەکە هەمووتان بۆ باس دەکەم."

لەم ساتەدا نەسیبەشیان هاتەلا، دوای ئەویش مەلەك خانم. موسا ئاغا بەدەمیانەوە پێکەنی. "منیش دەمەویست ئاکامی کارەکان بۆ زەهرا باس بکەم." نەسیبە و مەلەك خانم کەمێك زیاتر لێی نزیك بوونەوە. "لە ئەنقەرە لەکابرایەك،" بە دەم پێکەنینەوە، "لەکابرایەك کە خۆی بە مرۆڤ دادەنا رەفتارێکی سووك و نامەردانەم بینی. کە لەئەنقەرە زانیم باڵیۆزخانەی یۆنان لەئەستەنبۆڵە چووینە ئەوێ. سەعید رەحمی هاوڕێم دۆزیەوە. لەهەموو شوێنەکان رێوانی کردین. باڵیۆزی یۆنان هاوڕێی بوو، باڵیۆز واتە دەوڵەتی وڵاتێك. گفتی پێداین، گوتی زۆر زوو دەتانگێڕمەوە کرێت، لای ئەسپ و خۆشەویستەکانتان. کاتێك ئەوەی گوت، پێمانگوت باشە. شتێکی چەند چاکتان کرد کە باولەکانی خۆتان نەکردنەوە کچەکانم."بەرەو لای چنارەکان رۆیشت. نەسیبەش بەدوایدا رۆیشت، زەهراو مەلەك خانم لەهەمان شوێن وشك هەڵاتن، نەیانتوانی نە قسەیەك بکەن نە سەیری روخساری یەکدی بکەن.

کەمێك دواتر مەلەك خانم هاتەوە سەرخۆی و گوتی:

"دیارنیە کچم، تۆ هیچ خۆت نیگەران مەکە، هەرگیز دوورخراوەکان قبوڵ ناکەنەوە، بەلەموان پێیگوتم. قەدریی بەلەموانی من زۆر ژیرە، هەستان و دانیشتنی لەگەڵ پاشاو بەگەکاندا هەیە، ئەو کەسانەی کە دوور دەخرێنەوە، ئیدی هەرگیز ناتوانن بگەڕێنەوە." دەنگی خۆی بەرزکردەوە: "هەرگیز."

"دەترسم خاتوون، تۆ باوکم دەناسیت، ئەو هەر چۆنێك بێت دواجار دەگەڕێتەوە بۆ کرێت، ئەو هەر بڕیارێك بێت جێبەجێی دەکات."

مەلەك خانم بێدەنگ بوو، چاوی بڕیە نێو چاوەکانی زەهرا. پاشان گوتی:

"تۆ چەند جوانی کچەکەم. لەبەندە هەڵبژێردراوەکانی خواوەندی. مخابن نیە بۆ تۆ؟"

زەهرا گوتی: "تۆش زۆر جوانی مەلەك خانم، مخابن نیە بۆتۆش؟"

"نیگەران مەبە کچەکەم، نیگەران مەبە، -شەو ئاوسە بزانین سپێدە چ دەزێت-، ئێوەش لەوێ لەو ئیدۆمانەتان هەن؟"

"هەمانە."

"ببینە کچەکەم، لەوێ هەر گفت و بەڵێنێکی بە باوکتیان دابێت، مستەفا کەمال پاشا لەقسەی خۆی پەشیمان نابێتەوە، باوکت ئیدی ناتوانێت پێ بخاتەوە کرێت. رەنگبێت بڵێن لێنا چووە یۆنان و لەوێ رایکردو هاتەوە دوورگەی خۆی، بەڵام ئەگەر حکومەت ئەمە ببینێت، لێنا یەکسەر دەگەڕێنێتەوە لای یۆنانیەکان. تازە لێنا لەجەنگدا چوار جگەرگۆشەی لای مستەفا کەمال پاشا بوون. دوو لەکوڕەکانی لەلای مستەفا کەمال پاشا شەهید بوون. ئێستاش دوو لەکوڕەکانی لای ئەون. پۆیراز دەڵێت ئەگەر حکومەت پێبزانێت کە ئەو لێرەیە، یەکسەر دووری دەخەنەوە بۆ وڵاتی یۆنان. مەگەر دەکرێت رێگە بە ئێوە بدەن بچنەوە خاکی کرێت؟ باوکت دڵی خۆی تەسکین دەدات. من لەباوکت دەپرسم و تاوتوێی بابەتەکە دەردێنم."

"بپرسە مەلەك خانم، بپرسە تا من نەمرم."

"منیش نەمرم کچەکەم، منیش."

هوسمەن سەری لەقەسابییش دەردەچوو. مەڕەکەی لەتلەت کرد. گۆشتەکانی هی کەباب، نەرمك و سیپەلاك و جەرگی لەسەر مێزەکە دانا.

شەریفە خانم گوتی:

"ساجێکم بۆ بێنن."

پزیشکی ئاژەڵان پرسی:"ساج چیە، بەکەڵکی چی دێت؟"

"نانی لەواشەی لەسەر دەبرژێنین."

گوتی:"لە شارەکەی ئێمەدا نان لەنێو تەنووردا دەبرژێنن، هەروا لەواشەو ئەستوورکیش،.. ئاا، ئەمە چەند ساڵە کە نانی تەنوورم نەخواردووە."

دیسان ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا.

"دڵم بۆ بۆنی نانی تەنوور تەنگ بووە ئاااە! بۆنەکەی کاتێك کە لەتەنوور دێتەدەر تەواو بۆنی خاکی لێدێت، ئاااە!"

"من بەمزووانە نانی تەنوورت بۆ دەبرژێنم. لەشاری ئێوەش نانی ساجی و قورمەی ساجی دروست دەکەن. ساجەکە سەراوژێر دادەنێنە سەر ئاگر و تەنیەکەی پاك دەکەنەوە و ناوەوەی پڕدەکەن لەگۆشتی قیمەکراو و پاشانیش ئاگری دەدەنە بن."

پزیشکی ئاژەڵان بە وروژانەوە هاواری کرد:"تێگەیشتم."

پزیشکی بەڕێز، تەنانەت ئەگەر ساجیشمان دەست نەکەوت، بە هاوسەرەکەم دەڵێم تەنوورێك دابڕێژێت، لێرە نانت بۆ دەبرژێنم، جا چ نان! باران بباریێت و دڵۆپە درشتەکانی باران داببارنە سەر زەوی و بۆنی خاك بەرزببێتەوە و مرۆڤ مەست و شەیدا بکات و بۆنی نانی تازە بەدوایدا. بۆنی خاك و نان پێکەوە دەخۆین و لەخۆشیان وەك پەڕێکت لێدێت و باڵ دەگریت و دەچیتە ئاسمانان."

"سوپاست شەریفە خانم."

لەسەر پەنگران گۆشتیان برژاند، ڤاسیلی دەمێك پێشتر بتڵە شەرابەکانی هێنابوون و زارکیانی کردبووەوە و دایناببوونە سەر مێزەکە. دوو بتڵی نۆشاوەی دارقەزوان و دوو بتڵی راکی سەرمۆریش لەپشت بتڵە شەرابەکان داندرابوون.

دوای ئەوەی کە گۆشتەکە داندرایە نێو قاپان، خواردنەوەی شەراب دەستی پێکرد. موسا ئاغا قومێك شەرابی خستە دەمیەوە و تاوێك لەسەر زمانی رایگرت، هێنای و بردی، گوتی: "شەرابی وا نە لەکرێت هەیە و نە لەفەڕەنسا، ئەو شەرابە لەکوێوە دێت؟"

ڤاسیلی ئەو گردەی نیشان دا کە لەپشت باخە سەوزەکانەوە بوو و پلە پلە هەڵکشابوو:"ئاغا، ئەو شەرابە لەو باغانەی ئەو گردەوە دێت. تاناسی کارینجا ئازمەز ئەم شەرابانەی لە ترێی ئەو رەزانە دروست کردووە."

"بە خۆشی تاناسی کارینجا ئازمەز!"

هاوکات لەگەڵ موسا ئاغا پەرداخەکانیان بەرزکردەوە:

"بە سەلامەتی تاناسی کارینجا ئازمەز!."

"بە سەلامەتی ئەو، بە سەلامەتی ئەو."

کەس نەیدەزانی کێ ئەو ناوەی کارینجا ئازمەزی لە تاناسی ناوە. دوای ئەوەی پەرداخ لەسەر پەرداخ بە خۆشی تاناسی هەڵدران و نۆشکران، ئەمجارە بە خۆشی هەموو ئەوانەی لەوێ ئامادەبوون پەرداخەکانیان هەڵدا و خواردیانەوە. کاتێك خەریك بوو خواردنەوەکان تەواو ببن و

بتڵەکان چۆڕیان تێبکەوێت، وا سەرمەست و خۆشحاڵ بووبوون کە ئیدی بە خۆشی هەموو بوونەوەرانی دنیا، دڕندەو باڵندەکان، زیندەوەران، خشۆك و ماسیەکانی نێو دەریایان پەرداخەکانیان هەڵدان و خواردیانەوە.

زەهراو نەسیبە مات و مەبهوت مابوون. باوکیان هەرگیز تا ئەو رادەیە شادو خۆشحاڵ نەبینیبوو. ئەو هەمیشە کەسێکی سەرگران بوو. رەفتارەکانی لەکاتی تووڕەبوون و شادمانیشدا هەروابوو.

"بەسەلامەتی ئەو تاناسی کارینجا ئازمەزەی کە ئەم باغانەی دروست کردوون و دارمێوەکانی خزمەت کردوون و شەرابێکی وا بەتامی لەترێی ئەو رەزانە چێکردووە و ئەو راکیانەی کە بۆنی بنێشتی دارقەزوانیان لێدێت کرپیوە و بۆ ئێمەی داناون و خۆی رۆیشتووە."

کچەکان هەرگیز باوکیان، هەرچەندەش بیخواردبایەوە، ئاوا کە زمان لەدەمیدا نەدەگەڕا، نەبینیبوو. موسا ئاغا کاتێك چۆڕەی لە بتڵە راکیەکە هێنا بە جۆش و خرۆشێکی گەرمەوە گوتی:

"کە گەڕامەوە کرێت یەکەمین کارم، بەڵێ یەکەمین کارم، دۆزینەوەی تاناسی ئەزمەزە. دەیدۆزمەوە و لەگەڵ خۆمدا دەیبەم بۆ کێڵگەکەم. باشترین و بە پیت و بەرەکەتترین زەویەکانی خۆمی دەدەمە دەست تاکو رەزی ترێ دابنێت و شەراب دروست بکات. ئەسپی عارەبی دەدەمێ. خۆیشم گوندەکانی یۆنان یەك بە یەك دەگەڕێم و لەم رۆژگارەدا کە مرۆڤایەتی نەماوە، کەسێکی بێگەردو عارفی وەك تاناسی بە خەڵکەکە دەناسێنم. بە رۆژنامەکان دەڵێم. چاوی هەموو یۆنان لەسەرسامیدا مۆلەق دەبێت."هەستا بەلاکەلاك بەرەولای پۆیراز کە تا ئێستا بزەیەك لە سیمایدا دەرنەکەوتبوو هەستاو قۆپچەی چاکەتەکەی داخست. موسا ئاغای باڵابەرز دەستەکانی خۆی دانانە سەرشانەکانی ئەو:

"دەزانن، ئەو کوڕە قارەمانە ئێستا رێگای کرێتی بۆ کردوومەتەوە. ئەو من دەنێرێتە زێدی خۆم. ئەو لەپێناو مندا لەئەنقەرە بەرگەی رەفتاری نابەجێی گرت و قسەی نەکرد. ئەم قارەمانەی بەرەی رۆژهەلات، ئەو گەنجە قارەمانەی شەڕی سەربەخۆیی، تەنها لەبەر خاتری من، تەنها لەبەر خاتری من لەگەڵ فەرماندەکەی، تەنها لەبەر خاتری من شەڕی کردو ئایندەی خۆی پایەماڵ کرد. منیش دەمەوێت لەگەڵ خۆمدا هەڵیبگرم و بیبەمە کرێت. ئەگەر نەیەوێت لەکرێت بژیت دەچم لە ئەسینا خانووێکی بۆ دەکڕم. ئەو شایستەیی ئەوەی هەیە کە کۆشك و

ئەسپی ڕەسەن و ئوتومبێلی هەبن، کارێك دەکەم لەو بەڵایەی کە هەرەشەی لێدەکات دەرباز ببێت. ئێستا سەیربکەن چۆن دەربازی دەکەم. هەرکەسەو لەژێر کراسی خۆیدا کەسێکە.

ئەو تا زیاتر قسەی دەکرد، زەهراو نەسیبە زیاتر تەریق دەبوونەوە. پۆیراز چووبووە ژێر باڵی موسا ئاغا و دەیبردەوە بۆ ماڵەوەیان، قاچەکانی موسا ئاغا تێکدەئالآن و بەملاو ئەولادا رادەهەژا. زەهرا یەکسەر هات و ژێر باڵی دیکەی گرت. بەزەحمەت لەپلیکانەکان بەسەرکەوتن. موسا ئاغا لەسەر پلیکانەکان زۆری نەمابوو بکەوێت. پۆیراز بە زەحمەت توانی رایبگرێت و نەهێڵێت بکەوێت و بردیەوە بۆ ژوورەکەی. یەکسەر هاتەوەدەر، زەهراش تا سەر پلیکانەکان لەگەڵی چوو و بەرێی کرد:

"بڕیارە سبەینێ بچمە لای شەریفە خانم، تا عەسر لەوێ دەمێنمەوە، جاجمێکی چنیوە."

پۆیرازیش دانەوی و شتێکی چرپاندە گوێی ئەو:

"سبەینێ ڤاسیلی دێتە ماڵی شەریفە خانم، پێتدەڵێت من لەئاشەکە چاوەڕێی دەکەم، بەنێو دارزەیتوونەکاندا بچیتە سەرێ، کەس ناتبینێت."

دڵی هەردووکان کەوتبووە لێدان. پۆیراز دەستی کچەکەی گرت و، دەستی هەردووکیان زۆر سەیر دەلەرزین. پۆیراز کاتێك خەریك بوو لەپلیکانەکان دەچووە خوار، دەستی بە ئاسنەکانی ستارەکە گرت. قاچەکانی شل بووبوون. بەزەحمەت توانی خۆی بگەیەنێتە ژێردارچنارەکان. سەیری چەپ و راستی کرد، کەس لەوێ نەبوو. هەر خەریکی سەیرکردن بوو کە دەنگی پێیەك لەلای قامیشەلانەکەوە هات. گوێی راگرت، دەنگێکی وەك دەنگی پێی ڤاسیلی بوو.

"ڤاسیلی!"

"ئەوە منم."

هات لەتەك ئەودا دانیشت.

"شتێکت دەوێت؟"

"چۆنت زانی؟"

"گرنگ نیە چۆنم زانی، بێژە."

"تۆ قفڵسازێکی شارەزایت، وانیە؟"

"تۆ چیتدەوێت، بیڵێ."

"سبەی بەر لەوەی هەوا رووناك ببێتەوە، قفڵێك دێنیت، دەچیت لەدەرگای ئاشەکەی دەدەیت، پاشان کلیلەکەشی دەدەیتە من. من بەر لەوەی کە کارت تەواو بوو دێمە لات. پاشانیش دەچینە لای شەریفەخانم، ئەو جاجمێکی چنیوە، دەچیت دەیبینی. زەهراش وا بڕیارە بچێتە ئەوێ، هەر تۆ ببینێت بەسە."

ڤاسیلی هەستا:

"یاللا هەستە برام، ئەمڕۆ زۆر ماندوو بووم، سبەینێ دەبێت زوو لەخەو هەستیت.

"تۆ چۆن دەزانیت من سبەینێ دەبێت زوو لەخەو هەستم؟"

"من نەزانم دەبێ کێ بزانێت. مەگەر ئەوەی قفڵی دەرگاکە تۆ پێتنەگوتم، مەگەر ناتەوێت کلیلەکەیت بدەمێ؟"

"ئەمە تەواوە، سبەینێ قسە دەکەین."

هاتنە ماڵی پۆیراز، قۆڵ لەنێو قۆڵی یەکدی بەپلیکانەکاندا سەرکەوتن، دایکە لێنا هات. چوونە ژووری نووستن، ڤاسیلی و لێنا جلەکانیان لەبەر داکەندو جلی نووستنیان کردەبەری، پۆیراز هەرکە سەری گەیاندە سەر بالیف خەوی لێکەوت.

بەیانی زوو لەخەو هەستا. یەکنەفەس خەوتبوو. لەنێو جێ هاتەدەر، چوو ئاوێکی بە خۆیداکرد، بەجوانی ریشی تاشی، لێنا قاوەڵتی ئامادەکردبوو، بۆنی چا هەموو خانووەکەی گرتبووە خۆی. پۆیراز بەخێرایی لەسەر سفرەکە دانیشت. لێناش بەهەمان خێرایی کتریە هەڵماویەکەی هەڵگرت و دوو کەوچك شەکری رووکردە نێو پەرداخەوەو چای بۆ تێکرد. پۆیراز وا بەخێرایی قاوەڵتی دەخوارد کە دەتوانین بڵێین دەستەکانی نەدەبیندران. هەر لەگەڵ ئەوەی قاوەڵتیەکەی تەواو کرد، لەکاتێکدا دوایین پارووی هەر لەنێو دەم بوو خۆی گەیاندە پلیکانەکان. نەیزانی چۆن لەپلیکانەکان چووە خوار. خۆی لەبەردەم ئاشەکە بینیەوە. کلیلەکەی لەنێو دەست بوو. کلیلی خستە نێو قفڵەکە، دەرگاکە کرایەوە، نەیزانی چۆن لەبەیتوونەکە بەسەرکەوت، خۆی لەبەردەم سەکۆی پەنجەرەکە بینیەوە، هەر لەوێدا دانیشت، پشتی دایە دیوارە ئەستوورەکەوە ئەژنۆکانی خڕ کردنەوە. هەوا خەریك بوو کەم کەم رووناك دەبووەوە. ئەو تەمەی کە سەر دەریاکەی پۆشیبوو لەکاتێکدا کە ئارام ئارام لەنێو تاریك و رووندا دەهاتەدەر بۆ ئاسمان بەرز دەبووەوە.

پۆیراز لەپڕ چاوی کەوتە بەرامبەرەکەی، لەولاتر کەشتییێك تێدەپەڕی کە چراکانی داگیرساندبوون. گەڵای دارسپیندارێکی بەرز دەلەرانەوە، جگە لەدەنگی باڵەفڕەی باڵندەیەك کە لەدەوەنجارەکەی لای خوارەوە دەهات، هیچ دەنگێکی دیکە، تەنانەت دەنگی شنەی باش لەدوورگەکە نەدەهات. نیگای کەوتە سەر ماڵی زەهرا. بۆ ماوەیەك ئاوا مایەوە، پاشان لەپڕدا کەوتە رۆیشتن، لەپلیکانەکان چووە لای سەرەوە. لەبنمیچەکە هێلانەی چوڕەیەکی بینی. لەگۆشەی دواوە بتەوێت یان نا، دەنگێکی کەوتە بەرگوێ، چوڕەیەك هێلانەیەکی رێك و پێکی لەو گۆشەیەدا دروست کردبوو. لەگۆشەی سێیەمیشدا دیسان هێلانەیەکی دیکەی چوڕەیەك هەبوو پۆیراز لەبەر خۆیەوە گوتی سێ دانە. چوڕەیەك وەکو گوللە لە پەنجەرەوە هاتە ژوور، لە هەر سێ هێلانەکە هاوکات دەنگی جیکەجیکی زەرنەقووتەی چوڕەکە بەرزبووەوە. چوڕە داکانەکە هات و لەهێلانەکەی بەرامبەر نیشتەوە. کەمێك دواتریش چوڕەی سێیەم...

پۆیراز لەکاتێکدا قادرمە لەژێر پێیدا دەلەرزی هاتە خوارەوە، چووە دەرەوە، خۆی لەلێوار دەریا بینیەوە. لەدەنگی دەریا بترازێت دەنگێکی دیکە نەدەهات. رووی دەریا بووبووە پارچەیەك پوولەکە. لەبەر خۆیەوە گوتی، ئێستا کەی وەختی پیاسەکردنە. ئاسۆ خەریکە رووناك دادێت. دەرگای ماڵی زەهرا نەدەکرایەوە. رووی دەریاش کاتێك بروسکەی دەدا وردە شەپۆل بەدی دەکران. گەڕایەوە بەرەولای ئاشەکە چوو، کلیلەکەی بەدەستەوە بوو، خستیەوە نێو قفڵەکە، قفڵ کرایەوە بوو، قفڵەکەی پێوەداو کردیەوە. دووبارە کردیەوە و دایخستەوە. ماوەیەك ئاوا کردیەوەو دایخستەوە. بەدەستی بەکلیلەوە بەرەو لای قامیشەڵانەکە رایکرد، چووە نێو قامیشەڵانەکە. نێرگزەجاڕێکی زۆر لەو دەوروبەرە چرمسی بوون، هاوین هاتبوو، نزیکەی هەموو گوڵەکان ژاکابوون. ماوەیەکی زۆر بەسەر ژاکانی وەنەوشەکان تێپەڕیبوو. وەنەوشە یەکەمین گوڵ بوو کە لەبەر چاودا پشکوتبوو و پشکوتنی خۆی نیشانی کەس نەدابوو. لەنێو قامیشەڵانەکە بێئەوەی کەس بتوانێت بیبینێت بەباشی دەیتوانی دەرگای ماڵی زەهرا ببینێت. دەرگا وەك ئەوە وابوو هەرنەکرێتەوە. دەرگا نەکرایەوە، وەلــێ زەهرا بە بەژنی بەرز، چاوانی درشتی ئاسمانی، قژی بۆری کە تا شانەکانی شۆڕبووبووە و هەروا بەو دووچاڵەی گۆناکانی بەرامبەری راوەستابوو. چاوەکانی داخست، کاتێك کردنیەوە زەهرا لەبەر چاوانی ون بووبوو. بەو خەیاڵەی کە رەنگبێت زەهرا چووبێتە ئاشەکەو ئەوی لەوێ نەبینێبێت، بەرەو لای ئاشەکە رایکرد، بەخێرایی لەپلیکانەکە بەسەرکەوت، لەپەنجەرەکە هەڵوەستەیەکی کرد

چاکەتەکەی داکەندو چاوێکی بەماڵەکانی ئەولادا گێرا. لەو هەوا تاریك و روونەدا نەیدەتوانی بچوکترین سێبەریش بەدی بکات. خەریکبوو کاسەی سەری پڕ دەبوو، چووەوە خوار. سێ سێبەری بچوك بەخێرایی لەپەنجەرەدا هاتنە ژوور. دەنگی جیکەجیکی لەناکاوی زەرنەقووتەکان لەلای سەرەوە ترساندیان، هاوکات سێ باڵندە پێکەوە چوونە دەرەوە. پۆیراز سەیری لای سەرەوەی کرد، یەکسەر لەپلیکانەکان دابەزی و بەخێرایی دەرگای کردەوەو بەرەولای دارزەیتوونەکان رایکرد. چوو لەژێر پیرترین دارزەیتوون راوەستا. دەریا تاریك تاریك دەهاتە بەرچاو. لەنێو دەوەنەکان سێ باڵندە بە شڵپ شڵپەوە لە شەقەی باڵیان دا. بەرەو لای هەمان ئەو دەوەنانە چوو. هەستی لای چرپەی پێی بوو، هەمهەمەی دەیانی بیست. بە هێمنی بەرەولای ئاشەکە چوو لەسەر بەرداشی ئاشەکە دانیشت. لەدەرەوە، پەروانەی ئاشەکە بەغیژە غیژەوە دەخولایەوە. لەسەر بەرداشەکە هەروا بەسەری لەبەرخۆنراوەوە مایەوە. رۆشناییەك لەشوێنی ئاشەکەی دا. لەسەرەوە دەنگی چورِەیەك بەرزبووەوە. نەیتوانی لەشوێنی خۆی بجوولێت. کەمێك دواتر هەستا، دەرگای کردەوە، سەیری دارزەیتوونەکانی بەرامبەری خۆی کرد. گەڵای دارزەیتوونەکان دەبریسکانەوە. سێ پەپوولەی گەورە لەکاتێکدا لێکنزیك دەبوونەوە و یەکسەر لێکدوور دەکەوتنەوە و بە حاڵەتی زیگزاك هەڵدەفڕین، رووەو خوارەوە بەرەو دەریا فڕین و دووبارە لەبەر چاوان ون بوون. لەسەر لکە دەوەنێکی بەرزی لای راست پەپوولەیەکی رەنگ وەنەوشەیی هەڵنیشتبوو، لەسەر باڵەکانی بازنەی بچوك بچوکی نارنجی و رەش و سپی بەدی دەکران، باڵەکانی داگرتبوون و خەوی لێکەوتبوو. پۆیراز تاوێکی باش سەیری پەپوولەکەی کرد. سێ پەپوولە لەلای دەریاوە گەڕانەوە. لەکاتێکدا بە زیگزاك دەفڕین و لیکنزیك و دوور دەکەوتنەوە یەکڕاست بەرەولای گردەکە چوون. پۆیراز سێ پەپوولەکەی کاتێك بەبەردەمی تێپەڕین وەك ئەوەی نەیبینیبن بایەخی پێنەدان، نیگای لەسەر ئەو پەپوولە وەنەوشەییە بوو کە لەسەر لکی باریك و هەڵکشاوی دەوەنەکە کە بە شنەی ئارامی با بە هێمنی دەلەرایەوە خەوتبوو. بە ئەسپایی تا نزیك دەوەنەکە چووە پێش و راوەستا، لکە دەوەنەکە بە شنەی نەرمە بایەکە بەملاو ئەولادا دەهەژاو پەپوولەکە وەك ئەوەی لەسەر گەڵای ئەو لکە دەوەنە وشك بووبێتەوە تەکانی نەدەخوارد. پۆیراز بۆ ئەوەی پەپوولەکە لەخەو هەڵنەستێت، بەئارامی و بەکپی جارێك بەدەوری دەوەنەکە خولایەوە، پاشان کەمێك خێرایی خۆی زیاد کرد، لەهەر خولانەوەیەکدا بەدەوری دەوەنەکە خێراییەکەی زیاتر دەبوو، قاچەکانی

بەزەوی دادەکێشان، دەیکردە تەپە تەپێك نەبێتەوە، هاواری دەکردو نیگای لەسەر ئەو پەپوولەیە کە هێندەی چۆلەکەیەك دەبوو هەڵنەگرت، بەڵام پەپوولەکە هیچ بایەخ و کاردانەوەیەکی نەبوو.

پۆیراز ماوەیەکی درێژ بەدەوری دەوەنەکە سووڕایەوە، پاشان ماندوو بوو و دانیشت، کەمێك دواتر بەخێرایی هەستا، چووە ئاش و لەسەر بەرداشەکە دانیشت، نیگای کەوتە سەر دەنکە گەنمەکانی سەر بەرداشەکە، بیریکردەوە، لەشوێنی خۆیانن. لەلای سەرەوە دەنگی وزەوزی زەردەواڵەی بیست، هەستا، سەیری دەوروبەری خۆی کرد، لەگۆشەیەك، لەپێش هێلانەی چوڕەکە، زەردەواڵەیەکی گەورە باڵەفرکەی بوو، زەندەقی چوو، ئەگەر ئەم زەردەواڵەیە بەزەرنەقوتەی چۆڕەکانەوەبدات ئەوا یەکجێ دەیانکوژێت. نەك هەر چوڕە تەنانەت ئەوە بەمرۆڤیشەوە وەبدەن، بەمرۆڤی بەهێزیشەوە وەبدەن، دەیانکوژێت. بەرەو دەرەوە رایکرد، پەپوولەکە لەسەر لکە بەرزەکە چۆن هەڵنیشتبوو لەجێی خۆی بوو. بەخێرایی خولێکی بە دەوری دەوەنەکە لێدا. لەکاتی خولانەوە چاوی لەسەر پەپوولەکە هەڵنەگرت. بەرەولای دەوەنێکی سەرەوەتر چوو، لکێکی درێژو پان و پڕگەڵای لەدەوەنەکەکە کردەوە. زەردەواڵەکە بە وزەوزێکی ترسناك لەو سەرەوە دەهات و دەچوو، بەخێرایی لەپلیکانەکان بەسەرکەوت، هەر لەگەڵ بەسەر کەوت، لەهەر سێ هێلانەکە زەرنەقووتەی چوڕە. بەسەرو ملی رووتیان ملە باریکەکەیان درێژکردو لەکاتێکدا دەنووکە گەورەکانیان کردبوونەوە. دەستیانکرد بە جیکەجیکێك نەبێتەوە. چاوی پۆیراز لەسەر زەردەواڵەکە بوو، ئەو لکە دەوەنەی بەدەستیەوە بوو بەرزی کردەوە، خۆی بەسەر نووکی پەنجەکانی بەرزکردەوە، لکە دەوەنەکەی بەزەردەواڵەکە داکێشا، زەردەواڵەکە بۆی دەرچوو لەگۆشەیەکی دیکە بە وزەوزێکی زیاتر لەپێشان دەستی بە خولانەوەکرد. پۆیراز دیسان لکەکەی راوەشاندە زەردەواڵەکە. زەردەواڵە ئەمجارەش بۆی دەرچوو، دوای ئەوە پەلامارو هەڵاتن دەستی پێکرد. چەند جارێکیش زەردەواڵەکە هەڵمەتی بۆ نێو چاوانو مل و گەردنی پۆیراز هێنا. سوپاس بۆ خوا پۆیراز ئاگای لەخۆی بوو بە لکە دەوەنە پڕگەڵاکەوە بەرگری لەخۆی کرد، دەنا ئەگەر ئەو زەردەواڵە گەورە سوورە کە لەپیریان رەنگی بەسەر شینیدا دەیڕوانی پێیەوە دەداو دەیکوشت، تەنانەت ئەگەر نەشیکوشتبا، دەیخستنە نێو جێوە. پەنجە گەورەکە تەواو کراوە بوو. پۆیراز زەردەواڵەکەی لەم لا بۆ ئەولا راودەنا، زەردەواڵە لەپەنجەرەکە نزیك دەبووەوە، کاتێك کەمێك لەپەنجەرەکە دەچووە دەرەوە دووبارە دەگەڕایەوە،

دەچووە خوارەوە، تا دەچوو لای بەرداشەکە دەخولایەوە، پۆیراز دەگەیشتە سەری، بە هەموو هێزیەوە لکە دەوەنەکەی رادەوەشاندە زەردەواڵەکە، دیسان زەردەواڵە بۆی دەردەچوو و دەچووە پشتی هێلانە چوڕەکە و دەسوڕایەوە.

پۆیراز ئەوەندە بەدوای زەردەواڵەکە کەوتبوو هەموو گیانی لەبەر ئارەقە هەڵاتبوو، پێیەکانی ئاگری لێهەڵدەستا، چوو لەسەر بەرداشەکە دانیشت، زەهرای کەوتەوە یاد، پێکەنین کەوتە سەر لێوانی. زەردەواڵەکە بە تووڕەیی و بەوزەوزەوە بەنێو ئاشەکەدا دەسوڕایەوە، پۆیراز شێت دەکات، کاتێك لکە دەوەنەکە هەڵدەگرێت، لەدەرەوە دەنگی پێیەك دێت، پۆیراز گوێ هەڵدەخات، دەنگی پ دێت و تابەر دەرگا لەوێ نامینێت، پۆیراز بازێك دەدات و دەرگاکە دەکاتەوە، دەستی زەهرا دەگرێت، دەڵێت:"وەرە!" و دەیباتە ژوورەوە، بەرداشەکەی نیشان دەدات، زەهرا لەسەر بەرداشەکە دادەنیشێت، پێیدەڵێت:"سەیر لەبەر ئارەقە هەڵاتوویت."

"سەیر لەبەر ئارەقە هەڵاتوویت چیە، لەوەتەی دنیا رووناك بۆتەوە لەگەڵ ئەو نەفرەتیە دەرگیرم، دەرگیرم چیە، خەریکم شەڕ دەکەم، ئەوەندەی لکە دەوەنەکە رابوەشێنم نەلکەکە گەڵای پێوە ماون نەمن شەنگم لەبەرماوە. شەڕێکی مەرگبارمان کرد تەواو وەکو شەڕی ساری قامیش. نەمتوانی لەپەنجەرە فڕێی بدەمە دەرەوە، ئەویش چەند جار هەڵمەتی خۆکوژانەی پێکردم، منیش هەموو جارێك هەڵمەتەکانم بەو پەڕی سەختیەوە پووچەڵ کردنەوە و خۆمم لەدەستی دەرباز دەکرد، دەنا ئەو پیرە زەنگە سوورە شینباوە، دەبینیت کە چ وزەوزێك دەکات، منی یەکجێ کوشتبوو."

پۆیراز دەیگوت ئەگەر رۆژێك بگەمە زەهرا و دیداری لەگەڵدا بکەم، هەر لەگەڵ بینینی ئەو، هەر لەگەڵ گرتنی دەستی ئەو، رۆحم لەجەستەم جیادەبێتەوە، بەڵام ئێستا ئارام بوو، دڵی شاد شاد بوو، عیشق رۆچووبووە هەموو گیانیەوە. بەدەم پێکەنینەوە دەستی زەهرای گرت، گوتی:"سەیر بکە، ئەو بەڵایە پیرە ببینە! ببینە چۆن لەتووڕەییان هاربووە، واخەریکە دەمرێت، شێت بووە، وزەوز دەکات. داویەتیە منجڕی و ناچێتە دەرەوە، دەبا هەر نەچێتە دەرەوە، بەمن چی، بەڵام لەو سەرەوە سێ دانە هێلانەی چوڕە هەن، زەرنەقووتەکانیش هەموویان دەندوکی گەورەی زەردیان هەیە، دەمیان وا لێککردۆتەوە و جیکەجیکێکیانە کە هەست دەکەیت دوورگە خەریکە دەلەرزێت."

زەردەواڵە چی لێکردیت؟.

پۆیراز ئەبرۆکانی تێکنان:

"چی لێکردم، چی لێکردم؟ ئەو زەردەواڵە دوژمنی زەرنەقووتەی چوڕەن."

"ئێ باشە، چی لێکردیت؟"

"زەنگەسوورەکان دوژمنی چوڕەن. بەجووجکەکانیان وەدەدەن و دەیانکوژن. مارەکانیش هەروا. چوڕەکان زیاتر لەماران دەترسن. مار دەتوانێت بەم دیوارە سافەدا هەڵبگەڕێت و زەرنەقووتەکان قووت بدات. بۆیە هێلانەکانیان لەماڵان دروست دەکەن. "هەستا، گوتی:

یاڵا بابچینە سەرەوە."زەرنەقووتەکان کردیانە سەرو سەدا.

پۆیراز پشتی خۆی راست کردەوەو گوتی:

"داکانەکەیان خواردنی بۆ هێناون، هەستە بابچینە سەرەوە."

سێ زەرنەقووتەی چوڕە دەنووکەکانیان تا توانیبوویان لێککردبووەوە، ملی بێ پەڕیان ئەوەندە هێنابووە پێشەوە کەکەم مابوو هەڵببچڕێت و چاوەڕێ بوون کە دایکیان خواردنەکەیان بخاتە دەمەوە. خواردنەکان لەدەمی زەردی زەرنەقووتە بێئۆقرەکان دەچوو و دەهات. سێ چوڕە هەر لەگەڵ ئەوەی کاریان تەواو بوو، وەکو بروسکەو با لەپەنجەرەوە چوونەدەرو زەرنەقووتەکانیش ئارام بوونەوە و لەسەروسەدا کەوتن.

زەردەواڵەکە هێشتا بەو پەڕی تووڕەیی و وزەوزەوە دەخولایەوە. پۆیراز لکە دەوەنەکەی هەڵگرت، لەنێو دەستی خۆیدا رایوەشاندو تاقیکردەوە و رایوەشاندە زەردەواڵەکە کە لەسەرەوە دەخولایەوە. زەردەواڵە یەکسەر ئەنگاوتراو مرد و کەوتە پای دیوارەکە.

پۆیراز بە پێکەنینەوە گوتی:

"زەرنەقووتەی چوڕەت لە مردن قوتارکردن."

لەسەر بەرداشەکە دانیشت.

پۆیراز گوتی: "دەمەوێت ئەم ئاشە بخەمە کار."

پەروانەی ئاشەکە هەر لەخۆیانەوە دەخولانەوە هەموو وەستاکارەکانی ئاش رەوانەی یۆنان کرابوون، رەنگبێت ئەگەر ژمارەی دانیشتوانی دوورگە زیاد بکات وەستاکارێکیش پەیدا ببێت کە ئاشەکە بخاتەوە کار.

"ئەم زەردەواڵە خورماییانە حەز لەپێوەدانی زەرنەقووتان دەکەن. تا زەردەواڵەیەك لە رۆژێکدا دەتوانێت بە سەد دانە زەرنەقووتە وەبدات. بە مرۆڤانیش وە دەدەن. بە منداڵان

وەبدەن دەیانکوژن. ئەگەر بەتەمەنەکان وەبدات تووشی ئاوسان و ئازارێکی زۆریان دەکات، بەڵام نایانکوژێت. کوشتنیشیان هێندە ئاسان نیە. ئەگەر بەچکەکانیان ئازار بدەیت تووڕە دەبن و پەلاماری ماڵان دەدەن، هەر کەسێکیان وەگیر بکەوێت پێیوەدەدەن. جاری وا هەیە تەنانەت مرۆڤە بەتەمەنەکانیش بەو درێژووکە ژەهراویانەیان دەکوژن. من لێرە فەرخە زەردەواڵەیەکی زۆرم بینین. زەنگەسوورەکان دەتوانم بڵێم لەهەموو کون و دەرزی دیوارەکان لانەیان هەیە. من هەرکاتێك ئەو دەرزو کونە دیوارانە دەبینم رادەکەم و دەچمە لێوار، ئەوان پەلاماری گوندو شاروچکەکانیش دەدەن، یان کاتێك کە زەردەواڵە تووڕە دەبن دادەگژێنە گوندو شاروچکەکان، خەڵك دەرگاو پەنجەرەکانیان دادەخەن و لەنێو ماڵەکانیاندا خۆیان قایم دەکەن و تا هەوا تاریك دادێت لەماڵێ ناهێنەدەر. ئەو زەردەواڵانە توێکڵی کاڵەك و شووتیشیان حەز لێیە. من کە منداڵ بووم، شەوو رۆژ، بەتاقی تەنیا پاسەوانیم لە بێستانی شووتیەکانمان دەکرد.

بێستانی شووتیەکان لەدەم رووبار بوو. کەپرێکمان لەسەر چوار ئەستوندەکان دروستکردبوو. سەر کەپرەکەمان بە گەڵای دارکاژ داپۆشیبوو، نوێنەکەم لەسەر کەپرەکە راخستبوو، شەوان کاتی خەوتن، قادرمەم بە کەپرەکە هەڵدەناو بەسەر دەکەوتم و ئینجا قادرمەکەشم هەڵدەکێشایە سەرەوە لەتەك جێی خۆم درێژم دەکرد. لەشەوانی مانگەشەودا، تا بەیانی سەیری رووبارەکەم دەکرد کە بە هاشە هاشەوە رێگای تەی دەکردو ماسیەکان لە ئاو قەڵەمبازیان دەدا، کە بەیانی دادەهات قادرمەکەم بە کەپرەکە هەڵدەناو پێیدا دەهاتمە خوار و لە رۆخ ئاوەکە قاوەڵتیم دەکرد و ماسیەکانی بن ئاوەکەم کە لەتەك یەکدیدا بە خێراییەکی تەواو مەلەیان دەکرد، تەماشا دەکردن. سێبەری ماسیەکان بەسەر وردە بەردەکاندا دەلەرانەوە دەتگوت باڵەفڕەیانە. جگە لەوە زۆرمان میوان دەهاتن، لەو شووتیانەم بۆ دێنان کە بە ئاوی ساردی رووبار ساردمان دەکردنەوە. ئەوان شووتی سارد ساردیان دەخوارد و توێکڵەکانیان فڕێ دەدایە دەوروبەری کەپرەکە. پاشان زەنگەسوورەکانیش دەهاتن و دادەگژانە توێکڵەکان و تا شەو دەهات نێو ئەو توێکڵانە هەر زەردەواڵە و زەنگەسوورە بوو هەڵدەنیشت و هەڵدەفڕی. منیش هەندێکجار دەهاتم شووتییێکی گەورەم ئاوا قاش دەکرد و ئاوا دامدەنایە بەر هەتاو و زەردەواڵەکان دەهاتن و لەسەر شووتیەکە هەڵدەنیشتن و باڵە ناسکەکانیان وەکو پوولەکە لەبەر تیشکی هەتاو دەبریسکانەوە. ناو قەدی سووری تۆخ، کلکی درێژ و هەڵقە زەردەکانی کلکیان، درێژووکە شینباوە پۆڵاینیەکانیان. هەنگەکان ئەگەر بەمرۆڤەوە بدەن درێژووکەکانیان لەپێستی

ئەو کەسەی پێیەوە دەدەن بەجێ دەمێنێت. هەنگەکان کە درێژووکەیان نەما دەمرن. پێوەدانی سەدان هەنگ رەنگە نەتوانێت کەسێك بکوژێت، بەڵام پێوەدانی زەنگەسوورە بۆی هەیە کەسەکە بکوژێت. بەمتەرزە، ئەگەر چەندین زەنگەسوورە پێکەوە بەکەسێکەوە بدەن رەنگە ببێتە مایەی مەرگی کەسەکە. زەنگەسوورەکان زۆر تووڕەن. هەنگەکان و زەردەواڵە وردیلەکان زۆر لەزەردەواڵەکانی دیکە شارە زەردەواڵەیان هەن و زیاتر ئەو شارە زەردەوالانەیان لە نێو گەڵای دەوەنو قاپۆری درەختەکان دروست دەکەن. شارە زەنگەسوورەکان لە نێو درزی بەرد و دیوارەکان دان. ئەوەی کە ئەو زەنگەسوورانە شێت و هار دەکات ئەوەیە کە دار لە کونەکانیان وەربدەیت کە داریان تێوەردا ئیدی بەوپەڕی تووڕەییەوە لە شارەکانیان دێنەدەر و هەرکەسێکیان بێنە سەر رێگا پەلاماری دەدەن، بەڵام ئەگەر هیچ کارت پێیان نەبێت ئازار بەکەس ناگەیەنن، دێن و لەسەر توێکڵێك و قاشی سووری شووتیەکان هەڵدەنیشن و تا شەو دادێت لەوێ دەمێنێتەوە. هەر لەگەڵ هاتنی شەو تاکە زەردەواڵەیەك چیە لەسەر شووتیەکان نامێنێت. زەنگەسوورەکان ئەوەندەی لەتاریکی دەترسن لەهیچ شتێکی دیکە ئەوەندە ناترسن. زەردەواڵەکان کاتێك کە هەتاو هەڵات، دێن لەسەر قاش و توێکڵی شووتیەکان هەڵدەنیشن و تا دنیا تاریك دادێت لەوێ دەمێننەوە. کە تاریکیش داهات ئیدی کرمە گوڵەستێرەکان لەبن دەوەنان رووناکی خۆیان بەو دەوروبەرە پەخش دەکەن. من تا ئەو دەمەی رووناکی ئەو گوڵەستێرانە تەواو نەبووبا نەدەنووستم و هەر سەیرم دەکردن. پاشان دەنووستم نزیکەی بەرەبەیان، بە دەنگی کوندەپەپۆکان کە لەکەنارەکانی سەرەوە دەهاتن، بە ئاگا دەهاتم. یەکسەر دایکم بەرچایی بۆ دەهێنام، بەرامبەر یەکدی دادەنیشتین و قاوەڵتیمان دەکرد، پێکەوە بە چەرکەسی دەئاخفتین. حەسرەتێك کە بۆ قەفقاز هەیەتی لەباسکردن نایەت. کانیەکان، ئاوەکان، ئەسپەکان، جوامێرەکان، جەنگەکانیان لەگەڵ رووسان، مێشەهەنگەکان، غەڵێفەی هەنگوینی سپی، ئاغا چاونەترسەکانی قەفقاز، گوڵەکان، بۆنی گوڵەکانی هێشتاش هەر لەیادمە. رەوشی باوکم لەوەش خراپتر بوو. بەردەوام دەیگوت لەخوا دەخوازم لەخاکی قەفقاز بنێژرێم. سترانەکانمان چەرکەسی بوون، هەمووشیان لەبارەی قەفقازەوە بوون. هەموو رۆژێك، هەموو رۆژێك، هەموو رۆژێك دەیگوت دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ چیاکانی قەفقاز... باوکم کە پیرتر بوو، بەیانی تا شەو دادەهات هەرباسی قەفقازی دەکرد. پیرەکانی گوند هەموو رۆژێك بەیانی زوو دەچوون گوێیان لەسترانە میللیەکانی عاشق هەمزە دەگرت و دەگریان. عاشق

هەمزەش پیربوو. ئەویش لەنێو ئاگری حەسرەتی قەفقازدا دەسووتاو نەشیدەتوانی دەست لەدەنگبێژی هەڵبگرێت. دەنگی دایکی منیش خۆش بوو، ئەویش سترانی قەفقازی دەچڕین و هەمووانی دەخستنە گریانەوە. لەهەمووی زیاتر حەزی لە خاڵخاڵۆکەکان دەکرد. هەرکاتێك بهاتبوا هەموو نێو بێستانەکەی لێکدەدا کاتێك لەژێر بڕکە شووتیەك یان پەلکێك یان ژێر بڕکە پەتاتەیەك یان دڕکێك خاڵخاڵۆکەیەکی دەبینی شێت دەبوو. جارێك بینی هەموو بێستانەکە پڕبووە لەخاڵخاڵۆکەکان، دەیگرتن و لەسەر دەستی خۆی دادەناو نەوازشی دەکردن بەر لەوەی هەڵبفڕن شتێکی بە گوێدا دەچرپاندن. ئەو خاڵخاڵۆکانە دروست بۆ ماوەی یەك هەفتە دەتگوت لەئاسمانەوە داباریون هەموو ئەو دەشتە سوورهەڵگەڕا. هەفتەیەکیش دواتر تەنانەت یەك دانە خاڵخاڵۆکە لەو ناوە نەما، ئیدی دایکیشم نەهاتەوە نێو بێستانەکە، خوشکە بچووکەکەم خواردنی بۆ دەهێنام. ئەو خاڵخاڵۆکانەی کە لەسەر پەتاتەکان هەڵدەنیشتن بۆنی پەتاتەیان دەگرت."

پاشان، باسی جەنگی دەکرد، باسی نەبەردیو تێکهەڵچوونەکان، ترسەکانی، ئەزموونی ڕۆژانەی مەرگ، ترسی لەڕادەبەرەی بەر لەدەستپێکردنی جەنگ و ئەوەی کە دوای ڕۆیشتن بۆ جەنگ ئیدی ئەو ترسەی کە تا مێشکی ئێسقانەکانی ڕۆدەچوو، وردە وردە نەدەما. ئینجا باسی ئەستێرەکانی ئاسمانی بیابان و فراوانی و کاکی بەکاکیبوونی بیابان و کۆمەڵکوژیی ئێزدیەکانی کرد، بەڵام کاتێك گەیشتنە سەر بڕینی مەمکی کچەکان و فڕێدانیان بۆ سەر لمی لێوارەکان لەناکاو بێدەنگ بوو. ئەو بێدەنگیە ماوەیەکی درێژ درێژەی کێشا. پاشان چوونە دەرەوە. کچەکە بۆلای دار زەیتوونەکان چوو، پۆیرازیش هاتەوەماڵەوە و خۆی فڕێ دایە نێو جێگا، روخساری سوور هەڵگەڕابوو و شەلاڵی ئارەقە بووبوو. لێنای ساردو گەرمی ڕۆژگارچەشتوو هیچ بەلایەوە سەیر نەبوو. ماوەیەك ئاوا ڕاوەستاو سەیری پۆیرازی کرد کە لەسەر تەختەخەوەکەی کەوتبوو و چاوەکانی داخستبوون، دواتر چوو ئاشخانەو ئاگری کردەوە و کتری دانایە سەر ئاگرەکە و زەیزەفۆنی دەم کرد. پاشان هاتە بان سەری پۆیراز کە هێشتا چاوەکانی داخستبوون ڕاوەستا و گوتی: "هەستە کوڕم، زەیزەفۆنم بۆ دەم کردوویت، باشە بۆت، ئارەقەکەت وشك دەکاتەوە." دەستی گرت و هەڵیستاندەوە. پۆیراز چاوەکانی کردنەوە، هەر کە لێنای بینی پێکەنی.

"هەستە لاوۆ."

پۆیراز هەستا، بەلاکەلاك چوو لەسەر کورسی دانیشت. لێنا بە پەرداخێکی گەورەی لێوە زێڕکراو زەیزەفۆنی بۆ هێنا. بۆنی زەیزەفۆن ژوورەکەی پڕکرد. پۆیراز کاتێك پەرداخە هەڵماویەکەی وەرگرت لەکاتێکدا بزەی بۆ دەکرد پەرداخەکەی بەرز کردەوە و بۆنی پێداکرد، پاشان لەبەر رووناکی رایگرت، ئینجا بە ئارامی دەستیکرد بەخواردنەوەی.

"تۆ ئەمەیان بخۆرەوە، کتریەکە لەسەر ئاگرە، من ئێستا دەچم و یەکسەر دەگەڕێمەوە. تامن دەگەڕێمەوە تۆ بۆخۆی تێبکە و بیخۆرەوە. باشە بۆت."

لەژوورەکە چووەدەر، چووە ماڵی زەهرا. زەهرا لەسەر کورسیەك دانیشتبوو، گرمۆڵە بووبوو و چاوی بڕیبووە ئەو مافوورەی بەردەمی، لەگەڵ بینینی لێنا هەستا، چاوی بڕیە نێو چاوی ئەو. لێنا بە بنی چاو سەیرێکی کرد، سەیری دەوروبەرەکەی کرد، نەسیبەی بینی کە لەژوورەکەی بەرامبەرەوە دەهات. نەسیبە خەریك بوو پێدەکەنی.

"بەخێرهاتی دایکە لێنا، فەرموو دانیشە."

لێنا بە دەنگێکی تیژی شادمانیەوە گوتی: "سوپاست دەکەم کچم."

زەهرا لێنای گرتە باوەش.

"بەخێرهاتی دایکە لێنا، فەرموو دانیشە."

لێنا لەسەر کورسیەکەی بەرامبەر دانیشت، نەسیبەش دانیشت.

"موسا ئاغا نابینم."

"هەر پێشی تۆ بێیت چووە دەر، رەنگە چووبێتە ژێر چنارەکان."

"چای دەخۆیتەوە دایکە؟"

"حەزت لەقاوەیە دایکە لێنا."

لێنا دڵنیگەران بوو. دەبوا یەکسەر هەستابوا و چووبوایەوە ماڵێ و قسەی لەگەڵ پۆیراز کردبوا. ساتێك چیە نەیدەتوانی سەبر بگرێت. کچەکان بە میهرو سۆزەوە دەوریان دابوو. پەلەی بوو، چۆن دەیتوانی ئەمە لەکچە میهرەبانەکان بگەیەنێت. لەناکاو هەستایە پێ:

"دەبێت بڕۆم کچە خۆشەویستەکانم، کتری لەسەر ئاگردانەکەیە، مسۆگەر ئێستا هەڵچووە و ئاگرەکەی کوژاندۆتەوە. زەیزەفۆنم بۆ پۆیرازی کوڕم دەم کردبوو. ئێوەش زەیزەفۆن دەم بکەن و بیخۆنەوە، باشە، باشە بۆتان."

ئەمەی گوت و بەخێرایی گەڕایەوە. تەنانەت لەسەر پلیکانەکانیش دەیگوت:"باشە بۆتان، باشە بۆتان."

پۆیراز کاتێك بینی لێنا دەستپاچە بووە، ئەو پەرداخەی بە دەستیەوە بوو داینایە سەر مێزەکە و هەستا. پرسی:

"چیت لێهاتووە دایکە؟"

لێنا گوتی:"ئامێزی لێدام، گرتمیە ئامێز. زەهرا گرتمیە ئامێز. موسا کازم ئاغا بە تەنیا لە ژێر دارچنارەکان دانیشتووە. دەفکران راچووە. منی گرتە ئامێز. ئێستا ئەویش خەریکە زەیزەفۆن دەخواتەوە."

"وەرە دایکە، وەرە دانیشە ئێرە." کورسیەکەی بەرامبەری نیشان دا.

"تۆش زەیزەفۆن بخۆرەوە."

لەدڵی خۆیدا دەیگوت دەبێ لەئاشەکە چی بەسەر پۆیراز هاتبێت، پەروانەی ئاشەکە فڕەفڕیان دەکرد.

بەسەر سەریەوە گوللە تۆپەکان دەخشین. لە ژێر ئاگری گوللە تۆپەکان، سەربازە رووت و قوتەکان وەکو مێروولان بە چیا هەڵدەگەڕان، لەوێ دەمانەوە و دەبوونە سەهۆڵ. لەپڕ پەڕەسێلکەی کەوتە بیر، هەر جارێك کە لە پەنجەرەوە دەهاتنە ژوورەوە، بە کەللە سەری لە جەستەیان گەورەترە، لە کاتێکدا دەنووکەکانیان تا ئاخیر لێککردبووەوە دەیانکردە سەرو سەدایەك ئەو سەری دیار نەبێت. دەنگی جیکەجیکی ئەوان لێنەدەگەڕا هیچ دەنگێکی دیکە تەنانەت فڕەفڕی پەروانەی ئاشەکەش ببیستێت. دوو پەڕەسێلکە لە بنمیچی ماڵەکەیان هێلانەیان چێکردبوو. هەموو رۆژێك لانیکەم بیست جار، لەپەنجەرەوە دەهاتنە ژوورو دەچوونە دەرەوە و هەموو جارێکیش، دەنوکی زەردی زەرنەقووتە بێ پەڕوباڵەکان تا ئاخیر دەکرانەوە و ئەو پشکە گۆشتانەی کە هەر هێندەی ئەنگوستێك دەبوون قیامەتێکیان دەنایەوە نەبێتەوە.

"لاوۆ بیر لە چی دەکەیتەوە؟"

پۆیراز گوتی:"بیر لە زەرنەقووتەی پەرەسێلکە دەکەمەوە."

لێنا پرسی:"لە کوێت بینین؟"

"لە ماڵی خۆمان."

"لەکام ماڵی خۆتان؟"

"ماڵی سەردەمی منداڵیم، دایکە."
"بەهەر حاڵ موسا ئاغا چاوەڕێتە، لەسەر کانیەکە دانیشتووە."
"لە ماندووێتیان خەریکە دەمرم دایکە، هەموو گیانم دێشێت."
لێنا بە نیگەرانیەوە گوتی:
"بنوو لاوۆ بنوو، یەکسەر بڕۆ نێو جێ و بنوو، من جلەکانت دەگۆڕم."
"نا دایکە، من خۆم جلەکانم دەگۆڕم، سوپاس، دەستەکانت ماچ دەکەم. هەر کەسێکیش هات خەبەرم مەکەوە، ڤاسیلی بێت یان موسا کازم ئاغا.
ئێسقانەکانم زۆقەزۆقیانە. هەر ئاگام لەخۆم نەماوە، وەکو مردوو بم وایە."
لێنا ئەبرۆکانی وێکهێنانەوە و بەدەنگێکی بەرزەوە گوتی:
"منی گرتە ئامێز. تۆ ئاگات لەهیچ نیە، منی گرتە ئامێز. ئێستا تۆ بخەوە."
لەژوورەکە چووەدەرو چووە چێشتخانەو دوای ئەوەی ماوەیەك لەوێ کارەکانی کرد، گەڕاەوە لای پۆیراز، پۆیراز جلەکانی داکەندبوون و بە جلدانەکەیەوە هەڵواسیبوون و لە خەوێکی قووڵدابوو.
لێنا دروست کاتی نانخواردن پۆیرازی لەخەو هەستاند و ئەو خواردنانەی کە بە یارمەتی زەهرای ئامادە کردبوون لەسەر خوانچەیەکی ئەوزێڕکراو بۆ پۆیرازی بردن.
موسا ئاغاش دەوروبەری نیوەڕۆ هاتەوە ماڵ، حاڵی پۆیرازی پرسی، کاتێکیش لێنا دەیگوت خەوتوە، لەبەر خۆیەوە دەیگوت سەیرە سەیرە و دەیگوت "ئەم منداڵە چی بەسەرهاتووە." و دەگەڕایەوە، وردە وردە کاسەی سەبری پڕدەبوو و ئۆقرە و ئارامی لەدەست دەدا. رۆژان هاتن و چوون نە هەواڵێك لەئەسیناوە هات نە لەئەستەنبۆڵ. هەموو رۆژێك دەچووە ماڵی پۆیراز و لەحاڵ و رەوشی پۆیرازی دەپرسی، لێنا بە یۆنانی دەیگوت خەوتوەو ئەوی بۆ قاوەخواردنەوە بانگهێشتی ماڵەکەی دەکرد و ئەویش قسەی لێنای نەدەشکاند. موسا ئاغا دادەنیشتە سەر کورسی و لەگەڵ دانیشتنیدا بە زمانی یۆنانی وشەی ستایش ئامێزی دەردەبڕین:
"تۆ لای من زۆر بەڕێزیت لێنا. هیچ کەس لەتۆ ئازاو بوێرتر نیە، چونکە لەدەستی جەندرمەو پۆلیسەکان راتکرد و رێگایەکی دوور و درێژت بڕی، برسیەتیت کێشا. قاچەکانت ئاوسان، لەنێو دەریاکان، لەنێو کەشتیەکان خۆت شاردەوە و گەڕایتەوە نیشتمانەکەت، گۆڕی

باوك و باپیرانت بینیەوە. بۆیە تۆ بەهەشتیت. بۆنی نیشتمان و دەریا و دوورگەی خۆت شتێکی دیکە، وانیە؟"

"وایە موسا ئاغا، وایە. من خەریك بوو دەمردم، کاتێك لەدوورگە نزیك دەبوومەوە، لەدوورەوە بۆنی دوورگەم بۆهات، بە چەشنێك گیانم هاتە سەری لووتم، کاتێك تەواو لەدوورگە نزیك بوومەوە، هەستامە سەر پێیان، دوورگەکەمم بینی، باوەڕم نەدەکرد. لەپڕ بۆنەکەیم بۆ هات، لەبەر خۆمەوە دەمگوت ئەمە خەون و خەیاڵە، نوقورچەم لە پێیەکانم گرت، زانیم ئەمە خەون و خەیاڵ نیە، لەخودی دوورگەم. رامکرد و چوومە لای دارهەرمێیەکە. درەختەکە بە گوڵێلکان داپۆشرابوو و بەدی نەدەکرا، هەنگیش وزەوزیان بوو. بۆنی هەنگەکانم کرد. هەر لەوێدا دانیشتم، پشتم بە درەختەکەوە دا. کەس لەوێ نەبوو. ترس دایگرتم. گوتم ئەم دوورگە وێرانەیە دوورگەی من نیە، تا شەو داهات هەروا چۆن پشتم بە درەختەکەوە دابوو، مامەوە. بە خۆمم گوت رەنگبێت ئەو دوورگەیە کە هیچ کەسی تێدا نیە دوورگەی من نەبێت، لەهاتنەوەم بۆ دوورگە پەشیمان بوومەوە، نەمدەتوانی بشگریەم، لەولاتر سێبەری کەسێکم بەدی کرد، هەروا کە لەبەر خۆمەوە دەمگوت تۆ بڵێیت ئەمە مرۆڤە یان جنۆکەیە، خێرا لە جێی خۆم هەستام، لەبیرمە رامکردە لای سێبەرەکە و گرتمە ئامێزمەوە. دەنگێکم لە سێبەرەکەوە بیست، دایکە ناوت چیە، من پێم گوت ئالێکس، پانایۆر، پەترۆس، کۆستاس، کوڕەکەم تۆیت؟

گوتی نا دایکە. پاشانیش گوتی، ئێستا. بەخێر بێیت بۆ دوورگە. گوتم ئێستا ئەم دوورگەیە هی تۆیە؟ گوتی، ئێستا. گوایا کاتێك ویستومە بیگرمە ئامێز بێهۆش بوومە و کەوتوومە. کاتێك چاوەکانم کردەوە بینیم کوڕەلاوێکی بەرکەفتی و رێك و پێك و قەدوبالاَ بەرز بەسەر سەرمەوە وەستاوە. دایکە ناوت چیە؟ پێمدەڵێن لێنا، لاوۆ. من خەڵکی ئەم دوورگەیەم لاوۆ. منیان بۆ یۆنان دوورخستبووەوە، لەچوار کوڕەکانم دوویان لای مستەفا کەمال پاشان. منی بردەوە ماڵەکەی خۆی، زۆرباش خزمەتی کردم. من هەموو رۆژان بەیانیان، کە خۆرهەڵدەهات دەچووم دادەنیشتم و پشتم بە دارهەرمێیەکەوە دەدا. لەلایەك بە بۆنکردنی هەنگەکان، گوڵەکان و دەریای خۆم و لەلایەکی دیکە بە خواردنی ئەو خواردنە بەتام و بۆنانەی کە پۆیراز هەموو رۆژێك لەکاتی نیوەڕۆیان بۆی دەهێنام و هەروەها بە خواردنەوەی ئاوی ئەو

کانیەی کە پۆیراز بۆی دەهێنام هاتمەوە سەرخۆم و چاك بوومەوە. ئەمە هەمان ئەو پۆیرازەیە، باشترین بنیادەم، تۆش باش ئاگات لێبێت."

"ئەو هەر دەنوویێت، چی بووە؟"

"زۆر ماندووە، کەم کەم خەریکە دێتەوە سەرخۆی، تەنها ئەوکەسانەی کە زۆر ماندوو دەبن ئاوا دەخەون و بەو ئاسانیەش بەئاگا نایەن."

"کەواتە زۆر ماندووە!"

موسا ئاغا کاتێك ئەوقسانەی دەکرد ئەدای دەنگەکەی سەیر بوو، لێنا ئەمەی لە دڵ گران بوو، گوتی:

"موسا ئاغا، ئەوانەیش کە کێو هەڵدەکەنن، یان سەوڵ لێدەدەن، زەوی دەکێڵن، دەجەنگن، ماسی دەگرن و دڵیان ئاگر دەگرێت ماندوو دەبن. ئەو کەسانەی کە دڵیان ئاگر دەگرێت لەهەمووان زیاتر ماندوو دەبن."

قسەی دڵی خۆی کرد. هەموو ئەو قسانەی بە یۆنانی کردن.

"کەوابوو ئەو خەوەی پۆیرازی کوڕمان هی ماندوێتیە، ها؟"

"هی ماندوێتیە."

کاتێك قسەکانیان لەبارەی پۆیراز تەواو بوو، لەبارەی بابەتگەلی دیکە قسەیان کرد. موسا ئاغا لەزەتی لەقسەکردن لەگەڵ ئەو ژنە زرنگە وەردەگرت. لێناش ئەوی زۆر خۆش دەویست. چەند بەباشیش بە یۆنانی دەئاخفت، دروست وەکو شای یۆنان.

موسا ئاغا دەوروبەری عەسر هەستا، لێنا تا دەمی دەرگای ماڵەوەیان لەگەڵی چوو.

"سبەش دیسان سەردەدەمەوە."

"سوپاس موسا ئاغا، سبەینێ هەر لەگەڵ ئەوەی کوڕە بەئاگا هات خەبەرت دەدەمێ."

پۆیراز بەیانی زوو بەئاگا هات، لێنا بەرلەوەی ئەو لەخەو هەستێت دوو دەبەی ئاوی گەرم کردبوون و دایناببوونە گەرماوەکە. پۆیراز بە بینینی ئەو دوو دەبە ئاوە گەرمە زۆر خۆشحاڵ بوو و یەکسەر خۆی شوشت، ریشی تاشی، نینۆکەکانی کردن، لە ئاوێنەکە سەیری خۆی کرد، روخساری پەشۆکابوو، لێنا جلەکانی بۆ هێنان کە بۆنی بنیشتی دارەبەنیان لێدەهات و لەسەر کورسی بەردەم دەرگای گەرماوەکەی دانان. پۆیراز لەکاتێکدا کە خۆی بەخاولیەکی گەورە وشك دەکردەوە لەگەرماوەکە هاتە دەر. لێنا جلە جوان و کراسە سپیەکەشی بۆ هێنا، جلەکانی

پۆشین، دووباره سەیری ئاوێنەی کرد، سەر و قژ و سمێڵەکانی شانە کردن. پاشان چووە خوارەوە، بەرەو باخچەکە چوو. دەریا لەو خوارەوە سپی دەینواند. بۆنی خەستی دەریای بۆ هات. لەو هەوا گۆرگەمێشەدا هەموو شتێك جوان دەینواند. دەنگی باڵندەیەك لە دوورەوە کەوتە بەرگوێ، دروست وەکو دەنگی هەمان باڵندەی گۆرین بوو، ئەو باڵندەیەی کە دەنگەکەی دەبیسترا بەڵام خۆی نەدەبیندرا... لەشوێنی خۆی رەقهەڵات، ئەو سەرسامیەی زوو رەویەوە. گوێی بەرەو لای دەنگەکە هەڵخست، ماوەیەك ئاوا چاوەڕێ ما. هیچ دەنگێك لەو دەوروبەرە نەدەبیسترا. لەدڵی خۆیدا گوتی ئەم دەنگە نیشانەی خێرە. لەو هەوای گورگەمێشەدا هەموو شتێك جوان دەهاتە بەرچاو. لەبەر خۆیەوە گوتی بچمە سەرکانی. تا ئەمکاتە کانیەکەی ئاوا بەر لەدەرکەوتنی خۆر کە دەریا بەسەر سپی دەڕوانێت نەبینیبوو. یەك دوو هەنگاوی بۆ لای کانیەکە هەڵێنان و ئەوەی بەبیرداهات کە موسا ئاغا بۆ قاوەڵتی بانگهێشت بکات. یەکسەر چووەوە ماڵێ، پلیکانەکانی دوودانە دوودانە بڕین و چووە سەرەوە، بە شلەژان و دەستپاچەییەوە گوتی:

"دایکە لێنا، دایکە لێنا، هێشتا نەچوویتە ماڵی زەهرا و ئەوان؟"

لێنا بە ئارامیەوە گوتی: "جارێ سەبرت هەبێت، مەگەر نابینی وا مێزەکەم داناوە، چای و شیر لەسەر ئاگرە، سەیری مێزەکە بکە، دەبینی چ خەیار و تەماتە و بیبەرم داناونەتە سەرمێز؟"

"ئەمانەت لەکوێ پەیدا کردن دایکە؟"

"لەکوێم پەیداکردن؟ لەباخچەم لێکردوونەتەوە. بیبەر و خەیارەکانم لەو شوێنەی کە ئاوی کانیەکەی پێدادەڕوات دۆزیونەتەوە. ئاوی کانی بەنێو باخچەدا تێدەپەڕێت. خەیار و بیبەریش لەوێ رواون، لەکۆنەوە هەروا بووە."

"باشە ئەی ئەو تەماتە سوورانە هی کوێن؟"

"ئەوانیش هەر هی باخچەکەی خۆمانن."

"بەڵام دایکە مەگەر باخچەکەمان وشك نەبوو بوو؟ من تەنها دووجاران ئاوم داوە."

"تەنها هەر باخچەی ئێمە نیە، لەهەندێك لەباخچەکانیش برِکە وشکبوووەکان پڕن لە تەماتەی سوور."

"ئەی بۆچی من نەمبینیون؟"

"تۆ قەت سەیری بڕکە تەماتەکان ناکەیت. لەهەر باخچەیەك لەنێو بڕکە وشکبووەکانی تەماتە یەك دوودانە تەماتە هەن کە هێندەی هێلکە مریشکێك دەبن، ئەوەندەش بەتامن کە هەرئاوا لێیانبکەوە و بیانخۆ."

"تۆم هێنایە قسان دایکە، یەکسەر بڕۆ ئەوان لەخەو هەستێنە، سەیر بکە، هەموو شتێکت ئامادەکردووە، بۆچی وەستاویت؟"

"بوەستە، ئەوەندە بزۆز مەبە، هەوا هێشتا رووناك نەبۆتەوە. ئەوان دەبێت لەخەو هەستن، ئاوێك لەخۆیان بکەن، جلەکانیان بپۆشن، کچەکان پرچیان شانە بکەن. من خۆم دەزانم بچمە ئەوێ. تۆ ئاسوودەبە."

پۆیراز گوتی:"دەزانیت، باشە." لەپلیکانەکان دابەزی، بە خێرایی بەرەولای کانی رۆیشت و گەڕایەوە. ماوەیەك ئاوا رۆیشت و گەڕایەوە. هەر جارێکیش کە دەچوو و دەگەڕایەوە چاوێکی لە مالّی زەهرا دەکرد. هیچ جوولّەیەك لەمالّی زەهرا بەدی نەدەکرا. "ئەمانە چ جۆرە کەسانێکن، خۆر خەریکە هەلّدێت، هێشتا لەخەو هەلّنەستاون. دوێشەو بۆ قاوەلّتی ئەم بەیانیە بانگهێشتمان کردوون کەچی هێشتا بەخەبەر نەهاتوون."

هێواش هێواش تووڕە دەبوو تا زیاتریش تووڕە دەبوو خێراییەکەی زیاتر دەبوو. لێناش هەر نەدەهاتەدەر. لێنا لەدواوە سەیری کرد، گوتی، کاتێك ئاگر بەردەبێتە هەناوی کەسێك ئاوای لێدێت، زەردەخەنە کەوتە سەر لێوانی.

پۆیراز کاتێك دنیا کەمێك رووناك بووەوە لەباخچەی پشت کانیەکە تارماییەکی مەیلەو سووری بینی، خەریك بوو بە خێرایی دەڕۆیشت کە قاچەکانی هەلّیانگرت و بردیانە لای ئەو شتە سوورە، داهاتەوە بۆ ئەو شوێنەی کە بە سووریدا دەیڕوانی، تەماتەیەکی بینی و لێیکردەوە. تا دنیا زیاتر رووناك دەبووەوە ژمارەی تەماتە سوورەکان زیاتر دەبوو. تەماتەکانی تورتو سوور سوور بوون. تەماتەی زەویە وشکەکان ئاوا سووری گەش دەردەچن. کاتێك کە خۆر هەلآت سەیرێکی هەموو خانووەکانی کرد، لەگۆشەو کەناری هەر باخچەیەکدا ئەو سوورایيانە کە شەونمیان نیشتبووە سەر دەدرەوشانەوە. لەپڕ بۆی دەرکەوت کە خۆر دەرکەوتوە. گوتی وای ئابڕوومان چوو، رایکرد. باخچە بە باخچە هەر تەماتەی سوور تەماتەی سوورمان گوت و گەیشتینە کوێ. کاتێك هاتەوە مالّێ سەیری کرد میوانەکان هاتبوون و لە دەوری مێزەکە دانیشتبوون و چاوەڕێی ئەویان دەکرد، یەکسەر لەسەر کورسی دانیشت:

"ببوورن ئاغا، زۆر زۆر داوای لێبوردن دەکەم. تەماتەکان لەباخچەکاندا وشك بوونەتەوە. هەموو باخچەکان تەماتەیان هەن. ئاودێری نەکراون و بڕکی تەماتەکان وشك بوونەتەوە و تەماتەکان هەروا بە بڕکە وشکەکانەوە ماون و هێشتا هەر سوور سوورن. سفت و بەتام و بۆ، جا چ تام و بۆیەك..."

تەماتەیەکی گەورەی لەگیرفانی دەرهێناو لەپێش موسا ئاغای دانا، لێنا هەستا، تەماتەکەی لەپێش موسا ئاغا هەڵگرت، بردی شوشتیەوە و هێنای داینایە نێو قاپەکەی و گوتی:"ئاغا بیخۆ، چ بۆنێکی خۆشیشی هەیە." بەجۆرێك وەك ئەوەی بڵێیت من دۆزیومەتەوە.

موسا ئاغا بەدەم زەردەخەنەوە تەماتەکەی گرتە دەست و لەگەڵ پەنیری سپی ڕەوەندان خواردی و پرسی:

"ئەم خەیارو بیبەرانە هی کوێن؟"

"بیبەر و خەیارەکانیشم لە ڕۆخ ئەو ئاوەی کە لەکانیەکە بەنێو باخچەدا دێت لێکردوونەتەوە، لە ڕۆخ ئەو ئاوەیش کە لەکانیەکەوە دەڕژێتە دەریا جۆرەها پونگەم کۆ کردۆتەوە. هەنگ و زەردەواڵە لەسەر گوڵێکی ئەو بڕکە پونگانە کە تا ناوقەدی مرۆڤ بەرز دەبنەوە هەڵنیشتبوون. لکی ئەو پونگانە لەبەر ئەوەی ئەوەندە زەردەواڵە و هەنگیان لەسەر نیشتبوون شۆڕ بووبوونەوە سەریان گەیشتبووە سەر زەویەکە. ئەمساڵیش هەنگوینەکەمان بۆنی پونگە دەدات. ئێمەش ئەو هەنگوینە دەخۆین و بۆنی پونگەمان لێدێت."

قاوەڵتیەکە بەتەماتە دەستپێکرد و بە تەماتەش کۆتایی هات. موسا ئاغا وا باسی پونگەی کرێتی کرد کە هەموویان حەپەسابوون. سەرتاسەری دەریای میدیتەرانە بە بەرد و خاکەکەیەوە بۆنی پونگە دەدات. بزنەکان، مەڕەکان، گەوەزنەکان، شوورەکان، کەوەکان، مەلە هەنجیرخۆرەکان و قەرقاوڵەکان هەموویان بۆنی پونگەیان لێدێت.

پۆیراز ئیدی نەیدەتوانی بەرگە بگرێت، حەسرەتی ئوزون یایلا و چیاکانی بین بوغا وەکو بەردێك گرانایییان خستبووە سەر دڵی.

"هەنگوینی ئێمەیش بۆنی گیاگزگ دەدات گزگ دەوەنێکی بچووکە بە گوڵێکی شینباوەوە. گزگ ئەوەندە گوڵ دەدات کە دەوەنەکە یەکپارچە دەبێتە گوڵی شینباو. هەنگەکانیشمان لەسەر ئەو گوڵیلکانە دەنیشنەوە. ئەوەندە دەنیشنەوە کە ئیدی دەوەنە گوڵەکان نابیندرێن. زارکی غەلێفەکانی ئێمە بکەیتەوە بۆنی گیاگزگ مەست و وڕ و کاست دەکات."

پۆیراز دەیویست بڵێت، چیاکان و کانیو دارزەرکە باڵابەرزەکانی ئێمە.. بەڵام قسەکەی خۆی نەکرد تاکو موسا ئاغا دڵگران نەکات. لەکاتێکدا کە پێدەچوو ئەویش هەرگیز نەتوانێت بۆ گوندەکەی و چیاکانی تورۆسی هەزارکانی بگەڕێتەوە. ڕەنگبێت موسا ئاغا بتوانێت بگەڕێتەوە کرێتەکەی خۆی، بەڵام ئەو نەیدەتوانی بچێتەوە گوندەکەی خۆیان، چونکە ئیدی گوندێك لەگۆڕێ نەمابوو.

سەری قسانیان بە تەماتە دەستپێکردبوو و دەبوا بە تەماتە تەواو بکرێت، بەڵام پۆیراز نەیدەتوانی پێشی بەخۆی بگرێت و گوتی:

"پونگە و گوڵاڵەی کانیەکانی ئێمە." بێدەنگ بوو. موسا ئاغا قاوەڵتی کردبوو و تازە خەریکبوو دەستی بەقسان دەکرد کە قەدریی بەلەموان هاتە ژوور و نامەیەکی کە بە دەستیەوە بوو بۆلای پۆیرازی راگرت و گوتی:

"ڕەمزی کاولاکزادە سلاوی هەبوو و گوتی هەرچۆنێك بێت موسا کازم ئاغا بێنێتە شارۆچکە. زۆر کەس لەوێ چاوەڕوانی بەڕێزیانن. گوایە ژمارەیەك لەغاز داغیەکانیش دەیانەوێت بیبینن. گوتی با تەشریف بێنن."

پۆیراز گوتی:"وەرە دانیشە." بەلەموان گوتی: "دایکم چاوەڕێمە." و ڕۆیشت. پۆیراز نامەکەی بۆلای موسا ئاغا درێژ کرد ئەویش خوێندیەوە:

"خەڵکی چیای ئیدا من لەکوێ دەناسن." ئەمەی گوت و نامەکەی دایەوە پۆیراز."کێن ئەوانەی لەشارۆچکە چاوەڕوانی منن؟ رای تۆ چیە پۆیراز کوڕم؟ دکتۆرە بەڕێزەکانیش بانگهێشت کراون. با لەگەڵ ئەوان لەژێر دارچنارەکان کۆببنەوە بزانین ئەوان چیدەڵێن. لەوەی کە هەموومان بانگهێشت کراوین، واتاکەی ئەوەیە کە خەریکە رێکخراوەیەك رێك دەخرێت."

پۆیراز گوتی:"ناوەکەی پارتی گەلی کۆماریخوازە."

"کەوایە، دەیانەوێت ئەو کابرایە بکەنە سکرتێری گشتیی پارتەکە."

پۆیراز گوتی:"ڕاستە. من هەر ئێستا دەچم دکتۆرەکان دێنمە ژێر دارچنارەکان."

موسا ئاغا گوتی:"من وا دەچمە ئەوێ." هەستاو گوتی:"خوا ماڵتان ئاوەدان و خوانتان بە زیاد بکات."

پۆیراز یەکەمجار سەری ماڵی دکتۆرەکانی دا، لەوێ نەبوون. ئەوان هەردووکیان چووبوون لەدووکانەکەی لێوار لەدەوری مێزێکی درێژ دانیشتبوون و بەدەنگی بەرز قسەیان دەکرد.

سەلمان سامی گوتی: "فەرموو کاك پۆیراز. وەرە دانیشە. لەدەست ئەو پیاوە دەهری بووم. هەر دەڵێت سەرکەوتنی چاناك قەڵا. سەرکەوتنی چاناك قەڵا. ئەگەر سەرکەوتنێك هەبوویێت ئەی کەشتیەکانی دوژمن لەئەستەنبوڵ چیاندەکرد؟ لەچاناك قەڵا هەزاران سەرباز لەنێو چوون، ئەگەر ئەوە نەبوا کەشتیەکانی دوژمن چۆن دەیانتوانی بچنە بوغار و لە دوڵماباخچە لەنگەر بگرن؟"

دکتۆر خەلیل رەفعەت گوتی:"بەڵێ سەرکەوتن، ئەویش سەرکەوتنێکی شکۆمەندانە."

"پەنا بەخوا، ئەو پیاوە خەریکە شێتم دەکات!" رەنگی سەلمان سامی زەرد هەڵگەڕابوو و دەستەکانیشی دەلەرزین "سەرکەوتن. خۆیشی بە مسۆگەری قارەمانی قارەمانانە."

خەلیل رەفعەت هێشتا وەڵامی ئەوی نەدابووەوە کە پۆیراز نامەکەی دایە دەستی سەلمان سامی.

"ئەمە چیە؟"

"بانگهێشتنامەیەکە لە رەمزی کاولاکزادە."

سەلمان سامی بەگ گوتی:"هۆوویی!" نامەکەی خوێندەوە و دایە خەلیل رەفعەت بەگ، ئەویش خوێندیەوە و گوتی:"هۆوویی!"

"بۆتە یەکێك لەسەرکردەکانی پارتی گەلی کۆماریخواز." سەلمان سامی لەکاتێکدا چاوی بڕیبووە ناوچاوی خەلیل رەفعەت، گوتی:

"سەرکەوتن. مەگەر وانیە کاك پۆیراز، سەرکەوتنی چاناك قەڵا!"

"سەرکەوتن."

"مەگەر ئەو سەربازی راکردوو نیە؟"

"وادەڵێن."

"سەرکەوتن!"

"هەم لەسەربازی رایکردووەو..." دکتۆر بەر لەوەی قسەکەی تەواو بکات، قەدریی بەلەموان و ئەفەخەنجەرلی هاتنە ژوورەوە. خەنجەرلی بە دەنگە گەورەکەیەوە سڵاوی کرد، شووشەی دەرگای پەنجەرەکان وە جرینگە جرینگ کەوتن. پۆیراز بە بینینی ئەفەخەنجەرلی زۆر خۆشحاڵ بوو، هەستا. ئەوانی دیکەش بێدەستی خۆیان هەستان.

"فەرموو ئەفەخەنجەرلی. بەخێرهاتی. منیش چاوەڕێت بووم."

"ئەوا هاتم ئیدی."

ئەفە هێشتا لەسەر شێوە و شێوازی ئەفەکان بوو. بەخۆیو ئێلەگە شینە قۆڵکورتە زیوچنەکەیەوە، کراسی ئاوریشمی خەت خەتی بێیاخە، پوزەوانە، شەلواری نەخش و نیگارداری کە تا ئەژنۆ دەهات، کڵاوی وەنەوشەیی بە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ نەخشێندراو و خەنجەری دوو سەرەی لەبەر پشتێنی سوور نراو دەتگوت ئەفەیەك بوو کە هەر دوێنێ لەچیا دابەزیبێت. تەنها هەر گۆڕانێکی بچوکی بەسەرداهاتبوو، جلەکانی نوێ نوێ بوون و چەکمەکانی دەبریسکانەوە.

"گوتتان هەم لەسەربازی رایکردووەو هەم چی؟"

"هەم هونەری دیکەشی هەن."

ئەفەخەنجەرلی گوتی: "کێ؟"

پۆیراز گوتی:"رەمزی کاولاکزادە."

ئەفەخەنجەرلی لەکاتێکدا سەری خۆی رادەوەشاند گوتی: "ئەو کابرایە چ سەگێکی هیچ و پووچ و بێئابڕوو و خائینە. سەربازی راکردووش کێشە نیە نورعەلی، نورعەلییش سەربازی راکردووبوو، تاقمێکی لەدەوری خۆی کۆ کردنەوە و چووە یۆنان. لەگەڵ دار و دەستەکەیدا شەوان لەچیاکان دادەبەزی و دێهاتیەکانی رووت دەکردەوەو ئاگری بەردەدایە ماڵەکانیان. زۆری کوشتن. کاتێکیش مستەفا کەمال پاشا سەرکەوت، لەچیا هاتەخوار، ئاڵای سووری هەڵداو گوتی ئێمە لەگەڵ مستەفا کەمال پاشا یۆنانیەکانمان لەئزمیر نوقمی نێودەریا کردن و ئێستا وا لەوێ دێینەوە.

خەڵکی شارۆچکە ئەویان خستە سەر شانیان و سێ شەو و سێ رۆژ ئاهەنگیان گێڕا. من هاوارم کرد و ناڕەزاییم دەربڕی. سوپاس بۆ خوا کە هیچکەس قسەکانی منی نەبیست دەنا هەر لەوێ پێستیان لەجەستەم دادەماڵی، من ئێستا دەبێت بڕۆم. لەنێو بەلەمدا چاوەڕێم دەکەن. دوای ئەوەی کە نیشتەجێ بووم زۆر قسەم هەن لەگەڵ تۆ، زۆر."

هەستا و گوتی:"خوا حافیز." خەریکبوو دەچووە دەرەوە کەچی گەڕایەوە و گوتی:

"ئەگەر سەرگورد تۆپاڵ نەبا نەك هەر نەدەهاتمە ئەم دوورگەیە بەڵکو لەنزیکیشی تێنەدەپەڕیم، تازە خانووێکیشی داوەمتێ و هاوکاریشی کردم." و رۆیشت.

پۆیراز بە قەدریی بەلەموانی گوت: "ڤاسیلی بدۆزەرەوە با بچێت خانووەکەی پێ نیشان بدات. هوسمەن و ئوسو و شێخموس ئاغاش ئاگادار بکەوە، با یارمەتیت بدەن. پاشان بڕۆ

ماڵی ئێمه و به لێنا بڵێ با رۆن و برنج و ساوار و نانتان بداتێ. خۆشت لەباخچەکان تەماته و بیبەر لێبکەوه و کەموکورپیەکانی ماڵی خۆشتان لەماڵی ئێمه ببه."

ئەفه به دەستپاچەییەوه گوتی:

"هەمه، هەمه، خۆراکێکی زۆرم هەیه، سەبەته سەبەته، گونی گونی."

چوونه دەرەوه.

"موسا کازم ئاغا لەژێر چنارەکان چاوەڕوانی ئێمەیه."

که گەیشتنه ژێر چنارەکان زانیان که موسا ئاغا دەمێك بوو لەوێ چاوەڕێیانه، داوای لێبوردنیان خواست. لەگەڵ دانیشتنیان دەستیان به قسان کرد. به بڕوای ئەفه کارەکانی رەمزی هیچ و پووچ و بێشەرەفانه بوون. ئەو دووڕوو نا بەڵکو هەزار روو بوو. باسەکه درێژەی کێشا. خەلیل رەفعەت لەو بڕوایەدابوو که دانیشتوانی شارۆچکه شەو و رۆژ، تەنانەت لەخەونەکانیشیاندا درۆیان دەکرد، کار و ژیانیان درۆزنیه.

سەلمان سامی به تووڕەییەوه هەستا: "واته ئەفه خەنجەرلیش خەریکه درۆیان دەکات؟ ئەفەکان کەسانێکی رەسەنن، دۆست و لایەنگری هەژارانن، سامانی دەوڵەمەندان لەنێوان هەژاران دابەش دەکەن."

پۆیراز لەلایەك و خەلیل رەفعەت لەلایەکی دیکه به نەرمکردنی سەلمان سامی دڵی ئەویان بۆلای خۆیان راکێشا. سەرەنجام دکتۆریان کەمێك نەرمکرد.

موسا کازم ئاغا گوتی:

"ئێستا که مستەفا کەمال پاشای قارەمان ئەوی بۆ سەرۆکی گشتی پارتەکه به کەسێکی شیاو بینیوه، کەوایه خودی مستەفا کەمال پاشا پارتەکەی دروست کردوه. ئەویش به ناردنی نامه ئێمەی بانگهێشت کردووه، ئێمەیش له بەرخاتری مستەفا کەمالی دلێر و روخسار وەکو گوڵ ناچارین له رێوڕەسمی کردنەوەی پارتەکه بەشداری بکەین."

بڕیاریاندا بچنه ئەوێ، لەبەر خاتری موبارەکی ئەو پیاوه گەورەیه هەستیان به ئاسوودەیی کرد. لەلایەکی دیکەش دەمی موسا ئاغا لەخۆشیان پێکنەدەکەوتەوه. پۆیراز لەبەر خۆیەوه گوتی بێچاره موسا ئاغا چیبکات، داوای یارمەتی لەچۆلەکەی ئەسمانیش دەکات. که هەواڵێك لەئەستەنبوڵ و ئەسینا نەهات وا بەخەفەت و غەمگینیەوه سەیری چاوەکانی پۆیرازی دەکرد که دڵی مرۆڤی دەهێنایه هەژان. دەبوا به باشی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بەڕێز رەمزی کاولاکزاده

کردبوا، خانووەکان و ژمارەیەکی زۆر کلێسا و کێلگەی سێ دوورگانی وێران کردووە، دەست بەسەر بە پێزترین زەوی‌و زاری دێهاتەکانی لێوار دەریا داگرتووە و دار و درەخت و جەنگەلەکانی بڕیونەتەوە.

ئەگەر ئەو نەبوا کێ دەیتوانی بۆ ئزمیریەکان لەبواری ئاوەدانکردنەوەی ئزمیری سووتاو تەختەو دار و کاریتە دابین بکات. ئەو رەمزی کاولاکزادەیە کە دۆستێکی گیانی بە گیانی مستەفا کەمال پاشا بوو و مستەفا کەمال پاشاش سکرتێری گشتی پارتی گەلی کۆماریخوازە زۆر کاری لەدەست دێت. هەرچی دەڵێن با بڵێن، کاتێك رەنگبێت چاو هەڵبێنیت و خۆت لەکرێت ببینیەوە. پۆیراز بۆ ئەوەی ئەو کەشە خەماویە بگۆڕێت، بە کەمێك گورجوگۆڵێەوە پرسی:

"دکتۆرە بەڕێزەکان، ئێوە لەو ژنانەی بۆم ناردن رازین؟ لەدەستەوا، لەجلشۆرین و ماڵخاوێنکردنەوەیان؟"

سەلمان سامی گوتی:"تۆ چیدەڵێیت، چیدەڵێیت، ژنانی ئەوا ئازا لەکارەکانیان تەنانەت لەئەستەنبۆڵیش دەست ناکەون. مۆرغی هوما نیشتۆتە سەرم."

پۆیراز سەیری خەلیل رەفعەتی کرد.

"لەسەر منیش مۆرغی هوما نیشتۆتەوە. تەنها ئەوەندە غەمگین، ئەوەندە ترساو، ئەوەندە بێمتمانەن کە تۆ دەڵێیت تەمەنێکە پێنەکەنیون، تەمەنێك ترساندوویانن، تەمەنێك ئازار و ئەشکەنجەیان داون."

سەلمان سامی گوتی:"ئێستا با ماوەیەکی پێبچێت ئەوسا دەبینین مەلەك خانم دەیانهێنێتەوە سەرەخۆو وەزەوقیان دێنێت یان منداڵەکان؟"

سەلمان سامی گوتی:"ئەوەی لای من هەر هیچ قسان ناکات. بەیانیان دەچێتە لێوار، لەسەر بەرزاییەك دادەنیشێت، قاچەکانی شۆڕ دەکاتەوە، لەدەریا نز دەبێتەوە، چەند جارێك بە سەرو سەداوە ئامێزم لێدا، بەڵام نەیبیست، تەنانەت نەشجوولا. کە خۆر ئاوا دەبێت دەگەڕێتەوە ماڵ، دایکی خواردنی دەداتێ، دەچێتە ژوورێك، بە هێواشی نانەکەی دەخوات و قاپەکەی دەشوات."

خەلیل رەفعەت بەسەر سوڕمانەوە گوتی:"ئەوەی منیش لەهەمان رەوش دایە. پاشان پێکەوە دەگەڕێنتەوە و دێینەوە ماڵ. منداڵی سەیرن. بۆچی لەبەرزایی پێکەوە دادەنیشن؟ تاك و تەنیا..."

"مەلەك خانم بەزوویی سەروبنی مەسەلەکە ئاشکرا دەکات."

دکتۆر سەلمان سامی پرسی:"رێو رەسمەکە چ رۆژێکە؟"

پۆیراز نامەکەی کردەوە و خوێندیەوە:

"رۆژی هەینی. نیوەڕۆی رۆژی هەینی دەبێت لەوێ بین."

سەلمان سامی گوتی:"دەچین. لەبەر خاتری مستەفا کەمال پاشا، مەگەرنا؟"

هەموان یەکدەنگ گوتیان، هەروایە.

"بەڕێزان پێمگوتبوون، قسە لەگەڵ حەسەنی راکردوو دەکەن؟"

سەلمان سامی گوتی:"ئاه تەواو لە بیرمان کرد، ئەو لەکوێیە؟"

"لەنێو بەلەمەکەیەتی، ئەگەر نەچووبێتە دەریا، هەر ئێستا بۆتانی دەدۆزمەوە." هەستا، بەرەو لای ئەسکەلە چوو. بەلەمەکەی حەسەن لەشوێنی خۆی بوو. بەلەمێکی ماتۆڕداری جوان بوو بە رەنگێکی خۆڵەمێشی. بەلەمە رەنگ خۆڵەمێشەییەکان بەئاسانی لەنێو دەریا نابیندرێن. بە هاوارکردنەوە گوتی:

"حەسەن!"

دەنگی حەسەن لەنێو بەلەمەکەوە هات:"فەرموو سەرۆك پۆیراز."

"زوو وەرە ئێرە!"

حەسەن بەو کەلەکەی کە بە بەلەمەکەیەوە بەستبوو بە سەوڵلێدان خۆی گەیاندە لێوار. کەلەکەکەی بەسەر چەوولمەکەدا راکێشا و بەرەولای پۆیراز رایکرد:

"فەرموو!"

"دەمەوێت بچمە لای دکتۆرەکان. دەبێت قسەیان لەگەڵدا بکەیت." حەسەن بێدەنگ بوو، سەری لەبەر خۆی نا، دوای ئەوەی کە کەمێك بیری کردەوە چاوی بڕیە نێو چاوی پۆیراز:

"ئەو دکتۆرانە یەکێکیان سەرگوردە، یەکێکیشیان نەقیبە، وانیە؟"

"ئەوان دکتۆرن."

"نەمبەن رادەستی سوپام بکەنەوە و ئەوانیش لەسێدارەم بدەن، جاران گوللەبارانیان دەکردن، ئەوە باش بوو، هەڵواسین زۆر ناخۆشە. سەرۆك من نامەوێت لەسێدارە بدرێم، مەمبەرە لای ئەوان. مەگەر ئەوان ئەفسەر نین، لەسێدارەم نادەن؟ هەر راکردوویێك ببینن، دەیگرن، رادەستی سوپای دەکەنەوە، سوپاش یەکسەر مرۆ لە سێدارە دەدات. رەحم پێبکە براکەم. من باڵندەیەکی بچکۆلەم لەنێو دەوەنێکی گەورە، پەنام هێناوەتە بەر تۆ. دکتۆرەکان هەر لەگەڵ ئەوەی بمبەن... رێگەم پێبدە سواری بەلەمەکەم ببم و بڕۆم."

"هێی حەسەن، ئەزیش ئەفسەرم، هیچ ئازارێکم داویت؟" دەنگی هەڵبڕی:

"ئەگەر لەگەڵ مندا نەچیتە لای دکتۆرەکان، هەر ئێستا دەستەکانت دەبەستم، بە هۆسمەن دەڵێم بەیانی بتبات و رادەستی سوپات بکات."

"سەرۆك، بهێڵە بڕۆم، بەزەییت بەمن دابێتەوە، چۆن هاتووم، ئاوا رێی خۆم دەگرم و دەڕۆم. دەمانچەکەت هەڵکێشە و لەناوچاوانم بدە، لێبگەڕێ با بە ئابڕووەوە بمرم. هەر ئەوەندە بەسە رادەستی سوپام نەکەیت کە لەسێدارەم بدەن."

"ئێستا باش گوێ لەقسەکانم بگرە، یان پێکەوە بچینە لای دکتۆرەکان."

"ئەو دکتۆرانە کەسانێکی باشن؟"

"کەسانێکی باشن."

"تا ئێستا کەسیان لەبەر چاوان لەسێدارە داون؟"

"زۆریان لەبەر چاوی ئەوان لەسێدارە داون. ئەوان دکتۆرن. ئەوان خەڵکانێکی زۆریان لەکاتی گیاندان و مردن و گوللەبارانکردندا دیون."

"تۆ راستیم پێدەڵێیت، ئەوان رادەستم ناکەنەوە؟"

"قسەم لەگەڵدا کردوون، لەبەرخاتری تۆ قسەم لەگەڵدا کردوون. ئەوان کەسانی دەستڕۆیشتووی حکومەتن. قارەمانن. لەچاناك قەڵا و لەم دوورگەیە سەربازی زۆریان لەمردن دەربازکردوون."

هەڵواسینی کەسیان بە چاوی خۆیان بینیوە؟"

پۆیراز نەڕاندی:"چەندین جار."

"بڕۆ لێیان بپرسەو وەرەوە."

پۆیراز بە توڕەییەوە:

"راکردووی نەفرەتی، باوەڕم پێناکەیت؟ ترسنۆکی نەفرەتی، لە مێروولەو پەپوولانیش دەترسی، بڕۆ وێ با لەسێدارەت بدەن، باشتر. قاچەکانت ئاوێزان بکەن. تۆ لەبەر ئەو ترسەت لەسەربازی راتکردووە. هەموو ئەو شتانەی پێشتر گوتت درۆ و هەڵبەستراون."

حەسەن پشتی خۆی راستکردەوە و گوتی:"هەرگیز، هەرگیز، من ترسنۆك نیم. ئەگەر ترسنۆك بوام ئێستا لێرە نەدەبووم. سەرۆك، ئێستا تۆ باش گوێ لەقسەکانی من بگرە، تۆ ناتوانیت بەمن بێژی ترسنۆك. ئەو مافەت نیە. دووەم، تۆ بە چ هەقێك دەتەوێت من لەم دوورگەیە وەدەربنێیت؟ من ئێستا دەچمە لای دکتۆرەکان، ئەوانیش من دەبەن و لەسێدارەم بدەن. کاتێکیش لەسێدارە درام، ئەوسا تۆش تا پێتخۆشە خەنی ببە. ماندوو بووم."

وەرسووڕاو بەرەولای دکتۆرەکان رۆیشت، وەکو نێرکە پیاز لەبەردەم دکتۆرەکان ئامادە راوەستا و سلاوی کرد.

"منم حەسەنی راکردوو، سەرۆك پۆیراز بە من دەڵێت کە... "

لەم کاتەدا پۆیرازیش هات، لەتەنیشت دکتۆرەکان لەسەر تەختەکە دانیشت.

سەلمان سامی گوتی:"بۆچی لەوێ وشکهەڵاتوویت حەسەن، دانیشە."

"ناتوانم دابنیشم، ناتوانم دابنیشم و لێبگەڕێ بمگرن، بمبەنە بازاڕی شارۆچکەکە و لەسێدارەم بدەن، تا ئێستا کەستان بینیوە کە بەرچاوی خۆتانەوە لەسێدارە بدرێت؟"

سەلمان سامی بە دەربڕینێکی نەرم و باوکانە گوتی:

"بۆ ئەمە دەپرسیت حەسەن؟"

"ئێوە وەڵامی من بدەنەوە، بینیوتانە یان نا؟"

سەلمان سامی گوتی:"نەمانبینیوە."

بە تووڕەییەوە سەیری پۆیرازی کرد و گوتی:"بینیت پێمگوتیت؟ خۆزگە دەتبینی، ئەوکات ئاوا منت نەدەهێنا لە سێدارەم بدەن."

سەلمان سامی گوتی:"جارێ تۆ دانیشە." دەنگی ئەوەندە میهرەبان، نەرم و دڵسۆزانە بوو کە حەسەن لەناخەوە هەستی بە ئومێدەواری کرد.

"حەسەن، تۆ تا ئێستا لەسێدارەدانی کەست بینیوە؟"

"زۆرم بینیوە زۆر. لەبەرەی رووسەکان سەربازانی راکردوویان دەگرتنەوە و یەکسەر لەسێدارەیان دەدان، ئەویش بە کەدو لکی بەسەهۆڵبووی درەختەکانی جەنگەڵ لەژێر بەفر و

بەستەڵەکدا سپی سپی بوون. بە چاوانی خۆم دەمبینین. من شتێك دەڵێم و تۆ شتێك دەبیستی. زمانی هەموویان بستێك راکێشابوو، نووکی پێیەکان لەئەرزەکە دەخشا، ئیدی لەوە زیاتر ناتوانم هیچ بڵێم. ئەگەر من رادەستی سوپا بکەنەوە، تکایان لێبکەن لەسێدارەم نەدەن، پێیانبڵێن گوللەبارانم بکەن. ئەوە راستە کە مەرگ هەر چۆن بێت هەر مەرگە، وەلێ گوللەبارانکردن کارێکی پاکە. باشتر نیە رادەستم نەکەنەوە، بۆ بکوژرێم؟"

سەلمان سامی گوتی:"باشترە."

حەسەن بە واقوڕماوی و کەمێك بە ناباوەڕی و دوودڵیەوە پرسی:"باشترە؟"

"تۆ دانیشە، باشترە."

دەنگی سەلمان سامی ئەوەندە لێبڕاو و دڵنیاکەرانە بوو کە حەسەن دانیشت. بە دەست پۆیرازی نیشان دا:

"ئەم سەرۆك پۆیرازە بەمنی گوت ترسنۆك. ئەگەر ترسنۆك بوام، دەهاتم لە نێوان سێ ئەفسەر دادەنیشتم؟ ئەگەر لەسێدارەدانی یەك کەس تەنها یەك کەستان بینیبوا، دڵتان نەدەهات لێبگەڕێن لە سێدارە بدرێم."

"لەسێدارەدانی کەسمان نەبینیوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نیازی ئەوەمان نیە رادەستت بکەین، دەمەوێ کارتی خزمەتکردنی سەربازیت بۆ وەربگرم، وا دەکەم لەناسنامەکەشت بنووسن. ئیسحاق بەگی شەلە، سەرۆکی هۆبەی سەربازی شارۆچکە یەکێکە لە دۆستەکانی سەردەمی سەربازیم لەجەنگی چاناك قەڵا. قاچەکانی خراپ بریندار بووبوون و ئێسقانەکانی وردوخاش بووبوون، چەندین رۆژ و چەندین هەفتە چاودێریم کرد و ئاگاداریم لێکرد تاکو چاك بووەوە. قاچێکی باش باش بووەوە، قاچەکەی دیکەی کەمێك دەشەلێت. ئەگەر من و خەلیل رەفعەت بەگ نەبواین، ئێستا نەیدەتوانی بەڕێگادا بڕوات و وەکو ئێمە لەبەر کەمئەندامی خانەنشین دەکرا. ئێستا ئەو کەسەی من تۆی دەبەمە کن، دەتبات تا لەسێدارەت بدەن یان تیر بارانت بکەن؟"

حەسەن کە چاوەکانی وەکو ژێر پیاڵەیەك گەورە بووبوون لەدەمی دکتۆر رامابوو و واقی وڕمابوو نەیدەتوانی وشەیەك چیە بێژێت. حەزی لێبوو شتێك بڵێت، بەڵام نەیدەتوانی. دەتگوت زمان لەزاریدا ئاوسا بێت. زۆری لەخۆی کرد تا دواجار توانی قسە بکات:

"ئەگەر تۆزقالێك مرۆڤایەتی لەدڵدا مابێت، نە لەسێدارەم دەدات، نە گوللەبارانم دەکات...بەڵام ئەگەر مرۆڤایەتی نەمابێت..." دەنگی دەلەرزی. "ئەوانە هەم لە سێدارەم دەدەن و هەم گوللە بارانیشم دەکەن، فیشەك و پەتیشیان دەست نەکەوێت، دەمدەنە دەست دوو سەربازو بە سیرمەی چڕ دەمخنکێنن."

یەکەیەکی گەورەی سوپا لە بناری چیا کە دایکوتا. هەوا ئەوەندە ساردە، ئەوەندە ساردە کە تف هەڵاوێیت هەر لەهەواوە دەیبەستێت، بنار چیاکە یەکپارچە سەهۆڵبەندانە، دەگەنە شوێنێك کە کاتێك سەربازەکان قاچیان لەسەر سەهۆڵەکە دادەنێن هەڵدەزەلن‌و تا خوارەوە غلۆر دەبنەوە، ژمارەیەك لەسەربازەکان بەسەر چۆکانەوە و ژمارەیەکی دیکەشیان هەر بە پێوە رەق بوونەوە و بوونە پارچەیەك سەهۆڵ. ئەوانەی کە هێزێکیان تێدامابوو بۆ بە هەورازەکە هەڵگەڕان جارێکی دیکە ئاوڕیان لەدواوە دەدایەوە و سەیرێکی پشتە خۆیان دەکرد و ئیدی نەیاندەتوانی خۆیان وەرسووڕێننەوەو ئاوا رەق دەبوونەوە. دەچوونە ئەو جێگایانەی کە هەمووی کەناری سەخت سەختی سەهۆڵبەندان بوون. ئەوانەی لەو هەڵدێرگە سەهۆڵبەندیانە نزیك دەبوونەوە، دەستە دەستە و بەسەر یەکدا بۆ خەرەندە هەزار بە هەزاریەکان غلۆر دەبوونەوە. ئێمە کە ئەو دیمەنانە دەبینین چیدەکەین؟ تا دەتوانین لەهەڵدێرگەکان نزیك نابینەوە. دەگەینە ئەو جێگایانە کە وەکو دیوار لەبەردەمان قیت بوونەتەوە و پێدا هەڵگەڕانیان کارێکی مەحاڵە. ئێمە چ کارێك دەکەین؟ لەگەڵ گروپی هاوکاری سەهۆڵەکان دەشکێنن و قادرمەیان لێدروست دەکەین. بەمشێوەیە، بەچیاکەدا هەڵدەگەڕێین. ئەوانەی توانای سەیرکردنی خوارەوەیان هەیە، هەرجارێك کە سەیر دەکەن، یەکسەر رووی خۆیان وەردەگێڕن. لەو یەکە سەربازیە گەورەیە تەنها مستێك سەربازی ماونەتەوە. هەندێکیان لەحاڵەتی راوەستاندا رەق بوونەتەوە، هەندێکیان لەهەڵدێرگەکان پەرتی خوارەوە بوونە، هەندێکی دیکەیان کەوتوونەتە سەرعەرزەکە. لەبەردەڵانە سەهۆڵبەندانێك بەسەر کەوتین، سەیری دەوروبەرەکەمان کرد بینیمان ژمارەیەك سەرباز هەروا بە پێوە رەق بوونەتەوە بوونەتە پارچەیەك سەهۆڵ. سەربازەکان کاتێك دەستیان گەیاندە یەك دووانێکیان لەوان وەکو قاڵبەبەفر کەوتنە سەرعەرزەکە. گەیشتنە جێگایەك کە ئەوەندە تەرمی سەربازان لەوناوە کەوتبوو کە زەویەکە لەبەر تەرمان بەدی نەدەکرا، ئێمە چی دەکەین؟ سێ شەو و سێ رۆژ بێئەوەی شتێك بخۆین ئاوا بە چیاکە هەڵدەگەڕێین، ئەوانەی لەسەر بەفر و سەهۆڵەکە دادەنیشن تا پشووێك بدەن خەویان لێدەکەوێت

و ئیدی هەڵناستنەوە و ڕەق دەبنەوە. ئەوانەی بەدەست لوولەی تفەنگەکانیان دەگرن هەر مەپرسە، دەستیان بە لوولەی تفەنگەکانیانەوە دەچەسپێت و ئاوا دەمێننەوە. ئێمە چی دەکەین؟ بەرلەوەی بە چیاکەدا هەڵبگەڕێین، دە پازدە ڕۆژ نیوە برسی بە جلوبەرگێکی هاوینە و کالەکی چەرمیەوە بەنێو بەفر و سەهۆڵدا دێین و دەچین‌و پلیکانە لەسەهۆڵ دروست دەکەین و بە گردەکاندا هەڵدەگەڕێین. کاتێ بە هەورازەکەدا هەڵدەگەڕێین برسی دەبین و ئازووقەش لەدواوە نایەت. ئێمە چی دەکەین؟ لەبەر برسێتی و ماندوویێتی لەو ناوسەهۆڵەی بنارەکە پەرش و بڵاو دەبینەوە. ئەوانی دیکەمان بەرەو لوتکەی چیاکە بەڕێدەکەوین. مردەنیەکان دەمرن و زیندەنیەکان درێژە بەڕێگای خۆیان دەدەن. لەو نێوەدا ئەفسەرەکان چیدەکەن؟ ئەوانیش ڕەق دەبنەوە، هەڵبەتە ژمارەی مردووەکانیان کەمە. ژمارەیەکیان هەر ئاوا کە سەیری لوتکەی چیایەکە دەکەن ڕەق دەبنەوە. ئەفسەرەکان چیدەکەن؟ هەر یەکێك ڕەق بووەوە بە گوللە دەیپێکن. ئەوانەی کە دەکەون لەجیاتی ئەوەی دەنگی مرۆڤیان لێوەبێت، دەنگی کەوتنی قاپۆری درەختیان لێوەدەهات. هەروا کە تەلەفاتمان دەدا، دەوروبەری نیوەڕۆ گەیشتینە شوێنێکی هەمواری زۆر فراوان. ئەوێ جێوارگەی کوێستانی کوردەکان بوو کە هاوینان دەچوونە ئەوێ ڕەشماڵیان هەڵدەدان، هەوارگەکە جێگایەکی هەموار و پان و بەرین بوو.

فەرماندەکان بڕیاریاندا لێرە خواردنی گەرم دەخۆین، کەمێك پشوو دەدەین، پاشان بەرەو خوارێ، بەرەو لای ساری قامیش بەڕێدەکەوین، پاشەکشە بە سوپای رووس دەکەین، لەوێ جەمە خواردنێکی لە تێری دەخۆین، جلی گەرم دەپۆشین، چەکمەی پێستی بزن دەکەینە پێ و پاڵتۆی خووری... بەباشی دەنووین، سێ ڕۆژ و سێ شەو. لە یەکەك، تەنها یەك لەسەر چواری سەرباز، لەسەر چیاك..

کاتێك لە ئەرزەرۆم بەڕێکەوتم چیمکرد؟ باوکم چیپێگوتم، کاتێك بوومە سەرباز و گەڕامەوە... لەوێ لەوەرزی زستاندا شەڕمان کرد. لە لەشکرەکەی ئێمە هیچ کەس نەگەڕایەوە. ڕەنگبێت تەنیا یەك دوو شەل و کوێر و حەوت هەشت دیل گەڕابنەوە. باوکم پێیگوتم ئامۆژگارییێکت دەکەم کوڕم، ئەم پارەیەت دەدەمێ، بیگرە و بڕۆ بە دایکت بڵێ کیسەیەکی مشەمات بۆ بدورێت، پارەکان بخەرە نێو کیسەکە، هیچ شتێك مەکڕە، پێنج کیلۆ شەکری نەبات بکڕە، ئەمە لەبیر نەکەیت. ئەگەر جەنگ ئێوەی بەرەو لای سەهۆڵەکان کشاند، هەمووتان لەسەرمان ڕەق دەبنەوە. تەنانەت ئەگەر لەدەشت و شوێنە هەموارەکانیش بن دیسان

هەر لەسەرمان رەق دەبنەوە، پێستی سمۆرەشتان لەبەر بێت هێشتا سەرما وەکو مووس دەتانبڕێت و بە هیلاك دەچن. نەکەیت قسەکانم لەبیربکەیت. پێمگوت مەگەر دەکرێت قسەکانت لەبیر بکەم. کاتێك خەریك بووین بەرەو چیاکە دەڕۆیشتین بە شارۆچکەیەکدا رەت بووین. من چووم لە دووکانێکدا کەمەر بەندێکم کڕی، نەباتەکانم خستە نێو کەمەربەندەکە، لەپشتی خۆم بەست. پالتۆیەکی شڕو شەپڕێویشیان دامێ، گیرفانەکانی پالتۆکەم لێکردنەوە و هەندێك نەباتەکانم خستە گیرفانەکانی پالتۆکە، هەموو گیرفانەکانم پڕی نەبات کردن، لەو شوێنانەی کە پێویست نەبوا، لەدەشتەکان و شوێنە هەموارەکان نەباتەکانم نەدەخوارد، بەڵام کاتێك بە کێوی سەختی ئەللاهوئەکبەردا هەڵدەگەڕاین، جار جار یەك دوو دانە نەباتم دەخستە دەممەوە، لەکاتی بەسەرکەوتن بە هەورازەکەدا ژمارەیەکی زۆر سەربازمان لەسەر بەفرەکە دەکەوتن، عەریفەکان، ئەفسەرەکان و نەقیبەکان بەو خەیاڵەی نەوەك ئەو سەربازانەی کە لەسەر بەفرەکە دەکەوتن هێشتا نەمردبن ئەوانیان بە گوللەیەك دەپێکا. خوێن لەکەللە سەری سەربازەکان بە سەر بەفرەکەدا فیچقەی دەکرد و هەر لەچاوترووکانێکدا رەق دەبوونەوە. لەکاتی بەسەرکەوتندا ژمارەیەکی زۆریشمان رەق بوونەوە، فەرماندەکان بە سوونگیەکان زەبرێکیان دەگەیاندە سەربازە بەپێوە رەق هەڵاتووەکان و سەربازە رەقهەڵاتووەکان رادەقەنان و دەکەوتنە سەر بەفرەکە. قەدپاڵە بە بەفرو سەهۆڵ داپۆشراوەکە کە لوتکەکەی دیار نەبوو لەخوارەوە تا سەرەوە رەش رەش دەینواند. ئێمە لەئەرزەڕۆمەوە یەکنەفەس بۆ ئەوێ چووبووین، بێئەوەی پشووییێك بدەین یان پارووە نانێك بخۆین. بڕیاروابوو بە بەرزایی چیاکەدا رەت بین و بچینە ساری قامیش و شارۆچکەکە لە رووسان وەربگرینەوە. کاتێك خەریك بووین بەسەر بەرزایی چیاکەدا دەڕۆیشتین لەلای راستەوە لەلایەن سوپای رووسەوە وەکو باران گوولەمان بەسەردا بارین.

چی بە ئێوە بڵێم، من شتێك دەڵێم و ئێوە شتێکی دیکە دەبیستن، سەرتان نەیەشێنم، گەیشتینە لوتکەی چیاکە. ئەوێ زۆزان و جێوارگەی کوردان بوو. کە گەیشتینە ئەوێ کاڵەکەکانمان دڕابوون و بە بێخاوسی مابووینەوە، پێیەکانمان زامدار و وەکو دەف ئاوسا بوون، ماوەیەکی زۆر بوو کە پارویێك نان چییە نەچووبووە هەناومان. جلە هاوینییەکانمان زیوێر زیوێر بوو بوون و چەندین رۆژ لەسەریەك ئاوا رێگامان بڕیبوو، هەمووومان درێژاو درێژ لەسەر بەفرەکە راکشاین. بڕستی رۆیشتن و جووڵەمان تێدا نەمابوو، تەنانەت نەماندەتوانی

ئەنگوستەکانیشمان بجوولێنین. خۆر سوورهەڵگەڕابوو و خەریك بوو ئاوا دەبوو. لەهەر پێنج سەرباز یەکێکیان لەنێو چوو بوو و ئەوانەی ماشبوون خەریك بوو لەسەر چیای ئەڵلاهوئەکبەر لەبرسان دەمردن. ئێمە بە فەرمانی فەرماندەی گشتی بڕیاربوو بەدەم شەڕکردنەوە لێرەوە بڕۆین و خۆمان بگەیەنینە ساری قامیش و یەکینەکانی لەشکری رووس لە شارۆچکەکە وەدەرنێین، نان بخۆین و پشوو بدەین. فەرماندەکەشمان لەخۆباییانە خۆی فش بکاتەوەو سەرسنگی بە میدالیای زێڕ بڕازێتەوە.

سەلمان سامی بە دەنگێکی لێبڕاوانە گوتی: ((وەرە لای من دانیشە.)) حەسەن هات لای سەرگورد دانیشت. ((گوێ بگرە بزانە چی دەڵێم، ئێمەش لە یەکەم گوللەوە تا دوا ساتەکانی نەبەردی چاناك قەڵامان بینیوەو بەشداریمان تێدا کردووە، تۆ ئەوەم پێبڵێ چۆن دەرباز بوویت حەسەن؟)).

ئێمە لەسەر بەفرەکە کەوتبووین، هێشتا هەناسەیەکمان تازە نەکردبووەوە کە لەلای راستمانەوە دابێژراینە بەر گوللان. ئێمەش هەر لەو شوێنەی لێبڕاکشابووین دەستمان بە تەقەکرد، ماوەیەك ئاوا تاك و تووك لەملاو ئەولا تەقە بەردەوام بوو. پاشانیش تەقەمان راگرت. رامانەگرتبوا چیمان کردبوا، ئەوانیش بە مسۆگەری رەق بووبوونەوە کە تەقەمان راگرتبوو. خۆر لەئاوابوون دابوو، لەو ئان و ساتەدا، باوبۆرانێکی وا هەڵیکرد خوا بە نسیبی کەسی نەکات، دنیامان بەسەردا وێران بوو. لە لەشکرێکی بەو گەورەییەوە مستێك سەربازی بریندار و برسی مابوونەوە کە یەکسەر بەهەر جۆرێك بوو هەستاین، چونکە ئەگەر هەروا بە راکشاوی بمابواینەوە بەفر و باوبۆران دایدەپۆشین. باوبۆرانەکە ئەوەندە بەهێز بوو کە هەر کەس لەجێی خۆی هەڵدەستا بە عەرزی دادەدایەوە. دەستمان کرد بە سنگە خشکە. باوبۆران و رەهێڵەکە تێکیەوەپێچاین و رایماڵین و بردنی بۆ خوار خوارەوە و بەملاو ئەولای دەکێشاین. خۆمان لەدەشتەکە و سەر لێواری هەڵدێرەکە و گەلیەکان بینیەوە. من بە سنگە خشکەو بە چەنگەڕنە خۆم کێشایەوەو لە نێو زنارەکاندا زەندۆڵێکم دۆزیەوە، دەستم درێژ کرد سەیرمکرد دەستم گەیشتە خۆڵ. دوای چەندین مانگ بوو کە ئەمە یەکەمجارم بوو دەستم بگاتە خاك و خۆڵ. بە تەواوی خاکم لەبیرکردبوو. ئەگەر تا بەیانی زیندوو مابوام و خۆرهەڵاتبوا منیش دەمتوانی بە چاوی خۆم جارێکی دیکە خاك ببینمەوە. بە سینە خشکە خۆم نزیك کردەوە لە خاکەکە. ئەوێ لەچاو دەرەوە کە ئاسمان و زەوی یەکپارچە سەهۆڵ بوو گەرم بوو، گوتم ئەگەر

ئەمشەو بخەوم لەسەرمان دەمرم. دانەیەك نەباتم لە كیسەكەم دەرهێناو خستمە دەممەوە تا بەیانی دا هەروا نەباتم دەخواردو كە خەویش دەیویست بە سەرمدا زاڵ بێت، بە مست لە سەری خۆم دەدا و پێڵەقەم بە خاك و خۆڵی زەندۆڵی زنارەكە دەكێشا و قاچ و سەرو دەستەكانم ئەوەندە دەئێشان كە تەنانەت خەوم هەر بە بیردا نەدەهات. بەو شێوەیە ئەو شەوەم رۆژكردەوە، لە درزی زەندۆڵەكەوە تیشكێكی رووناكی دەهاتە ناو زەندۆڵەكەوە، كاتێك چاوم بە خاك كەوت، دەتگوت دنیایان داومەتێ. دڵ و دەروونم گەشانەوە. چوومە لای ئەولاتری زەندۆڵەكە سەیرم كرد پێنج ئەفسەر بەسەر یەكدا كەوتوون و لە سەرمان رەق بوونەتەوە. هەر پێنجیانم یەك بە یەك بردنە دەرەوە تاكو تەرماكانیان ببینن و هەڵیانبگرنو بیانبەنە خوارەوەو لەو سەر چیایە نەبنە خۆراكی گیانداران. كاتێك بەنێو تەرمی مردواندا دەرۆیشتم هیچ چارەم نەبوو جگە لەوەی بەسەر تەرمەكاندا رەت ببم. سەربازەكان لەكاتێكدا ئامێزیان بە یەكدا كردبوو ئاوا مردبوون. هەموو لایەكی ئەو چیاو رووبار و دۆڵ و دەشت و داوێنەكان پڕ بوو لەتەرمی سەربازان. لەو لەشكەرە بەو گەورەییەی خۆیەوە لە ئێمە بەولاوە ئیدی هیچ كەس زیندوو نەمابوو.

سەلمان سامی گوتی:

((لەو كێوانە نەوەد هەزار كەس لەسەرما و لەبەر نەخۆشی و برسیەتی مردن. داخۆ چەند كەس لەو لەشكرە گەورەیە كەمئەندام بوون دیار نییە. ئەوەی كە جەنگ چەند ترسناكە و دووره لەشان و شكۆی مرۆڤ و هەموو مرۆڤایەتی سۆزی مرۆڤ لەنێو دەبات تەنها ئەو كەسانە ئەوە دەزانن كە لەجەنگدا بەشداریان كردبێت. دەمەوێت بڵێم ئەنوەر پاشا فەرماندەی گشتی بوو. ئەو بوو كە لەشكری برسی و روت و پایەتی بەر لەهاتنی وەرزی بەهار رەوانەی چیاكانی ئەللاهوئەكبەر كرد، ئەو لە راستیدا ئەو لەشكرەی بۆ جەنگ نا بەڵكو بۆ مردن و لەنێوچوون ناردە ئەوێ. ئەوان كە بە ئازایەتی ناوبانگیان دەركردبوو ترسنۆكترین كەس بوون. من لە ترسناكترین جەنگەكاندا بەشداریم كردووە. ملەستووری زۆر زۆرم بینیوون. خۆم بینوومن و دەزانم چەند ترسنۆك و بوودەڵەن. دەبێت ئەوانەی بڕیار لەسەر هەڵگیرساندنی جەنگ دەدەن بێنیت و بیانخەیتە بەردەستی سەربازەكان و پێیانبڵێیت فەرموو هاوڕێیان، پاشان بكوژیت و بكوژرێیت، ئەوسا دەبینیت كە ئایا جەنگێك هەڵدەگیرسێت یان نا؟ دەبێت لەجەنگەكاندا فەرماندەكان لەگەڵ شەڕكەرەكان رووبەڕوو بكەیتەوە، ئەوسا دەبینیت كە داخۆ كەس لەبارەی

جەنگ دەم هەڵدەبڕێت یان نا. من فەرماندەیەکی خزمی خۆمم هەبوو، فەرماندەی دەستەیەك بوو، سەبارەت بە جەنگی ساری قامیش زۆر قسەمان لەگەڵ یەکدا کردبوو. ئەنوەر پاشا فەرماندەی گشتی، کەسێکی نەشیاو بوو. سوپا هەر هیچ نەیدەتوانی فەرماندەیی یەکینەیەکیش بکات. فەرماندەی خزمەکەم دەیگوت ئەنوەر پاشا چاوچنۆکیەکەی چەندین بەرامبەری کێش و عەقڵەکەی بوو، ئەوەندە کە شێتی دەکرد. ئەوکات لەسنوورەکانی رۆژهەڵات ساری قامیش شارۆچکەیەکی رووسی بوو. هیچکەس نەیدەزانی لەوێ چەند سەربازی رووس کوژراون. هەندێك دەیانگوت دوو لەشکر، هەندێکی دیکە دەیانگوت سێ لەشکر و هەشبوون دەیانگوت پێنج لەشکر. سوپای رووس زیاتر لەبەرەی دژی ئەڵمانیا سەرقاڵ بوو. فەرماندەکانی سوپا، لەچلەی زستاندا، تەنانەت بەبێ جەنگیش نەیاندەتوانی بگەنە ساری قامیش. سەربازەکان نە جلوبەرگێکی گونجاویان هەبوو و نە خواردن و خۆراك. زۆربەی دەبۆکانی ئەرزەڕۆم بەتاڵ و حەتاڵ بوون. کۆمەڵێکیان لەعێراقەوە هێنابوو کە جلوبەرگی هاوینەیان لەبەر بوو و پاپەتی بوون. سوپا چەکی پێویستیشی نەبوو. واتە رەوشەکە بە شێوەیەك بوو کە نەدەکرا بەو چلەی زستانە پەلاماری ساری قامیش بدەن. سوپای رووس کە هەموو هێز و شیانی خۆی خستبووە بەرەی ئەڵمانیا نەیدەتوانی بەو زستانە دژوارو سەختە هێرش بکات. ئەگەر تا بەهار راوەستابوایەن ئەو کوشت و کوشتارە گەورەو ئەو شکستە رووی نەدەدا. ئەمە بەهۆی بێعەقڵییەکانی ئەنوەر پاشاوە بوو. لەو ناوەڕاستەی زستانەدا لەساری قامیش دەیەویست چیبکات، خوا دەزانێت. سەربازانی برسی، تێنوو، پێخاوس و رووت و بێ جلوبەرگی گونجاویان لەو مانگە کانوونەدا راکێشایە نێو ئەو دۆزەخە سەهۆڵبەندانە سەختە کە درێژاییەکەی لەچیای ئارارات تا دەریای سپی درێژ دەبێتەوە، زۆربەی ئەو سەربازانەی کە لەچاناك قەڵا لەنێوچوو بوون، لەچیاکان لەسەرمان رەق بووبوونەوە، جگە لەوانەی کە بەهۆی تیفۆشەوە مردبوون. کە بەهار داهات سوپای رووسیا دەستی بە جووڵە کرد، لەکاتێکدا کە لەلایەنی بەرامبەر واتە لەبەرەی ئێمەوە سەربازێك نەمابوو کە بەرگری بکات، چوونە چیاکان، بە بەرزاییەکانی ساری قامیشدا بۆ میزۆرپۆتامیا و لەوێشەوە تا تەرابزۆن چوونە پێش.

((حەسەن دەڵێت کە لەشکر بەر لەوەی بتوانێت خۆی بگەیەنێتە سەر چیاکە و شەڕ بکات نەوەد هەزار کەسیان لەسەرمان رەق بوونەوە. بەرلەوەی دەست بە شەڕ بکرێت، سەرجەم سەربازەکانی لەشکرێك لەنێودەچن. درۆیە، درۆیەکی گەورە، لەشکرێکی گەورە، لەشکرەکان

لەنێوچوون، بەر لەوەی بچنە نێو شەڕەوە. مردووەکان خۆ کوڕی سوڵتان و پادشا نەبوون. نەوەد هەزار کەس چییە، سەد هەزار، دووسەد هەزار بەر لەوەی شەڕ دەستپێبکات لەبرسان و لەبەر نەخۆشی تیفۆش و سەرما مردن، ئەوانەی دیکەشیان لە دەرگیریە بچووکەکانی ئێرەوە ئەوێ بەدەستی رووسەکان و بە تاوانی راکردن لە خزمەتی سەربازی بە فەرمانی ئەنوەر پاشاوە کوژران. ئەنوەر بەری گەندەڵیی دەسەڵاتی عوسمانی بوو. ساری قامیشمان بگرتبا چی دەبوو، نەمانگرتبا چیدەبوو. هیچ کەس ئاگاداری رەوشی سەربازانی ساری قامیش نەبوو. تەنانەت هیچکەس نەیدەزانی رووسەکان لە پشت چیاکان بنکە و بارەگایان هەیە یان نا. رووسەکان بە هەموو هێز و بێرەحمانە و بێئەمان لەبەرەی دژی ئەڵمانییەکان دەجەنگان.

((لە عێراق کۆمەڵێکیان هێنابوو کە نیمچە رووت، بە جلوبەرگی هاوینە، پێڵاوی کالەکە چەرینە لەپێ، لەڕو لاواز و هەر ئێسك و پیست و ماندوو لێبڕاو کە هەموویان لە مانگی کانوون لەو هەوا ساردو بەو باوبۆران و بەفر و سەهۆڵبەندانە، کە هەڵۆش رەق دەکاتەوە، رەوانەی چیاکان کرابوون)).

((درۆیە، درۆیەکی گەورە، دەڵێن نەوەد هەزار کەس لە چیاکان رەق بوونەوەو مردن، ئەمە درۆیە، درۆیەکی گەورە، لەشکرێکی گەورە لە چیاکان لەنێوچوو، لەنێوچوو. بەر لەوەی کە تەنانەت فیشەکێکیش بتەقێنن)).

نەوەد هەزار چییە، سەدو پەنجا هەزار کەس لەو لەشکرە گەورەیە، نزیکەی هەموو ئەو لەشکرە گەورەیە، بەر لەوەی شەڕ دەست پێبکات، لەبەر برسێتی و سەرماو تێنوویی لەنێوچوو. پاشانیش سوپای رووس کاتێك بینی سەربازێك چییە لەبەرامبەری نییە لەساری قامیشەوە هاتە میزۆپۆتامیا و ئەنەدۆڵی ناوەڕاست و تا ناوەڕاستەکانی دەریای رەش پێشڕەوی کرد.

لە چیاکە هاتمە خوار، گەیشتمە پێدەشتێکی هەموار، تەنانەت لەو پێدەشتەش بەفر تا ناو قەدم دەهات. لەپێشمەوە درەختێکی گەورەی سپیم بەدی کرد، کەسێك لەژێر درەختەکە دانیشتبوو، لێینزیك بوومەوە، پشتی بە درەختەکەوە دابوو، چاوەکانی داخستبوون و سەری بەسەر شانی لای راستی داکەوتبوو. پێمگوت دۆستۆ، تۆ مردوویت یان زیندوو؟ ئەگەر زیندوویت چاوەکانت بکەوە. تا توانیم هاوارم کرد، دەترسام دەستی لێبدەم، دەترسام مردبێت. لەدڵی خۆمدا گوتم، باشە با مردبێت، ئەم کێو و دەشت و دۆڵ و قەدپاڵانە پڕ بووە لەمردوان،

مەگەر کەس ماوە نەمردبێت، دامنا ئەوەشیان مردبێت. قژم گرت و سەرم بەرزکردەوە، چاوەکانی کردنەوە پێمگوت تۆ چۆن نەمردوویت و ماویت؟ نەیدەتوانی قسە بکات. رامتەکاند و بەرزم کردەوە. هەر کە بەرزمکردەوە گوتی: وازملێبێنە وازملێبێنە، مەمکوژە، من هیچ نازانم، واخەریکە لە برسان دەمرم. گوتم سەبرت هەبێت من چاکت دەکەمەوە. ویستی شتێك بلێت، لێوەکانی جوولاند، راقەناو کەوتەوە خوار، چاوەکانی داخران، گوتم هەموو هێزو برستی بەدەنت ئەوەندەبوو. نەڕاندم بەسەریدا و پێمگوت چاوەکانت هەڵبێنە کوڕە، ببینە دەمەوێت چیت پێبدەم، دێیتەوە سەرخۆت، کە گوێی لە رستەی دێیتەوە سەرخۆت بوو، چاوەکانی کردنەوە، سەیرێکی کردم، سێ دانە نەباتم خستنە دەمیەوە. چاوەکانی داخستنەوە، تا ئەودەمەی نەباتەکە لەنێودەمی نەتوایەوە چەناگەی نەجوولاند، تەنها سێ جار ئاوی دەمی قووت دایەوە، چاوەکانی کردنەوەو گوتی، ئەگەر سێ دانە نەباتی دیکەم بدەیتێ تەواو دێمەوە سەرخۆم. من لەساڵی دوایی خوێندنگەی سەربازی بووم کە بردیانم بۆ سەربازی، من عەریفم. دەتوانم کاری زۆر باشت بۆ بکەم. سێ دانە نەباتی دیکەشم داپێی، تەواوێك هاتەوە سەرخۆی، کەوتەوە سەر پێ و چوو خولێکی بە دەوری درەختەکە لێداو گەڕایەوە شوێنی خۆی. چۆنە لێرە ماویت؟ یەکینە و فەوجەکەت لە کوێیە؟ نازانم. چۆن نازانی؟ ئەوان هەموویان مردن. من نانی فەرماندەی فەوج و سەرگوردو نەقیبم لە گیرفانی پاڵتۆکانیان دەرهێنا. مردوو ناتوانن نان بخۆن. نازانم لەوێ رامکرد یان نا. نازانم ئەم درەختەمان لە دواوە بوو یان جێگایەکی دیکە. هاتم دانیشتمە بن ئەم درەختە، هەموو نانەکانم خوارد، پاشانیش مردم، دوای ئەوەش تۆ هاتیت.

سەلمان سامی تا دەهات ئۆقرەو ئارامی خۆی لەدەست دەدا.

((ئیدی بەسە تۆ چۆن راتکرد، ئەمەمان بۆ باس بکە.))

((باشە جەنابی سەرگورد.))

((پاشان چی روویدا، باس بکە.))

((پێمگوت، ئێستا چیدەبێت، تۆ سەربازی راکردوویت. زۆر بیری کردەوە، پاشان گوتی، واتە من سەربازی راکردووم، تۆ بڵێ. من نازانم. منت لە خەو هەستاند. گوتی لەتاریکیدا بووم، مردبووم. ئێمە ئاوا لەگەڵ یەکدا خەریکی قسەکردن بووین، لەولا چەند سوارێك دەهاتن. سەربازەکە سوارەکانی ژمارد، گوتی رێك خەریکن بۆ لای ئێمە دێن. پێمگوت، بۆچی

سوارەکانت ژمارد؟ گوتی ئەوەی لەپێشەوەی هەموویانە ئەوە سەرفەرماندەیە. ئەوان حەوت کەسن ئەوانەی بەدوای ئەوەوەن ئەوە فەرماندەکانی ئەون. سێ لەو فەرماندانە ئەڵمانین. سەرفەرماندە هەرکە سەربازێکی راکردووی بینی ناچاری دەکات دەمی بکاتەوە، ئینجا لوولەی تفەنگەکەی دەخاتە نێودەمی و دەیتەقێنێت. پێمگوت وەرە با رابکەین و خۆمان بگەیەنینە نێو ئەو دارستانەی لای خوارەوە. گوتی من چەندین جار ئەوم بینیووە دووربینی بە ملیەوە هەڵواسیوە، زۆر دەمێکە ئێمەی بینیووە. تا ئێمە خۆمان دەگەیەنینە ناو دارستانەکە دەگاتە سەرمان و بێ لام و جیم ناو دەممان پڕ دەکات لەگوللە. دەبێت هەر لێرە بوەستین تاکو دێت. کاتێکیش هات هەستین و ئامادەباش قاچەکانمان جووت بکەین و سڵاوی لێبکەین و خۆمان بناسێنین بەڵکو بتوانین خۆمان دەرباز بکەین. پاشان بە بێدەنگی چاوەڕێمان کرد. من گوتم ئیدی کارمان تەواو، ئەویش گوتی تەواو دەربازبوونمان نییە. ئەوەندە نزاو پاڕانەوانەی دەمانزانی کردمان. کەمێك دواتر سوارەکان گەیشتن و هاتن دروست رووبەڕوومان راوەستان. ئێمە دەمێك بوو خەبەردار راوەستابووین. ئێمە خۆمان ناساند. ئەنوەر پاشای فەرماندەی گشتی، گوتی ئەی سەربازانی هەڵاتوو! هەموو سەربازەکان خەریکن دەمرن ئێوەش رادەکەن، ها؟ دەمانچەکەی دەرهێنا، گوتی دەمتان بکەنەوە)) ئێمە چبکەین دەممان تا بناگوێمان لێککردەوە، پاشا ئەنگوستی لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگ بوو، پاشان کەمێك بیری کردەوە، ئاوڕی لەپاشاکانی دوای خۆی دایەوە. پرسی سەربازی راکردوو گوللەباران دەکرێت، ئەمە یاسایە، مەگەرنە؟ فەرماندەکان یەکدەنگ گوتیان، یاسایە. تەنانەت فەرماندە ئەڵمانییەکانیش وایانگوت. ئەنوەر پاشا گوتی لەنێو هەموو لەشکر تاکە فیشەکێك نەماوە، فیشەکەکانی ناو خورجینەکەی منیش تەواو بوونە. ئێوەش فیشەکی کەمتان پێماوە. ئێمە لەجیاتی گوللەباران دەبێت لەنێو دارستاندا لەداریان بدەین. من نابێت ئیدی فیشەکەکانم بە هەدەر بدەم، ئەگەرنا چۆن دەتوانین ساری قامیش لە رووسەکان وەربگرینەوە؟ بیرمکردەوە، لەدڵی خۆمدا گوتم، لەشکرێك ئیدی نەماوە، تۆ دەتەوێت ساری قامیش بە سەربازانی مردوو لە رووسان وەربگریتەوە؟ ئەو تاك و تووکە سەربازەی کە ماویشن و ئێوە دەتانەوێت لە داریان بدەن، تۆ بە تاقی تەنێ دەتەوێت بچیت ساری قامیش وەربگریتەوە؟ بیرم لەو شتانە کردەوە، بەڵام نەمتوانی ئەمانە بە ئەنوەر پاشا بڵێم، ترسام. کوڕە، تۆ کە مردوویت، قسە بکە، ترسام. لەبەر

خاتری ساتێکی ژیانی زیاتر. کوڕە، تۆ هەرچەند ساتێکی دیکە دەمریت، وادیارە تا گیان لەجەستە مابێت، بنیادەم نائومێد نابێت. زۆر ترسام.))

ئەنوەر پاشا بانگی نەقیبێکی گەنجی کرد کە لەدواوەی هەمووان بوو و پێیگوت ئەمانە بەدوای ئێمەدا بێنە. پاشاکان هەموویان ڕۆیشتن. نەقیبەکە گوتی یاللا وەرێکەون. قاچەکانی من وەکو کۆتەڵ گۆد بووبوون و هەڵئاوسابوون، هیچ هەستم بە ئێش و ئازار نەدەکرد. من حاڵم تەواو باش بوو. هاوڕێکەم حاڵی ئەوەندە خراپ بوو کاتێك چەند هەنگاوێکی خوارو خێچی بۆ پێشەوە هەڵێنا کەوت و لەو گۆڕە ڕاکشا. نەقیبەکە گوتی ڕاستی بکەوە. بەرزمکردەوە. نەقیبەکە بۆ دواوە کشایەوە پێلەقەیەکی وای بە پشتی هاوڕێکەمدا کێشا کە هاوڕێکەم بەربووەوە سەر عەرزەکە. نەقیبەکە گوتی بەرزی بکەوە، بەرزم کردەوە، لەسەر پێیان بەملاو ئەولادا دەکەوت، دیسان کەوتە سەر بەفرەکە. هاوڕێ ژێر درەخت دانیشتووەکەی من، کە تەمەنی حەڤدە هەژدەساڵێك دەبوو و هەر ئێسك و پێستی مابوو و گۆناکانی قووڵ بووبوون و چاوە شینە گەورەکانی دەقووڵدا چووبوون و لەبرسان و لەماندوێتیان هەر هێندەی منداڵێکی لێمابووەوە، سەربازی دەوڵەتی عوسمانی و ئەنوەر پاشا بوو. نەقیبەکە نەڕاندی ئەمە بخە بان کۆڵتەوە. مەگەر کێشی چەندە ئەم سەربازە؟ سەربازەکە دەکەمە کۆڵم، ئەگەر تۆ ئەسپەکەت خێرا لێبخوڕیت، منیش بە دواتدا خێرا خێرا بڕۆم، لەسەر بەفرەکە قاچم بخلیسکێت، سەربازەکە لەسەر پشتم دەمرێت، ئەوسا چی بە ئەنوەر پاشا دەڵێیت. هەم من لە سێدارە دەدات و هەم تۆیش. نەقیبەکە گوتی ڕێك وایە، گوتی لەسێدارەمان دەدات. هێواش هێواش دەڕۆیشتین.

((من لە ڕێگا چوارجار کەوتم. ئیدی هەناسەم خەریك بوو بوەستێت کە نەقیبەکە چادرێکی نیشاندا کە نزیکی دارستانێك بوو. ڕەوە ئەسپێك لەبەردەم چادرەکە دیاربوون. بەو سەربازەی کە بە کۆڵمەوە بوو چووینە ناو چادرەکە. لەنێو چادرەکە، ئەنوەر پاشا لەسەر کورسیەك کە لەگوندێکی چۆڵی ئەرمەنیان دۆزیبوویانەوە دانیشتبوو، قاچی خستبووە بان قاچی و پاڵی دابووەوە. فەرماندەکان کە لەڕو لاواز بووبوون لەگەڵ پاشا ئەڵمانییەکان بە پێوە وەستا بوون. ئەنوەر پاشا قسەی دەکرد. من هێشتا لەبەر دەرگاکە بووم کە نەقیبەکە لەئەسپ دابەزی و هات پاڵی بە منەوە ناو بۆ ئەولا چوو لەبەردەم ئەنوەر پاشا ئامادە ڕاوەستاو گوتی: ((حەزرەتی پاشا، ڕاکردووەکانم هێناوە.)) ئێمە خەریك بووین لەزارکی چادرەکەوە دەچووینە

ژوورەوە کە ئێمەی نیشاندا. من سەربازەکەم لەسەر پشتم داگرت و دامنایە عەرز و یەکسەر ئامادە راوەستام و سلاوی سەربازیم کردو خۆم ناساند. گوتی تۆ تا ئێستا چوویتە کوێستانی سەر چیای ئەللاهوئەکبەر؟ گوتم چوومە. بۆم باسکرد. لەپڕ بەتووڕەییەوە لەشوێنی خۆی هەستا، پیاوێکی بەو وردیلەییەوە، بووە دێوێك. نەڕاندی، گوتی چیتگوت؟ چیتگوت؟ لەدەستەیەکی گەورە تەنها تۆ ماویت؟ ئەو ئەفسەرانەت بینی کە لەبەردەم زەندۆڵەکە بەسەریەکدا کەوتبوون و رەق بووبوونەوە؟ سەگی خائین؟ ئەو مردووەی کە خەوتووە دەبێت یەکسەر لەداری بدەن تا ببێتە پەند. من گوتم ئەگەر لەسەر چیایەکە باوبۆران دەستی پێنەکردبوا کە چاو چاوی نەدەبینی و جگە لەوە، لەلای راستیشەوە وەکو باران لەلایەن رووسەکانەوە گوللەمان بەسەردا نەباریبوان و گولله تۆپمان بەسەر سەردا نەتەقیبوانەوە ئێستا لە ساری قامیش بووم. ئەنوەر پاشا گوێی لە قسەکانم گرت، پاشان لەشوێنی خۆی دانیشتەوە. لەدڵی خۆمدا گوتم باشت قسە کرد هاوڕێ. من خەریك بووم لەگەڵ خۆمدا دەدوام کە دیسان قوتیلە لە شوێنی خۆی هەستاو وەکو دێو خۆی فش کردەوەو نەڕاندی و گوتی لەماوەی یەك دوو رۆژ دەچمە نێو ساری قامیش. رووی کردە پاشاکان کە بە پێوە وەستابوون، ئەمانە گوللەباران مەکە، فیشەکمان نەماون. ئەمانە سەرباز نین، خائینگەلی ترسنۆکن کە دەبێت بەدارەوە بکرێن. سەربازانی شەرافەتمەند دەبێت گوللەباران بکرێن. دوای گرتنەوەی ساری قامیش چەندی بتانەوێت دەتوانن تەقە بکەن و گوللەباران بکەن، دەتوانن هێندەی دەستەیەکی راکردوو خەڵك گوللەباران بکەن، بەلام ئێستا راکردووەکان دەبێت لەدار بدەن. قاچەکانم شل بوون، پاشا چووە دەرەوە، منیش بە دوایدا رۆیشتم... جەنابی ئەنوەر پاشا، لێمەگەڕێ لەدارم بدەن، من راکردوو نیم، دەمویست بڵێم جەنگاوەرم، پاشا سوار بوو، هێشتا پاشاکانی دیکە سواری ئەسپەکانیان نەبووبوون کە لە رووبەڕوومانەوە رێژنەی گوللەمان بەسەردا باری. ئەنوەر پاشا خۆی لەسەر ئەسپەکەی خەواند و خێرا خێرا ئەسپەکەی دایە بەر قەمچیان و رەتاندی. دەستەی پاسەوانانی بارەگای فەرماندەیی وەلامی دەسترێژیەکەیان دایەوە. رووسەکان بۆ دواوە کشانەوە. زۆربەی پاشاکان لەنێو چادرەکاندا مابوونەوە. پاشایەکیان کە سمێڵێکی ئەستووری هەبوو و بە کەسێکی باش دیار بوو، گوتی جارێکی دیکە ئەو زەندۆڵەی کە باستکرد بۆم باس بکەو.. بۆم باسکرد، پێیگوتم ئەو شتانەی باسیان دەکەیت راستن؟ پێمگوت بۆ راستی قسەکانم شاهێد و دەلیلم هەیە. سەیری سەرو سیمام بکە، لەزۆربەی ئەشکەوت و زەندۆڵەکاندا خۆڵێکی

سووورباو هەیە کە لە دەنکە گەنم دەچێت. چووم لەپێشی راوەستام، سەیرێکی جلەکانم بکە، جلەکانم هەموو خۆڵاوین بەو خۆڵە سووورە یان نا؟ سەیر بکە ببینە گیرفانەکانم نەباتیان تێدایە یان نا، دەستم رۆکردە گیرفانم چەنگێك نەباتم هێنایەدەر، هەر کە نەباتەکانی بینی چاوەکانی پاشای سمێڵزل وەکو ژێر پیاڵە گەورە بوون، دەستی درێژکرد، ئەو نەباتەم بدەرێ، رووی کردە پاشاکانی دیکە، سەیر بکەن نەبات، ئێستا چایەك دەخۆینەوە، چاش بە نەباتەوە. ئاوڕی لەمن دایەوە، هێشتاش ئەو نەباتانەت پێن؟ چەنگێکی دیکەم لەگیرفانم دەرهێنا، پاشا رووگرژەکان روخساریان کرایەوە. سمێڵزل یەکسەر بانگی ئەفسەرێکی کرد، لێپرسی، چای هەیە، مەگەر نە کوڕم؟ کەمێك ماوە، لەبن کیسەکەیە، بە ئەندازەی سێ چوار جار دەمکردن. دەی زوو چایەکە لێبنێن و پەرداخێکیش بۆ خۆت هەڵبگرە. سەیر بکە، نەبات هەیە، نەبات؟ پاشای روخسار کراوە گوتی ئەمە هەستێنەوە، دەڵێیت پێشتر لەشوێنێك بینیوومە، راوەستە، ئێستا بە بیرم دێتەوە. سەربازەکەم کە ملی وەکو لاسکە هەرمێ باریك و روخساری لەترسان زەرد هەڵگەڕابوو، بەرزکردەوە. پاشاکە گوتی ئەم سەربازە ناتوانێت بەپێوە بوەستێت، ئەگەر هیچ نەباتت پێ ماوە دانەیەکی بدەرێ با کەمێك بێتەوە سەرخۆی. ژێربالّی بگرە با نەکەوێت. منیش یەکسەر دانەیەك نەباتم لەگیرفانم دەرهێناو خستمە ناو دەمیەوە. سەرباز مژتی و مژتی و تەواوی کرد. ئێستا چایەکیش بخواتەوە بە تەواوی دێتە سەرخۆی. نیگای پاشا هەر لەسەر دەستی من بوو، ئەو دەستەی کە بۆ سەربازەکە نەباتم لەگیرفانم دەرهێنابوو. نیگاکەی تکاکارانە بوو، وەك ئەوەی بڵێیت دیسانیش نەبات لەگیرفانەکانت هەیە؟ بەڵام خۆی هیچی نەدەگوت. پاشا سمێڵزل و بە قەڵافەتەکە، رووی کردە پاشاکان و گوتی کەوایە لەو لەشکرە سەدو بیست هەزار کەسییە تەنها هەر ئەم سەربازە ماوە کە دەمانەوێت لەداری بدەین. ئێمە لەجیاتی ئەوەی ئەو سەربازە کە لەدەستی ئەسپێ و سەرما خۆی پاراستووەو زیندوو ماوەتەوە لەسێدارە بدەین دەبێت مەدالیای قارەمانێتی پێبدەین. پاشا دوای ئەم قسانە دڵگران بوو، چاوەکانی پڕ بوون لەئاو، لۆچ کەوتنە نێوچاوانی. حاڵەتێکی پڕ لەئازار لەسیمایدا دەرکەوت. بەمنی گوت ئەم منداڵەی کە بە کۆڵتەوە هێنات لەکوێوە بینیت؟ گوتم لەژێر ئەو درەختەی کە جەنابی ئەنوەر پاشای لێبوو. کاتێك گەیشتمە ئەوێ وامزانی ئەم سەربازەش وەکو ئەوانی دیکە مردووە. لەتەنیشتیەوە دانیشتم، سەیرم کرد بینیم وا بەزەحمەت هەناسە دەدات. ئامێزم لێدا، گوتم گەرمی بکەمەوە، بینیم خۆیشم وەکو قاڵبێك سەهۆڵ وام. گرتمە ئامێز، نەمزانی چەندی

پێچوو. منیش هاتمەوە سەرخۆم. لەپڕ بە بیرم هاتەوە کە نەبات دەربازمان دەکات. جەستەی ئەویش گەرم بوو بووەوە. نەبات بەدوای نەباتمان خوارد. پاشای سمێڵزل ئاوڕی لەپاشاکانی دیکە دایەوەو گوتی، ئەگەر ئەنوەر پاشا عەقڵی هەبوا ئەو لەشکرە گەورەیەی نەدەهێنا بۆ ئێرە بەبرسیەتی و رووت و ماندوو و شەکەت لەم چلەی زستانەدا لەو کێوانە و لەنێو ئەو باوبۆرانە بەرەڵلا بکات تاکو ئاوا لەنێو بچێت و هەموویان بمرن، چاوەڕوانی بەهاری دەکرد. پاشاکان یەکدەنگ گوتیان مەگەر هەموومان بە ئەنوەر پاشامان نەگوت؟ پێمان نەگوت لەشکرمان بەو بەفرە کە ئاسمان و دەشت و چیاکانی ئێرە هەموو سەهۆڵبەندانە، لەسەرمان رەق دەبێتەوەو لەنێو دەچێت، هەموومان دەمرین، مەگەر پێماننەگوت؟ مەگەر ئەنوەر پاشا نەبوو فەرماندەیی لەحەسەن عزەت پاشا سەندەوە کە دەیگوت هێرش نەکەین و چاوەڕێی بەهار بکەین و لەشکری بەرەو ئەو چیا سەخت و هەڵەموتانە نەکشاند؟ ئێستا خەریکە رك و تووڕەییەکەی بەو منداڵانە دەڕێژێت. بەسەر ئەو منداڵانەی کە خۆیان خەریکە گیان دەدەن. وەك ئەوەی هەموو لەشکر رایکردبێت و هیچ سەربازێك نەمابێت.

سەرهەنگە سمێڵزلەکە گوتی راکردوو جارێکی دیکە خۆت بناسێنە. منداڵێکی حەڤدە هەژدەساڵانە بوو، خۆی ناساند. سەرهەنگ ئەو منداڵەی ناسیبووەوە، ئەو ساڵی ئاخیری خوێندنی سەربازی بوو کە بردبوویانە سەربازی، لەجەنگدا بووبووە فەرماندەی دەستە و لەنەبەردەکان ئازایەتی لەخۆی نیشاندابوو.

سەرهەنگ گوتی، بێژە کوڕم، من تۆم ناسیەوە. پاشان چی روویدا، ئەو کاتێك قسەی دەکرد هەموو گیانی دەلەرزی، لە(چەرکەس کوی)یەوە هێرشمان کرد. فەوجەکەی ئێمە زیانێکی زۆریدا. لەدەستەکەی مندا تەنها سێ کەسمان مان. بەو خەیاڵەی کە فەرماندەی لەشکرەکەمان نەمردبێت بە دوایدا گەڕام و ماندوو بووم، گوتم لەژێر درەختەکە دابنیشم، دانیشتم. ئاگام لەخۆم نەبوو خەو بردبوومیەوە، گوتم پێنج دەقەی دیکە بە ئاگا دێمەوە. خەوەکە ئەوەندە شیرین بوو کە هەرچەندەی هەوڵمدا هەستمەوە نەمتوانی. پاشان هەستم کرد مردووم. لەخەودا خۆم لەبەهەشتدا بینی. دوای ئەوەش ئەم سەربازە هات و هەڵیستاندم، منی لەدەست مەرگ دەرهێنا، نەباتی دامێ، نەباتی دامێ و پاشانیش ئەنوەر پاشا هات.

پاشان زۆر لەگەڵ یەکدا قسەیان کرد، گوتیان با ئەو منداڵانە لەسێدارە نەدەین، گوللەبارانیشیان نەکەین. ئەو دارستانەی خوارەوە پڕە لەو سەربازانەی کە یان لەسێدارەیان داون

یان گوللەبارانیان کردوون. ئەنوەر پاشا هەر جارێك دەچووە هێڵەکانی پێشەوەی شەڕ، پەنجا شەست، سەد، سەدو پەنجا سەربازی بەقەولی خۆی راکردووی کە دەمیان پڕ گوللە نەکردبوون دەدا بە پێش خۆی و دەیهێنانە بڕیارگەو دەیدانە دەست کە گوللەبارانیان بکەن. کاتێکیش لەشکر داغان بوو، دەستیکرد بە لەسێدارەدانیان.

چایەکان هاتن، خواردیانەوە، پاشاکان دەمێك بوو چایان بە شیرینایەتی نەخواردبووەوە.

سەلمان سامی گوتی: "مرۆڤ لەو سەرمایە بەرگەی هیچی نەدەگرت و خەوی لێدەکەوت، زۆربەی کەسەکان لەگەڵ ئەوەشدا کە دەشزانن دەمرن بۆ پێنج خولەکیش بێت دەخەون، بەڵام ئیدی حاڵی خۆیان تێناگەن. ئەو خەوە مەستکەرە. لەماوەیەکی کەمیشدا رەق دەبنەوە. لەساری قامیش سەدو بیست هەزار سەرباز لە لەشکرەکە بەو شێوەیە مردن. هەزاران سەربازی دیکەش یان بوونە خۆراکی ئەسپێ یان بە نەخۆشی تیفۆ لەنێوچوون... گەورەترین کارەسات بەدرێژایی مێژووی جەنگەکانی دنیا."

"کەواتە ئەو شتانەت پێخۆش بوون کە باسمکردن، دکتۆر سەرگورد؟" سەلمان سامی لەبیستنی ئەو پرسیارە ئەوەندە تووڕە بوو کە وەکو شێتان دەرپەڕی و نەڕاندی و گوتی:

"یاللا هەستەو لێرە بڕۆ گۆڕت گوم بکە سەگباب. دەبێت کام قسەی تۆم پێخۆش بووبێت، هەی توولەسەگ، بڕۆ دەنا هەر ئێستا دەتکوژم." بەرەو لای حەسەن چوو، حەسەن بەخێرایی رایکردو سواری بەلەم بوو. کاتێك سەلمان سامی خەریك بوو دادەنیشتەوە دەستەکانی دەلەرزین، رەگی ملی هەڵدەفیبوون.

خەلیل رەفعەت:

"تووڕە مەبە قوربان، بریا قسەکانی خۆی تەوا کردبان"

"منیش بێئۆقرەو کونجکۆڵ بووم بزانم ئەمە چ جۆرە جانەوەرێکە، گەورەترین تراژیدیای مێژووی ژیانی خۆی ئاوا بە پێکەنین و گاڵتەئامێزانە باس دەکات. منیش کونجکۆڵ بووم، وەلێ نەمتوانی پێش بەخۆم بگرم، بەرگەم نەگرت. ئەگەر بە سەریدا هاوارم نەکردبوا دەمردم."

"ئەویش بۆی دەرچوو. بۆی دەرچوو، بەڵام بۆ کوێ دەچێت، کەمێکی دیکە دەگەڕێتەوە. ئەویش خۆی دەکوشت کە بەسەرهاتەکەی تا تەواو دەبێت بگێڕێتەوە. ئەو جۆرە کەسانە کە کارەساتی ئاوایان بەسەر هاتووەو تێیانپەڕاندووە، هەروەها ئەوانەی بەرگەی تەنیاییان گرتووە

ئەگەر کەسێك بدۆزنەوە کە گوێیان لێبگرێت، چل شەوانە رۆژ بەبێ ماندووبوون قسە دەکەن. ئەو ترساو هەڵات، ئەگەر نا بشتکوشتبوا قسەکانی خۆی نەدەبڕی، گەورەم."

"ئێستا زووبە بچۆ بانگی بکەوە. وایزانی منیش ئەنوەر پاشام، چوو خۆی فڕێدایە نێو دەریا. بڕۆ پێیبڵێ تووڕەبوونەکەی دکتۆر دامرکاوەتەوە."

خەلیل رەفعەت هەستا، بۆ لای دەریا رایکرد. حەسەنی راکردوو سواری بەلەمەکەی بووبوو و بە نیگەرانی و دەستانی لەرزۆکەوە هندری ماتۆڕی بەلەمەکەی رادەکێشا.

"حەسەن، حەسەن، دکتۆر لەتۆ تووڕە نەبوو، تووڕەبوونەکەی بەهۆی پاشاکانەوە بوو. پێیگوتم کە پێتبڵێم بێیتەوە، گوتی زۆر حەپەساو و کونجکۆڵ بووم بزانم دوا بەسەرهاتەکە چی لێدێت. گوتی نەك هەر لەسێدارەی نادەم تەنانەت سیخورمەیەکیشی لێنادەم."

حەسەن لەجێی خۆی هەستا، ئاوڕی لەلای خەلیل رەفعەت دایەوە، ماوەیەکی باش لەسەرتاپای وردبووەوە، پاشان لەناکاو داهاتەوەو جارێکی دیکە هندرەکەی راکێشا. ماتۆڕەکە کەوتە کار، بەلەمی بەرەو لای رۆژهەڵات وەرسووڕاند. ئەو دەیەوێت ئەمن لەسێدارە بدات. چاوەکانی رێك وەکو چاوی ئەنوەر پاشان. تۆش متمانەی پێمەکە. تۆش لەسێدارە دەدات. لەکاتێکدا کە بەرەو دوورگەی کابا کەوتبووە رێ سەخت کەوتبووە نێو بیرو خەیاڵان. ئایا دکتۆر سەرگورد رادەستی دەکا کە لەسێدارەی بدەن؟ چەندیش بە وردی گوێی لەقسەکانم گرتبوو. چاوەکانی هیچ لەچاوی ئەنوەر پاشا نەدەچوون. تەنها هەندێکجار چاوەکانی پڕدەبوون لەکینەو نەفرەت، دروست وەکو چاوەکانی ئەنوەر پاشا. لەلایەکی دیکەش گوێی دەگرت. کاتێك بەسەرهاتی دۆزینەوەی منداڵە مردووەکەم گێڕایەوە چاوی پڕبوون لەئاو و کە بینیشی منداڵەکە نەمرد و هاتەوە سەرخۆی چەند خۆشحاڵ بوو و کاتێکیش ئەنوەر گوتی بڕۆن لەسێدارەیان بدەن تووڕە بوو و دواجاریش وەك ئەوەی ئەو بێت بیبەنە پای سێدارە گرمۆڵە بووە نێو خۆی و قاچەکانی شل بوون و روخساری زەرد زەرد هەڵگەڕا. کەسێکی ئاوا دەیتوانی لەسێدارەم بدات؟ دەیتوانی. چونکە چاوی پڕبووبوون لە رك و نەفرەت وەك ئەوەی تۆڵەی ئەو شکستە لە ئاسمان و زەوی بکاتەوە. لەکوێی دنیا، لەکام جەنگدا بیندراوە کەسێك وەك ئەنوەر پاشا هەڵبکێشێتە دەمانچەکەی و لەنێو دەمی سەربازەکاندا خاڵی بکات و هەر کەسێکی لەسەر رێگایدا ببینێت بکوژێت؟ لەکوێ؟ لەکوێ؟ دوای شکست لەهەر جێگایەك سەربازێکی بدیبوا جگە لەدەمت بکەرەوە شتێکی دیکەی نەگوتووە.

چاوەکانی سەرگورد لەچاوەکانی ئەو دەچوون؟ لەچاوەکانی ئەو دەچوون، مەگەر کاتێك بەسەری دانەڕاندم و بۆ لام هات ڕێك وەك ئەنوەر پاشا نەبوو؟. ئەنوەر چاوانی پڕ کینە و شێتانەی هەبوون. دکتۆر لەو جۆرە مرۆڤانەیە کە لەپڕ هەڵدەچن و یەکسەریش ئارام دەبنەوە، لەدڵی ئەو جۆرە مرۆڤانە خراپە ناتوانێت چەکەرە بکات.

بەڵەم هات لەبەرامبەر دوورگەی کابا ڕاوەستا، حەسەن لەنگەری گرت، سواری کەلەکی دواوە بوو و بەرەو وشکانی ڕۆیشت، چوو لەدەم کانیەکە دانیشت، سەیری بەلەمەکەی کرد، لەجێگایەکی زۆر نزیکی بەستبووەوە، ئایا مەبەستی ئەوەبوو کە ڕێبواران ببیینن و بچن بە پۆیراز و دکتۆر بڵێن؟ پێکەنینی بەخۆی هات، گوتی کێ بەلەمی من دەناسێت؟ چۆکی دادان، مستێك ئاوی کانیەکەی خواردەوەو لە ڕۆخ کانیەکە ڕاکشا. تا بەیانی هەرچی کردی نەیتوانی بخەوێت، ئۆقرەو ئارامی لێهەڵگیرابوو. لەدووشەممەوە تا پێنجشەممە لەدوورگەکە مایەوەو نەچووە هیچ شوێنێك. بەیانی ڕۆژی پێنجشەممە لەکانیەکە ئاوی خواردەوە، دەست و دەم و چاوی شووشت، سواری کەلەکە بچوکەکەی بوو و خۆی گەیاندەوە بەلەم و ماتۆڕەکەی خستەکار. چووەوە دوورگەی کارینجا، ماوەیەك لەنێو دەریا لەپشت دارهەنارەکان چاوەڕێ ما. پاشان لەپڕ هندری ڕاکێشا، ماتۆڕەکەی دوو سێ جاران چەرخاند و کەوتە کار. بەلەمەکە ماوەیەك بە ئارامی چووە پێش. حەسەن بەردەوام ئاوڕی دەدایەوەو سەیری دوورگەی دەکرد. پاشان لەپڕ پێی لەسەر بەنزینەکە داگرت و هەموو بەنزینی دایە ماتۆڕەکە. بەلەم خەریك بوو دەفڕی. بەلەمی تا دوورگەی کابا لێخوڕی. چووە کەنداوە بچووکەکەی پشت زنارەکان، لەنگەری داگرت، بە بەلەمە بچووکەکەی لە ئاو هاتەدەرێ. چووە ڕۆخ کانیەکە، لەتە نانێکی خستە دەمیەوە، ئاوی خواردەوە، قولابی لەنێو کەلەك دەرهێنا و یەك دوو دانە کلۆماسی گرتن، بە قولابەکەیەوە کردن، لە ماوەیەکی کورتدا سێ ماسیی گەورەی گرتن، لە بەردەکە دابەزی، چەقۆی لەنێو کەلەکەکە هێنا، ماسیەکانی پاککردنەوە، خوێی لێدان و لەسەر تاتە بەردێك لەبەر هەتاو دانان. نیوەڕۆ بە چیلکەی وشکی زەیتوون ئاگرێکی کردەوە، ماسیەکانی برژاندن و خواردنی، پشتی بە بەردی پشت کانیەکەوەدا و خەوی لێکەوت. نزیکەی ڕۆژئاوا بوون بوو کە خەبەری بووەوە، لەبەر عارەقە هەڵاتبوو. دەم و چاوی شووشتن، هەر کە سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد بزنە شین و کاریلەکانی پیر خدر دەوریان دابوو، نێرییێکی گەورەیان لە پێشەوە بوو بە بۆنێکی تیژەوە. کەوابوو نێریەکانی پیر خدریش وەکو نێریەکانی دیکە بۆنیان

لێدێت. کاریلەکان چەند جوانن، خۆزگە بیتوانیبوا ئەو کاریلانە بلاوێنێتەوەو دەستێکیان بەسەردا بێنێت، مووە شینەکەیان چەند جوانە. یانی دەتواندرێت دەست لەکاریلەکانی پیر خدر بدرێت؟ پیاو ئەگەر دەستیان لێبدات چ روو دەدات؟ یان خدر لەجیاتی یەك کاریلەی خۆی مرۆڤ ناباتە سەر دوندی ئەو زنارەو فڕێی ناداتە خوارەوەو پاشان ناچێتە خوارەوەو بە تامەزرۆییەوە سەیری مردووەکە بکات؟ ئەگەر ماسیگرێکی ناشارەزای دەریای مەدیتەرانە رێگای بکەوێتە ئەم دوورگەیە- مەدیتەرانەییەکان زۆر حەز لەگۆشتی بزن دەکەن- باوبۆرانێك هەڵبکات و هەفتەیەك درێژە بکێشێت، ئەویش لەم دوورگەیە بمێنێتەوە، یەکێك لەو کاریلانە سەر ببڕێت و بیخوات، خدر دێت و هەڵیدەگرێت و دەیبات لەسەر ئەو زنارە فڕێی دەداتە خوارەوە؟ ئەگەر فڕێی بداتە خوارەوە ناهەقی نەکردووە؟ ئایا ئەمە لەخدری خاوەن ئەسپە پۆز دەوەشێتەوە؟ مەگەر هەر ئەو نییە بە هانای کەشتیەکانەوە دەچێت و لەنوقمبوون دەربازیان دەکات؟ ئەو کە بە سواری ئەسپەوە وەکو با لەهەموو دەریاکان... ئەسپە پۆز وەکو با بەسەر هەموو دەریاکاندا دەخشێت، خوا ئاوای ئافراندووە. باڵیشی نییە، بەلاّم باشترە بلێین دەفڕێت. ماسیگر لەدەریا نوقم بوو، بەمە دەڵێین دەریای رەش، نەتێدەگات بەلەم چییە، نە کەشتی، شەپۆل دەدات و مرۆڤ دەبات و هەڵیدەداتە ئەو ژێرانە. خوا دەزانێت لە یەکەم رۆژەوە چەند کەس لەبەر خدر پاڕاونەتەوەو داوایان لێکردووە وەرەو قوتارمان بکە. نەیتوانیوە هیچ کەسیش قوتار بکات. خدر حەزی لێبێت دێت و حەزی لێنەبێت نایەت. کەسیش تا ئێستا نەیبینیوە کە ئەو حەزی لێبووبێت بهێت. خدر چ پەیوەندییەکی لەگەڵ خوا هەیە، کوڕە خاڵیەتی؟ هیچ کەس نازانێت. یۆنانییەکانی دەریای رەش دەڵێن عیسا کوڕی خوایە. خدر چی خوایە؟ ئەویش رزگارکەریەتی؟ تەنها وەلی و عارفی دەریاکان نییە، بەڵکو وەلی و عارفی کێو و دەشت و بیابانەکان و سەرتاسەری رووی زەویە. ئەگەر لەماسیگرەکانی دەریای رەش، دەریای مەدیتەرانە، دەریای ئێژە، دەریای مەڕمەڕە بپرسین ئایا کەسێك هەیە کە خدر دەربازی کردبێت چیدەڵێن؟ دەڵێن نە، نییە. مەگەر سەرنشینەکانی کە لە چاناك قەلاّ نوقمی ژێر ئاو دەکەوتن هاواریان نەدەکرد ئەی خدر قورتارمان بکە، پاشان هەموویان کەوتنە بنی بنی دەریا؟ ئەوان موسڵمان نەبوون؟ خدر تەنها موسڵمانەکان دەرباز دەکات؟ خدریش سلاّوی خوای لێبێت کارەکانی سەیرن، بۆچی بزنەکانی هێناوەتە ئەم دوورگە چۆڵە؟ بۆچی ئەو داوەی بۆ خەڵکی بێچارە ناوەتەوە؟ دامانناکەسێکی هەژار هاتە ئەم دوورگەیە، دەریا کەوتە شەپۆل و باوبۆران دەستیپێکرد و ئەو هەژارە

ناچار بوو ده پازده ڕۆژ لەم دوورگەیە مایەوە، دەبێت لەبرسان بمرێت؟ دامانەنا نەشیزانی بزنەکان هی پیرە خدرن، ئەگەر بزنەکانی سەربڕین و خواردنی، ئەوە ڕەوایە کە خدر ئەو هەژارە بەدبەختە فڕێ بداتە بنی دەریاوە؟ لەکوێ بزانێت ئەم بزنانە بزنی پیرە خدرن سڵاوی خوای لێبێت. ئایا نابێت لەو دوورگە چۆڵ و هۆڵە بزنەکان شوانیان هەبێت؟ خدر شوانێك کە بتوانێت لەم دوورگەیە بمێنێتەوە لە کوێ پەیدا بکات؟ باشە کە ناتوانێت کەس بۆ شوانیی بزانەکانی پەیدا بکات بۆچی ئەگەر کەسێك سەری بزنێکی ببڕێت و بیخوات فڕێی دەداتە بن دەریا؟ ئەمە کارێکی مرۆڤانەیە؟ بەڵکو چاوەکانی خدریش وەکو چاوی ئەنوەر بن. چاوەکانی سەرگوردیش... کاتێك سەرگوردی بەبیرهاتەوە، لەدڵی خۆیدا گوتی قورتارمان بوو و خۆشحاڵ بوو. ئەو ئەفسەرە لەسێدارەی دەدام. زوو یان درەنگ ئەو کارەی دەکرد. بە ناخێری گیانی دکتۆرە! هە! فریوم دەدات. لەسێدارەم دەدەن و هەموویان لەمەیدانەکە کۆدەبنەوە و سەیرم دەکەن و چێژ وەردەگرن. لە ڕاستیدا جەژنی ڕەمزی کاولاکزادەیە. لەبەر خۆیەوە گوتی تەرمی هەڵواسراویشم سێ شەو و سێ ڕۆژ لەمەیدانی شارۆچکەکە ئەو جەژنەیان دەڕازێنێتەوە. کاتێك بیری لەمانە دەکردەوە مووی جەستەی ڕاست بوونەوە، لەرزی، ناو قاچی چەپی گزە گزی دەکرد.

ئەگەر لێرە کەسێك من ببینێت و بمدۆزنەوە، وەرگیرم بێنن، بەزمێکی هێند خۆش بۆ شارۆچکە پەیدا دەبێت کە هەموو شارۆچکە شەش مانگان هەر باسی من دەکات. هەندێکیان دەڵێن مخابن، مخابن، هەندێکیشیان دەڵێن باش بوو، باش بوو، سەربازی ڕاکردوو. چۆن دەکرێت لێرە خۆم دەرباز بکەم، خۆ دەربازکردن ئاسانە، بەڵام بەنزینم کەم ماوە. جگە لەشارۆچکە لەهیچ جێگایەکی دیکە بەنزین نییە کە...

بزنەکان هێشتا بە دەوریەوە بوون، دەستی بۆ سەری یەکێك لەکاریلەکان درێژکرد، بەڵام هەر یەکسەر کێشایەوە، خەریك بوو دەلەرزی. هەر لەوەی کەم بوو دەست بداتە کاریلەکانی پیرە خدریش. تووڕە بوو، ئەگەر ئەمانە بزنی وەلی و عارفێك بن، لێرە لای کەسێك چ دەکەن، ئەوە بنیادەمە، زەوقی ناچێتێ کاریلەیەکی شین بگرێتو سەری ببڕێت بیخوات؟ گۆشتەکەی لەسەر پەنگری داری گزرەو چیلکەی وشکی دارزەیتوون لەشیش بدات و بیکاتە کەباب؟ بۆنی گۆشتی کاریلەکە بکرێتە کەباب مرۆڤ مەست ناکات؟ دەستی بەهات و هاوار کرد، یاللا، یاللا بڕۆن ون بن. کێ بە ئێوەی گوتووە بهێنە ئێرە؟ مردین، مردین. تەمەنێکە ئەوەندەی ماسیان بخۆین

ورگمان هەڵمساوە، ئینجا کاریلەکانی پیر خدرت بێنە بەردەم، جا ئەویش چ کاریلەگەلێك، شین، خڕوپڕ و تێربەز، نەتوانیت بیانخۆیت، نەتوانیت دەستیان لێبدەیت، تەنانەت نەتوانیت شیریشیان بخۆیتەوە. ئەگەر بشخۆیتەوە، دەتگرێت و دەباتە سەر دوندی زنارەکان تێتهەڵدەداتە خوارەوە، لەو خوارەوە بە عەرزی دەکەویت و پارچە پارچە دەبیت و دەمریت. کوڕە تۆ کە لەسێدارەت دەدەن، ماتۆڕەکەشت بەنزینی نەماوە کە بتوانیت رابکەیت. ئەگەر بچمە شارۆچکە بەنزین بکڕم یەکسەر دەمگرن. ئەگەر دەست لەبزنەکانی بدەم، خدر دەچێتە دڵی فەرماندە و ئاگاداری دەکاتەوە، ئەمیش لەگەڵ دەستەیەك جەندرەمە دێت و دوورگە گەمارۆ دەدات، دەمگرن. بە لکی دارچنارەکەی مەیدانی شارۆچکە هەڵمدەواسن. ئاهەنگێکی وا لەشارۆچکە دەگێڕن کە دە شەو و دە رۆژ درێژە بکێشێت و بە ساڵانیش باسی نەبڕێتەوە. یاللا، بزنە نەفرەتیەکانی خدر یاللا. لەوەی کە بەبزنەکانی خدری گوتبوو بزنە نەفرەتیەکان نیگەران بوو. وردە وردەش ترس دایگرت. ئەگەر خدر بیستبێتی؟ سواری ئەسپە بۆزە خاڵدارەکەی ببێت و وەکو برووسکە و با دەریاکان تەی بکات و بێت من لەو سەر زنارە تێهەڵداتە خوارێ، تێمهەڵداتە خوارێ، تێمهەڵداتە خوارێ... ئاوا مایەوەو بیریکردەوەو گوتی ئەوە باشترە لە لەسێدارەدان. لەکاریلەیەك نزیك بووەوەو ویستی بیگرێت، دەستی بۆ درێژکرد، ترسا، کێشایەوە. بە تووڕەییەوە بەرەو لای بزنەکان بازیدا، بزنەکان هەر گوێیان پێنەدا، زۆر هەوەسی چووە گۆشتی کاریلان، ئەگەر کاریلە بخوات، خدریش دێت لەسەر دوندی زنارەکەوە فڕێی... لانیکەم بە زگی تێری کەبابی گۆشتی کاریلە ئەم دنیایە بەجێدێڵێت. زۆر تووڕە بوو، بزنەکانی دەوروبەری سەریان بەرزکردبووەوەو بێباکانە سەیریان دەکرد. سەیری چیدەکەن گەمژەینە، وەك دیارە دەتانەوێت بڵێن بزانەکانی پیر خدرین. چەند بەخۆتان دەنازن، ئەگەر لێرە نەبوان و لەجێگایەکی دیکە دەبوون، تەنانەت ئەگەر بزنی پێغەمبەریش بوان، زۆر لەمێژ بوو خواردبوونیان. بڕۆن سوپاس بکەن کە لەدوورگەی کابان، هیچکەس ناهێتە ئێرە. جگە لەدزانو سەربازانی راکردوو. واتە پۆیراز لەبەر خاتری باوکی دێتە ئێرە؟ ئەویش لەشتێك دەترسێت، رەنگبێت لەترسی گیانی خۆی بێت، لەم دوورگەیە کێ دێتە سۆراغت. ئەی ئەگەر من مانگێك لێرە بمێنمەوە؟ خۆ مرۆڤ هەر بە خواردنی ماسی ناتوانێت بەردەوام بێت، تەنانەت ئەگەر نەزرکردەش بێت. منیش یەکەمجار ئەم کاریلە جوانانەتان یەك یەك سەردەبڕم و دەیانخۆم. شیریشیان دەدۆشم و دەیخۆمەوە. دووبارە دەستی بۆ کاریلەیەك کە وەکو جنۆکە سەیری دەکرد،

درێژ کرد، دوباره خێرا کێشایه دواوه، کەوته لەرزە، باش نەبوو دەستی لێنەدا، خدر خراپ لێکیدەداتەوە، رەنگە ئیفلیجیشت بکات، دەست و پێت بێهەست دەبن، ناتوانیت لەجێی خۆت بجووڵێیت، ناتوانیت ماسیان بگریت، تەنانەت ناتوانیت خۆت دابێنیەوەو لەو ئاوی کانیە ئاو بخۆیتەوە، وای، وای! لەبەر خۆیەوە گوتی بەڵکو ئەمانە هەموویشی هەر درۆ بن. ئایا ئەوکاتەی کە خەریك بووین بە چیای ئەللاهوئەکبەردا هەڵدەگەڕاین، هەموو سەربازەکان لە ناخی دڵەوە هاواریان نەدەکرد، نەدەپاڕانەوە، ئەی خدری زیندە وەهانامان وەرە، ئەی خدر وا دەمرین؟ بۆچی بۆ دەربازکردنیان نەهات؟ خدر مردبوو؟ ئەسپەکەی تاسمەی بردبوو و کەوتبووە بنی دەریاو مردبوو؟ ئەوەندەمان هاوارکرد کەچی بە هانامانەوە نەهات و نەهات. واتە هەموو ئەو مرۆڤانە گوناهکار بوون؟ واتە لەنێو ئێمەدا کەسێك نەبوو کە بێگوناه بێت. سەربازی چوارده ساڵە دەتوانێت چ گوناهێکی هەبێت؟ ئەی بزنەکان، لێرە بڕۆن، دین و ئیمان لەمرۆڤ مەستێنن، رۆژێك بەرگە دەگرم، دوو رۆژ بەرگە دەگرم، دواجار یەکێك لەو خڕو خڕپن و تێر گۆشتانەتان هەڵدەبژێرم و لەسەر پەنگران دەیکەمە کەباب و بە چێژ و ئیشتیاوە دەیخۆم. فڕێدان لەو سەرەوە بە دەستی پیر خدر باشتر نییە کە لەسێدارەم بدەن؟ لەتوڕەییان نەیزانی چیبکات. بەیەکجاری خافڵگیر کرابوو. ئەوان کاتێك لەشارۆچکە گەڕانەوە بە دوامدا دەگەڕێن، خوا دەزانێت بە چەند جەندرمەی تێنوو بەخوێنم بە دوامدا دێن، پۆیرازیش دەزانێت کە من ئێرە پێدەزانم، نەکا بێن و زۆر ئاسان لێرە بمدۆزنەوە؟ رایکردە لای دارزەیتوونەکان، دارێکی وشکی دەست دایێ، بەخێرایی گەڕایەوە بۆ لای بزنەکان رایکرد، دارەکەی بەسەر بزنەکاندا راوەشاند، بزنەکان هەر گوێیان نەدایێ. هەرچی لەدەمی دەرهات بە بزنەکانی گوت. پاشان پەشیمان بووەوە، لەسەر یەك لەسەر یەك دووپاتەی دەکردەوە تۆبە، هەزار جار، هەزار جار تۆبە. چ ناماقوڵیەکمان کرد و جنێومان بە پیر خدر سلاوی خوای لێبێت، دان. تۆبە! چوو سواری کەلەك بوو و بەرەو لای بەلەمەکەی چوو. سواری بەلەم بوو، کەلەکەکەی بەدواوەی بەلەم بەستەوە. هندری ماتۆڕەکەی گرت و بە تووڕەییەوە رایکێشاو سووڕاندی، هەر رایکێشا و رایکێشا، بەڵام ماتۆڕ نەدەکەوتە کار، هەستا، شەڵاڵی ئارەقە بووبوو، سەیری بزنەکانی کرد، لەدەوری کانیەکە مۆڵ بووبوون و خەریك بوون ئاویان دەخواردەوە، چەند سەر نێرییێکیش کە مووە درێژەکانیان گەیشتبووە عەرز، لەپێش بزنەکان وەستابوون و سەیری ئەویان دەکرد. سەیر بکەن، سەیر بکەن، ئەگەر ئەم ماتۆڕە دانەگیرسێت، ئەوسا دەبینن چیتان لێدەکەم. با خدریش ئەم قسانەم

ببیستێت، ئەگەر قاچی ئەسپەکەی نەخلیسکابێت و نەکەوتبێتە بن دەریا. لەجیاتی ئەوەی لەبرسان بمرم هەر ڕۆژە کاریلەیەك و هەر دوو سێ ڕۆژ جارێك یەکێکتان بە خەیاڵی ئاسوودە سەردەبڕم و دەیخۆم. ئەگەر خدر نەکەوتۆتە ژێر دەریا، بابهێت، بهێت ڕێگایەك بدۆزێتەوەو من لێرە دەرباز بکات، ئینجا منیش دەست لە خواردنی ئێوە هەڵدەگرم و لەدەست گوناهـ و ئیفلیجبوون دەرباز دەبم، ئەگەرنا خۆتان دەزانن و با خدریش بزانێت کە من وا بیانووەکانتان دەبڕم. بزنەکان بەڕیز لە دوای نێریەکە بۆ سەرەوە دەچوون. ئێوە بڕۆنە سەرەوە، بڕۆنە سەرەوە، سەر گردەکە هەر هیچ نییە، ئەگەر من لەم دوورگەیە بمێنمەوە، بشچنە ئاسمان، دێم و هەمووتان دەگرم و دەتانخۆم. دەست نادەمە بزنە شیردەرەکان، تەنها شیرەکەیان دەخۆمەوە. ئەو بزنانەی کە شیریان تێدا نەماوە گۆشتەکەیان دەخۆم. با خدریش سڵاوی خوای لێبێت گوێیەکانی خۆی بکاتەوەو قسەکانم ببیستێت. ئێستا خەریکم هندر رادەکێشم. ئەگەر ماتۆڕەکە هەڵنەبوو چیبکەم. کەیفی خۆتانە ئەگەر خدر گوێتان نەداتێ من چیبکەم؟ دەبێت بمبوورن. من لەو ڕۆژە هەمیشە نەباتم هەرپێبووە.

بە تووڕەییەوە هندرەکەی گرت و سێ جار رایکێشا، ماتۆڕەکە کەوتە کار بە یەکجاری نوقمی شادمانی بوو، بە ئارامی دەستیکرد بە خولانەوە بە دەوری دورگە. بە دوای جێگایەکی گونجاو دادەگەڕا بۆ مانەوەو شاردنەوەی بەلەمەکەی. ئەشکەوتێکی دۆزیەوە، ئەشکەوتێکی درێژ بوو، بەڵام بەلەمەکە جێی تێدا نەدەبووەوە. بەلەم، دینگەیەکی درێژی هەبوو و چارۆگەی نەبوو. ئەو دینگە درێژەش بە کەڵکی هیچ نەدەهات. ئاە، خۆزگە دەیتوانی بەلەمێکی چارۆکەداری شیری یان شینی بکڕیبوا. مرۆڤ خۆ چارەنووسی خۆی نازانێت، بەڵام کەسێك کە ئەو هەموو ساڵە، وەکو راکردووەکان بەنێو دەریاکاندا گەڕاوە دەبوا بیزانیبوا کە چارۆگە چەند پێویستە. سوێندی خوارد کە ئەگەر ئەمجارەش لەدەست جەلادەکان قوتاری بێت و بە سەلامەتی بۆی دەربچێت چارۆگەیەك بۆ بەلەمەکەی بکڕێت. پۆیرازیش سەربازی راکردوو بوو، دەبێت ناچاری بکات کە ئەویش بۆ خۆی چارۆگەیەك بکڕێت. لەلای ڕۆژهەڵاتی دوورگە، لەدامێنی زنارەکانی کە وەکو دیوار پاڵیان وێکدابوو و سەریان لەئاسمان دەخشا، دەشتێکی گەورەو کاکی بە کاکی درێژ هەبوو. دەشتەکە لەبەر هەبوونی ئەو هەموو دەوەنە گەزانە زۆر دیارنەبوو. ئەگەر حەسەن تا ناو دەوەنەکان نەچووبوا، ئەویش ئەو دەشتە فراوانەی بۆ بەدەرنەدەکەوت. لەنێوەڕاستی دەشتەکەشدا سێ ساختمانی رووخاو هەبوون کە دیوارەکانیان بە تەواو

نەرمابوون. دیارە لێرەش کەسانێك ژیاون، بە سالآنیش ژیاون. لەلای ڕۆژهەلآتیشەوە کەنداوێکی بچووکی درێژبووەوەی بینی کە دەکرا بەلەمێکی چوار پێنج مەتری تێدا جێبکەیتەوە. بە خەیالێکی ئاسوودەوە گەڕایەوە شوێنی پێشووی. نانی کەم پێمابوو، بەلآم گوتی قەی ناکات، ماسی، بزن، شیر. ویستی بلێت گۆشتی بزن، بەلآم قسەکەی خۆی قووت دایەوە. مەگەر هەر پیر خدر نەبوو سلآوی خوای لێبێت ئەو ماتۆڕەی کە هەلنەدەبوو بۆی هەلکرد؟ هێشتاش هەر لە چاوەکانی سەرگورد کە لە چاوەکانی ئەنوەر پاشا دەچوون دەترسا. چاوەکانی نەقیب پڕن لە نەرموونیانی و میهر و چاکە. نیگاکانی سەرگورد تالێ، تووڕە و ڕکاوی و کەمێکیش شێتانە و لە دنیا تۆراو و ترساو بوون.

عەسر داهات و خۆر ئاوا بوو، حەسەن نانی خوارد، ئاوی خواردەوە، چووە نێو بەلەمەکەی و ویستی سەرخەوێك بشکێنێت، نزیك بە بەیانی ماندوو بوو، خەوی لێکەوت.

سپێدە زوو بەخەبەر هات، ترسێك چنگی لەهەناوی گیرکردبوو. سواری کەلەك بوو، چووە لێوار، لەئاوی ئەو کانییە کە وردە بەردی سپی لە بنیدا دەلەرینەوە دەست و دەم و چاوی خۆی شووشت. تێشووەکەی کردەوە، تەماتەیەکی سووری کە لە بڕکە وشکەکانی باخچەی مالآنی دوورگەی لێکردبووە، لەگەلێ پەنیری ڕەوەندان کە ناوەوەی نەرم نەرم بوو تێکەلێ کرد و خستیە سەر نانێك و وەکو بەرچایی خواردی. بزنەکان چووبوونە سەر زنارە تیژەکان و بەڕیز ڕاوەستابوون و گەردەنیان هەلکێشابوو و تەماشای ئەویان دەکرد. ئەوەندە ماسیی خواردبوون ڕەنگی ماسیانی گرتبوو و لێیان بێزار بووبوو. خوا دەزانێت ئەم بزنانە چەند سالە لێرەن. لێرە دەکرێت پێنج تا دە خانوو دروست بکرێت. خدر بزنەکانی خۆی لێرە داناون، ئێمە بۆچی بزن و مانگاکانمان نەهێنینە ئێرە. گەنم و جۆ و چەوەندەر نەچێنین، زەیتوون موتربە نەکەین و سەوزە نەڕوێنین؟ لەم دوورگەیەدا دەتواندرێت دێیەکی بچووك دروست بکرێت، دێیەك کە ئیدی هەموو ڕۆژێك جەندرمە نەتوانن بەسەری دابدەن. دارتەبگ و سەرو و چناری بەرز بەرزی جوان و بۆنخۆش دەچێنین و دار هەرمێیەکیش لەگۆڕەپانەکەی دواوە، بەردەم کاولەکان دەچێنین کە دواتر وەکو دارچنارەکان بەرز و پان و پۆڕ ببن و زەردەوالە لەسەر گەلآکانیان بنیشنەوە، ئەوەندە هەلبنیشن کە لەبەر گرانابیان لکە بە گولێ داپۆشراوەکانیان سەر لەعەرزی بنێن. پاشان بزنێك دەکوژینەوە، بۆنی کەبابی گۆشتی ئەو بزنە کە لەسەر پەنگران دەیبرژێنین هەموو دوورگە دەگرێتە خۆی. هەموو ڕۆژێك گۆشتی ناسك و شیری بزنان دەخۆین و دەخۆینەوە، ماست و

نڤیشك له شیرەكە دروست دەكەین. ماسیانیش دەگرین. ماسیەكان دەبەینە شارە گەورەكان و دەیانفرۆشین. ئەم دەریایە پڕە لەماسی. بزنەكانی پیر خدریش ئەوان كە تاریكی داهات دەگرین و لەجیاتی بزنەكانی خۆمان دەكوژینەوە ئەگەر خدر لێرە لەجێگایەكی ئاوا سەخت و بەردەڵان ئەوەندە بزنەی هەبن، خوا دەزانێت لەنێو ئەو بەردەڵانەی ئەولاتر چەند بزنی دیكەی هەن. ئەگەر خدر رازی بێت، ئێمەشی خۆشبوێت، لێرە ئێمە چەند لەبزنەكانی بخۆین، لەولا كاریله لەدایك دەبن، بۆ لەدایك نەبن، ئێمە ئاگامان لەبزنەكانی دەبێت، شوانەتیان دەكەین. خوا دەزانێت، چەندیان بزن لێخواردوون، ئەگەرنا، لەم دوورگەیەی بەم گەورەییە بزنەكان هەر ئەوەندە بوونە؟ كاتێك هیچكەس دەستی لێنەدابن، دوورگە پڕ نەدەبوون لەبزنە شینەكان؟

ئێستا دكتۆرەكان كلاوم بخەنە سەر چیبلێم، مەگەر ئەوان ئەفسەر نین؟ بەخوێنی مرۆڤ تێنوو نین. تەنانەت ئەگەر تێنووش نەبن، ئەركێك لەكەللەیاندا جێگیربووە. ئەو دكتۆرە گەنجە، نەقیبە چییە، پێدەچێت پیاوێكی بە بەزەیی بێت، بەڵكو لێشنەگەڕێن لەسێدارەم بدەن. بەڵكو موسا كازم ئاغاش-كچی چەند جوانی هەن، خوای گەورە ئەوانی چەند بە جوانی ئافراندووە- بتوانێت چاكەیەك بكات. بە مرۆڤێك دەچێت كە بە گوێی بكەن. یان خودی پۆیرازیش پێموایە رەگێكی چاكەی تێدایە، بەڵام دەبێت لەبەجێماوەكانی ساری قامیش بترسیت. ئەوان بایەخ بە فرمێسكی دایك و باوك و منداڵ و كەسە خۆشەویستەكانیشیان نادەن. خوا هەرچی چاكە و سۆز و عەشق و میهرەبانیەك هەیە هەڵیگرتووە بە هەوایدا بلاوكردۆتەوە. ئەو سەرگوردە چەندیش لێم توورە بوو.

دەستەپاچە بوو، ماتۆڕەكە كوژایەوە، بەلەم رۆیشت و لمۆزی دای لەلێواری دەریا، رایگرت، حەسەن ئاگای لەوە هەر نەبوو. بە پەلەپەل هاتم ئەو دیوی دنیا. لێرە دەبێت بچمە كوێ، رەنگبێت ئێستا هۆسمەن بۆ ئەوەی لەسێدارەم نەدەن خەریك بێت پارە بداتە حكومەت. خۆی دەیگوت سكەی ئاڵتوونی مەسیحیی گرانبەهای هەن. لەناكاو لەهەمووان نائومێد دەبوو و پاشان بە بێهۆ ئومێدی بۆ دەگەڕایەوە. لەپڕێكیشدا ترسێك دایدەگرت نەبێتەوە، بیری دەكردەوە بەشی ئەوەندە بەنزینی پێنەماوە بیگەیەنێتە لێوار، زۆر نیگەران بوو. پاشان بەهێنانە بەرچاوی ئەوكاتەی كە دەیبەنە ژێر داری سێدارەو پاشان بە شادمانیەوە پێیدەڵێن خوالێیخۆش بێت، جێگاو مەكانی بەهەشت بێت، نوقمی نێو شادمانی دەبوو. دنیا پڕە لەكەسانی باش و جوان.

سەرگورد و نەقیب جلی فەرمی سەربازیان پۆشیوە، چەکەکانیان وا لێکردوون دەبریقێنەوەو کڵاویان ناوەتە سەریان و هاتوونەتە ئەسکەلەو بەدەم گفتوگۆوە چاوەڕوانی ئەوانی دیکە بوون. پۆیراز و ڤاسیلی لەوانی دیکە زووتر هاتن. ڤاسیلی جلە شینەکەی پۆشیبوو، کڵاوە مۆرە گوڵێنگەدارەکەشی نابووە سەری. پۆیراز جلی فەرمیی سەربازی کردبووەبەر و مەدالیای سەربەخۆییشی بە بەرۆکەوە کردبوو. پزیشکی ئاژەڵانیش جلێکی شینباوی پۆشیبوو. جلوبەرگەکانی هوسمەن هەڵگلۆچاو و لۆچاوی بوون. دوای هەمووان موسا کازم ئاغا هات، جلوبەرگێکی زۆر رێك و پێکی پۆشیبوو. کڵاوێکی لەسەرنابوو، کراواتێکی شینی پنك پنکی سپی بەسەر کراسە سپیەکەیەوە گرێ دابوو کە لەگەڵ مۆدی ئەو رۆژگارە دەهاتەوە. جلەکانی رەش و پێڵاوەکەشی دەبریقایەوە. سمێڵەکانی کشت کردبوون و ریشە ماش و برنجیەکەی شانەکردبوو. چاوە شینە جوانەکانی نیگایەکی هێمنیان هەبوو. بەجۆرێك سەیری دەوروبەرەکەی دەکرد وەك ئەوەی بەدوای شتێکدا بگەڕێت. نیگای هات و کەوتە سەر پۆیراز، ئەو گەنجە لێهاتووە، خۆشڕووو خۆشخووە لەنێو جلوبەرگە فەرمیەکەیدا گەنجتر دەینواند. لەوەی کە ئەو لەو جەنگە بێئەمانەدا توانیبووی گیانی خۆی قوتار بکات پێی سەیر بوو. قەدریی بەلەمەوان بەلەمە ماتۆڕدارەکەی خۆی لەئەسکەلە راگرتبوو. یەکەمجار ژێر باڵی موسا کازم ئاغایان گرتن و سواریان کرد. شانو شکۆی پیاوانەی لێدەباری. دەتگوت خەریکە لەنێو ئەسپەکان، مەهتەرەکان، دەرو دراوسێ و دۆستەکانی سەیری ئەسپە رەسەنەکانی خۆی دەکات.

بەلەموان ماتۆڕەکەی خستە کار، کەمێك دواتر هەموو بەنزینی دایێ. لەهەموو جاران زووتر گەیشتنە شارۆچکە، رەمزی کاولاکزادە بەگ، جلوبەرگە شینەکانی پۆشیبوون و کڵاوە پێستیەکەشی نابووە سەری و لەگەڵ پیاوەکانی لەچاوەڕوانی خەڵکی دوورگەی کارینجا بوو. بەڕێوەبەری ناحیە، سەرۆکی هۆبەی سەربازی، عوزێر خانی کارمەندی دایرەی نفوس، عەبدولوەهاب، خەیری ئەفەندی جەعفەر، ئیسماعیل و ریشسپیانی شارۆچکە بۆ پێشوازیکردنی ئەوان هاتبوون. هەر لەگەڵ ئەوەی هاتنە ناو شارۆچکە، لەپڕ دەهۆڵ و زوڕناکان وەکارکەوتن. دەهۆڵ و زوڕناکان لە پێشەوەو میوانەکان و پێشوازیکەران بە دوای ئەواندا دەڕۆیشتن و تا دەهات ژمارەی خەڵکەکە زیادی دەکرد. ئاڵاکان بەڕیزێکی درێژ دەلەرانەوە. بەدەم سەرو سەدایەکی زۆرەوە گەیشتنە نێو شارۆچکە و گەیشتنە باڵەخانە گەورەکەی رەمزی

بەگ، لەچەند پلیکانەیەك بەسەرکەوتن و لەنهۆمی یەکەم چوونە نێو هۆڵێکی گەورەو لەسەر مۆبلەکان کە بەریز لەتەك یەکدیەوە داندرابوون دانیشتن و رۆچوونە نێو مۆبلەکان.

دکتۆر سەلمان سامی ئاورێکی لەخەیری ئەفەندی دایەوە کە لەتەنیشتیەوە دانیشتبوو و چرپاندیە گوێی:

"من لە تەمەنمدا نە مۆبلی وامبینیوە نە لەسەریان دانیشتووم."

خەیری ئەفەندی گوتی: "ئەم کۆشکە هی لەفتەریس فراسئۆغلوە"[1]. لەفتەریس دەوڵەمەندترین کەسی ئەم ناوچەیە بوو، کێڵگەی هەبوون و هەروەها کەشتیگەلێك کە بۆ هەموو لایەکی دنیا دەچوون. خانووێکی دیکەی وەکو ئەمەشی لەئزمیر هەبوو. رەمزی کاولاك بە ئالآیەکەوە کە نە مانگەکەی لەمانگ دەچوو و نە ئەستێرەکەی لەئەستێرە، لەکاتێکدا سەری شۆربووبووە سەر زەوی گەیشتە نێو شارۆچکە. جلی فەرمی سەربازی لەبەر بوو. هەموو پیاوەکانی جلی (زیبك)[2]ەکانیان پۆشیبوو. خەنجەرە درێژەکانیان لەبەر پشتێنە ئەوریشمەکانیان راکردبوو، تفەنگە ماوزەرەکانیشیان کە قۆنداغیان نەخشێندرابوو، بەرانپیل دابوو. فیشەکدانە زیونیەکانیشیان راست و چەپ تا سەر نێکیان لەخۆدابوون. هەریەکەیان کلاوێکی گوڵداری لەسەر نابوو. ئەمانە هەمووی هەروەها شەلوارە پڕ نەخش و نیگارەکانیان کە ناوپیستێریان تا ئەژنۆکانیان دەهات و ئێلەگە قۆڵکورتەکانیان، شکۆ و هەیبەتی لەشکری ئەفەکانیان بە پیاوەکانی کاولاکزادە بەخشیبوو."

سەلمان سامی گوتی: "بوەستە!" بەم قسەیە خەیری ئەفەندی بێدەنگ کرد و پاشان درێژەی پێدا: "ئێمە بۆچی ئاوا لێرە دانیشتووین، بابچینە دەرەوە کەمێك بگەڕێین. کاکە پۆیراز تۆش وەرە."

هەستا، هەرسێکیان پێکەوە لەپلیکانەی ناوەڕاستی هۆڵەکە چوونە خوار، بەرەو لێوار رۆیشتن، لەوێ لەسەر لەکانی لێوار پیاسەیان کرد.

"هاتنە مەیدانی شارۆچکە، لەمەیدانی شارۆچکە تریبونێکیان دانابوو، کەس تێبینی نەکردبوو کێ ئەم کارەی کردووە. خەڵك بە بینینی هاتنی رەمزی کاولاك بەو ئالآیە گەورەیەو لەگەڵ دەستە ئەفەییەکەی، دوای ئەوە دەهۆڵژەن و زورناژەن و کەسانێك کە زیبکیانە سەمایان

---

(1) Lefeerisfaraegla.

(٢) زیبك = دلاوەرانی ئەنەدۆڵی رۆژئاوا.

دەکرد مەیدانیان پڕ کردبوو. لەو مەیدانە بەو گەورەییە جێگای دەرزی هەڵباوێیت نەمابوو. رەمزی بەراکردنێکەوە خۆی گەیاندە پشت تریبوونەکە و سلاوی سەربازی لەخەڵکەکە کرد، گوتی ئێمە دوژمنەکانمان نوقمی دەریا کرد و وا لەوێ دێینەوە. من لەگەڵ ئەفەکانم فەوجی یۆنانیەکانمان تەفرو توونا کرد، نیوەمان کوشتن و نیوەی دیکەشمان لەئزمیر رشتنە نێو دەریا. نەڕاندی و گوتی هەر تورکێك هەزار یۆنانی و هەر ئەفەیەك سەد هەزار یۆنانی دێنێت. پاشان ئەو یۆنانیانەی نیشاندا کە لە ساری قامیش هاوکاری ئەویان کردبوو و بە چاوی خۆیان خوێنرێژییەکانی ئەویان بینیبوو. سێ شەو و سێ رۆژ ئاهەنگی گێڕا و میوانداری رێکخست. هەزار و نەداران لەسەر حەسیرەکانی کە لەحەوشەدا راخرابوون دانیشتن و نانیان خوارد، لەکۆشکی ناوبراو پێشوازی لە ریشسپیانی شارۆچکە کرا. کۆشکەکە سێ رۆژ و سێ شەو جمەی هات و هەر دەستەیەك دەهاتن و دەستەیەك دەچوون. منیش دەزانم و هەموو خەڵکی شارۆچکەش دەزانێت، ئەو سەربازی راکردووە. ئەو ئەفانەی کە لەگەڵ ئەودا هاتبوون بەڕاستی لەجەنگی یۆناندا بەشداریان کردبوو. ئەفەکان هەر لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگی سەربەخۆی لەچیاکانی دابەزیبوون و بەشداری جەنگیان کردبوو. ئێستاش بۆ چەند رۆژێك و لەپێناوی پارە وەکو سەرباز رەگەڵی کەوتبوون. ئەو کابرایە هیچ و پووچە، سەربازی راکردوو و خائین بە نیشتمانە."

سەلمان سامی هەر لەگەڵ ئەوەی وشەی سەربازی راکردووی بیست، رووی کردە پۆیراز، ئەو حەسەنە راکردووە لە کوێیە؟ چیلێهات خۆ دەیویست لەگەڵ ئێمە بێت، بچین کارتی کۆتایی خزمەتی لەسەرگورد ئیسحاق، سەرۆکی هۆبەی سەربازی وەربگرین؟

پۆیراز گوتی: "لەو رۆژەوە بەدوایدا دەگەڕێین کەچی نایدۆزینەوە. رایکردووە قوربان."

سەلمان سامی سەری خستە نێو لەپی دەستەکانی و تاوێك ئاوا بیری کردەوە. پاشان گوتی: "ترسا. کاتێك قسەمان دەکرد و قسە هاتە سەر لەسێدارەدان و پاشانیش بە تووڕەییەوە قسەم لەگەڵ کرد لەترسی ئەوەی کە رەنگبێت رادەستی بکەینەوە رایکرد. زۆر نیگەران بووم."

خەیری ئەفەندی گوتی: "ئەوە کێیە باسی دەکەن؟"

لەلایەك پۆیراز لەلایەکی دیکەش سەلمان سامی باس و بەسەرهاتی حەسەنی راکردوویان بۆ باسکرد. چاوەکانی خەیری ئەفەندی پڕ بوون لەفرمێسك، کوڵەگری لەقورگی مابوو، بە دەنگێکی لەرزانەوە گوتی:

"خۆزگە کوڕەکانی منیش رایانکردبوا، چاناك قەڵا چ دەردێکی بۆ دەرمان کردین، زریپۆشەکانی دوژمن هاتنە بۆغاز و لەبەردەم دوڵما باغچە لەنگەریان گرت."

سەلمان سامی قۆڵی پۆیرازی گرت و گوتی: "خۆزگە هەموو لەشکری ساری قامیش دەبوونە سەربازی راکردوو. بە کۆمەڵ مردن و رەقبوونەوەی ئەوان چ دەردێکی دەرمان کرد، خۆزگە لەئەفسەرەوە بگرە تا سەرباز هەموویان رایاندەکرد. ئەوە من بووم لەبەرامبەر حەسەنی راکردوو بەد رەفتاریم کرد. پۆیرازم، براکەم، کوڕەکەم، تۆ بڵێیت حەسەنی راکردوو بۆ کوێ رایکردبێت؟ من خراپەم لەگەڵ کرد. ئەویش منی تووڕە کرد."

بەهاوار کردنەوە گوتی: "خۆزگە ئەوەی نەدەکرد، خۆزگە ئاوا قسەی نەکردبوا. ناتوانین بیدۆزینەوە؟ ئەگەر بماندۆزیبوایەوە کاری خزمەتی سەربازیم لە ئیسحاق بەگ بۆ وەردەگرت."

"لەدورگە نییە، هەموو جێگایەك گەڕاین نەماندۆزیەوە، نەبوو. سەر لەئێوارە سواری بەلەمەکەی بووە، هەڵاتووە، بەڵام ناتوانێت زۆر دوور بکەوێتەوە، زۆر بڕوات هەر تا دوورگەی کابا دەتوانێت بڕوات، بەنزینی پێ نییە."

سەلمان سامی پرسی: "قەدریی بەلەموان لێرەیە؟"

"بە بەلەموانمان گوتبوو بێتە ئێرە، با بچینە ئەسکەلە بەڵکو لەوێ بێت لە چایخانەکە بێت."

ماوەیەك بێدەنگ بوون، پاشان لەکاتێکدا گوێیان بۆ قسەکانی خەیری ئەفەندی راگرتبوو بە ئارامی بەرەو ئەسکەلە رۆیشتن.

چۆرباچیەکان باسی گۆڕینەوەیان بەر لەوەی کە فەرمانەکە لە لۆزان دەربچێت زانیبوو. هەموو ماڵ و دارایی خۆیان بە نرخی هەرزان دەفرۆشت و دەڕۆیشتن. لەفتەریس و رەمزی برادەری نزیکی یەکدی بوون، لەفتەریس کاتێك دەڕۆیشت کێڵگەکەی کە زۆر لە پێنج هەزار مەتری چوار گۆشە دەبێت، هەروەها باخەکان و خانووەکەشی کە ئێستا رەمزی تێیدا دانیشتووە، فرۆشتە رەمزی. بڕیار وابوو کە ئەگەر بگەڕێتەوە، لە رەمزیان وەربگرێتەوە. لەفتەریس لەهەموو رووێکەوە متمانەی بە رەمزی دەکرد. رەمزی برادەری کوڕی یەکێك لەبنەماڵە رەسەنەکانی شارۆچکەکە بوو. دەوڵەمەند بوو. بۆ ئەوەی دژی یۆنانیەکان نەجەنگێت و ناچار نەبێت ئەوان بکوژێت لەسەربازی رایکردبوو. ئەگەر نەشگەڕابوایەوە هەموو ئەو ماڵ و سامان و داراییە حەڵاڵی رەمزی برای دەبوو.

خەریك بوون لەئەسکەلە نزیك دەبوونەوە کە قەدریی بەلەموانیان پێگەیشتەوەو پێکەوە چوونە چایخانەکە. چایخانە جمەی دەهات لەخەڵك، هەموویان پێکەوە لەبەریان هەستان، چاو قاوەیان بۆ هێنان. هەمووان بەخێرهاتنیان کردن.

"هێشتا حەسەنت نەدۆزیەوە قەدری، نە؟"

قەدریی بەلەموان گوتی: "نەماندۆزیەوە. ئەو شەوەی کە هاتە لای من، گوتی لەسێدارەم دەدەن. ناتوانم لێرە بمێنمەوە. سەرگورد لەسێدارەم دەدات. سبەی دووسبەی جەندرمە دێن، دەمبەن. من دەبێت ئەمشەو بڕۆم، بەڵام تانکی بەنزینی بەلەمەکەم بەتاڵە، گوتی ئەگەر بەنزینم بدەیتێ، پارەیەکی زیاترت دەدەمێ. پێمگوت ببوورە حەسەن من هەر ئەوەندەم بەنزیم هەیە کە خۆم بگەیەنمە شارۆچکە. سەرۆك پۆیرازیش داوای لێکردووم بچمە شارۆچکە، لەگەڵ ئەوەشدا کیسەیەکی مەخمەلی گەورەی لەباخەڵی دەرهێنا، گوتی ئەم پارەیە بگرە، بڕۆ سێ دەبە بەنزینم بۆ بکڕە، بۆ کرێی هێنانەوەش پارەیەکی زیاترت دەدەمێ."

پۆیراز گوتی: "تۆ بڕۆ دوورگە، شیخموس و ئوسو لەگەڵ خۆت هەڵبگرە، پێکەوە بڕۆنە دوورگەی کابا، حەسەن بدۆزنەوەو بیهێنن. کاك دکتۆر گوتی دەیەوێت کارتی کۆتایی خزمەتی سەربازی بۆ لەسەرگوردی هۆبەی سەربازی، کە برادەری خۆیەتی، وەربگرێت. ئەگەر نەیویست بێت بە هەر چەشنێك بووە رازی بکەن. ئەگەر تۆ بۆت رازی نەکرا، بە شێخموس بێژە با ئەو بۆ ئوسوی وەربگێڕێت. ئوسو پێیبڵێت کەمن دەبمە زەمانەتی گیانی. با ئوسو رازی بکات. کە گەیشتنە دوورگەش مەهێڵن دەستی بە بەنزین بگات، دەنا بەنزینەکە دەبات و بۆی دەردەچێت. گوناهە بەدبەختە، ئێستا هەر ساتێك دەمرێت و زیندوو دەبێتەوە. یاڵلا زوو بن بەرێبکەون بڕۆنە دوورگە."

سەلمان سامی گوتی: "بەلەموان کوڕم. سڵاوی من بە حەسەن بگەیەنە، پێیبڵێ با نەترسێت، تاکو من زیندووبم ناهێڵم هیچی بەسەر بێت و هیچکەس ئەزیەتی بدات، با بێتەوە وەکو برا لەدوورگە بەهەشتیەکەمان بە خەیاڵی ئاسوودە بژیت."

دوای ئەوەی کە قەدریی بەلەموانیان بەرێکرد گەڕانەوە شارۆچکە. لە نێوان رێگا پیاوەکانی رەمزی بەگ پێشوازیان لێکردن: "وای بەڕێزان، چەند نوێنەرێکی ئەنجوومەن لەئەنقەرەوە هاتوون و لەباڵەخانەکە چاوەڕێتان دەکەن."

ئەو نوێنەرانەی کە لەئەنقەرەوە هاتبوون ژمارەیەکی زۆریش ئالآیان هێنابوو. ڕەمزی کاولاك بەگ گوتبووی دوو دانە لەئالآ گەورەکان لەسەر دوو دارئەسپیندای بەرزی هەردوو لای حەوشەکە ئاوێزان بکەن. ئالآکانی دیکەش لەسەر دیواری بەرز و نێوان دیوارەکانی حەوشە بەڕیز داندرا بوون. ئالآکان دەشەکانەوە. لەناو حەوشە دەهۆڵ و زوڕناکان لێدەدران و زیبکەکان ئەژنۆیان لەزەوی گیر دەکرد و هەڵدەبزینەوەو سەمای زیبکیان دەکرد. جلوبەرگە پڕ نەخش و نیگارەکانی زیبکەکان دەبریقانەوە. زیبکەکان نەك هەر لەناوەڕاستی حەوشە بەڵکو لەگۆشە و چوار لای حەوشەکەش سەمایان دەکرد. کاتێك ئەوان هاتنە ناو تەلارەکە، هەمووان هەستان. جلوبەرگی شینی هەموو نوێنەرەکان دەتگوت کاری دەستی یەك بەرگدرووی شارەزایە. پیاوێکی بالآبەرز، قیت و قۆز لەنێو نوێنەرەکاندا وەستابوو کە ملێکی درێژی هەبوو. دەستماڵێکی سپی لەبەرگی سەر سنگی چاکەتەکەی نابوو و کراواتێکی سووری بەستبوو. مەدالیای سەربەخۆیی بەسەر سنگیەوە دەدرەوشایەوە. کاتێك پۆیراز هاتە ژوورێ نوێنەرە بالآبەرزەکە هاتە لای ئەو و خۆی ناساندو گوتی کە ئەو لە گەلی بۆلۆ، دوای جەنگی سەربەخۆیی بەشداری کردووە.

پۆیراز دەستپاچە بووبوو و نەیدەزانی چیبڵێت.

"ئەی ئێوە؟"

"من قوربان... من... یەکەمجار لەچیای ئەللآهوئەکبەر و ساری قامیش، پاشان بەرەی ئورفا لەبەرامبەر هێزە فەڕەنسیەکان..."

"بەختەوەرم کوڕم. کەوابوو تۆش یەکێك لەو چەند دانە سەربازانەی کە لەساری قامیش قوتاریان بوو. تووشی شەڕیش بوویت؟"

"تووش بووم، بەڵام نەك بەو شێوەیەش. بەر لەوەی شەڕ دەستپێبکات هەموو سەربازەکانمان مردن، هەموویان کوشتن."

"ئێمەش لەگەلی بۆلۆ شەڕمان کرد. زیانی زۆریشماندا. سەربازەکانی ئێوە ئەسپێ لێیدان و لەسەرمان ڕەق بوونەوە، سەربازەکانی ئێمەش بە گوللە و سەرەنێزان مردن. ئیمپڕاتۆریای گەورەش لەگەڵ ئێمەدا مرد. سوپاس بۆ ئەمڕۆمان، لەهێلکەی قەقنووس، کۆمار و میللەتی ڕەسەن و شکۆمەند و پاکی تورك سەری دەرهێنا."

"سوپاس بۆ خوا، هاتینەدەر."

"عوسمانی حەوتسەد ساڵ دەوامی کرد، کۆمار تا هەتایە دەمێنێت."
"هەر دەمێنێت قوربان. زۆر زیاتر."

ئەو سەربازە دێرینانەی خاوەن مەدالیا، کاتێك خەریك بوون لەگەڵ یەکدا دەدوان یەکێك لەنوێنەرەکان هاتە لایان و گوتی: "جەنابی سەرهەنگ ئێمە هەمووماں وا دەچینە مەیدانی شارۆچکەکە. لەوێ بڕیار وایە بۆ خەڵکەکە روونی بکەینەوە کە ئەم نیشتمانەمان چۆن دروست کرد، دڵی هەمووان بە قسەکانمان بکەینە خوێن و چاویان پڕ بکەین لە فرمێسك."

سەرهەنگ دەستی خستە نێو دەستی پۆیراز و گوتی:

"با تازە بچینە مەیدان، قسەکردن لەمەیدانەکان بە نسیبی هەموو کەس نابێت. دۆزینەوەی مەیدانێك بۆ ئەوەی وتاری تێدا بدەیت لەسەرکەوتن لەمەیدانی جەنگ سەختترە."

قۆڵ لەنێو قۆڵ، زۆر هێمنانە لەپلیکانەکان چوونە خوار، لەدواوەی ئاپۆرەکە تێپەڕین. زیبکەکان لەپێش هەمووان، بەدوای ئەواندا دەهۆڵکوت و زوڕناژەنەکان بەدەنگێکی کەڕکەر و بەدوای ئەوانیشدا نوێنەر و دانیشتووانی شارۆچکە و ریشسپیەکانی شارۆچکە و دێهاتەکانی دەوروبەر و لەدوای هەمووانیشەوە منداڵان و پیرو گەنجان... رەمزی کاولاکزادە هەر کە سەرهەنگ و پۆیراز ئاوا قۆڵ لەنێو قۆڵی یەکدی بینی ترساو ئەو ترسەی کە هەیبوو زۆر زیاتر بوو. لەبەر خۆیەوە گوتی، تێگەیشتم تێگەیشتم ئەم پۆیرازە چ کارەیە. کاتێك سەیری چاوەکانیم کرد زانیم دەبێت کارێکی نهێنی و گەورەی هەبێت. ئەو وەلی نیشانچیەش بە چاوە سەوزە کەلائاساییەکانی کە دووجار دووجار دەیکوتان کە بینیم زانیم چ کارەیە. ئەو دکتۆرانەی کە دواتر هاتن؟ پاشان ئەو پیاوەش کە ناوی پزیشکی ئاژەڵانە؟ چۆن دەکرێت کەسێك ناوی پزیشکی ئاژەڵان بێت؟ ئەو دەبێت یەکێك بێت لەو تەشکیلاتە تایبەتە، دەبێت نازناویشی پزیشکی ئاژەڵان بێت. سەیری ئەمە بکە، جووجەلە ببینە چۆن قۆڵی لەقۆڵی ئەو سەرهەنگە بەڕێزە هەڵکێشاوەو بەنێو خەڵکەکەدا دەڕوات و لەنێو خەڵکدا بەهێواشی قسەی لەگەڵدا دەکات. سەیرکە سەیرکە، ئەوان لەگەڵ یەك قسە دەکەن، وەکو کوڕو باوك، برا گەورە و برا بچووك و وەکو دۆستی هەزار ساڵە، ئەمانە بەدوو قسان پیاو دەبەنە بن داری سێدارە. ناتوانی چرکەیەك سەیری چاوەکانی ئەو سەرهەنگە بکەیت، نیگای کار لەناخی مرۆڤ دەکات. لەنێو ئەمانەدا هەمدیسان پۆیراز لەهەمووان جوامێرترە. کڵێسای دوورگەکەی ئەویشمان تێکدا. دەبوا کڵێسامان نۆژەن بکردبوایەوەو منارەیەکی سپی بەرزیشمان بۆ دروست بکردبوا،

بەڕاستی پێویست بوو ئەو خانووە جوانانەی چێشتلینەرەکان تێکبدەین؟ ئەو پیاوە، ئەو وەلیە بەرازە، نیگاکانی دەتگوت نیگای شەیتانن، ئەگەر پۆیراز بەگی بەڕێز، قارەمانی خاوەن مەدالیای ئورفا نەبوا، لێیدەدام. ئەوەندە بە بکوژان دەچێت کە ئەوددەمەی سەیری کەسێك دەکات مرۆڤ سەری سووڕ دەمێنێت چۆن گیانی دەرناچێت. مرۆڤ دەبێت رەفتاری لەگەڵ ئەو پۆیرازە، ئەو مرۆڤە خۆش خولق و خووە رەفتارێکی باش بێت. دەتوانێت مرۆڤ لەدەردو بەلاکان بپارێزێت وەك چۆن پێشتر پاراستوویە. ئاوڕی لەدواوە دایەوە، خۆی لەپۆیراز و سەرهەنگ نزیك کردەوە، بە حاڵەتێکی ساختەکارانە خەبەردار راوەستا، دەستەکانی تەواو بە تەنیشتەکانی خۆی جووت کردبوو، سەری بردبووە نێو شانەکانی و شانەکانی بەرزکردبوونەوە.

"قوربان ئێوە قسە دەکەن، وایە؟"

سەرهەنگ پشتی راستکردەوە، قۆڵی لەقۆڵی پۆیراز هێنایەدەر.

"هەڵبەت من قسە دەکەم."

"پایەدار و راوەستاو بیت قوربان، دەستە موبارەکەکانت ماچ دەکەم."

سەرهەنگ ئیدی سەیری رەمزی نەکرد، دووبارە قۆڵی لەقۆڵی پۆیراز هەڵێناو بەدەم قسەکردنەوە ئارام ئارام کەوتنەوەڕێ، کە گەیشتن خەڵکەکە رێی بۆ کردنەوە، سەرهەنگ سلاوی لە ئامادەبووانی راست و چەپی خۆی کردو تا نزیك تریبوونەکە چوو. هەر لەگەڵ ئەوەی ئەوان لەتریبوونەکە نزیك بوونەوە، یەکەمجار نوێنەرەکانی گەل و ریشسپییەکانی شارۆچکە و شارۆچکەکانی دەوروبەر، ئینجا دێهاتییەکان چەپڵەیان لێدا، دەهۆڵ و زوڕناکان دەنگیان نەما، مەشقیان بە هەموویان کردبوو و دێهاتیەکان راهێنانێکی باشی سەربازیان پێکرابوو. چەپڵەڕێزان ماوەیەکی باش درێژەی کێشا. سەرهەنگ لەکاتی چەپڵە لێدانەکان سەیری بەرامبەر خۆی کرد، پاشان لەناکاوێك سەری هەڵبڕی و بەرەو تریبوون هەنگاوی هەڵێنا. سێ پلیکانە بەسەرکەوت، سەیرێکی چەپ و راستی خەڵکەکەی کرد، چەپڵەلێدانەکان خێراتر بوون. سەرهەنگ دەستەکانی هەڵبڕی، لەپی دەستی روو لەخەڵکەکە بوو. لەناکاوێك چەپڵەلێدانەکە وەستا و سەرهەنگ دەستی بە قسان کرد:

"ئەی خەڵکی من، ئەی ئەو خەڵکەی دوژمنتان لە ساکاریا، ئینونو و ئافیۆن وەدەرنا و دوورتان خستەوە، ئەی ئەو خەڵکەی لەمەیدانی جەنگی دوملوپینار دەشتەکەتان بە خوێنی

سەربازانی دوژمن ئاودا، ئەی خەڵکی قارەمانی من، کە دوملوپینارتان پڕ کرد لەلاشەی دوژمنان، ئەی خەڵکی بەرزو بەڕێزی من، ئێوە بوون کە پاشماوەی دوژمنتان لە ئزمیر لەدەریا کرد، ئەی خەڵکی شایستە، ئەی میللەتی قارەمان، ئێوە بوون کە وەکو لافاوێکی گەورە لەئاسیا راسان و بە پێکهێنان و دروستکردنی دەوڵەتی جیاجیا خۆتان گەیاندە ئەنەدۆڵ، مەگەر ئێوە نەبوون چۆکتان بە رۆم و بێزانستان دادا؟ مەگەر ئێوە نەبوون کە نۆسەد ساڵ بەسەر ئەم دنیا گەورەیەدا حوکمڕانیتان کرد؟ مەگەر ئێوە نەبوون کە ئاتیلا و چەنگیزخان و تەیموورتان کردنە فەرمانڕەوای جیهان و بە تیروکەوان و نیزەکانتان دنیا و چیاو دەریاو بیابانەکانتان هێنایە لەرزە؟ ئەم میللەتە، قەقنوسە. قەقنووس شای هەموو باڵندانە کە هەزار ساڵ تەمەن دەکات، پاشان ئاگرێك لەناخی دێتەدەرو قەقنووس بەو ئاگرە دەبێتە خۆڵەمێش، لەو خۆڵەمێشە هێلکەیەك دێتەدەر و لەو هێلکە گەرمە جووجەڵەیەك و ئەو جووجەڵەیە لەماوەی حەوت رۆژدا گەورە دەبێت و دەبێتە شای باڵداران. قەقنووس ئا بەمشێوەیە، بە شکۆ و بالادەستیەوە تا رۆژی قیامەت دەژین. نەژاد و رەچەڵەکی ئێمەش لەنێو ئادەمیزادەکاندا وەکو قەقنووس وایە. ئێمەش وەکو هێلکەیەك کە هەر هەزار ساڵ جارێك لەنێو ئاگردا دێینەدەر، وەکو قەقنووس تا قیامەت لەخۆڵەمێشی خۆمان دروست دەبینەوە. نەژاد و کۆمارەکەمان لەژێر سێبەری مستەفا کەمال پاشا تا دنیا دنیایە زیندوو دەمێنێتەوە. ئەی، خەڵکی قارەمانی من، ئێمە ئەمڕۆ هاتووینەتە ئێرە تاکو پارتی گەلی کۆماریخوازی خۆمان پێکبێنین. ئەو رێکخستنە کە لەباوەشی میللەتەکەمان و لەنێو دڵی میللەتەکەمان لەدایك دەبێت ئێمە بەرز دەکاتەوەو لەبەرزایی چیاکانی ئالپەوە دەمانگەیەنێتە لووتکەی شارستانێتیی ئەوروپا. ئەی میللەتی من، لەبیر نەکەن کە ئێمە لەخۆڵەمێشی هەزار ساڵەمان لەدایك بووین، لەخۆڵەمێشەکان، لەخۆڵەمێشەکان لەدایك بووین. هەزار ساڵی دیکە دووبارە لەخۆڵەمێشەکانمان لەدایك دەبینەوە."

سەرهەنگ زیاتر وروژا، قورگی خۆی ساف کردەوە، دەنگە گەورەکەی تا توانی زیاتر هەڵبڕی: "بەڵێ، دە هەزار ساڵ، سەد هەزار ساڵ، تا دنیا دنیایە، تا دنیا دنیایە، لەگەڵ کۆمارەکەی خۆمان و لەگەڵ رێبەری خۆمان مستەفا کەمال پاشا، بەگەڵ رێکخستنی گەلی کۆماریخوازی خۆمان هەر هەزار ساڵ جارێك ئێمە لەخۆڵەمێشی خۆمان لەدایك دەبین و دەبینە

حوکمڕانی جیهان. بژی کۆمار، بژی پارتەکەمان، بژی قەقنووس، بژی حوکمڕانیکردن بەسەر جیهان، بژی، بژی، بژی."

بڕیار وابوو تا ڕەمزی کاولاك ئەو ئالآیەی بەدەستیەوە بوو زیاتر بەرز بکاتەوە دەنگی چەپڵەڕێزانی ئامادەبووان زیاتر و زیاتر ببێت و لە ڕاستیدا هەروا بوو، دەنگی چەپڵەڕێزانی خەڵکەکە ئەو ناوەی هێنابووە هەژان. بەر لەهاتنی کۆمار، لەهیچ جێگایەکی ئەنەدۆڵدا چەپڵەلێدان باونەبوو. چەپڵەلێدان و هاندان لەئەنقەرەوە هات و بە هەموو جێگاکانی دیکەدا بڵاوبووەوە. ڕەمزی کاولاکیش دوای هاموشۆ و پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئەنقەرە، چەپڵەلێدان و چەند شتێکی نوێی دیکەی هێنابووە شارۆچکە. چەپڵەلێدان و هاندانیش هەر لەئەنقەرە فێربووبوو. کاتێکیش بووبووە یەکێك لەسەرانی پارتی گەلی کۆماریخواز، چەپڵەلێدانی لە ڕێوڕەسمی کردنەوەی لقی پارتەکەی فێری خەڵکی شارۆچکەو دواتریش خۆی دیهاتەکان یەك بە یەك گەڕابوو، کردبوو. ئەو، لەڕاستیدا، نەك بۆ فێرکردنی چەپڵەلێدان و هاندان و بەڵکو گیانبازی بۆ نیشتمان دەکرد.

چەپڵەڕێزان دەستی پێکرد وەکو گرمەی هەوری ئاسمان، هەر نەشدەبڕایەوە. سەرهەنگ دەستی دەهەژاند، دەست و مەچەك و پەنجەکانی دەکردنەوەو لێکیدەدان و دەیبەستن، سوپاسی خەڵکەکەی دەکرد و چەپڵەلێدانەکە تەواو نەدەبوو و نەدەبوو. هەموو ئەوانەی چەپڵەیان لێدەدا وروژابوون، لەپی دەستەکانیان وا پێکدادەدا دەتگوت دەنگی تەقینەوە لەو ناوە هەڵدەستێت. سەرهەنگ هەرچی هەوڵیدا، چەپڵەلێدان دانەمرکایەوە، سەرەنجام لەپشت تریبوونەکە هاتە خوار، بەڵام لەشوێنی پێشووی نەوەستا، بەخێرای هەنگاوی هەڵێناو ڕۆیشت. لەو نێوە، کاولاکزادەش بە بەردەوامی ئالآکەی رادەوەشاند و بەرز و نزمی دەکردەوە، بەڵام خەڵکەکە بێگوێدانە ئەو هەروا بەوپەڕی جۆش و خرۆشەوە چەپڵەیان لێدەدا. ڕەمزی هەرچەند خەڵکی شارۆچکەی لەسەر چەپڵەلێدان ڕاهێنابوو، ئەوەی لەبیر کردبوو کە دەستهەڵگرتنیان لەچەپڵەلێدان فێر بکات. هیچ ڕێگایەکی بۆ بێدەنگکردنی ئەو خەڵکە بەمێشك دانەدەهات. بەدەستپاچەییەوە چووە پشت تریبوونەکە و بەهەموو هێزی تێیدا بوو نەڕاندی و گوتی: "هاوڕێیان دەستهەڵگرن، دەستهەڵگرن." ئەو هەرچەندەی هەوڵیدەدا ئەوانە بێدەنگ بکات، دەنگی چەپڵەڕیزان زیاتر و زیاتر دەبوو. ئەویش لەپشت تریبوونەکە دەست و پێی خۆی ون کردبوو. سەیری کرد ناتوانێت بێدەنگیان بکات، لەپشت تریبوونەکە هاتە خوار، قاچی

تێکئالآن و کەوت، دەنگی چەپڵەڕێزان دیسان زیاتر بوو. سەلمان سامی کە لەدەست ئەو چەپڵەلێدانە خەریك بوو شێت دەبوو خێرا خۆی گەیاندە پشت تریبوونەکە، دەمانچەکەی دەرهێنا، سێ گوللەی بە هەوا وەنان، خەڵکەکە وڕوکاس مان، ژمارەیەکیان بێدەنگ بوون، ژمارەیەکیشیان هەروا لەسەر چەپڵەلێدانەکەیان بەردەوام بوون.

"بەسە ئیدی چەپڵە لێمەدەن، ئەمە فەرمانە."

دەنگی چەپڵەلێدان لەپڕ راگیرا، بێدەنگیەکی تەواو هاتە ئارا. رەمزی کاولاك کە هاتبووەوە سەرخۆی بە شەلە شەل چووەوە پشت تریبوونەکە و هاواری کرد:

"لێرە بە دواوە نابێت چەپڵە لێبدەن." جلەشینەکەی خۆڵاوی بووبوو، خۆی ئەمەی نەدەزانی. "ئێستا هەمووەمان پێکەوە دەچینە نووسینگەی پارت، بڕیارە لەوێ سەرهەنگ داوە سوورەکە ببڕێت. چەپڵەڕێزان بوەستێت. لەمەودوا چەپڵەلێدان بوەستێت."

سەرهەنگ لەپێش هەموویان و ئەوان و خەڵکەکە بە دوای ئەودا، بۆ کردنەوەی نووسینگەی پارت بۆ باڵەخانەی یۆنانی بەڕێکەوتن. خەڵکەکە دەوری باڵەخانەکەیاندا، دەنگ لەبەر کەسیان دەرنەدەهات. تەنانەت تەپڵ و زوڕناش لێنەدەدران. سەرتاسەری باڵەخانەکە بە ئالآکان رازێندرابووەوە. سەرهەنگی رەشداگەڕاو و لاواز و قەدبڵند بەرەو دەرگاکە بوو، دەرگا کراوە بوو، سەرهەنگ بەرامبەر دەرگاکە راوەستا. کچۆلەیەکی گەنج کە ئاوەڵدامەنێکی چین چینی پۆشیبوو و گەردەنبەندێکی بە ملیەوە کردبوو بە سینێکی زێڕین کە مەقەسێکی لەسەر بوو لە سەرهەنگ نزیك بووەوەو مەقەسەکەی بۆ لای سەرهەنگ راگرت. سەرهەنگ بەر لەهەڵگرتنی مەقەسەکە سەیرێکی روخسارە جوانکیلەکەی کچەکەی کرد. دەستەکانی کچەکە بتەوێت یان نا دەلەرزین. روخساری لەبەر عارەقە هەڵاتبوو. سەرهەنگ مەقەسەکەی هەڵگرت. سەیرێکی کرد. داوە سوور و سپیەکە لەلایەکی باڵەخانەکە بۆ لاکەی دیکەی راکێشرابوو. سەرهەنگ وەك ئەوەی لەپەرستگەیەك بێت دەستی چەپی بە هێمنی بۆ لای داوەکە درێژکرد، بەدەستی راستی کە مەقەسەکەی گرتبوو هات و بە ئارامی داوەکەی بڕی، ئاوڕی لەخەڵکەکە دایەوە. بە دەنگە گەورەکەیەوە گوتی: "پیرۆزە! پایەداربێت پارت و نیشتمانمان..." سەیری کرد خەڵکەکە تێکقڤژا، یەکسەر بێدەنگ بوو. ئەگەر ئەمجارە دیسان دەستیان بە چەپڵەلێدان بکردبوایەوە، ئیدی کەس نەیدەتوانی کڕیان بکاتەوە. بەلەز لەباڵەخانەکە چووە ژوورەوە. لەپلیکانەکان سەرکەوت، میوانەکانیش بە دوای ئەودا بە سەرکەوتن. کەلوپەلەکانی ناو باڵەخانەی پارت بە

شێوازێکی جوان داندرابوون. مۆبلەکان، کورسیەکان، تەختەکان و ئەو مێزانەی لەوێ بوون لەئەستەنبۆڵ و ئەنقەرەش نەبوون. دانیشتن، بەریاندایە قسان. ئەو کەسانەی کە جێگایەکیان بۆ دانیشتن پەیدا نەکردبوو، هەروا بە پێوە وەستا بوون و بە کەیف و زەوقەوە گوێیان بۆ قسەکانیان راگرتبوو. ئیسحاق بەگ، سەرگوردی تۆپخانە و هۆبەی سەربازیش کە درەنگ گەیشتبوو لەوانە بوو کە بە پێوە وەستابوون. دکتۆر سەلمان سامی و ئەوانی دی لەسەر تەختەکانی تەنیشت دەرگای تەلارەکە دانیشتبوون. دکتۆر هەر کە سەرگوردە شەلەکەی لەبەرامبەر خۆدا بینی لەسەر تەختەکە هەستا و بە هێواشی چووە دەرەوەو ئاماژەی هاوڕێکانیدا ئەوانیش بە هێواشی بە دوای ئەودا چوونە دەرەوە. ئەوانەی لە رۆخ دەرگاکە بوون لەگەڵ رۆیشتنی ئەوان، یەکسەر دانیشتنە سەر جێگای ئەوان. هەندێك کە سەرگەرمی قسەکردن بوون بە جۆش و خرۆشێکەوە باسی ئەوەیان دەکرد کە وڵات دەگەیەننە ئاستی ئەورووپا و بەرزترین ترۆپکی ئەو پێشکەوتنەی کە هەیە. بە شانازییەوە باسی ئەوەیان دەکرد کە چۆن توانیویانە لەو عوسمانیە بۆگەن و رزیوە ئەو چڵە سەوز و گەشاوەیە بەرهەم بێنن و بە گوتنی ئەوەی کە چڵە، چڵە، چڵەکەمان بەرهەمهێنا وروژانەکەیان گەیشتە ئەوپەڕی.

"تا زووە بابچینە هۆبەی سەربازی."

دکتۆر سەلمان سامی گوتی: "با بچین."

هۆبەی سەربازی نزیك بوو، لە کاتێکدا کە قەرەباڵغیەکەیان دەسمی دەچوونە پێشەوە، گەیشتنە باڵەخانەیەکی لە تەختە دروستکراوی زۆر جوان. کەمێك لەوێ راوەستان، "سەرگورد ئیسحان، باڵەخانەکەی نۆ باڵەخانە نییە، کۆشکە."

"ئەمە خانووی چێشتلێنەرێك بوو، بارەگای فەرمانگەکەمان وەکو کولانەی مریشك وابوو، هاتم ئەم باڵەخانەیەم بینی، کەوتە بەر دڵم. سەیرم کرد کابرایەکی پێکەنیناوی بە جلو پێڵاوەوە لەسەر دۆشەکی پەڕی مەل لێیڕاکشاوەو خەوتووە. هەر کە منی بینی یەك پێ هەستا، خەبەردار هەستایە سەرپێ، پرسیم ئەم خانووە هی کێیە؟ گوتی هی خۆمە. لەباوکتەوە بۆت ماوەتەوە؟ گوتی هی چێشتلێنەرێك بوو. منیش پاسەوانی کێڵگەکەی بووم، کاتێك دەیویست بچێتەوە شارەکەی خۆی، دای بەمن، بۆ دەپرسیت؟ وای ئیدی، بۆ ئەوەی حکومەت لەدەستی دەرنەهێنێت و لێینەستێنێت. تۆش لێتوەرگرت، وانییە؟ منیش... کلیلەکانیش لای تۆن؟ بەڵێ. بدە ببینم کلیلەکان. یەکسەر کلیلەکانی دامێ. ملی کەچ کرد، منیش بە خەیاڵی

ئەوەی بوومە خاوەنی ئەم خانووە خۆشحاڵ بووم. دیسانیش خۆشحاڵ دەبم، دوای دە رۆژی دیکە وەرە لام، خانوویێکت بۆ پەیدا دەکەم. کەوابوو پێیانبڵێ ئەو باغەی کە بۆیان داناوم لێمنەستێننەوە. هەندێك کاغەزی لەگیرفانی دەرهێناو نیشانی دام، ئەم باڵەخانە و باغەیان فرۆشتبووە ئەو پیاوە گەنجە. تۆ دوای دە رۆژی دیکە وەرە لای من، ئەگەر خانوویێکی جوانم بۆ پەیدا نەکردی کە بە دڵی خۆت بێت خانووەکەی خۆمت دەدەمێ. تۆ باغەکەت بدە بەمن، ئەوکات حکومەت ناتوانێت لێمبسەنێت، من چی لەم خانووە گەورەیە بکەم. تۆ هەر ئەوەندە بکە باغەکە نەکڕیت. خانوویێکت بۆ دەکڕم نەبێتەوە. گوتی سوپاس. بەڕێکەوت و رۆیشت."

چوونە ناو باڵەخانەکە، ناو باڵەخانەکە زۆر پاك و خاوێن بوو، مۆبل و تەختە و کورسیەکانیان لە ئیتاڵیاوە هێنابوو.

دکتۆر سەلمان سامی لەبارەی پیاوە گەنجەکە پرسیاری لەسەر گورد کرد:

"پیاوە گەنجەکە دوای دە رۆژ هاتەوە. من خانوویێکی بچووکم بۆ پەیدا کردبوو. قەباڵەی باغەکەشم وەرگرتبوو، قەباڵەکانم دانێ. هاواری کردو گوتی های زیندووبوومەوە، زیندووبوومەوە. وەکو باڵندان بە فڕین فڕی و رۆیشت. لەدوور دوورە دەنگی دەهات و دەیگوت، هاوسەرگیری دەکەم، هاوسەرگیری دەکەم."

"ئێستا ئێمە کارێکمان پێت هەیە. با یەکەمجار کاك پۆیراز باسی حەسەنی راکردووت بۆ بکات، ئینجا من باسی دەکەم."

یەکەمجار پۆیراز یەك بە یەك ئەو قسە و باس و خواسەی بۆ گێڕایەوە کە راکردوو بۆی باس کردبوو و پاشان سەلمان سامی دەستی پێکرد. سەرگورد ئیسحاق بەگ دڵگران بووو فرمێسك لەچاوەکانی قەتیس مان و دەتگوت هەموو گیانی دەلەرزی:

"تەواوە، ئەوە روویدا. ساری قامیش گەورەترین دۆڕانی مێژووی ئێمەیە. ئەنوەر پاشا نموونەی شێتێکی لەخۆڕازیە. لە راستیدا، مەرگی لەشکرێکی گەورەیە کە بەر لەوەی بچنە شەڕەوە رەق دەبنەوەو دەبنە خۆراکی ئەسپێیان. ئێژن نەوەد هەزار کەس مردوون، نە نەوەد هەزار، نە سەد هەزار و نە سەدو پەنجا هەزار کەس. ژمارەی تەلەفاتی ساری قامیش هەرگیز کەس پێمان ناڵێت. تەریق دەبنەوە، دەترسن بڵێن لەشکرێك بە فەرمانی شێتێکی دڵڕەق بەر لەوەی بچنە نێو شەڕ لەسەرمان رەق بووەوەو بووە خۆراکی ئەسپێیان و بە نەخۆشی تیفوس لەنێوچوو."

سەرگوردی شەلە لەقسانی گەرم کردبوو و هەموو رووداوەکانی ساری قامیشی بە تاڵی و نەهامەتیەکانیەوە باس دەکرد.

دکتۆر سەلمان سامی بە بەردەوامی دەیگوت: "رێی تێناچێت. رێی تێناچێت. رێی تێناچێت. هیچکاممان هیچشتێك لەبارەی ساری قامیشەوە نازانین، مخابنە. بۆچی هیچشتێك نالێین؟"

"نایلێین دکتۆری هێژا. هیچ قسەیەك لەبارەی ئەو لەشکرە ناکەن کە شەڕی نەبینی و هەمووشی کوژرا، ئەو سێ فەوجەی لە تەکیان بوو،. هەروەها باسی هێزە پشتگیرییەکانی چەرکەس و هاوڵاتیانی دەریای رەش، هەروەها باسی فەوجی سوارە نیزامیەکانی کورد ناکەن، چۆن دەتوانن روونی بکەنەوە جەنابی دکتۆری هێژا، چۆن دەتوانن شەرم لەخۆیان نەکەنەوە، چۆن؟"

سەرگورد شەلاڵی عارەقە بووبوو، رەگی گەردەنی رەق راوەستابوون و چاوە شینە گەورەکانی لە قەپێلکی چاویەوە دەرهاتبوون. قاچی چەپی بۆ لای ئەوان درێژ کرد و دەلینگی شەلوارەکەی هەڵکرد: "سەیری قاچم بکەن، نە قاچم و نە هیچشوێنێکی دیکەم نیشانەی بڕینی پێوە نییە. خەریك بووین بە چیاکەدا هەڵدەگەڕاین کە باو بۆرانێکی وا هەڵیکرد سێ بەشی ئەو فەوجەی کە بەشەکەی دیکەی پێشتر رەق بووبووەوە بۆ دواوە گەڕایەوە، هاتینە پێدەشت، تا ناوکمان رۆچووینە نێو بەفرەوە، نەماندەتوانی لە جێی خۆمان بجووڵێین. ئەوەی دیکەشم لەبیر نییە. کاتێك چاوم هەڵێنان، خۆم لەماڵی گوندییێك بینیەوە. دوو کەسی دیکەشم لەکن بوون. هەردووکیشیان ملازم بوون، پرسیم چیمان بەسەر هاتووە، هاوڕێکانی دیکەمان لەکوێن؟ هەردووکیان لەشوێنی خۆیان کەمێك هەستانەوەو گوتیان کاتێك ئەو گوندیانە دۆزیمانیانەوە، سەیری هاوڕێ سەربازەکانی خۆمانمان کرد کە کەوتبوونە سەر بەفرەکە یەك یەك سەیرمانکردن بینیمان هەموویان رەق بووبوونەوە. گوتم من هەردوو قاچم لەدەستداوە. ملازمەکەی دیکەش گوتی منیش قاچم نەماوە. بەخۆمم گوت دەبا قاچەکانم بجووڵێنم، نەمتوانی مەرامی گوندەکە قاچێکی بۆ دەرمان کردم. هەر بەو تاکە قاچەم، خۆبەخشانە بەشداریم لەجەنگی سەربەخۆییدا کرد. هێشتا مەدالیای سەربەخۆییان بۆ نەناردووم. وابزانم لە بیریان کردووم."

"نابێت، نابێت، نابێت."

"دەبێت دکتۆری هێژا، دەبێت تۆ حەسەنی راکردوو بهێنە لای من چۆن توانیویە خۆی لەدەستی ئەنوەر پاشا دەرباز بکات، سەرم سوورماوە، زوو بیدۆزنەوە و بیهێنن تا خێرا لەداری بدەین! هیچکەس نەیتوانی لەسەربازی رابکات، ئەنوەر پاشا هەر سەربازێك ئەگەر لەسەرمانیش رەق نەبوایەو نەبوایە بە خۆراکی ئەسپێیان و بەدوای فەوج و لیواکەی خۆیدا بگەڕابوا دەیگرت و لوولەی دەمانچەکەی دەخستە نێو دەمی و پلی پێدادەهێنا. ئەنوەر پاشا ئەگەر ئێمەی بۆ دەگیرا، ئەگەر لەو گوندەی پەنامان بردبووە بەر وەگیری دەهێنایین، دەینەڕاندو دەیگوت دەمتان بکەنەوەو پاشان پلی بە دەمانچەکەیەوە دەناو بەدەم تریقانەوەی پێکەنین رێگای خۆی دەگرت و دەڕۆیشت. خێرا بڕۆن حەسەنی راکردوو بدۆزنەوەو بیهێننە لای من تا هەم کارتی تەواوبوونی خزمەتی سەربازی پێبدەم و هەم مەدالیایەکی قارەمانێتی لە پای ئازایەتیەکانی لەساری قامیش. هیچ ترس و دڵەڕاوکێیەکتان نەبێت کە حەسەن ناسنامەیەکی نییە. ئێمە لێرە خانێکمان هەیە، خانێکی راستەقینە، لەو خانە ساختە و دروستکراوانە نییە، خانێکی راستەقینەی چەچە نییە."

"عوزێر خان ئێمەی بۆ ئەم شەو بانگهێشت کردووە. خان موژدەی ئەوەشی دا کە جەنابی پایەبەرزیشتانی بانگهێشت کردووە. وەلێ ئێمە نەمانتوانی تا شەو چاوەڕێ بین هاتینە لای ئێوە."

"بەخێر بێن، سەفاتان هێنا. خۆشحاڵم کە دەبێت کارەکانی حەسەن ئەنجام بدەم. لەوەی کە دەتوانم یارمەتی بدەم فرە خۆشحاڵم. هەم کارتی تەواوبوونی خزمەتی پێدەدەم و هەم کارتێکی رێزلێنان لە پای ئەو قارەمانییەتیانەی لە جەنگدا ئەنجامی داون و لە پای ئەوەش کە تاکە کەسە کە لە فەوجەکەی خۆیدا توانیویە بە ساغی بێتەوە."

هەموویان پێکەوە هستان و بۆ نانخواردن چوونە باڵەخانەکەی رەمزی کاولاك. رەمزی کاولاك بەگ، دکتۆر سەلمان سامی لە تەنیشت سەرهەنگ دانیشاند، پۆیرازی لە تەنیشت دکتۆر و خەڵکی دوورگەی کارینجاو میوانەکانی دیکەی لە تەنیشت پۆیرازەوە تا لای خوارەوە بەڕێز دانان. ئەو کارە بریتی بوو لە رێزنان لەخەڵکی دوورگەی کارینجا. نوێنەرەکانی ئەنجومەن و سەرەك هۆزی لە تەنیشت سەرهەنگ دانابوون جێی سەرهەنگ ئیسحاقیشی لە تەك سەرۆك هۆز کردبووەوە، چونکە رادەی پەیوەندیی نێوان پۆیراز و سەرگوردی لە نزیکەوە بینیبوو. ئەگەر ئەو پیاوێکی گرنگ نەبێت پۆیراز ئاوا بەڕێزەوە رەفتاری لەگەڵدا دەکات؟ ئەو

بهێنیت و بیبەیت سەرگوردێکی شەلەیە و چی دیکەنا، لەکاتێکدا پۆیراز قارەمانێك بوو خاوەنی مەدالیای سەربەخۆیی، کێ دەڵێت بەڵکو سەرگوردیش مەدالیای سەربەخۆیی هەبێت و لەبەر کاری نهێنی بەخۆیەوە نەکردبێت.

جۆرەها خواردنەوەت لەسەر مێزی میوانداریەکە دەبینی، هەمووان دەیانخواردەوە. گاڵتەیان دەکرد، وتاریان دەدا، بێپسانەوە باسی ئەو تیرانەیان دەکرد کە لەچیای ئالتای دەهاوێشتران و رۆدەچوونە ورگی چیاکانی ئالپەوە. نەژادە هەڵبژاردەکەمان بڕیار بوو وەکو جەنگیز خان، لەچیاکانی ئالتای را بهێتە ئەنەدۆڵ و لەوێ گشت هۆز و تیرەکان یەکبگرن و دەست بەسەر هەموو جیهاندا بگرن. ئێمە وەکو رۆڵەکانی خۆر سەرزەویمان بە شکۆی خۆمان رازاندەوە، دوای ئەوەش بە شەرەفی خۆمان دەیرازێنینەوە. خوێن لەشمشێرەکانمان دەچۆڕتەوە، خەڵکی لەئێمە دەترسێن و ملمان بۆ کەچ دەکەن.

نانخواردن بە وتار و قسە ستایشئامێزەکانی سەرهەنگەوە دەستیپێکرابوو، بە هەمانشێوەش کۆتایی هات.

شەمەندۆفەر چاوەڕێی ئەو میوانانە بوو کە لە ئەنقەرەوە هاتبوون، بەر لە نانی ئێوارە سواری شەمەندۆفەر بوون کە بە گوڵ و لکی دارمۆرتك رازاندرابووەوە. رەمزی کە هونەری چەپڵەلێدان و هاندانی فێری گوندیەکان کردبوو، لەبیری نەکردبوو کاتی بەڕێکردنیشیان بە جۆش و خرۆش و جانانە چەپڵە لێبدەن، بە جۆرێك کە دەنگی چەپکەکانیان وەکو هەوری ئاسمانان بگرمێنێت. ماوەیەك بەدەم هۆرا هۆرا ئەو خەڵکەی هان دەدا چەپڵە لێبدەن، بەڵام هیچ دەنگێك لەو خەڵکە نەبیسترا کە ویستگەکەیان پڕ کردبوو. دەنگی دەهۆڵ و زوڕناش ماوەیەك بەر لە بەڕێکەوتنی شەمەندۆفەرەکە نەمابوو. شەمەندۆفەرەکە بەڕێکەوت و هەڵم و دووکەڵێکی زۆری بەو ناوەدا بڵاو دەکردەوە، دروست ئا لەم کاتەدا دەنگی دەهۆڵ و زوڕناکان دنیایان هێنایە لەرزین. خەڵکە بێدەنگەکە تا ئەو دەمەی شەمەندەفەرەکە لەبەر چاوان ون بوو لە جێی خۆیان نەجوولان. دوای رۆیشتنی شەمەندەفەر سەمای زیبك و هەڵهەلەکان... بەدەم سەماوە گەڕانەوە باڵەخانەکە و تا بەرەبەیان سەمای زیبکی و هەڵهەلەکان بەردەوام بوون.

رەمزی، هەر لەگەڵ ئەوەی دەستەیەك زیبك و سەماکەر دەستیان لە سەماو هەڵپەڕین هەڵدەگرت، دەستەیەکی دیکەی دەهێنا.

خەڵکی دوورگەی کارینجا ئەگەرچی لەو بەزم و هەرایە ماندووش بووبوون، بە دڵ و گیان پێشوازیان لە عوزێر خان کرد. موسا کازم ژێر باڵی خانی گرت، لەپلیکانەکان چوونە سەرەوە. موسا ئاغا شادو گورج و گۆڵ بوو، یەکسەر لە دەوری مێز دانیشتن. پاشانیش خاتوون هات، بەخێرهێنانی هەمووانی کرد مێز رازێندرابووەوە. دوو کچۆڵەی تازە پێگەیشتوو خزمەتیان دەکرد. تا درەنگانێکی شەو بە ئارامی باسیان لەسەرهەنگ، پارتی گەلی کۆماریخواز، میوانە تایبەتەکانی پارت، والیەکان، رەمزی کاولاك و دانانی بە سەرپەرشتیکاری پارت و جەنگی ئازادی کرد. لە هیچکامیان بچووکترین نیشانەی مەستبوون بەدی نەدەکرا عوزێر خان و سەرگورد ئەوانیان تا ئەسکەلە بەرێکرد. کاتێك ئەوان سواری بەلەمە ماتۆڕدارەکە بوون، سەرگورد ئیسحاق لە کاتێکدا دەستی تەکان دەدا گوتی:

"حەسەنتان لەبیر نەچێت، حەسەن. ئینشاللا دەیدۆزنەوەو دەیهێننە لای من، ئەو هاوڕێیەم. بەهەرحاڵ، لەدەست تووڕەیی ئەنوەر پاشا خۆی دەرباز کردووە، دڵم بۆ ئەو هاوڕێ سەربازەم تەنگ بووە."

پۆیراز لەوەڵامدا گوتی: "ئینشاللا دەیدۆزینەوە. سوپاست دەکەم جەنابی سەرگورد. ئێوە کەسێکی عاقڵ و باشو هێژا رزگار دەکەن."

دکتۆر سەلمان سامی لەوەی کە خراپ هەڵسوکەوتی لەگەڵ حەسەن کردبوو و بووبووە خۆی هەڵاتنی نیگەران بوو و لەسەر یەك دەیپرسی دەتوانین حەسەن بدۆزینەوە. پۆیرازیش ئەگەرچی نەیدەتوانی وەڵامێکی تەواو دڵنیاکەرانەی بداتەوە دەیگوت ئەو ناتوانێت دوور بکەوێتەوە، بەنزینی پێنەبوو، داوای لە قەدریی بەلەموان کردبوو بەنزینی بداتێ ئەویش پێیگوتبوو هەر ئەوەندەم بەنزین هەیە کە ئێمەی پێبگەیەنێتە شارۆچکە. نیشانچی گوتی ئەگەر نەچووبێتە شارۆچکە چۆن دەتوانێت بەنزین پەیدا بکات. دکتۆر سەلمان سامی لە بیستنی ئەم قسەیە زۆر خۆشحاڵ بووبوو. بەدبەختەی لەترسان زەندەقی رژابوو، ترس چەندین ساڵ بوو رۆچووبووە مۆخی ئێسقانەکانی، ترس لەوەی هەر رۆژێك رەنگبێت بیگرن و بیکوژن... ترسەکەی هێندە بە خوێنساردی و بێبایەخانە و وەك ئەوەی ترسی خۆی نا هی کەسێکی دیکە بێت باس دەکرد کە... تەنها ئەو کەسانە وا باس لەترس دەکەن کە لەترس بترازێت بیر لەهیچشتێکی دیکە ناکەنەوەو لەگەڵ ترس و هەراسدا دەژین. لەکاتێکدا کە هەندێکیان بێدەنگ بوون و بیریان دەکردەوەو هەندێکیان لەبارەی حەسەنەوە دەدوان نزیکەی نیوەڕۆ گەیشتنەوە دوورگە. بە

دوودڵی و گومانەوە چوونەوە نێو دوورگە. لە ئەسکەلە چاوەڕێی قەدریی بەلەموان بوون، لەم ساتەدا مەلەك خانمیان بینی کە خەریك بوو دەهاتەخوار، مەلەك خانم بۆ لای کانیەکە چوو، لەوێ راوەستا، چاوەڕێی کردن، گوتی: "بەخێر بێنەوە."

گوتیان: "سوپاس." دانیشتن.

"قەدریی بەلەموان، دوێنی ئەو راکردووەی دۆزیەوەو هێنایەوە. بە بەلەموانم گوت کوڕم، ئەو کەسێکی راکردووە. بیهێنەوە ماڵێ، با لەگەڵ ئێمە نان بخوات. پێشمگوت بەنزینیش لەبەر دەست دامەنێ نەوەك شەو دەیبات و دیسان رادەکات. بەلەموان گوتی دایکە، بەنزین و سەوڵەکانم هەڵگرتوون، تەنانەت سەوڵی بەلەمەکەی ئەویشم هەڵگرتوون و هەموویانم بردوونەتە نێو بەلەمێك و شاردومنەتەوە. پاشان لەگەڵ راکردوو هاتنە ماڵەوە. روخساری راکردوو وەکو روخساری مردوان سپی هەڵگەڕابوو، نوور لەچاوانی نەمابوو و لێوی شین و مۆر بووبوون. پارووێکی خستە دەمیەوە، هەر جووی و جووی، بەڵام نەیتوانی قووتی بدات. گوتم چتە حەسەن کوڕم. گوتی هیچ مەپرسە دایکە باشەکەم. هەموو گیانی دەلەرزی. لێم مەپرسە مەلەك خانم، دایکە باش و جوان و رەسەنەکەم، لێم مەپرسە. من هەڵاتم، چووم خۆم لە دوورگەی کابا شاردەوە. بزنەکانی خدر دەوریان دام پێمگوتن من بۆ ئەوە نەهاتوومەتە ئێرە کە ئێوە ببرژێنم و بتانخۆم. سوپاس بۆ خوا لەسەر قوەت و تاقەتم. نانیش نەبێت ماسیان دەگرم و ورگی خۆم تێر دەکەم. لەوێ تەنانەت ئەگەر مانگێك یان دوو مانگ یان تەنانەت سێ مانگانیش بمێنمەوە دەتوانم ئیدارە بکەم. لەماوەی سێ مانگدا، هەرچۆنێك بێت، بەلەمێکی ماتۆڕدار و بەوێدا هەر رەت دەبێت، دەتوانم هەندێك بەنزینی لێوەربگرم و خۆم بگەیەنمە لێوارێك، خۆم دەگەیەنمە شارۆچکە، تانکی بەنزینی بەلەمەکەم پڕ دەکەم و چوار دەببانیش هەڵدەگرم و خۆم قورتار دەکەم. کاتێك لەدوورەوە بەلەمی ئەوم بینی زۆر خۆشحاڵ بووم، تا گەیشتە دوورگە هەر دەستم بۆ هەڵتەکاند، منی بینی، سووکانی وەرسووڕاند بۆ لای دوورگە. کە زیاتر نزیك بووەوە و زانیم بەلەم بەلەمەکەی قەدریی بەلەموانە، گوتم هەموو شتێك بڕایەوە، گوتم بچمە سەر تەپۆلکەکە و لەوێ خۆم فڕێ بدەمە خوارەوە. گوتم پارچە پارچە بوونو مردن زۆر لەوە باشترە لە سێدارە بدرێم. مرۆ کاتێك پارچە پارچە بێت و بکەوێتە نێو دەریا گیانی شیرین بەخوێ و سوێرایی ئاوی دەریا دەزوورێتەوە، ئاوی سوێر گیانی مرۆڤ سەیر دەزوورێنێتەوە، خوێن تەنانەت پەنجەیەکی برنداریش دەزوورێنێـتەوەو دەیهێشێنێت. ئینجا وای لەجەستەیەکی پارچە پارچە

کراو! مووی بەدەنم راست بوونەوە. لەو بیرو خەیاڵانەدا بووم کە ئەو گەیشت، لەشوێنی خۆم رەق هەڵاتبووم، مردبووم و ئاگام لەخۆم نەبوو. هەڵیانگرتن و دایاننامە نێو بەلەم و هێنامیانەوە دوورگە. پاشان نووستم هەستم کرد مردووم. تاوێك دواتر سەیرمکرد زیندوو بوومەتەوە. ئەوان هەروا خەریك بوون قسەیان دەکرد. لەنێویاندا قەدریی بەلەموانم بینی، گوتم پەنام وەبەر خوا، مرۆڤایەتی لەم دنیایەدا لەنێو نەچووە. لەدڵی خۆمدا گوتم ئەم بەلەموانە کوڕی مەلەك خانم. باوکیشی لەجەنگی چاناك قەڵا بووە گەردو وەکو هەور چووە ئاسمان، ئەوەندە بەرزبووەوە بە شێوەیەك تا گەیشتە لای فریشتەکان، فریشتەکان دووبارە ئەویان گەڕاندەوە سەر حاڵەتی مرۆڤ و بردیانە بەهەشت و بە پەریەکانی بەهەشتیان سپارد. لەم دنیایەدا هیچکەس هەیە دوای مردنی یەکسەر بچێتە بەهەشت؟ تەنانەت عارف و پیاو چاکەکانیش یەکسەر دوای مردنیان ناچنە بەهەشت. تەنانەت خدریش سڵاوی خوای لێبێت ناتوانێت بچێت. کوڕەکەی مەلەك خانمیش من ناباتە ژێر داری سێدارە. مەلەك خانمیش کە ژنە شەهیدە رادەستی حکومەتم ناکات. گوتم ئەگەر گوێ لەقسەکانی ئەویش نەگرن، دەمگرن و دەمبەن گوللەبارانم دەکەن. من تا توانیم قسەم لەگەڵ کرد، گوتم ناتوانن هیچشتێکت لێبکەن. پێمگوت، گوتم، وابزانم رازی بووە. خۆشحاڵ بووم، ئەویش خۆشحاڵ بوو، تەنانەت قاقا پێکەنی. خواردنم بۆ هێنا، وەکو برسی ساڵی گرانی پەلاماری خواردنی دا. دەستو دەم و چاوی خۆی شوشت. بینیم بە گوێزانەکەی قەدری ردێنشی تاشی. لەجاران گەنجترم هاتە بەرچاو. کە ئەوم وەکو بەلەموانەکەی خۆم ئاوا جوان و جاحێڵ بینی هەناوم هاتنە خوار، ئەگەر نەگریابوام، دەخنکام، پێشم بەخۆم گرت، دەنا وایدەزانی خەریکم بۆ حاڵ و رەوشی ئەو دەگریم و تا بەیانی خەوی لێنەدەکەوت. نوێنێکی پاك و خاوێنم بۆ راخست تا لانیکەم رۆژێك لەنێو نوێنێکی ئاسوودەدا بتوانێت بخەوێت. منیش دەچمە لای عەلی چاوش تۆ پاڵ تاکو ئەم کوڕە کە هەموو هزرو بیری لەسەر گیانی خۆیە لەسێدارەی نەدەن و گوللەبارانی نەکەن. پاشانیش ئەم کوریژگە شەهید دەبێت و بێئەوەی ببێتە گەرد دەڕوات و دەگاتە تەبەقەی فریشتەکان و لەبەر ئەوەی نەبۆتە گەرد و تۆز ئاسوودەتر دەتوانێت بچێتە بەهەشت، ئەگەرنا لەسێدارەی بدەن یەکڕاست دەچێتە دۆزەخ.

"شەو یەك دووجار هەستامەوەو چووم سەیری نوێنەکەیم کرد، بینیم وەکو فریشتان خەوتووە. بەیانی زوو لەخەو هەستام تاکو شۆربا و چای بخەمە سەر ئاگردان کە چووم بینیم

لەنێو جێگادا نەماوە. بەدەنگی بەرز بانگم کرد قەدریی بەلەموان هەستە. گوتم، بەلەموان، بەلەموان، بەلەموان، راکردووەکە رایکردووە. بەلەموان بە کپی هەستا، جلەکانی پۆشین، بەر لەوەی دەست و دەم و چاوی بشوات و شتێك بخوات بەدوای داچوو، ئیدی هەواڵێکیان نییە."

موسا ئاغا گوتی: "بەلەموان تا نەیدۆزێتەوە ناگەڕێتەوە."

پۆیراز گوتی: "ناگەڕێتەوە."

مەلەك خانم گوتی: "ناگەڕێتەوە."

لەم کەین و بەینە زەهرا هات، لەپێشیان راوەستا، پێکەنی و گۆناکانی قووڵ بوون بێئەوەی کەس تێبینی بکات بە چاو ئاماژەیەکی بۆ پۆیراز کرد و تێیگەیاند کە: "بەرچایی ئامادەیە، تەشریف بێنن بۆ ماڵی ئێمە." گەڕایەوە، سەتڵی لە ئاوی کانییەکە پڕ کرد، خێرا خێرا بەرەو ماڵ گەڕایەوە. ئەوانی دیکەش هەستان. نانخواردنی بەیانی زۆر درێژەی کێشا. دکتۆر سەلمان سامی ئارام و ئۆقرەی نەبوو:

"زووبە هەستە بابچینە ژێر دارچنارەکان، لەوێ بوەستین تا قەدریی بەلەموان دەگەڕێتەوە."

پۆیراز گوتی: "نیگەران مەبە جەنابی سەرگورد، قەدریی بەلەموان دەیدۆزێتەوە و دەیهێنێتەوە، ئێوە خۆتان نیگەران مەکەن."

مەلەك خانمیش لەکاتێکدا رەنگ بە رووانیەوە نەمابوو، بە راکردن هاتە ژێر دارچنارەکان، گوتی: "بینیمن، وا خەریکە دێن، ئەوانم لەلای دارهەنجیرەکە بینی. پێموابێت یەکێکیان بەلەموانەکەی خۆم بوو، بە تەواوی نەمتوانی دەستنیشانیان بکەم. ئەوەکەی دیکەش دەبێت ئەو راکردووە بێت. ئەم پزیشکەی ئاژەڵان گەنجە دەبێت بینایی چاوەکانی زۆر باش بێت."

پزیشکی ئاژەڵان یەکسەر هەستا و گوتی:

"چاوم باشن، ئەوەندە تەنانەت لەچاوەکانی نیشانچیش باشتر، من دەتوانم لەتاریکیی شەوێکی باراناویدا مێروولەی رەش لەسەر بەردی رەش ببینم. هەر ئێستا دەچم ئەوانتان بۆ دێنم."

لە چاو قوچانێکدا رۆیشت و لەپشت خانووەکان ون بوو. ئەوانی دیکە، ملیان راکێشابوو و روویانکردبووە ئەو شوێنەی کە پزیشکی ئاژەڵان تێیدا لەبەرچاوان ون بوو و ئاوا چاوەڕێ مانەوە. هیچ قسەیان لەگەڵ یەکدا نەدەکرد. دکتۆر سەلمان سامی هەستا، بە دوای پزیشکی ئاژەڵاندا چوو، ئەویش لەودیو خانووەکان لەبەر چاوان ون بوو.

دوای ماوەیەك چاوەڕوانی، سەلمان سامی لەپێشەوەو ئەوانی دی بەدوایدا لە ڕۆخ خانووەکان هاتنەدەر. روخساری دکتۆر تووڕە دیاربوو، ئەوەندە تووڕە کە چیوای نەمابوو بتەقێت. هات لە تەك موسا کازم ئاغا دانیشت. لەم سەروبەندەدا، زەهرا بە سینییێکی زیوین و فنجانی زارککراوە کە خەتی سووریان تێدابوو قاوەی سەر بە کەفی بۆ هێنان، بۆنی خۆشی قاوە ئەم ناوەی پڕ کرد.

پزیشکی ئاژەڵان ئەو فنجانەی کە زەهرا بۆی راگرت وەرنەگرت: "من دەبێت بڕۆم. دەمەوێت بچمە ماسیان، رەنگە بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ کەمێك دوابکەم. ئێوە بۆخۆتان سەلاتەی بە تەماتان دروست بکەن، دارو پەردووش ئامادە بکەن. من رۆیشتم، خواحافیز."

مەلەك خانم گوتی: "تا حەز بکەیت تەماتە و پیاز و بیبەر زۆرە. هەموو باخچەکە پڕیەتی. تەنانەت بەشی ساڵێکمان دەکات. داریش ئامادەن. ئەویش داری وشکی دار زەیتوون. ماسی باشمان بۆ بگرە."

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "دەیانگرم. لوفەر دەگرم، لوفەر نەبێت چیپۆرا، ئەویش نەبێت لێورێك، ئەویش نەبێت..."

پۆیراز گوتی: "تێگەیشتین، خێرا بگەڕێوەو لێمەگەڕێ لەبرسان بمرین. هەرچیت گرت بیهێنە، قبوڵە."

"تەنانەت ئەگەر پالاموت بێت؟"

پۆیراز بە پێکەنینەوە گوتی: "هەرچیت بۆ گیرا، با بەچکە نەهەنگ بێت."

"بۆ سەلاتە سرکەی هەنار، لیمۆندوزی..."

زەهرا گوتی: "سرکەی هەنارمان هەیە." بە بەلەموان و حەسەنی گوت: "بابچم قاوەتان بۆ بێنم."

زەهرا لە کاتێکدا سینی بەتاڵی بەدەستەوە بوو هەستا و رۆیشت. کەمێك دواتر بە سێ فینجان قاوەی سەر بە کەف گەڕایەوە. قاوەکەی دایە ئەوان. پۆیراز ئەمجارەش نەیتوانی سەیری بکات. زەهرا فنجانە بەتاڵەکانی بردەوە ماڵێ. فنجانی قاوە هەروا لە دەستی حەسەندا بوو.

سەلمان سامی بە ئەدایەکی فەرماندەرانەوە گوتی: "خێرا قاوەکەت بخۆرەوە. هەواڵی خۆشم هەیە بۆت. حەسەن مەگەر تۆ سەربازی راکردوو نیت؟ نە تۆ ئەمە دەزانی و نە منیش. ئەمە سەرۆکی هۆبەی سەربازی پێیگوتین. وادیارە، سەرگورد ئیسحاقیش یەکێکە لەو پاشماوانەی

کوشتارەکەی چیای ئەللاهو ئەکبەر." بێدەنگ بوو. حەسەنیش ئەو قاوەیەی بەدەستیەوە بوو بەیەك فڕ خواردیەوە.

دوای سەرگورد، موسا کازم ئاغا سەری قسانی گرتە دەست، قسەکانی جەنابی سەرگورد ئیسحاقی دووپاتە کردنەوە، گوتی بەزووی کارتی کۆتایی خزمەتی سەربازیت پێدەدات. ئەو زۆر راشکاوانە، وردو بەشێوەیەکی دڵنیاکەرانە و متمانەوە قسەی دەکرد. "کاك سەلمان سامی هێژا تۆی بە جەنابی کاك ئیسحاق، سەرۆکی هۆبەی سەربازی، ناساند. دکتۆر ایناساندی کە هەمووان تۆیان کەوتە بەر دڵ، هەموو ئەوانەی بیستیان دڵگران بوون. زۆری نەمابوو بدەنە پڕمەی گریان. ئەویش وەکو تۆ لە ساری قامیش لەگەڵ رووسان جەنگاوەو بریندار بووە. قاچێکی پڕ لە ساچمەیە. ئێستا، حەسەن گیان، کوڕەکەم، کاك سەلمان سامی بەو شێوەیە تۆی لە راکردن دەرباز کرد. لەمەودوا تا ماویت دەتوانیت بە ئاسوودەیی بژیت. جەنابی دکتۆری هێژا بەو زمانە شیرین و پێگە مەزنەی خۆیەوە منیش دەگەڕێنێتەوە بۆ زێد و ماڵ و حاڵی خۆم. ئاه ئەگەر ئێستا بەڕێز وەلی نیشانچی لێرە دەبوو، ماچبارانی دەکردیت، دەیبردیتە لای کاك ئیسحاق، کارتی کۆتایی خزمەتی سەربازی بۆ وەردەگرتیت و دەیدایەوە دەستت."

دوای ئەو پۆیراز لێیوەرگرتەوە:

"لەمڕۆ بە دواوە دەبێت وایدابنێیت کە کارتی کۆتایی خزمەتت هەیە. تۆ دۆست و هاوڕێی دنیاو قیامەتمانی. ئێمە تۆمان وەك چۆن هەیت واقبوڵ کردووە. زیندوو ماوەکانی ساری قامیش بە راکردوو داناندرێن. من خۆیشم لەپاشماوەکانی ساری قامیشم. چەند باش بوو کاتێك منیان لەژێر بەفرەکاندا هێنایەدەر رووبەڕووی ئەنوەر پاشا نەبوومەوە، دەنا منیشی وەکو سەربازانی دیکە بەناوی سەربازێکی خائین و ترسنۆك کە خۆی لەژێر بەفردا شارۆدتەوە دەگرت و دەمی پڕ دەکردم لەگوللە. جەناب سەرگورد ئیسحاقیش، بەهەرحاڵ ئەویش لەپاشماوەکانی ساری قامیشە. بۆیە حاڵ و رەوشی تۆی دەرك کرد. سەرگورد دکتۆری هێژاش بەسەرهاتی تۆی بە شێوەیەك باس کرد کە هیچکەس ناتوانێت بەرگەی ئەو قسانە بگرێت" بە ئەدایەکی شادەوە درێژەی دایێ: "هەرکاتێك ویستت پێکەوە دەچینە شارۆچکە و کارتی کۆتایی خزمەتە سەربازییەکەت وەردەگرین و دێینەوە. جەناب سەرگورد ئیسحاق بتبینێت زۆر خۆشحاڵ دەبێت."

حەسەن کە لەتەك قەدریی بەلەموان بەرامبەر ئەوان دانیشتبوو، هەر لە سەرەتای باسەکەوە خۆی کرمۆڵە کردبوو و دەستەکانی لەنێو قاچەکانی شاردبووەوەو تا ئەوان زیاتر قسەیان دەکرد

ئەو زیاتر لەنێو خۆیدا گرمۆڵە دەبوو و دەچووەوە نێو خۆی. هەر کە پۆیراز لەقسەکانی بووەوە، سەلمان سامی لێیوەرگرتەوە، هەر بەو شێوەیەی کە لەگەڵ ئیسحاق گەرم و گوڕانە قسەی کردبوو، ئەمجارەش وشە و رستەی هێند پڕ سۆز و کاریگەرانەی دەردەبڕین کە لەقووڵایی دڵیەوە سەرچاوەیان دەگرت. جا تۆ بڵێ چی نەگوت، بەڵام هیچیەك لەو قسانەی ئەوان کەمترین کارتێکردنیان لەسەر حاڵ و رەوشی حەسەن جێنەدەهێشت و ئەو هەروا وەکو بەرد دانشتبوو. دکتۆر هەستی بە داماوی کرد و بێدەنگ بوو. دوای ئەو موسا کازم ئاغا دەستی بە قسان کرد. ئەویش پێدەچوو باشترین ئەو قسانەی کە لەتەمەنی خۆیدا بتوانێت دەریانبڕێت دەریبڕین، حەسەن ئەمجارەش کاردانەوەیەکی تێدا بەدی نەکرا. موسا ئاغا زۆر لەمە دڵگران بوو، لەناخی دڵەوە ئاخێکی هەڵکێشاو گوتی، ئاخ مەفتەن، ئاخ نیشتمان، ئاخ کرێت، ئەگەر لەوێ دەبووم و ئەم قسانەم نەك بۆ کەسێك بەڵکو بۆ بەردێکیش بکردبوان، بەردەکە وەدەنگ دەهات.

پۆیراز دڵی بە حاڵی موسا ئاغا سووتا. دڵی بە حاڵی سووتا کە لەکرێت قسە لەقسەی نەدەکرا، قسەکانیان بەدڵ‌و بە گیان وەردەگرت، تەنانەت ئەسپ و باڵندەو گەوەزن و گوڵ و دارو درەخت و ئاغاکان و پاشاکانیش گوێیان بۆ قسەکانی ئەو رادەگرت، ئێستا ئەم حەسەنە بایەخێك بە قسەکانی ئەو نادات و تادێت زیاتر لەنێو خۆیدا گرمۆڵە دەبێت. یان ئەو بەڵاو نەهامەتیانەی کە بەسەر دکتۆر سەلمان سامی هاتبوون، زۆری نەمابوو بتەقێتەوەو دۆ و دۆشاو لێکبدا، وا لەحەسەن وردبووبووەوەو نەیدەتوانی چاوی لەسەر هەڵبگرێت. پۆیراز لەدڵی خۆیدا گوتی، باشترە جارێکی دیکەش قسەی لەگەڵ بکەمەوە. خۆی ئامادە کردو دەستی بە قسان کردەوە:

"چدەڵێیت حەسەن کاکی خۆم، تۆ ئیدی حەسەنی راکردوو نیت. ئەو هەموو خەڵکە وا بەڵێنت پێدەدەن. هەم سەرگورد دکتۆر، هەم نەقیب دکتۆر، هەم موسا کازم ئاغا، ئاغای مەزنی کرێت." دواجار قسەکانی پۆیراز گۆڕان بۆ لایلایەی دایکانە. زۆر قسەی کرد، لـێ حەسەن هەروا لە شوێنی خۆی بوو و هیچ کاردانەوەیەکی لەخۆی نیشان نەدەدا.

موسا کازم، جارێکی دیکە، بە شادترین ئەدا، دەستی بە قسە کردەوە، رەوش هەروەك خۆی بوو و گۆڕانێکی بەسەردا نەهات. موسا ئاغا بە ئاشکرا لەبەر حەسەن پاڕایەوە. پیاوێکی وا مەزن لەپای مرۆڤدۆستیی خۆیەوە خەریك بوو خۆی وێران دەکرد. ئەو کابرایە پووت و دەغەڵە کە پوولێکی قەڵپیش ناهێنێت، بووبووە بەڵای سەریان.

دکتۆر جارێکی دیکە خۆی تاقیکردەوە، دەنگ لەدارو بەردەوە بێت، لەحەسەن نەهات.

دکتۆر بە تووڕەییەوە بە بەلەموانی گوت:
"ئەوەی لە تەنیشتەوەیە رایهەژێنە، نەوەکا مردبێت."
بەلەموان توند حەسەنی راهەژاند:
"نا، نا جەناب سەرگورد، زیندووە، زیندووە، سەیری بکە جەناب سەرگورد، هەناسەش هەڵدەکێشێت. سەیری بکە سنگی بەرز و نزم دەبێتەوە. گ
دکتۆر لە کوورە دەرچوو:
"ئەمشەو دەتەوێت بۆی دەربچیت، بڵێ! نەیڵێیت، بەم دەستانەی خۆم لەدارت دەدەم. لاشەشت هەڵدەگرم و فڕێی دەدەمە بەر سەگەلی ئەو دێهاتانەی لێوار دەریا. با لاشە خۆر و سەگەل بتخۆن. ئەگەر دەتەوێت رابکەیت، هەر ئێستا رێگەت پێدەدەم بڕۆیت."
ماوەیەك تێیەوەڕاما. حەسەن ئەمجارەش بچووکترین کاردانەوەی نیشان نەدا. دکتۆر بەخێرایی و تووڕەییەوە هەستا، بەڵام یەکسەر لەجێی خۆی دانیشتەوەو گوتی: "ئاه ئەنوەر پاشا، لە کوێیت، وەرە گوللەکانی خۆت لەناو دەمی ئەم کابرایە بەتاڵ بکەوە. ئەگەر گوللەکانت بۆ گرتنەوەی ساری قامیش هەڵگرتوون، فەرمان بدە با ئەمە هەر بەم دارهەرمێیەوە هەڵبواسین."
حەسەن کاتێك گوێی لە رستەی لە سێدارەدان بوو، زۆر خێرا ئاوڕی لە دارهەرمێیەکە دایەوە، گیانی بەشێوەیەك راچڵەکی کە هەمووان تێبینیان کرد.
پۆیراز زۆر دڵی بە حاڵی حەسەن سووتا.
مەلەك خانم کە تا ئەوان زیاتر قسەیان دەکرد ئەو زیاتر لەنێو خۆی گرمۆڵە دەبوو، سەرەنجام هاتە قسە:
"ئەم بەستەزمانە کەوتۆتە چ بارودۆخێك، ترس و مەرگ لە سەرتاپای دەبارێت."
ئا لەم کاتەدا بەلەمەکەی پزیشکی ئاژەڵان لە ئەسکەلە لەنگەری گرت. شێخموس، ئوسۆی دەنگبێژ و هوسمەن بۆ پێشوازیکردن لە پزیشکی ئاژەڵان و هەروەها بۆ هێنانی ماسییەکان چوونە ئەسکەلە. پزیشکی ئاژەڵان هاتە ژێر دارچنارەکان، بەڵام کەس متەقی لەبەر نەهاتەدەر. بە بێدەنگی لەتەنیشتیان دانیشت. رەوشێکی سەیر باڵی بەسەر ئەوێدا کێشابوو. سەیری روخساری یەك بە یەکیانی دەکرد، بەڵام شتێکی دەست نەدەکەوت. ئاوا کە بە حەپەساوی و واقوڕماویەوە سەیری دەکردن دکتۆری بینی کە بە روخسارێکی سوور هەڵگەڕاو، دەمارەکانی ملی رەپ راوەستاو و شەلاڵی عارەقە بەخێرایی هەستاو پەنجەی بۆ لای حەسەن درێژ کرد:

"بەلەمێك و ئەگەر هەبێت دوو دەبەی بەنزین بدەنە ئەو کابرایە. بەنزین و سووتەمەنی نییە، هەرچی سووتەمەنیتان هەیە بیدەنێ، پارەکەی چەندە من دەیدەم، ئەو کابرایەم لەبەر چاوان دوور بخەنەوە. ئیدی نامەوێت لێرە بیبینم. هەر کوێیەکی دەیەوێت هەڵیبگرن و بیبەنە ئەوێ."

مەلەك خانم ئاماژەی بۆ قەدریی بەلەموان کرد کە هەڵیبگرن و بیبەن، بەلەموان هەستا ژێر باڵی حەسەنی گرت، ژێر باڵی دیکەیشی پزیشکی ئاژەڵان گرتی.

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "بیبەینە ماڵی ئێمە. حاڵی باش نییە. هێشتا نەیتوانیوە ترس لەجەنگ و بەڵاو مەرگ لەخۆی دوور بکاتەوە. بەداخەوە، لەماڵی من چاوەڕێ بە تاکو ماسیتان بۆ دێنم. دەتەوێت تۆ بڕۆ، من لێرە لای حەسەن دەمێنمەوە."

قەدریی بەلەموان گوتی: "من دەڕۆم."

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "باشە. دوای نانخواردنیش... زووبە بەلەموان تۆ زوو بچۆ و بگەڕێرەوە. با لە برسان نەمرین."

حەسەن لەسەر کورسیەك کە پزیشکی ئاژەڵان لەجەعفەری کڕیبوو دانیشتبوو و خۆی خڕ کردبووەوە.

پزیشکی ئاژەڵان گوتی قسەکردن لەگەڵ ئەو پیاوە هیچ سوودی نییە، قسەی نەکرد. چوو لەچێشتخانەکە چەند قاپ و چەنگاڵی هێنان و داینانە سەر مێزی نانخواردن. دۆلکەی لە ئاوی سەتڵەکە پڕ کرد، جامە ئاوێکیشی بۆ حەسەن هێنا:

"ئەمە بخۆرەوە!"

حەسەن سەری هەڵبڕی، شادییەکی هەستپێنەکراو لەسیمایدا دەرکەوت، ئاوەکەی وەرگرت، یەکنەفەس خواردییەوە.

"جامێکی دیکەش بێنم؟"

جامە ئاوێکی دیکەی هێنا، حەسەن ئەویشی خواردەوە.

((دانەیەکی دیکە؟))

حەسەن ئەویشی ئارام ئارام خواردەوە، ئەگەرچی لەنێو خۆیدا گرمۆڵە بووبوو، روخساری حاڵەتێکی هێمن و نەرمی بەخۆوە گرت. وەك بڵێیت خەریکە باشتر دەبێت. پزیشك خۆشحاڵ بوو.

پزیشكی ئاژەڵان ئیدی نەچووە لای، سەتڵێكی بەتاڵی هەڵگرت و چووە دەرەوە. هەر لەگەڵ ئەوەی قاچی لە ژوورەكە بردە دەر، بۆنی كەبابی ماسی بۆ هات، گوتی خراپ برسیمانە. خوا دەزانێت ئەو بێچارەیە لە كەیەكەوە هیچی نەخواردووە.

ماسییەكان خەریك بوون دەبرژان. پزیشكی ئاژەڵان، دوای پڕكردنی سەتڵی ئاوەكە، لە لێوی كانییەكە دانیشت.

پۆیراز پرسی: "چۆنە؟"

"سێ جام ئاوی خواردەوە. ئێستاش هاتووم هێشتا ئاوی بۆ ببەم، بەڵكو بتوانێت ماسیش بخوات."

پزیشكی ئاژەڵان سەتڵەكەی لەبەردەم خۆی هەڵگرت و هەستا.

بەلەموان گوتی: "تۆ بڕۆ، من هەر لەگەڵ ئەوەی ماسییەكان برژان خۆم بۆتیان دێنم."

موسا ئاغا پرسی: "بەلەموان، تۆ گوتت ئەوت لەنێو دارهەنجیرەكان، لەسەر درەختێكی گەورە بینیووە؟"

"هەموو شوێنێكی دوورگە گەڕام. رەنگبێت دە جار بەنێو دارهەنجیرەكان رەت بووبم، پیاو چ بیر لەوە بكاتەوە سەیری سەرەوە بكات. بێئومێد بووبووم، پێموانەبوو ئیدی بیدۆزمەوە، خەریك بووم هەروا بەوێدا دەڕۆیشتم كە لەسەرەوە دەنگێكم بیست، وامزانی باڵندەیە كە لەسەر درەخت هەڵنیشتووە. یەك دوو هەنگاو چووبوومە پێش كە هەستم كرد وەك بڵێیت لكێك شكا. ئاوڕم دایەوەو سەیرێكی درەختەكەم كرد. سەیرمكرد بینیم تاكە پێڵاوێك لەنێو گەڵاكانی درەختەكە كەوتووە. پاشان بینیم دوو تاكە پێڵاون. چوومە ژێر درەختەكە و بانگیم كرد، لەوێ وەرە خوار. ئەگەر یەكسەر نەهێیتە خوار لێتدەدەم و لەوێت دێنمە خوار. من ئەم قسانەم دەكرد كە لەپڕ سەریمكرد حەسەن لەو سەرەوە كەوتە خوار لەنێو چەمەنەكە و لەبەر دەممدا خڕبووەوە نێو خۆی. بەسەر سەریەوە چاوەڕێم كرد. بە سەختی سەری خۆی بەرزكردەوە، بە دەنگێكی نزم و نووزەئاساوە گوتی، تۆ بۆچی دەتەوێت من بگریت و بمبەیت لە سێدارەم بدەن قەدریی بەلەموان، چۆن دڵت دێت ئەو كارەم لەگەڵدا بكەیت، ئەگەر بزانیت گیانی خۆم چۆن دەربازكردووە، یەكسەر وازملێدێنیت، دەبەیەك بەنزینیشم دەدەیتێ، منیش هەموو پارەكانی خۆمت دەدەمێ. پارەیەكی زۆرم هەیە. تۆش دەوڵەمەند دەبیت و هەم گیانی كەسێكیش لە مردن رزگار دەكەیت. پێمگوت بڕیار نییە لەسێدارەت بدەن، ئەو سەرگوردەی كە لەشارۆچكەیە بڕیارە كارتی كۆتایی خزمەتی

سەربازیت بداتێ. ئێستا هەستە. ژێر باڵم گرت و هەڵمستاند. لە ڕێگا تا توانیم قسەم بۆ کرد، پێمگوت کاك دکتۆر بەڵێنی لە سەرگورد وەرگرتووە. لەسەر حەوت کانی ئاوم پێداو خواردیەوە. چاوەکانی بە تەواوی ڕەش و سپی بووبوون. جەستەی گەرم نەبوو. قسەکانمی نەدەبیست من مردوویێکم هێناوەتەوە ئێرە."

سەلمان سامی گوتی: "دەترسم دواجار خۆی خۆی بەدارەوە هەڵبواسێت".

بەلەموان ئەو ماسیانەی کە لەسەر پەنگران برژابوون و دووکەڵیان لێهەڵدەستا هەڵگرتن و دایانانە نێو قاپێکی گەورەو بۆ پزیشکی ئاژەڵانی بردن. حەسەن هەر کە بۆنی ماسیانی بۆ هات چاوەکانی کردنەوەو لە ماسیەکانی کە بەلەموان لە ناوەڕاستی مێزەکە دایانابوون راماو دەمی پڕ بوو لە ئاو. تا ئەودەمەی پزیشکی ئاژەڵان لە چێشتخانەکە نەگەڕایەوە چاوی لەسەر ماسیەکان هەڵنەگرت. پزیشکی ئاژەڵان نان بەدەستەوە بۆ لای مێزەکە گەڕایەوە، سەبەتەی نانی دانایە نێوەڕاستی مێزەکە، چوو حەسەنی کە هەروا چاوی لە ماسییەکان نز کردبوونەوە، هەڵگرت و لەسەر کورسیەك داینا، لە قاپەکەی خۆی ماسی دایێ، سەبەتەی نانەکەی لەبەردەم دانا. سوراحیە بە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ نەخشێندراوەکەی لە ئاوی پاکی سەتڵەکە پڕ کرد.

حەسەن لەپڕ داگژایە ماسییەکان. پزیشکی ئاژەڵان هێشتا نیوەی ماسییەکانی خۆی نەخواردبوو کە ئەو بەشەکەی خۆی تەواو کردن و بە حاڵەتێکی پاڕانەوەئامێز سەیری پزیشکی ئاژەڵانی کرد. پزیشکی ئاژەڵان هەم ماسییەکانی نێو قاپەکەی خۆی و هەم ئەوانەی ناو سینییەکەی دانانە بەردەم حەسەن. حەسەنی ڕاکردوو ئەمجارەش بە تەڕدەستی دەستی کرد بە خواردنی ماسییەکان بە نان و ئاوی بەسەرداکرد. بەلەموان یەکسەر سینییەکەی سەر مێزی ڕفاند، گوتی: "ماسی زۆرە، ماسی زۆرە، هەر ئێستا دەچم دەیانهێنم." ڕایکرد و چوو سینییێکی پڕ ماسی برژاوی هێنا. حەسەن، دیسان پەلاماری بۆ بردن، ئەوەندە تێر بووبوو کە جووڵەی لەبەر بڕابوو. هێشتا ماسییەکی زۆر لەنێو سینیەکە مابوون. ئەوانیش پزیشکی ئاژەڵان خواردنی.

حەسەن نەیدەتوانی لەجێی خۆی هەستێت، بە چاوانی داکەوتوویەوە سەیری ئەملاو ئەولای دەکرد.

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "بەلەموان، نوێنێك لەم ژوورە ڕابخەین، حەسەن هەر خەریکە لەخەوان دەمرێت، با بیخەوێنین. بخەوێت دێتەوە سەرخۆی."

یەکسەر نوێنەکەی ئامادەکرد، حەسەنیان بردە ژوورەکە، جلەکانیان لەبەر کردەوەو خستیانە نێو جێگا. حەسەن هەر سەری دانایە سەر بالیف خەوی لێکەوت و رۆژی دواتر نزیکەی نیوەڕۆ لەخەو هەستا. مات و حەپەساو بە چاوانی تژی ترس سەیری دەوروبەری کرد. لێفەکەی لەسەرخۆی هەڵگرت و بەرزی کردەوە، وەك ئەوەی بیپشکنێت. لەپەنجەرەوە تیشکی خۆر بە ئەندازەی سینیەك لەلێفە پڕ لەنەخش و نیگارە گوڵە وەنەوشەییەکان کەوت. هەر لەگەڵ بیستنی دەنگی پێی پزیشکی ئاژەڵان کە هاتە ژوورەوە، چاوی لەسەر تیشکی خۆرەکە مالّق مان.

"یاللا هەستە بەرچایی ئامادەیە."

"من لەکوێم؟ تۆ کێیت؟"

"من پزیشکی ئاژەڵانم، تۆ لەماڵی منی. زووبە هەستە، بە ئەندازەی دوو سەتڵ و مەسینەیەك ئاومان هەیە، خۆت بشۆ. دوای نانخواردن من ریشت دەتاشم."

حەسەن هەرچی هەوڵیدا نەیتوانی هەستێت. پزیشکی ئاژەڵان باوەشی لێداو هەڵیگرت و بردیە حەمام. ئاوی یەکێك لەسەتڵەکان گەرم بوو، پزیشکی ئاژەڵان ئەوی لەسەر کورسیەکی بچووك دانا، پاشان بە سابوونێکی بۆندار، سەرو قژو بەدەنی حەسەنی جوان و خاوێن شووشت، جلەکانی کردنەوەبەر و ژێر باڵی گرت و بردی لەسەر مێزەکە داینیشاند. چاوەکانی حەسەن بە بینینی ئەو خواردنانەی سەر مێز زەق بوونەوەو لەناکاو وەکو دوێنێ شەو پەلاماری سفرەکەی دا. کاتێك سفرە هیچی لەسەر نەما، سەیری پزیشکی ئاژەڵانی کردو گوتی:

"منیان لەسێدارە نەدا، وانییە؟" بە لاکەلاك یەکڕاست چووەوە لای جێگاکەی، لێفەکەی کردەوەو خۆی خستە ژێری و راکشا.

پزیشکی ئاژەڵان رایکردو یەکڕاست بەرەو ئەسکەلە چوو، سواری بەلەمەکەی خۆی بوو و رۆیشت بۆ ماسیگرتن. تا شەو داهات هەر خەریکی ماسیگرتن بوو. کە هەردوو لەگەنی تایبەتی ماسیان پڕ بوون لەماسی، گەڕایەوە دوورگە. بەر لەوەی ماسیەکان لە لەگەنەکە دەربێنێت چووەوە ماڵەوە، لێفەی لەسەر حەسەن لادا، حەسەن خەوی لێکەوتبوو و لەخەودا لێوەکانی لێکدەسووین، بە بینینی ئەو خۆشحاڵ بوو. دوو دانە سەتڵی لەحەمام هەڵگرتن، چەند دانە لەماسیەکانی نێو لەگەنەکەی جیاکردنەوەو داینانە نێو سەتڵەکە. یەکەمجار چووە لای پۆیراز، لێنا هاتە پێشوازیکردنی.

"لە دەریا ماسی لەرەلەریان بوو. زۆرمگرتوون، چەندی دەتەوێن لەسەتڵەکە هەڵیانگرە."

لێنا یەکسەر سەتڵێکی هێنا:

"چەند باشە، چەند باشە، هێشتا هەر جووڵە جووڵیانە."

"هەر ئێستا لەلەگەن هێناومنەتەدەر. کە دەشگەڕامەوە بەردەوام ئاوەکەم لێدەگۆڕین. بەلەم بە لێوی ئەسکەلەی کێشاو چەند دانەیەکیان کەوتنە سەر تەختەکە. لەسەر تەختەکە هەر هەڵدەبەزینەوە. تا خۆم گەیاندنێ کە هەڵیانبگرمەوە لە پەلوپۆ کەوتبوون."

کاتێك لێنا ماسیەکانی هەڵدەبژاردن و هەڵیدەگرتن، ماسیە زیندووەکان لەنێو دەستی دەخلیسکان و خێرا کۆی دەکردنەوە.

پزیشکی ئاژەڵان یەك بە یەك بە ماڵەکاندا گەڕاو ماسییەکانی نێو لەگەنەکەی لەنێوان مەلەك خانم، موسا ئاغا، دکتۆرەکان و ئوسوی دەنگبێژ دابەش کرد. ئەو ماسیانەی کە ماشبوون بەر لەوەی بیانباتەوە ماڵەوە، لەلێوار دەریا پاکی کردنەوە. کە هاتەوە ماڵ سەیری کرد حەسەن هێشتا هەر خەوتووە. لێفەی بەرزکردەوەو سەیرێکی کرد، روخساری حەسەن حاڵەتێکی ئارامی هەبوو و تەواو دیاربوو کە ئەویان لەنێو دارستانی خەونەکانیدا هەڵنەواسیبوو بە خۆشحاڵیەوە بەرەو لای دوکانەکان چوو، هەمووان لەژوورەوە دانیشتبوون. لەگەڵ بۆنی خەستی دەریا لەدەرگاکە چووە ژوور. دکتۆر سەلمان سامی بە راوێژێکی گاڵتە ئامێزەوە گوتی:

"لەکوێ بوویت بەڕێز پزیشکی ئاژەڵان."

"چووبوومە راوەماسی، قوربان."

دکتۆر بە پێکەنینەوە گوتی: "ئاشکرایە. بۆنی هەموو دەریاکانیشت کۆکردۆتەوەو لەگەڵ خۆتدا هێناوتە. ماسیشت گرتوون؟"

"گرتوومن، قوربان."

"کەوایە ئەمڕۆ میوانداری ماسیخواردنمان هەیە."

"هەمانە قوربان هەمانە. ماسی زۆرە، هەردوو لەگەنەکانم پڕ کردوون. هەر لێکلێکەش ئاوم لێدەگۆڕین تاکو ماسیەکان نەمرن. کاتێك خەریك بووم ماسیەکانم دابەش دەکردن، لەسەتڵەکان هەڵدەبەزین و خۆیان فڕێ دەدایە دەرەوە."

"بۆ ئێمەشت بردن؟"

"بردنم قوربان."

"خزمەتکارەکەی ماڵی ئێمە ماسی لێنان دەزانێت؟"

"ژنەکانیماڵی ئێوە خەڵکی ناوچەی دەریای رەشن، ئەوان لەخواردنی ماسی بترازێت هیچ خواردنی دیکە نازانن. بۆ نموونە ماسی کوڵی بە هەزار شێوە لێدەنێن."

"تێگەیشتم، کاك جەمیلی پزیشکی ماسیگر."

"ئەوەشم بە ژنەکانی ماڵی ئێوە گوت کە بچن لەباخچەکان لەنێو بڕکە تەماتە وشکبووەکان تەماتەی سوور جیا بکەنەوەو بیبەری سەوز و کەرەوزیش بێنن. لەهەردوولای کانیەکە تا ئاوڕێژگەی دەریا گیای پوونگە کە پێیدەگوترێت نەعناع هەیە، پێمگوتن ئەویش بێنن. گوتم، ئەگەر لەماڵێ سرکەی هەنارتان نییە، بە لێنا بڵێن با بتانداتێ، پیازی تازەش لەباخچەدا هەن، ئەگەر نەشبوون دەتوانین پیازی وشك بەکاربێنین."

موسا ئاغا گوتی: "ئێمە سرکەی هەنارمان لەماڵێ هەیە، زۆرمان کڕیوە، تەنانەت ئەگەر لەماڵی ئێمەش نەبوو، لەماڵی تاناسیی پیاوچاك هەر دەبێت."

"هەربژی پزیشکی ئاژەڵان، کوڕم. حەسەن حاڵی چۆنە؟"

"خەوتووە. نانی بەیانیم دایێ، هێندە بەمگێزەوە خواردی کە هیچی لەسەر سفرە نەهێشتەوە، فراوینیش هەروا، خێرا خێرا خواردنەکان دەخوات و تەواویان دەکات، پاشان خێرا دەڕوات و خۆی دەگەیەنێتە نێو جێگاو یەکسەر دەخەوێت."

"دەیەوێت هەروا بخەوێت؟"

"نا، یەك دوو رۆژی دیکە هەڵدەستێتەوە. هەر هەڵیشستێتەوە دێتە لای من."

"واتە راناکات؟"

"بۆ هیچ جێیەك ناڕوات. تەنانەت هەڵیبگرین و فڕێی بدەینە ئەوبەری دەریاش دەگەڕێتەوەو دێتەوە ئێرە، ئەگەر ترسەکەی رژابێت. دکتۆر، تۆ خۆت دەتگوت مرۆڤەکان کاتێك کەوتنە رەوشێکی ناهەموار و تاقەتپروکێن ترسی خۆیان سەرکوت دەکەن و بەسەریدا زاڵ دەبن."

پزیشکی ئاژەڵان لەو رۆژە بەدواوە بۆ ماوەیەك خۆی دەرنەخست، بەخێرایی دەڕۆیشتە راوەماسی و دەگەڕایەوە. هەموو رۆژێ هەڵدەستا، بەرچایی لەگەڵ حەسەن دەکردەوە. حەسەن لەگەڵ تەواوکردنی بەرچایی دەچووەوە نێوجێگاو خەوی لێدەکەوت. پزیشکی ئاژەڵان هەر جارێك کە لە راوەماسی دەگەڕایەوە دەیبینی حەسەن خەوتووە. کاتی فراوین و ئێواران مەلەك خانم و لێنا ماست و خواردنی خۆش خۆشیان کە بۆ حەسەن دروست دەکرد، بۆیان دەهێنا.

حەسەن رۆژی سێیەم، بەرلەوەی کەڵەشێری بەرەبەیان بخوێنێت لەخەو هەستا، بۆ ئەوەی پزیشکی ئاژەڵان لەخەو هەڵنەستێنێت بە ئەسپایی چووە گەرماو، بە هێواشی دەرگای گەرماوەکەی پێوەدا، وەکو پشیلە لەپلیکانەکان چووەخوار. چووە سەر کانی، سەتڵەکانی پڕ ئاوکرد. دووبارە بە بێدەنگی لەپلیکانەکان بەسەر کەوتەوە، دووبارە بە ئارامی چووەوە گەرماوەکە، دەرگاکەی بە هێواشی داخست، جلەکانی داکەند، بیری کردەوە پێویست ناکات ئاو گەرم بکات، شلەتێن بوو، بەسابوونە بۆندارەکەی پزیشکی ئاژەڵان جوان و خاوێن خۆی شوشت، بە خاولیە گەورە نارنجیەکەی پزیشکی ئاژەڵان خۆی وشك کردەوە، تەنها شەلوارەکەی کردەوەبەر. چوو لەنێو بەلەم جلەکانی ژێرەوە و جلە خاوێن و تازەکانی هەڵگرت، دەبوا چەکمە ئاوەزێنەدار و بریقەدارەکانیشی کردبوانە پێی، کراسە یاخەدارە نوێ نوێیەکەشی دەبوا هێنابوا. گوێزانی ریشتاشینەکەی لەناو بەلەم بوو، ئەگەر ریشی بتاشیبوا درەنگ دادەهات، پزیشکی ئاژەڵان هەڵدەستاو وایدەزانی رایکردووە. گویزان و جلەکانی هەڵگرتن، گەڕایەوە، بە بێدەنگی بە پلیکانەکاندا بەسەرکەوت، سەیری کرد پزیشك هێشتا لەپرخەپرخی خەودایە، خۆشحاڵ بوو، یەکسەر چوو ریشی بتاشێت، هات لەسەر مۆبلێکی نەرم دانیشت، چووە نێو فکرو خەیاڵان، دواجار لەخۆی دەهری و تووڕە بوو، گوتی، کەللەڕەقی نەفرەتی، سەروان و سەرگورد پێتدەڵێن جەنگ تەواوبووە، جەنگ تەواو بێت سەرباز لەسێدارە دەدەن؟ خراپ کەوتبووە بیرکردنەوە، لەناکاو هەستا، گوتی: "دەبا هەر لەسێدارەم بدەن، با بیکەن، کوڕە، چەندجار مردیت و زیندوو بوویتەوە؟ چەند جار، چەند جار، مردیت و زیندوو بوویتەوە؟ بەسە. جارێك دەمرم و هەموو شتێك تەواو دەبێت."

"حەسەن هەستاویت؟"

"هەڵبەتە کە هەستاوم، تەنانەت بەر لەوەی خۆر هەڵبێت، خۆم شووشتوە، پاك بوومەتەوە، ریشیشم تاشیوە، چووم جلەکانم لەنێو بەلەم هێنان، پاشانیش بووژامەوە."

پزیشکی ئاژەڵان لەدڵی خۆیدا گوتی دەبێت چی روویدابێت کە راوێژی ئاوا پڕە لەشادمانی. چی روویداوە، ئەم ماستە مووێکی تێدایە. پزیشکی ئاژەڵان لەهەمانکاتدا خۆشحاڵ بووبوو، نیگەرانیش بوو. یەکسەر چوو سەیرێکی دەمانچەکەی کرد، دەمانچە لەشوێنی خۆی بوو. لەبەر خۆیەوە گوتی پیاو لەو کارانەی ئەو کابرایە کردوونی ترساوە.

کاتێك پزیشکی ئاژەڵان خەریکی ئامادەکردنی قاوەڵتی بوو حەسەنیش یارمەتیدا. دوای دانانی خواردنەکە لەسەر مێز، حەسەن بە ئەدایەکی گەرم و نەرم گوتی: "من ئێستا دەچم لەکانی ئاو دێنم."

"زوو وەرەوە."

حەسەن سەتڵەکانی هەڵگرت، بەخێرایی رۆیشت، کەمێك دواتریش بە سەتڵی پڕ لەئاوەوە گەڕایەوە، دۆلکەی پڕ کرد لەئاو. سەری لەچای سەر ئاگردانەکەدا، پەنگرەکانی تێکوەردان، گڕەکە کتریەکەی گرتەخۆ، ئاوەکە هاتە جۆش. پزیشکی ئاژەڵان لەپشت مێزەکە دانیشتبوو و سەیری شێوەی چالێنانەکەی حەسەنی دەکرد تەواو حەپەسابوو.

حەسەن چایەکی وەکو خوێنی کۆتری لەنێو پیاڵەی کەمەرباریك هێنا. تا تەواوکردنی بەرچایی هیچکامیان متەقی نەکرد.

حەسەن پیاڵەو کەلوپەلەکانی کۆکردنەوە، قاپەکانی شووشتن. لەبەرامبەری یەکدی لەسەر کورسیەکان دانیشتن.

ئاسۆگە ڕووناك داهات کەمێك دواتر خۆرهەڵات، بۆنی ئارامبەخشی دەریا لەگەڵ شنەبای بەرەبەیاندا هات.

حەسەن گوتی:

"گوایە لەو سەرەوە کانیەك هەیە کە بنی کانیەکە هەموو وردە بەردی سپی تێدایە."

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "وایە."

"دەتەوێت سەرێك لەوێ بدەین، تا خۆر بە تەواوی هەڵدێت دەگەڕێینەوە."

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "باشە، دەچین."

بەنێو دارزەیتوونەکاندا بۆ لای سەرەوە رۆیشتن، هەموو لایەك بۆنی پوونگەی لێدەهات. پوونگەکان تا ئەژنۆ هاتبوون و گوڵە بچووکە شینەکانیان پشکوتبوون. بەدرێژایی ڕێڕەوی ئاوی کانییەکە لەسەرەوە بۆ خوارێ دوو ڕێچکەی شینباو درێژبووبوونەوەو ئاوێکی زوڵاڵ و شینیان بەنێودا دەڕژایە خوارەوە. چوون، یەکێکیان لەملاو ئەوەی دی لەولا دانیشتن. بێئەوەی سەریان هەڵببڕن رۆخ کانییەکە و وردە بەردەکانیان سەیر کرد. هیچ قسەیەکیان نەکرد. ئەوکاتەی کە تیشکی خۆر لەئاوی کانیەکەی دا و ئاوەکە لەسەر بەردێکی ساف کە ڕەگی سووربڕاوی تێدابوون لەریەوە، هەستان، بە ڕێڕەوی دارزەیتوونەکان و ڕێڕەوی ئاوی کانیەکە، لە کاتێکدا کە قاچیان

ڕۆدەچووە نێو پوونگەکە بەرەو لای خوارەوە سەرو ژێر بوونەوە، هاتن و لەژێر چنارەکان دانیشتن. لەدوور دوورەوە، لەلای دارهەنجیرەکانەوە دەنگی باڵندەیەك هات. پزیشکی ئاژەڵان پرسی:

"ئەمە دەنگی چ باڵندەیەکە؟ لەشارەکەی ئێمەیش دەنگێکی ئاوام بیستووە، بەڵام کەس نەیدەزانی دەنگی چ باڵندەیەکە.

حەسەن گوتی: "من چ بزانم، من چەندین ساڵە لەنێو دەریام، لەدەنگی مەلی دەریا بترازێت دەنگی هیچ باڵندەیەکی دیکەم نەبیستووە، تەنانەت نازانم ماسیەکان دەنگیان هەیە یان نا، چونکە قەت گوێم لەدەنگیان نەبووە."

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "هەموو گیاندارێك دەنگی خۆی هەیە، بەڵام ئێمە ناتوانین دەنگی هەموویان ببیستین."

حەسەن گوتی: "ڕاستە. من پێشتر لە پشت دارهەرمێیە گەورەکەوە ڕەت دەبووم، ڤاسیلی لەبن درەختەکە لەگەڵ پشیلەکەی دەدوا. ڤاسیلی دەیگوت و پشیلەکە میاوە میاوی دەکرد. منیش لەپشت درەختەکە دانیشتبووم و گوێم لەگفتوگۆیەکەیان ڕاگرتبوو. ڤاسیلی یەکەمجار بە تورکی قسەی دەکرد، پاشانیش لە پڕێکدا بێدەنگ بوو. ئەو تا ئەو دەمەی بێدەنگ بوو پشیلەکە هەر میاوە میاوی دەکرد، پاشان سەری هەڵبڕی، سەیری لق و پۆپەکانی درەختەکەی کرد، سەیری ئاسمانی بان چیای بەرامبەر، هەورەسپییە ڕێبوارەکان، دەریای بەرامبەری و دواجار پشیلەکەی کە بێپسانەوە دەنگی لێوە دەهات، کرد. گوتی: "بێدەنگ بە هاوڕێ، بێدەنگ بە. پاشانیش دەستی کرد بە قسەکردن بە یۆنانی. من لەیۆنانیش دەگەم. زیاتر لەنیوەی دانیشتووانی گوندەکەی ئێمە یۆنانی بوون. گرووپی عوسمان تۆپاڵ هات و شەوێك هەموویانی کوشت، ڕاکردووەکان لەسەر چیا دەگیران، لەچیا هاتمە خوار، پێشتریش لەچیا هاتبوومە خوار، پاشان نەمتوانی بمێنمەوە، دووبارە ڕامکرد و گەڕامەوە چیا. هەرسێ جارانیش کەوتبوومە داوەوە. لەگوند باوکم گوتی عوسمان تۆپاڵ بەڵای خواوەندە. لەهەر جێگایەك یۆنانی ببینێت دەیکوژێت. لەسەر چیاش پیاوانی خوار تەمەن چل ساڵی دەکوژێت، ئەو هەزار جار لەئەنوەر پاشا خراپترە."

"بۆچی پیاوەکانی دەکوشت؟"

"بۆچی دەیکوشتن؟ لەبەر ئەوەی سەربازی ڕاکردوو بوون."

"چۆن دەزانی کەسێکی چیانشین سەربازی ڕاکردووە؟"

"بەچیەوە، بەچیەوە دەیزانی سەربازی راکردووە، باوکم گوتی کوڕەکەم ئیدی مەچووە چیا. تەنانەت پیاوەکانی چیانشین کە ردێنیان تا ئەژنۆیان درێژ بووبووەوە بۆ ئەوەی ناوی سەربازی راکردوویان لەسەر هەڵبگیرێت لەچیا دەهێنە خوارەوە، دەهێنە دەشت و دەریا. هیچم بە باوکم نەگوت. باوکم پارەی دامێ، گوتی برۆ خۆت بە سوپا بناسێنە. چووم، لەگوندێك کە سێ گوند لەولاتری گوندەکەی ئێمەوە بوو، بەلەمێکی ماتۆڕدارم کڕی کە لەیۆنانیەکانەوە بەجێمابوو، لەو یۆنانیانەی کە بەدەستی عوسمان تۆپاڵ کوژرابوون. سەیرمکرد بینیم نزیکەی هەموو دێهاتیەکان دەشەلن، قاچی یەکدیکەیان پێکابوو و هەموویان شەل بووبوون. نەدەچوونە سەربازی، بەڵام لەجیاتی ئەوە لەشەلبوون بترازێت چارەیەکی دیکەیان نەبوو. لەو رۆژە بەدواوە منیش خۆم کردە شەل، تا ئەو رۆژەی هاتمە ئێرە هەر بە شەلی بە رێگادا دەڕۆیشتم، ئەوەندە خووم بە شەلبوونەوە گرت کە دواجار هەر بەڕاستی شەلنەبوونم لەبیرچووبووەوە. تا ئەو رۆژەی هاتمە ئێرە..."

"چۆن هاتیتە ئێرە؟ ئەم دوورگەیەت چۆن دۆزیەوە؟"

"دوای ئەوەی کە بەلەمە ماتۆڕدارەکەم لەو گوندە کڕی. من بەر لەوەش بچمە سەربازی ماسیگر بووم، تا ناوچەکانی خوارەوە دەچووم و خەریکی ماسیگرتن و پارە کۆکردنەوە دەبووم. چوومە شاری گەورەو بینیم ئەسکەلە پڕە لە بەلەمی ماتۆڕدار. سەیرمکرد پیاوێکی ریشدرێژ کە سیمایەکی نوورانی هەبوو دەیانفرۆشێت، خاوەنەکانی ئەو بەلەمە ماتۆڕدارانەش عوسمان تۆپاڵ کوشتبوونی. لەو کابرایەی کە بەلەمەکانی دەفرۆشت پرسیم بۆچی ئەوانەی کوشتووە، کابرایەکە گوتی من بە چاوی خۆم بینیم، لەسەر ئەو شەقامە درێژەی ئەم شارۆچکەیە هەموویانی تا دوایین کەس بە دارەوە کرد، بۆچی لەسێدارەی دان، مەگەر سەربازی راکردوو بوون؟ پیاوە ریشدارەکە گوتی، ن...ە، یۆنانی بوون سەربازی راکردوو گوللەباران دەکەن، گوتم کەوایە، لەوەتەی من بەلەمم کڕیوە، لەدەریا بەدوای سەربازی راکردوودا ناگەڕێن. یەك دوو رۆژ هەموو بەلەمەکانم یەك بە یەك سەیرکردن، بەلەمێکم دۆزیەوە کە تازە رەنگ کرابوو و بۆنی بۆیاخی لێدەهات. ماتۆڕەکەی تازە کرابووەوە. لەگەڵ کابرای ریشدار لەسەر نرخەکەی زۆر بە بەریەك هەڵچووین، ئەوەندە بە بەریەك هەڵچووین کە پیرەمێرد رۆحی هاتبووە سەری کەپووی، بەلەمە ماتۆڕدارەکەم بە نرخێکی هەرزان لێکڕی. منیش بەلەمەکەی خۆمم دایە ئەو، پێمگوت براکەم ئەمەش با بۆتۆ بێت، بیفرۆشە. دەتوانم بڵێم لەدێهاتەکان نەمامەوە، دوای ئەوەی ماسیەکانم فرۆشت، کەنداوێکم دۆزیەوە. بەلەمەکەمم بردە ئەوێ، گوتم ئێستا کە دەریا ئارام و بێدەردەسەریە بابچم بۆخۆم

دوورگەیەك بدۆزمەوە، هەروا كە بە ڕێگاوە ماسیم دەگرتن و ماسیم دەفرۆشتن لە دەریای ڕەش ڕەت بووم و پەنام هێنایە ئەم دوورگەیە، لێرە بە شەلە شەل خەریكبووم بە ڕێگادا دەڕۆیشتم كە خەدیجەم بینی. لەدڵی خۆمدا گوتم خواوەند ئەم هەموو جوانیەی چۆن ئافراندووە و یەكسەر ڕۆیشتنەكەی خۆم ئاسایی كردەوەو وازم لەشەلەیی هێنا. لەهەمانكاتدا بوو كە پۆیراز منی بینی، ئیدی نەمدەتوانی خۆم بە شەل نیشان بدەم، كە خەدیجەم بینی، گوتم لێرە دەمێنمەوە، متمانەم بە كاك پۆیراز كرد، وەكو گەمژەكان بابەتی ڕاكردنەكەمم بە پۆیراز گوت. ئەوەی دیكەش خۆت دەزانیت و ئاگات لێیە، دەیانەوێت چیم لەگەڵدا بكەن؟ ئاه گەمژەی كەللەپووك پۆیراز ژیانی خستمە مەترسییەوە."

"لێرە لەو كەسانەی كە جگە لەكوشتن و لەسێدارەدان كارێكی دیكە نازانن هەواڵێك نییە، من هەموو شتێكم بۆ باس كردیت."

حەسەن چەناگەی خستە سەر سنگی و داما، لەودەمەدا موسا كازم ئاغاش هاتە لایان، بە پێكەنینەوە:

"وای، باش بوو تۆم بینی حەسەن، نەچوویتە لای دكتۆر سەلمان سامی؟ بەدواتدا دەگەڕێت."

ڕوخساری حەسەن وەكو كاغەز سپی سپی هەڵگەڕا.

"مەترسە حەسەن، كاك سەلمان بۆیە بەدواتدا دەگەڕێت یارمەتیت بدات. یاللا با بتبەم لای ئەو."

حەسەن بێدەنگ بوو بوو.

"بابچین مام ئاغا، با لەگەڵ كاك پۆیراز موسا بچین. من دەچم لە ماڵەوە بانگی دەكەم و لەگەڵ خۆمدا دەیهێنم."

تا ئەودەمەی كە پۆیراز و پزیشكی ئاژەڵان لەماڵەوە هاتنەدەر، ڕاوەستان و چاوەڕێیان كرد، پاشان هەموویان پێكەوە بەرەو لای دوكانەكان بەڕێكەوتن دكتۆر سەلمان سامی و دكتۆر خەلیل ڕەفعەت لەسەر كورسییێك بە ئارامی دانیشتبوون و لەكاتێكدا دەستەكانیان دەجووڵاند سەرگەرمی قسەكردن بوون.

"فەرموون قوربان، بەخێربێن، سەفاتان هێنا، فەرموون."

لەسەر كورسییەكان دانیشتن، حەسەن بەپێوە مایەوە. كورسییێكی بەتاڵ لەبەرامبەری بوو، سەری دانەواندبوو و ئەوەی جووڵەیە لە ڕوخساری بەدی نەدەكراو ئاوا ڕاوەستابوو، كەس بە

حەسەنی نەگوت دابنیشێت. لەگەڵ یەکدا دەربارەی ڕێوڕەسمی ڕەمزی کاولاك قسەیان کرد. لەلایەك پێدەکەنین، لەلایەکی دیکە هەموویان پێکەوە جنێویان بە ڕەمزی کاولاك دەدا. دکتۆر سەلمان سامی لاسایی کاولاکی دەکردەوە، لاسایی دەنگەکەی دەکردەوەو بە هەمان دەنگ و راوێژەوە لاسایی وتارخوێندنەکەی ئەوی دەکردەوە، ئەو کەسانەی دەستدرێژیان کردە سەر ئەم نیشتمانە، هەر لەم نیشتمانەدا نوقمی نێو خوێنی خۆیانمان کردن. دەیگوت لاشەکانیان بەسەر یەکدا کەڵەکە بووبوو و بۆنی گەنیوی لاشەکانیان دنیای پڕ کردبوو. پاشەملەی کاولاکی دەکرد و لە هەمانکاتیشدا سەیری حەسەنی دەکرد کە بەپێوە وەستابوو. لەپڕێکدا قسەکانی بڕی، بە دەربڕینێکی ساردو جیددی بە حەسەنی گوت: "چما ئاوا سەرت وەکو منداڵی بێ داك و باب کەچ کردووەو لەوێ وەستاویت، وەرە دانیشە!"

حەسەن بە هێمنی هەنگاوێك چووە پێش، لەسەر کورسییەکە دانیشت و لەنێو خۆیدا خڕبووەوە سەریەك.

"هەر ئێستا دەچینە شارۆچکە یان بەیانی؟"

"ئەمڕۆ بچین باشە، دکتۆر، سبەیش دەچین جەنابی سەرگورد ئیسحاق و وەهاب بەگ و عوزێرخان و بەرپرسی بەڵگەنامەو تاپۆ دەبینین، شەویش دەگەڕێینەوە. جەناب سەرگورد ئێوە فەرمایشێکتان نییە؟"

"بۆچی، منیش لەگەڵتاندا دێم."

پۆیراز دەستە پاچە بوو:

"تەشریف بێنن جەنابی دکتۆر، تەشریف بێنن، تەشریف بێنن، سەرچاو و سەرسەرمان، بەهاتنی ئێوە کارەکەمان ئاسانتر دەبێت."

"بەڵام ئەو کابرایە کاولاکە، جاولاکە چییە، لەماڵی ئەو نامێنینەوەو سڵاویشی لێناکەین، ئەو سەربازە راکردووەی کە هەموو دوورگەی تالاّن کردووە، خانووەکانی سووتاندون و هەموو درەختەکانی بڕیوونەتەوە. پێمخۆشە عوزێر خانیش ببینم، ئەو پیاوە رەسەن و نەجیبزادەیە."

"دەچینە لای عوزێرخان و لەماڵی ئەودا دەمێنینەوە."

"چوار کەس بین زۆرە، نیوەمان دەچینە ماڵی خەیری ئەفەندی. بەڵکو عوزێرخانیش بانگهێشتی ئەوێ بکەین."

"عوزێرخان قبوڵ ناکات، قوربان."

"ئەگەر وابوو دوو کەسمان دەچینە لای عوزێرخان و دووانیشمان دەچینە ماڵی خەیری ئەفەندی، ئەگەر هەموومان بچینە لای خەیری ئەفەندی زۆر خۆشحاڵ دەبێت."

سواری بەلەمەکەی پزیشکی ئاژەڵان بوون، دەوروبەری عەسر گەیشتنە شارۆچکە، چوونە دووکانی خەیری ئەفەندی.

خەیری ئەفەندی گوتی: "جەعفەر بەیانی قاوەی هێناوە، قاوەیەکی تفت پێکەوە دەخۆینەوە." کەیفی ساز بووبوو.

"کورِم، با قاوەکان سەربەکەف بن."

پەنگرەکانی نێو مەقەرەکە هێشتا نەبووبوونە خۆڵەمێش، گەنجەکە بە سینییێکی زیوین قاوە سەربەکەفەکانی هێنا، نێو دووکان پڕ بوو لەبۆنی قاوە.

دکتۆر سەلمان سامی:

"دەزانن مرۆڤ بۆچی ئەوەندە حەز لەقاوە دەکات، لەبەر بۆنەکەیەتی، بەڵام تەنها وەستایەکی وەکو ئەم گەنجە دەتوانێت ئاوا قاوەی بۆنداری سەر بە کەف دروست بکات، ئاوا قاوەیەك..."

"دکتۆری هێژاو نووری چاوەکانی من، ئەو بەو ئاسانییە نەبۆتە وەستا، دروستکردنی قاوەی باش و سەربەکەف و بۆنخۆش کارێکی ئاسان نییە. یەکەمجار قاوەکە دەبێت باش هەڵبشێویت، ئینجا لەنێو هاوەندا بیهاڕیت. زۆر زۆر وەستایی دەوێت."

باسەکەیان زۆر بە کوتی بۆ خەیری ئەفەندی باس کرد. خەیری ئەفەندی گوتی: "منیشتان لەگەڵ دێم." هەستان، بەرەو هۆبەی سەربازی کەوتنەڕێ. سەرگورد ئیسحاق بە خۆشحاڵییەوە پێشوازی لێکردن، شوێنی بۆ نیشان کردن، دانیشتن، تەنها حەسەن بە پێوە وەستا. ئامادەباش راوەستابوو. چاوی بڕیبووە ناوچاوی سەرگورد ئیسحاق و ئاوا مابووەوە.

"تۆش دانیشە کوڕەکەم."

حەسەن لە جێی خۆی تەکانی نەخوارد.

"دانیشە کوڕەکەم، تۆش دانیشە."

حەسەن زیاتر خۆی راست کردەوەو دەستەکانی توند بەسەر ئەژنۆکانیەوە چەسپاندن.

"کورِم، پێمگوتی دانیشە."

"سەرگورد، لێیگەڕێ، ئەو سەربازە. بێگومان لەبەرامبەر تۆدا دەبێت ئاوا ئامادەباش راوەستێت، ئەو ناچارە بە حاڵەتی ئامادە بوەستێت."

سەرگورد ئیسحاق گوتی: "زۆر باشە، بوەستە."

هەمووان پێکەوە پێکەنین.

"سەرباز، لە ساری قامیش بوویت، وانییە؟"

حەسەن وشك و جیدی گوتی:

"لە ساری قامیش بووم، فەرماندە."

"کەوایە ئارام ئارام تایبەتمەندییەکانی خۆت بڵێ، دەمەوێت بیاننووسم."

حەسەن یەکسەر و بێپچڕان تایبەتمەندییەکانی خۆی گوت و سەرگوردیش دەینووسین.

"جارێکی دیکە."

"سەرچاو، قوربان."

حەسەن ئەمجارە تایبەتمەندییەکانی هێمن هێمن دووبارە کردنەوە.

"نووسیم کوڕم."

روخساری حەسەن بۆ تاوێك لەخۆشیان گەشایەوە.

"چوویتە سەر چیاکانی ئەللاهو ئەکبەر، مەگەرنا؟"

"چووم فەرماندە. رۆژی یەکەم بە رێکەوتین بۆ لای دوندە هەرە بەرزەکەی زۆر لەسەربازەکانمان لە رێگادا لەسەرمان رەق بوونەوە." بێدەنگ بوو، کەمێك بیریکردەوە: "پاشان، لەسەر چیاکە باوبۆرانێك هەڵیکرد نەبێتەوە، هەوا تاریك داهات کە باوبۆرانەکە هەموومانی راپێچ کردو بردنی بۆ خوار خوارەوە، ناو دۆڵەکان. لەوێش ئەوانەی کە تا ئەودەم زیندوو مابوون رەق بوونەوە. لە لەشکرەکەی ئێمە هیچ کەس بە زیندوویی نەمایەوە."

"تۆ چۆن دەرباز بوویت؟"

حەسەن چیرۆکی نەباتەکانی بەدرێژی بۆ گێڕانەوە. لە راوەستان ماندوو بووبوو هەر رادەهەژایە سەریەك.

فەرماندە بە دەنگی بڵند گوتی: "سەرباز ئامادە راوەستە."

حەسەن هاتەوە سەرخۆی، خۆی کۆکردەوە.

"سەرچاو فەرمانده."

"ئەمە فەرمانە."

"سەرچاو، فەرمانده."

"یەکسەر دانیشتە سەر کورسییەکە."

حەسەن سلاوی سەربازی کردو چوو لەسەر کورسی دانیشت.

"پاشان تۆ چوویت و هاورێ قوتاربووەکانی خۆتت دۆزینەوە، وایە؟"

"نەمتوانی بیاندۆزمەوە فەرماندە، هەموویان لەسەرمان رەق بووبوونەوە."

"چوویتەوە بۆ فەوجەکەت، وایە؟"

"نەمتوانی بیاندۆزمەوە فەرماندە، هەموویان رەق بووبوونەوە."

"بۆ سریەکەت؟"

"نەمتوانی بیاندۆزمەوە، هەموویان رەق بووبوونەوە."

"بۆ دەستەکەت؟"

"ئەوانیش هەموویان رەق بووبونەوە، لەشکریش..."

"باشە، چۆن کەوتیتە دەستی رووسەکان؟"

حەسەن نەیتوانی هیچ بلێت، سەری نایەوە بەرخۆی، ماوەیەکی درێژ داما.

ئیسحاق تاقەتی چوو:

"ها چی بوو؟ بیر لەچی دەکەیتەوە؟"

"هیچ مەپرسە فەرماندە، چۆن دەتوانم بلێم بوومە دیلی رووسە کافرەکان. چۆن دەشێت سەربازێکی تورك ببێتە دیلی رووسە کافرەکان؟ لەشەرمان تا ئێستا نەمتوانیوە ئەمە بە کەس بلێم، کاتێك بەبیرم دێتەوە لەشەرمان دەبمە دلۆپێك ئاو."

"تۆیان بەدیل گرت."

"من چوومە دەشتێك. زەوی و ئاسمان یەکپارچە سەهۆڵ بوو. جێگایەکی زۆر دوور، پشت تەمتومان، درەختێکم بینی کە وەکو سێبەر وابوو، بۆ لای درەختەکە چووم، شتێکی وەکو تارمایی لەبن درەختەکە بوو کە تا لێینزیکتر دەبوومەوە باشتر دەردەکەوت. کە گەیشتم بینیم سەربازێکەو خەریکە دەمرێت. گوتم بوەستە ئێستا زیندووت دەکەمەوە. سێ دانە نەباتم لەگیرفانم دەرهێنان، خستمنە نێو لێوەکانی، سەرباز هەر کە نەباتەکانی خوارد، چاوەکانی هەڵێنان، حاڵی کەمێك هاتوە سەرخۆی."

"پاشان؟"

"هەر ئێمەیان بینی، لوولەی چەکەکانیان تێکردین، من یەکسەر هەستامەوە، دەستەکانم هەڵبڕین. سەیرمکرد هاوڕێ روو لە مردنەکەشم هەستاوەتەوەو دەستەکانی بەرزکردۆتەوە. رووسەکان هاتن، بەرزیان کردینەوە، کەوتین، بەرزیانکردینەوەو کەوتین، ئێمەیان بردە ساری قامیش لەنەخۆشخانە خەواندیانین. دوای ئەوەی لەنەخۆشخانە دەرچووین، ئێمەیان بردە سێبریا، سێبریا ئەوەندە سارد بوو کە رێویەکانی ئەو مسیان دەڕی. زۆر خراپتر لەئەڵلاهو ئەکبەر هەموو رێویەکان!"

"پاشان؟"

"پاشان، چووین بینیمان هەموو ئەو سەربازانەمان کە لە سەرمان رەق بووبوونەوە لەوێ بوون. بۆ بێگاری بردمانیان. چەند پاشا و فەرماندەشمان لەگەڵ بوون. چەند ساڵ لەوێ بووین، نازانم. شەو و رۆژ لەوێ دیار نییە کە بزانم چەند ساڵمان پێچوو."

"پاشان؟"

"پێنج هاوڕێ پێکەوە رامانکرد. ئەفسەرێکی گەنجیشمان لەگەڵدا بوو کە باش شارەزای رێگاو خۆ دەربازکردن بوو. هەرکە گەیشتینەوە وڵات یەکسەر بەدوای فەوجەکەماندا گەڕام، بەڵام نەخۆی دیاربوو نە ناوی. منیش دەستمکرد بە ماسیگرتن و لەوسەری دەریای رەشەوە هاتم و خۆم گەیاندە ئێرە، لەم دوورگەیەماندا پەنام گرت."

جەنابی سەرگورد ئیسحاق گوتی:

"بەخێرهاتی!" چووە پشت مێزەکەی دانیشت، کاغەزێکی دانایە بن دەستی و قەڵەمی خستە نێو حبرەکە و هێنایەدەر و کاغەزەکەی پڕ کردەوە، ئینجا لەنێو چەکمەزەکە مۆری دەرهێناو لای خوارەوەی کاغەزە نووسراوەکەی مۆرکرد:

"بیگرە ئەمە کارتی کۆتاییهاتنی خزمەتی سەربازی تۆیە، ئێستا دەبێت لەتۆماری گشتیشدا تۆماری بکەم تاکو لەپۆڵا مکومتر بێت. کاتێکیش کە ناسنامەکەتت وەرگرت بیهێنە با لەسەر ناسنامەکەشت ئاماژەی پێبدەم و کارەکەی لەسەر تۆمار بکەم."

حەسەن هەستایە سەر پێ، سڵاوی سەربازی کرد، ئامادە راوەستا. ئیسحاق کارتی کۆتاییهاتنی خزمەتی سەربازی بۆ درێژکرد، حەسەن بەدەستانی لەرزانەوە کارتەکەی وەرگرت.

پزیشکی ئاژەڵان گوتی:

"ئێوە هەر لێرە دابنیشن، من لەگەڵ حەسەن دەچم ناسنامەی بۆ دەردێنین و دەیهێنین."

خەیری ئەفەندی گوتی: "من دەبێت لەگەڵ حەسەن بچم، من دەبێت بۆ ماڵەوە بانگهێشتی بکەم."

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: ((نابێت، دەبینە مایەی زەحمەتتان. من لەگەڵی دەچم و ناسنامەکەی وەردەگرین و دێینەوە."

"تۆ بمێنەوە پزیشکی بەڕێز، ئەو خانە، هەم دەچین کارەکەی حەسەن جێبەجێ دەکەین، هەم بانگهێشتی ماڵەوەی دەکەین. چونکە ئەو خانە، من دەبێت ئەو پیاوە بۆ کولبە دەروێشیەکەم بانگهێشت بکەم. دروست نییە کەسێکی دیکە بچێت. لەوێشەوە دەبێت بچینە لای وەهاب بەگ و بەرپرسی بەڵگەنامەکان. دەبێت سەرێکیش لەبەڕێوەبەری ناحیە بدەین. ئەگەر بتانەوێت دەتوانن بچنە ماڵی ئێمە. من ماڵەوە ئاگادار دەکەمەوە، لەماوەی نیو سەعات مێزی ئێوە ئامادە دەکەن."

عوزێر خان لەبەر دەرگا پێشوازی لێکردن.

"دەزانم، دەزانم دۆستەکانی ئێمە هاتوون. فەرموون، فەرموون وەرن دابنیشن."

"جەنابی خان بەڕێزتان دەفەرموونە ماڵی ئێمە، هاتووین ئەمەتان عەرز بکەین."

"زەحمەتتان کێشا، زەحمەتتان کێشا."

"تکا دەکەین، جەنابی خان."

"ئینشاللا کاولاك..."

"ناشێت، ناشێت، لە مەجلیسێك کە ئێوە حزورتان هەبێت، کەسانی ئاوا ناتوانن بێن...

خەیری ئەفەندی کارتی کۆتاییهاتنی خزمەتی سەربازی حەسەنی بۆ لای عوزێر خان درێژ کرد، عوزێر خان وەریگرت و خوێندیەوە.

"ئەم سەرگورد ئیسحاقەش مرۆیێکی چەندە باشە."

حەسەن رێك راوەستابوو و لەحاڵەتی ئامادەییدا بوو.

"دانیشە کوڕم."

"ناتوانم دابنیشم جەنابی خان."

"بۆچی؟"

"تۆ پاشایت."

عوزێر خان لەکاتێکدا سمێڵەکانی دەجوولاَن لەناخی دڵەوە پێکەنی، گوتی: "ئەوە سەردەمی خۆی بوو حەسەن کورِم." بانگی کاتبەکەی کرد. کاتب یەکسەر هات.

"ئەمە بگرە لەگەڵ حەسەندا بچۆ ژوورەکەت، پێناسەی حەسەن پڕ بکەرەوەو بیهێنەوە بۆ من، لە تۆماری گشتیشدا بینووسە."

ئەوان یەکسەر دەستیان کرد بە رەخنە و عەیب و عار گرتن لە مەراسیمە شکۆدارەکە، باسیان لەسەرهەنگ و کاولاك کرد، بابەتەکە ئەوەندە سەیر و سەمەرە بوو نەبڕێتەوە.

کاتب و حەسەن هاتنەوە. عوزێرخان پێناسەکەی مۆرکرد، گوتی: "پیرۆزت بێت!" پێناسەکەی بۆ لای حەسەن کە ئامادە راوەستابوو راگرت. هەستان، خەریك بوون دەچوونە لای وەهاب بەگ. عوزێر خان گوتی: "ئێوە برۆن، سلاَو لەوەهاب بەگ بکەن و پێیبڵێن خانووێکی باش بداتە حەسەن."

وەهاب بەگ بە گەرمی پێشوازی لێکردن.

"دەزانم، کورِەکەمان حەسەن، دلاوەرێکی زۆر زەحمەتکێشە. ئێستا خانووێکی زۆر جوانی دەدەمێ. نانووسم کامە خانوو. کاك جەمیلی پزیشك و هاورِێکانی جوانترین خانوویان هەڵبژاردووە." پێکەنی.

"با حەسەنیش ئەو خانووە هەڵبىژێرێت کە بە دڵی خۆیەتی. ئێستا قەباڵەکەی..." حەسەن لە حاڵەتی ئامادەیی چووەدەر، کیسەکەی کە تا زارکی پڕ بوو لەگیرفانی دەرهێنا، سێ دانە سکەی لەسەر مێزی بەردەم وەهاب بەگ دانان، وەهاب بەگ بە بێدەنگی پارەکەی هەڵگرت و خستیە نێو چەکمەچەکەوە.

چوونە لای بەرپرسی تاپۆ و بەڵگەنامەکان.

برادەران نەچووبوونە ماڵی خەیری ئەفەندی، هێشتا لەهۆبەی سەربازی هەر خەریکبوون لەبارەی کاولاکزادە قسەیان دەکرد. لە سیرەوە تا پیاز باسی ژیانی ئەو کابرایەیان کردبوو و هێشتاش هەر خەریکبوون باسیان دەکرد. لەپڕێکدا هەستان و بەرەو ماڵی خەیری ئەفەندی کەوتنەرِێ. لەنێوەڕاستی تەلارە گەورەکەی ماڵی خەیری ئەفەندیدا مێزێکی گەورە کە روومێزێکی وەنەوشەیی پڕ نەخش و نیگاری لەسەر راخرابوو، داندرابوو، هەموو شتێك لەسەر مێزەکە هەبوو، لەشیری مامرەوە بگرە تا گیانی ئادەمیزاد. هەمووان شادو خۆشحاڵ بوون. خەیری ئەفەندی شوێنی بۆ هەمووان دیاریکرد، حەسەن، ئەمجارەش بە حاڵەتی ئامادەیی راوەستا.

خەیری ئەفەندی لەشوێنی خۆی هەستا، ژێر باڵی حەسەنی گرت و لە رۆخ مێزەکە داینیشاند. حەسەن، دیسان لەنێو خۆیدا گرمۆڵە بوو و ئاوا مایەوە.

بەیانی زوو، بەر لەخۆرهەڵاتن هەستان و یەکسەر نانی بەیانیان خواردو چوونە بازار. دووکانەکان گەڕان و هەر کەم و کورتییەکیان هەبوو کڕیان. حەسەن شتومەکەکانی دکتۆر سەلمان سامی بە پشتی خۆی هێنان و خستنیە نێو بەلەمەوە، گوتی: "منیش ئێستا دەچم لەشارۆچکە هەندێك پێداویستی بۆ خۆم دەکڕم."

گوتیان: "باشە."

قەدریی بەلەموان گوتی: "منیش دێم."

حەسەن خۆشحاڵ بوو و گوتی:

"تۆش وەرە، ئەوە باشتر کە تۆش بهێیت."

پێکەوە چوون، پزیشکی ئاژەڵان یەکجێ ئەوانی بردە لای جەعفەر. جەعفەر بە جۆش و خرۆشێکی لە رادەبەدەر پێشوازی لێکردن.

پزیشکی ئاژەڵان گوتی:

"چیتدەوێت حەسەن؟"

حەسەن بەرەو لای کورسی و تەختەکانەوە چوو: "وەرنە ئێرە با بۆ ماڵەکەم مۆبل و تەختە هەڵبژێرین."

"باشە حەسەن، هەڵیاندەبژێرین."

لەلایەك قەدری، لەلایەکی دیکە پزیشکی ئاژەڵان دەستیانکرد بە هەڵبژاردنی تەخت و مۆبلەکان، پاشانیش بڕیاریان لەسەر کڕینی ئەو شتانەدا کە حەسەن پەسندی کردن.

جەعفەر گوتی:

"ئەم مۆبلانە دروستکراوی فەرەنسان، بەڵام من بە هەرزانی دەتانفرۆشمێ، بە نرخێکی هەرزان. دوای رۆیشتنی یۆنانییەکان کەس ئەمانە ناکڕێت. لەوساوە تەنها خەیری ئەفەندی و دوو کەسی دیکە لەمانەی کڕیون. دوای ئەوان هیچکەس... هیچکەس سەیریشی نەکردوون."

جگە لەمۆبلەکان، نوێن، تەختەخەوی فلزی، قاپ و هیربار، کورسیی دیسان دروستکراوی فەرەنسا، مافوورێکی گەورەی چندراوی سپارتا و سێ مۆمدانی بچووك و ئەوەی بۆ ماڵێك پێویست بێت کڕیان.

جەعفەر گوتی: "هەربژی کاکە حەسەن! من لەمندالّیمەوە ئەم کارە دەکەم، وەلـێ کەمتر کەسێکم بینیوە وەکو کاك حەسەن بێت، جوانترین شتی هەلّبژارد."

پزیشکی ئاژەلّان گوتی: "ببینە حەسەن، لەشەو و رۆژێکدا ناتوانیت هەموو شتێك بۆ مالّ دابین بکەیت، شتەکانی دیکە هەر کاتێك پێویستیان کرد دەیانکڕیت. کاکە جەعفەر خۆ راناکات، هەر لێرەیە."

حەسەن لەبەرامبەر ئاوێنەیەك وەستابوو، بە وردی تێیەوە رامابوو و هەر سات ناساتێکیش سەیرێکی دەوروبەری خۆی دەکرد.

"ئەم ئاوێنەیە گرانترین شتی نێو ئەم دووکانەیە. چێشتلێنەرە یۆنانییەکان بەر لەوەی ئەم ئاوێنەیە بکڕن لەسەر ئەم مۆبلە دادەنیشتن -مۆبلی پێش مێزی نیشاندا- دەستەکانی دادەنایە سەر هەردوولاجانگی سەری و بیریدەکردەوە."

حەسەن گوتی: "با ئەمەش بکڕین." بە پاڕانەوە سەیری چاوەکانی پزیشکی ئاژەلّانی کرد.

"با بیکڕین، حەسەن."

"مەترسە حەسەن ئەم ئاوێنەیەت بە نرخێکی زۆر هەرزان دەدەمێ، دەلّێیت بۆچی، چونکە خەلّکی ئێمە حەزیان لەو جۆرە ئاوێنانە نییە."

هێشتاش هەندێك شتی دیکەیان هەلّبژارد. پزیشکی ئاژەلّان لەبەر خۆیەوە گوتی ئەم حەسەنە راکردووە چەند پارەشی هەیە.

حەسەن نیگایەکی تژی رێز و خۆشەویستی لە پزیشکی ئاژەلّان کرد!" من سالّەهای سالّ لەو سەری دەریای رەش تا ئەمسەری گەڕام ماسیم گرتن و پاشان هاتمە ئێرە. دەریای ئێوە پڕە لەماسی. بزنە شینەکانی پیر خدریشم بینین. دوای ئەوەی کە یۆنانییەکان ئێرەیان بەجێهێشت، لێرە ئیدی ماسیگری وەکو دەریای رەشمان بۆ نەماوەتەوە. من بەر لە چوونە سەربازیم، لەگەلّ ماسیگرێکی یۆنانی بە هاوبەشی کارم دەکرد. ئەو ماسیگرێکی شارەزاو سەرۆکی ماسیگرەکان بوو. منیش وەکو ئەو بەو پارەیەی دەستم دەکەوت زێڕم دەکڕی. سەیر بکە، نێو پشتوێنەکەم پڕە لەکیسەی زێڕ. گەورەترین ترسم ئەوە بوو کە پارەکانم ببنە هی ئەنوەر پاشا." لەلایەك لەگەلّ پزیشکی ئاژەلّان لەمسەری دووکان دەچووە ئەو سەر و دەگەڕایەوەو لەلایەکی دیکە سەیری ئەو شتومەکانەی دەکرد کە دەیەویست بیانکڕێت و لەلایەکی دیکەش وەك ئەوەی بیەوێت تۆلّەی ئەو هەموو بێدەنگییەی خۆی بکاتەوە لێکلێکەو بێناوبڕ قسەی دەکرد.

داهاتەوەو چرپاندیە گوێی پزیشکی ئاژەڵان: "ئەگەر سەرگورد ئیسحاق لێرە بڕوات و کەسێکی دیکە بهێتە شوێنی ئەو خۆ لەسێدارەم نادات، لەسێدارەم نادات وانییە؟"

"لەسێدارەت نادات. تۆ ئێستا کارتی کۆتاییهاتنی خزمەتی سەربازیت پێیە، جگە لەوە بۆ ئەوەی بابەتەکە فەرمی و تەواو بێت لەپێناسەکەشتدا نووسراوە، تەنانەت گوللەتۆپیش کار لەو کارتەی تۆ ناکات."

جەعفەر لەکاتێکدا بۆ لای ئەوان دەهات پرسی: "هەموو ئەو شتانەی پێویستت بوو کڕیت؟"

حەسەن بە حاڵەتێکی لەخۆباییانەوە گوتی: "کاك جەعفەر، کەلوپەلی ماڵی سەرۆکێکی ماسیگرانی وەکو من بە ڕۆژێك چۆن دەکڕدرێن. من جەنگاوەریشم."

جەعفەر گوتی: "ڕاستە، من دە ساڵە خێزاندارم، هێشتا نەمتوانیوە شتومەکی ماڵەکەم هەموو تەواو بکەم. هاوسەرەکەشم یۆنانییە."

"ئێوە بڕۆن سواری بەلەمەکەتان بن، من شتومەکەکانتان بۆ دێنم و دەیانخەمە نێو سەندوق و گونیە و دەیانپێچمەوە و بۆتانی دەنێرم. خەیری ئەفەندیش سندوقی بەناوبانگی پڕ لەنەخش و نیگاری دروستکراوی ئەدیرنەو مەراشی هەن کە لە داری سنۆبەر و گوێز دروست کراون، لەو جۆرە سندوقانەی کە مرۆڤ لەبینینیان تێر نابێت. خەیری ئەفەندی ئەو سندوقانەمان بە هەرزان دەداتێ. من لەماڵەوە سێ دانە لەو سندوقانەم هەن، لەهەرە جوانەکانیان. بڕۆ چەندت ویستن لەویان بکڕە. من ئێستا شتەکانتان لێکدەدەمەوە بزانم بای چەند شمەکتان کڕیوە. پارەکەیش یان ئێستا بیدەن یان با بۆ دوای ئەوە بێت کە بۆتانمان ناردن."

حەسەن سەیرێکی پزیشکی ئاژەڵانی کرد، پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "هەر ئێستا پارەکەت دەدەدینێ، ئەمە چ قسەیەکە تۆ یەکێکی لەباشترین برادەرەکانی ئێمە."

جەعفەر لەپشت مێزەکەی دانیشت. دوو شاگردی دووکانەکە شمەکەکانیان هەڵدەگرت، نیشانی جەعفەریان دەدان وجەعفەریش نرخەکەیانی دەنووسین.

جەعفەر کە شەلاڵی عارەقە بووبوو کاری ژمێریاری تەواو کردو ئەنجامی نرخی هەموو شمەکەکانی بە ئەوان ڕاگەیاند. پزیشکی ئاژەڵان لەو ئەنجامە خۆشحاڵ بوو. حەسەنیش بە بینینی ئەو خۆشحاڵیەی پزیشکی ئاژەڵان بە هەمانشێوە خۆشحاڵ بوو، دەستی بردە ژێر پشتێنەکەی، لەنێو کیفی دەمانچەکەی کیسەیەکی گەورەی دەرهێنا، سکە زێڕەکانی ژمارد، داینانە سەر لەپی دەستی جەعفەر، پاشان بە پەلە چووە لای خەیری ئەفەندی. پزیشکی ئاژەڵان هەرچەندە زۆرجار

چووبووە لای خەیری ئەفەندی، سەندوقەکانی نەبینیبوو. لەسەرسامبووندا لە شوێنی خۆی رەق هەڵاتبوو، گوتی:

"با سندوقەکان هەڵبگرین."

کە گەیشتنەوە دوورگە، هەموو خەڵکەکە لەئەسکەلە چاوەڕێی ئەوانیان دەکرد. بە بینینی سندوقەکان واقیان وڕما.

پۆیراز گوتی: "ڤاسیلی لەگەڵ ئێمەدا وەرە بابچین خانووێکی جوان بۆ حەسەن پەیدا بکەین."

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "منیش دێم."

"تۆش وەرە."

حەسەن بە پۆیرازی گوت: "با نزیك ماڵی ئێوە بێت."

پۆیراز گوتی: "پەیدای دەکەین."

مەلەك خانم گوتی: "منیش دێم." لەکاتێکدا نەوازشکارانە دەستی بە سندوقەکاندا دەهێنا، رووی کردە قەدریی بەلەموان و گوتی: "بەلەموان، سبەی کەللەی سەحەر بەرێدەکەویت و دەچیتە لای خەیری، سێ دانە لەو سندوقانە دەکڕیت و دەیانهێنیتەوە. زۆر پێویستمان پێیاندەبێت.))

بەرەو لای خانووەکان رۆیشتن، زۆر خانوویان بینین، خانووێکیان هەڵبژارد کە هەم حەسەن پەسندی کرد، هەم ئەوانی دیکە، جگە لەوە، خانووەکە نزیك ماڵی پۆیرازیش بوو. رووکاری خانووەکەش مسی بوو.

حەسەن گوتی: "من دەچم ماسی دەگرم." لەخۆشیان نەیدەزانی چیبکات. بە پزیشکی ئاژەڵانی گوت: "تۆش ئەگەر بتەوێت لەگەڵ مندا وەرە برا، واباشتر دەبێت. هەموومان بەپێی پێویست ماسیان دەگرین، ئەمڕۆ بۆ من رۆژێکە وەك ئەوەی تازە لەدایك بووبم، دەڵێی لەمردن هەستاومەتەوە."

دەستی قەدریی بەلەموانیش هەر خۆش بێت، تانکی بەنزینی بەلەمەکەی حەسەن بە تەواوی پڕ بەنزین بوو.

بەخێرایی بەرەو دوورگەی کابا وەڕێکەوتن.

حەسەن گوتی: "جەنابی پزیشك، ئەگەر ئێستا وەلی نیشانچیمان لەگەڵ بوایە، سەیری ئەم ئاوانەی دەکردو دەیزانی کێندەر ماسی لێهەن، وانییە؟"

"دەیزانی."

"من هیچکەسی وەهام نەبینیووە."

"بە زوویی دەیبینی. ئەو ئێستا لەگەڵ ئەحمەد خەریکە ماسیان دەگرێت."

"گێژ بوومە، ئەگەر تۆ ئاوا باسی نیشانچیت نەکردبوا باوەڕم نەدەکرد. ئاخۆ ئەو چ جۆرە بنیادەمێکە، چ بنیادەمێکی سەیرە!"

"دەزانی حەسەن، شەیتان کچێکی هەبووە کە لەگەڵ باوکی نیشانچی هاوسەرگیری کردووەو لەو کچەی شەیتانیش کوڕێك هاتۆتە دنیا کە ناویان ناوە وەلی، ئەو وەلیەش چۆتە یەمەن، بۆ سەربازی. لەیەمەن لەژێر خۆرەتاو، هێلکەی مریشك لە گەرمان دەکولێت. لە ماوەی پێنج سەد ساڵدا کە لێرەوە سەرباز رەوانەی یەمەن و عارەبستان کراون دەتوانم بڵێم هیچکامیان نەگەڕاونەتەوە تەنها وەلی نیشانچی نەبێت."

حەسەن گوتی: "سەیرە، سەیرە، کەسێکی چەند سەیرە ئەم وەلی نیشانچییە!"

"ئەو سەربازیی وا کردووە. لەیەمەن، لەناو دۆزەخ، تا دەریای رەش، تا بناری چیای گوندەکەی خۆیان بەپێی پیادە هاتووە، لەیەمەنەوە."

"ئەگەر بیبینم لێیدەپرسم ئەو خدرە بۆچی بزنەکانی خۆی هێناونەتە دوورگەی کابا، بۆچی کەشتیی ئەوانەی بزنەکانی دەبەن نوقمی ژێر دەریا دەکات، ئەو گۆشتیش دەخوات؟ خدر بۆچی بزنەکانی بردوونەتە دوورگەی کابا؟ ویستویە چ لە بزنە شینەکانی بکات، ئەو کە مرۆڤە؟"

"ئەو لە توخمی ئادەمیزادە، بەڵام عومری جاویدانی هەیە."

"ئەگەر لەتوخمی ئادەمیزادە چۆن دەتوانێت مرۆڤێك، ژمارەیەك مرۆڤ لەبەر خاتری بزنێك نوقمی ژێر دەریا بکات؟ یانی ئەو بزنە شینانە تەڵە نین بۆ مرۆڤ داندرابنەوە؟ یان ئەگەر مرۆڤەکان هەوەسی خواردنی گۆشتی کاریلەیان کرد؟ نیشانچی هەموو ئەم شتانە دەزانێت؟"

"مەگەر دەشێت نەیانزانێت، چیمان بەتۆ گوت؟ مەگەر پێمنەگوتی نیشانچی لەکچی شەیتان بەدنیا هاتووە، مەگەر نەمگوت ئەو کەسێکی زۆر بە ئەزموونە؟ پێمنەگوتی داری وشکی درەختی گێلاس لە عەرزی دەچەقێنێت، دارە وشکەکە شین دەبێت، پاشانیش گێلاسی سوور سوور کۆ دەکاتەوەو بە سەلامەتی دەیانخوات؟ و زۆر هونەری دیکە، زۆر هونەری دیکە! ببیستی دەمت بەش دەبێت. دەبێت لەو کابرایە کە نەوەی خودی شەیتانە بترسیت، لە هەمانکاتدا، پیاوی وەکو ئەو باش پەیدا نابێت."

پاشان بێدەنگ بوون، ئینجا حەسەن گوتی:

"باقولابەکان هەڵدەینە ناو ئاو. لێرە بۆنی ماسیی لوفەرم بۆ دێت." قولابە تایبەتەکانی گرتنی لۆفەریان هەڵدانە ناو ئاو و هەر یەکسەر هەریەکەو لوفەرێکیان لە ئاو راکێشایە دەر.

"نیشانچی بە چاوەکانی و تۆش بە لووتت... تۆش کوڕی کچەکەی دیکەی شەیتانیت؟"

بەر لەخۆرئاوابوون، حەسەن و پزیشکی ئاژەڵان لەگەنەکانی ماسیانیان پڕکردن لە لۆفەر و گەڕانەوە بۆ دوورگە. ڤاسیلی بە دارزەیتوون ئاگرێکی کردبووەوەو لەو ناوە گردێك لەپەنگری سوور سوور خڕکرابوونەوە سەر یەك. ڤاسیلی و حەسەن، سەبیحە و کچەکان، لەگەنە پڕ لە لۆفەرەکانیان هەڵگرتن و بردنیانە لێوار دەریاو هەر زوو خاوێنیان کردنەوە. خواردنەوەش هێندرا، هەمووان کەم و زۆر خواردیانەوە، موسا ئاغا خۆی لەسەر پێیان رانەدەگرت، پۆیراز ژێر باڵی گرت و بە زەحمەت لەپلیکانەکانی وەسەر خست، بەرلەوەی جلەکانی بگۆڕێت خستیە نێو جێگاو خەواندی. کچەکان بە دوایاندا هاتبوون. پۆیراز لەو رۆژەوە لەشەرمان نەیدەتوانی سەیری روخساری زەهرا بکات و خۆی لــێ دووردەختەوە. کاتێك لەپلیکانەکان دەچووە خوار، گوتی:

"کچینە، جلەکانی باوکتان بگۆڕن و باش بیخەوێنن. ئەو ئەمڕۆ کەمێك نیگەران بوو. زۆری نەخواردۆتەوە، نیگەران مەبن. هەر زوو لەگەڵ دکتۆرەکان دەیبەین بۆ کێڵگە. کێڵگەکە ببینێت شادمان دەبێت. شەوتان شاد."

حەسەن قەت مەشروبی نەخواردبووەوە. ئەمشەویش هەرچەند زۆریان پێداگری کرد کەچی دەمی لێنەدا، لەخۆشحاڵیان ئۆقرەو ئارامی نەبوو، نەیدەزانی چیبکات. بەبێئەوەی بەسەرخۆی بهێنێت، لەسەر مێزەکە هەستاو خۆی خزاندە نێو تاریکی، چووە نێو بەلەمەکەی و لەنێو نوێنەکەیدا راکشا، تا بەیانیش داهات نەیتوانی بخەوێت. سێ جاران لەسەربازی رایکردبوو. نەیدەتوانی بەرگەی کوژرانی مرۆڤەکان بگرێت. جارێك لەشەڕێکی دەستەو یەخە بەشداری کردبوو، بە بینینی ئەو سەربازانەی بە سەرە نێزە ورگی یەکدیکەیان هەڵدەدڕی و یەکدیان دەکوشت، رشابووەوەو پشتاوپشت بەربووبووەوە، کە بەخۆ هاتبووەوە سەیری دەوروبەری خۆی کردبوو بینیبووی ئەو ناوە هەموو پڕە لەتەرمی غەڵتانی خوێن، لەسەر پشت چاوی بڕیبووە ئاسمان و تا خۆر ئاوا بووبوو، تا ئەو دەمەی ئاسمان پڕ بووبوو لە ئەستێرە ئاوا لەسەر پشت راکشابوو. لەکاتی رۆیشتن ساتمەی بردبوو و لە تەرمەکان هەڵنگوتبوو، خوا دەزانێت تا ئەوکاتەی مەیدانی شەڕەکەی بەجێهێشتبوو قاچی لەچەند تەرم هەڵنگوتبوو و ساتمەی بردبوو و کەوتبوو.

دوای نەبەردی دەستەویەخە، ئیدی نەیتوانیبوو بگەڕێتەوە فەوجەکەی خۆی، دابوویە چیاو دواجار گیرابووەوە. گیرابووەوە، دووجاری دیکە لەشەڕی دەستەویەخە بە سەلامەتی دەربازی بووبوو، دووجار دابوویە چیاو هەردووجاریش دەستگیر کرابووەوە. سەربازە راکردووەکان وەك ئەوەی لەدنیادا هیچ جێگایەك بۆ خۆشاردنەوە نەبێت تەنها چیا نەبێت، هەر کە رایاندەکرد خۆیان دەگەیاندە چیاکان، لەچیاش زوو یان درەنگ دەستگیر دەکرانەوەو گوللەباران دەکران. حەسەن هەر جارێك گیرابووەوە توانیبووی گیانی خۆی قوتار بکات. وەك چۆن چارەنووسی لە شەڕە دەستەویەخەکان دەربازبوون بوو لە راکردنەکانیشدا هەروا بوو و بە سەلامەتی لێدەردەچوو، دووجاران هیوای نەمابوو گوللەبارانی بکەن کە قوتار بوو بوو.

حەسەن لە دڵی خۆیدا دەیگوت پیاوانی حکومەت هەرکەسێك بە چیاوە ببینن وادەزانن سەربازی راکردووە، دەیگوت، گوێی دەگرن و دەیبەنە مەیدانی شارۆچکە و گوللەبارانی دەکەن. حەسەن گوتی چیاو ودمی نییە. حەسەن گوتی رۆژێك چوومە سەر دوندی چیایەکی بڵند، سێ شەو و سێ رۆژ لەوێ بیرمکردەوە. حەسەن گوتی ئێمە لەناوچەکەی خۆمان دەریامان هەیە، منیش رادەکەم و دەچمە دەریا. حکومەت خووی بە چیاوە گرتووە، لەوێ باوکی خۆی ببینێت، نێرەکتکێك ببینێت وادەزانێت سەربازی راکردووە، دەیبات و یەکسەر گوللەبارانی دەکات. حەسەن گوتی منیش رادەکەم و دەچمە دەریا. حەسەن گوتی چوومەوە ماڵ، بابەتەکەم بۆ باوکم روون کردەوە. باوکم گوتی بۆ هیچ شوێنێك مەچۆ، لێرە لە عەمباری ماڵێ خۆ بشارەوە، ئەگەر ویستت بچیە ئاودەستیش، تەنها شەوان دێیتەدەر، ئەگەر بتگرن و بیانەوێت گوللەبارانت بکەن، منیش لەگەڵ تۆدا گوللەباران دەکەن. سێ رۆژ لە عەمبار چاوەڕێی باوکم بووم. باوکم بە بەلەمێکی نوێ نوێوە هاتەوە. چوار دانە سەوڵی لەنێو بەلەمەکە دانابوون کە دوانیان یەدەگ بوون. حەسەن گوتی چوومە دەریا، کەسێك لێینەپرسیم داخۆ سەربازی راکردووم یان لە کوێ دێیت و دەچیتە کوێ. هەر کاتێك توانیبێتم گوتوومە سەربازی راکردووم، بەڵام کەس پێی باوەڕ نەکردووم. دەیانگوت مەگەر رێی تێدەچێت لەنێو دەریاش سەربازی راکردوو هەبێت. گوتم بەخوا، بە پیر، بە پێغەمبەر سەربازی راکردووم، باوەڕیان نەکرد، پێمپێکەنین. من هاتمە ئەم دوورگەیە. بە کاك پۆیرازم گوت من سەربازی راکردووم، ئەو باوەڕی کرد. پێمگوت...

هەستاو لەجێگا هاتەدەر و چووە لێوار، لەوێ راوەستاو سەیری بنی دەریای کرد. بن دەریاکە رۆشن رۆشن بوو. تیشکی خۆر تا ئەو دیو ژێر دەریای رووناك کردبووەوە. قووڵایی ئاوەکە لەبەر

رووناکایی تیشکی خۆر دەبریسکایەوە، ماسیە رەنگاورەنگەکان، بەخێرایی رێچکەیان دەبەست لەنێو ئاوەکە بەرەو لێوار دەکەوتنە دوای یەك و لەولاتر لەنێو تاریکیدا ون دەبوون، کەمێك دواتر، دووبارە دەگەڕانەوە بۆ لای لێوار و وەك ئەوەی قەوزەی لێوارەکان بۆن بکەن، لەکاتێکدا کلکیان دەجوولاند و ئاوەکەیان شەق دەکرد دواتر وەك ئەوەی بەردێکیان بەنێودا بدەن بەخێرایی لەو نێو ئاوە بڵاودەبوونەوەو هەریەکە و بۆ لایەك دەچوو. حەسەن هەمیشە خەریکی ماسیگرتن بووەو کاتی ماسیگرتن لە لێوار یان رۆخ بەلەمەکەی سەیری بن دەریای کردبوو، بەڵام ئەو سێبەرە بەدوای یەکدا ریزبووەی سەر وردە بەردەکانی کە بەخێرایی دەردەکەوتن و نەدەمان و دیسان دەردەکەوتنەوە، نەتوانیبوو ببینێت. لە ئەسکەلەوە تاکو خانووی چێشتلێنەرەکان نەیتوانیبوو چاو لەسەر بنی دەریاکە هەڵبگرێت. ماسیە هەڵبەزیوەکان دەبریسکانەوە، بنی دەریاکە خۆری پێدەکەوت دەبریسکایەوە. چەندین ساڵ لەسەر دەریای رەش بەو خووە بەو هەموو شەپۆل و لافاو و باوبۆرانانەیەوە کاری کردبوو، بەڵام ئەوها نەبوو. دەریای نەبینیبوو، چ نهێنییەك لەم کارەدا هەبوو.

دوای ئەوەی، حەسەن رێك بۆ ماوەی سێ رۆژ، بەر لە خوێندنی کەڵەشێری بەیانیان دەچووە لێوار، لە بنی دەریاو ماسیەکان رادەماو دەگەڕا بێئەوەی کە گوێ بداتە دووریی مەودای دوورگە، دوای خۆرئاوا دەبوو دەگەڕایەوە ماڵەوەو هەر کە یەك دوو پارووە نانی دەخوارد لەنێو خۆیدا گرمۆڵە دەبوو و خەوێ لێدەکەوت.

رۆژی سێیەم، ئەو پێویستی و کەلوپەلانەی کە لە جەعفەری کڕیبوون گەیشتن، ئەمجارەش مەلەك خانم، شەریفە خانم، زەهرا، نەسیبە و پیاوەکان لەدابەزاندن و رێکخستنی کەلوپەلەکاندا یارمەتیان دا. شەریفە خانم لە هەر جێگایەك شتێکی دادەنا، هەمووان پەسەندیان دەکرد.

حەسەن دوای ئەوەی کەلوپەلەکانی ماڵێیان بۆ داناو رێکیانخست نەیتوانی بچێتەدەر لەماڵ، چەندین کاتژمێر لەبەرامبەر هەریەك لە شمەکەکان رادەوەستا، سەیری دەکرد، هەروەك چۆن سەیری تۆپەڵە ماسییە درەوشاوەکانی ژێر دەریای دەکرد. جگە لەوە دەتگوت ئەو تابلۆیەی کە بە دیواری هۆڵی خانووەکەیدا هەڵواسرابوو دەپەرستێت، نەیدەتوانی لێیدوور بکەوێتەوە. لەلای خوارەوەی تابلۆکە باخێکی پڕ لەگوڵ و گوڵزار، زەردەواڵە، خاڵخاڵۆکە، لەلای سەرەوەش مراویە ئاویلکە بە دەنووکی جوانیان و لەحاڵەتی هەڵفڕین، رەشۆڵە، مەلی خەنجیرخۆر و باڵندەی چکۆلەی رەنگاورەنگی دیکە. زەردەواڵەکان رووناکیان بە دەوری خۆیاندا پەخش دەکرد. حەسەن لەخواردن

دابڕابوو، کاتێك دراوسێیەکان خواردنیان بۆ دەهێنا، کە یەك دوو پارووی دەخوارد تێر دەبوو. تەنانەت کە خواردنیشیان بۆ دەهێنا عەقڵی پێدا نەدەشکا بیخوات. حەسەن گوتی ئەی خوای من، ئەمە چ کارێکە، چ حاڵێکە، دەریا بگەڕێیت و سەرتاپای بۆنی دەریات لێبێت، بۆنی دەریا رۆبچێتە هەموو گیانت، کەچی دەریا نەبینیت. تا ئەودەمەی پۆیراز دەگەڕێتەوە ماڵ ئەمە حاڵ و رەوشی حەسەنە.

"حەسەن ئەم خانووە ماڵتە یا گۆڕتە؟ لەوەتەی قاچت ناوەتە ئەم خانووە نەچوویتە دەرەوە."

حەسەن بە سەری دانەویەوە گوتی:

"من هەرگیز ماڵێکم نەبووە کە..."

پۆیراز گوتی: "ئێستا هەتە.)"

"داوایەکی دیکەم لەتۆ هەیە براکەم."

"بێژە حەسەن."

"دەمەوێت جارێکی دیکە لەگەڵ تۆدا بێمە شارۆچکە."

هەر کاتێك پێتخۆش بوو، من بەخیلی بەتۆ دەبەم، تۆ لە ئێمە هەمووان زیاتر بەدڵ و جەرگتر و ئازاتری. لەنێو ئەو هەموو کەسانەی کە چوونە جەنگ کەمتر کەسیان هەبوو کە وێرابێت نەچێتە جەنگ، تەنیا کەسانی وەکو تۆ بوون کە ئەو ئازایەتییە بنوێنن. هەموومان، بە ملیۆنان کەسمان وەکو مێگەلی مەڕان کەوتینە پێش شوانەکانمان و بەرەو مەرگ و رەقبوونەوەو مردن ملی رێگامان گرت."

"دەیانویست منیش لەسێدارە بدەن، ئەگەر ئەو دەریایانە و هەروەها ئێوە نەبوان، ئێستا قاچەکانم بە هەواوە دەهەژانەوە."

"تۆ بەرامبەر مەرگ و هەڵگیسێنەرانی کوشت و بڕ راوەستایت."

"تۆ تا ئێستا جەنگەڵێکت بینیووە کە هەموو سپی و یەکپارچە سەهۆڵبەندان بێت؟"

"نەمبینیووە."

"من بینیوومە. جەنابی سەرگورد ئیسحاقیش بینیوویە، چونکە بینیوویە بۆیە منی لەسێدارە نەدا، ئەگەر بتەوێت راستیت پێبڵێم، من بەهۆی ئازایەتیو پیاوەتیی خۆم رامنەکرد، لەمردن و سێدارە ترسام. ئەو هەموو ساڵە لەگەڵ هەرکەسێك لەچیاو ساری قامیش قسەمکردووە هەموویان زەندەقیان لەمردن چووبوو."

"راستە، هەموویان دەترسان، بەڵام ئێوە راتانکرد."

"چیبڵێم، ئێمە رامانکرد چونکە خۆمان لەهەمووان ترسنۆکتر دەزانی. تۆ بەیانی لەگەڵ مندا دێیتە شارۆچکە؟"

پۆیراز لەکاتێکدا کە لەپێکەنینان زاری تا بناگوێی بەشکردبووەوە گوتی: "دێم، هاوڕێ ترسنۆکەکەم."

"بۆچی دەبێت شتێك کە خوا دەیزانێت من لەبەندەی خۆی بیشارمەوە."

لەگەڵ سەوادی بەیانی وەڕێکەوتن، قەدریی بەلەموانیشیان لەگەڵ بوو.

ماتۆڕەکەی حەسەن باش دەڕۆیشت، قەدریی بەلەموان سەری سووڕمابوو، بیریکردەوە، کەوابوو بەلەمێکی لە بەلەمی منیش باشتر پەیدا دەبێت.

"هەرکە گەیشتینە شارۆچکە مەڕێك دەدۆزینەوە، پاشان گونیە برنجێك دەکڕین، دوای ئەوەش، هەنگوینی ئامادەکراوم لەدووکانێکدا بینی، هەنگوینیش دەکڕین. من هەنگوینی باش و بێخەوش دەناسم. باوکم زۆر غەڵێفەی مێشەهەنگانی هەبوون. خواردنەوەیەکی مشەش دەکڕین، لە راکی بنیشتی یۆنانی، راکی سپی خۆمان، شەڕابی ئزمیر، خواردنەوەیەکی زۆر دەکڕین، هەر دەگەڕێین تا هەرە باشەکەی دەدۆزینەوە. دەچین نانی تازەش لەنانەواخانە دەکڕین، ئەگەر نەشبوو لەشارۆچکە دەمێنینەوەو کەللەی سەحەر دەچینە نانەواخانە، نانی تازە دەکڕین، لەو جۆرە نانەی کە بۆنەکەی مرۆڤ مەست دەکات."

پۆیراز گوتی:

"منیش هەم بۆنی خاکم ئەودەمەی باران لێیدەدا زۆر پێخۆشە، هەم بۆنی نان کە تازە لە تەنوور دەردێت. مەترسە حەسەن، ئێمە شتەکانمان دەکڕین، پاشان دەچینە نانەواخانەیەك، نانی تازەو بۆنخۆش بەرادان دەدەین و دەیخەینە نێو گونییێك و بە باشی دەیکەینە نوردی و شەوی میوانداریەکە، دەریاندێنین. خۆشمان یەکی یەك دانە هەڵدەگرین، بەڵام هەر ئاوا بەبێ چێشت دەیانخۆین. هیچ خواردنێك تام و بۆنی نان نادات."

حەسەن بە خۆشحاڵیەوە گوتی: "نادات."

قەدریی بەلەموان گوتی: "نایدات. ئەو نانەی کە دایکم لەتەنوور دەریدەهێنا مرۆڤی تەواو مەست دەکرد. مرۆڤ هەرگیز لەتام و بۆنی نانی تازە لەتەنوور دەرهاتوو تێر نابێت. بەتایبەت

ئەگەر نانەکە هەروا بە وشکی بخۆیت. تەنانەت نقیشك و هەنگوینیش ناتوانێت بۆن و تامی نانی وشك لەنێو ببەن."

حەسەن گوتی: "کە لێرە گەڕاینەوە تەنوورێك بۆ مەلەك خانم دروست دەکەین کە هەموو دنیا باسی بکات."

لەهەموو جاران زووتر گەیشتنە شارۆچکە. قەدریی بەلەموان لەدڵی خۆیدا نیگەران بوو، بەڵام بەسەرخۆیدا نەهێنا. هەروەکو جاران لەگەڵ حەسەن هەڵسوکەوتی کرد. ئەگەر ماتۆڕەکەی حەسەن نەبواو هی هەر کەسێکی دیکە بوایە و ئاوا بەخێرایی رۆیشتبوا دڵی گەردی دەگرت.

بەلەموان هەر زوو باشترین مەڕی هەڵبژارد و پەسندی کرد. چوونە دووکانی هەنگوینفرۆشی، بۆنی هەنگوین مەستی کردن. پاشان هەموو بازاڕەکە گەڕان و زۆر خواردنی بەتامیان کە بە بیریان داهاتبێت کڕین. حەسەن هەر جارێك خواردنێکی تازەی دەدۆزیەوە لەخۆشیان شاگەشکە دەبوو. کیسەکەی دەردەهێنا، چەنگێك پارەی دەخستە سەر لەپی دەستی دووکاندارەکە و پێیدەگوت: "هەرچەندەی دەتەوێت هەڵیبگرە!"

پاشان چوونە نانەواخانەیەك، پۆیراز چوو لەگەڵ کابرای نانەوا قسەی کرد.

نانەوا گوتی: "سەرچاوان قوربان، هەویری ئامادەمان هەیە و تەنووریش گەرمە. ئێستا چەند دارگزرەیەکی دیکەشی دەخەمە ناو. ناو تەنوورەکە سوور دەبێتەوە. تەنوورەکە ئێستاش هەر تەواوە، بەڵام ئەگەر ئێوە واتان پێباشترە وایلێدەکەین."

زارکی تەنوورەکەی هەڵدایەوەو سەیرێکی کرد:

"پێویست بە داری دیکە ناکات، ئێستا نانی پێوە دەدەین، زۆری پێناچێت."

دوو کەس گونتکەکانیان لەسەر بێلۆکەکان پان کردنەوەو رەپێشی ناو تەنوورەکەیان کرد، کەمێك دواتر نانی برژاویان هێنایەدەر، هەرسێکیان پێکەوە بۆنی نانی تازەیان هەڵمژی.

نانەوا گوتی: "دەتانەوێت پەنیرت بۆ بێنم، بەنانی تازە زۆر خۆش دەبێت."

پۆیراز گوتی: "سوپاست دەکەم، نانی تازە، هەر ئاوا بە هیشکیش باشە، تامەکەی ئاوا باشترە."

ئەوان هێشتا نانی نێودەستیان تەواو نەکردبوو کە بۆ جاری سێیەم ئەو نانانەی خرابوونە نێو تەنوور دەرهێندران.

نانەوا پرسی: "میوانداریەکە سبەی شەوێیە؟"

پۆیراز گوتی: "سبەی شەوێیە."

"نانەکانتان وا بۆ قەد دەکەم کە تا سێ ڕۆژان وەکو تازە بن ئاوا بمێننەوە."

حەسەن گونیە نانەکەی خستە سەر کۆڵی و هاتنەوە ئەسکەلە، ئەو مەڕەی کە لەلای سەرەوە بەستبوویانەوە، هێشتا ئەو گیایە سەوزەی لەبەریاندانابوو تەواوی نەکردبوو.

کە گەیشتنەوە دوورگە سەیریانکرد منداڵ و پیرو لاو و ژن و پیاو لە ئەسکەلە ڕاوەستاون و چاوەڕێی ئەوان دەکەن. یەکەمجار مەڕەکەیان دابەزاند، ئینجا خواردنەکان و خواردنەوەکان. چوونە ژێر چنارەکان، لەسەر نیوتەختەکان دانیشتن. ئەوانەی کە چاوەڕێی ئەوانیان دەکرد ئاگرێکیان بە وشکە دارزەیتوونەکان کردبووەوە، هێشتا ئاگرەکە نەبووبووە پەنگر.

پۆیراز پرسی: "جەناب سەرگورد، میوانداریەکە ئەمشەوە یان سبەی شەو؟"

دکتۆر سەلمان سامی گوتی: "ئاشکرایە کە ئەمشەوە، ئێمە دەمانزانی زوو دەگەڕێنەوە، بۆیە ئاگرمان کردەوەو چاوەڕێمان کردن، ئاشکرایە کە ئەمشەوە. ئەم مەڕە بەشی سێ ڕۆژانمان دەکات.

"باشە کە ئەمشەوە. لەنانەواخانە نانی تازەمان کڕی و وەڕێکەوتین. نانەکان هێشتا بۆنی خۆشیان هەر لێدێت."

سەرگورد پرسی: "کێ مەڕەکە بکوژێتەوە؟"

هوسمەن گوتی: "من. ئێمە لەمەملەکەتی خۆمان، واتە لە یۆنان، مێگەلی مەڕانمان هەبوو، بۆیە من لێیدەزانم، من دەیکوژمەوە."

"کەوایە ئەم مەڕە هەڵبگرە و بیبە دوورتر، لەژێر دارزەیتوونێك، لەوێ بیکوژەوە، شەق و پەقی بکە، پارچەکانی بخەرە نێو لەگەنێك و بیانهێنەوە ئێرە. شێخموس، حەسەن، ئێوەش یارمەتی هوسمەن بدەن." ڕووی لەژنەکان کرد: "خانمەکان، لەماڵەکانتاندا هەرچی قاپ و چەنگاڵ و کێرد و پەرداختتان هەیە بیانهێنن. سەرمێزەکانیش بە گوڵان بڕازێننەوە."

"ساخ بیت، هەر بژیت مەلەك خانم"

"منداڵەکانم بە تەنێ نەناردن، زەهراشیان لەگەڵ بوو."

پۆیراز بە بیستنی ناوی زەهرا، هەستی بە موچڕکێك کرد لە ناو دڵیەوە، کاتێك خەریك بوون لە ئەسکەلە نزیك دەبوونەوە زەهرای لەنێو قەرەباڵغی خەڵکەکە بینی، بەڵام تەنانەت بۆ جارێکیش نەیتوانی سەری هەڵبڕێت و سەیری بکات.

یەکەمجار خواردنەوەکانیان لەسەر مێز ریزکردن، دکتۆر سەلمان سامی بە بینینی سێ بتڵ ماستیکا لە خۆشیان هورای کێشاو گوتی:

"چەندین ساڵە ماستێکام دەست نەکەوتووەو نەمخواردۆتەوە." روخسارە خەماویەکەی لەپڕێکدا گۆڕا، رووی کردە پۆیراز: "سەیرکە، لەسەر مێزی دواوەیە، شەراب، راکی. گۆشتەکە چیلێهات؟"

"وادەیهێنن قوربان. کە گۆشت هات نانەکانیش دەکرێنەوە، تازە تازە، نانی تازەی بۆنخۆش، هەروەها گوڵەکان، شەرابەکان، راکیەکان."

دکتۆر خەلیل رەفعەت بەگ گوتی: "کەوتینە ناوی!"

"حەسەنی راکردوو لەمەنجەڵ گەڕایەوە."

"هەموو ترسنۆکەکان، کاتێك ترسی خۆیان جڵەوکرد دەبنە کەسانی بوێر و نەترس."

موسا ئاغا گوتی: "وایە وایە." بەوردی و لەسەر خۆی بە نموونە هێنانەوە باسی ترسنۆکی و بوێریی کرد. "تۆ راست دەکەیت دکتۆر، ترسنۆکترین کەس دەتوانێت ببێتە ئازاترین کەس."

لەگەنە گۆشتەکان هاتن، گۆشتە لەشیشدراوەکەش بەسەر پۆلوانەوە چزە چزی بوو و بۆن و دووکەڵی گۆشتی برژاو ئەو ناوەی پڕکردبوو. زەهرا برێکی باش گۆشتی برژاوی بردە سەرمێزی ئەوانەی کە دەیانخواردەوە. پاشان گۆشتی سەر ئاگرەکەی برد لە پێش ژن و منداڵەکانی دانا.

موسا ئاغا ئەمجارەش زۆر مەست بوو. ئەوەندە گەش و خۆشحاڵ بوو کە هەمووان واقیان وڕما. موسا ئاغا بێناوبڕ باسی کرێتی دەکرد. کرێت لەسەر زاری ئەو چیرۆکی حەسرەت و خودی ئەویش چیرۆکبێژێکی کۆن بوو. وردە وردە دەنگەکەی بۆ نووزەو لاوانەوە گۆڕا. دەنگ وەکو لێمشتی ئاوێکی بەخوڕ لەدەمیەوە دەردەچوو. کاتێك بەسەر تەنیشتی راستی داکەوت، پۆیراز کە حازر و ئامادە راوەستابوو گرتی، هەڵێستاندەوە، ژێر پیلی گرت و ویستی بیباتەوە ماڵێ کە کچەکانیش هەستان، بەدوای ئەواندا رۆیشتن. بە سەختی لەپلیکانەکان بەسەرکەوتن. پۆیراز کاتێك موسا ئاغای لەسەر جێگاکەی درێژ دەکرد و دەیخەواند دەستی بەدەستی زەهرا کەوت، بۆ ساتێك نیگایان تێکئالا، پۆیراز نیگای خۆی دزیەوە.

میواندارییەکە دوو شەوی دیکەش درێژەی کێشا، بەڵام موسا ئاغا تا سەوادی بەیانی لەسەر مێزی خواردنەوە دادەنیشت، بە ئارامی گۆشتی دەخوارد، بە ئەدایەکی شکۆمەندانە دەم نا دەمێك قسەی دەکرد و لەماوەی ئەو دوو رۆژ دەمی لەخواردنەوە نەدا.

حەسەن هەستی بە بەختەوەری دەکرد، هەموو رۆژێك دەچووە راوەماسی، بە نۆرە ماسی لەنێو ماڵەکان و بەگوێرەی ژمارەی کەسەکان دابەش دەکردن، ئەوەی دەشمانەوە دەیبردنە شارۆچکە و دەیفرۆشتن. جەناب سەرگورد ئیسحاقی لەبیر نەدەکرد، بەتامترین ماسی بۆ ئەو دەبردن. لیڤەرەك، چیپۆرا، لۆفەر، ماسییە چکۆلەی پەڕپان. شلەی ماسیە چکۆلەی پەڕپان بەتامترین شلەیە. کاتێك ئەو شلەیە دەخۆیت بۆنی دەریا لە هەموو بەدەنت دەگەڕێت.

حەسەن لەشارۆچکە بووبووە دۆست و برادەری هەموان. هەرکەسێك کارێکی هەبا بەدوای ئەودا دەگەڕا، هەرکەسێك کێشەیەکی هەبا گوێی لەو دەگرت، بەدوای رێگاچارەیەکدا دەگەڕاو دواجار چارەیەکی بۆ کێشەکەی دەدۆزیەوە. دکتۆرەکان، بەتایبەت سەلمان سامی، خۆشدەویست. کاتێکیش ئەوان پرسیاریان لەبارەی ساری قامیش و رووداوەکانی ئەو سەردەمی کە راکردوو بوو لێدەکرد وەڵامی دەدانەوەو بۆی باسدەکردن. دکتۆر سەلمان سامی هەر جارێك ئەو پرسیارەی لێدەکرد کە چۆن بیرت لەوە کردەوە لە چیاکان بهێیتە خوارو دەریاکان هەڵبژێریت؟ ئەویش هەموو جارێك ئەو پرسیارەی ئاوا وەڵام دەدایەوە: زۆربەی ئەوانەی دابوویانە چیاکان گیرابوونەوە، بەڵام لەدەریا کەس نەگیرابووەوە. حەسەن دەیگوت هیچکەس عەقڵی بۆ ئەوە نەدەچوو کە کەسێکی راکردوو لەنێو دەریادا بژیت. لەنێو دەریا کەس نەیدەپرسی تۆ لە کوێ دێیت و بۆ کوێ دەچیت. حەسەن کاتێك قاچی دەنایە سەر وشکانی لەجەستەیەوە بۆنی دەریای بەو ناوەدا بڵاو دەکردەوە.

لەوەی کە هەموو سەربووردەی خۆی بۆ دکتۆرەکان بگێڕێتەوە دەترسا تۆ بڵێیت ئەو دکتۆرە شێتە، دیسان تووڕە نەبێت و بەڵایەکی دیکەی بەسەر نەهێنێت؟ لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەتوانی پێش بەخۆی بگرێت، نەیدەتوانی ئەو بەسەرهاتەی بەسەری هاتبوو بۆ دکتۆرەکان باس نەکات.

ئەنوەر پاشا لەپێشی پێشەوەی فەرماندەکانی ستادی جەنگی، کە دووانیان ژەنەراڵ و سەرگوردێکی ئەڵمانی بوون، هاتە بارەگای فەرماندەی سوپا، ئەفسەرەکان یەکسەر لەچادرەکانیان هاتنەدەر، ئامادە راوەستان، سڵاوی سەربازیان کرد.

ئەنوەر پاشا لەکاتێکدا قیتاو قیت بەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە بوو بە دەنگی گڕەوە گوتی: "ئەفسەر نییە!" لەبەر ئەوەی قەدو باڵایەکی کورتیلەو دەنگێکی کزی هەبوو بۆیە دەنگی خۆی گڕ و قەڵەو دەکرد. "ئەفسەرانی هێژا، ئەو ناپاکانەی کە یەکەم رۆژ و دوێنێ هێنامن لە دارتان دان یان نا؟"

"هێشتا لەدارمان نەداون، حەزرەتی پاشا."

"چۆن دەبێت، بۆچی فەرمانی من جێبەجێ ناکەن. واتای جێبەجێنەکردنی فەرمان دەزانن. ئەمانە یەکسەر دەبەن و لەنێو دارستانەکە لەداریان دەدەن. بۆچی فەرمانتان جێبەجێ نەکردووم؟"

"حەرزەتی پاشا بڕیارماندابوو ئەمانە ڕەوانەی دیوانی جەنگ بکەین."

ئەنوەر پاشا تووڕە بوو تا هەیبەت و شکۆی دوو بەرامبەر دەربکەوێت. ئەگەر ئەم ڕەوش و شێوەیەی خۆی لەئاوێنەدا هابینابوا لە خۆشحاڵیان باڵی دەگرت. دەنگی لەگەڵ ورگە زلەکەی ڕێك هاتبووەوە:

"ئەمە واتای چیە بەڕێزان، فەرمانده هێژاکان، یانی چی، دادگای سەربازی یانی چی؟" دەنگی خۆی زیاتر هەڵبڕی، "مەگەر ئەمن فەرمانم پێنەکردن؟ دادگای سەربازی چیە؟ مەگەر پێمنەگوتن، ئەم ناپاکانە گوللەباران بکەن و لە داریان بدەن؟ مەگەر نەمگوت سەربازانی راکردوو سەرباز نین، مرۆڤ نین؟ مەگەر نەمگوت ئەمانە گوللەباران نەکەن و فیشەکیان لـێ خەسار مەکەن، بەمزووانە هێرش دەکەینە سەر ساری قامیش و لەماوەی چەند رۆژێکدا ئاڵاکەمان لەوێ دەشەکێنینەوە؟ بەلای منەوە تەنانەت تاکە فیشەکێك دە سەرباز دێنێت. هەر ئێستا بیانبەن و بە داریانەوە بکەن، ئەمە فەرمانە. نامەوێت ئەو راکردووە ناپاکانە، ئەو چەپەڵانە ببینم."

باڵابەرزترین ئەفسەر بە دەربڕینی ئەدای ڕێزگرتنی سەربازییەوە چەند هەنگاوێك بەرەو لای ئەسپەکەی ئەنوەر پاشا چوو، گوتی: "حەزرەتی پاشا!" ئەو فەرماندە قەڵەوەی سوپا، شکۆمەندانە، بە خوێنساردی و بە راوێژێکی نەرم درێژەی دایە قسەکانی: "لکی هەر دارێك بگریت دە سەربازی پێداهەڵواسراوە. راکردووگەلێکی زۆرمان لەدار داون."

"فەرماندە هێژاکان، ئێوە هاتنە ئێرە بە ئاسوودەیی دەخۆن و چای گەرم دەخۆنەوەو گزرەو کۆتەڵی داران دەخەنە نێو ئاورگە و گەرم دادێن. سوپاکەتان، لەشکرەکەتان، فەوجەکەتان لە کوێیە، چییان بەسەر هاتووە، هەموویان رایانکرد، ئەوانتان گرتەوەو بە دارانتان هەڵواسین؟"

ئەنوەر پاشا بەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە بە فیزێکی زیاترەوە چاوەڕێی وەڵامی کرد، کەسیان وەڵامیان نەدایەوە. کە فەرماندەکان دەنگیان نەکرد، بە هەموو هێزیەوە نەڕاندی و ئەسپەکەی یەك دوو هەنگاو بۆ پێشەوە هاژۆت.

"قسە بکەن فەرماندەینە، سەربازەکانتان لەکوێن؟"

ئەنوەر پاشا بەسەر پشتی ئەسپەوە وەکو شێتان هاواری دەکردو هەڵدەبەزییەوە:

"فەرماندەکان، فەرماندەکان، سەربازەکانتان لەکوێن؟ سەربازەکانتان، لەشکرەکەتان، سوپاکەتان، فەوجەکەتان لەکوێن؟ چیتان لێکردن؟ بۆچی ئێستا ئێوە لەلای ئەوان نین؟ چ وەڵامێکتان بۆ گەڵ هەیە بیدەنەوە؟ لەم چەند رۆژە پەلاماری ساری قامیش دەدەین. سەربازەکانتان کۆبکەنەوەو وەپێش بکەون. ئەمە فەرمانە. سبەینێش دێینەوە. دەبێت ئەوانە بە زووترین کات لەدار بدەن. ئەمە فەرمانە."

ئەسپەکەی بەرەو لای دارستان تاودا، دارستان بە تەواوی سپی بوو. لەسەر هەر درەختێك بچووکترین پەڵە نەدەبیندرا. پاشان هەر کە لەدارستانەکە نزیك بووەوە، حەوساری ئەسپەکەی راکێشا، لەمسەر تا ئەوسەر هەر سەرباز بوو بەدرەختەکانەوە هەڵواسرابوو. بۆیە درەختەکان لە درەخت نەدەچوون. ئەنوەر پاشا جڵەوی ئەسپەکەی راکێشا، کەمێك راوەستا، ددان قروچەیەکی بۆ کرد، بە دەنگێکی وەکو فیکەی مار گوتی "ئاوااا." ئەسپەکەی بەرەو لای چیای ئەڵڵاهوئەکبەر تاودا.

فەرماندە باڵابەرزەکە کە باڵای لەوانی دیکە بەرزتربوو پرسی:

"بڕیارە هێرش بکەینە سەر ساری قامیش؟"

فەرماندەکان یەکدەنگ گوتیان: "بۆ سەر ساری قامیش."

سەرتیپێك لەنێو ئەو فەرماندانە هەستاو لەکاتێکدا کە قایشە پشتەکەی رێکخستەوەو هاتەدەر، پرسی: "بۆ سەر ساری قامیش؟"

فەرماندەکان یەکدەنگ گوتیان: "بۆ سەر ساری قامیش."

سەرتیپەکە لە دەرەوە راوەستا، سەیرێکی ناو دارستانی کرد، سەیرێکی لای چیای ئەڵڵاهوئەکبەر و ئینجا ئاسمانی کرد کە تەواو سپی بووبوو و بەفر دەباری، بەرەو لای تاقەداری پشت چادرەکان چوو و لەژێر درەختەکە راوەستا.

دەنگی تەقەیەك لە دەرەوە هات، فەرماندەکان لەچادرەکان هاتنەدەر و چوونە ژێر درەختەکە، هاورێیەکەیان درێژاو درێژ لەسەر بەفرەکە راکشابوو، چاوەکانی زەق بووبوونەوە. سیمای لەسەر سەهۆڵەکان غەڵتانی خوێن بوو.

ماوەیەك بە بێدەنگی، بێئەوەی کە سەیری یەکدی بکەن چاویان بڕیبووە فەرماندە لەسەر عەرد راکشاوەکە. هەرکە یەکێك لەوان گوتی: "ئێستا کە پاشا لێرە نەماوەو بە پێش سەربازەکان

کەوتووەو بەرەو ساری قامیش دەڕوات." فەرماندە قەڵەو و توندوتۆڵەکە گوتی: "مردووەکان خەون نابینن، فەرماندە."

باڵا بەرزترین فەرماندە گوتی: "بەڵام ئەنوەر پاشا خەون دەبینێت."

گەڕانەوە نێو چادرەکە، لەبزیان نەدەبزووت.

فەرماندە توندو تۆڵەکە گوتی:

"بانگی ئەو سەروانە بکەن با چایەك بخۆینەوە."

سەروانەکە هات:

"چاتان هەیە سەروان؟"

"چا هەیە، وەلــێ شەکر نییە."

"ئەنوەر پاشا چەند سەربازی راکردووی گرتوون و هێناونی؟"

"نۆزدە سەرباز، فەرماندە."

"ئەوانەی دوایی دوو مێردمنداڵ بوون، ئەو دووانە کە یەکیان زەرد و ریوەڵەیەك بوو و ئەوەی دیکەش چاوەکانی وەکو چاوی جنۆکان بوون، لە کوێن؟"

"لەنێو چادرەکانن، فەرماندە."

"سەروان، هەموو راکردووەکان هەڵبگرە و لەگەڵ عەریفێك، بە ملازم عومەریش بڵێ، دیسان هەر دەبێت ئەو راکردووەکان لەدار بدات. ئەو دوو سەربازەش بێنە ئێرە."

"سەرچاو فەرماندە."

کەمێك دواتر سەروان، حەسەن و هاوڕێیەکەیشی هێنا.

"مێردمنداڵەکان، ئێمە ویستمان دەربازتان بکەین، بەڵام نەکرا. ئەنوەر فەرمانیدا بەداخەوە. ئێمە دەزانین گوناهتان نییە."

حەسەن و هاوڕێیەکەی بێدەنگ بوون. حەسەن لەدڵی خۆیدا گوتی تەواو، کارمان تەواوە، دەیانەوێت بمانکوژن. مەگەر بڕیار نەبوو بماننێرنە دادگا؟ کەمێك خۆی کۆکردەوە، بە ئاستەم دەنگی لەبەر دەهاتەدەر:

"مەگەر بڕیار نەبوو لەسێدارەمان نەدەن، بماننێرنە دادگا؟"

"هەمووومان، فەرماندەکان گشتیان بڕیارماندابوو بتاننێرینە دادگای سەربازی. هەمووومان دەمانویست دەربازتان بکەین، ئەنوەر پاشا هات، گوتی بەداریانەوە بکەن. فەرمانی پێکردین. فەرمان ئاسنیش دەبڕێت کوڕم، فەرمان ئاسن دەبڕێت."

فەرماندەیەك کە بێئەندازە لاوازو ریوەڵە بوو ملێکی درێژی هەبوو و نزیك ئاگردانەکە دانیشتبوو و دەستەکانی بەرەو ئاگرەکە درێژ کردبوو، هەستاو بەملاو ئەولادا هەژا:

"زۆرمان پێناخۆش بوو کوڕەکانی من، زۆر نیگەران بووین وەلێ نەمانتوانی کارێك بکەین."

فەرماندە قەڵەو و توندوتۆڵەکە هەستا:

"حەسەن، کوڕم، نافیز، رۆڵەکەم، خواتان لەگەڵ کوڕەکانم، خوا رەحمتان پێبکات، خوا بەهەشتتان بە نەسیب بکات. چیبکەین کوڕینە. یەکێك لە فەرماندە مەزنەکانیشمان کەمێك بەر لەئێستا خۆی کوشت. جێگای ئەویش بەهەشت بێت."

فەرماندەی توندوتۆڵ بیری لەنەباتەکە دەکردەوە، بەڵام نەیدەتوانی ئەمە بە حەسەن بڵێت. ئەو ملازمەش کە دوای لەداردانی حەسەن نەباتەکانی لە گیرفانی ئەو دەدۆزێتەوە بە کەسی نیشان نەدەدان. بیری لەوە کردەوە کە فەرماندەی لەشکرە، بەڵام نەیتوانی پێش بەخۆی بگرێت:

"حەسەن، کوڕم، زۆر لەمێژە چامان بە شەکر نەخواردۆتەوە. لەسایەی تۆوە بوو کە چای شیرینمان خواردەوە." تەریق بووەوە، لەشەرمان بووە تنۆکە ئاوێك، لەپڕ پلەو پۆستە سەربازییەکەی خۆی هاتەوە بیر، بە ترس و نیگەرانیەوە هاواری کرد: "سەرباز، ئامادە بە!"

حەسەن ئامادە راوەستا.

"هەرچی نەبات لەگیرفانەکانتدا هەیە دەریانبهێنەو دایانبنێ سەر ئەم مێزە. لەوەی بە دواوە نەبات بە چ کەڵکی تۆ دێت. زۆر دڵگران بووین کوڕم، کوڕم، زۆر دڵگران بووین، بەڵام هیچمان پێنەکرا. ئەنوەر پاشا فەرمانی دا، ئێمە دەمانتوانی چی بکەین. هەمووومان دڵگران بووین. کوڕم، حەسەن، یاللا، تۆ تا دەمێکی دیکە... یاللا. دەستت لەگیرفانەکانت بگێڕە... لەمەودوا نەبات بە چ دەردی تۆ دەخوات. خوا رەحمتان پێبکات منداڵەکان، هەزار رەحمەت."

حەسەن لەکاتێکدا قاچەکانی تێکەئاڵان، تا مێزی ناوەڕاست چووە پێش، بە دەستانی لەرزانەوە نەباتەکانی گیرفانی لای چەپی دەرهێنان و هەڵیڕشتنە سەرمێزەکە. حەسەن بۆ ساتێك ویستی نەباتەکانی کە لەنێو پشتێن و گیرفانی سەر سنگی قایمی کردبوون دەربهێنێت و ئەوانیش بدات، زۆر دەترساو دەلەرزی. زۆری نەمابوو لە هۆش خۆی بچێت. جارێکی دیکەش بیری کردەوە

ئەگەر ئەو نەباتانەش لەسەر مێزەکە دابنێت چ روودەدات، بەڵام دەستی بۆ لای گیرفانی سەر سنگی نەچوو. حەسەن لەکاتێکدا بەوپەڕی دڵەڕاوکێوە لەنزیك مێزەکە وەستابوو، ملازمەکە هاتە ژوور:

"فەرمایشێکتان هەیە فەرماندە؟"

"ئەمانە هەڵبگرەو بیانبە." دەنگی وەکو ناڵە وابوو. "بیانبە بۆ ناو دارستان. کندرتان هەیە؟"

"هەیە، قوربان."

فەرماندە توندو تۆڵەکە هاواری کرد بەشێوەیەك کە رەگی گەردنی رەپ بوون:

"هەیە یانی چی، ملازم؟"

"جەنابی ئەنوەر پاشا، زۆر کندری بۆ هێنابووین، جا چ کندرێك کە چەور کرابوون تایبەت بۆ لەسێدارەدانی سەربازان ئامادەکرابوون، ئێمەیش ئەوەندەمان سەربازی راکردوو پێوەکردن کە تەنها بەشی چوار پێنج سەرباز کندرمان لا ماوە."

"ئینجا؟"

"ئینجا ئەوانەی کە ماون بەو کندرانەی کە رامانچاندون دەیانبەستینەوەو لەسەر عەرزی درێژیان دەکەین و ئاوا دەیانخنکێنین، فەرماندە."

فەرماندە توندوتۆڵەکە بە دەنگێکی بەرزتر نەڕاندی و گوتی: "ئەم فەرمانە لە کوێوە هاتووە؟"

لەگەڵ نەڕاندنی ئەو فەرماندەیە، فەرماندەکانی دیکە کە نزیك ئاورگەکە خۆیان گەرم دەکردەوە لە شوێنی خۆیان راچڵەکین:

"لە جێی خۆتان دانیشن فەرماندە، بۆچی تووڕە دەبن؟ لەسێدارەدان و خنکاندن بە کندر چ جیاوازیەکی هەیە. مەگەر زۆربەی فەرماندەو شازادەکانی عوسمانی بە کندر نەخنکێندراون؟ مەگەر حەزرەتی ئەنوەر پاشاش زاوای سوڵتان نییە؟"

"تۆ راست دەکەیت فەرماندە، ئەو چەند سەربازێکی دیکەمان بۆ دێنێت کە لەسێدارەیان بدەین، ئەو جەلادە خوێنمژە. هەرچەندە سەربازمان دەست بکەون بیانگرین و بیانخنکێنین، بیانخنکێنین، بەڵام هەرچەندە لەسێدارەیان بدەین یان بیانخنکێنین هێشتاش ناتوانین ئەو پیاوە رازی بکەین، دڵی بە هیچ ئاو ناخواتەوە."

سەربازە راکردووەکانیان دانە پێشەخۆ و بردیاننە ناو دارستان. دارستانەکە سپی سپی بوو، نە قاپۆری درەختێك بەدی دەکرا، نە پەلك و گەڵایەك. تا چاو بڕی دەکرد هەر سەربازی بەدارەوەکراو

بوون بە قاچەکانیانەوە کە نووکی پێیان لەزەوی دەخشا، ملی هەندێکیان وەکو کندر راکشابوو. هەندێکیان رووت و قووت بوون و هەندێکیشیان لەنێو جلی دڕاو تێتڕ تێتڕ.

بایەك هەڵیدەکرد بەرگەت نەدەگرت، سەربازەکان لەسەرما توانای ئەوەشیان نەبوو پەنجە دابنێنە سەر پەلاپیتکەی تفەنگەکانیان، تەنانەت نەیاندەتوانی پەنجەکانیان ببزێون.

راکردووەکانیان ریزکردن، سەربازێك کندرێکی لەئەستوورترین لکی درەختێك گرێدا. یەکەمین راکردوویان کە یەکێکی بە هەیکەل بوو بردە بن درەختەکە، راکردووەکە بەرگری نەکرد و هەڵقەی کندرەکەیان خستە ملی، شەختەکانی ژێر قاچیان راماڵین، سەرە پەنجەکانی لە عەرزی دەخشان و وەکو فرفرۆك بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە. زمانە درێژەکەیشی لە زاری هاتبووە دەر. وردە وردە روخساری شین هەڵگەڕا. راکردووی دووەم و سێیەمیان برد، بەهەمان شێوە بەداریانەوە کردن. ژێر باڵی راکردووی چوارەمینیان گرت، کابرای چوارەم بە تەکانێك هەردوو سەربازەکەی خستە سەر عەرز. هێشتا ئەو دوو سەربازە هەڵنەستابوونەوە کە سەربازەکانی دیکە پەلاماریاندا. راکردوو کە کەسێکی بەهێز و چوار شانە بوو بە چەند تەکانێك ئەوانیشی لەسەر شەختەکاندا تەخت کردن. نزیکەی هەموو سەربازەکان وەرگژانە سەری و دەستەکانیان لە دواوە بەستن، لەسەر پشت لەنێو بەفر درێژیان کرد. ئەو کندرەی کە شەوی پێشتر رۆنیان لێدابوو، لە ملیان ئاڵاند، سەرێکی کندرەکە دوو لەسەربازەکان گرتیان و سەرەکەی دیکەش دوو سەربازی دیکە. کندرەکە شەوی پێشتر جارێکی دیکە چەور کرابوو، مولازمەکە بە نەڕاندنەوە فەرمانیدا:

"بە هەموو هێزتانەوە کندرەکە رابکێشن ئەمە فەرمانە."

یەکەمجار چاوەکانی سەربازی راکردوو لە قۆڵتی چاوی دەرپەڕین و زۆری نەمابوو بە تەواوی دەربچن. پاشان هەموو جەستەی وێکهاتەوە، ئینجا شل بوو، گرژ بوو، بەرز بوو، نەوی بوو، پاشان لەرزی، ئینجا ئارامتر بووەوە، ماوەیەك ئەو لەرزە سستانە بەردەوام بوون. پاشان، ئاوا بە هەڵواسراوی لە جووڵە کەوت.

ملازم گوتی:

"بەمشێوەیە ئاسانترە. هەموویان ئاوا ... پێموابێت ئیدی ئەوانی دیکە زەحمەتیان ناکەن. ئەمە هەموو لەبەرچاوی خۆیان روویداو بینیان. بەرگری ناکەن، یاللا، یەکێکیان بێنن، لێرە درێژی بکەن. ئەو کندرەتان لە کوێ پەیدا کرد؟"

"فەرماندە، عەریف عوسمان ئەم کندرەی تا بەیانی چەور کردو ئامادەی کرد. عەریف عوسمان دەڵێت بەو کندرە دەڵێن کندری پاشاکوژ."

راکردووەکانیان بە نۆرە لەسەر شەختەکە درێژ دەکرد. کندرە چەورکراوەکەیان لەمل دەئاڵاندن و بێئەوەی زۆر زەحمەت بکێشن، ساتێکی کەم تەکانیان دەخواردو دەلەرزین و پاشان لەسەر شەختە و بەفرەکە بێدەنگ دەبوون و لەجووڵە دەکەوتن.

لەماوەیەکی کورتدا ژمارەی راکردووەکان بەنیوە بوو. تا خۆرئاوا بوون دەبوا هەموویان بخنکاندبوان.

نۆرە گەیشتە سەر رۆستەم پاڵەوان. ئەو وێڕای هەموو شتەکانی دیکە، بەهێز دیاربوو. کاتێك کە خەریکی ئەوە بوون لەسەر عەرزەکەی درێژ بکەن، بەرگری کرد، ئەوانەی کە قۆڵیان گرتبوو لەسەر شەختەکە تەختی کردن. ئەو کەسانەی بۆ لای دەهاتن بەلای راست و چەپدا فڕێی دەدان. رێك لەو ساتەدا، حەسەن کە کەسی یەکەمی ئەو ریزەبوو، دەستی هاوڕێکەی خۆی گرت و بەرەو ناو دارستان رایکرد. ناو دارستانەکە بەفر تا ناوقەدیان دەهات. چەند کەسێك کە رۆستەم پاڵەوانیان لەسەر عەرزەکە درێژکردبوو و هەڵقەی کندرەکەیان لەملی ئاڵاندبوو، حەسەن و هاوڕێکەیان لەکاتی راکردن بینی، ملازم فەرمانی دا و سەربازەکان لوولەی چەکەکانیان کردە حەسەن و برادەرەکەی و چاوەڕێی فەرمانی ((تەقە بکەن!))ی ملازم بوون. حەسەن ئاوڕی دایەوەو سەیری دواوەی کرد بینی وا سەربازەکان دەستیان لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگەکانیانە و چاوەڕێی فەرمانی ملازمەکە دەکەن. هاوڕێکەشی ئاوڕی دایەوەو سەیری کرد... خۆیان فڕێ دایە پشت قاپۆری درەختێکی گەورەی کەمێك ئەولاترو تا چەناگەیان لەبەفرەکە ختم بوو. کەمێك ئاوا لەنێو بەفرەکە مانەوە، کاتێك سەریان هەڵبڕی و ئاوڕیان دایەوە هێشتا سەربازەکان لوولەی تفەنگەکانیان لەوان کردبوون و ئامادەی تەقەکردن بوون. ئەگەر لەو مەودایە کەمەدا تەقەیان کردبوا، تەنانەت سەربازێکی نەشارەزاش دەیتوانی هەردووکیان بهەنگێوێت. هیچ کامیان خۆیان نەدەجووڵاند و هەموویان دەست لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگ چاویان بڕیبووە چاوەکانی ملازم. بەدەم کوتەکشکاندنەوە سەد هەنگاوێك چوونە پێش، لەپشت قاپۆری درەختەکە دەرپەڕیبوون. دیسان ئاوڕیان دایەوە، نیگایان لەنیگای ملازمەکە گیر بوو. چاوەکانی ملازم ئاگریان لێدەباری. یەکسەر لەسەر بەفرەکە راکشان، بە سنگەخشکە رۆیشتن و تا قاپۆرێکی ئەستووری درەختێکی

دیکەیان نەدۆزیەوە هەڵنەستانە سەر پێوە. دواجار کە ئاوڕیان دایەوە بینیان وا ڕۆستەم پاڵەوان لەبەر پێی ملازم قاچەکانی خڕکردوونەتەوەو گرمۆڵە بووەو ئاوا لەو گۆڕە تخێڵ بووە.

ئیدی ئاوڕیان لەدوای خۆیان نەدایەوەو لەکاتێکدا یەك دوای یەك نەباتەکانیان کە حەسەن لەگیرفانی سەر سنگی شاردبووینەوە، دەرهێنان و خستنیانە دەمیان، لەدارستانەکە دەرچوون. لەوە بەدواوە دەشت بوو. کەوتنەڕێ. هاوڕێ ئێسك و پێستەکەی حەسەن گیانی هاتووەوەبەر و دەتوانین بڵێین وەکو حەسەن دەڕۆیشت. لەپێش خۆیدا چاویان بە دووکەڵێك کەوت، بەرەو لای دووکەڵەکە ڕۆیشتن. کە نزیك بوونەوە سەیریان کرد هیچ دووکەڵێك لەوێ بەدی ناکرێت. ئەدی ئەگەر دووکەڵ نەبووبێت چیبوو، کەمێك لەولاتر دیسان دووکەڵێك لەعەرزەکە بەرزبووەوە. دووکەڵ، باریك و درێژ بۆ ئاسمان دەچوو. ئەمجارە لەچەپ و ڕاستی خۆیاندا دووکەڵی دیکەیان بینی کە لەعەرز بەرز دەبوونەوە. دووکەڵەکان تا دەهات زیاتر دەبوون، ڕاست بۆ ئاسمان هەڵدەکشان.

"دەبێت گوندێك لێرە هەبێت. هەیە، بەڵام لەکوێیە؟"

هاوڕێکەی گوتی: "دەبێت لەم دەوروبەرە بێت، لەو شوێنانەی دووکەڵیان لێهەڵدەستێت."

حەسەن گوتی: "دۆزیمەوە." سێ پێپلیکەی هەڵکەندراوی بەردەم خۆیانی نیشاندا. دەرگایەکی هەڵکەندراویشیان بەرامبەر دیاربوو. لەدەرگاکەیاندا، چاوەڕێیان کرد. دەنگی ژن و منداڵ و دەنگی پیاوان و دەنگی دیکەش دەهات. چاوەڕێان کرد، دەنگەکە نەما، دووبارە لەدەرگایان دایەوە، دووبارە دەنگەکان...

گوتیان: "میوانی خواین. دەرگامان لێبکەنەوە. ئێمە پیاو خراپ نین."

پیرەمێردێك دەرگای کردەوە.

"ئێمە دوێنی بەیانی لەمردن هەڵاتووین. مەترسن، ئێمە سەربازی ڕاکردووین."

"فەرموون وەرنە ژوورنە."

چوونە ژوورێ، لەلای دەستە چەپ دەرگای چوونە ژوورەوە بوو و لەوێ بۆنێکی توندی سەرگینی ئاژەڵان دەهات.

"ئێوە جاری یەکەمە کە دێنە ئەم خانووە ژێر زەمینیانە؟"

"جاری یەکەمە."

"لێرە، لەسەر زەوی بە زستانان بەرگەی ئەو سەرماو سۆڵە و بەفر و تۆفانە ناگیرێت."

لبادی گوڵچن لەسەر عەرزەکە ڕاخرابوون کە مرۆڤیان سەرسام دەکرد، لەسەر لبادەکان بالیفیان بە دیوارە سپیکارییەکان هەڵنابوون، لەپێش بالیفەکانیش دۆشەکی ئەتڵەسیان ڕاخستبوون. پیرەمێرد بەخێرهاتنی کردن و خولقی کردن کە لەسەر دۆشەکەکان دابنیشن. پێڵاوەکانیان دوورتر داکەندبوون و لەسەر دۆشەکەکان دانیشتن و پاڵیان وەبالیفەکانەوە دا.

"ببوورن میوانانی خوا، ئێرە جێگایەکی شایستە نیە بۆ میوان. یەکەم نانمان نیە، هەمووی سەربازەکان بردیان، دووەم ساوار، سێیەم قاوەشمان نیە. بەر لەجەنگ کاتێك میوانێك دەهاتە ئەم ماڵە، بە دوو ئاونان قاوە دەکوترا. بە شەو و ڕۆژ بۆنی قاوە لەم ماڵە دەهات. ئێستا چا هەیە، بەڵام شەکر نییە. نانیش نیە. نە ئارد و گەنم و ساوارمان هەیە، نە... هەرچی هەمانبوو سەربازەکان بردیان. تەنها مەڕو مانگاکانمان ماون، ئەوانیش وا وردە وردە سەردەبڕین و دەیانخۆین. هەموو گوند وەکو ئێمەیە. دەیان هەزار گوند وەکو ئێمە دەژین. لەم گوندانە پیاوێك نەماوەتەوە، ئەوانەی ڕۆیشتن نەگەڕانەوە. لەم ماڵەشدا پێنج کوڕە گەنج ڕۆیشتن، کارتی کوژرانی هەر پێنجیشیان هاتۆتەوە. دیارە نەیانتوانیوە ڕابکەن."

حەسەن و هاوڕێکەی سێ ڕۆژان لەماڵی پیرەمێردەکە مانەوە. ڕۆژی دووەم بوو کە پیرەمێرد مەڕێکی کوشتەوە. بەبێ نان، کەبابی تاوەیان بە ماست خوارد.

"هیچکام لەوانەی لەو ژێر زەمینانە دەژین نانیان نیە، مەڕەکانیان دەکوژنەوەو گۆشتیان دەخۆن. ئەگەر مەڕەکان تەواو بوون مانگاکان دەکوژنەوەو دەیانخۆن. هەواڵی ناخۆش لەبەرەکانی جەنگ دێن، دەڵێن سەربازەکان لەبرسان لەنێو دەچن. هەرکە بینیتان هاتن و مەڕو مانگاکانیشیان بردین."

کاتێك ئەوێیان جێهێشت پیرەمێرد پەنیری پێستەی دانێ.

"لەنێو بەفر و سەرمادا ئەمە بخۆن، بەڵکو بتانپارێزێت و لەسەرمان ڕەق نەبنەوە."

ئاوا دێ بەدێ ڕۆیشتن تا گەیشتنە نزیك ئەرزەڕۆم.

هاوڕێکەی حەسەن گوتی: "هاوڕێم، من دەچمە ئەرزەڕۆم بەڵکو یەکینەکەی خۆم بدۆزمەوە. باش بوو کە نەیانتوانی بمخنکێنن، دەنا ئێستا بە سەربازی ڕاکردوو لەقەڵەم درابووم."

یەکدیان گرتە باوەش و خوا حافیزیان لەیەکدی کرد. هاوڕێکەی حەسەن بەرەو ئەرزەڕۆم ملی ڕێگای گرت. حەسەنیش ڕێگایەکی دیکەی گرتەبەر و ئەسپ و خورجینی بۆ خۆی کڕین. تا چیاکانی دەریای ڕەش ڕۆیشت، چیاکان پڕبوبوون لەسەربازی ڕاکردوو و زۆربەیان بووبوونە ڕێگر.

لەگوندەکاندا تەنها پیاوانی زۆر پیرو مێردمندالّی خوار پانزده سالّی مابوون. حەسەن چووە گوندێك کە کەوتبووە دۆلّێکی پڕ دارو درەخت و خانووە لە تەختە دروستکراوەکانیان رەنگاورەنگ و سەربانیان بە خۆلّی سوور سواخ درابوون و دارگوێزی گەورە گەورە دەوری گوندەکەیان دابوو. ژنانێکی بینی کە لەژێر دار بەرووییێکی گەورە خووریان دەرێساو کریان دەچنی، سلاّوی لێکردن، ژنەکان لەبەری هەستان و وەلاّمی سلاّوەکەیان دایەوەو گوتیان: "بەخێر هاتی!" حەسەن، لەولاتر پیرەمێردێکی بینی کە ردێنێکی درێژی هەبوو پشتی کۆم بووبووەوە، چوو لەسەر لایەکی نیوتەختێکی تەختەی رەنگ رۆیشتووی شکاو و رزیو کە پیرەمێردەکە لە سەری دانیشتبوو، دانیشت. پیرەمێردەکە کە بینی میوانێك لەتەنیشتیەوە دانیشت، خۆشحالّ بوو. یەکسەر سەری قسانیان کردەوە.

حەسەن گوتی:

"لە چیای ئەللاّهو ئەکبەرەوە دێم."

"مەگەر لەوێ هەمووان رەق نەبوونەوە؟"

"رەق بوونەوە."

"تۆ چۆن قوتار بوویت؟"

"من بە خواردنی نەبات خۆم گەیاندە سەر چیا، بە خواردنی نەباتیشەوە هاتمەوە خوار."

"مرۆڤ ئەگەر نەبات بخوات رەق نابێتەوە؟"

"رەق نابێتەوە. باوکم ماوەی سەربازییەکەی لەو ناوچانە بووە، من کە دەچوومە سەربازی پێیگوتم، وای کوڕەکەم نەکەیت پالّتۆی خووری بپۆشیت، گیرفانەکانت پڕ بکە لە نەبات."

"باوکێکی ژیرت هەبووە، نەبات لێناگەڕێت مرۆڤ سەرمای ببێت. تۆ ئێستا سەربازی راکردوویت؟ چیاکان پڕن لەسەربازی راکردوو."

"من سەربازی راکردوو نیم. لەوەتەی لەچیا هاتوومەتە خوار، بە دوای فەوجەکەمدا دەگەڕێم، بەلاّم تا ئێستا نەمدۆزیوەتەوە. ئەگەر لەم ناوەش نەیدۆزمەوە نازانم دەبێت چیبکەم."

"تۆ ئەمشەو لەمالّی ئێمە بمێنەوە. دلّم زۆر تەنگ بووە. لەگوندی ئێمەدا تاکە پیاوێك چیە نەماوەتەوە. زۆر دلّم تەنگ دەبێت لەنێو ئەم ژنانە. هەندێکیان چاو لەرێی کوڕەکانیانن، بەشێکیان چاوەڕێی هاوسەرەکانیان، هەندێکی دیکە هی دەستگیرانەکانیان، هەندێکیشیان چاوەڕوانی گەنجێك دەکەن کە بێت و هاوسەرگیریان لەگەلّدا بکات. هیچ قسەیەکی دیکەیان نییە

لەوە بترازێت. خەریکم لەخەمان دڵم شەق دەبات، خۆزگە بمردبوام، هەموو رۆژێك دەمرم و زیندوو دەبمەوە."

ئەو شەوە لەماڵی مام حوسێن مایەوە، پیاوێکی دنیا دیدە و بە ئەزموون بوو. حەسەنی کەوتە بەر دڵ. پێیگوت هەرچەندی بیەوێت دەتوانێت لەوێ بمێنێتەوە. حەسەن دە رۆژان لەماڵی ئەو مایەوە. نەیدەتوانی زیاتر بمێنێتەوە، ماڵەکە قەرەباڵغ بوو، پێنج بووك لەماڵێدا بوون. بووکەکان چاوەڕێی هاوسەرەکانیان بوون کە کارتی کوژرانیشیان هاتبووەوە. منداڵەکانیان سەرك و بنك بوون. خواردنیان گەنمە شامی و گوێز بوو. گەنمە شامییەکەش وردە وردە لەتەواوبووندا بوو و تەنها هەر گوێز مابوون. حەسەن لەماڵی مام حوسێن رۆیشت و چووە ماڵ دونە کە بە تاقی تەنیا دەژیا. دونە لەبەر ئەوەی هەر خۆی بوو گەنمە شامی زیاتری هەبوو. درەختەکانیشی زیاتر بوون. حەسەن بڕیاری دا لەو گوندە بمێنێتەوە. لە ماڵە گەورەو دوو نهێمیەکەی دونە نیشتەجێ بوو. براکان، هاوسەر، خزم و کوڕەکانی دونەش چووبوونە بەرەی شەڕو نەگەڕابوونەوە. کەس لەماڵێ چاوەڕێیان نەبوو، بووکەکان چووبوونەوە ماڵە باوانیان. حەسەن و دونە وەکو دایك و کوڕ وابوون. حەسەن پیاوێکی لێهاتوو بوو، قژێکی ئاڵتوونی، قەدو باڵایەکی بەرزو چاوەکانی شین بوون. لە کاتی قسەکردندا بە بەردەوامی پێدەکەنی. هەموو رۆژێك لە رووبارەکەی لای خوارێ ماسی دەگرتن. منداڵەکانی گوندیشی فێری ماسیگرتن کردبوون. رووبار ئەوەندەی ماسی تێدابوون کە لەرەلەری بوو لە ماسیان، هەموان حەسەنی تاکە پیاوی گوندیان خۆشدەویست. حەسەن سەرسام بوو، مرۆڤگەلێکی ئاوا باشی وەك ئەم گورجیانەی هەرگیز نەبینیبوو. خوا دەزانێت، ئەوانەی کە چوونەتە سەربازی و نەگەڕاونەتەوە کوڕە گەنجی چەند لێهاتوو و قۆز بوونە. حەسەن هەموو رۆژێك وەك چۆن ماسی بۆ ماڵی خۆی دەهێنانەوە ئاواش بۆ ماڵی مام حوسێنی دەبردن. وەك چۆن دارگوێزەکانی پوورە دونەی دادەوەشاندن و توێکڵی دەکردن، هاوکاری ژنەکانی دیکەیشی دەکرد. حەسەن لەماوەی چەند مانگێکدا بووە دەمڕاستی ئاوایی. ئیدی دەبوا لەو گوندەی بمێنێتەوە. تاکە پیاوی گوندێکی بەو گەورەییە خۆ ناتوانن بنێرنە سەربازی. لە کاتی هاتنی لەهەموو دێهاتەکانی سەر رێگا جگە لەیەك دوو پیاوی زۆر پیر بترازێت پیاوێکی دیکە نەمابوو... فاتیمە، کچە دراوسێکەیان، جوانترین کچی گوندەکە بوو. ژنانی گورجی لەو ژنانە نەبوون کە لەبەر پیاوان رابکەن و خۆیان لێبشارنەوە. فاتیمە رۆژێك هاتە لای دونە و پێیگوت:

"پووره دوونه، من بۆ حەسەنی کوڕت داخوازی بکە. کوڕەکەت یەکێکی لەمن باشتری لەکوێ دەست دەکەوێت؟"

دونە گوتی: "تۆ کچێکی جوانیت، راوەستە با بە حەسەنی بڵێم، با بزانم دەیەوێت لێرە بمێنێتەوە یان دەگەڕێتەوە مەملەکەتی خۆیان."

فاتیمە گوتی: "بپرسە. ئەو بچێتە هەر جێیەك منیشی لەگەڵ دەچم."

لەماوەی چەند رۆژێکدا شیرینیان خورایەوە، مام حوسێن ئەڵقەی دەستگیرانیەکەیانی کردنە پەنجە. لەو بارەیەوە قسەو قسەلۆکێکی زۆر لەگونددا کەوتە سەر زمانان: مرۆڤ چۆن دەتوانێت ببێتە دەستگیرانی کەسێکی ئاوا، دیار نیە لەکوێ هاتووە، دەچێتە کوێ، کێیە و دەیەوێت چ کارێك بکات. ئایا خەتەنەکراوە، نەکراوە، کەسێك بینیوویە، فاتیمە ئەمەی بینیوە؟ و ئەو جۆرە قسە و قسەلۆك و پرسیارو باس و خواسانە ئاوا زار بە زار دەگەڕان.

حەسەن نەیدەتوانی بەنێو دێ یان بە نزیك کانیەکەدا تێبپەڕێت. گرانایی سەدان نیگای لەسەرخۆی هەست پێدەکرد. دواجار، نەیتوانی بەرگە بگرێت، مام حوسێنی بانگ کردو پێکەوە چوونە لێوی کانیەکە. رۆژی یەکەم ژنەکان تاسان و نەیانتوانی تەماشایان بکەن. هەفتەیەك دواتر، ئاسایی بوونەوەو تەنانەت یەك دوو پیرەژن سەیری حەسەنیشیان کردو بە روویدا گرژینەوە.

گوێزەکان کاتی داوەشاندنیان هات. حەسەن دارگوێزەکانی خۆیانی داوەشاند، گوێزەکانی کۆکردنەوە، توێکڵە سەوزەکەیانی لێکردنەوە، کردنیە نێو گونیە. پاشان یارمەتی مام حوسێنی دا کە دارگوێزی زۆری هەبوون، گوێزی بەرزترین لك و قەدەکانی دارگوێزەکانی داوەشاندن و بە گوێزوەشێنی درێژ لکە هەر بەرزەکانی تەکاندان و هەموو گوێزەکانی لێکردنەوەو کۆتمەرەی کردن. ژنەکان بە ئاسانی توێکڵەکانیان لێدەکردنەوە. مێردمنداڵ و منداڵە گەورەترەکان بە لکە بەرزەکاندا هەڵگەڕان و گوێزیان کۆدەکردەوە. سێ کچۆڵەی گەنج و پێنج منداڵ لە دارگوێزەکان کەوتن. باوکی حەسەن بەیتاڵ بوو. مام حوسێنیش هەندێك سەری لە شکستەیی دەردەچوو، پێکەوە بەسەر شکستەکاندا راگەیشتن و هەڵیانبەستنەوە. ژنەکان گوێزیان بە سەوان کۆکردنەوەو بۆ فرۆشتن هەر بە سەوان بردنیان بۆ شارۆچکەی لێوار. لە ماوەی هەفتەیەکدا هەموو ئەو گوێزانەی کە بۆ فرۆشتنیان جیاکردبوونەوە فرۆشتنیان. فاتیمەش بەشێك لەو گوێزانەی کە حەسەن کۆیکردبوونەوەو توێکڵیان کردبوون، هەڵیگرتن و بردنیە شارۆچکە. حەسەن بەمە دڵگران بوو. ئەگەر بیتوانیبوا بچێتە شارۆچکە، مەحاڵ بوو لێبگەڕێت فاتیمە ئەو بارە قورسە بە کۆڵ

هەڵبگرێت و بیباتە شارۆچکە، بەڵام ئەو نەیدەتوانی بچێتە شارۆچکە ژنەکان زانیان کە بۆچی حەسەن ناتوانێت بچێتە شارۆچکە. ئەمەیان تەنها لەنێو خۆدا باسکردو غەیبەتیشیان کرد.

رۆژێك حەسەن کاتێك خەریك بوو لەپەنجەرەڕا سەیری دەرەوەی دەکرد، جەندرمەی بینین، ویستی لەپەنجەرەوە دەربپەڕێت و رابکات لەوکاتەدا یەکێك لە دواوە باوەشی پێداکرد، کە ئاوڕی دایەوە سەیریکرد جەندرمەیەك بوو لەلای چەپیەوە بوو و لەگەڵ ئەو جەندرمەیەی کە لە پشتەوەڕا گرتبووی دەستەکانیان بەستن و بردیانە دەرەوە. فاتیمە کە لەژێر دارگوێزەکەی بەرامبەر راوەستابوو، زەرد زەرد هەڵگەڕاو لەجێی خۆی وشك هەڵاتبوو. حەسەن ئەوودەمەی بە بەردەم فاتیمەدا رەت دەبوو، گوتی: "چاوەڕێم بە فاتیمە، زوو یان درەنگ دێمەوە لات." ئەم قسانەی هێند بە دڵنیاییەوە دەربڕین کە فاتیمە لەرزی، دەیویست هەندێك شت بە حەسەن بڵێت، بەڵام نەیتوان دەمی هەڵبڕێت. کاتێك حەسەن لەگەڵ جەندرمەکان لەبەر چاوان ون بوو، فاتیمە ئەوسا توانی بڵێت: "تا ئاخیری ژیانم."

ئەو دەمەی لەچیاکە دادەبەزین حەسەن سەیری جەندرمەکانی کرد بینی هەر ئێسك و پێستن و قاچیان تێکدەئاڵێت. کەمێك دەڕۆیشتن و ماندوو دەبوون و لێیاندەبڕاو لەپەنا بەردێك خۆیان خڕدەکردەوە سەریەك و دادەنیشتن. لەقسەکانیشیان بۆی روون بووەوە کە تفەنگەکانیشیان خاڵین. جەندرمەکان لەبەر ئەوەی هەر دەڕۆیشتن و دادەنیشتن و بە زەحمەت رێگاکەیان دەبڕی حەسەن خۆی دوا دەخست. جەندرمەکان لە حەسەنیان پرسی بۆچی باش ناتوانیت بڕۆیت، حەسەن دەیگوت: "دەستەکانم بەستراون، ئەدی ئێوە بۆ ناتوانن بڕۆن."

چیاکان پڕبوون لەسەربازی راکردوو. هەندێکیان رێگریان دەکرد، هەندێکی دیکەیان لە ئەشکەوتەکاندا خۆیان دەشاردەوە. زۆربەی هەر زۆریشیان پەنای دەبردە بەر ئەو دێهاتانەی کە تەنها پیر و پەککەوتەو بێوەژن و کچانی جحێڵ و منداڵیان تێدا مابوون. هەواڵی زۆر لەو دێهاتانەوە دەهاتن و جەندرمەش هەموو رۆژێك بۆ راوکردنی ئەو سەربازانە بەسەر ئەو دێهاتە شاخاویانەیان دادەدا کە یان رێگایان نەبوو یان رێگاکەیان بەردەڵان و سەخت بوو. هەندێکجاریش لەگەڵ سەربازە راکردووە رێگرەکان دەرگیر دەبوون، دەیانکوشتن و دەکوژران، ئەو جەندرمانەی نەیاندەتوانی ئەو گوشار و سەختیانە بەرگە بگرن، تفەنگەکانیان هەڵدەگرت و تەڤلی ئەو دەستەو گروپە راکردووە رێگرانە دەبوون، هەندێکیشیان بۆ شارەکانی خۆیان دەگەڕانەوەو لەوێ یەکسەر دەستگیر دەکران و رەوانەی دادگای سەربازی دەکران.

"ئەوانەی ڕەوانەی دادگای سەربازی دەکران، لەنێو دارستاندا لە دار دەدران؟"
سەردەستە بە تووڕەییەوە گوتی: "هەڵبەتە کە لەداریان دەدان. دەتەوێت چیان لێکردبوان، خزمەتیان کردبوان و دایانبەستبوان؟ جاران گوللەبارانیان دەکردن. گوللە نەمان گوللەبارانیان بکەن، ئێستا هەموویان لە دار دەدەن."
حەسەن قەدەمی شکان و نەیتوانی بە ڕێگادا بڕوات.
"هەستە حەسەن، ئەگەر گوللەمان پێبوان هەر ئێستا لەکۆڵمان دەکردیەوە. زۆر ڕاکردووی وەکو تۆم لەسەر ئەو چیایانە گوللەباران کردوون. ئەگەر کندرم پێبوا بەم دارگوێزەمەوە هەڵدەواسیت و تەرمەکەشتم فڕێدەدایە ئەو دۆڵەی خوارەوە. زۆر تەرمی خائینانی وەکو تۆم لەو هەڵدێرگایانە فڕێ داونەتە خوارێ و بوونەتە خۆراکی ئاژەڵانی کێوی، هەستە وەڕێکەوە!"
"دەستم بەستراون ناتوانم بڕۆم. من ڕاکردوو نیم سەردەستە، من بەدوای فەوجەکەی خۆمدا دەگەڕێم، بە دوای فەوجەکەمدا دەگەڕام کە هاتم و گەیشتمە ئێرە، بەڵام نەمدۆزیەوە."
"فەوجەکەت چیلێهات؟"
"وا بەدوایدا دەگەڕێم سەردەستە. فەوجەکەم بۆتە دڵۆپێك ئاو و بە عەرزیدا ڕۆچووە. ئاخر من چۆن دەتوانم خیانەت لە نیشتمانەکەم بکەم. تۆ لە جێی من بوایت بەدوای فەوجەکەتدا نەدەگەڕایت. ئەگەر فەوجەکەم بدۆزمەوە کارتی کۆتاییهاتنی خزمەتی سەربازیم وەردەگرم."
حەسەن هەموو هێزو توانی خۆی کۆکردەوەو دەستیکرد بە ڕازیکردنی سەردەستە، بەڵام هەر نەیتوانی دڵی وەك بەرد ڕەقی سەردەستە نەرم بکات. تووڕە بوو:
"سەیرکە سەردەستە، تۆ بەردێکی لەخۆت گەورەترت هەڵگرتووە. دەزانی من کێم. ئەمن ئەنوەر پاشا خۆی... تۆ ئەنوەر پاشا دەناسیت؟"
"دەیناسم، کێ هەیە ئەو نەناسێت."
"بەڵێ، ڕۆژێك ئەنوەر پاشا بانگی کردم و گوتی کوڕم، وەرە ئەم کاغەزە وەربگرە و بیخەرە گیرفانت، بڕۆ فەوجەکەت لە هەر جێگایەکە بیدۆزەرەوە، ئێستا کاغەزەکەم پێیە، دەستەکانم بکەرەوە با پیشانت بدەم. ئەگەر پاشا بزانێت منتان کە بەدوای فەوجەکەمدا دەگەڕێم لەسێدارە داوە فەرمان دەردەکات تۆ بە هەموو یەکینەکەتەوە لەسێدارە بدەن. ئەو لە هەموو جێگایەك چاو و گوێی هەن." حەسەن بێدەنگ بوو، خۆی ساف و ڕێکخستەوە، بە ڕاوێژێکی فەرماندەرانە

گوتی: "ئامادە، ئەمە فەرمانە، یەکسەر دەستەکانم بکەرەوە. پاشانیش ئەگەر لە ئەنوەر پاشا ناترسیت هەر جێگایەکی پێتخۆشە بۆ ئەوێم ببە."

سەردەستە لە کاتێکدا رەنگی بە رووانەوە نەمابوو هات دەستەکانی حەسەنی کردنەوە.

حەسەن گوتی:

"من دەگەڕێمە گوند، لەگوند دەستگیرانم هەیە. بینیت کاتێك کە دەهاتین لەبن دارگوێزەکە راوەستابوو و دەگریا. بگرە ئەم کاغەزەی ئەنوەر پاشا ببەو بیدە بە فەرماندەکەت. ئەمە فەرمانە، یەکسەر دەبێت بیبەیت. دوای سێ رۆژی دیکە من خۆم دێمە شارۆچکە، کاغەزەکەم لەسەروان وەردەگرمەوە."

گەڕایەوەو کەوتەڕێ. دوای ماوەیەك رۆیشتن ئاوڕی دایەوەو سەیرێکی دواوەی خۆی کرد، جەندرمەکان راوەستابوون و سەیری ئەویان کردبوو. بە باریکە رێگایەکی پێچاوپێچ پێچی کردەوە بۆ پشت زنارەکان، لە جیاتی بچێتە دۆڵەکە ملی چیای گرت. بەنێو درەختەکاندا مل بە ملی جۆگەلە ئاوێکی باریك کە لە کانیەکەوە سەرچاوەی گرتبوو دەڕۆیشت، خۆی گەیاندە سەر کانیەکە، لەوێ ئاوی خواردەوە. لە نزیك کانیەکە چەند دارگوێزێك هەبوون، ژمارەیەك گوێزی خڕ و ئازای بۆ خۆ لێکردنەوە. لەگیا دڕکاویەکانی ئەوێ سەبەتەیەکی دروست کرد و گوێزەکانی کردنە ناو سەبەتەکە. لە رۆخ کانیەکە دانیشت کە دەوروبەرەکەی هەموو پونگە بوو، پونگەکە گوڵی وردیلەی دابوون. کاکڵە گوێزە سپی و تازەکانی خواردن، خەوێك بەسەر چاوانی داهات و لێینووست.

# بەشی سێیەم

بەلەمێك لە ئەسکەلە لەنگەری گرت. یەکەمجار منداڵەکان، دوای ئەوان گەورەکان چوونە پێشوازیی میوانەکە. بەر لە هەموویان پزیشکی ئاژەڵان، پاشان ئەوانی دیکە بە میوانەکەیان گوت: "بەخێر بێن!" میوانەکە بە دەمی بەبزەوە گوتی: "من ناوم وەستا ئارسۆنە. من ماوەیەکی زۆر لەم دوورگەیە ماومەتەوە. بریندار بووم." ئاوڕی لەلای کڵێسا دایەوەو بەدەست بینایە رووخێندراوەکەی کڵێسای نیشاندا: "لەکاتی شەڕەکە ئەو کڵێسایەیان کردبووە نەخۆشخانە. خوا خێریان بنووسێت. دکتۆرەکان لێرە برینەکانیان تیمار کردم من لە سەربازی، تفەنگساز بووم، واتە ئەو تفەنگانەم چاك دەکردنەوە کە تێکدەچوون. خەڵکی چیاکانی توورۆسم. کە چاك بوومەوە، چوومەوە شارۆچکەی خۆمان، کەس و کارەکانم کەسیان نەمابوون. دراوسێکان هەفتەیەك میوانداریان کردم. هێشتا جلی سەربازیم لەبەر بوو. شەوێك دراوسێیەکم بردمیە وێستگەی شەمەندۆفەر، سواری شەمەندۆفەری ئەستەنبۆڵ بووم. لەوێ خزمم هەبوو، دۆزیمنەوە، ئێمە لە شارۆچکەکەمان پشتاو پشت ئاسنگەر بووین، خزمەکانم دووکانێکی ئاسنگەریان بۆ کردمەوە، منیش لە دووکانەکەمدا تا توانیم قولاب و نێزەم دروست کردن، ئەو کات لە ئەستەنبۆڵ بازاڕی فرۆشتنی ماسی هەرمێنێکی زۆری هەبوو، لەکاری ئاسنگەریدا بە فرۆشتنی قولابە جۆراوجۆرەکانی کە دروستم دەکردن، پارەیەکی باشم دەستکەوت، بەردەوام بیرم لە دوورگە دەکردەوە، پرسیارم کرد، زانیم کە دوورگە چۆڵە. دواتر هەواڵم بیست کە پڕ بووە لە خەڵك، هەستام و هاتم."

پزیشکی ئاژەڵان دووبارە گوتی: "بەخێر بێیت!" ئەوانی دیکەش گوتیان: "بەخێر بێیت، بەخێر بێیت!" نیشانچی دەستی درێژکرد، دەستی ئارسۆنی گرت و رایکێشایە لای ئەسکەلە.

نیشانچی، هەر کە وەستای گەیاندە سەر ئەسکەلە لێیپرسی:

"خانووت هەیە؟ خانووت کڕیوە؟"

وەستا ئارسۆن بە خۆشحاڵیەوە گوتی: "کڕیومە." دەستی بردە گیرفانی و چەند پارچە کاغەزێکی دەرهێنان. "بگرە سەیریان بکە!"

نیشانچی گوتی: "من خوێندەواریم نییە." کاغەزەکانی دایە دەستی پزیشکی ئاژەڵان. پزیشکی ئاژەڵان سەیرێکی کاغەزەکانی کردن، پاشان چاوێکی بە دەوروبەر داگێڕا. کە زانی ڤاسیلی دیارنییە، هاواری کرد: "ڤاسیلی لە کوێیە؟" لەلای دارهەرمێ گەورەکە دەنگێك هات: "چییە پزیشکی ئاژەڵان، من لێرەم."

"زووبە وەرە ئێرە، کارت بۆ پەیدا بوو."

ڤاسیلی بە هەڵەداوان هاتە ئەسکەلە، کاغەزەکانی لە پزیشکی ئاژەڵان وەرگرت، خوێندنیەوە، گوتی: "زۆر باشە، لەگەڵ مندا وەرە با خانووەکەت نیشان بدەم. خانووەکەت لەم نزیکانەیە، زوو دەگەڕێینەوەو کەلوپەلەکانت دەبەینە نێو خانووەکەت. بەخێرهاتیت!"

وەستا ئارسۆن گوتی: "زۆر سوپاس، هاوڕێ."

ڤاسیلی هەر زوو خانووەکەی دۆزیەوە.

"لە قەباڵەکە نووسراوە ناوت ئارسۆن زەرکانە، وایە؟"

گوایە. باوکیشم هەم ئاسنگەر بوو، هەم دارتاش. هیچ وەستایەك وەکو باوکم شارەزای دارستانە چڕەکان نەبووە. لەسەردەمی کۆندا هیچ دارستانێك هێندەی دارستانی درەختی زەرك چڕ نەبووە. لەوان سەردەماندا هەموو بەلەمە گەورەکان لەتەختەی دارزەرکی ئەو دارستانە چڕانە دروست دەکران. بۆیە، لە باپیرمەوە بە دواوە بە ئێمە دەڵێن بنەماڵەی زەرکان.

"ئاوا، ئێستا بابچین بەلەمەکەت بەتاڵ بکەین. دەبێت دووکانێکیشت بۆ پەیدا بکەین. تۆ هاتوویتە ئێرە کە ئاسنگەری بکەیت؟"

"تا ئەوەندەی بە بیرم بێت لێرە چەند دووکانێك هەبوون."

ڤاسیلی گوتی: "هەن، هەمووشیان، پۆیراز کاتی خۆی بۆ ئەوەی رەمزی کاولاك تێکیان نەدات کڕینی. پۆیراز برای سوێند خواردووی منە."

ڤاسیلی تا گەیشتنە ئەسکەلە، لەو ماوەیەی بەڕێوەبوون، هەر باسی رەمزی کاولاکزادەی بۆ کرد و باسی ئەوەی بۆ کرد کە چۆن کلێساو کۆشکی چێشتلێنەرانی تێکدان و چەندیش لە نیشانچی دەترسێت.

لەئەسکەلە نیشانچی و هەموو دانیشتووانی دوورگە پێشوازیان لێکرد. بە یارمەتی یەکدی کەلوپەلەکانی وەستا ئارسۆنیان هێناو لەسەر ئەسکەلە کەڵەکەیان کرد. کەلوپەلێکی زۆر لە بەلەم بارکرابوو. باوڵ و سندوقی دارگوێزی نەخش و نیگارداری دروستکراوی مەراش، سندوقی

لە دارسنۆبەر دروستکراوی ئەدیرنە، گونیەی پڕ، نوێن، مافوور، جاجم، قاپ و هیربار و نزیکەی هەموو ئەو شتانەی کە بۆ ماڵێك پێویستن. دیسان بە یارمەتی یەکدی هەموو شتومەك و کەلوپەلەکانیان بردە نێو خانووەکە.

وەستا ئارسۆن خۆشحاڵ بوو. چەند باش بوو کە ئەم دوورگەیە هەڵبژاردبوو وەستا ئارسۆن هەروا کە نوقمی نێو شادمانی بووبوو، پۆیراز هاتە ژوورەوە. ڤاسیلی گوتی: "ئەمەش کاك پۆیراز موسای برام.. ئەو هەروەها یەکەمین کەسیشە کە هاتۆتە ئەم دوورگەیە و لێرە نیشتەجێ بووە."

"بەخێربێیت وەستا. بەخێربێیت بۆ دوورگەکەمان برا."

"سوپاستان دەکەم، سوپاستان دەکەم، بەڵام هاتووینەتە ئێرە زەحمەتتان بدەینەبەر."

"بە سەفاو زەحمەتەکەتەوە سەر سەر و سەرچاومان هاتی. هەم زەحمەتەکەت بێژەو هەم سەفات."

"لە زەحمەتەکانم بپرسن، لە راستیدا ئامرازەکانی ئاسنگەری و کوورەو رەژوو و چەند شتێکی دیکەشی لە مێز و کورسی و مۆبلەوە بگرە تاکو نێزەکانم لە شارۆچکە بەجێماون. هەروەها خواردنەکانم. دەبێت بچین بیانهێنین."

دوای ئەوەی شمەکەکانیان لەشوێنی خۆیان دانان، چوونە سەر ئەسکەلە. لەو ماوەیەدا موسا کازم ئاغا و کچەکانیشی هاتبوونە ئەسکەلە، پۆیراز بە بینینی زەهرا رەنگی هەڵبزرکاو هاوسەنگی خۆی لەدەستدا، بەڵام هەر زوو هاتەوە سەرخۆی.

وەستا ئارسۆن گوتی: "من دەبێت بچم ئامێرەکانم بێنم، دووکانەکەم بکەمەوە."

پۆیراز گوتی: "ئەوەندە پەلە مەکە، جارێ تا دوورگە پڕ نەبێت لەخەڵك کارێکی ئەوتۆ نییە کە ئەنجامی بدەیت. ئەگەر زۆر حەزت لە کارکردنە، کارێك هەیە."

وەستا ئارسۆن چاوەکانی بریسکانەوە:

"زۆر حەزم لەکارکردنە، کاك پۆیراز، براکەم."

پۆیراز دەستی بۆ لای ئاشەکەی لای سەرەوە درێژ کرد: "ئەو ئاشە دەبینیت؟"

"دەیبینم."

"پەروانەکانی دەخولێنەوە، دەبینیت؟"

"دەبینم."

"پەروانەکانی دەخولێنەوە، بەڵام بەرداشەکەی ناسوورێت، دەتوانیت بەرداشەکە بخەیتە کار و بتوانین گەنمی لێبکەین؟"

"بەرداشەکە دەخەمەکار. ئاردێکی وای لێدەکەم بۆتان کە دنیا پێی سەرسام بێت. تەنوورێکشت بۆ دروست دەکەم کە بۆنی نانەکەی هەموو لەدوورگەدا بگەڕێت و هەر کەسێك بۆنەکەی بکات، برسی ببێت."

"تۆ بەم بەلەمەت لانیکەم بە دوو ڕۆژان دەتوانیت بچیت و بگەڕێیتەوە." قەدریی بەلەموان لە دوایەوە بوو، ڕووی لەو کرد: "دوو کەسیش لەگەڵ خۆت ببەو لەگەڵ وەستا ئارسۆن بچنە شارۆچکە و بگەڕێنەوە."

"یاللا منداڵینە، فەرموو وەستا ئارسۆن، ماتۆڕەکەی من خێراییەکەی بێوێنەیە، بابڕۆین."

وەستا ئارسۆن سواری بەلەمەکەی قەدریی بەلەموان بوو، بەدوای ئەویشدا کوڕەکانی دیکە سوار بوون. بەلەم بۆنی خەستی دەریای لێدەهات.

قەدریی بەلەموان یەکسەر ماتۆڕی بەلەمەکەی خستەکار، دوای کەمێك بەنزینی دایێ، بەلەم کەوتە خێرایی. دەم بە دەم زیاتر بەنزینی دەدایێ.

وەستا ئارسۆن بە سەرسووڕمانەوە گوتی: "ماتۆڕەکەت ماتۆڕێکی زۆر نوێیە. بەلەمەکەشت زۆر جوانە."

"وەستاکەم هەموو شەش مانگ بەر لە ڕۆیشتنی کڕیبووی."

تا گەیشتە شارۆچکە بە هەستێکی تژی ڕێزو خۆشەویستییەوە باسی وەستاکەی کرد.

"وەستا ئارسۆن، بەڕای تۆ وەستاکەم دەگەڕێتەوە؟ ئینشاللا دەگەڕێنەوە، بەڵام ناتوانن بگەڕێنەوە."

"بەڵام ئەو لەجەنگی چاناك قەلا عەریفی تۆپخانە بووە."

"هەرچییەك بووبێت ناتوانێت بگەڕێتەوە."

"موسا کازم ئاغا دەتوانێت بگەڕێتەوە؟"

"ئەو کێیە؟"

"ئەوەی کە ریشی نێریانی هەیە. خەڵکی کریتە. کێڵگەدار بوو، ئەسپی ڕەسەنی بۆ پاشاو بەگەکان بەخێوکردووە. زۆر دەوڵەمەند بووە. ئەویشیان بۆ دوورگەی ئێمە دوورخستۆتەوە.

ئەویش دەیەوێت بچێتەوە بۆ کرێت. گوایا مستەفا کەمال پاشا دەیەوێت بینێرێتەوە بۆ کرێت، دەینێرێتەوە؟"

"نایینێرێتەوە."

" کێ تۆی ناردیتە ئێرە؟"

"من خۆم هاتم."

"بۆچی هاتیت؟"

"من خەریك بووم دەمردم، منیان هێنایە ئێرە بۆ نەخۆشخانە. کاتێك چاوم کردنەوە سەیرمکرد لەو کلێسا وێرانەیەم. ئەوکات وێرانیان نەکردبوو."

"ئەویّ رەمزی کاولاك وێرانی کرد گوایە گۆزەیەکی پڕ زێڕ لەژێر کلێساکە هەبووە، کاولاکزادە دەریهێناوەو بردوویە. هەندێك لەزێڕەکانی داوەتە ئەنقەرەییەکان و ئەوانیش ئەویان کردۆتە سەرۆکی خۆیان. ئێستا ئەو سەرۆکی هەموو ئەم ناوچەیە. تەنانەت لە زوبێرخان، خانی چەچەنیش گەورەترە."

لەکاتی خۆی زووتر گەیشتنە شارۆچکەکە، کەلوپەلەکانی وەستا ئارسۆنیان لە قاوەخانە بچووکەکەوە گواستەوە سەر ئەسکەلە و خۆر هێشتا ئاوا نەبووبوو گەڕانەوە دوورگە. کە گەیشتنەوە دوورگە، خۆر تازە ئاوا بووبوو. سەر رووی دەریا هێشتا لەو شوێنەی کە خۆری لێئاوا بووبوو تیشکی وەنەوشەیی لەسەر دەسووڕا.

قەدریی بەلەموان کە بەلەمی لەسەر ئەسکەلە راگرتبوو گوتی: "وەستا ئارسۆن، ئێستا کاتەکە درەنگە، ئەمشەو لەماڵی ئێمەدا بمێنەرەوە. ئێمە نوێنی زیادمان هەن. دایکیشم بە میوانان دڵخۆش دەبێت. سبەینێ بەلەمەکە دادەگرین و شتومەکەکان دەبەینە ماڵەکەت و دایاندەنێین و رێکیاندەخەین. دایکیشم یارمەتیمان دەدات."

وەستا ئارسۆن دەستی دانایە سەر شانی ئەو هاوڕێیانەی کە بە پێوە وەستابوون و گوتی: "هەربژین کوڕەکان. زۆر یارمەتیتان دام. بەیانی زوو دیسان دێنەوە؟"

ئەوەیان کە کڵاوی لەسەر بوو گوتی: "دێینەوە."

ئەوی کە سەری خۆی سفر کردبوو گوتی: "باشە."

وەستا ئارسۆن گوتی: "منیش دیاریی زۆر باشتان دەدەمێ."

کوڕەکان تەریق بوونەوەو سەریان لەبەر خۆیان نایەوەو بە خێرایی لەوێ ڕۆیشتن. دایکیان چاوەڕێیان بوو، پێش ئەوەی نان بخۆن بە وردی باسی سەفەرەکەیان کرد بۆ دایکیان و دایکیان خۆشحاڵ بوو.

پۆیراز و ڤاسیلی بەیانی زوو وەستا ئارسۆنیان لەماڵی مەلەك خانم هەڵگرت و بردیانە دووکانەکە. دکتۆرەکان هێشتا دەرگای نۆرینگەیان نەکردبووەوە.

وەستا هەر کە زانی دکتۆرەکان لەوێن، پرسی: "بۆچی هاتوونەتە ئێرە؟" پاشان گوتی: "ئێرە دکتۆر و برینداریکی زۆری لێبوون. ئەم دوورگەیە پڕ بوو لەبریندار. لێرە دکتۆر و برینداریکی زۆریش مردن. ئەم دکتۆرانە بەچ نیازێك هاتوونەتە ئێرە؟ هەموو ئەو دکتۆرانەی کە دەهاتنە ئێرە بریندار و نەخۆش بوون."

وەستا ئارسۆن دووکانی یەکەمی پەسند کرد و گوتی: "دەنگی چەکوش هیچ کەس لێرە ئازار نادات."

"دەنگی چەکوش هیچ کاتێك کەس ئازار نادات، دەنگی چەکوش..."

"سوپاست دەکەم کاك پۆیرازی هێژا."

ڤاسیلی دەرگای دووکانەکەی کردەوەو کلیلەکانی دانە وەستا ئارسۆن.

وەستا ئارسۆن پرسی: "دووکانەکان گشتیان کلیلی خۆیان هەیە؟"

ڤاسیلی گوتی: "کلیلیان هەیە، کلیلی دووکانەکانیان خستبووە سەر دەرگاکان."

"کلیلی خانووەکانیشیان؟"

"کلیلی خانووەکانیشیان."

"کەسانێکی باش بوون، زۆر یارمەتیان داین. هەرکەسێك خاك و دەریای خۆشبووێت مرۆڤەکانیشی خۆشدەوێن."

پۆیراز گوتی: "راستە."

"منیش لەخۆشەویستی خاك و دەریا هاتوومەتە ئێرە. بە دڵنیاییەوە دکتۆرەکانیش هەر بەم هۆیەوە هاتوون."

"دکتۆرەکان دوای تاوێکی دیکە هەڵدەستن و دێن، نۆرینگەکەیان دەکەنەوە، دەیڕشێنن و گەسکی لێدەدەن. کورسیەکانیان لەتەنیشت یەك دادەنێن، ئەگەر هیچ کەسیان نەچووە کن، ئاوا بە بێدەنگی دادەنیشن، کە خۆریش ئاوابوو دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان."

"ئەگەر کەسێکیان بچێتە لا قسان دەکەن؟"

"قسان دەکەن، جا چۆن قسەکردنێك. ئەگەر یەکێکیش بچێتە لایان زۆر خۆشحاڵ دەبن. ئەو کاتانەیش کە هیچکەس ناچێتە لایان بەرامبەر یەکدی دادەنیشتن و چاو دەبڕنە دەرگاو باوێشك دەدەن. کاتێك کەسێك دەچێتە لایان، چ ئاشناو چ نائاشنا، نوقمی نێو شادمانی دەبن و قسەیان بۆ دەکەن و گوێیان لێدەگرن."

تا نیوەڕۆ هەموو شتەکان گواسترانەوە بۆ دووکانەکە، سندوقەکان ڕێکخران، کرانەوە، سندوقەکان پڕ بوون لە قولاب و تۆڕ و داو و گلۆڵە بەن، وەلی نیشانچی بە بینینی ئەم شتانە چاوەکانی وەکو ژێرپیاڵە کرانەوە، چوو بە دەستانی لەرزۆکە دەستی وەستا ئارسۆنی گرت و پرسی: "هەموو ئەم قولابەت بەخۆت دروست کردوون؟"

وەستا ئارسۆن گوتی: "زۆرتریشیان هەر خۆم دروست کردن. هەندێکیشم لەو قولاب و خێزانە ناردن لە ئەوروپا بۆیان هێناوم. ئەم دەریایە تا بڵێیت ماسی تێدایە، ماسیی جۆراوجۆر، لەم سندوقانە بۆ هەموو جۆرە ماسییەك قولابی تایبەت هەن."

قولاب و نێزەکانی ناو سندوقەکان دەبریسکانەوە، وەلی نیشانچی ئاگای لە خۆی نەمابوو بە روخسارێکی نوقمی نێو شادی چاوی بڕیبووە سندوقەکان.

"لێرە بۆ هەموو جۆرە ماسییەك قولاب هەیە؟"

"هەیە."

"تەنانەت بۆ زەردەماسیش؟"

"هەیە."

"بۆ کۆسە ماسی؟"

"هەیە."

"بۆ مار ماسی؟"

"بۆ گرتنی مارماسی پێویستمان بە قولاب نیە."

نیشانچی ناوی زۆر جۆرە ماسیانی دەزانی. ناوی هەموویانی هێنا. قولابی زۆرتری هەموو جۆرە ماسییەك و هەموو جۆرە نێزەیەك بۆ ئەو ماسیانەی بەنێزە راو دەکران لەناو سندوقەکانی وەستا ئارسۆندا هەبوون.

نیشانچی دەستی خۆی بەرزکردەوەو دایناپە سەر شانی وەستا ئارسۆن و گوتی: "خوا تۆی بۆ ناردینە ئێرە. کاتێك دوورگە پڕ بوو لەخەڵك بوارت نابێت سەرت بخورێنیت. دەزانیت ماتۆریش نۆژەن بکەیتەوە؟"

"دەزانم. لە ئەستەنبۆڵ لای وەستا حوسێن ناوێك کارم دەکرد کە هەموو جۆرە ماتۆڕێکی نۆژەن دەکردەوە. لە ئەستەنبۆڵ وەستای دیکە نەبوون. هەموو مانگێك سێ چوار جار لە ئەنقەرەوە بۆ چاککردنەوەی ماتۆڕی پاشاکان داوایان دەکردو دەیانبرد."

پۆیراز پرسی: "ئاشەکە کەی دەخەیتە کار؟"

"لە ماوەی دوو سێ رۆژ لە کاروباری خانووەکەی و دووکانەکەم دەبمەوەو دوای ئەوە کاری ئاشەکە دەست پێدەکەم. چونکە پەروانەکانی دەخولێنەوە، ئەوە دیارە کە تا دوایین رۆژەکان هەر کاری کردووە. خستنەوە کاری شتێکی ئاسانە. تۆ هەر ئەوەندە بکەیت بەسە کە گونیەیەك ئارد پەیدا بکەیت."

پۆیراز گوتی: "پەیدای دەکەم." لەوەی کە بڕیار وابوو ئاشەکە بکەوێتە گەڕو گەنمی لێبکرێت، خۆشحاڵ بوو. لەپڕ زەهرای کەوتەوە بیر، دڵی کەوتە لێدان. لە ئاشەکە بۆنی ئاردی بۆ هات، گوتی: "خودی ئاشەکە وەکو بۆنی ئاردەکە وایە. لە دنیادا چ بۆنێك لەو بۆنە خۆشتر هەیە؟"

وەستا ئارسۆن گوتی: "گوڵیش بۆنی ئەوەندە خۆش نییە. هەموو کەس ئەمە نازانێت."

چوونە ئاشەکە، وەژوورکەوتن، وەستا ئارسۆن دوای ئەوەی هەموو کونج و کەلەبەرەکانی ئاشی پشکنین، پەروانەکانی راگرتن.

"با پەروانەکە رابگرین، یەکێکیان کۆن بووە، هی تازەی بۆ دادەنێین. بەرداشەکە هێشتا نوێیە. من هەم ئەم ئاشە دەخەمەوە کار و هەم ئاشەوانێکی گەنج دێنم و دەیخەمە سەر ئاشەکە. ئەوسا دەبینن بۆنی ئارد تا نێو ماڵەکان دەڕوات."

پۆیراز دەستی دانایە سەرشانی وەستا ئارسۆن، لە ئاشەکە چوونەدەر. پۆیراز ئاوڕی دایەوەو گوتی:

"وەستا ئارسۆن، لێبگەڕێ با پەروانەکان بخولێنەوە. پەروانەی خولاوە دوورگە بە زیندوویی نیشان دەدەن."

وەستا یەکسەر گەڕایەوە، پەروانەکانی خستنەوەکار، هاتەوە لای پۆیراز، پۆیراز گوتی:

"ئەها، ئاوا. هەر پەروانەکان کەوتنەوە خولانەوە، چوونە سەر کانییەکە و لەسەر نیوتەختەکان دانیشتن.

"شانی چەپم پێکراوە، بەڵام هێشتاش کاری خۆی دەکات. کاتی سەوڵلێدان وەژان دەکەوێت، بەڵام بەهەر جۆرێك بێت لەگەڵی دەڕۆین. نازانم چیبووە، بەڵام پێموایە ساچمەی گولله تۆپە کە کاتی خۆی دکتۆرەکانی ئێرە لەو کڵێسایە دەرمانیان کرد."

پۆیراز بە وروژانەوە گوتی: "دەزانیت، دوو لەو دکتۆرانە ئێستا لێرەن."

"دەزانم، بەڵام نەمتوانی بیانناسمەوە."

"یەکێك ناوی سەلمان سامیە، ئەوەی دیکەشیان خەلیل رەفعەت. یاللا هەستە بابچینە لای ئەوان، ئێستا لە نۆڕینگەن."

هەستان و بەرەو لای نۆرینگەکە چوون. دکتۆرەکان بە بینینی ئەوان لە شوێنی خۆیان هەستان و بۆ پێشوازیکردنیان تا بەردەرگا هاتن و گوتیان: "بەخێربێن، وەرن دانیشتن."

جێگایان نیشاندان.

"لێرە دەرمان کرایت، وانییە وەستا ئارسۆن؟"

"بەڵێ وایە کاك دکتۆر."

"لە کوێ بریندار بوویت؟"

"لەلای ئاناوارزا. لێرە لە کڵێساکەی سەرەوە چاوم هەڵێنان. لێرە منتان دەرمان کرد و چاکتان کردمەوە."

"لە سەربازی چ کارە بوویت؟"

"سەربازی ئاسایی بووم، بەڵام تفەنگسازی سریەکەشمان بووم. ئێسکی شانی چەپم وردو خاش بوو، دکتۆرەکانی ئێرە دەرمانیان کردم، خوا خێریان بنووسێت."

ئەو رۆژە دکتۆرەکان وەستا ئارسۆن و پۆیرازیان بۆ نانخواردن بانگهێشتی ماڵی خۆیان کرد، هەم نیوەڕۆ و هەم نانی ئێوارەیان لەماڵی دکتۆر سەلمان سامی پێکەوە خوارد. دوو ژن خواردنێکی خۆشیان بۆ لێنابوون. لە بەیانیەوە تا شەو داهات هەر لەبارەی نەبەردەکانی گەلیبۆلۆ و ساری قامیش قسەیان کرد. باسکردنی ئەو نەبەردە ترسناك و خوێناویانە تەواو دەیوروژاندن و سەریان دەگێژەوە دەچوو. هەرسێکیان هاتبوونە ئەم دوورگە جوانە و ناو ئەم

سروشته دڵڕفێنه تاکو ڕۆحی خۆیان بشۆنەوەو ئەو کارەسات و ڕووداوه ناخۆش و ترسناکانه له بیر خۆیان ببەنەوه.

وەستا ئارسۆن، خەڵکی شارۆچکەیەکی دەوروبەری تووڕۆس بوو. له نەبەردەکانی بالکان چووبووه مەیدانەکانی جەنگ و بەر لەوەی ماوەی خزمەتی سەربازی تەواو ببێت جەنگی یەکەمی جیهانی هەڵگیرسابوو. دوای ئەوەی که بریندار بووبوو، گەڕابووەوه شارۆچکەکەیان، بەڵام شارۆچکەکه چۆڵ و هۆڵ و خاڵی بوو و هیچ کەسی لێنەمابوو. له شارۆچکەکه نه ئەرمەنیەك مابوو نه تورکمانێك و نه کوردێك، که ئەوێی ئاوا بینیبوو خۆی گەیاندبووه نێو دارستانەکان و لەوێ خۆی شاردبووەوه، سوپاس بۆ خوا که هێشتا جلی سەربازی هەر لەبەر بوو، له چیاکانەوه دابەزیبووه پێدەشتەکان و خۆی گەیاندبووه وێستگەیەکی شەمەندەفەر که پێیدەزانی و خۆی گەیاندبووه ئەستەنبۆڵ. له ئەستەنبۆڵ چووبووه لای وەستایەك که قولابی ماسی و نێزەو پێداویستییەکانی بەلەمی دروست دەکردن و ماتۆڕی نۆژەن دەکردنەوه. خۆی له تەمەنی هەشت ساڵیەوه ئاسنگەری کردبوو. له سەربازیشدا بووبووه تفەنگساز. تا ئەو ڕۆژەی بریندار بووبوو ئەو تفەنگ و تۆپ و چەك و چۆڵانەی چاك دەکردنەوه که لەکار دەکەوتن. لەم کڵێسایەدا دکتۆرەکان و یۆنانییەکانی خەڵکی ئەم دوورگەیه و ژنانی دێهاتەکانی ئەم لێوارانه بەباشی چاودێریان کردبوون و پێیانڕاگەیشتبوون. خۆیان خستبووه گوشارێکی زۆرەوه تاکو ئەوان چاك بکەنەوەو پێیانڕابگەن. وەستا ئارسۆن لەو کاتەوه بەڵێنی لەگەڵ خۆی دابوو که ئەگەر چاك بووەوه، بهێتە ئەم دوورگەیه و لێرەدا بمێنێتەوه.

هەموو کەلوپەل و پێداویستییەکانی دیکەی له شارۆچکه مابوون هێندران. به یارمەتی هەمووان بارکران، مەلەك خانم بەپێی سەلیقەی خۆی ماڵەکەی بۆ ڕێکخست و شتەکانی دانان. وەستا ئارسۆن به بینینی ماڵەکەی واقیوڕما. لەبەر خۆیەوه گوتی خوا دەزانێت ئەو کەسەی ئەم خانووەی دروستکردووه کاتێك چووه له دوورەوه تەماشایەکی کردووه چەند دڵی پێخۆش بووه.

پاشان نۆره هاته سەر دووکانەکه. سندوقه قورسەکان و ئامێره گەورەکانی کوورەی ئاسنگەری گواسترانەوه ئەوێ. وەلی نیشانچی له ڕێکخستن و دانانی شمەکەکان یارمەتیدان و هاوکاری کردن. هوسمەن و ڤاسیلی و کوڕەکانیشی لەگەڵ خۆیدا بردبوون. به چاودێریی وەستا ئارسۆن هەموو پێداویستی و کەلوپەلەکان له جێی خۆیان جێگیرکران. کوورەیان دانا، ئامێری

ئاسنگەریان جێگیر کرد. پاشان پڕیان کرد لە خەڵووز و دایانگیرساند. هەموو دانیشتوانی دوورگە بۆ بینینی شێوەی کارکردنی کوورەی ئاسنگەری و ئەو ئاگرەی کە بەهۆیەوە کاری دەکرد، هاتبوون و دووکانەکەیان پڕ کردبوو. وەستا ئارسۆن، خەڵووزی هەڵدانە نێو کوورەکە. وەلی نیشانچی هەنبانەی کوورەکەی راکێشا. ماوەیەك دواتر پەنگرەکان گەشانەوە. پروشکەی ئاگر لە کوورە بۆ ئەملاو ئەولا پەرت بوون. وەستا ئارسۆن، تا پروشکەکان زیاتر بەرزدەبوونەوە زیاتر خەڵووزی دادەنانە نێو کوورەکە، وەلی نیشانچی بە وەستاییەوە هەنبانەکەی رادەکێشاو دەیبردەوە پێش و کوورەکەی پێ گەرم دەکردو پەنگرەکانی پێ گەش دەکردنەوە. دواجار گوتی: "ماندوو بووم." دەستی لە دەسکی هەنبانەکە هەڵگرت، بۆ لای سندوقەکان چوو. هەر سندوقێکی دەکردەوە ئامراز و پێداویستییێکی جیاجیای لێدەردەهێنا. یەکێك لەو سندوقانەی کردبووەوە کە پڕ بوو لە قولابی ماسیگرتن. سندوقەکەی تەنیشتیشی پڕ بوو لە نێزە بە ئەندازەی گەورەو بچووك. چاوەکانی نیشانچی لەسەرسامیان هێندەی ژێر پیاڵەیەکیان لێهاتبوو. لە هەمووی زیاتر بە بینینی قولابەکان سەرسام بووبوو.

"ئارسۆن، لەم سندوقەدا بۆ هەر جۆرە ماسییەك قولابێك هەیە؟"

"بۆ هەر جۆرە ماسییەك قولابێك هەیە. منیش گفتم داوە تا ماوم لێرە بمێنمەوە."

"کارێکی باش دەکەیت. من ئێستا دەچمەوە گوند تاکو ژنەکەم لەگەڵ خۆمدا بێنم ئەو ئێستا تاکو تەنیا لەگوند ماوەتەوەو چاوەڕێی کوڕەکانی دەکات کە لە ساری قامیش بگەڕێنەوە. پۆیراز دەڵێت تەنها چەند سەربازێك کە بە پەنجەی دەست دەژمێردران لەساری قامیش توانیان بە زیندوویی دەربچن. زۆربەشیان سەربازی راکردوون. من زوو دەگەڕێمەوەو یارمەتیت دەدەم. سەرم لە کاری ئاسنگەری دەرناچێت، بەڵام لە ماسیگریدا شارەزام." بێدەنگ بوو، داماو بیریکردەوە، لە روخسار و چاوەکانی ئارسۆن راما، ماوەیەك ئاوا سەیری کرد. نێوچاوانە پانەکەی وەستا ئارسۆن گنجی تێکەوتبوون. ئەبرۆی رەش و پەیوەست و چاوانی گەورەو قاوەیی بوون. کە سەیری دەکرد، زەل زەل رادەما، وەك ئەوەی سەیری قووڵایی بکات، بە چەشنێك وەك بڵێیت بیری بەرامبەرەکەی بخوێنێتەوە. لەلای راستی روخساریدا، لە گۆناوە تا چەناگەی، شوێنی برینێك هەبوو کە حاڵەتێکی تەڵخی بە روخساری دەدا.

"وەستا ئارسۆن، برا، لێرە هەموو شتێك زۆر باشە، بەڵام کێ دەزانێت دا خۆ تۆ چەندت پارە بەم خانووە داوە. کێ دەزانێت چەند پارە بۆ کوورەی ئاسنگەری و سندان و شتەکانی دیکە

خەرج کراوە، چەند بۆ نوێن، قاپ و قاجاغەکان، سندوقە نەخش و نیگاردارەکان، مافوورەکان، جاجمەکان. باشترین جاجمی دنیا کێ رایاندەچنێت و دروستیان دەکات، وەستا ئارسۆن؟" شەریفە خانم دەیانچنێت کلیم و جاجمەکانی ئەو ببینێت سام دەتگرێت، ناتوانیت سەیریان بکەیت، ئەفسوون دەبیت، ئینجا دەبێت کەسێك بێت و بە ئاگات بێنێتەوە. بە هەرحاڵ بەمزوانە جاجمەکان دەبینیت. ئێستا ئەوەی گەرەکمە پێتبێژم ئەوەیە کە زۆر زۆر پارەت خەرج کردووە، چ پارەت لەگیرفاندا نەماوە. من زۆر ماسیم گرتوون، پارەیەکی باشم خڕکردۆتەوە." دەستی بردە گیرفانی. "چەندت پێویستە با بیدەم، هەرکاتێك هەتبوو دەیدەیتەوە." وەستا ئارسۆن بە دەستپاچەییەوە گوتی: "هەمە. هەمە. پارەم لەگیرفاندایە. ئێستا تۆ بچۆ و بگەڕێرەوە، ئەوسا قسەی لێوە دەکەین."

نیشانچی گوتی: "باشە، ئێستا وا دەڕۆم."

نیشانچی ئەو شەوە نەیتوانی بخەوێت. بەیانی زوو لە دەرگای ماڵی پۆیرازیدا. پۆیراز بە نیگەرانی دەرگای کردەوە:

"(چیە نیشانچی؟ چ قەوماوە؟"

"زۆر شت، خوا ئێمەی زۆر خۆشدەوێت کە وەستا ئارسۆنی مەسیحی بۆ ناردووین. هەر پەنجەیەکی سەد هونەری لێدەبارێت. ئێستا تۆ جلەکانت دەپۆشیت و لەگەڵ ئێمە دێیتە شارۆچکە. چونکە، (یەخەی گرت و رایکێشا) بەم جلانە ناتوانم بچمەوە گوند و سوڵتان کە لەوێ چاوەڕێی کوڕەکانیەتی لەساری قامیش بگەڕێنەوە، بێنمەوە. دەبێت بچینە شارۆچکە و دەستە جلێکم بۆ بکڕیت کە تەنانەت پاشاکانی رۆمیش نەتوانن لەبەری بکەن. زووبە ئامادەبە."

"تۆ بڕۆ لە ژوورەوە دانیشە. بە لێنا بێژە زوو بەرچایی ئامادە بکات."

نیشانچی گوتی: "هەر ئێستا. لێنا زووبە، بەرچایی ئامادە بکە، راوەستە با یارمەتیت بدەم."

لێنا گوتی: "تۆ خۆت لە کاری ژنان هەڵمەقورتێنە. بڕۆ لەسەر کورسی دانیشە، من خۆم هەر ئێستا ئامادەی دەکەم. سەیرکە، ئاوەکە هاتە جۆش. شیری تازەی بزنیشمان هەیە، ئیدی چیتدەوێت؟"

"هیچم ناوێت."

چوو لەسەر کورسیەك دانیشت.

لەو ماوەی کە لێنا خەریکی دانانی مێزەکە بوو، پۆیراز دوشێکی گرت، ریشی تاشی، کۆلۆنیای لێدا، هاتە سەر سفرەکە دانیشت. یەکسەر دەستیان بە نانخواردن کردو بە خێرایی بەرەو ئەسکەلە رۆیشتن. قەدریی بەلەموان لەنیوەشەوەوە ئامادە بوو و چاوەڕێی ئەوانی دەکرد، سواری بەلەم بوون، کەوتنە قسان، نەیانزانی چەندی پێچوو تا گەیشتنە شارۆچکە، خۆیان گەیاندە دووکانەکەی جەعفەر. جەعفەر ئەوانی بردە لای سامی، بە ناوبانگترین شاگردی بەرگدرووێکی یۆنانی شارۆچکەکە. ئەو پارچە و قات و جلوبەرگانەی بەرگدرووە یۆنانیەکە بۆ ئاغا و بەگەکان دووری بوونی بۆ ئەو مابوونەوە. پۆیراز و نیشانچی و جەعفەر لە دووکانی شاگردەکە وەژوورکەوتن و یەکسەر کەوتنە هەڵبژاردنی جلوبەرگ بۆ نیشانچی. دوای ماوەیەك توانیان دەستە جلکێکی بە دڵی نیشانچی هەڵبژێرن. نیشانچی جلەکەی پۆشی، چوو لەبەردەم ئاوێنەیەکی یەك بە بەژن راوەستا، جلەکە دەتگوت بۆ ئەو دووراوە. نیشانچی ماوەیەك لەنێو دووکانەکە هاتوچوو و لە ئاوێنەکەدا تەماشای ئەملاو ئەولای خۆی کرد. پاشان جارێکی دیکە هاتوچوو و ویستی دیسان جارێکی دیکەش لەئاوێنەکە سەیری خۆی بکات، بەڵام شەرمی کرد، ئەگەر کەس لەوێ نەبوا پێیپێبکەنێت، چەند جارێکی دیکەش لەئاوێنەکە لە خۆی رادەما.

بە بەردەم ئاوێنەکە رەت دەبوو، هێواشۆکە سەیرێکی خۆی دەکرد.

نیشانچی لەکاتێکدا دەیگوت: "زۆر جوانە." دیسان چوو لەپێش ئاوێنە راوەستا، یاخەی چاکەتەکەی رێکخست، دەستێکی لەدوگمەکان وەردا، بە دوو ئەنگوست دەستی بەخەتی ئوتوکراوی شەلوارەکەی داکێشا.

بێئەوەی چاو لەسەر ئاوێنەکە هەڵبگرێت گوتی: "زۆر جوانە، زۆر جوانە. ئێستا کراسێکیشم پێویستە، یاخەدار بێت، واتە بە بێیاخە نابێت."

شاگردی بەرگدرووەکە گوتی: "لەو جۆرانەشمان هەن. وەستاکەم کراسیشی دەدووری، ئەویش کراسی ئیتاڵیایی. هەروەها جلوبەرگی وا کە خاوەن کەشتییەکان دەیانپۆشی."

لەنێو قەفەزەکە چەکمەچەیەکی دەرهێناو داینایە سەر مێز، زارکەکەی کردەوە، گوتی: "بەڵام ئەمانە زۆر گرانن. تەنانەت ئەم کراسانە ئاغا و پاشاو پولدارەکانیش ناتوانن بیانکڕن. دوای رۆیشتنی یۆنانییەکان، توانیومە تەنها یەك دانەیان لێبفرۆشم، ئەویش رەمزی کاولاکزادە بەنیوە قیمەت لێیکڕیم."

نیشانچی دەستی درێژ کرد و کراسێکی شینی لەنێو کشوەکە دەرهێنا. "دەبێت ئەمەم بە چارەگێکی نرخەکەی خۆی پێبدەیت، دەنا شارۆچکە و ڕەگ و ڕەچەڵەکت دەسووتێنم، دڵنیابە ئەم کارە دەکەم. بە منیش دەڵێن نیشانچی."

شاگردی بەرگدروەکە پێکەنی:

"ئەگەر تۆ وەلی نیشانچی بیت، منیش هەرچی لێرە هەڵیبگریت، بەم قاتەی لەبەرتشتدایە بە چارەگێکی نرخەکەیان بۆت حساب دەکەم."

نرخەکانی گوت.

کراسێکی یاخەدار تەنانەت لەکراسێکی بێیاخەش هەرزانتر بوو.

"سێ دانە لەم کراسانە دەکڕم."

شاگردی بەرگدرووەکە گوتی: "باشە، سێ دانەیان بکڕە."

نیشانچی کیسەکەی دەرهێنا، سکەیەکی زێڕی دانایە بەردەم شاگردی بەرگدرووەکە. شاگردی بەرگدرووەکە گوتی: "نیشانچی، وەلی نیشانچی، تەنها ئەو قاتەی پۆشیوتە نرخەکەی لەسکەیەکی زێڕ زیاترە، بەڵام قەیدی ناکات با وابێت."

ئەو سکەیەی لەبەردەمی بوو هەڵیگرت و داینایە نێو کشوەکە و لە کاتێکدا کراسەکانی دەپێچایەوە گوتی: "پیرۆزت بن."

نیشانچی گوتی: "سەبرت هەبێت." خۆی درێژ کرد و کراسە شینەکەی کە لە نێو دەستی شاگردی بەرگدرووەکە بوو وەرگرت و لەسەر مێزەکەی دانا، کراسە بێیاخە خەت سوورەکەی کە لەبەری بوو لەبەری کردەوەو کراسە شینەکەی کردەبەر، چوو لەبەردەم ئاوێنەکە ڕاوەستا، ماوەیەك سەیری خۆی کرد و پاشان چاکەتەکەی کردەوەبەر، چاوی بڕیە پۆیراز. سەیرێکی ئاوێنەی دەکرد و سەیرێکی پۆیراز. جارێك سەیری ئاوێنە و جارێك سەیری پۆیراز.

پۆیراز، سەیری چاوەکانی ئەوی دەکرد کە لەنێوان خۆیو ئاوێنەکە لەجووڵەدا بوون. گوتی: "خۆمانەین، تۆش قەدو قیافەیەکی جوانت هەیە وەلی نیشانچی. هەر کەسێك بتبینێت وادەزانێت شای ئینگلستانی نەك ماسیگر."

سامی گوتی: "ماشەڵڵا، ماشەڵڵا، خوا لە چاوی بەد بتپارێزێت."

نیشانچی لەخۆشیان ئۆقرەی لێهەڵگیرابوو: "سوپاستان دەکەم دۆستان، برادەران، هەربژین. ئێستا دەبێت چەکمەیەکی ئاوەزێنەداریشم بۆ بدۆزیەوە."

جەعفەر گوتی: "دەیدۆزینەوە. زەرد بێت یان ڕەش؟"

نیشانچی گوتی: "با ڕەش بێت."

شاگردی بەرگدرووەکە گوتی: "ئەویشم هەیە. گیانمان بە قوربانی نیشانچی. ناو و ناوبانگی ئەو لەم گوند و شارانە دەنگی داوەتەوە. هەرچی لەم دووکانەی بکڕێت بە یەك لەسەر چواری نرخەکەی بۆی دادەنێین."

چوو لەپشتەوە توورەگەیەکی هێناو جووتە چەکمەیەکی ئاوەزێنەداری لێدەرهێناو گوتی: "ڕێك بۆ پێی تۆ دەبێت."

نیشانچی لەسەر کورسی دانیشت، خێرا خێرا پۆتینەکانی داکەندن، چەکمەکانی کە شاگردی بەرگدردووەکە بۆ لای ڕاگرتبوو وەرگرتن و بە هێمنی کردنیە پێی، هەستا، گوتی: "ڕێك بۆ پێی من دروست کراوە." چووە پێش ئاوێنە.

شاگردی بەرگدرووەکە بە حەپەساویەوە گوتی: "های ماشەڵلا، ماشەڵلا."

پۆیرازیش گوتی: "های ماشەڵلا."

جەعفەریش گوتی: "خوا لەچاوی پیس بتپارێزێت و بەزوویی بتگەیەنێتەوە ئازیزەکەت."

شادو خۆشحاڵ گەڕانەوە شارۆچکە. نیشانچی بەو شێوەو شێوازەیەوە سێ ڕۆژان بەنێو دوورگەدا گەڕا. لەلای دکتۆرەکانەوە بۆ لای شەریفە خانم و سەیرکردنی جاجمەکانی چوو، گوتی: "های ماشەڵلا، ماشەڵلا. هەر جاجمێك باخێکی بەهەشتە بۆ خۆی. های ماشەڵلا، ماشەڵلا!" زۆر کەیفی بەو "های ماشەڵلا"یە هاتبوو. بۆ هەرلایەك دەچوو "های ماشەڵلا"ی لەسەر زار بوو. چووە لای موسا کازم ئاغا، "های ماشەڵلا، ماشەڵلا، خواوەند ئەم کچانەی چەند جوان ئافراندون، های ماشەڵلا." لەلای موسا ئاغاوە چووە لای پۆیراز... هەر ماڵەو چەند جار سەری لێدا، "های ماشەڵلا، ماشەڵلا!".

پاشان جلوبەرگە نوێیەکانی داکەندن، خستنیە ناو بوخچەیەك کە لە مەلەك خانمی وەرگرتبوون. چەکمەکانیشی داکەندن و خستیە نێو توورەگەیەك. جلەکانی پێشووی کردنەوەبەر، پۆتینەکانی پۆشین، بەرەو گوند وەڕێکەوت.

لەشارۆچکە سواری بەلەم بوو کە بۆ ئەستەنبۆڵ دەچوو. لە ئەستەنبۆڵ هەفتەیەك لە سیرکجی لە میوانخانەیەکی هەرزان مایەوەو چاوەڕێی کرد، پاشان سواری کەشتییێکی بچووك بوو کە دەچووە لای گوندەکەیان. هەفتەیەك لەسەر کەشتییەکە لەنێو کەسانێکی هەژار و

بێنەواو کەنەفت مایەوە. لەنیوەی ڕێگا ئازووقەی هەژارەکان تەواو بوو، ئەو خواردەمەنییێکی باشی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو. گونیەی پڕ لە نان و پەنیر و زەیتوونی لەنێو ڕێبوارەکاندا دابەش کرد. لەیەکەمین بەندەر کە کەشتییەکەی لەنگەری لێگرت، سەیری کرد نان و زەیتوون و پەنیرەکە بەشی ڕێگاکە ناکات، لەگەڵ چەند کەسێك چووە لێوار و بەر لەوەی کەشتییەکە بەڕێبکەوێتەوە بە خۆراك و ئازووقەیەکی باشەوە کە بە کۆڵ هەڵیانگرتبوو و گۆزەی پڕ لە ئاوەوە خۆیان گەیاندەوە نێو کەشتییەکە.

لە شارۆچکەکە، بەر لەوەی بگاتە بازاڕ تووشی بوو بە تووشی چەند کەس لە برادەرەکانی خۆی، هەموویان پێکەوە بەرەو بازاڕ کەوتنەڕێ، هەرکەسێك کە ئەوی دەبینی دەیگرتە باوەش و بەگەڵ ئەو خەڵکە دەکەوت کە هاوڕێیەتیان دەکرد. هەمویان چوونە قاوەخانەیەك، لە تەك یەك و رووبەڕووی یەکدا دانیشتن. نزیکەی هەموو پیاوەکانی شارۆچکەکە کەسانی نامۆ بوون. لەبەر ئەوەی کە زۆربەی زەوییەکانی دەوروبەری دەریای ڕەش زەوی بێبەرهەم و بێپیتن نزیکەی هەموو پیاوەکانی ئەوێ نامۆ و کەسانی هەژار و بێنەوا بوون. دوای جەنگ لە ناوچە دوورەکانیش خەڵك کاری بۆ پەیدا نەدەبوو. زۆربەی خەڵکە هەژارەکەی دەریای ڕەش دەچوونە هەر جێگایەك نانەوایی و ماسیگری و هەر کارێکی دەستیان بکەوتبوایە دەیانکرد. دوای ڕۆیشتنی یۆنانییەکان کەس نەمابوو ماسیگری بکات. لە سەرو سیمایانەوە دیار بوو کە هەموویان بە زگێك تێر و بەدوان برسین. ژمارەیەك لە دانیشتووانی شارۆچکەکە بۆ گوندە بە پیتەکانی یۆنانیان کۆچیان کردبوو، بەڵام حکومەتیش لە زۆربەی شوێنەکاندا ئەو تورکانەی ئاکنجی کردبوون کە لە یۆنانەوە هاتبوون.

ئەو شەوە نیشانچی چووە ماڵی عەلی دەورانی برادەرە گیانی بە گیانییەکەی خۆی، بەڵام پەشیمان بووەوە. ماڵی عەلی دەوران کلکی مشکی لــێ بە ئارد نەدەبوو. لە ماڵێدا نە نان هەبوو نە هیچ خواردنێکی دیکە نزیکەی عەسر بوو لە ماڵەکە چووە دەر. لەنانەواخانەیەك دوو سێ نانی ڕەشی پەیدا کردن کە دیار نەبوو ئاردەکەیان لەگەڵ چ تێکەڵ کردبوو و نانەکەیان بێژابوو. نان ئەوەندە گران بوو کە کەم کەس توانای کڕینی هەبوو. نیشانچی نانەکانی کڕین. پاشان بەنێو دووکانەکاندا گەڕاو ئاردی گەنمە شامی، نزیکەی نیو کیلۆ لوبیا، نۆك، نیسك و کەمێکیش دونگی پەیدا کرد و گەڕایەوە ماڵی عەلی دەوران و ئەو شتانەی بۆ ئەوان برد. ماڵەکە بە بینینی ئەو خواردەمەنیانە ئەوەندە خۆشحاڵ بوون... نیشانچی خۆشحاڵی

کەسەکانی لەزەماوەندی بووکگواستنەوەو جەژن و شادییەکاندا بینیبوو، بەڵام ئەو جۆرە خۆشحاڵییەی هەرگیز نەبینیبوو. منداڵەکان هەر ئێسك و پێست بوون. ئەو کورتەکەی کە ژنەکەی عەلی لەبەری بوو ریشاڵ ریشاڵ بووبوو. چاوەکانی عەلی دەوران دەقووڵدا چووبوون، ملی باریك بووبوو و گۆناکانی پێکداقۆپابوون. کە بە رێگادا دەڕۆیشت بەملاو ئەولادا دەکەوت. پیاوەکانی شارۆچکە، هەموویان کەم و زۆر لە رەوشێکی ئاوەها دابوون.

نیشانچی لەماڵی عەلی دەوران تەنها توانی لەسەر حەسیر بخەوێت. دۆست و ناسیاوەکانی دیکەی کاتێك بیستیان نیشانچی میوانی عەلی دەورانەو خواردن و خۆراکی بۆ بردوون، ئەوانیش بانگهێشتیان کرد و هەوڵێکی زۆریاندا کە بشچێتە ماڵی ئەوان. نیشانچی نەیتوانی بانگهێشتی هەندێك لەدۆستەکانی رەت بکاتەوە، بەبێئەوەی بیەوێت چووە ماڵیان. لەماڵی هیچکامیان تەنانەت لەتە نانێکیش نەبوو. نیشانچی بۆ هەر ماڵێك بچووبوا بەر لەوەی بچێت دەچووە بازاڕ و دووکانەکان دەگەڕاو خواردن و خۆراکی بۆ دەکڕین ئینجا دەچووە ماڵیان. دەچووە هەر ماڵێکیش زۆر بە گەرمی پێشوازی لێدەکرا.

ئیدی نەیدەتوانی شارۆچکەکە بەجێبێڵێت و بچێتە گوند، بەڵام ئەدی ئەگەر سوڵتان بە دوای منداڵەکانیدا تا ساری قامیش چووبێت و لەوێ لە سەرمان رەق بووبێتەوە... یان بەو خەیاڵەی کە ئەگەر بۆ پەیداکردنی خواردن و هێنانی ئازووقە بچمەوە گوند و لەو ماوەیەشدا منداڵەکان بێنەوەو نەماندۆزنەوە هەر لەوێ مابێتەوەو مردبێت. لەو بیرو داڵغانەدا بوو، دواجار توانی خۆی کۆبکاتەوەو بێتەوە سەرخۆی، هیچ چارەیەکی نەبوو جگە لەچوونی بۆ گوند. کەوتەڕێ، بەڵام هەرجارێك رێگای گوندی دەگرتەبەر، دەگەڕایەوە شارۆچکە، ماوەیەکی درێژ سەیری ئەوێی دەکرد و هەر جارێك سەیری دووکەڵکێشی خانووەکانی دەکرد دەیبینی کەمترین دووکەڵیان لێهەڵناستێت. خەڵکی بێچارەی شارۆچکە لەبرسان دەمرن، ناتوانن خواردنێك بۆ خۆیان بکڕن و دابین بکەن، دەتوانن چی بکڕن تا ئاگر بکەنەوە، بێگومان نابێت دووکەڵ لە ئاگردانەکانیان بێتەدەر. بەو حاڵ و رەوشەیەوە چەند رۆژ دواتر بۆ گوندێك چوو. خەڵکی ئەو گوندەی دەناسین، گوندەکە لەودیو قەدپاڵی چیاوە بوو. دەچوو لەماڵی دۆستەکانی دەمایەوە. دەیزانی ئەوانیش هیچیان نییە، ئەوانیش نیازمەندی پاروەنانێك بوون، بەڵام هەرچۆنێك بێت ئەوێ گوند بوو، مرۆڤ دەیتوانی شتێك بۆ خواردن پەیدا بکات. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك شتی لەشارۆچکە کڕی و لەگەڵ خۆیدا بردی و بەرەو گوندەکە بەڕێکەوت. لەو گوندەشدا نزیکەی

کەسی لێنەمابوو، ماڵ بە ماڵی گوندەکە گەڕا، دەرگای هەموو ماڵەکان کراوەبوون، لە هیچ ماڵێکدا بنیادەمێك بەدی نەکرا، خۆشحاڵ بوو، لەولاتر، لە پێدەشتەکە، لەسەرووی کانیاوێکدا سێ ماڵ بەدی دەکران، لە هەر سێ ماڵەکەشدا کەسانێکی دەوڵەمەند و خاوەن بزنەگەل دەژیان. ئەوان بە باشی پێشوازیان لەنیشانچی کرد. ئەو شەوە، شلە ساواریان بۆ لێنا، کاریلەیان کوشتەوە، دۆشەکی نەرم و نیانیان بۆ راخست، بەیانی زوو توونی گەرماویان بۆ گەرم کرد، سابوونی گوڵبۆیان وێدا.

نیشانچی مەترسیە پێشبینکراوەکانی قبوڵکردن و لەبارەی گوندەکەی خۆیان پرسیاری لێکردن. بۆی باسکردن کە ژنەکەی چۆن بۆ ئەوەی منداڵەکانی ببینێت ئەوددەمەی ئەوان نووستبوون بەجێیهێشتوون و چۆتەوە گوند. ئەوەشی پرسی کە ئایا کەسیان لەو گوندانە دیوە چاوەڕێی منداڵەکانی بکات.

ساڵح ئاغای ماخۆی مێگەلە بزنەکە و سێ کانیەکە گوتی: "ژنانێکی زۆر گەڕاونەتەوە گوندەکانیان، ئەوان چاوەڕێی منداڵە شەهیدەکانیانن کە کارتی شەهید بوونەکەیان هاتۆتەوە. لەبارەی ئەوەی داخۆ لە گوندەکەی ئێوەشدا دایکانی وا هەبن یان نا، ئەمن لەو بارەیەوە هیچم نەبیستووە. هەواڵی هاتنەوەی هاوسەرەکەی تۆشم نەبیستووە، تۆ چوویتەوە گوند؟"

"نەمتوانی بچم. لەوەتەی هاتوومەتە ئەم دەڤەرانە ئاوا خەریکم بە دەوری گونددا دەخولێمەوە، بەڵام ناتوانم بچمە نێو گوند."

"تۆ جارێ چەند رۆژێك لێرە، لەماڵی ئێمەدا بمێنەرەوە تا دواتر رێگایەك دەدۆزینەوەو دەتبەینە گوند."

وەلی نیشانچی بە نائومێدییەوە گوتی: "ئینشاڵلا."

نیشانچی چەند رۆژ کە هیچ چەند کاتژمێریش نەیدەتوانی لە جێگایەك ئۆقرە بگرێت، هەموو رۆژێك تا نزیك گوندەکەیان دەچوو، لەوێ لەسەر بەردێك دادەنیشت، دەیهێنایە بەرچاوی خۆی وا سوڵتان لەنێو دەرگای ماڵێدا درێژاو درێژ کەوتووەو مشك گوێچکەکانی قرتاندون و مێرووله چاویان کۆڵیوە و جەستەی هەڵمساوە. هەندێکجاریش بیری دەکردەوە کە گوند چۆڵ و هۆڵ بێت، لەوێ لەو گوندە چۆڵە نازانێت چیبکات، هەڵدەستاو وەك ئەوەی غلۆر بێتەوە بە هەناسە بڕکێوە لە چیاکە دەهاتەوە خوار، دەهاتەوە خوار و رێگای گوندێکی نا ئاشنای دەگرتەبەر، بە بینینی گوندی چۆڵ و هۆڵ زەندەقی دەچوو، چاوەکانی دادەخستن، پاشان

به چاوانی نیوه داخراو له گوندەکە دەچووەدەر، تا هەناسەی لەبەردا دەبوو رایدەکرد. شەلاڵی عارەقە دەبوو و دادەنیشت، هەناسەیەکی هەڵدەکێشایەوە، دەگەڕایەوە شارۆچکە، هەندێك شتی لە دووکانی بێ کڕیارەکان دەکڕی و دەچووە یەکێك لە ماڵەکان و دەبووە میوانی ئەوان. هەمووان بە باشی پێشوازیان لێدەکرد. هەر کاتێکیش نەیانبینیبوا وایاندەزانی چۆتە گوندەکەیان، زۆربەیان لەبارەی ژن و منداڵەکانیەوە پرسیاریان دەکرد. خۆیشی لەوانەی دەیبینین پرسیاری ژنەکەی دەکرد، هیچ کەس ئەویان نەبینیبوو. ئەو کاتی خۆی زۆر جاران لەگەڵ ژنەکەی چووبووە شارۆچکە و خەڵکەکە ژنەکەیان دەناسی. ئەدی ئەگەر؟

ئەگەر نیشانچی غیرەتی ئەوەی هەبواو بچووبوا گوند و ژنەکەی و ژنەکانی دیکەی لەگونددا دەبینین کەوا خۆیان ڕێکخستۆتەوەو ژیانێکی ئارامیان بۆ خۆیان دەستەبەر کردوە، ئەودەم لە خۆشیان شاگەشکە دەبوو. بەداخەوە لەترسان نەیدەتوانی بچێتەوە گوندو بە دەوروبەریدا دەخولایەوە.

بەیانی دا، ژنەکان هەموویان لەخەو رابوون و چوونە کۆزی بزنەکان و بزنەکانیان دۆشی، هەموویان پێکەوە هاتنەوە، شیری بزنەکانیان رۆکردە مەنجەڵێکی بچووك، بۆ لێنانی برنجبەشیر مەنجەڵیان خستنە سەر ئاوردان، نانێکی زۆر ئاردی گەنمەشامیان دروست کردبوو، بەرچاییان بێدەنگ و پێکەوە خوارد، پاشانیش چوونە ژێر دارگوێزەکان، ئەو شتانەی لەسەر کەوڵەکاندا پانیان کردبوونەوە لەسەر پشتیەکانیان دایانان، بڕیار بوو زەریفە خەونی دوێنێ شەویان بۆ بگێڕیتەوە.

"خەونم دیوە، خێر بێت، خێرو بەرەکەت بێنێت."

ژنەکان هەموویان بە یەك دەنگ گوتیان "خێرو بەرەکەت بێنێت."

قووڵایی دەریا بە تیشکی خۆرەکە رووناك بووەوە. سێبەری چیا بە بەفر داپۆشراوەکان کەوتە بن دەریا، سێبەری چیا بەفرینیەکان... کانیەکان تەقینەوە، کەفاوی بوون، بەسەر بەردەکاندا هاتنە خوار، بەردە شینباوەکان کەوتنە ژێر کەفە سپیەکان، چیاکان کەفاوی بوون، ئاسمان کەفاوی بوو، خۆر کەفاوی بوو. قەدپاڵەکان لەژێر تیشکی خۆر درەوشانەوە، بەفر بریسکایەوە. سەربەفرەکە ئارام ئارام لەسەریەك خڕبووەوە. خڕبوونەوەی بەفر قەدپاڵەکانی داپۆشی. هەروەك چۆن گوڵە سەهۆڵیەکان ئارام ئارام و بتەوێت یان نا سەر لەژێر بەفر دەردێنن، کەللەسەری سەربازەکان لەژێر بەفر هاتنەدەر. یەکەمجار کەللەسەر و لوولەی تفەنگەکانیان بە

دەرکەوتن، پاشان شان و مل و ئینجا لای سەرەوەی جەستەیان، دواتریش لە ئەژنۆ بە سەرەوەیان، رانەکانیان، قاچەکانیان... رووت و قووت بوون. تیشکی خۆر لێیدەدان. پاشان خوێن بەسەر بەفرەکەدا هاتەخوار. زەوی و ئاسمان سوور هەڵگەڕا. پاشان تیشکی سوورباو بە هەموو لایەکدا بڵاوبووەوە. لەنێوەڕاستدا رووناکییەکی سوورباو درەوشایەوە، بایەك هەڵیکرد، باوبۆران نەڕاندی، رووناکییە سوورباوەکە دیار نەما. هەموو ئەو مرۆڤە رووت و قووتانە سەربازانی رەقبووەوە، بەفر، باوبۆران، گێژەڵوکە جارێکی دیکە هەڵیکردەوە، هەموو لایەك تاریك داهات، تاریکی رەویەوە. سەربەفرەکە وەکو جەنگەڵ وابوو، جەنگەڵی سەربازانی رەقبووەوە. لەخەونمدا بینیم، خوا بەخێری بگێڕێت، من و سێ کەس لەجەنگەڵی سەربازانی رەقبووەوە لە رۆخ کانیەکەی خوارەوە بووین، لە تەکمەوە کچانێکی شۆخ و شەنگ هەبوون بە جلوبەرگی ئاڵوواڵا، هەر یەکێکیان وەکو پەری سپی بوو. سێ سەرباز، چەك لە شان، لەنێو بەفرەکە رابوون و هاتن. هەرسێکیشیان بنیادەم بوون، هاتن و دەستی پەریەکانیان گرت، لە نێوەڕاستەوە رووناکییەك کە لە قووڵایی دەریای دابوو، کەشتییەکی سپی بەسەر کەوتەوە سەر دەریاکە. سێبەری کەشتییە سپییەکە لەژێری ژێرەوەی دەریاکەی دەدا، سێ کوڕەکانی سوڵتان سێ پەریان سواری کەشتییەکە کرد. کەشتی وەڕێکەوت، هاتە ئەم خوارە، دەریا تەواو بوو، کەشتی لێوارەکەی بڕی، تا ئەم خوارە، تا زنارەکان هاتە پێش. هات و هاتو چووە سەر زنارەکان. لەوێ لەسەر زنارەکان وەستا. سێ کوڕەکانی سوڵتان لەگەڵ سێ پەری. سوڵتان کاتێك ئەوانی بینی باوەڕی نەکرد، لەبن دارگوێزەکە پاڵی بە قاپۆری درەختەکەوەدا، لەوێ وشك داهات. کەشتی لەوێ، لەسەر بەردەکان کەوتبوو، سوڵتانیش لەنێو کەشتییەکە بوو. نەیاندەتوانی لەشوێنی خۆیان تەکان بخۆن. کەشتییەکە کە بەسەر رۆشناییەوە بوو لەپڕێکدا وەڕێکەوت و رێك بەرەو گوند هات. کەمێك دواتر رۆشناییەکە کەفی کرد. کەفەکانی رۆشنایی تا دەهات زیادیان دەکرد، بڵاوبوونەوە، بەسەر دارگوێزەکاندا رەت بوون، کەشتییە سپییەکە دوو باڵی دەرکرد، کەفەکانی شەقکرد و کاتێك لەسەر دارگوێزەکاندا دەهاتە خوار، وەلی نیشانچی و سوڵتان لەژێر دەریاکە هاتنە دەرەوەو بەسەرکەوتن و چوون لەسەر کەشتییە باڵدارەکە کە خەریك بوو دەفڕی دانیشتن، منداڵەکانیان گرتنە ئامێز. تاریکییەکی ئەنگوستە چاو هەموو لایەکی داپۆشی، پاشان لە پڕێکدا بەخەبەر هاتم. لەو دەمەی کە بەخەبەر دەهاتم کەشتییە رۆشناییەکەم بینی کەوتە سەر دەریاکە، چوو لەبن دەریاکە نیشتەوە. واتاکەی ئەوەیە

که بڵێم سێ ڕۆژ، سێ هەفتە، سێ مانگ، سێ ساڵی دیکە لەژێر دەریاکە، ئاوی دەریاکان، کەشتییە سپییەکە، هاتنە دەرەوەی سەربازانی بە سەهۆڵ بوو، وەکو گوڵە بەفرینەی نێو بەفرەکان، پاشانیش یەکسەر ڕەقبوونەوەو کەوتنیان، مانەوەیان لە قەدپاڵی چیاکە وەکو جەنگەڵێك، دوورکەوتنەوەی سێ کوڕە لاوی دەست لەناو دەستی یەکدی بە جلوبەرگی سپیانەوە لەو جەنگەڵە بە سەهۆڵبووەدا، لەوێ مانەوەی ئەوانەی کە ڕەقبووبوونەوە، ئەم خەونەی شەوانە نیشانەی ئەوەیە کە سێ کوڕەکەی سوڵتان شەهید نەبوونە، نەبوونەتە دیلی رووسان، بڵێم سێ ڕۆژی دیکە، سێ مانگی دیکە دەگەڕێنەوە لای دایکیان.

ئەو خەونە مێشکی سوڵتانی زۆر ئاشوفتە کردبوو، بەڵام دروست دەرچوو. منداڵەکانی نەمردبوون، نەکەوتبوونە بەردەستی رووسەکان، لەسەرمان ڕەق نەبووبوونەوە. زەریفە ئەگەرچی خەونەکەی بە تێکەڵ و پێکەڵیەوە دەگێڕایەوە، ڕووی دەریاکە ڕووناکی دایدەگرت. باڵی دەدانە کەشتییەکە و هەڵیدەفڕاند، کەشتی زنارەکانی شەق دەکردن و تا گوند دەهات، بەڵێ، بڕیار ئەوەیە کە ڕۆژێك کوڕەکانی دەگەڕێنەوە. ئەویش لە خەونیدا بینیبووی کە کوڕەکانی بە جلوبەرگی جوانەوە گەڕاونەتەوەو یەك یەك باوەشی پێدادەکەن، بەڵام پەریە جوانەکانی لەگەڵدا نەبینیبوون. ڕەنگبێت منداڵەکانی شەرمیان کردبێت ئەوان پیشانی دایکیان بدەن.

زەریفە لەو ڕۆژە بە دواوە هەموو شەوێك خەونی دەبینی و دەهات خەونەکەی خۆی بۆ ژنەکان دەگێڕایەوە. سوڵتان، فاتیمە و ئامینە بەیانیان لەگەڵ سەوادی دەدا لەخەو هەڵدەستان، چێشتیان دادەنایە سەر ئاگردان، مەڕەکانیان دەدۆشی و بە شەوق و زەوقێکی زۆرەوە چاوەڕێی زەریفەیان دەکرد کە درەنگ لەخەو هەڵدەستا. سوڵتان لەو ڕۆژەوەی هاتبووەوە گوند تەنها جارێك خەونی بەکوڕەکانییەوە بینیبوو، ئەوان درێژاو درێژ بەسەر بەفرەکاندا ڕاکشابوون بە ڕوخساری زەرد هەڵگەڕاویانەوە. پاشان هەستابوونەوە، لەکاتێکدا شوێنپێیان بەسەر بەفرەکەدا بەجێدەما، چوارپەلی بەسەر بەفرەکە ڕۆیشتبوون، پاشان، لە کۆتایی گەلیەکی قووڵ و تەنگەبەردا بەسەر پشتدا کەوتبوون، لەو ئانەدا سێ سەگی زەبەلاحی شوانان لەوێ پەیدا بووبوون و دەستیان کردبوو بە لستنەوەی خوێنی بەستووی ئەوان.

خەونەکانی فاتیمە و ئامینە ئەوەندە ئومێدەوارکەر و شادیبەخش نەبوون. کوڕە بریندارەکەی فاتیمە لەکاتێکدا بەسەر بەفرەکە خوێنی لەبەر ڕۆیشت چووبووە نێو چادرەکەی. فاتیمە هەر ئەوەندە دەزانێت ئاگای لە هیچی دیکە نیە. نەیتوانیوە بچێتە نێو چادرەکە، بۆیە

نەیزانیوە چی بەسەر کوڕەکەی هاتووە، هەر لەوێ لەبەردەم چادرەکە چاوەڕێی کردووە، پاشان بەدەم گریانەوە خەبەری بۆتەوە.

بەڵام ئامینە لەخەونەکانیدا بینیبووی کە کوڕەکەی مەدالیایەکی گەورەی بەسەر سنگەوەیە، سواری ئەسپێکی سوور بووە بە ریکابی زێڕینەوە، بە جلوبەرگی ئەفسەریەوە، چەکمەی بریقەدار، سنگی داوەتە پێش خۆی، ئەسپەکەی تاوداوە، وەکو بروسکە لەسەرەوەی گوند، بێئەوەی پێی ئەسپەکەی بە عەرزی بکەون، دەچێتە دەشتەکەی ئەو سەرەوەی زنارە سپییەکانی بەرامبەر، تا سەوادی بەیانی ئەسپ بە حیلاندنەوە لەو نێوە دەڕواو دەگەڕێتەوە، ئامینە سەری سووڕماوە، ئەویش سواری ئەسپێك بووە، کلکی ئەسپی کوڕەکەی گرتووە، ئەسپ جووتەیەکی هاویشتووەو ئامینەی تێفڕەداوەو سوپاس بۆ خوا کەوتۆتە نێو کانیەکە و دەربازی بووە، ئەگەر بکەوتبایەتە سەربەردێك پارچە پارچە دەبوو. ئامینە ئەسپەکەی بەرەللا نەکردووە، ئەو دەمەی کە بەرەو ترۆپکی چیاکان فڕیوە لەخەو هەستاوە.

خەونم پێیوە بینیووە، خەونەکەی، خێر دەبێت ئینشاللا، خێر دەبێت. زەریفە ئەمڕۆ زۆر درەنگ لەخەو هەستا، کراسە نوێیە بە گوڵە سوورمەیی و نارنجیەکەی کردەبەر، پێڵاوە بریقەدارەکانی کردنە پێ، ملوانکە سوورمەییەکەی بە ملەوە کرد، ڕەفتە ئاوریشمیە نارنجیەکەی کە دروستکراوی حەلەب بوو هەڵدایە سەر سەریەوە. ئافتاوەی پڕ کرد لە ئاو، بێئەوەی بە کەس بڵێت، چوو لە پەنا بەردە ئەستێیەکە، بۆ قەزای حاجەت... سوڵتان، ئامینە و فاتیمە بە بینینی ئەو حاڵ و ڕەوشەی زەریفە بێئەندازە خۆشحاڵ بووبوون. زەریفە هەرجارێك خەونێکی گرنگی بینیبوا دەکەوتە ئەو حاڵ و هەوایە. دەستی دەدایە مەسینە، بە راکردن دەچووە پشت ماڵان، خێرا خێرا ئاوێنەی بە قاپۆری دارگوێزەکەوە دەکرد، بێئەوەی چاو لەسەر ئاوێنەکە هەڵگرێت پرچی شانە دەکرد، سابوونە سەوزە بۆندارەکەی لەسوڵتان دەخواستەوە، ئامینە بە هەڵەداوان دەهات، ئاوی بە دەستان دادەکرد، ئەویش لەکاتێکدا دەست و دەم و چاوی خۆی دەشووشت، تا ئەودەمەی روومەتەکانی پەمەیی هەڵدەگەڕان ئاوا روومەتەکانی هەڵدەپشاند.

خەونم پێوە دیوە، خەون، گوتم خێر دەبێت، خێر.

ئەو رۆژە زەریفە زوو لەخەو هەستا، ئەوانی دیکەشی هەستاند. هەموویان بە نیگەرانیەوە لەنێو جێ هاتنەدەر، هەموویان پێکەوەو بە یەك دەنگ گوتیان، چی بووە زەریفە چی بووە؟

"ئێستا دەست و چاوتان بشۆن، وەرنەوە سەرخۆتان، خەونێکی سەیرم دیوە، تا ئێستا خەونی وام نەبینیوە، ئێوەش خەونی واتان نەبیستووە، زووبن."

ژنەکان دەست و بردیان کرد، هاتنە ژێر دارگوێزەکان دانیشتن و پاڵیان بە قاپۆری دارگوێزەکانەوەدا.

تاریکی وەکو دیوارێك وابوو هەر چوار لای گرتبوو. قاڵبی بەفر هەر چوارلایان پڕکردبوو، دارو درەخت و ئاو و تاریکی و هەموو شتێك بووبووە سەهۆڵبەندان. هیچشتێك تەکانی نەدەخوارد. لەهیچ لایەکەوە دەنگێك نەدەهات، دەنگەکان بەستبوویان و بووبوونە سەهۆڵ. رۆژێك یان سێ رۆژ، پێنج رۆژ یان دە رۆژ لەنێو ئەو تاریکییەدا چاوەڕێ مانەوە؟ لە پڕێکدا تاریکییەکە شریقاندی و لە نێوەراستەوە شەق بوو، رۆشناییەکی وا ئەو ناوەی داگرت کە ئاوی لەچاوان دەهێنا. لەبەر تیشکی رۆشناییەکە چاو چاوی نەدەبینی. ماوەیەکی درێژ کەس نەیتوانی هیچ جێگایەك ببینێت. پاشان دەوروبەرەکە وردە وردە روون بووەوەو بەدیارکەوت. ستوونێك لە رەنگی ئەرخەوانی لە زەویەوە تا ئاسمان تەنانەت تا ئاسمانەکانی سەرەوەتریش هەڵکشا، ستوونە ئەرخەوانییەکە کە پروشکی رۆشنایی بە دەوروبەری خۆیدا پەخش دەکرد دوای ماوەیەك کەوتە جوولە. هەروا کە دەجوولا بازنەیەکی بە ئەندازەی خۆی بە دەوری ترۆپکی بەرزی چیاکەدا دروست کرد. خەڵکەکە لەلای خوارەوەی بازنەکە دەستیان بە هەڵگەڕان بەرەو ترۆپکی چیاکە کرد، ستوونە ئەرخەوانییەکە بۆ ئەولای ئاسمان هەڵکشابوو. ئەو سەربازانەی کە بە ستوونە ئەرخەوانییەکەدا هەڵدەگەڕان وەکو مێرووڵان وابوون. لەهەمانکات، لەو مێشەهەنگانەش دەچوون کە لە دەوری هەنگەڵانەکان کۆ دەبنەوە. قەدپاڵەکان لە ئاپۆرەی خەڵکەکە رەش دەچووەوە. ستوونە ئەرخەوانییەکە کە لە ترۆپکی چیاکە تا ئاسمان، تا تەبەقەی حەوتەمی ئاسمان درێژ بووبووەوە، دەستی کرد بە جوولان، چیاکەش لەگەڵ ستوونە ئەرخەوانییەکە جوولا. بە دوایدا تۆفانێك هەڵیکرد کە ئاوێتەیەك بوو لە نوور و بەفر و باو بۆران و کڕێوە، زەوی وەکو لانکە هەژایە سەریەك، بە چەشنێك کە دەتگوت چیاکە لە زەوی هەڵکەندرابێت. لەپڕێکدا هەموو لایەك تاریك داهات، یەکسەریش رووناك بووەوە، خۆر لەقەدپاڵەکانی چیای دا. ئەوەی رەشایەتییە لەو دەوروبەرە دیار نەما. سوڵتان، تۆ، فاتیمە، ئامینە، تۆ و من پێکەوە لەوێ دەستمان خستبووە نێو دەستی یەکدی و لە تەك یەکدیدا راوەستابووین، لەژێر ستوونە ئەرخەوانییەکە. وەك ئەوەی سەیری قەدپاڵەکانی چیا بکەین،

سەیری بەفری قەدپاڵەکان، کە با هەڵیدەگرت و بەسەرو چاومانی دادەکرد. ستوونە ئەرخەوانییەکە لەترۆپکی چیاکە دادەبەزێت و دێت لەدەوری ئێمەدا بازنە دەبەستێت و بە دەوری ئێمەدا دەخولێتەوە. بە دەورماندا دەخولێتەوەو دەخولێتەوەو پاشان دەگۆڕێت بۆ رەنگێکی زۆر سوور، ئێمەیش دەچین و بە حەپەساوی لەژێر ستوونە ئەرخەوانیەکە رادەوەستین، لە رۆخی ئەولای ستوونە سوورەکە کۆمەڵە سوارێك بە دەردەکەون، سەرشانیان دەبریسکێتەوەو کەسانێکی تووڕەن. ژمارەیەکیش پیاوی کورتیلە بەخۆیان و چەند سەر مەڕی مردوو لە پێش ئەو کەسە تووڕانەوەن. دێن لە پێشمان رادەوەستن، پیاوە کورتە بنەکە، لە سوڵتان دەپرسێت، تۆ ژنی وەلی نیشانچی نیت، ئەو سەربازەی کە لە یەمەن رایکرد؟ سوڵتان دەڵێت چیت لێبشارمەوە، من ژنی ئەوم، تۆ دایکی ئەو سێ کوڕە نیت کە لە ساری قامیش و چیاکانی ئەڵلاهو ئەکبەر رایانکرد؟ چیتلێبشارمەوە، دایکیانم. کەوایە دەمت بکەرەوە! بە تووڕەییەوە نەڕاندی، لوولەی دەمانچەکەی خستە ناودەمی سوڵتان و رێك ئەودەمەی دەیویست پەلاپیتکەی دەمانچەکەی دابگرێت، لەژێر بەفرەکاندا سێ دەنگ لە سێ شوێنی جیادا بەرزبوونەوە، ئەنوەر پاشا، ئەنوەر پاشا، ئەو ژنە دایکی ئێمەیە، دەمانچەکەت فڕێدە، دەنا بە سێ گوللە دەتکوژین. یەکسەر فڕێیدە نەفرەتی. ئەنوەر پاشا دەمانچەکەی فڕێ دایە سەر زەوی، سەری ئەسپەکەی وەرسووڕاند، ئەوانی لەگەڵیشی بوون جلەوی ئەسپەکانیان وەرسووڕاند و رایانکرد، لەگەڵ راکردنی ئەوان منداڵەکانی ئێمە هەر پێنجیان لە پێنج لاوە لەژێر بەفرەکان هاتنەدەرو باوەشیان بە ئێمەدا کرد. لەخۆشحاڵیان شێت بووبووم لەودەمەدا لە خەو هەستام. سەرینم گرتبووە باوەش و توند دەمگوشی، ئێستا باش گوێ لە قسەکانم بگرن، ناتواندرێت ئەو جۆرە خەونانە نە بەخێر نە بە شەڕ تەعبیریان لێبدەینەوە، چونکە ئەو جۆرە خەونانە راستین. منداڵەکانی ئێمە نە لەسەر بەفرەکان رەق بوونەتەوە، نە لەژێر بەفرەکاندا ماونەتەوە خەونەکەم ئەوە نیشان دەدات کە ئەوان لەژێر بەفرەکان ماونەتەوە، دواتر هاتوونەتە دەر، ژێر بەفر گەرمە. ئەگەر لەسەر بەفرەکە مابانەوە رەق دەبوونەوە، چەند باشە کە چاوەڕێیانین. ئەگەر چاوەڕێیان نەبووبواین، دەهاتنەوە گوند و ئێمەیان نەدەدۆزیەوە، چی روویدەدا، چیاندەکرد، دەهاتن نەیاندەدۆزیەوە، گوندیشیان چۆڵ و هۆڵ دەبینی، لێماندەتۆران، دەچوونە جێگایەکی دیکە. تا ئێستا خەونێکی وا راستەقینەم بۆ ئێوە گێڕاوەتەوە؟ لەسەر ئەو کێوە ناوی ئەنوەر پاشام لەکوێ دەزانی؟ ژنەکان سەردوولکەیان بۆ ئەنوەر پاشا هۆنیبووەوە، رەنگە بڵێین ئەو

سەردوولکانە تا ئێرۆکانە هاتوون و من بیستوومن، سەردوولکەکان منیش بیستوومن، ئەگەر ئەو عاشقە دەنگبێژەی کە لەعێلی یوسف هاتبوو ئەو سەردوولکانەی گوتن، من چۆنم زانیوە ئەنوەر پاشا سەربازەکانی ئێمەی کوشتووە. خەونی راستەقینەش هەیە. پێویست بە تەعبیرلێدان ناکات.

کاتێك زەریفە گوتی تەعبیرلێدان پێویست ناکات، ژنەکان هەموویان دایانە قاقای پێکەنین، پاشانیش هەستان، دەستی یەکدیان گرت و تێیانهەڵکردنە گۆرانیان و سەمایان کرد، وەکو جەژن و زەماوەندان.

سوڵتان گوتی: "منداڵەکان خەریکن دێنەوە، ئێمە تا هەنووکە نە خەونێکی وامان بینیوەو نە لە کەسمان بیستووە."

زەریفە گوتی: "نیشانەیەکی وەکو ستوونە ئەرخەوانیەکەمان کە تا ئاسمانی حەوتەم بڕوات تا ئێستا نەبینیووەو نە شتێکمان لەبارەوە بیستووە، ئەو نیشانە چیە، نیشانەکە ئەوەیە کە لەچیای تۆفانیدا، ئەو سەربازانە تەنانەت ئەگەر چوار، پێنج کەسیش بن، رەق بوونەتەوە."

فاتیمە گوتی: "منداڵەکانمان دێنەوە."

ئامینە گوتی: "دێنەوە."

زەریفە گوتی: "سوپاس بۆ خوا. ئەو رۆژەی کە منداڵەکانمان دێنەوە جووت جووت مەڕیان بۆ دەکەینە قوربانی. ئاهەنگ دەگێڕین."

ئەو شەوە بە دڵخۆشییەوە نووستن و بەیانیش بە دڵخۆشییەوە لەخەو هەستان، چوونە سەرکانی ئاویان هێنا، چایان لێناو بەرچاییان خوارد. زەریفە بە شادمانییەوە خەونی ئەو شەوەی بۆ گێڕانەوە.

وەلی نیشانچی هێشتا بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە. دەچووە شارۆچکە، دەبووە میوانی برادەرە کۆنەکانی، هیچ قسەی نەدەکرد. وەلی نیشانچی ئیدی وەلی نیشانچی جاران نەبوو.

رۆژێك، جارێکی دیکە، ئەوکاتەی خەریك بوو لە شارۆچکەکە دەگەڕایەوە دیمەنی مردنی سوڵتانی لە نێو دەرگا هاتەوە بەرچاوان، لەبەرخۆیەوە گوتی ئیدی هەرگیز ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ گوند. مێشکی ئاڵۆز بوو بەوەی ئەدی ئەگەر سوڵتان نەمردبێت. هەر جارێك دەگەیشتە نێو شارۆچکە لەبەر خۆیەوە دەیگوت ئەگەر نەمردبێت. ئیدی نەدەچووە ئەو جێگایانەی کاتی خۆی کە لە گوند بوو دەچووە ئەوێ، چاوەڕێی کەشتی بوو کە بڕیاربوو بهێتە شارۆچکە. لەلایەکی

دیکە زۆر لە دەستی سوڵتان تووڕە بوو. ئاخر راتکرد کە چیبکەیت، بچیتە گوندو لەنێو دەرگای ماڵێدا بمریت و ببیتە خۆرامی ئاژەڵان! مەگەر تەنها کارتی مردنی کوڕەکانی تۆ هاتەوە، یانی کارتی ئەو هەموو خەڵکە نەهاتەوە؟ ئەو هەموو خەڵکە مەگەر گوندەکانیان چۆڵ نەکردو نەچوونە ئەو گوندانەی پێدەشت کە لەوێ بژین؟

لە ئاسمانەوە سیسارکە کەچەڵ بە چاوانی گەورەیان بەدوای یەکدا بە وشە وشەوە شۆڕیان کردەوە، نزیکی دەرگای ماڵەکە دەبوون، پەلاماری تەرمی سوڵتانیان دەدا، کراسەکەیان بە دەنووك و چرنووکان پارچە پارچە دەکرد، دادەگژانە سەر جەستەی رووت و قووتی و هەموو جارێك تیکەیەکیان لێدەکردەوە. هەندێکجاریش جەستەی لەت و پەتکراو و ئێسقانەکانی سوڵتان لەنێو سیسارکە کەچەڵەکان دەمایەوە، نیشانچی هەرچەندی هەوڵیدەدا نەیدەتوانی ئێسقانەکانی سوڵتان ببینێت. خوێن لە چرنووکی سیسارکەکان دەچۆڕایەوە. نیشانچی بۆ رزگاربوون لەو شوێنە و گەڕانەوە بۆ دوورگە چاوەڕێی کەشتی دەکرد، لەسەر وشکانی دانیشتبوو و قاچەکانی بە پاردەی هەڵدێرگەکەدا شۆڕکردبوونەوەو سەیری دەریای دەکرد و نەیدەتوانی چاو لەسەر دەریا هەڵبگرێت.

زەریفە گوتی: "کەسێکم بینی. لەسەرەوە، لەنێو زنارەکان. تارماییەك. لەسەر زنارێك بەرامبەر گوند دانیشتبوو، نەدەجوولا."

"لە خەودا بینیت؟"

"نە، لە بێداری."

"ئەدی بۆچی بە ئێمەت نەگوت؟"

"من چۆن بزانم، بەڵکو وامزانیبێت خەونیشە."

سوڵتان گوتی: "منیش ئەو تارماییەم بینی."

ئامینە گوتی: "منیش بینیم."

فاتیمە گوتی: "من ئەو تارماییەم لەوکاتەدا بینی کە لەم بەرد بازی دەدایە ئەو بەرد."

زەریفە گوتی: "سەیری ئەو سەرەوە بکەن، لەو دوورە، لەپەنا بەردەکە تارماییەك خەریکە دێت."

سوڵتان گوتی: "وادێت. مرۆڤە، جنۆکەیە، چییە. زۆر دەمێکە کەس نەهاتۆتە ئەم ناوە."

هەموویان هەستان، تەماشای تارماییەکەیان کرد، بە ئارامی بۆ لای ئەوان دەهات. تا ئەوکاتە تارماییەکە بە تەواوی لێیاننزیك بووەوە لەجێی خۆیان نەجوولاَن و چاوەڕێیان کرد. کاتێك هات لەبەردەمیاندا وەستا کەمێك جوولاَن، بەلاَم بێدەنگ مان. ڕێبوارەکە جلی سەربازی لەبەربوو، ریشێکی درێژ، تۆزاوی و ڕەنگبێت چلکن و قرێژاویشی هەبوو. هیچ نیشانی نەدەدا کە ریشەکەی ڕەش ڕەش بێت. یەکێك لە چاوەکانی دەرپەڕیبوو و برینێکی سوور تا سەرگۆنای درێژبووبووەوە. دەستی چەپی لەشانیڕا بڕابووەوە، قاچی راستیشی وەکو کەوان کەچ بووبوو. جلەکانی دڕاو و سینگە پڕمووەکەی بە تەواوی بەدەرەوە بوو و شەلوارە دڕاوەکەشی بە قاچەکانیەوە ئاوێزان بوو. ئەو کە هەر ئێسك و پێست بوو فووت لێکردبوا دەکەوت. ملی باریك بووبوو، وەك ئەوەی هەر ئێستا بپسێت.

سولَتان هاواری کرد: "ئەوە تۆیت عوسمان؟ ئەوە تۆیت؟ بەڕاست ئەوە تۆیت؟"

عوسمان هیچ وەلاَمی سولَتانی نەدایەوە، لەکاتێکدا دەیگوت: "دایکە، دایکە، دایکە!" بە راکردنێکەوە رووەو لای خوارەوە رایدەکرد، دوای ئەوەی چەند هەنگاوێك هاتەپێش، گۆچانەکەی دەستی سووڕا و دەمــاو دەم کەوتە سەر عەرزەکە، بە زەحمەت هەستایەوە. پاشان بە لاکەلاك چووە مالَی خۆیان، دەرگا کراوەبوو، چووە ژوور، هاتەوەدەر. مالَ چۆلَ بوو بە دەنگێك کە هەر ئەوەتا دەبیسترا و نەدەبیسترا گوتی: "دایکە، دایکە، لە کوێیت دایکە؟" لەنێو دەرگاکە دانیشت. ژنەکان رایانکردە لای، هەلَیانستاندەوە، ژێر بالَیان گرت و هێنایانە مالَی سولَتان، نیودەرێکیان بۆ داناو دایانیشاند، دایاننا کە پالَ وەقاپوری دارگوێزەکەوە بدات. عوسمان کەمێك هەناسەی تازە کردەوە. وەك ئەوەی کەمێك هاتبێتەوە سەرخۆی. گوتی: "لە برسان مردم. ئەگەر کەمێك ساوارتان هەبێت شلە ساوارێکم بۆ لێبنێن. زۆر لەمێژە پارووەنانێك و مراکە شلە ساوارێکم نەخواردووە."

سولَتان گوتی: "هەر ئێستا. دەبێت ساوارێکت بۆ لێبنێم کە میر و بەگانیش نەیانخواردبێت."

هەستا، ئاگردانەکەی دەرەوەی داگیرساند، قابلەمەی دانایە سەر سێپاکە. لەبەر ئەوەی ساوار زوو لێدەنرێت قابلەمەکەی لەسەر ئاگرەکە هەلَگرت، بڕێکی باش ڕۆنەکەرەی خستە ناو مەقلیەك، بۆنی مگێزهێنەری ڕۆنی قرچاوە ئەو ژێر دارگوێزانەی داگرت. دەنگی چزەچزی ئەو ڕۆنەکەرەیەی کە بەسەر ساوارەکە دادەکرا عوسمانی خستە هەلَەکەسەما.

"ساوارەکەم زوو بۆ بێنن، دەنا هەر ئێستا شێت دەبم."

قاپێکی پڕ ساواریان دانایە بەردەم عوسمان. عوسمان بە کەوچکێکی لەدار دروستکراوی نوێ پەلاماری ساوارەکەی دا. پاشان خۆی لێککێشایەوەو چووە پشتی بە قاپۆری دارگوێزەکەوەدا و خەوی لێکەوت.

سولتان گوتی: "بەستەزمانەی، بابچم لەژوورەکەی وەلی جێگایەکی بۆ رابخەم و بخەوێت."

یەکسەر هەستان، پێکەوە جێگایەکیان بۆ راخست، عوسمانیان کە خەوی لێکەوتبوو هەڵگرت و بردیانە سەر جێگا پاك و خاوێنەکە و درێژیان کرد، ئەگەرچی بۆنی لەشی عوسمان ئازاری دەدان، بەڵام بەسەرخۆیان نەهێنا.

لەدەوری سفرەکە دانیشتن، دەستیان بە خواردنی ئەو ساوارە کرد کە بۆ عوسمانیان لێنابوو.

"لێگەڕێن با بنووێت، با بێتەوە سەرخۆی، سبەی پرسیاری منداڵەکانی لێدەکەین."

سولتان پرسی: "مەگەر کارتی کوژرانی عوسمانیش نەهاتبووەوە؟ مەگەر دایکی بە گریان و لاواندنەوەکانی ئاگری بەرنەداینە هەناوان؟ ئەگەر عوسمان هاتۆتەوە، ئەگەر ستوونە ئەرخەوانییەکە تا ئەودیوی ئاسمانەکان درێژ بووبووەوە، واتاکەی ئەوەیە کە منداڵەکانی ئێمەش بە رێگاوەن."

فاتیمە ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی: "ئەگەر بڕیار وابێت منداڵەکانی ئێمەش وەکو ئەو بێنەوە واباشترە هەر نەهێنەوە."

زەریفە هاواری کرد: "ئەمە چ قسەیەکە دەیکەیت؟"

سولتان گوتی: "منداڵەکانی من هەرچۆنێك دێنەوە با بێنەوە، تەنها ئەوەندەم دەوێت هەناسە بدەن، هەر ئەوەندەم بەسە بۆنیان بکەم."

ئامینە وەکو شێتان بە رقەوە سەیرێکی فاتیمەی کرد.

"من ئامادەم هەر منداڵەکانم بێنەوە با دوو دەست و دوو قاچ و چاوێکیان پێوە نەمابێت. تەنها ئەوەندەم دەوێت هەناسەیان لەبەر مابێت. یا نەتوانن قسەش بکەن تەنها ئەوندە بەسە بێنەوە، بۆنیان بکەم."

فاتیمە بە حاڵەتێك کە لەقسەکەی خۆی پەشیمان بووبووەوە گوتی: "بێنەوە، با بێنەوە هەرچۆنێك دێنەوە بەس بابێنەوە."

عوسمان دەوروبەری نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر لەخەو هەستا. هەر لەگەڵ لەخەو هەستان سەیری لای چەپ و ڕاستی خۆی کرد، نیگای کەوتە سەر ئاوێنەی قەدی دیوارەکە، بەخێرایی بۆ لای ئاوێنەکە چوو، هەر کە خۆی لەئاوێنەکە بینیەوە، ئاوێنەی هەڵگرت، دووبارە سەیری کردەوە، بە هەموو هێزیەوە بەدیوارەکەی بەرامبەریدا داکێشا. پارچەکانی ئاوێنە جرینگجرینگ کەوتنە سەر عەرز. ژنەکان بە تاساوی ڕایانکرد و هاتنە ژوورەوە.

سوڵتان گۆچانەکەی عوسمانی هەڵگرت دایە دەستی و پێیگوت: "هیچ نییە عوسمان گیان. ئاوێنەکە لەدیوار بەربۆتەوەو شکاوە. ئاوێنەکە کۆن بوو. دەی بابچینە دەرەوە، ئاو گەرم بووە، با جوان و خاوێن بتشۆین."

عوسمانیان بردە سەر سەرشۆکەکە، جلەکانیان داکەندن، عوسمان بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو خۆی ڕاپسکاند، گوتی:

"پێویست ناکات. مەمشۆن، نامەوێت، برسیمە. ئاوێنەکەش شکا. زۆرم برسیە. مردم لەبرسان.."

"وەرە ژێر دارگوێزەکە دابنیشە. ترخێنەت بۆ لێدەنێین. ئەویش بە پوونگە. ببینە، لەسەر گۆڕکەکەیە، هەست بەبۆنەکەی ناکەیت؟"

عوسمان هەواکەی بۆن کرد.

"گوتم عوسمان حەزی چۆتە ترخێنە، ترخێنەی پار زستانمان مابوو، چەند باش بوو کە ترخێنەمان مابوو. بۆنی بکە، بۆنی بکە، سەیر بکە چ بۆنێکی هەیە، بۆنی ترخێنە بۆنێکی جیاوازە."

ئەو هەرچی زیاتر دەیگوت، بۆنی بکە، بۆنی بکە، عوسمان زیاتر بۆنی ترخێنەی هەڵدەمشت و سییەکانی خۆی پڕ دەکرد لە بۆنەکە.

"بۆنی بکە، بۆنی بکە. بۆنی بکە عوسمان بۆنی بکە. سەربازەکان زۆر مگێزیان لە ترخێنەیە. بۆنی بکە عوسمان بۆنی بکە."

سوڵتان بۆ ماوەیەك دەستی لەگوتنی بۆنی بکە بۆنی بکە هەڵگرت، چوو قابلەمەی ترخێنەی لەسەر ئاگردانەکە هەڵگرت. لەو ماوەیەدا فاتیمە سفرەی لەبەردەم عوسمان دانابوو و نانی گەنمە شامی کە ئەو بەیانیە پژاندبوویان لەبەردەم عوسمان دانابوو. سوڵتانیش بەکاسەی گەورەی درێژ ترخێنەی کە هەڵمی لێهەڵدەستا هێنا. عوسمان بە کەوچکی دارین کە

بەدەستیەوە بوو پەلاری ترخێنەکەی دا. لە ماوەیەکی کورتدا شلەی ترخێنەی ناو کاسەکەی تەواو کرد، سولّتان دووبارە کاسەکەی پڕکردەوەو دووبارە...

عوسمان بە نانی گەنمە شامی و ترخێنە ورگی خۆی بە باشی تێرکرد، پشتی بە دارگوێزەکەوەدا و چاوەکانی خستنە سەریەك. لەو ماوەیەدا کە ئەو چاوەکانی نووقاندبوو ژنەکان بێدەنگ بوون. ساتێك دواتر عوسمان لەپڕ چاوەکانی کردنەوە. هەر عوسمان چاوەکانی کردنەوە زەریفە پرسی:

"منداڵەکانی ئێمەش بەڕێوەن، وانییە عوسمان؟"

عوسمان گوتی:

"منداڵەکانی ئێوە ناتوانن بێنەوە."

"بۆچی ناتوانن بێنەوە؟"

"مردووەکان ناتوانن بچنە هیچشوێنێك، ناشتوانن لەهیچشوێنێکەوە بێنەوە."

"چۆن دەزانیت کە ئەوان مردوون؟"

بەوە دەزانم کە لەو لەشکرە گەورەیە هیچکەس زیندوو نەما، هەموویان لەنێو بەفردا ڕەق بوونەوە، ئەوانەیش کە ڕەق نەبوونەوە ئەسپێ خواردنیانی. لەوەوە دەزانم کە لەو لەشکرە گەورەیە هیچکەس زیندوو نەماوەتەوە."

"ئەگەر هەموویان مردوون ئەدی تۆ چۆن زیندوویت؟"

"هاااا ئەمە جیاوازە، منیش مردبووم، لەپڕێکدا چاوم کردنەوە سەیرم کرد زیندوو بوومەتەوە. لەجێگایەك بووم نەمدەزانی کوێیە. جێگایەك کە وامدەزانی دنیایەکی دیکەیە، هەموویان بە زمانێکی دیکە دەدوان، چەند شەو و ڕۆژێك لەوێ مامەوە، نازانم. یان چەند مانگ و چەند ساڵ نازانم. دوای ماوەیەکی درێژ، لە ڕاستیدا درێژی و کورتی ماوەکەش نازانم، کەسێکیان هێنایە لام، توند شەتەکیان دابوو. دوای ماوەیەك دەستی بە قسان کرد. ئەفسەرێك بوو کە بەدیلی کەوتبووە دەستی رووسەکان، ئەویان لەژێر بەفر دەرهێنابوو. هەموو گیانی لەت و پەت بوو بوو. بە چەشنێك کە ئەگەر مردبوا باشتربوو. دوای ماوەیەك ئەفسەرەکە گوتی ئێمە لە نەخۆشخانەیەکی رووسەکانین. منیشیان لەژێر بەفردا هێنابووەدەر، قاچێکم بە دەرەوە مابووەوەو ڕەق بووبووەوەو ئەو قاچەیان بڕیمەوە. چاوێکم گوللە پێکابووی و لەکاسەی خۆی دەرچووبوو، دکتۆرەکان دەستیان لە شوێنی بەتاڵی چاوەکەم نەدابوو."

"ئەدی منداڵەکانی ئێمەیان لەژێر بەفرەکاندا هێنایەدەر؟"

"هیچکەس."

"ئەی چوونە کوێ؟"

"نەچوونە هیچ لایەك، ئەوان لەهەمان جێگا لەبناری چیاکە بەر لەوەی کە تەنانەت بشکەون هەر بە پێوە رەق بوونەوە. هەزاران سەرباز لەو قەدپاڵەی چیادا بە هەمان شێوە بە پێوە رەق بوونەوەو ئاوامانەوە، وەکو دارستانێك. منیش ئەو دارستانەم بینی."

سوڵتان پرسی: "بەچاوی خۆتت بینی؟ بینیت منداڵەکانی ئێمە رەق ببنەوەو بمرن؟"

"نەمبینین."

"ئەگەر نەتبینیوون چۆن دەزانیت کوڕەکانی ئێمە رەق بوونەتەوە؟"

"گوێت لێنیە لەبەیانییەوە دەڵێم هەموو لەشکرەکە رەق بووەوەو مردن، واپێتدەڵێم زۆربەیان بوونە خۆراکی ئەسپێیان، مەگەر نەمگوت، نەتانبیست؟ هەموویان مردن، هەموویان مردن، هەموویان مردن. وادەزانیت من زیندووم، منیش مردووم، منیش مردووم، مردووم."

بە تووڕەییەوە بە کۆمەکی گۆچانەکە دەستی بە قاپۆری دارگوێزەکەوە گرت و هەستایەوە، کەمێك چووە پێش، پاشان راوەستاو ئاوڕی دایەوە، چاوێکی لە بن تا سەر لکی دارەکان کرد، پشتی خۆی وەرسووڕاند و لەکاتێکدا هەر دایکە دایکەی بوو بەرەو خوارەوە سەرو ژێر بوو، گەیشتە دەرگای ماڵەکەیان، دەرگای کردەوە، چووە ژوورەوە، بە دەنگێك کە لەنووزانەوە دەچوو گوتی دایکە، دایکە، دایکە لەکوێیت؟ چوویتە کوێ؟ هەموو ژنەکان چاوەڕێی کوڕە مردووەکانیانن، تۆ دایکە، دایکە، دایکە تۆ لەکوێیت؟ لەماڵێ هاتەدەر. دەنگی گۆچانەکەی دەستی کە بە بەردەکان دەکەوت و دایکە دایکە کردنەکانی لەنێو ئەو زنارانە دەنگی دەدایەوە. نیشانچیش کە تا نزیك گوند هاتبوو ئەو دەنگەی دەبیست. نیشانچی لەدڵی خۆیدا گوتی ئەم دەنگە دەبێت نیشانەی شتگەلێکی باش بێت. گوند چۆڵ نییە. سوڵتانیش رەنگبێت لەگەڵ گوندییەکان بە تێروتەسەلی و رێكو پێك بژیت.. هەستێکی ئومێدبەخشانە کەوتە دڵیەوە، قاچەکانی هەڵیانگرت و بەرەو لای سەرەوەی گوندەکەیان برد. شادی و ئومێدێك گرتیە خۆی کە لەنێو ئەو رێگا سەخت و بەردەلانە دەستی کرد بە غاردان. لەسەریەك دەکەوت و یەکسەر هەڵدەستایەوە، کەمێك دواتر دیسان دەکەوت. بەدەستی رووشاو و خوێناوی خۆی گەیاندەوە ماڵی خۆیان.

یەکەمجار سولّتان ئەوی بینی، ئەژنۆی شل بوون، هەر لەو جێگایە دانیشت کە لێیبوو. ژنەکانی دیکەش بە راکردنەوە هاتن و گوتیان: "چیتلێهات سولّتان؟" سولّتان هەرچی هەولّیدا دەنگی دەرنەدەچوو.

"سولّتان چیتلێهاتووە؟"

زەریفە رایکرد و جامە ئاوێکی بۆ هێنا. سولّتان کە دەستەکانی دەلەرزین نەیتوانی جامەکە بگرێت، زەریفە جامە ئاوەکەی بەسەر دەمیەوە کرد، سولّتانیش بە لێوە لەرزۆکەکانیەوە لەکاتێکدا نیوەی ئاوەکەی رشت کەمێك ئاوی خوارەوە، دەستە لەرزۆکەکانی دوای ئەوەی چەند جارێك تاقیکردنەوە نەیتوانی بەرزیان بکاتەوە، بەرەو لای رێگاکەی رادان، ژنەکان سەیری رێگاکەیان کرد، زەریفە گوتی: "وای، وای ژنینە، ئەوەی دێت وەلی نیشانچی نییە؟"

سولّتان کە کەمێك هێور بووبووەوە بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی: "ئەوەی دێت وەلیە، لە دەنگی پێیەوە ئاشکرایە کە وەلییە. ئەو وەلیە وەلی."

تا وەلی نزیکتر دەبووەوە سولّتان زیاتر دەهاتەوە سەرخۆی. "وەلیە وەلی، ئەوەی دێت، وەلیە وەلی."

دەستی دانەبەرخۆی و هەستایەوە.

"ئەوەی دێت وەلیە وەلی."

یەکسەر بەرەو لای وەلی رایکرد و دەکەوت و هەڵدەستایەوە. بەسەر بەردەکاندا بەسەرکەوت. وەلیش بە بینینی ئەو لەسەرەوەڕا رایکردە خوارێ، یەکیدیان گرتە باوەش. بەوشێوەیە هاتنە ژێر دارگوێزەکان. سولّتان هەناسەبڕکێی بوو، سنگی بەرزو نزم دەبووەوە. ژنەکانیش کەمێك لەولاتر وەستابوون و سەیری ئەوانیان دەکرد.

"وەلیە وەلی."

ژنەکان کاتێك بە خۆهاتنەوە یەکسەر چوونەوە ماڵ و گونیە و جاجمیان هێنا و لەژێر دارگوێزەکان رایانخستن. یەکەمجار دەستی نیشانچیان گرت و دایاننیشاندە سەر نیمدەرێك، ئینجا هاتن بەرامبەریان دانیشتن. ماوەیەکی باش متەقیان نەکرد، تەنانەت سەیری روخساری یەکدیکەشیان نەکرد.

"ئەوەی بەرامبەرمان هات وەلی بوو وەلی."

یەکەمجار سولّتان هاتەوە سەرخۆی، بە لێوانی بەبزەوە گوتی: "بەخێر هاتی، وەلی."
پاشان ژنەکانی دیکەش بەخێرهاتنیان کرد.
وەلی گوتی: "سوپاستان دەکەم."

زەریفە هەستا، جامێکی مسینی هەڵگرت، لەکۆتکێکی ئاو خواردنەوە ئاوی بۆ وەلی هێنا، وەلی ئاوی جامە گەورەکەی لەکاتێکدا قورتە قورتی دەکرد خواردەوە. دوای ماوەیەك بێدەنگ باسی دوورگەی بۆ کردن، لەبارەی راکردنی سولّتان هیچی نەگوت. باسی دوورگەی کردو باسی ئەوەی کرد کە چۆن ئەوێیان دۆزیەوە، کێ ناوی دوورگەی پێگوتوون، کە گەیشتنە دوورگە چۆن چۆنی پێشوازیان لێکراوە، لەوێ خانووێکی وەکو کۆشکیان داونەتێ و باسی ئەوەی بۆ کردن کە دوورگە دەڵێی بەهەشتی خوایە. ژنەکان لە دەمە دەمی عەسر ساواری بە رۆنەکەرەیان بۆ لێنا، دۆشیان هێنایە سەر سفرە کە لەماستی بزنان دروستیان کردبوو. پاشان هەریەکەیان بۆ لایەك چوو و لێیخەوتن. هەموو بەیانی زوو لەخەو هەستان. بێئەوەی قسەیەك بکەن ئاشی بەیانیان خوارد، سولّتان بۆ خڕکردنەوەی بوخچەکانی چووەوە ماڵێ، ژنەکانی دیکەش بەدوایدا چوون. ماوەیەك دواتر بە بوخچەی گریدراوەوە هاتنەدەر. وەلی نیشانچی پارچە کاغەزێکی لەگیرفانی دەرهێناو دایە زەریفە، "ئەگەر منداڵەکانی ئێمە هاتنەوە ئەم پارچە کاغەزەیان بدەرێ. پێیانبڵێ نوسخەیەکی دیکەی ئەم پارچە کاغەزە لە شارۆچکەیە لای حاجی تۆپاڵ. حاجی دەیاننێرێتە لای ئێمە. قسەکانم لە بیرنەکەیت."

"زەریفە گوتی لە بیرم ناچن کاك وەلی."

نیشانچی کیسەکانی بەرپێی بەکندرێك توند گرێدان و بە شانی دادان. سولّتانیش بوخچەکانی هەڵگرتن.

نیشانچی گوتی: "ئەم گوێزانە با بۆ ئێوە بن. من ئیدی بۆ وەشاندن و کۆکردنەوەو فرۆشتنی گوێزەکان ناهێمەوە. هەمووتان کۆکردنەوەی گوێز شارەزان، کۆیان بکەنەوەو بیانفرۆشن، وەکو ئاغای ئەم دێیە لێرە دەژین و چاوەڕوانی منداڵەکانتان دەکەن. هەموو گوێزی ئەم گوندە هی خۆتانن. کێ دێت بۆ گوێز لێتان دەپرسێتەوە؟ هیچکەس لێرە نەماوە، ئەوانەی ماویشن وەکو من رۆیشتوون و جێگایەکیان بۆ خۆیان دۆزیوەتەوە. چیان لەو سەر چیایە دایە. باشە ئیدی، لە کەم و کوڕییەکانمان ببوورن." کەوتەڕێ، سولّتانیش بە دوایدا، فرمێسك لە چاوەکانیدا قەتیس

مابوو و ئاخی هەڵدەکێشان. گوتی: "گەردەنمان ئازاد بکەن." بەلاکە لاك کەوتە دوای نیشانچیەوە.

"لەسەر خێر، لەسەر خێر، لەسەر خێر. هەر منداڵەکان بگەن دەیاننێرینەوە لاتان، بەهیچشێوەیەك نیگەران مەبن. یانی ئێوە پێتانوایە ئەو خوایەی کە عوسمانی کوڕی سەفیەی ناردەوە کوڕەکانی ئێمە نانێرێتەوە لامان؟ لەسەر خێر."

ژنەکان تا ئەودەمەی کە ئەو دوانە لەدەربەندەکە پێچیاندایەوەو لەبەرچاوان ون بوون هەروا وەکو بەرد لە شوێنی خۆیان مانەوەو سەیریان کردن.

سوڵتان و نیشانچی ئارام ئارام و بەدەم قسەکردنەوە دەڕۆیشتن. نیشانچی باسی دوورگەی دەکرد، باسی نەوەکانی، ئەوەی کە مەلەك خانم و لێناو زەهراو سەبیحە چەند بە باشی ئاگایان لێیانە، هەرجارێك کە لە ماسیگرتن دەگەڕێتەوە وا هەست دەکات منداڵەکان کەمێکی دیکە گەورە بوونەو باڵایان کردووە، لەهەمانکاتدا باسی دانیشتوانی دوورگەی دەکرد و باسی سروشتی ئەوێی موو بە موو بۆ سوڵتان باس دەکرد. نیشانچی هەرجارێك کە باسی نەوەکانی دەکرد چاوەکانی سوڵتان دەبریسکانەوە، بۆیە نیشانچیش بەردەوام هەر باسی نەوەکانی دەکرد. دواجار، سوڵتان ئەودەمەی کە لەچیاکە بەرەو دەشت دادەبەزین لەسەر بەردێك دانیشت، "وای نەوە بەدبەختەکانی خۆم کە کە بێ دایك و باوك گەورە دەبن. وای." دایە پرمەی گریان. نیشانچی چوو لە پێش سوڵتان راوەستا بە دەنگێکی لێبڕاوانە گوتی: "مەگری، مەگری، مەگەر نەوەکانت لە چیان کەمە. ژنەکانی دوورگە وەکو گوڵ پێیانڕادەگەن و ئاگایان لێیانە، لەمن و تۆ باشتر، مەگری."

دەستی سوڵتانی گرت و هەڵیستاندەوە، دەستی بە هێمنی لەسەر شانی دانا:

"بۆم باس بکە، باسی خەونەکانی زەریفەم بۆ بکە، هەموو شەوێك دنیایەك خەونی دەبینی؟"

"بەیانیان زوو دەستی پێدەکرد و هەندێك رۆژان تا نیوەشەو هەموو ئەو خەونانەی دیبوونی دەیگێڕانەوە. ئێمە دەڕۆین، بەڵام منداڵەکانمان دێنەوە. زەریفە زۆر بە روون و ئاشکرایی لەخەونەکانیدا بینیوویە کە منداڵەکانی ئێمە نەمردوون و وەکو عوسمانی کوڕی سەفیە دەگەڕێنەوە."

وەلی نیشانچی لەجێی خۆی ڕەقهەڵات، ئەبرۆکانی تێکنان و ڕەگی نێوچاوانی بەرزبوونەوەو گوتی: "سوڵتان، سوڵتان، سوڵتان، منداڵەکانی ئێمە ئەگەر وەکو ئەو حاڵ و ڕەوشەی عوسمان بگەڕێنەوە باشترە کە هەر نەگەڕێنەوە، با هەر لەلای رووسەکان بمێننەوە، تێگەیشتی؟"

سوڵتان بە راوێژێکی نەرم، بێتووڕەبوون و لەهەمانکاتدا دڵنیایانە گوتی: "بۆ ئەوەندە تووڕە دەبیت، بە تووڕەیی قسان دەکەیت، نازانیت چیدەڵێیت. خەونەکانی زەریفە، دەڵێن کە منداڵەکانی ئێمەش وەکو عوسمان دەگەڕێنەوە، دەڵێن ساخ و سەلامەت وەکو چۆن لێرە رۆیشتن ئاوا دەگەڕێنەوە. ئەوە تۆ چیدەڵێیت وەلی نیشانچی. زەریفە رۆژان و مانگان خەونی بینین، هەموو خەونەکانیشی وەك خۆی بۆ دەگێڕاینەوە. لەنێو ئەوانەی کە بڕیارە بگەڕێنەوە هیچکامیان وەکو عوسمان نەبوون. ئەو هەموو شتێکی دەگوت تەنها ئەوە نەبێت کە رۆژ یان مانگ یان ساڵی گەڕانەوەیانی نەدەگوت. رەنگبێت خەونەکانیشی نەیانزانیبێت ئەوان کەی دەگەڕێنەوە، لەو ماوەیەدا شایەرێك لە ئارتوینەوە هات، شایەری بیانی، سەردوولکە و سترانی چڕین. لەبارەی کەسێکی ئەژدیهائاساشەوە هەندێك شتی چڕی، ناوەکەشی گوایە ئەنوەر پاشا بووە کە ملی سەربازەکانی دەخستە بەر دەمی تیغ. ژنەکانی شوێنێکی ئەودیوی یەمەن، سەبارەت بە ئەنوەر پاشای بکوژی سەربازان سەردوولکەی نەفرەتئەنگێزیان هۆنیەوە. ئەو بۆی خوێندین و ئێمەش گریاین. عاشقی رێبوار کەسێکی لێهاتوو بوو، کاتێك خەریك بوو گوندەکەمانی جێدەهێڵا زەریفەشی کەوتە دوا و لە گەڵیدا رۆیشت، ئێمە ئاوا بێ زەریفە ماینەوە، بەبێ خەونەکانی، زۆری نەمابوو شێت ببین، سوپاس بۆ خوا زەریفە زوو گەڕایەوەو دیسان خەونەکانی خۆی بۆ گێڕاینەوە."

نیشانچی گوتی: "زەریفە کارێکی باشی کردووە گەڕاوەتەوە لاتان. مرۆڤ کاتێك چاوەڕێی سەربازەکەیەتی چۆن دەتوانێت بکەوێتە دوای عاشقێك، تەنانەت با ئەو عاشقەی عاشقی حەقیش بێت و بڕوات؟"

سوڵتان گوتی: "بەهەرحاڵ، دوای ئەوە زەریفە خەونی وای دەبینین کە بۆی دەگێڕاینەوە کوڕەکانمان دەهاتنەبەر چاومان، بە روخساری بزەداریانەوە."

نیشانچی ژێر باڵی سوڵتانی گرت، پێدەکەنی.

"لەدوورگە گەلیەك هەیە کە لەلێوی دەریاوە دەست پێدەکات تا ئەوسەری دوورگە درێژ دەبێتەوە. گەلیەکە پڕە لەدارهەنجیر. دارهەنجیرەکان کورتە باڵان، گەڵاکانیان پاك و لك و

کەدەکانیان چڕو پڕن. دارهەنجیرەکانی ئەوێ وانین وەکو ئەم دارگوێزانە بەرزن، هەر هەنجیرێکیشیان یەك بە لەپی دەستن. هەنجیر کە پێدەگەن شیلەیان لەبەر دەڕوات. ئێستا دەبێت بە تەواوی پێگەیشتبن. ئەگەر ئێمە تازووە نەگەینەوە دوورگە، ئیدی هەنجیر بە کەڵك نامێنن، باڵندە هەموویان دەخۆن. ئینشاللاّ کەشتییێك لەم ناوانە پەیدا دەبێت."

بەدەم باسکردنی هەنجیرەوە گەیشتنە نێو شارۆچکە. دوای ئەوەی کە لەبازاڕ هەندێك کەلوپەلیان کڕی، چوونە ماڵی یەکێك لەدۆستەکانیان. دۆستەکانیان بە بینینی سوڵتان زۆر خۆشحاڵ بوون.

وەلی نیشانچی هێشتا لەبەر دەرگا بوو کە پرسیاری کەشتی کرد. دۆستەکەی گوتی: "سبەی کەشتی دێت، دەوروبەری عەسریش دەچێتە ئەستەنبۆڵ."

وەلی نیشانچی، هەربیری لە هەنجیرە گەییوەکان دەکردەوە. هەنجیرە گەییوەکان زۆر زۆرن کە ئەگەر بفرۆشرێن پارەیەکی باشیان لاّ بەدەست دێنن. ئایا کەسێك لەنێو دوورگە دەست دەکەوێت کە عەقڵی بەوە دابکشێت هەنجیرە گەییوەکان کۆبکاتەوە؟ دارهەنجیر ناسکە، لکەکانی بەرگەی بەری زۆر ناگرن، بە کەمترین قورسایی دەشکێن. بۆ لێکردنەوەی هەنجیر مێردمنداڵانی دە دوازدە ساڵەی گوند بەسەر دارهەنجیرەکان دەنێن. نیشانچی هەر بیری لەهەنجیرەکان دەکردەوە. ئایا عەقڵیان پێدادەشکێت هەنجیرەکان کۆبکەنەوە؟ لەنێویاندا کەسانێك هەبوون حەزیان لە هەنجیر هەبووبێت؟ کاك موسا کازم ئاغا، ئەو خەڵکی کرێت بوو، لەوێ هەنجیر دەڕوێنن. ڤاسیلی و پۆیراز، هەردووکیان ئاشناییان لەگەڵ دارهەنجیراندا هەیە. پۆیراز خەڵکی بەرزاییەکانی دەشتێکی پان و بەرینە بەناوی چوکوراوا. چوکوراوا، شوێنێکی گەرمەسێرە، هەنجیریش مێوەیەکی گەرمەسێریە. پۆیراز لە چوکوراوا چۆتە سەر دارهەنجیرەکەی باغچەی ئاشەکە، هەنجیری خواردووە، زگی پەنمیوەو قاچی خستۆتە سەر لکە هەنجیرێکی باریك و لەگەڵ شکانی لکە باریکەکە خۆی بە لکێکی ئەستوورتر گرتۆتەوە. ڕەنگبێت ئەوان پێیانگوتبن هەنجیرەکان کۆبکەنەوە. کە کاتی لێکردنەوەی هەنجیرەکان لکەکانیان دەشکێنن و لەو سەرەوە دەکەونە خوارێ، خوانەخواستە لەو بەرزاییە ئەگەر بەسەر بەردێك بکەون، تەنانەت بۆی هەیە بشمرن.

دۆستەکەی گوتی:

"دە ئێوە جارێ دابنیشن، دابنیشن پشووێك بدەن!"

دۆستەکەی بوخچەکانی سەر پشتی وەلی وەرگرتن و ژنەکەشی بوخچەکەی سولّتانی وەرگرت و دایاننانە لایەك، پاشان ئەو خواردنانەشیان لێوەرگرتن کە لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان و بردیانە ناندینەکە.

دوای نانخواردن لەبارەی جەنگەوە قسەیان کرد. "تەنها بە پەنجەی دەست بژمێری خەڵکی لەجەنگ گەڕانەوە. پێشتر گەنجێکی عاشق لە ئارتوینەوە هات، چاوێکی کوێر بوو، قاچێکیشی شەل، بەدەم گریانەوە ستران و سەردوولکەی لەبارەی جەنگەوە دەچڕین و بیسەرەکانیشی دەخستنە گریان. بەر لەوەی بریندار ببێت زۆر لەو سەربازانەی بینیبوون کە لە سەرمان ڕەق بووبوونەوەو بووبوونە سەهۆڵ، لە قەدپاڵی چیاکاندا جەنگەڵێك لە سەربازی بەسەهۆڵبوو دروست بووبوو. عاشقی گۆڕین سێ شەو و سێ ڕۆژ خەڵکی گریاندبوو. بێپسانەوە لاواندنەوەی (غەریبێ دایێ)ی چڕیبوو، دڵی بیسەرەکانی دەکردە خوێن. ئێمە ئەوەدەمەی کە سەربازبووین، کە سەرباز نەمان هاتن و منداڵە وردکەی پازدە شازدە ساڵەیان ڕاپێچی سەربازی کرد، منداڵەکانیش لەکاتی بەڕێکەوتنندا یەکدەنگ و پێکەوە هاواریان کردبوو وای دایێ غەریبێ دایێ و دابوویانە پرمەی گریان."

خاتوونی ماڵەکە دەمێك بوو کاتێك ئەوان خەریکی گفتوگۆ بوون جێی بۆ ڕاخستبوون. دوای نانخواردنو بەرچایی خاوەن ماڵ گوتی: "فەرموون، وەلی، حەزی لە دووسەرینە. فەرموون" و هەستا.

ژنەکە مەسینە بەدەست هات و گوتی: "ئەگەر پێویستت بەسەر پێشاوێ هەیە، هۆ لەوێیە و فانۆسێکی دایە دەستەکەی دیکە، بەدەست نیشانی دا، سولّتان چووە دەرێ، وەلی لە ڕۆخ جێگاکە چاوەڕێی سولّتانی کرد.

هەر سەریان خستە سەر بالیف خەویان لێکەوت.

لەگەڵ سەوادی بەیانی دا لەخەو هەستان، نیشانچی مەسینەی پڕ ئاوی هەڵگرت و خۆی گەیاندە ئاودەستخانەی نێو باخچە. پارچە کۆنە جاجمێك بە دەرگای ئاودەستخانەکەدا هەڵواسرابوو. نیشانچی دوای خۆ خاڵیکردنەوە بەو ئاوەی مەسینەکە خۆی شووشت، بێجامە و شەلوارەکەی هەڵکێشایە و دۆخینەکەی توند کردەوە، لەدەرگای حەوشە یەکێك لەکچەکانی ماڵەکە مەسینەکەی لێوەرگرت، نیشانچی دانیشت، کچەکە سابوونێکی دایە دەست، ئاوی لەدەستە کراوەکانی کرد. نیشانچی قەت دەست و دەموچاوی بەتایبەت ریشی تێکچرژاوی بە

سابوونێکی ئاوا بۆندار نەشووشتبوو. دوای ئەوەی شووشتن و خۆپاگژکردنەوەکە تەواو بوو، سابوونەکەی دانایە سەر تەختەکەی تەنیشتیەوەو هەستا. کچەکە خاولیەکی شینی کە لەسەر شانی بوو هەڵگرت و بۆ لای ئەوی درێژ کرد، وەلی دەست و دەم و چاوی وشککردنەوەو گوتی: "سوپاس کچەکەم." رووی کردە دەریا، بەخێرایی هەنگاوی نان، دۆستەکەی لەدوایەوە بانگی کردو پێیگوت: "وەلی، ئەوە بۆ کوێ دەچیت؟ برنجبەشیر ئامادەیە."

"تا برنجبەشیرەکە لەسەر ئاگردان دادەگرن، من گەڕاومەتەوە سەر سفرە."

بەڕاکردن چووە ئەسکەلە، کیوشکی پلیتبڕەکە هێشتا نەکرابووەوە. کەس لەو ناوە نەبوو، خێراتر لەوەی رۆیشتبوو گەڕایەوە، قابلەمەی برنجبەشیرەکە هێشتا لەسەر ئاگر بوو، هێنایانە خوار، خێرا خێرا قابلەمەکەیان بەتاڵکرد و هەموویان خوارد، نیشانچی هەر لەگەڵ هەستان چووە ئەسکەلە و گەڕایەوە، ئەبرۆی تێکنابوون: "ئەمجارەش کەس لەوێ نەبوو. پلیتبڕ و قاوەخانەی ئەسکەلەش نەکرابوونەوە."

"ئێستا وەرە دانیشە کەمێك قسان بکەین. کەوابوو دوورگەی تۆ دوورگەیەکی ئاوایە و ئیدی بەتەما نیت بگەڕێیتەوە ئەم ناوە؟"

نیشانچی گوتی: "ناگەڕێمەوە، بگەڕێمەوە چیبکەم، گۆڕی دایك و باوکم لێرەن، با هەر لێرە بن، خۆ ئەوان نان و ئاوم لـێ داوا ناکەن. خۆزگە تۆش دوورگەت دەبینی، بەهەشتی خوایە لەسەر ئەم زەویە. دەڵێی بەهەشتە، خانووێکیان داومەتێ دەڵێی کۆشکە. دوو نهۆمە، میچەکەشی نەخشی دەریایە. لەسەرەوەی نەخشی دەریاکەشدا گوڵی وا هەن کە تۆ دەڵێی لە بەهەشتێکی نەناسراو هێندراون. بەیانیان کە لە خەو هەڵدەستم گوڵەکان دەبینم. دەریا بۆ ناڵێی، ئەوەندە هێمنە، ئەوەندە هێمنە باو شەپۆل و تۆفانەکانی لەوانەی دەریای رەش دەچن، وەکو دەریاکانی دیکە شێت و شەوێت نابێت، هەروەك ماسیگرەکان دەڵێن، دەریایەکی زۆر ئارامە. زۆربەی کاتەکان ئەوەندە ئارامە کە مێروولەکان دەتوانن ئاوی لێبخۆنەوە. ماسیەکانی، ماسیەکانی، پڕ ماسیە پڕ، هەر قوڵاب هەڵدەو ماسیان بگرە، هەڵدەو بیانگرە، ئاوا. ئاوخواردنەوەی مێرووله... باپیرانمان گوتوویانە جێگا باشەکان خەڵکەکەشی باش دەبێت، ئەمە قسەیەکی راستە، تەنانەت دێهاتیە تورکمەنەکانی لێواری دەریای ئێمەش ماسی دەخۆن. ئەگەر چەند مانگێك لەنێو دەریا خۆشخولقەکەی خۆمان ماسی بگرم، بەشی چەند ساڵێکمان دەکات."

دۆستەکەی پێکەنی:

"هێی وەلی، تۆ کە لێرەش بوویت هەروا بوویت. مەگەر ئەوکاتە ماسیەکان هەر کە دەیانبینیت لە دەوری بەلەمەکەتدا خڕنەدەبوونەوە؟"

زۆر چاوەڕێی ئەو کەشتیەی کە بڕیار بوو بێت نەمانەوە. بەیانیی زوو کەشتیی ئەستەنبۆڵ لەنگەری گرت. نیشانچی دەستپاچە بووبوو، سوڵتان لە کوێیە. ئارام ئارام بە دوایدا دەڕۆیشت، سوڵتان زۆر منجڕ بوو، کاتێك بڕیاری بدابوا کارێك بکات، بە مسۆگەری ئەنجامی دەدا. چەند شەو بوو نەخەوتبوو، چەند ڕۆژ بوو ئۆقرەو ئارامی نەبوو. وایلێهاتبوو کە هەر ئێستا نائێستا ون ببێت و بچێتە ئەو دنیایەی یەکێك بوو یەکێك نەبوو. ئاشکرابوو کە ئەو تا ماوە هەر چاوەڕێی کوڕەکانی دەکات و هەموو شەوو ڕۆژێك خەونیان پێوە دەبینێت و کاتێکیش دێنەوە سەمایەکی وا بۆ نیشانچی دەکات کە هەموو دنیا سەرسام بکات.

کەشتی لەنگەری گرتبوو و چاوەڕێ بوو ڕێبوارەکان سوار بن. نیشانچی ئەگەرچی حارز و ئامادە بوو، بەڵام ترس و دڵەڕاوکێی تا دەهات زیاتر دەبوو، چاوی لەسەر هەڵنەدەگرت، سوڵتانیش بەبێهیچ جووڵەیەك، وەکو وەلی نیشانچی بەبێسەبری چاوەڕێی بەڕێکەوتنی کەشتییەکە بوو. لەنێو قاوەخانەکە دانیشتبوو و چاوی بڕیبووە کەشتییەکە، لەکاتێکدا نیشانچی کونجکۆڵ بوو بزانێت لە دوا ساتەکاندا چ بەڵایەکی بەسەر دەهێنێت.

ئەو، وەکو ئەوە وابوو بە کەرامەت و جادوو هەر ساتێك بۆی هەبوو لەبەر چاوان ون ببێت. ئەو کەشتییەش هەر بەڕێ ناکەوێت. دواجار چوو لە تەنیشت سوڵتان دانیشت، بە توندی دەستەکانی گرت، سوڵتان دەستی خۆی نەکێشایە دواوە. سەیرە، ئەم سوڵتانە چی بەسەر هاتووە؟.

چەند بەلەمێك بۆ گواستنەوەی ڕێبوارەکان بۆ سەر کەشتی هاتن، نیشانچی هەستاو سوڵتانیشی هەستاند. لەکاتی هەستاندا دەست و پێیەکانی سوڵتان بە توندی دەلەرزین. لەگەڵ چەند ژن و پیاوی دیکە سواری بەلەم بوون. سوڵتان هێشتا هەر دەلەرزی. گەیشتنە کەشتییەکە، لەپەیژەکان بە سەرکەوتن. پیاوێك قۆڵی کراسەکەی هەڵکردبوو، جلێکی لۆچاویی شینی لەبەر بوو، چاوانی شین، سمێڵێکی سوور، لووتێکی باریکی هەبوو، کابینەکەی نیشاندان.

سوڵتان گوتی: "ئۆووی، تەختی دانیشتنیشی هەیە. دەڵێی ژووری پاشایانە."

ئەو پیاوەی کە لووتێکی باریکی هەبوو گوتی: "وایە. کەشتییەکەی ئێمە نوێیە. دروستکراوی ئینگلستانە، زۆرباشە."

سوڵتان لەپڕ دەستی خۆی لەنێو دەستی نیشانچی کێشایە دواوە، بە خێرایی لەکابینەکە چووە دەر. بەترسەوە لەسەر سەکۆی کەشتییەکە راوەستاو چاوی بڕینە چیاکانی گوندەکەیان.

نیشانچیش هات لەتەکیەوە راوەستا، دەستی سوڵتانی کە توند بە میلەکانی ستارەی سەکۆکە چەسپیبوون گرت، هەرچی هەوڵی دا نەیتوانی دەستی سوڵتان لە میلە ئاسنەکان بکاتەوە. دەستی خۆی خستە سەر دەستی ئەو، بە ئارامی گوتی: "دەمەوێت دەستت بگرم." دەنگی نەرم و نیان بوو، نیشانچی گەنجتر و دەنگەکەی گەرمتر و کاریگەر و راوێژی دەربڕینی وەکو هی سەرەتای عاشقبوونی لەگەڵ سوڵتان لێهاتبوو، دەستی سوڵتان لەمیلە ئاسنەکە بووەوەو هات لەسەر دەستی نیشانچی داندرا، کە دڵی وەکو دڵی کۆتر خێرا خێرا لێیدەدا. بزەیەکی ئارامیش کەوتە سەرلێوانی، ئەمەش لەبەر چاوی نیشانچی شاراوە نەبوو. تا رۆژئاوا بوو ئاوا لەوێ مانەوە بەبێئەوەی چاو لەسەر چیاکانی گوندەکەیان هەڵبگرن.

کاتی ئاوابوونی خۆر زەنگی کەشتییەکە لێدرا، نیشانچی بێئەوەی دەستی خۆی لەسەر دەستی سوڵتان هەڵبگرێت گوتی: "ئەمە زەنگی نانخواردنە، یاللا بابچنە خواردنگەکەو خواردنێکی باش بخۆین."

لەو میانەدا پیاوە لووت باریکەکە هات:

"هۆڵی خواردنەگەکەمان نوێ نوێیە. ئەو خواردنە خۆشانەی ئێمە هەمانە تەنانەت لە ریستوورانتەکانی ئەستەنبۆڵیش نین. قومریەکان، من ئێوە دەناسم. ئەمە سەرۆك وەلی نیشانچیە. ئەو کاتێك دەچووە دەریا هەموو ماسیەکانی نێو دەریا دەهاتن و لەدەوری بەلەمەکەیدا بازنەیان دەبەست. مەگەر نەتانبینی ئەودەمەی ئێوە لەوێ دانیشتبوون و لەنێو خۆتاندا گرمۆڵە بووبوون هەموو خەڵکی شارۆچکەکە بۆ بەڕێکردنتان هاتبوون. من ئەوە چەندین ساڵە کەشتیم هەیە لە هیچ جێگایەك بەڕێکردنێکی ئاوام نەبینیوە. خەڵکی ئێوەیان زۆر خۆش دەوێت قومریەکان."

وەپێشیان کەوت، ئەوانی بردنە هۆڵەکە، مێزی نیشاندان، کورسی راکێشان و داینیشاندن. هەندێك شتی چرپاندە گوێی پێشخزمەتەکە، پاشان گوتی: "نۆشی گیانتان بێت" و رۆیشت.

نیشانچی گوتی:

"سەیرکە سولّتان، ئەمانە وەکو ئێمە نان ناخۆن. من شێوازی نانخواردنی ئەمانە لەلای پاشا فێر بووم، شتێکی ئاسان نیە. تۆ ئەگەر بتەوێت دەبێت سەیری من بکەیت و وەکو من بخۆیت، ئەگەر ناشتەوێت دەتوانیت هەروەکو لەگوند دەتخوارد ئاوا بخۆیت. بە کەمێك گاڵتەوە گوتی: "بە جەهەنەم هەرچۆنی دەیانەوێت بیخۆن با وای بخۆن."

لەوکاتەدا هەشت نۆ دە ژن و پیاو هاتنە نێو هۆڵەکە. وەکو ئەستەنبۆڵیەکان جلوبەرگیان پۆشیبوو. یەکێك لە ژنەکان ئەوروپایی بوو و ئەوانی دیکەش زۆر شیك و رازاوە بوون. نیشانچیش هیچی لەوان کەمتر نەبوو، تەنانەت لەوانیش شیکتر بوو. سولّتان لەنێو خۆیدا گرمۆڵە بووبوو، لەکاتێکدا خەریك بوو بەشێوازی خۆیان نانی دەخوارد، دەم دەمەش سەری هەڵدەبڕی و لەگەڵ نیشانچی پێدەکەنی و یەکسەریش سەری نەوی دەکردەوە. لەنێو کەشتیدا، رۆژی دواتر زمانی سولّتان وا کرایەوە کە تا گەیشتنە ئەستەنبۆڵ هەر خەون لەسەر خەونی زەریفەی دەگێڕانەوە. سولّتان خەونەکانی زەریفەی هێند بە جۆش و خرۆش و گەرم و گوڕانە دەگێڕانەوە کە نیشانچی سەرسام دەبوو و ئەویش وەکو سولّتان باوەڕی دەهێنا کە کوڕەکانی دەگێڕێتەوە. دەیگوت: "بەڵکو بەر لەوەش کە ئێمە بگەینە دوورگە ئەوان گەیشتبنە دوورگە.

سولّتان دەیگوت: "بەڵکو گەیشتبن."

نیشانچی دەیگوت: "بەڵکو گەیشتبن."

"بەهەرحاڵ، ئەگەر کارتی دیارنەمانی منداڵەکانیشمان هاتۆتەوە، خۆ کارتی مردن یان شەهید بوونیان نییە. ئێستا ئەوان لە رووسیا دەژین. دەڵێن لەم رۆژانە شۆڕشێکی گەورە لە رووسیا دروست بووە، رووسیا سەراوبن بووە، لەبەر ئەوەیە رووسیا نەیویستووە منداڵەکانمان ئازاد بکات. ئەگەر بەباشی خەونەکانی زەریفە لێکبدەیتەوە راستە راست راست. تازە لەنێو ئەو خەونانە خەونێك هەیە کە هەڵۆیەکی شینباو دێت و دەڕوات بۆ نێو هەورەکان بەرزدەبێتەوە، بەسەر دەریای شینیدا هەڵدەفڕێت و دەڕوات تا دەگاتە سەر زنارە شیناوەکانی بەرامبەر گوند هەڵدەنیشێت."

هەرسێ هەڵۆکە لەسەر زنارەکان هەڵنیشتبوون، باڵەکانیان دەکردەوەو دایاندەخست. هەرجارێك باڵەکانی خۆیان دەکردنەوەو دایاندەخستنەوە پروشکیان بە دەوری خۆیاندا پەخش دەکرد، پروشکەکان لە سێ لاوە وەکو تاڤگە تا بن دارگوێزەکان دەهاتن و بەسەر ئێمەدا دەڕژان. پروشکەکانی هەڵۆکان دارژان و دارژان تا وایلێهات بن دارگوێزەکان وەکو لێواری

دەریایەکی شینی لێهات. ڕەنگە شینباوەکەی بە چەشنێك بوو کە هەموو جێگایەك ڕەنگی شین هەڵگەڕا. لەنێو نووری سەر ئەو دەریا شینەدا سێ لاوی شینباو دەرکەوتن. هەرسێکیشیان لەبەردەم ئەو تاڤگەی پروشە سێ لایەنیە هاتبوون و لەژێر دارگوێزەکان وەستابوون. سوڵتانیش لەنێو ئەو نوورە شینەی تاڤگەیەدا مابووەوە، هەر لەگەڵ بینینی منداڵەکان، هەرسێکیانی گرتبووە باوەش. سوڵتانیش وەکو هەڵۆکان باڵی لێڕوا بوون. هەر چواریان لەپڕێکدا قۆڵیان لەقۆڵی یەکدی هەڵکێشابوو، باڵەکانیان کردبووەوە، منداڵەکانیش... هەرچواریان لە کاتێکدا کە لە چوارلاوە بۆ ئاسمان هەڵدەفڕین، هاواریان دەکرد، زوو دەگەڕێینەوە، زوو زوو. لە لێواری دەریای نوورەوە لەژێر دارگوێزەکاندا لەناو دەریای شیندا کەشتییێك هاتبووەدەر، لێرەوە تا ئەوێ، سەرکەشتییەکە هەرچوار دەوری ڕازێندرابووەوە، سێ بنیادەمی رووت و قووت، لەنێو ئەوانیشدا ژنی رووت و قووت، هەرچواریشیان ڕەنگی شینیان بەخۆوە گرتبوو، نوور و ڕۆشناییشیان لەخۆ پەخش دەکرد، پروشکەی شینباو هەروا بەو ناوەدا پەخش دەبوون. کەشتی کە هەموولایەکی نوقمی نێو نوور و ڕۆشنایی بووبوو لە پڕێکدا لەژێر دارگوێزەکاندا چووەوە ژێر ئاوەوە. لەبن دارگوێزەکاندا تەنها چوار مرۆڤی رووت مابوونەوە، سێ سەرباز و ژنێك. ژنەکە لە پڕێکدا هەرسێ کوڕەکانی پێکەوە گرتبووە باوەش.

سوڵتان گوتی: "بەزوویی دەگەڕێنەوە" و تا گەیشتنەوە شارۆچکە خەونەکانی زەریفەی باس کردن. کاتێك گەیشتنەوە شارۆچکە، یەکسەر چوونە دووکانەکەی خەیری ئەفەندی. نیشانچی گوتی:

"خەیری ئەفەندی، ئەم خانمە، سوڵتانەکەی خۆمە."

خەیری ئەفەندی گوتی: "بەخێربێن!" دەیزانی کە نیشانچی بۆ هێنانەوەی سوڵتان چووبووەوە گوندەکەیان.

"سوپاست دەکەم، بەڵام ئەم هاوسەرەی من هەموو دارو نەداری خۆی دایە ئەو چوار ژنەی کە لەگوند چاوەڕێی کوڕەکانیانن. ماڵەکەی، بزنەکانی، مامرەکانی، تەنانەت دارگوێزەکانیشی. ئێستا ئاوا بەدەستی بەتاڵ هاتۆتەوە ئێرە."

"هاتووە، بابێت، بەخێر بێت، سەفای هێنا. منیش چاوەڕێی کوڕەکانی خۆمم کە کارتی شەهیدبوونیان هاتۆتەوە. هەموو ڕۆژێك وا هەستدەکەم وا لە چاناك قەڵاوە خەریکن دێنەو بۆ ئێرە."

نیشانچی ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: "ئینشاللا دێنەوە. خانمەکەم جلوبەرگی تایبەتی هەیە."

"ئەمشەو دەمێننەوە، خانمی من چارەسەری دەکات، من و تۆ چ سەرەدەری لە کاری ژنان دەردەکەین."

خەیری ئەفەندی ماڵێی ئاگادارکردەوە کە بۆ پێشوازیکردن لەمیوانان ئامادەیی بکەن. کاتژمێرێك دواتر میوانەکانی هەڵگرتن و لەگەڵ خۆی بردنیەوە ماڵێ. یەکەم شت کردی ئەوەبوو گوتی گەرماوەکە داگیرسێنن. یەکەمجار سوڵتان خۆی شووشت، بە ئاوی گەرم و سابوونی بۆندار، پاشان وەلی نیشانچی. ئەو شەوە لەنێو نوێنێکدا خەوتن کە بۆنی بنیشتی دارەبەنی لێدەهات. رۆژی دواتر هاوسەرەکەی خەیری ئەفەندی و سوڵتان پێکەوە چوونە بازاڕ، ئەو قوماشانەیان دۆزینەوە کە بە دڵی سوڵتان بوون، بانگی شاگردی بەرگدووە یۆنانییەکەیان کرد کە بۆیان بدوورێت. سوڵتان یەك یەك ئەو جلانەی بۆی دوورابوون تاقیکردنەوە. نیشانچی بەوپەڕی چاوتێرییەوە پارەی خەرج دەکرد. لە رەوشێکی وا دابوو کە دەیتوانی هەرچی پارەی لەگیرفاندا هەیە بۆ سوڵتانی خەرج بکات. لەو ماوەیەدا خەیری ئەفەندی خەبەری دابووە پۆیراز کە نیشانچی و سوڵتان خانم هاتوونەتەوە شارۆچکە. هەروەها سێ جووت پێڵاوی لەجوانترین پێڵاوی ژنانی یۆنانی کردنە دیاریی بۆ سوڵتان خانم. هەموو شارۆچکەکە کۆڵان بە کۆڵان گەڕان. لەو میانەدا، نیشانچیش شەوان خەونەکانی زەریفەی بە وەستاییەکی تەواوەوە بۆ خەیری ئەفەندی گێڕانەوەو سەرەنجام ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی: "ئەگەر خەونەکانی زەریفە راست بن مندالەکانی ئێمە شەهید نەبووینە، بوونەتە دیلی رووسان. سێ لەو سەربازانەی کە کارتی شەهیدبوونیان هاتبووەوە گەڕاونەتەوە گوندەکەی ئێمە، ماڵ بە ماڵی گوندی چۆڵ گەڕاون، بە دوای دایك و باوك و ژنەکانیان گەڕابوون، پاشانیش رۆیشتوون کە بیاندۆزنەوە. ئینشاللا دەیاندۆزنەوە."

نیشانچی دەستی دانایە سەر دەستی خەیری ئەفەندی و گوتی: "ئینشاللا مندالەکانی ئێوەش دەگەڕێنەوە. بیستوومە ئینگلیزەکان لە چاناك قەلا زۆریان دیل گرتووە، بەرپرسەکانی ئێمەش کارتی کوژرانیان بۆ هەموو دیلەکان رەوانەکردووە. وەك دەڵێن فەرماندەکانی ئێمە بۆیە کارتی کوژرانی سەربازەکانی ئێمەیان بۆ کەس و کارەکانیان ناردۆتەوە تاکو بڵێن

تورکەکان نابنە دیل، سەربازە ونبووەکانیان بە شەهید دانە قەڵەم و کارتی شەهیدبوونیان بۆ کەسوکارەکانیان ناردەوە."

خەیری ئەفەندی کە لەنێو خۆیدا گرمۆڵە بووبوو پشتی خۆی راستکردەوە، چاوەکانی بروسکەیاندا، لەناخی دڵەوە گوتی: "ئینشاڵڵا وادەبێت، ئینشاڵڵا وادەبێت."

"رۆژێك دەبینیت منداڵەکانی تۆش لەم باخچەیە دەردەکەون و بەرەو دەرگای ماڵێ دێن."

"ئەوکات لە خۆشیان دەمرم. خۆزیا ئەوان بهاتبوانەوە و با من لە خۆشیان بمرم."

"ناتوانین هیچ بڵێین. منیش کە یەکەمجار خەونەکانم بیستن، وەکو تۆ، خەیری ئەفەندی، خۆزیا ئەو رۆژە ببینم، بەڵام کاتێك ئەوەم بیست منداڵەکانمان رووت و قووت لەسەر پشتی کەشتییێکی شینباو لەنێو نوور و رۆشناییدا راوەستاون کە چیای شەقکردبوو و تا گوند کشابوو، باوەڕم کرد کە منداڵەکانمان بە دیلی کەوتوونەتە دەستی رووسان و بەم زووانە دەگەڕێنەوە."

"ئەو کەشتیە شینباوەم جارێکی دیکە بۆ بگێڕەوە تاکو منیش جارێك لێکیبدەمەوە."

نیشانچی گوتی: "با من نەیگێڕمەوە، با سوڵتان بیگێڕێتەوە. ئەو باشتر دەیگێڕێتەوە. خەونەکە زەریفە بۆی گێڕاوەتەوە، سوڵتانیش بە روون و ئاشکرایی منداڵەکانمانی لەسەر ئەو کەشتییەی کە رەنگێکی شینباوی ورشەداری پەخش دەکرد بینیون. ئەگەر لەم چەند رۆژەدا منداڵەکانمانت لەم دەوروبەرە بینین پێت سەیر نەبێت. ئەم خەونە خەونێکە بە مسۆگەری دێتەدی. لە راستی راسترە. ناونیشانی دوورگەشم داونەتێ و نووسیویانە، هەم ناوی شارۆچکەکە و هەم ناوی تۆش بە دەرگای ماڵەوەمان هەڵواسیون، داومەتە ژنەکانی گوندیش. ناونیشانەکەم لەوێ داوەتە دۆست و برادەرەکانیشم."

خەیری ئەفەندی گوتی: "هەر منداڵەکان هاتنە لای من یەکسەر دەیاننێرمەوە لای ئێوە، هیچ نیگەران مەبە." هێشتا خەونە شینباوەکەی لە زمانی سوڵتانەوە نەبیستبوو.

بە وردی گوێی بۆ ئەو خەونە راگرت کە سوڵتان گێڕایەوە. رەنگی شینباو تا مۆخی ئێسقانەکانی رۆچووبوو.

خەیری ئەفەندی و هاوسەرەکەی ئەوانیان تا ئەسکەلە بە درەقە کرد. ئەو خەیری ئەفەندیە رۆیشتبوو، و لە شوێنیدا ئەم خەیری ئەفەندییە هاتبوو، لە خۆشیان پەڕو باڵی دەرکردبوون و خەریك بوو دەفڕی، لە کوێش لە چاناك قەڵا... لەلایەك باوەڕی دەکرد و لە خۆشیان باڵی

لێدەڕوان و شاگەشکە دەبوو، پاشان بیریدەکردەوە کە ئەمە خەونە، چی ڕوودەدات، باڵەکانی هەڵدەوەرین و لە دەستی دەدان و سەرتاپای شلو خاو دەبووەوە. دواجاریش بەخۆی دەگوت ئەگەر منداڵەکان بەڕێوەبن، ئەمجارەش سەرتاپای نوقمی نێو شادی دەبووەوە.

خەیری ئەفەندی و خانمەکەی بەیانی زوو لە خەو هەستان، سفرەیەکی تژیان بۆ ئامادەکرابوو، بە بێدەنگی بەرچاییان کرد. پاشان یەکسەر لە ماڵەکەیان هاتنە خوار و بەرەو لای ئەسکەلە چوون. قەدریی بەلەموان بەلەمە ماتۆڕدارەکەی لە ئەسکەلە ڕاگرتبوو و چاوەڕێی ئەوانی دەکرد. خەیری ئەفەندی نیشانچی و خانمەکەشی سوڵتانی گرتە ئامێز.

خەیری ئەفەندی گوتی: "ئێمە هەمیشە لە ماڵی خۆماندا چاوەڕێتانین. ئێوە دڵشادتان کردین، ئومێدەوارتان کردین، لەمڕۆ بەدواوە بە ئومێدەوە چاوەڕوان دەبین. خەونەکانی زەریفە ڕاست دەردەچن. خواحافیز، خواحافیز!"

بەلەمەکەی قەدریی بەلەموان لە ئەسکەلە جیابووەوەو لەکاتێکدا ئاوەکەی کەفاوی کرد بەڕێکەوت. خەیری ئەفەندی و خانمەکەی لەشوێنی خۆیان وەستابوون و نەیاندەتوانی چاو لەسەر ئەو بەلەمە هەڵبگرن کە ئاوەکەی شەق دەکردو دوور دەکەوتەوە. تا ئەودەمەی بەلەم لەبەرچاوان ون بوو ژن و مێردەکە لەجێی خۆیان نەجوولان.

کە دەگەڕانەوە خەیری ئەفەندی قۆڵی هاوسەرەکەی خۆی گرت و چاوی بڕیە دووری چاوی:

"ئێمە سەربازانێکی زۆرمان بینین و لەبارەیانەوە بیستوومانە کە دوای هەفتەیەك یان دە پازدە ساڵ کە کارتی شەهیدبوونیشیان هاتبووەوە کەچی لە دیلیی گەڕانەوە، مەگەر وانییە؟ بەڵام بۆچی عەقڵمان پێدا نەشکاو ئەو ماتەم و عەزارداریەمان بۆ منداڵەکانمان کرد و خۆمان ئاوا نابووت و وێران کرد؟"

خانمەکەی بە بزەوە گوتی: "دروستە." گوتی: "بریا..." خەیری ئەفەندیش لە کاتێکدا چاوەکانی دەبریسکانەوە، بە ماندووبوونێکی زۆرەوە بە بزەیەك وەڵامی خانمەی دایەوە. لەوکاتەوەی کارتی کوژرانی کوڕەکانیان هاتبووەوە ئەمە یەکەم زەردەخەنەی ئەوان بوو.

# بەشی چوارەم

قەدریی بەلەموان نوقمی نێو شادمانی بوو، لەو کاتەوەی ئەوانی بینیبوو لە خۆشیان زاری وێکنەکەوتبووەوە. هەر کەسێکیش وەکو ئەو خولیای دۆستایەتی بوو، کە نیشانچی دوای ئەو ماوە درێژە دەبینی لە ناخی دڵەوە خۆشحاڵ دەبوو و بەهەمان ئەندازە رێزی لەنیشانچی دەناو بە بینینی ئەو دەکەوتە نێو سیحری میهرو شادمانییەوە.

"هەر کە هەواڵی هاتنەوەی ئێوەم لەخەیری ئەفەندی پێگەیشت بەلەمم بەرەو دوورگە تاودا. ئێستاش نازانم چۆن گەیشتمەوە دوورگە، چۆن هاوارم کرد، چۆن هەموو خەڵکی دوورگە بە باڵندەو پشیلەکانیەوە رژانە سەر ئەسکەلە. جارێکی دیکە هەواڵی هاتنەوەی ئێوەم پێگوتن. ئەوان لێیانپرسیم نیشانچی لەگەڵ سوڵتان خانم هاتۆتەوە یان بە تەنیا. منیش هەروەك لەخەیری ئەفەندیم بیستبوو بۆم باسکردن کە پێکەوە هاتوونەتەوە. وایاندایە چەپڵەلێدان و هۆراکێشان کە پشیلەکان و تەنانەت مەلانی دەریاش لەجێی خۆیان راچڵەکین و رەوینەوە. دوورگە نوقمی نێو شادمانی بوو. پەڕەسێلکەکان، هەرچی پەڕەسێلکەی دوورگە هەیە، تیژ وەکو شمشێر هاتن و بەسەر سەرمان رەت بوون. شادمانی هێشتاش لە دوورگە درێژەی هەیە. ئەوکاتەی کە خەریك بووم لەدوورگە بۆ بینینی ئێوە دەهاتم هەموو دوورگە دەتگوت خۆی بۆ ئاهەنگی بووکگواستنەوە ئامادە دەکات."

نیشانچی کە لەخۆشحاڵیان شاگەشکە بووبوو چاوی بڕینە نێو چاوی ژنەکەی و گوتی: "قەدریی بەلەموان..." سوپاس هەزارجار سوپاس بۆ خوا کە دۆست و برادەری زۆر خۆشەویستمان هەن، نزیکتر لەبرا."

"قوربانت بم وەلی، کێ هەیە تۆی خۆش نەوێت، تۆش هەمووانت خۆشدەوێن، لە مێرووڵەی سەر زەویەوە بگرە تا باڵندەی ئاسمانان."

قەدریی بەلەموان گوتی:

"باڵندەی ئاسمانان. پێیدەڵێن وەلی نیشانچی بەلەموان، سەرۆك وەلی."

کە نزیك بوونەوە لە دوورگە قەدریی هەستایە سەرپێ: "سەیری ئەسکەلە بکەن، هەموو خەڵکی دوورگە لەوێ کۆبوونەتەوە."

تاکو بەڵەم لەوێ لەنگەری گرت متەق لەبەر کەس نەهاتەدەر. دکتۆرەکان، موسا کازم ئاغا، مەلەك خانم، شەریفە خاتوون، پۆیراز، ڤاسیلی، هوسمەن لەپێش خەڵکەکە و زەهرا و نەسیبە و دەنگبێژ و پزیشکی ئاژەڵان و شێخ مووس لەپشت ئەوانەوە راوەستابوون.

نیشانچی دەستی سوڵتانی گرتبوو و بەرەو ئەسکەلەی دەبرد کە لەپێشەوە دەنگێك هات: "بەخێر بێیتەوە نیشانچی." بەدوای ئەو دەنگەشەوە ئەو خەڵکە پێکەوە گوتیان: "بەخێر بێنەوە، بەخێر بێنەوە!"

نیشانچی خڕبووبووەوە نێوخۆی و بە دەنگێکی شەرمانانەوە گوتی: "مەمنوونم، مەمنوونم، نەبوو، نەبوو." لەپڕ پشتی خۆی راست کردەوە، بەدەنگێکی بەرزەوە گوتی: "مەمنوونم، مەمنوونم، هەربژین، لەگەڵ ئێوە بوون چەند لەزەتبەخشە."

چوونە ژێر چنارەکان و لەسەر نیوتەختەکاندا دانیشتن. زەهراو نەسیبە شەربەتیان دروستکردبوو. شەربەتیان بەسەر ئەوانەی لەژێر دارچنارەکان دانیشتبوون دابەش کرد. تا ئەودەمەی خۆر لەپشت تەپۆلکەی ئەوبەرەوە ئاوابوو و لەبەر چاوان نەما، هەر پێکەوە قسەیان کرد. لە راستیدا سوڵتان قسەی کرد و ئەوان گوێیان لێگرت. سوڵتان، یەکەمجار باسی خەونەکانی زەریفەی کرد و پاشان باسی دارگوێزەکان و کشتکاری لەنێو خاکی بەتوورەکان هێندراو و دواجار هاتە سەر ئەو سەربازە زۆر کزو لاوازەی کە بە گۆچانێکەوە هاتبووە گوند و بە دەنگێکی بەرز و لێکدا لێکدا هەر دایکە دایکە دەکرد. هەمووان بۆ سەربازەکە گریان، سوڵتانیش.

دوای ئەوەی خۆر ئاوابوو فانۆسەکانیان پێکردن و بە لکی چنارەکانیان هەڵواسین. هەر دوای هەڵکردنی فانۆسەکان دارزەیتوونی وشکی نێو ئاگردانەکان گڕدران و بڵێسەیان لێبەرز بووەوە.

ڤاسیلی هەر کە هەواڵی هاتنەوەی نیشانچی و هاوسەرەکەی بیست گوتی من وا دەڕۆم هەندێك ماسی بگرم. تا من لە ماسیگرتن دێمەوە، هەرکێتان کام خواردنی خۆشتان بەزەین دادێت دروستی بکەن، بۆ نانی ئێوارە هونەری خۆتان بنوێنن. من دەچمە لای یەکێك لەو نیشانانەی کە نیشانچی کاتی خۆی پێینیشانداوم. دەبینن کە بە بەلەمێکی پڕ ماسی دەگەڕێمەوە.

ڤاسیلی کە گەڕایەوە بەلەمەکەی پڕ ماسی نەبوو، دوو لەگەنی تایبەتی پڕ کردبوون لە ماسی، تا گەیشتبووەوە لێکدا لێکدا ئاوەکەیانی گۆڕیبوو، بەشێوەیەك کە ماسییەکانی

گەیاندبووەوە دوورگە هێشتا هەر هەڵدەبەزینەوە. ژنەکان و کچەکان لەگەنە ماسیەکانیان بردە لێوار، ماسییەکانیان پاککردنەوەو هێنانیانەوە ژێر چنارەکان.

دارەکان گڕیان گرتبوو، پەنگرەکان سوور بووبوونەوە، ڤاسیلی و هوسمەن خۆیان دەستیان لێهەڵکرد، ماسیەکانیان دانانە سەر پەنگران، دووکەڵێکی چڕ لە پەنگرەکان بەرزبووەوە، ئەو ناوە پڕ بوو لەبۆنی خۆشی گۆشتی ماسی. سترانبێژەکەش هاتە یارمەتیدانیان. کچەکان و ژنەکان ماسییە سووربووەوەکانی سوور وەك رەنگی هەناریان بە سنیان بردن و دایاننانە سەر مێزەکان. خواردنی دیکەش لەسەر مێزان داندرابوون، خواردنەوەی جۆراوجۆریش لەسەر مێزەکان دەبیندران.

پەرداخیان لە پێش نیشانچی دانابوو. موسا کازم ئاغا خواردنەوەی بۆ تێکرد. نیشانچی تا ئەو کاتە لەهەموو تەمەنی خۆیدا لێوی لەخواردنەوەی مەی نەدابوو. کێ زاتی ئەوەی دەکرد دەستی کەسێکی مەزنی وەکو موسا ئاغا بگێڕێتەوە؟ و نیشانچی بەرداخە مەیەکەی رەت نەکردەوە، تەنانەت ئەگەر ژەهریش بوا دەیخواردەوە. ئەویش لەگەڵ ئەوانی دیکە پەرداخەکەی هەڵدا، واپێدەچوو کە هەمووان خەریکن سەیری شێوازی خواردنەوەکەی بکەن. لەگەڵ ئەوانی دیکە پەرداخەکەی خۆی خواردەوە، بەڵام بە روخسارێکی تێکئالاو. لە دڵی خۆیدا گوتی وەك ئەوەی دەڵێن هێندەش تاڵ نیە. بێگومان موسا کازم ئاغا لەو بەتەمەنتربوو، پەرداخەکەی خۆی پڕ دەکرد و وەکو چۆن ئاو دەخواتەوە ئاوا دەیخواردەوە.

لەلایەك دۆڵمەی کدو، لەلایەکی دیکە زەلاتەی پەلپینە، لەلایەك ماسی دەهات و لەلایەك خواردنی دەخوارد و لەلایەکی دیکە مەی دەنۆشی. هەمووان دەیانگوت بەسەلامەتی و پەرداخەکانیان هەڵدەدا.

زەهرا دەستی لەسەر دڵی بوو، باوکی لێکلێکە هەر پیاڵە دوای پیاڵەی پڕ دەکردو هەڵیدەدا، تا دەهات لۆچی نێو چاوان و روخساری زیاتر دەبوون و شین هەڵدەگەڕا. حاڵەتی تەڵخی روخساری بە چەشنێك بوو کە کول و کۆڤانەکانی ناخیان دەردەخست. ئەگەر وەکو جارەکەی دیکەی لێبێت ئابڕوویان دەچێت. لە منداڵییەوە باوکی ئاوا نەبینیبوو. هەمیشە ئەوکاتەی دەیخواردەوە، لەکۆتاییدا، بە سەنگینی و شکۆمەندی و پڕ لەمیهر و خۆشەویستی لەسەر مێزەکە هەڵدەستا. زەهرا لەوە دەترسا دوای کەمێکی دیکە رووداوێکی ناهەموار رووبدات. نیوەشەو داهات و ئەوەی کە نەدەبوو رووبدات روویدا. موسا کازم ئاغا لەکاتێکدا

کە دەستەکانی دەلەرزین پیاڵەی پڕ لە راکی بەرزکردەوەو سەیرێکی کرد، پاشان هەڵیداو چۆڕی لێبڕی، ئینجا پیاڵەی بەتاڵی بەرەو لای دەریا تێهەڵدا، سەیری ئەولای کرد، پیاڵەکە کەوتە سەر وردە بەردەکان و شکاو دەنگی شکانەکەی لەو بێدەنگیەی شەودا دەنگی دایەوە:

"هاوسەرەکەم لەنێو کەشتیدا کۆچی دوایی کرد، لەناوەڕاستی دەریای مەدیتەرانە. کاتێك مرد، منیش بوومە مردوویێکی جووڵەدار. تەرمەکەیان فڕێدایە نێو دەریا، گوایە یاسای دەریاوانی بەو شێوەیە. کاتێك هاوسەرەکەمیان هەڵدایە نێو دەریا، دەریا دەتگوت منیشی راکێشایە نێو خۆی. لەدڵی خۆمدا گوتم منیش خۆم فڕێدەدەمە نێو دەریا، لە دڵی خۆمدا گوتم منیش لەگەڵ ژنەکەمدا بچم و تا هەتایە لەگەڵ ئەودا لەژێر دەریای مەزندا بخەوم. سەیرم کرد ئەگەر ئەوە بکەم دوو منداڵەکەم کەسیان نابێت ئاگای لێیانبێت. من و ژنەکەم دەچینە نێو دەریاو دەبینە خۆراکی ماسیان و ئەم دوو کچە دەبنە خۆراکی کێ؟ تا ئەوکاتەی گەیشتینە تورکیاو قاچمان نایە سەر وشکانی، ئاوی دەریا منی بۆ خۆی رادەکێشا، رێك ئەودەمەی دەمەویست خۆم تێفڕێ بدەم کچەکانم دەهاتنە بەرچاوم، یاخەیان دەگرتم و دەیانگوت، ئێمە، ئێمە، ئێمە چیبکەین بابە. دواجار نەمتوانی بەرگری بکەم. گوتم، وەکو خەواڵوێك خۆم هەڵدەمە نێو دەریا، لەوەش ترسام. گوتم کە لەکاتی بێداریدا نەتوانم لەکاتی خەودا خۆم فڕێدەدەمە نێو دەریا، ئەمجارە لەخەوتن دەترسام. دوای ئەوە، هەرچی کردم نەمتوانی بخەوم."

مەلەك خانم گوتی: "کارێکی باشت کرد. زۆر کارێکی باشت کرد. دەنا لە بینینی روخساری جوانی تۆ بێبەش دەبووین سوڵتانی من."

"کارێکی باشم نەکرد مەلەك، هیچ کارێکی باشم نەکرد. ئەوان رۆژان ئومێدەوار بووم. دەمگوت رۆژێك دەگەڕێمەوە زێدی خۆم. وادەزانیت ئێستا من زیندووم، نە ئێستا لەمردووش خراپترم، مردوویێکم کە بە تاڵ بۆتەوە. زۆربەی هەرە زۆری برادەرەکانم، ئەوانی کە متمانەم پێدەکردن و گیانی خۆی دەکردنە قوربان مردوون. وامدەزانی من دووبارە دەنێرنەوە زێدی باو و باپیرانم، حکومەتی یۆنان داوای لێبووردنم لێدەکات. دۆستەکانم تەنانەت نامەیەکیان بە پوولی یۆنانی بۆ نەناردووم. ئێوەو هیچ کەسی دیکە جگە لە قەدریی بەلەموان ئەوە نازانێت. من لەوکاتەوەی هاتوومەتە ئێرە هەموو رۆژێك نامە بۆ برادەرەکانم دەنووسم، ناونیشانی خەیری ئەفەندیم داونەتێ، قەدریی بەلەموان هەموو رۆژێك دەچوو و دەبووە مایەی زەحمەت بۆ خەیری ئەفەندی و منیش ناونیشانی ئێرە، دووکانەی کارینجام دانێ، بەڵام ئەوە چەند لەمێژە چاوەڕێم

کەچی دێڕێك چیە نەهاتووە، پاشان لەگەڵ کوڕەکەمان کاکە پۆیراز چووینە لای فەرماندەکەی ئەو. فەرماندە، بووبووە نوێنەرێکی گەورە، سووکایەتی پێکردین و دەریکردینە دەرەوە. وەك ئەوەی کەسێك ئەگەر بیەوێت بچێتە پێشهاتی خۆی تاوان دەکات. پاشان چووینە ئەستەنبۆڵ، هاوپۆلەکانمان دۆزیەوە، کوڕی گەورەترین جەنەڕاڵ. کوڕی ئەو جەنەڕاڵە هێندە بەڕێز و رووخۆشی و مەردانە پێشوازی لێکردین گوتم پیاو لەجیاتی باوك و دایك و برا دۆستێکی ئاوای هەبێت بەسە. پۆیرازی کوڕم شایەدە بۆ ئەویش چەندم نامە نووسین، ئەویش مردووە، هیچ هەواڵێکی نیە. بەتەنیای تەنیا ماومەتەوە لەو ناوەڕاستی دنیایە."

"مەگەر ئێمەت لەگەڵ نین سوڵتانی من، ئێمە هەموومان تۆمان لەگیانی خۆشمان خۆشتر دەوێت، خۆشەویستی ئێمە راستەقینەیە."

موسا کازم ئاغا گوتی: "ئاااە، کرێت، ئاااە نیشتمانەکەم، ئاااە ئەو نیشتمانەی کە بۆنی بەهەشتت لێدێت، نەمتوانی عیشق و گیانی خۆمت تێدا بنێژم، ئەوم فڕێدایە نێو ئامێزی دەریای گەورەی مەدیتەرانە. خۆزگەم بە خۆزگەداران لە خاکی باو و باپیرانم دەست لەنێو دەستی یەك پێکەوە رادەژاین، لەژێر کەپرێکی وەنەوشان. ئەی ی ی مەلەك خانم".

بە لاکەلاك هەستایەوە، بەرەو دەریا بۆ نێو تاریکی هەنگاوی هەڵێنان. هەموان وڕوکاس بووبوون، نەیاندەزانی چیبکەن، زەهرا لەو شوێنەی لێیدانیشتبوو دەیزریکاند و دەیگوت: "بابە، بابە، چیدەکەیت؟ دەچییە کوێ؟ و نەیدەتوانی لەجێی خۆی هەڵبستێت. لەو ئانەدا پۆیراز خۆی کۆکردەوەو بەدوای موسا ئاغا خزیە نێو تاریکیەکە، دەنگی شڵپەشڵپی دەریا هات. پۆیراز خێرا خۆی گەیاندە شوێنی شڵپە شڵپەکە، بەرەو لای تارمایەکەی نێو دەریاکە رایکرد، ئاوی دەریا تا ناوقەدی هاتبوو، لەپشتەوە تارمایەکەی گرتە باوەش و لەنێو ئاو دەریهێنا، بێئەوەی ئازاری بدات، ژێر باڵی گرت. لەو ئانەدا ڤاسیلی و هوسمەنیش هاتن، موسا ئاغایان لەدەستی پۆیراز وەرگرت، ژێر باڵیان گرت، کچەکان لەپێش و ئەوان بەدوایاندا بەرەو ماڵەوە چوون، بەزەحمەت لە پلیکانەکان بەسەر کەوتن. لامپای هۆڵەکە هەر بە داگیرساوی هێشترابوونەوە، زەهرا بردنیەوە ژوورەکەی خۆی و لەسەر تەپڵەیەك دانیان، لامپای ژووری نووستنەکەشی پێکرد. کاتێك کچەکان خەریك بوون جلەکانی باوکیان دەگۆڕی ئەوانی دی چوونە دەرەوە.

موسا ئاغا سێ رۆژان نەیتوانی لەنێو نوێن بهێتەدەر. مەلەك خانم بێئەوەی چاو لێکبنێت، رووسەرییێکی رەشی لەنێو چاوانی بەستبوو، لەسەر بالینگانی موسا ئاغا دانیشتبوو. رۆژی

یەکەم دکتۆرەکان بەجێیانهێشت، رۆژی دووەم بەدەم پێکەنینەوە گوتیان: "موسا کازم ئاغا هیچ کێشەیەکی نییە، تەنها زۆر خەمگینە." نیوەڕۆی رۆژی سێیەم موسا کازم ئاغا لەکاتێکدا سەیری چاوەکانی مەلەك خانمی دەکرد گوتی: "حەزم چۆتە سرکەی هەنار و دۆڵمەی گوڵەکدو."

"سبەی سەر لەبەیانی زوو دۆڵمەیەکی گوڵەکدو بۆ سوڵتانی خۆم لێدەنێم هەر حەز بکەیت بیخۆیت. کێڵگەیەکی بەردەم خانوویەکم دۆزیوەتەوە کە کدوەکانی پڕن لە گوڵ. دۆڵمەیەکی گوڵەکدو لێدەنێم کە ئەنگوستەکانتی لەگەڵ بخۆیت."

مەلەك خانم بەر لەهەڵاتنی خۆر هەستا، چووە ئەو باخچەیەی کە لەبەردەم خانووەکەوە بوو، کدوەکان لەبن گوڵەکدوان زەرد دەچوونەوە، گوڵەکان تەواو پشکوتبوون. ئەگەر گوڵەکان بەرلەوەی هەتاویان لێبدات لێنەکرێنەوە ناتوانیت دۆڵمەیان لێدروست بکەیت، هەر تیشکی خۆریان پێکەوت گوڵەکان وێکدێنەوە، ئەگەر بشتەوێت لێکیانبکەیتەوە لەنێو دەستتدا هەڵدەوەرێن و تێکدەچن.

ئەو رۆژە، نیوەڕۆ، موسا ئاغا لەگەڵ پۆیراز کە بەتایبەت بانگهێشتی کردبوو دۆڵمەی گوڵەکدویان بە سرکەی هەنار خوارد. کچەکان و مەلەك خانمیش لە دەوری مێزەکە بوون. لەکاتی نانخواردندا موسا ئاغا سێ جار لە پۆیرازی پرسی: "دۆڵمەی مەلەك خانم چۆنە؟" پۆیراز لەوەڵامدا دەیگوت: "زۆر بەتامە، زۆر بەتامە." دوای نانخواردن موسا ئاغا و پۆیراز بەرامبەر یەکدی دانیشتن و لەکاتێکدا کە قاوەی تازە لەهاوەن کوتراویان دەخواردەوە موسا ئاغا لە ناکاو سەری هەڵبڕی و گوتی: "سبەی پێکەوە دەچینە ئەستەنبۆڵ. هەم ئەو سەعید رەحمی کەسێکی بە دەرد نەخۆر بوو، هەم ئەو باڵیۆزەی یۆنانیش."

"سەرچاو ئاغا."

"دۆڵمەی کدوەکەت پێچۆن بوو؟ ئەم دۆڵمەی گوڵەکدوە تەنهاو تەنها خەڵکی کرێت دەزانن لێیبنێن. دۆڵمەی گوڵەکدو لە کرێتەوە چۆتە دەریای مەدیتەرانە."

"ئێمە ئاشناییمان لەگەڵ دۆڵمەی گوڵەکدو نییە."

"مەلەك خانمیش لەو کرێتیانەی بۆ ئێرە کۆچیان کردووە فێری لێنانی بووە. سبەینێ دەچینە ئەستەنبۆڵ. بابچین بزانین کارەکەمان گەیشتۆتە کوێ."

چوونە ئەستەنبۆڵ و هەر زووش گەڕانەوە. سەعید رەحمی وەك باڵیۆزی گەورە چووبووە وڵاتێکی دوور، بەڵام هیچکام لە ئەندامانی خێزانەکەی نەیاندەزانی چۆتە کوێ. کەس ئاگای

لەباوکیشی نەبوو. بەڵکو کەسیش نەیویستبێت سەبارەت بە چارەنووسی ئەو هیچشتێك بدرکێنێت.

که لەئەستەنبۆڵ گەڕانەوە موسا ئاغا وایلێهاتبوو کە کچەکانی بە زەحمەت ناسیانەوە. گۆناکانی قۆپابوون، گنج و لۆچەکانی نێوچاوانی زیاتر قووڵ بووبوون، بریسکە و درەوشانەوەی چاوەکانی نەمابوو، سەرو ریشی زیاتر سپی بووبوو، هەروەها لێوی لە لێوی نەدەکردەوە.

هیچ وەڵامێکی نامەکانی کە بۆ دۆستە ئەسینایی و کرێتییەکانی نووسیبوون پێنەدەگەیشت. ئەگەر تاکە دێڕێکیشیان بنووسیبوا، هەر تەنها دێڕێك با جنێو بوا، ڕەنگ بوو موسا ئاغایان شاد بکردبوا، چۆن دەبێت بنیادەم بەرامبەر بە بنیادەم، دۆست بەرامبەر بە دۆست ئاوا خیانەت بکات؟ ئەویش دۆستانێك کە جووت جووت ئەسپی ئینگلیزی بەدیاری دابوونێ... دۆستانێك کە بەرامبەریان... نەك هەر لە باسکردن بەڵکو تەنانەت لەبیرکردنەوەش لەبارەیان تەریق دەبووەوە.

"باشتر وایە نامەیەك، یان باشترە چەند نامەیەك بۆ دۆستە دێرینەکانم بنووسم، بۆ دۆستە لە برا نزیکترەکانم، ئەگەر دیسانیش وەڵامیان نەبوو، ئەوسا دەڵێین دیارە ئەم دنیایە، ئەو مرۆڤانە ئاوایان لێهاتووەو هەموو شتێك روون دەبێتەوە."

دانیشت، بەوپەڕی حەسرەت و ئارەزووەوە لە ماوەی هەفتەیەکدا نامەکانی نووسی، پاشان بانگی پۆیرازی کرد، پێکەوە چوونە شارۆچکە، نامەکانیان بەدەستی خۆیان خستنە نێو سەندوقی پۆستە، دۆست و دراوسێ و برادەرەکانی جەنەڕاڵ ئەگەر بەردیش بوان بەو نامانە بە بێگومان وەڵامیان دەدایەوە. پۆیراز دوای چەندین رۆژی یەك لە دوای یەك سەیری کرد موسا ئاغا روخساری شادو خەندان و کەمەری راست و قەدو قیافەی شووش و رێك بۆتەوە. موسا ئاغا بێڕادە خۆشحاڵ بوو و پێیوابوو نامەکانی بێوەڵام نابن. پۆیراز لەوە دەترسا کە ڕەنگبێت ئەو هیچ وەڵامێك وەرنەگرێت.

حاڵەتی راست رۆیشتن، قسەکردن، و تەواو جووڵەو ڕەفتارەکانی موسا ئاغا گۆڕابوون و بووبووە کەسێکی دیکە. خوا دەزانێت ئەگەر کچەکان باوکیان بەو شێوەیە ببینیبوا چەند خۆشحاڵ دەبوون.

دوای ئەوە پۆیراز هەر دوو سێ رۆژ جارێك سەری لەپۆستخانە دەدا. رۆژ دەهاتن و تێدەپەڕین کەچی نامەیەك بۆ موسا کازم نەهات. هەر جارێك پۆیراز لە شارۆچکە دەهاتەوە

لەدەنگی پێیەکانییەوە دەیزانی هیچ نامەیەکی لە پۆستخانەکە بۆ نەهێناوەو دەیگوت: "نیگەران مەبە پۆیراز، کوڕم، دواجار ڕۆژێك هەر دێت یەکێك لە دۆستەکانم نامەیەکی باش یان خراپم بۆ دەنێرێت، دڵنیام. ناکرێت و ڕێی تێناچێت هەموو دۆست و هاوڕێکانم مرۆڤایەتیان لەبیر چووبێتەوە. هەرچۆنێك بێت نامەیەکم بۆ دەنێرن، ئەویش نامەیەك بە تام و بۆی کرێتەوە."

"دەزانم دەینێرن، بەڵام کەی؟ منیش زۆر کونجکۆڵم ئەمە بزانم."

"کاتەکەی نازانم، بەڵام لەنێو ئەو هەموو دۆست و برادەر و ئاشنایانە بێگومان یەك دوانێکیان نامەم بۆ دەنووسن. خۆ هەموو کرێت و یۆنان مرۆڤبوونیان لەبیر نەکردووە، من دنیایەك نامەم بۆ کەسانی جیاجیا نووسیوە، هیچ نەبێت یەکێك لەوان لەبەر ئەو نان و نمەکەی پێکەوەمان کردووە چەند خەت نامەم بۆ دەنووسێت."

جەعفەر پێیگوتبوون کاغەزی هێندە گەورەتان بۆ دەنێرم بە گەورەی کاغەزی نەخشەکان، وەك دیاری بۆتانی دەنێرم. هەرچەندەی بتانەوێت. چەند ڕۆژ دواتر بە قەدریی بەلەموان زیاتر لەو بڕەی کە داوایان کردبوو و زۆر گەورەتر لەو ئەندازەیەی گوتبوویان کاغەزی بۆ ناردن.

موسا ئاغا بە خۆشحاڵیەوە گوتی:

"ڕۆڵە پۆیراز، کاکە پۆیراز، پێتخۆشە پێکەوە بچینە کێڵگە؟"

"هەڵبەتە ئاغا، بەسەرچاو ئاغا، ئەمر دەفەرمووێت ئاغا."

دوای ئەو ڕۆژەی کە یەکدیان بینی، پۆیراز هەرجارێك ڕووبەڕووی زەهرا دەبووەوە دەست و پێی خۆی لــێ ون دەبوون و نەیدەتوانی سەری بەرزبکاتەوەو سەیری سیمای زەهرا بکات. هەر جارێك ئەوی دەبینی ئەو ئێزدیانەی دەهاتەوە بیر کە لە لێواری دەریا بینیبوونی و خۆی بەهۆی ئەوەی کە لەو ئاژاوەیەدا بەشداری کردبوو نەدەبەخشی. هەڵۆکان دەگژ یەکدا دەچوون. پۆیراز هەندێکجار خەونی دەبینی. خەیاڵی کۆمەڵکوژیی ژنەکان ساتێك چیە ئۆقرەو ئارامیان بۆ نەهێشتبووەوە. ئەو هەمیشە زەهرای لە هزرو خەیاڵدا بوو. نەیدەزانی ئەوەی دەیبینی خەیاڵە، خەونە، یان ڕاستیە، هەموو شتێکی تێکەڵ بەیەك دەکرد. زەهرا بە جەستەیەکی خوێناوی لە کاتێکدا خۆی بۆ لای هەڵۆیەك کە پەلاماری مەمکەکانی دەدا هەڵدەدا، باڵەکانی هەڵۆی کە سنگی ئەوی گرتبووە نێو چڕنووکە تیژەکانی خۆی ڕادەوەشاند... پۆیرازیش لە تەك زەهرا پەلاماری هەڵۆکانی دەدا.

هەرچی هەوڵی دەدا نەیدەتوانی بیر لە زەهرا نەکاتەوە، لە توانای دانەبوو. هەندێکجار دەهاتە سەر ئەوەی دوورگە بەجێبێڵێت، زەهراو هەموو شتێك و مەمکە لەرزانەکانی لەبیر بکات، بۆ نموونە بچێتە چیاکانی قەفقاز و زێدی باو و باپیران، لێبڕاوانە بڕیاری دەدا، بەڵام کەمێك دواتر پەشیمان دەبووەوەو دووبارە بیری لە قەفقاز دەکردەوە، لـێ شارەزای قەفقاز نەبوو... تەنانەت بچێتە ئەوێش هەر بیری لای زەهرا دەبێت، شەو و ڕۆژ. بچێتە هەر جێگایەك و هەر کارێك بکات زەهرا و یادی زەهرای لە مێشك دەرناچێت.

پۆیراز بە زەهرا بووبووە ئەم پۆیرازە تەواوە. ئەگەر ساتێك بیری لەو نەکردبوایەوە، شەرمی لەخۆی دەکردەوە. دەیتوانی بیر لە دەست و قاچی خۆی نەکاتەوە، بەڵام نەیدەتوانی زەهرا فەرامۆش بکات. ماوەیەك ئاگای لەو ڕووداوانە نەدەما کە لە دەوروبەریدا ڕوویاندەدا، وەکو خەواڵوان بۆ ئەملاو ئەولا دەڕۆیشت، بۆ بینینی زەهرا بیانوێکی دروست دەکرد. لە دوورگە کەس نەمابوو حاڵ و باری ئەو پێنەزانێت. پۆیراز چی بەسەر هاتبوو؟ سوپاس بۆ خوا، لێنا هۆشی تەواو بوو و هەموو بیرو تێبینییەکانی لەگەڵ پۆیراز باس دەکردن.

("ئەم دوورگەیە بەجێبێڵە، نازانم دەردو خەمت چییە، بەڵام دەزانم کە دەردو خەمێکی گەورەیە. ئەو دەردە دەتکوژێت. بیر لەمن مەکەرەوە، دوای ڕۆیشتنی تۆ، من دەچمە ئەستەنبۆڵ لەوێ کەسوکاری خۆم هەن. دەشچمە ئەنقەرە. لەوێش مستەفا کەمال پاشام هەیە، دەچمە لای ئەو، کوڕەکانم دەمگەنێ. هەر ئەوەندە بەسە تۆ خۆت لەو دەردو ئازارە ڕزگار بکەیت، تورکەکان چیدەڵێن، دەڵێن -پێت لە ڕێگای پیس دامەنێ-. تۆش ئەوە مەکە. ئەم دوورگەیە جێگایەکی باش نەبوو بۆ تۆ. ئەو دەردو ئازارەی لەدڵتدا هەیە دەتکوژێت، عارەبەکانیش جێگاکەتیان دۆزیوەتەوە. ئەگەر ئەو دەردەش نەتکوژێت، ئەوان دەتدۆزنەوەو دەتکوژن."

"بچمە کوێ دایکە لێنا؟ خۆت دەزانیت کە من ناتوانم بچمە هیچشوێنێك"

"تۆش بڕۆ لای مستەفا کەمال پاشا. ئەو خۆشیدەوێیت، ئەو مەدالیای گەورەی زێڕی پێتداوە. تۆش ئەوت خۆشدەوێت. ئەو لێناگەڕێت کەس پەنجەت بۆ درێژ بکات. بە منداڵەکانی منیش دەڵێیت منیش کوڕی لێنام. دوای ئەوە ئیدی تۆ کارت بەسەر هیچەوە نەبێت. ئەوان موسا ئاغا دەنێرنەوە کرێت، وادەکەن زەهراش هەر لێرە بمێنێتەوە. تۆ دەزانیت من چیدەڵێم؟"

بازووی گرت و ڕایکێشا:

دوای ئەوەی کە چەندجار قۆڵی گرت و رایکێشا و قسەکانی خۆی دووبارە کردنەوە، پۆیراز گوتی:

"تێگەیشتم دایکە، تێگەیشتم دایکە جوانەکەم."

"زووبە برۆ، ئەوەندە فکر و داڵغان لێمەدە، تۆ کوڕێکی باشیت، حاڵت باش دەبێت."

"سوپاست دەکەم دایکە."

پۆیراز ئەوددەمەی لە پلیکانەکان دەچووە خوار، لێنا لە دوایەوە خاچی بۆ کێشا.

لێنا نوقمی نێو شادی بوو، چونکە پۆیراز گوێی لە قسەکانی گرتبوو و دەچووە ئەنقەرە.

قەدریی بەلەموان هێشتا کە دەریا سپی بوو زوو لەخەو هەستا بووو هاتبووە ئەسکەلە و چاوەڕێی ئەوان بوو. پۆیرازیش لەسەر گردۆلکە نزمەکەی نزیك دارزەیتوونەکان راوەستابوو و سەیری دەریای دەکرد و بیری لە یەکەمین رۆژی هاتنی بۆ دوورگە و سێبەری شکۆفەی دارخۆخەکان کە لە ئاوەکەیان دابوو دەکردەوە، بیری لەو رۆژەی کە چووبووە ماڵی زەهراو ئەوی بینیبوو دەکردەوە. زەهرا وەکو ئێستا لەبەر چاوانی بوو. شمشێرە تیژ و خەنجەرەکان دەبریسکانەوەو جەستەی بچووك، رووت، خوێناوی بێپسانەوە فڕێدەدرانە نێو فوراتەوە. پۆیراز نەیتوانی خۆی بگرێت، سەری گێژی خوارد، قاچەکانی نەیانتوانی بە پێوەی رابگرن، دانیشتە سەر عەرزەکە. رێك لەم ساتەدا لەبەردەم پلیکانەی ماڵەکەیدا موسا ئاغای بینی، هەستایەوە، سەرگێژی و تاسانەکەی کەمێك باش بووەوە، وای بەدیکرد کە زەهراش بەدوای موسا ئاغا لە پلیکانەکان دێتە خوار. بە بینینی کچکەش وەك ئەوەی هیچشتێکی نائاسایی رووینەدابێت سەیری بەخۆی هات. نە فوراتی خوێناوی و تووڕە، نە کچۆڵەی پارچەڵەی تێهەڵدراو بۆ نێو ئاوی فورات، هیچکام لەمانە نەمابوون. موسا ئاغا سواری بەلەم بوو، زەهرا لەنێوەڕاستی ئەسکەلە وەستابوو. پۆیراز نەدەبوو چیدیکە موسا ئاغا لە چاوەڕوانی بهێڵێتەوە، بە راکردنەوە خۆی گەیاندە ئەسکەلە، ئەوددەمەی بە تەنیشت زەهرادا تێدەپەڕی، وەکو هەمیشە بۆ ئەوی نیگاکانیان تێکهەڵنەنگوێت ئەمجارەش سەری لەبەر خۆی نابووەوە. زەهرا بە هێمنی گوتی: "دەبێت قسەت لەگەڵدا بکەم. کە گەڕایتەوە لە ئاشەکە چاوەڕێم."

پۆیراز بە دەنگی بەرزەوە گوتی: "بەیانیت باش، بەیانیت باش زەهرا خانم، مام ئاغا دێن؟"

زەهرا گوتی: "سواری بەلەم بووە، چاوەڕێی ئێوەیە."

"درەنگ کەوتم؟"

"نە ئێمەش هەر کەمێکە هاتووین."

پۆیراز سواری بەلەم بوو.

موسا ئاغا کاتێك دەستی ئەوی دەگوشی گوتی:

"تۆ دەتگوت دەریا لەم کاتەی رۆژدا سپی دەبێت، بەڵام من باوەڕم نەدەکرد. سەیریکە دەریا سپی سپی هەڵگەڕاوە. چەند جوانە." هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. "چەند جوانە!"

تاوێکی دیکە دەریا دەکەوێتە شەپۆلان، ماسییەکانیش لەگەڵ شەپۆلاندا بەرزدەبنەوە سەر ئاوەکە. ئەودەم جوانیی دەریا و بۆنەکەی لەو بەرەبەیانەدا هەست پێدەکەین. ئەم دنیایە هەر کوێیەکی بگریت و هەر کاتێکی سەیر بکەیت بەهای ژیانی هەیە."

"سوپاس کوڕم، هێزم وەبەردێنیت. تۆ تەنانەت دوای ئەزموون و کارەساتەکانی ساری قامیشیش دەتوانیت وابیر بکەیتەوە، ئاوا قسە بکەیت. مرۆڤبوونی مرۆڤ واتە ئەمە. تا زیاتر مردوان ببینێت زیاتر بە ژیانەوە دەچەسپێت و پابەندی دەبێت. ئەودەم لەدڵی مرۆڤدا شتێك بەناوی ترس لەمردن بوونی نامێنێت. تۆ لەوێ، لە ساری قامیش بوویت وەنییە؟"

"لەوێ بووم."

"دەچینە کێڵگە، دەبێت چیبکەین؟"

"دەبێت کێڵگەکە بژێنینەوە. لەم رەوشە شێواوەدا تەنانەت ئەگەر لە دۆستێکەوە هەواڵێکیش بێت هەواڵێکی خۆش نابێت. زۆرم بیر کردەوە، لەم رۆژگارەدا رەوشی یۆنان هێندە خراپ و ناهەموارە کە هەموو دۆستەکانی تەنها لە هزر و خەمی ئێش و ئازارەکانی خۆیان دان. ئینشاڵڵا ئەم رۆژە سەختانەی تورکیا و یۆنان زوو تێدەپەڕن و هەم گۆڕینەوەو هەم ئەو نەهامەتیە ترسناك و نامرۆڤانەیەش زوو بە زوو لەبیر دەکرێت ئینشاڵڵا. ئێمە لێرە ئەسپ و کێڵگەکەمان دەفرۆشین و کێڵگەیەکی باشتر دەکڕین. نابێت نیگەران بین، ئەسپە باشەکانمان نافرۆشین، دەیانبەینەوە بۆ کرێت."

پۆیراز گوتی: "رەوش هەر وەك ئێستا نامێنێتەوە."

موسا ئاغا بە چاوانی تژی لە میهرو خۆشەویستی و لە هەمانکاتدا ئەشکتێزاو سەیری پۆیرازی کرد:

"تۆ لاوێکی عاقڵ و خاوەن ویژدان و وردبینیت کوڕم، وەسیەتی من بۆتۆ ئەوەیە کە تەرمەکەم ببەیتە کرێت، لە تەنیشت گۆڕی باوکمەوە بمنێژیت، گفتم دەدەیتێ؟"

"گفتت دەدەم" ئاغا، بەڵام تەمەن بەدەستی خوایە. ئەگەر لەتۆ زیاتر تەمەنم کرد گفت دەدەم ئەمە بکەم."

"ئێستا دەتوانم پرسیارێکت لێبکەم؟"

"فەرموو ئاغا."

"وەستا ئارسۆنت ناسی؟"

"یەکدیمان ناسی."

"ئاسنگەرە؟"

"وەستا ئاسنگەرە، ئاغا."

"رەنگبێت بۆ چێکردنی کێڵگەکە بە کەڵکمان بێت. دەتوانین ئێستا لەگەڵ خۆماندا بیبەینە کێڵگە؟"

"ئێستا بانگی دەکەم."

زەهرا لەسەر ئەسکەلە چاوەڕێی بەرێکەوتنی بەلەم بوو. پۆیراز ئەوکاتەی خەریك بوو بە بەردەمی تێدەپەڕی دیسان نەیتوانی سەیری روخساری بکات.

زەهرا گوتی:

"دەچیتە کوێ؟"

پۆیراز بێئەوەی سەری بلند بکات گوتی:

"دەچم وەستا ئارسۆنی ئاسنگەر بێنم. مام ئاغا کاری پێی هەیە. دوای ئەوەی کە گەڕامەوە لە بەیانییەوە تا شەو دادێت لەگەڵ پەڕەسێلکەکان لە ئاشەکە دەبم، وەرە ئەوێ، دەمەوێت قسەت لەگەڵدا بکەم." بە ئاستەم دەنگی دەبیستترا، بە سرتە قسەی دەکرد، بەڵام زەهرا ئەمەی بیست، هەموو گیانی لەرزی، بەخێرایی بەرەو لای کارگەی وەستا ئارسۆن رۆیشت، لە دەرەوەی کارگەکە بەدەنگی بەرز بانگی کرد: "وەستا ئارسۆن، وەستا ئارسۆن، مام موسا ئاغا کاری پێت هەیە. دەچینە کێڵگە، گوتی کەلوپەلە پێویستەکانت هەڵبگرەو وەرە."

وەستا ئارسۆن گوتی: "وەرە ژوورەوە. لێرە دانیشە." کورسییێکی نیشاندا.

"چ کێڵگەیەك؟"

"کێڵگەی ئەسپان. موسا ئاغا لە کرێت ئەسپی رەسەن و باشی بەخێو کردوون، ئەسپی عارەبی. خاوەنە یۆنانیەکەی ئەم کێڵگەیەش هەر ئەسپی بەخێوکردوون، ئەویش ئەسپی

ڕەسەن. موسا ئاغا ئەم کێڵگەیەی لە دارایی کڕیوە، دەیەوێت لێرەش ئەسپی ڕەسەن بەخێو بکات."

ئارسۆن ژمارەیەك ئامێری خستنە نێو جانتایەکی نوێ کە لەبەر دەستی بوو و هەستا:

"موسا ئاغا لە کوێیە؟ لە ماڵەوەیە؟ ئێمە دراوسێی یەکدین."

"دەزانم."

"پیاوێکی زۆر دەوڵەمەندە؟"

"خوا دەزانێت."

"هەندێك لەو کەسانەی گۆڕدراونەتەوە ئەوەندە دەوڵەمەند و ساماندار بوون کە حکومەت لەجیاتی ئەو زەوی و زارو کێڵگانەی لەیۆنان هەیانبووە لێرە زەوی و زارێکی زۆری پێداون کە رووبەرەکەیان دەگاتە پازدە بیست هیکتار، بەڵکو موسا ئاغاش ئەم کێڵگەیەی ئاوا بەمشێوەیە کڕیبێت."

پۆیراز بە شڵەژاوییەوە گوتی: "نا، ئاوا نییە. نە، نە، موسا ئاغا لەبەر چاوی خۆمەوە سکەی زێڕەکانی هەڵڕشتنە بەردەم بەڕێوەبەری دارایی."

"کەواتە زۆر دەوڵەمەندە."

"ڕەنگبێت قەدریی بەلەموان لەناو بەلەمەکەیدا چاوەڕێمان بێت."

تا گەیشتنە بەلەم هیچ قسەیان نەکرد. بەلەموان هەرکە ئەوانی بینی ماتۆڕی بەلەمەکەی پێکرد، بەلەم بەخێرایی کەوتەڕێ و ئاوەکەی کەفاوی کرد. موسا ئاغا هەستاو سڵاو و هەواڵپرسی لەگەڵدا کردن.

وەستا ئارسۆن گوتی: "تکا دەکەم، تکا دەکەم هەڵمەستن، فەرموون دانیشن."

لە کابینەکە بەرامبەر یەکدی دانیشتن.

"قەدریی بەلەموان، قەدریی بەلەموان، کابینی بەلەمەکەت چەند جوان دروست کردووە."

"سوپاس سەرۆك پۆیراز، بە لوتفی ئێوە، لەسایەی تۆ. لە دەرەوەش نیمدەری زۆر جوانم داناون. هەرکاتێك ویستتان دەتوانن بچنە دەرەوەی کابینەکە و لەوێ بە ئاسوودەیی دابنیشن."

"هەربژیت قەدریی بەلەموان."

نزیکەی شەو داهاتبوو گەیشتنە گوندەکەی عەلی چاوەش تۆپاڵ و لە ئەسکەلەی گوندەکە راوەستان، ئەو گوندیانەی کە لەژێر چنارەکە کۆبووبوونەوە ئەوانیان بینی و لە پڕێکدا هەستانە

سەرپێ و بۆ پێشوازیی ئەوان هاتنە سەر ئەسکەلە. عەلی چاوەش، یەکەمجار بە جۆش و خرۆشەوە، پۆیرازی گرتە باوەش و پاشان موسا کازم ئاغا و دوای ئەویش وەستا ئارسۆن. گوندییەکان یەکدەنگ گوتیان: "بەخێربێن."

"سوپاس، سوپاس، سوپاس."

ئەوانیان بۆ سەر مێزێك کە رووميزی لەسەر راخرابوو بانگ کرد. کەمێك دواتر چای وەك خوێنی کۆتریان هێنا.

عەلی چاوەش سەیرێکی وەستا ئارسۆنی کردو گوتی: ((پێموایە ئەمن پێشتر لە جێگایەك تۆم بینیووە."

وەستا ئارسۆن گوتی: "دوور نییە. تۆ قاچت لە چاناك قەلا لەدەست داوە، مەگەر نا؟ ئێمە کە دەهاتین کاك پۆیراز پێیگوتم."

عەلی چاوەش گوتی: "راستە، ئینگلیزەکان قاچیان وەکو دیاریەك لێوەرگرتم و بردیان و دایانە پادشاکەیان، پێیانگوت خاوەنشکۆ ئەمە قاچی عەلی چاوەش تۆپاڵە. ئەمەت بیستووە؟"

"بیستوومە، دەبێت ئەمنت لەشوێنێك بینیبێت لە لەشکری چاناك قەلا تفەنگساز بووم. تۆپ و تفەنگەکانم چاك دەکردنەوە."

"زانیم تۆ کێیت."

"بێژە بزانم کێم؟"

"فەوجێك هەبوو کە دەستی بە هێرشبردن کرد، لەو فەوجەدا تەنێ سێ کەس مابوونەوە، یەکێکیان تفەنگسازەکەیان بوو، ئەو تفەنگسازە تۆ بوویت؟"

"من بووم."

"تۆ چۆن قوتارت بوو؟"

"ئێمە هێشتا دەستمان بە هێرش نەکردبوو کە گوللەتۆپێك رێك لەبەردەمی منیدا. هەموو خاك و خۆڵی سەنگەرەکەم بەسەرداکەوت. حاڵی خۆم نەدەزانی. کاتێك کە بەخۆم هاتمەوە سەیرمکرد هەموو جێگایەك تاریکە و هەموو گیانم قوڕ و خاك و خۆڵە. درەختێکیشم بەسەردا کەوتبوو، لك و کەدی درەختەکە بەچوار دەورمدا لە عەرزەکە چەقیبوون. بە دەستەکانم خاك و خۆڵەکەم لەسەرخۆم لاداو رۆشنایی خۆرم بینی. لەگەڵ بینینی رۆشنایی دیسان لەهۆش خۆم

چووم. نەمزانی چەندە خەوتبووم. بەکورتی ئاواملێهات. پاشان گوللەیەك تەرۆکی چەپی پێکام. گوللەی لامەسەب چوار دانە پەراسووی شکاندبووم. لە دڵی خۆمدا گوتم تەواو تازە مردم، بەڵام هێنامیانە نەخۆشخانەی ئەم دوورگەیە، دوورگەی کارینجا. دەمنادەمێك بەهۆش دەهاتمەوە، هەرجارێك بەهۆش دەهاتمەوە وامدەزانی مردووم. ئاوا مردم و زیندوو بوومەوە. جارێك چاوم هەڵێنان بینینم لە نێوەڕاستی بەهەشتێك دام. لەدڵی خۆمدا گوتم ئەگەر بە زیندوویی بمێنمەوە بەهەر نرخێك بێت دەمەوێت لەم بەهەشتەدا بژیم. سەیر دەکەم ئەو دکتۆرانەی ئێمەمانانیان دەرمان دەکرد و گیانیان وەبەرنابنەوە بەر لە ئێمە هاتوونەتە ئەم بەهەشتە. من لەم دنیایەدا لەم دوورگەیە بترازێت هیچ شتێکم نییە. ئەودەمەی من سەرباز بووم دایك و باوك و کەسوکارەکانیان کوشتبووم. لەم دنیایەدا تەنها لکێك بۆ ئەوەی دەستی پێوە بگرم بۆم ماوەتەوە ئەویش ئەم دوورگە بەهەشتیەیە. لەمە زیاتر دەتوانم چی لە خوا داوا بکەم."

"داوا بکە. تەنانەت ئەگەر داواش بکەیت، خوا بۆ کەسێکی بێشانسی وەکو تۆ زلکە شخارتەیەکیش ڕەوا نابینێت. دەی هەستن تا ئەو ئاسنگەرە بێچارەیەش پارویێك دۆڵمەی گوڵەکدو و مەرجانە ماسیەك کە تازە لە دەریا هاتۆتەدەر تام بکات. دەی هەستن. لە ڕاستیدا سەرم لەوە سووڕما کە ئەمڕۆ ئەم دۆڵمەی گوڵەکدوە لێرە هەیە. قسمەتی ئەو بووە."

کابانی ماڵ لەبەر دەرگا بە گەرمی پێشوازی لێکردن. دەنگی لە خۆشحاڵیان وەکو ئاواز وابوو:

"بەخێر بێن، بەخێر بێن. ئەمڕۆ دۆڵمەی گوڵەکدوشمان هەیە. بریا نیشانچیش لێرە بوایە. ئەو بۆ دۆڵمەی گوڵەکدو دەمرێت. ئەحمەدی مە ڕاوەماسی لەو فێربووە، هەموو ڕۆژێك ئەوەندەی ماسیان دەگرێت و ئێمە ئەوەندەمان ماسی خواردوون کە خۆشمالن بووینەتە ماسی. هەموو گەنجەکانی گوند حەزیان لێیە لای سەرۆك نیشانچی کار بکەن."

سفرە ڕاخرا، یەکەمجار ماسی، ئینجا دۆڵمەی کدو هات. دوای کەمێك قسەکردن، چوونە سەر جێگاو زوو خەوتن، بەیانی زوو لەخەو هەستان، ئەودەمەی خەریك بوون بەرچاییان دەخوارد ئەو ئۆتۆمبێلەی دوێنێ شەو داوایانکردبوو هات. بە پەلە بەرچاییان خوارد. ئەو ئۆتۆمبێلەی کە سواری بوون تازە بۆیاخ کرابووەوەو بۆنی بۆیاخی لێدەهات. گوشنەکانی هەردوولای دانیشتنەکە نەرم و نۆڵ و پڤدار و لەسەر گوڵە وەنەوشە نەخشێندرابوون تاکو

سەرنشینەکان بە ئاسوودەیی بتوانن تیایدا پاڵ بدەنەوە. کەوشەکانیان داکەندن و قاچیان لێڕاکێشان و پشتیان بە پشتیەکانەوەدا.

عەلی چاوەش گوتی: "ئیسماعیل لەو ڕۆژەوە کێڵگەی بەجێنەهێشتووە. بە بەردە نەقاڕکراوەکانی کۆشکە وێرانکراوەکە خانوویێکی بچووکی لە تەنیشت دارەگەورەکە بۆ خۆی دروستکردووە، خانووەکە بچووکە، بەڵام تابڵێیت جوانە. لە دێهاتەکانی ئەو ناوە تەختەی بۆ نێو ژوورەکان و سوفالی بۆ سەربانی خانووەکەی هێناوە. کاولاکزادە ئەگەرچی هەموو خانووەکانی تێکداوە، بەڵام نەتوانیبوو تەختە و سوفالە بەجێماوەکانی زۆر لەخانووەکان ببات. ئەویش لە وێرانکردنی دێهاتەکان کەوەڕێ بووبوو. ئیسماعیل بۆ ئەسپەکەشی ئاخوڕێکی دروست کردبوو. هێند باش پێیڕاگەیشتووەو ئاگای لێبووە کە ئەگەر ئێستا ببینیت کەفەڵی دەڵێی ئاوێنەیە دەبریقێتەوە، باخێکی دروستکردووە، بێستانی دروست کردووە. مامر و مراوی لە قەفەسان کردوون. هەر چوار مانگاکان شیرێکی زۆریان تێدایە. ئیسماعیل پێیانڕاگەیووە، پاش کەمێکی دیکە کە بگەینە کێڵگە بە چاوی خۆتان دەیبینن..."

عەلی چاوەش بێپسانەوە باسی ئیسماعیلی دەکرد و قسەکانی تەواو نەدەبوون، "هەرکەسێك لە جێی ئەو بوایە تا ئێستا کاولاك ئوغلوی کوشتبوو. ئەو تەنانەت جارێکیش باسی کاولاکی نەکردووە. ئەوانی دیکەش سەبارەت بە کاولاك قسەیان نەکردووە. ڕای من بپرسیت پێتدەڵێم کە ئیسماعیلی تۆپچی بە دوای دەرفەتێکی گونجاودا دەگەڕێت. ئەو ئەگەر هەمان ئەو ئیسماعیلە بێت کە من دەیناسم، چاوەڕوانە. کەسێکی ژیر و خۆگرە."

چوونە حەوشەی کۆشکە وێرانکراوەکە. ئیسماعیل بە شادی و شانازییەوە پێشوازی لێکردن و گوتی:

"بەخێر بێن، هاتوون ئەسپەکە ببینن؟ بۆ خۆم خانوو و بۆ ئەسپیش تەوێڵەم دروستکردووە. ئەگەر ئەسپەکە ببینن نایناسنەوە."

رایکرد بۆ تەوێڵەو بە ئەسپێکی جوان و گەشەوە هاتەوەدەر.

موسا ئاغا بە سەنگینیەوە گوتی: "ئیسماعیل ئەمە هەمان ئەو ئەسپەیە کە ئێمە کڕیمان؟ چەند باش ئاگات لێیبووە و پێیڕاگەیشتوویت ئیسماعیل، هەربژیت."

"ئێمە کە ئەم ئەسپەمان کڕی هیچ ئاگایان لێنەبووبوو، نەیانزانیبوو کە ئەم ئەسپە ئەسپی عارەبیە. بە سێ مانگان ئاوای لێهات. ئەوا بە خێرایی کە باوەڕ ناکرێت. زۆر زیرەکە. ئەو هەموو ئەسپەم بەخێوکردوون، بەڵام ئەسپی وام زۆر کەم بینیوون."

موسا ئاغا لە ئەسپەکە نزیك بووەوە، دەستێکی لە گەردنیەوە تا کەفەڵی کێشاو لاواندیەوە. پاشان، دەمی لێککردەوە، ددانە سپییەکانی ئەسپ دەرکەوتن.

موسا ئاغا دەمێکی باش سەیری ددانەکانی ئەسپی کردن و پاشان دەستی لەسەر دەمی هەڵگرت و گوتی:

"ئیسماعیل تۆ سەیری ددانەکانی ئەم ئەسپەت کردووە؟ ئەم ئەسپە هێشتا هەر چوار ساڵەیە."

"سەیرمکردووە ئاغا، هێشتا چوار ساڵەیە."

"ئەسپێکی زۆر جوانە، لەنێو ئەسپە عارەبییەکانیش لە هەرە رەسەنەکانە. ئەمانە رەسەنترین ئەسپی دنیان. ناسنامەیشی هەیە؟"

"نە، ئاغا، بەڵام زوو وەریدەگرین. کێ دەتوانێت ناسنامە نەداتە ئەسپێکی وا رەسەن، رەسەنایەتی ئەم ئەسپە لەنێو چاوانیەوە نووسراوە."

هەستی بەختەوەری ئەم ساتە بارتەقای هەموو ئێش و ئازارەکانی داهاتوو دەبێت.

موسا ئاغا لەو ساتەوەی ئەم ئەسپەی بینیبوو بۆ کەسێکی جیا لە موسا ئاغای پێشان گۆڕابوو و تەنانەت شێوەی بە رێگادارۆیشتنی گۆڕابوو. بەخێرایی بەرەو لای خانووە وێرانکراوەکە رۆیشت، ئەوانی دیکەش کەوتنە دوای. لە نێو دەرگای خانووەکە راوەستا، ماوەیەکی درێژ سەیری دەوروبەری خۆی کردو پاشان گوتی: "ئەم پیاوە پیاوێکی ژیر بووە، خانووی لە باشترین شوێن دروست کردووە. لەهەر لایەکیەوە سەیر بکەیت دەریات لێدیارە، جگە لەوە، وەك ئەوەی لە هەر گۆشەیەکیەوە سەیری بکەیت وادەزانیت سەیری دەریایەکی دیکە دەکەیت. لە کرێتی ئێمەشدا شوێنی وا هەن کە لە هەر گۆشەیەکەوە سەیر بکەیت دەریایەکی دیکەت دەکەوێتە بەرچاو. ئەم کەسانەی دەریا تەنها بەیەك شێوە دەبینن، ناتوانن وەکو پێویست چێژی لێوەربگرن. لە دوورگەی ئێمەدا کابرایەك هەیە وەکو منداڵێکی بزۆز وایە، رەنگبێت ئێوەش بینیبتان، مەبەستم وەلی نیشانچییە."

عەلی چاوەش گوتی: "دەیناسین، دەیناسین ئاغا. ئەو زۆر دێتە ئێرە، هەر قاچی گەیشتە سەر ئەسکەلە هاوار دەکات عەلی چاوەش، عەلی چاوەش، عەلی چاوەش دۆلمەی کدو ئامادەیە؟ هەریسەی ترخێنە لەسەر ئاگردانە؟ خوشکەکەمان تەندروستی باشە؟"

"ئەو وەلی نیشانچیە دەریا هەموو رۆژێك، بەیانیان، نزیکەی نیوەڕۆیان، نیوەڕۆیان، عەسران، شەوان، لەنێو رۆشنایی، لەژێر تریفەی ئەستێران، لە شەوانی مانگەشەو بەشێوەی جۆراوجۆر دەبینێت. ئەو تەنها لەنێو دەریایەکدا ناژیت، بەڵکو لەنێو دەریاگەلی جیا جیا دەژیت. دەریاوانە تایبەتەکان ئاوا. ئەو کابرایەی ئەم خانووەشی لێرە دروست کردووە بە هەمان ئەو ئەندازەیەی ئەسپەکانی خۆشویستووە، ئاواش دەریای خۆشویستووە."

"ئەم خانووە باپیرەی چورباچی ئێمە دروستی کردووە."

موسا ئاغا گوتی: ((خوا لێیخۆشبێت. پیاوێکی باش بوو. تەنها خۆشویستنی ئەسپ و دەریا بەس نییە، دەبێت باڵندە و ئاژەڵ و مێرووله و هەنگ و سەنگ و خاك و خۆڵ و باو نەیزەك و هەموو شتێك، هەموو شتێك، هەموو ئەو شتانەی لە دنیادا هەن خۆشتبووێن، لە ناخی دڵەوە. نابێت لە لاواندنەوەی دنیا هەرگیز تێر ببێت."

موسا ئاغا بەرەو درەختێك کە کانیاوێکی لەژێردا هەڵدەقوڵێ هەنگاوی هەڵێنا. خۆی دابووە دەست لافاوێك لە شادمانی و ئەوانی دیکەش هەوڵیان دەدا بگەنە ئەو. موسا ئاغا لە رۆخ کانیاوەکە راوەستا، داهاتەوە، سەیرێکی ئاوەکەی کرد، روخساری خۆی لەنێو ئاودا بینیەوە، روخساری وەکو هی سەردەمی گەنجیەتی وابوو، ئارام و تژی بوو لە میهر و شادمانی.

"ئێستا دنیای من ئەو دنیایەیە. دنیای من، کرێتە، بە هەموو شتێکیەوە لە کرێتدا بۆنی هەموو شتێك، دار و درەخت و ئاو و خاك و باڵندان جۆرێکی دیکە بوو. لە کرێتدا رۆژەکان و هەموو شتێك جیاواز بوو. لێرەش هەموو شت جۆرێکی دیکەیە، وەلــێ هێشتا بە هەموو دڵ و گیانم هەستم پێنەکردووە. ئەگەر رۆژێك لە وەلی نیشانچی بپرسین تۆ چما ئەوەندە خۆشحاڵیت، دەڵێت، شادی و شادمانی رۆچۆتە مۆخی ئێسقانەکانم، هەر ساتێك دێت و دەڕوات دڵم ئەڤینێك دەئافرێنێت."

لە پڕێکدا رووی کردە ئیسماعیل: "ئەم کانی و ئەم درەختە کەمێك گۆڕاون، وانییە؟"

"وایە ئاغا، گۆڕانیان بەسەرداهاتووە، کانیاوەکەم گەورەتر کردووە، دەوروبەرەکەیم هەڵکەند و گەیاندمە نزیك ریشاڵەکانی درەختەکە، ژێر درەختەکەم هەڵکەند، کانیاوەکە سێ ئەوەندەی

جارانی لێهاتووه. ورده بەردەکانی ژێرەوەی کەم بوون و بەشی کانیاوەکەیان نەدەکرد، گونی گونی ورده بەردم بە کۆڵ بۆ لە دەریارا هێنان و هەڵمرشتنە ژێرەوەی. کاتێك کانیاوەکە لە بن قاپۆری درەختەکە نزیك بووەوە ئاوەکە زۆر زیادی کرد. ئاوا بوو بە ستێرێکی بچووك کە ژێرەوەی بە ورده بەردی رەنگاو رەنگ داپۆشراوه."

موسا ئاغا بە راوێژێکی لێبڕاوانە گوتی: گئیدی دەست لەم کانییە مەدە ئیسماعیل. بەتایبەت چیدیکە کارت بەسەر ئەم درەختەوە نەبێت. سروشت هەمیشە لە ئێمە مانان عاقڵترە. خۆی لەهەمووان باشتر دەزانێت چی دەکات و دەیەوێت چیبکات. کاری ئادەمیزاد، کە دەڵێن ئافەریدەیەکی سەیرە، تەنها بۆتە وێرانکردن و لەنێوبردن. تەنها بۆتە وێرانکردن و لەنێوبردن. تەنانەت دڵی خۆیشی لەنێو بردووه."

"تێگەیشتم ئاغا، دەستیان لێنادەم ئاغا، تێکیان نادەم ئاغا."

"ئەم ماسیانە لە کوێوە هاتوونەتە ئێرە، نێو ئەم کانیاوە؟ پێشتریش هەبوون؟"

"نە ئاغا، من ئەوانم هێنا ئاغا."

"کارێکی چەند نابەجێت کردووە. تۆش وەکو گەمژەکان ویستووتە سروشت جوانتر بکەیت. ئەگەر کانییەکە بیویستبوایە جوانترین وردەبەرد و جوانترین ماسی دەهێناو دەیهاوێشتنە نێو خۆیەوە. ئەو ماسیانە هەڵبگرەو بیانبەرەوە بۆ ئەو جێگایەی لێتهێناون. ئیدی هەرگیز بە کۆڵت ورده بەردان بۆ کانییەکە مەهێنە. ئەوەندەی هێناوتن بەسە کاتێك ویستت ماسییەکانیش بگوازیەوە ئاگاداربە ئازاریان نەدەیت و لەنێویان نەبەیت."

سەرچاو ئاغا، لەنێویان نابەم ئاغا."

وەستا ئارسۆن بە فووتێك زەوی خانووەکەی رووپێو کردو لە دەفتەرێکدا کە بەدەستییەوە بوو دەینووسی. پۆیرازیش یارمەتی ئەوی دەدا. کاتێك لەگەڵ ئیسماعیل و عەلی چاوەش بەرەو لای ئەو رووبارە دەرۆیشت کە زەویی دارزەیتوونەکانی کردبووە دوو بەش، رووی کردە وەستا ئارسۆن و گوتی:

"وەستا ئارسۆن، وەستا ئارسۆن، وەستا ئارسۆن، دوای ئەوەی کە نەخشەی خانووەکەت تەواوکرد تەوێڵەکان و ئاخوری ئەسپەکەی من و باخچەی گوڵان لەبیر نەکەیت. بۆ هەمووان نەخشە بکێشە، نەخشەی هەموو ئەو شوێنانە بهێنە و بیاندە بەمن. تەواوی کێڵگەکە بە هەموو وردەکارییەکانییەوە دەبێت لەژێر دەستی من دابێت."

"خەمت نەبێت مام ئاغا، سەرمان لە نەخشەسازییش دەردەچێت، کێڵگە بە بەرد و دار و خاك و کانیاو و رووبار و زەیتوونەکانییەوە دێنم و دایدەنێمە بەردەستت، بەڵام ئەم کارە چەند رۆژێك درێژە دەکێشێت."

"ئەگەر ویستت دەتوانیت لە ماڵی ئیسماعیل بمێنیەوە."

"وەستا ئارسۆن دەخەینە سەر سەرو سەرچاومان، ئەویش وەکو ئاغامان عەلی تۆپاڵ قارەمانی چاناك قەڵاو گەلیبۆلۆیە. ئەم وەستا ئارسۆنە هەمان ئەو وەستا ئارسۆنە نییە کە بەر لەوەی خۆی بهێتە ئێرە ناو و ناوبانگ و دەنگوباسی هاتبوو و بووبووە وێردی سەر زاران، دەنگوباسی ئەو تۆپانەی کە دوژمنیان لەت و پەت دەکرد، هەروەها چاککردنەوەی ئەو تفەنگە کۆن و لەکارکەوتووانەی کە نوێ نوێی دەکردنەوە؟"

عەلی چاوەش تۆپاڵ بە فیز و شانازیکردنێکەوە قاچی بە عەرزداکێشا:

"خۆیەتی، ئەمە هەمان ئەو وەستا ئارسۆنەیە و قارەمانی چاناك قەڵاو گەلیبۆلۆیە. ئەوانەی لە نەبەردەکانی چاناك قەڵاو گەلیبۆلۆ زیندووماونەتەوە هەمیشە شانازی پێوە دەکەن و لەنێو هەموویاندا کەسێك نابینیت ناو و ناوبانگی وەستا ئارسۆن نەبیستبێت. تفەنگ و تۆپی هەندێکیانی چاك کردۆتەوەو جگە لەوە زۆرجار لە پشت رەشاشەکانیش دانیشتووەو ئەو دوژمنەی کە وەکو رەوەی کلۆیان بەرەو رومان دەهات هەڵێدەوەراندن و لەنێوی دەبردن."

ئەم قسانەی کردن و ئینجا ئەمەی بۆ زیاد کرد: "ئارسۆن، خاك و دوورگە و ئێمەمانانی هەڵبژاردووە و ئێمە هەموومان هەست بە سەربەرزی و شانازی دەکەین."

موسا ئاغا وەپێشکەوت و بە هەنگاوی پتەوەوە چووە پێش. بە چەشنێك کە پۆیراز و ئیسماعیل نەیاندەتوانی پێیبگەن. گەیشتنە رووبارێك کە وەکو نوور بەسەر وردە بەردە درەوشاوەکاندا رەوان بوو. رەنگدانەوەی رۆشنایی ئاوەکە دەکەوتە سەر دارزەیتوون و دەوەنە گەزەکان و چنارەکانی هەردوو لای رووبارەکە. رۆشنایی دیکەش جگە لە رۆشنایی هەتاو بەو دەوروبەرە دەکەوت و پۆلە ماسی بە پوولەکە درەوشاوەکانیان هەڵدەبەزینەوەو شۆڕی نێو ئاوەکە دەبوونەوە.

موسا ئاغا لە رۆخی ئاوەکە لەسەر ئەژنۆ دانیشت. ماوەیەك ئاوا مایەوە، تا رۆژئاوابوون چاوی لەسەر ئاوەکە هەڵنەگرت.

سێ ڕۆژ لەوێ مایەوە. عەلی چاوەش کە حاڵ و بارێکی باشی هەبوو زۆر بەباشی پێشوازی لێکردن. خواردنی وای دەرخوارد دان، کە قەت نەیانخواردبوو، بە درێژایی ئەو سێ ڕۆژە موسا ئاغا کرێت و ئەسپەکانی و ژنەکەی خۆی کە فڕێیان دابووە نێو دەریا و کچەکانی کە ڕۆح و گیانی بوون و بەکورتی هەموو شتێکی لەبیرکردبوو، هەموو شتێکی لەبیر کردبوو چونکە کێڵگە، دەریا کە لە کێڵگەڕا بە هەزار شێوە دەبیندرا، ئاوە درەوشاوەکانی ڕووبار، کانیاوەکە کە وەکو تۆپەڵێك ڕۆشنایی لەژێر دارچنارەکە دەلەرایەوە، عەلی چاوەش و هەموو ئەو کەسانەی دیکەی ئەوێ سەرمەست و ئەفسوونیان کردبوو. موسا ئاغای ئەفسوونکراو لەم دنیایە نەمابوو و چووبووە دنیایەکی دیکە. لەنێو خەون و خەیاڵاتێکی بەهەشتیانە وەکو مەست و خەواڵوان باڵەفڕەی دەکرد و دەفڕی.

دوای سواربوونی بەلەمەکەی قەدریی بەلەموان بوو کە کچەکانی بەبیر هاتنەوەو کاتێك لەلایەکیەوە پۆیراز و لەلایەکەی دیکەی وەستا ئارسۆنی بینیبوو هەندێك بەخۆی هاتبووەوە:

"دەگەڕێینەوە دوورگەکەمان کوڕینە، عەلی چاوەش و ئیسماعیل لەکوێ مانەوە؟ دەمویست کەمێك: پارە بدەمە ئیسماعیل، دامێ؟"

پۆیراز گوتی: "داتێ ئاغا."

موسا کازم ئاغا پشتی بە پشتییەکەوە دا، چاوەکانی نووقاندن، هەر دەمنادەمێك چاوەکانی دەکردنەوەو بە سەرسامیەوە سەیرێکی دەوروبەری دەکرد و هەر یەکسەریش چاوەکانی دادەنانەوە سەریەك. کاتێك بەلەم گەیشتەوە ئەسکەلە موسا ئاغا پرسی:

"گەیشتین؟"

وەستا ئارسۆن کە دەستی ئەوی گرتبوو و هەڵیدەستاند گوتی: "گەیشتین ئاغا" و پێکەوە لە بەلەم دابەزین.

موسا ئاغا کە لە کێڵگە تا دوورگە وەکو خەواڵوانی لێهاتبوو، ئێستا ئەو موسا ئاغایەی چەند ساتی پێشتر نەبوو، بووبوو بە موسا ئاغای بێئەندازە شاد، بێئۆقرە و گەنج بە چاوانی درەوشاوەوە. بە هەمان شێوەی کە کەسێك لەخۆشیان باڵی لێدەڕوێن، موسا ئاغاش باڵی لێڕوابوون. وا بەخێرایی بەرەو ماڵەوەی دەڕۆیشت کە پۆیراز تۆزیشی لە دوو نەکرد. هێشتا قاچی نەنابووە دەرگای باخچە کە گوتی:

"کچەکانم، کچەکانم، کچە ئازیزەکانم، من هاتمەوە، من، من."

کچەکان هاواریانکرد: "بەخێربێیتەوە باوکە!" لەپلیکانەکان بەرەو باخچە دابەزین و باوکیان گرتە باوەش. ئەو شادمانیەی باوکیان کاری لەوانیش کرد. پۆیرازیش لەگەڵ ئەواندا نوقمی نێو ئەو شادمانیە خرۆشاوە بووبوو.

"وا لەبەهەشت دەگەڕێمەوە کچە ئازیزەکانم. لەتەمەنمدا بەهەشتی ئاوام نەبینیووە. هیچ کەسیشم نەبینیووە کە تاکو ئێستا بەهەشتێکی ئاوای بینیبێت. لەهەر لایەکی کێڵگەی ئێمە سەیری دەریا بکەیت دەریات بەشێوەیەکی جیا دێتە بەرچاو، بە رەنگ و رۆشناییە جیاوازەکان. هیچ جێگایەك بە دەریا ناگات. با هەرچی زووە بچینەوە ماڵێ تا هەمووتان بۆ باس بکەم." دەستی خستە نێو قۆڵی کچەکانی و بەرەو پلیکانەکان وەڕێکەوتن. خەریك بوون لەپلیکانەکان بەسەر دەکەوتن، موسا ئاغا دەیگوت: "بوونە جادوو. دەڕۆیت دەگەیتە ئەوێ و سەیری دەریا کە کەمێك لەولاترەوەیە دەکەیت، کانییێکی زوڵاڵ لەژێر درەختە گەورەکە و رووباری درەوشاوەو زوڵاڵ بەنێوەڕاستی دارزەیتوونەکاندا رەت دەبێت، دەبینیت، لەوێ شتێك ئەفسوونت دەکات کە لەهەموو تەمەنتدا تاقیت نەکردۆتەوە، جەستەت، قاچەکانت لەزەوی جیادەکاتەوە، سەرت دەخاتە خولانەوەو مەست و حەیران دەبیت. مرۆڤ نوقمی نێو شادی دەبێت، مەملەکەتی شادیەکان و فڕینەکان و جادووەکان لەهۆش خۆتت دەبەن و مەست و حەیرانت دەکەن، دەچیتە نێو دنیایەك کە دنیای شتە جاویدان و نەمرەکانەو پێتخۆشە هەر لەوێ بمێنیتەوە. ئێستا من لە وەها دنیایەکی جاویدانەوە بەدەوری خۆمدا خول دەخۆم. چەند باش بوو کە هاتینە ئەم دوورگەیە و ئەم خەڵکە باشەمان بینی، ئەو کێڵگەیەمان کڕی، خۆزگە ئێوەش دەچوون و کێڵگەکەتان دەبینی، لەوێ شتگەلێك هەیە کە مرۆڤ ئەفسوون و سەرمەست دەکات، ئەوێ، کێڵگەکە."

پۆیراز هەروا لەسەر پلیکانەکان وەستابوو. حەپەسابوو، لەلایەکی دیکەش تا دەهات خەم و ئازار زیاتر دڵیان دادەگرت. زەهرا، ئەوەدەمەی باوکی خەریك بوو لەپلیکانەکان بەسەر دەکەوت، ئەوەدەمەی لەگەڵ باوکی قسەی دەکرد ئاوڕێکی دابووەوەو سەیرێکی ئەوی کردبوو، بەڵام نەیتوانیبوو سەری بەرزبکاتەوەو تەماشای زەهرا بکات. ئەویش تاسا بوو، قاچەکانی ئەویش لە زەوی بووبوونەوە، ئەویش پێدەچوو خۆی لەبیرچووبێتەوە. ئێستا خۆزگە دایکە لێنا بهاتبوایە، قۆڵی بگرتبواو بیبردبوایەوە ماڵێ، ئەو خەم و ئازارەی روخساری داگرتووە هیچکەس نەبینێت و زەهرا لەو گرفتە رزگار بکات. لەکاتێکدا کە ئەوان تژی بوون لەشادی و

میهر و له خۆشیان خەریك بوون باڵ بگرن، پۆیراز وەکو منداڵێکی بێسەرپەرشت و تاك و تەنیا لەنێوەڕاستی ئەم دوورگەیە مابووەوە. بەیانی بەهەر جۆرێك بێت زوو لەخەو هەڵدەستێت، دەچێتە ئاشەکەو تا رۆژئاوا دەبێت، تا تاریکی دادێت چاوەڕێی ئەو دەکات، چ بێت و چ نەهێت. بەیانی ئەمە نەك جارێك دەیانجار و بە دڵنیاییەوە بەڤاسیلی دەڵێت.

پۆیراز گەڕایەوە ماڵەوە.

زەهرا، ڤاسیلی لەئەسکەلە بینیەوە، بڕیاربوو بچێتە راوەماسی. پێیگوت: "بوەستە ڤاسیلی، کارم پێتە."

ڤاسیلی لەهەمان جێگای لێیبوو وەستا.

"بەو، بە پۆیراز بڵێ، سبەی لەبەیانییەوە تا شەو دادێت لەناو ئاشەکە چاوەڕێم."

ڤاسیلی پرسی: "هەر ئێستا؟"

زەهرا گوتی: "هەر ئێستا، پێش ئەوەی بچێتە ماسیان."

ڤاسیلی چووە ماڵی پۆیراز، کەمێك دواتریش گەڕایەوە. زەهرا کە سوور سوور هەڵگەڕابوو گوتی: "چیگوت؟"

ڤاسیلی گوتی: "هیچی نەگوت. رەنگی زەرد هەڵگەڕابوو و شڵەژاو دیاربوو. دەتگوت دەیەوێت شتێك بڵێت، بەڵام نەیتوانی. من خولق و خووی ئەو شارەزام. ئەگەر بێدەنگ بێت و قسەیەك نەکات تەواو ئیدی نایکات. من بەوەش لێینەگەڕام و سەیرێکی روخساریم کرد و لێمپرسی: "چی بە زەهرا بڵێم؟ دیسان هیچی نەگوت. کەمێك لێوەکانی جووڵاندن. من دیسان چاوەڕێم کرد، دووبارە پرسیمەوە، ئەو دیسان نەیتوانی هیچ بڵێت."

سواری بەلەمەکەی بوو، دەستی بە سەوڵلێدان کرد. لەو شوێنەی وەستابوو وشکهەڵات و ماوەیەك ئاوا مایەوە، پاشان لەپڕ خۆی کۆکردەوەو بە بۆڵە بۆڵەوە گوتی، قسە ناکات با نەیکات، ناهێتە ئاشەکە با نەهێت، من خۆم بەیانی زوو دەچمە ئاشەکە و چاوەڕێی دەکەم. لەدڵی خۆیدا گوتی باوکم بۆچی ئەوەندە خۆشحاڵە، بەڵکو هەواڵێکی لەبارەی گەڕانەوە پێگەیشتبێت... وەلێ ئەگەر وایە بۆچی کێڵگە و دەریا و مرۆڤە تازەکان ئاوا ئەفسوونیان کردووە؟ چیوای نەماوە دوو دانە باڵ لەژێر هەنگڵی بڕۆین و لەشەقەی باڵان بدات و بڕوات بۆ کرێت، لەوێ لەسەر دارەمێوەکانی بەردەم دەرگا هەڵبنیشێت. لە ئەسکەلەوە بۆ لای دارچنارەکان چوو، لەسەر نیوتەختی کەنار کانیەکە دانیشت، گوتی، بەڵکو لەجێگایەك لەم

دەوروبەرانە رووبەڕووی یەکدی ببینەوە. چاوەڕێ ما. تا زیاتر چاوەڕێی کرد، هیواو ئومێدی زیاتر بوو. بەو خەیاڵەی کە کەمێکی دیکە بە دەردەکەوێت، کەمێکی دیکە بە دەردەکەوێت تا نزیکەی نیوەڕۆ هەر لەوێ مایەوە. کەس نەدەهاتە سەرکانی. هیچ دەنگێك لە دوورگە نەدەبیسترا. نە دەنگی مەلێك، نە زەردەواڵە، نە مرۆڤ و نە شەپۆلی... رێك لەم ساتەدا پشیلە عەباس و پشیلە مێینەکەی کە تازە لە حەرەم هێندرابوو بە بەردەمیدا رەت بوون. پشیلەکان هەردووکیان مەست و سەرخۆش بوون. زەهرا چونکە پشیلەکانی خۆشدەویستن و لە منداڵییەوە زۆر یاری لەگەڵدا کردبوون، نزیکەی هەموو رەفتاری پشیلەکان شارەزا بوو. تەنانەت پێکەنینی پشیلانیشی بینیبوو. خولّق و خووی پشیلەکان وەکو خولّق و خووی ئەو کەسانە لێدەهات کە بەخێویان دەکردن. پشیلەکانیش کە بە بەردەمیدا تێپەڕیبوون نوقمی نێو شادمانی بوون. زەهرا بەخیلی بە پشیلەکان برد. خۆزگە ئێستا لێرە هەڵدەستا و دەچووە لای شەریفە خاتوون وەکو هەمیشە جاجمی لەگەڵ دەچنی. باوکی دەریای هەزار روخساری بینیبوو، هەزار جۆر رۆشنایی، هەزار جۆرە گوڵ، ئاسمانی بە هەزار شێوە بینیبوو و مەست بووبوو، جادووی لێکرابوو. ئەگەر تەنها جاجمی دەستچنی شەریفە خاتوونی بینیبوا ئەفسوون و مەست دەبوو، عەقڵی خۆی لەدەست دەدا. ئایا ئادەمیزاد دەتوانێت شتێك لەو بوونەوەرانەی خواوەند ئافراندوونی بئافرێنێت؟.

هەستا، سەیری ئاوە درەوشاوەو زولاڵەکەی کرد کە لەشێرەکە دەڕژایە خوار. ئەگەر ئاوا سەیری بکەیت ئەم ئاوەش هەزار رۆشنایی و نووری تێدا بەدی دەکرێت. باوکی ئاوابوو. خەریك بوو دەچووە لای شەریفە خاتوون کە قاچەکانی بەرەو ماڵەوەیان بردەوە. باوکی خەریك بوو بە جۆش و وروژانەوە قسەی لەگەڵ نەسیبەدا دەکرد. هەر لەگەڵ بیستنی چرپەی پێی زەهرا ئاوڕیدایەوە و سەیری کرد و گوتی:

"زەهرا چەند باش بوو هاتی، وەرە لای من دابنیشە، تۆش ببینە." کاغەزێکی پان و گەورە لەسەر مێزەکەیان کرابووەوە. سەیر بکە کچم، ئێرە کێڵگەکەمانە. ئێرە کۆشکێکی کۆنی لێبووە، هەرچەندە وەکو کۆشکەکەی کرێتی ئێمە نییە، لێ بۆ خۆی خانووێکی زۆر جوان و بەرچاوە."

کۆشکەکە و ئەوەی کە لەجێی ئەو کۆشکە چۆن کۆشکێك دروست دەکات، ئەو درەختەی کە کانیاوێکی لەبندا هەیە و رووبارێك بە ماسیەکانیەوە لەنێو دارزەیتوونەکاندا هاشە هاش

دەکات و دەڕژێتە نێو دەریا و بە کورتی هەرچی لە کێڵگەکە هەبوو بە هەموو وردەکاریەکانیەوە لەسەر کاغەزە سپیەکە نووسرابوون و وێنەیان کێشرابوو. باسکردنی لە کێڵگە و مرۆڤە خاکەڕاکانی ئەوێ و هەستی سەرسامبوونی بەوێ تەواو نەدەبوو. هەروەها ناوبانگی وەلی نیشانچی لەو دەڤەرە بێئەندازە بوو. بە وردی و بەوپەڕی ڕێك و پێکیەوە باسی رووداوەکەی گوندی عەلی چاوەش تۆپاڵی بۆ کردن و باسی ئەو یۆنانیانەی کە لەوێ رۆیشتبوون و ئەو کەسانەی هاتبوونە جێگای ئەوان و لە ماڵەکانیان نەدەهاتنەدەر و ئەوەی کە وەلی نیشانچی بووە لە ماوەی دوو رۆژدا ئەوانی لەماڵەکانیان هێنابووەدەر و هەمووانی سەرسام و واقوڕماو کردبوو، بە چەشنێك کە هەمووان وەکو زاهید و پیاو چاك سەیریان کردبوو. لە ماوەی دوو رۆژ ئەو گوندیانەی کە لە یۆنانەوە هاتبوون لە سایەی وەلی نیشانچی بووبوونە دۆست و برادەری دڵسۆزی یەکدی، وەلی نیشانچی بەشێوەیەك قسەی لەگەڵدا کردبوون و خستبوونیە نێو بازنەی جادووی خۆیەوە کە ئەو ئاوارانەی چەندین مانگ بوو لەماڵەکانیان نەهاتبوونەدەر و کەس نەیدەبینین، یەکسەر لەماڵەکانیان هاتبوونەدەر، هەموویان منداڵ و پیر و گەنج.

موسا ئاغا گەرم داهاتبوو، یەکڕیز قسەی دەکرد، لەلایەکی دیکەش باسی سەرسامی و ئەفسوونبوونی خۆیشی دەکرد.

نەسیبە خواردنێکی بە تامی کرێتی لێنابوو، ئەویش بەبێ یارمەتی ئەوانی دیکە. خواردنیش خواردنێکی تایبەتی کرێتی بوو.

موسا ئاغا دوای نانخواردن دیسان بە شادی و گەرم و گوڕیەوە گوتی: "کچەکانم، من دەچمە ماڵی پۆیرازی کوڕم، زوو دەگەڕێمەوە ئینشاللا نابمە مایەی زەحمەتی. لەسەر ڕێگای خۆم مەلەك خانمیش لەگەڵ خۆمدا دەبەم."

هەستا، چووە حەمامەکە، سابوونێکی زەردی بۆنداری هەڵگرت، زەهرا بەمەسینە ئاوی بەدەستان داکرد. کچەکە ئەو خاولیەی کە بەسەر شانیەوە بوو دایە باوکی، موسا ئاغا دەستەکانی وشك کردنەوە.

موسا ئاغا نەخشەی کێڵگە و دەوروبەرەکەی لەسەر مێز هەڵگرت، قەدی کرد، چووە دەرەوە، لەخوارەوە بانگی مەلەك خانمی کرد، مەلەك خانم لەگەڵ بیستنی دەنگی ئەو یەکسەر دابەزیە خوارەوە.

"مەلەك، مەلەك، مەلەك خانم، وەرە بزانە دەمەوێت باسی چیت بۆ بکەم و چیت نیشان بدەم، دەچینە ماڵی پۆیرازی کوڕم، ئەو، ئەو کێڵگەیەی بۆ پەیدا کردم. ئەمجارە سێ ڕۆژان لەوێ ماینەوە. منیش دانیشتم و بیرم کردەوە کێڵگەکە چۆن دروست بکەم، بۆیە نەخشەم بۆ کێشا." ئەو کاغەزەی بەدەستیەوە بوو نیشانیدا.

پۆیراز هەر کە ئەوانی لەبەردەم دەرگادا بینی یەکەمجار واقی وڕما، پاشان یەکسەر شادی دڵی داگرت:

"بەخێر بێن، سەفاتان هێنا، سەرفرازتان کردین ئاغا. فەرموون خانم، فەرموون ئاغا. بەخێرهاتن." جێگای نیشاندان. لێنا گوتی:

"چای ئامادەیە بەڕێزەکەم." ماوەیەك بە زمانی یۆنانی پێکەوە قسەیان کرد.

"چەندە باش بە یۆنانی قسان دەکەیت بەڕێزەکەم."

"تورکییەکەشیان زۆر باشە دایکە لێنا."

لێنا گوتی: "هەموو شتێکیان باشە."

بەخێرایی چووە ناندینەکە، یەکسەر چایەکە هات، وەکو ڕەنگی خوێنی کۆتر و لەنێو پیاڵەی کەمەرباریك و هەڵمی لێهەڵدەستا.

موسا ئاغا بێئۆقرانە لەکاتێکدا کە پیاڵەکەی بەدەستەوە گرتبوو، گوتی: "ئێمە سێ شەو و سێ ڕۆژ لەنێو بەهەشتێك بووین، زەوی و ئاسمان و هەموو جێگایەك بۆنی بەهاری دەدا. دەتگوت لەئاسمانەوە گوڵ ڕواون، لەسەرەوە بۆن و بەرامەی خۆشمان بەسەردا دەبارین. لەدەریاوە بۆنێکمان بۆ دەهات کە لەهیچ دەریایەکدا بۆنی وا پەیدا نابێت. بۆنێك بوو کە لەشی مرۆڤی نەرم و نۆڵ دەکرد."

دوای ئەوەی ئەو قسەو باسانەی کە بۆ کچەکانی کردبوون بۆ ئەوانیشی دووبارەکردنەوە، هاتە سەر بابەتی دیکەی وەکو ئاو و هەوا و ماسی و باڵندان. بەتام و چێژەوە باسی خەڵکەکەی کرد. سوڵتان موسا ئاغا باسی شتگەلێکی کرد کە پۆیراز زۆر لەوانی نەبینیبوو کەچی خولیاو ئەفسوونیان بووبوو. سوڵتان موسا ئاغا باسەکانی هێند جوان و وروژێنەرانە بوون کە مرۆڤیان شەیدا دەکرد. دیارە ئەفسوونبوون ئەمەیە. پۆیراز ڕۆچووبووە نێو قسەو وتە جوانەکانی موسا ئاغا و لە بەهەشتێکەوە دەفڕی بۆ بەهەشتێکی دیکە و دەڕۆیشت و دەگەڕایەوە. لەم ساتەدا دەرگاکە کرایەوەو ئوسوی دەنگبێژ هاتە ژوور:

"خەتای من نیە، بیرەدا رەت دەبووم کە قسەکانیم کەوتە بەر دڵ، لەسەر پلیکانەکان دانیشتم، ئەگەرچی هیچ یەك لە قسەکانی مام ئاغا تینەگەیشتم، بەڵام دیسان رۆچوونە نیو دڵم. عەبدالی زینکیی ئاوازخوینی ئیمەش ئاوابوو. ئەو سترانی بە زمانی کوردی دەچڕی، بەڵام تورك و فارس و چەرکەس و گۆرجی و بە کورتی لە حەفتاو دوو میللەت هەر کەسیك گویبیستیان بوا دەیتوانی تییانبگات. هەرکەسیك بیت دەتوانیت لە قسەکانی موسا ئاغا بگات. موسا ئاغا زمانەکەی نییە قسە دەکات، دڵیەتی قسان دەکات. باشە، ئاوازخوینە مەزنەکان وان، زمانیان نا بەڵکو دڵیان لەگەڵ مرۆڤدا قسان دەکات. ئەو قسانە حەفتاو دوو میللەتیش تییاندەگات."

لینا لە سینییەکی زیوین پینج پیاڵەی کەمەرباریکی چای هینان کە بۆن و بەرامەکەی ئەو ناو هۆڵەی پڕکردبوو. موسا ئاغا لەلایەکەوە چایەکەی دەخواردەوە، لەلایەکی دیکەش قسەی دەکردن و رووداو و بەسەرهاتەکانی دەگیڕانەوە. پۆیرازیش لە تەنیشتیەوە بوو. ئەوەی کە موسا ئاغا دەیگیڕایەوەو باسی دەکرد بینیبووی، بەڵام موسا ئاغا بەشیوەیەکی دیکە دەیگیڕانەوەو باسی دەکردن. بە چەشنیك کە مرۆڤ شەیدا دەبوو و تامەزرۆی ئەوەی دەکرد تەمەنیك لەویدا بژیت، بەڵام ئەگەر ئاوایە ئەدی بۆچی ئەو دەیەویت تەنها و تەنها لە کریتدا بژیت و دڵی تەنها هەر بۆ کریت لیدەدات و نایەویت لە هیچشوینیکی دیکە بیت.

موسا ئاغا دوای ماوەیەك قسەکردن، کاغەزیکی گەورەی کە لەسەر میزەکە بوو کردەوەو لەبەردەم خۆیدا پانی کردەوەو گوتی کە چۆن کۆشکیك لەنیو کیڵگەکە دروست دەکات، چ جۆرە گوڵیك لەنیو باخچە و چ درەختیك لەناو باخەکەیدا دەڕوینیت، لەنیو باخچەی کۆشکەکەدا چۆن چیمەن دەڕوینیت، تۆوی چیمەنەکە لە ئینگلستاندا دینیت، بۆ دروستکردنی میچی کۆشکەکە لەکوێ وەستاکارو دارتاشان و بۆ نەخشاندن و رازاندنەوەی دیوارەکان خۆشنووسان لە ئیران و هیندستان و عارەبستان دینیت و کۆشکەکە وادروست دەکات کە ببیتە ویردی سەر زاران. پاشان، باسی لەئەسپەکان کرد، باسی رەگەز و جۆری ئەسپەکان. لە جیگایەکی وا جواندا دەیویست ئەسپی عارەبی و ئینگلیزی وا جوان و رەسەن بەخیو بکات کە هەموو بەخیوکەرانی ئەسپ بە بینینیان لەسەرسامیان ئەنگوستیان بخەنە دەمیانەوە. دوای ئەو هەموو قسەو روونکردنەوانەشی گوتی ئەسپەکان جوانترین بوونەوەری سەر رووی زەوین. ئەوەشی بۆ زیاد کرد کە لە تەك هەر قارەمانیکدا ئەسپیکی پیرۆز و پیبەخیریش هەبووە کە ئەوی

پاراستووەو پشتیوانی لێکردووە. هیچکەس ناتوانێت بوراقی، ئەسپەکەی حەزرەتی محەمەد (دروودی خوای لێبێت) کە پێی چۆتە میعراج فەرامۆش بکات. ئەسپەکانی ئەسکەندەر، حەزرەتی عەلی (سەلامی خوای لێبێت) و کوێر ئۆغلۆ وەك خاوەنەکانیان بە جاویدی ماونەتەوە.

باسکردنی ئەسپەکان تا بەیانی بەردەوام بوو. موسا ئاغا ئەوەندە لە قسەکردن ماندوو بووبوو بەشێوەیەك کە هەندێك وشەی بەنیوە ناچڵی لەدەم دەردەچوون. بێدەنگ دەبوو، هەناسەی هەڵدەکێشاو درێژەی بە قسان دەدایەوە، هەر کە تیشکی خۆر دەرکەوت قسەکردنی ئەویش تەواوبوو... لە روخساری ماندوویدا شادی و ئازار و ترس بەدی دەکرا... کاغەزە گەورەکەی سەر مێزەکەی کۆکردەوە، هەستاو گوتی: "کاکە پۆیراز، کورِم، ئینشاللا کاك جەمیلی پزیشکی ئاژەڵان لێرەیە، سبەی دەبێت قسەی لەگەڵدا بکەم، دەمەوێت ببینم و هەموو تەوێڵەی بەخێوکردنی ئەسپەکانی ئەنەدۆڵ بگەڕێم و ئەسپەکانیان ببینم. وەك پزیشکی ئاژەڵان دەڵێت جوانترین ئەسپ لەلایەن خەڵکی چوکوراواوە بەخێودەکرێن. پزیشکی ئاژەڵان ئەسپان باش دەناسێت. مێژووی ئەسپەکانی ئاسیای ناوەڕاست و گەشەکردن و پەرەپێدانی کاری بەخێوکردنی ئەسپیش باش شارەزایە. ئەوکاتەی ئاشوورییەکان چوکوراوایان داگیر کردبوو نەداوای زێڕیان لە خەڵکی ئەوێ کردبوو نە هیچشتێکی گرانبەهای دیکە، تەنها سێ سەدو شەست سەر ئەسپی رەسەنیان لێداواکردبوون. دەمەوێت بچمە چوکوراواو تەوێڵەکانی ئەوێش ببینم. لە رحاش لەسەلاحەدینی ئەییوبییەوە بەدواوە ئەسپی رەسەنیان بەخێوکردووە. هەروەك کاك جەمیلی پزیشکی ئاژەڵان بۆی باسکردووم سەلاحەدینی ئەییوبی لە هەموو شوێنێك تەوێڵەی بەخێوکردنی ئەسپی هەبووە."

بەرەو پلیکانەکان رۆیشت، پۆیراز بە نیگەرانیەوە هەستایەوە، قۆڵی موسا ئاغای کە بەملاو ئەولادا دەکەوت گرت، قۆڵ بەقۆڵ لەپلیکانەکان چوونە خوار. مەلەك خانم بەدوای ئەواندا دەهات. پێکەوە چوونە سەرەوە. کچەکان هێشتا نەخەوتبوون و چاوەڕێی باوکیان بوون. هەرکە ئەوان گەیشتنە ژوورەوە کچەکان هەستان، ژێربالی باوکیان گرت، ئەویان بردەوە ژووری خەوتنەکەی. یەکسەر جلەکانیان گۆڕی و لەسەر تەختەوەکەی درێژیان کردو هاتنە دەرەوە، ئەوانی دیکەش هەروا لەوێ راوەستابوون.

"نافەرموون، دانانیشن، ناتانەوێت بەرچایی لەگەڵ ئێمەدا بکەن؟"

ئەمە نەسیبە پرسی، زەهرا هیچ دەنگی نەدەکرد. نیگای هەر لەسەر پۆیراز بوو، بەڵام پۆیراز وەك هەمیشە سەری دانەواندبوو و سەیری هیچ لایەکی نەدەکرد.

مەلەك خانم گوتی: "سوپاس کچەکانی خۆم، من دەبێت بچمەوە ماڵ. بەلەموانەکەم ئەگەر لەخەو هەستێت و ببینێت لەوێ نیم، نیگەران دەبێت، دەڵێت رەنگبێت شتێکم بەسەر هاتبێت. خوا حافیز."

لەگەڵ پۆیراز چووە دەرەوە، پۆیراز بە لێنای گوت: "دایکە چای دەمی کێشاوەو بۆنەکەی هەموو دوورگەی داگرتووە. من چایەکم دەوێت و بەرچاییەك. پەلە بکە، دەمەوێت بچمە دەرەوە."

لێنا بەرچاییەکەی خێرا خێرا ئامادە کرد، چایشی هێنا. پۆیراز بەرچایی زوو خواردو یەکسەریش چووە دەرێ. بە راکردنەوە خۆی گەیاندە ئاشەکە، سێ جار بە دەوری ئاشەکەدا سووڕایەوە، بەڵام تەنانەت جارێکیش نەیتوانی لەبەر دەرگای ئاشەکە رابوەستێت. ئەودەمەی لەئاشەکە بۆ نێو زەیتوونستانەکە دەگەڕایەوە تیشکێکی بچووکی خۆر بە دەرەوە بوو، سێبەری دەرختەکان ئەوەندە درێژ بووبووەوە کە تەنانەت بەردەلانەکەی پشت کانیاوەکەش لەنێو رۆشناییدا بەدی دەکرا.

پۆیراز تا کانییەکە چوو، پاشان چووە سەر بەردەڵانەکە، لەپێش بەردەنووسەکە دانیشت، پشتی بە بەردەکەوەدا، سەری دانەواند، بۆ ماوەیەك ئاوا مایەوە، پاشان لە پڕێك هەستا، بەرەو لای ئاشەکە رایکرد، لەکاتێکدا دڕکی دەوەنە دڕوەکان لە قاچەکانی رادەچوون چوو لەبەردەم ئاشەکە راوەستا. هەرچی کردی نەیتوانی لەدەرگای ئاشەکە نزیك ببێتەوە، پاشان هێزی دایە بەرخۆی و لە دەرگاکە نزیك بووەوە، گوێی بەدەرگاکەوە نا، بەڵکو دەنگێك لەناو ئاشەکە ببیستێت. ئاوا چاوەڕێ ما، چاوەڕێ ما، بەڵام هیچ دەنگێك لە ژوورەوە نەهات. دووبارە بەرەو زەیتوونستانە رایکرد، لەوێوە بۆ کانیەکە چوو، لە کانیەکەوە بەرەو بەردەڵانەکە، لە بەردەڵانەکەوە بەرەو بەردەنووسەکە و شانی بە بەردەنووسەکەوەدا، پاشان یەکسەر کەوتەوەڕێ، خۆی گەیاندەوە ئاشەکە. پاشان بێئەوەی لە هیچ جێگایەك بوەستێت لە ئاشەکەوە بەرەو لای بەردەنووسەکەوە چوو و گەڕایەوە. نیگای کەوتە سەر پەڕەسێلکەیەك کە لە پەنجەرەی ئاشەکە هاتەدەر و دووبارە گەڕایەوە نێو ئاشەکە. پەڕەسێلکە دەتگوت شێت بووە. بێڕاوەستان لە پەنجەرەکە دەچووە ژوورێ و دەهاتەدەر. پۆیراز لەوێ لەبەردەم پەنجەرەکە وەستابوو و چاوی

لەسەر پەڕەسێلکەکە هەڵنەدەگرت. تا ئێستا شتی وای نەبینیبوو. لە ماڵە گەورەکەیان لە ئوزون یایلا سێ هێلانە پەڕەسێلکە هەبوون. پەڕەسێلکەکان باڵندەی تیژباڵ بوون، بەڵام هەرگیز پەڕەسێلکەی ئاوا تیژباڵی نەبینیبوون. پەڕەسێلکەکە لەوکاتەی کە بەوپەڕی خێراییەوە لە پەنجەرەکە دەچووەوە ژوور پۆیرازیشی بەخێراییەکی زۆرەوە بەرەو لای دەرگاکە کێش کرد و دەرگاکە لە خۆیەوە کرایەوە، پۆیرازیش لەگەڵ پەڕەسێلکەکە چووە ژوورێ. زەهرای بینی کە لەسەر بەرداشەکە دانیشتووە، روخساری زەرد هەڵگەڕابوو. چاوە شین و گەشەکانی کردبوونەوەو بە شێوەیەك سەیری دەکرد وەك ئەوەی نەیناسێت. هەرجارێك پەڕەسێلکەکە دەچووە ژوورێ فەرخە پەڕەسێلکەکان پێکەوە سەریان لە هێلانەکەوە دەرهێنا، بە ملی درێژ و بێ پەڕو رووتیان و دەنووکە زەردە تەواو کرایەوەکانیان هەرایەکیان دەنایەوە ئەوسەری دیارنەبێت.

"پەڕەسێلکە، پەڕەسێلکەت بینی، سەیری فەرخەکان بکە، چ سەرو سەدایەکیان ناوەتەوە."

پۆیراز ئاگای لە قسەکانی خۆی نەبوو، چاوەڕێی وەڵامیش نەبوو. لە تەك زەهرا لەسەر بەرداشەکە دانیشت، نەیتوانی تەنانەت جارێکیش سەیری روخساری زەهرا بکات، سەری نەوی کرد و ئیدی نەیتوانی بەرزی بکاتەوە. ماوەیەك ئاوا بە بێدەنگی تێپەڕی. زەهرا سەیری دەکرد، بەڵام روخساری پۆیراز بچووکترین گۆڕانی بەسەر دانەدەهات.

وەکو هەمیشە بە حاڵەتێکی خەیاڵاوی، شەرمنانە و بە شێوەیەك کە وەك ئەوەی نەزانێت چیبکات، لەشوێنی خۆی رەقهەڵاتبوو و هەروا سەیری دەکرد. ماوەیەکی کەم دواتر، زەهرا کەمێك خۆی جووڵاند:

"من چیم لێکردوویت پۆیراز، من چیم لێکردوویت کە سەیری روخسارم ناکەیت؟ نەکا گرفتێکی دیکەت هەبێت؟ نەکا ژن یان دەستگیرانێکت هەبێت، بەمن بێژە تاکو منیش بزانم چیبکەم، چارەنووسی خۆم تێبگەم. ئەگەر بڵێم ژنت هەیە دروست نیە، چونکە نەیانتوانیوە کاتێك تەمەنت شازدە ساڵان بووەو لەخوێندنگەی سەربازی بوویت ژنت بۆ بێنن، ئەگەر دەستگیرانت هەبووبێت، تۆش وەکو پزیشکی ئاژەڵان بە هەمووانت دەگوت، تەنانەت ئەگەر بە کەسیشت نەگوتبوا بە ڤاسیلی و دایکە لێنات هەردەگوت، وەك چۆن هەموو شتێکت پێگوتن. هەموو ئەو شتانەی بەسەرت هاتوون، ئەوکارانەی کردوونت، ئەوەی کە چۆن گیانی خۆت لەساری قامیش قوتار کردووە، لە رحا لەگەڵ فەرەنسیەکان جەنگاویت، چۆن مەدالیای زێڕی قارەمانیی مستەفا کەمال پاشات وەرگرتووە، لە کۆمەڵکوژی ئەو خەڵکەی کە پێیاندەڵێن

ئێزدی، ئەوانەی کە خۆرو ئەهریمەن دەپەرستن، بەشداریت کردووە. پاشان پەلاماری هۆزە کۆچەریەکەت داوە..."

زەهرا هەر لەگەڵ ناوهێنانی ئێزدیەکان، سەیریکرد روخساری پۆیراز کە تا ئەودەم ئاسایی بوو لەپڕ زەرد زەرد هەڵگەڕا، پاشان سەری خۆی وەرسووڕاند و سەیرێکی زەهرای کرد، دەستە لەرزۆکەکانیشی لێککردنەوە، نەیدەزانی دەستەکانی لە کوێ دابنێت و چیانلێبکات. ماستەکە مووێکی تێدابوو. لەوێ بە بەردەوامی ئێزدیەکانیان کوشتووە، ئەوانیان دەکوشتن و پارەو هەرچی هەیانبوو دەیانبرد، رووت و قووتیان دەکردنەوە، پارەو سەعات و خشڵ و زێڕ و جەواهیراتی ژنەکانیان دەبرد و ئینجا دەیانکوشتن. ئەو قەل و داڵانەی لەسەر تەرمی کوژراوەکان دەنیشتنەوە بەخوێنی ئێزدیەکان سوور سوور دەبوون. تەرمی ئێزدیەکانیان، فڕێدەدایە نێو رووبارێکی گەورەکە ناوی رووباری فوراتە!هرا بە بەردەوامی باسی لە ئێزدییەکان دەکرد و پۆیراز هەر جارێك گوێی لەناوی ئێزدییەکان دەبوو ترس دایدەگرت و هەموو جارێکیش بەدڵەڕاوکێوە سەیری زەهرای دەکرد. زەهرا بیری کردەوە، پێدەچێت پۆیراز سەرو کارێکی لەگەڵ ئێزدییەکاندا هەبێت، ئایا کچێك لەنێو ئەواندا هەبووە ئەو خۆشیویستبێت و عاشقی بووبێت، ئایا ئێزدیەکان ئەویان لەگەڵ خۆیان بردبێتە چیا، یان لەبەر چاوی پۆیرازدا رووتیان کردبێتەوەو کوشتبێتیان و فڕێیان دابێتە نێو ئاواوە؟ ئایا دەبێت هەموو شتێکی بە باوکی گوتبێت تەنها ئەم باسەی پێنەگوتبێت؟ ئایا ڤاسیلی ئەمانە دەزانێت؟ نەکا پۆیراز لەخۆشەویستی ئەو ماندوو بووبێت؟ ئەدی ئەگەر وایە بۆچی شەوان تا بەیانی لەژێر باران و لەنێو دەریا و بە بەردەمی ماڵی ئەواندا دەخولێتەوە، ئەگەر ئەم عیشقە عیشقێکی ئاگرین نەبێت دەبێت چیبێت، یاری بووبێت؟ ئایا لەبەر بوونی منداڵ بووبێت؟.

"هەموو شتێك دەزانم، تۆم خۆشدەوێت، ئەگەر تۆ نەبیت، منیش نامەوێت بژیم، ئەگەر سبەی هەواڵمان بۆ بێت کە دەتوانین بگەڕێینەوە کرێت، تۆمان لەگەڵدا نەهێیت، منیش لێرە لەگەڵ تۆدا دەمێنمەوە، ئەگەر نەمێنمەوە دەمرم. پێمبڵێ، تۆ عاشقی کچە ئێزدیەکەیت؟"

بێدەنگ بوو، ماوەیەکی درێژ سەیری روخساری ئەوی کرد، سیمای حاڵەتێکی داماونە و بەزەییئامێزی بەخۆوە گرتبوو.

"نەکا وابیر بکەیتەوە کە ئەگەر منداڵم ببێت لە چوونەوە بۆ کرێت نائومێد دەبم و خۆم دەکوژم، باوکم زۆر دەمێکە لە چوونەوە بۆ کرێت پەشیمان بۆتەوە. وا باسی کێڵگەی

بەخێوکردنی ئەسپانی کرد کە دەتگوت خوا تەنها یەك بەهەشتی ئافراندووە، ئەویش ئەوێیە، چەند باش بوو کە ئەوێی کڕی. باوکم لەوێ وەك جادووی لێکرابێت وایە، دامنا جادووشی لێکرابێت و بشکەڕێتەوە کرێت، من لە خوێندنگەی ئینگلیزەکاندا دەرسم خوێندووە. لەوێ بە ئێمەیان..." تەریق بووەوە، بێدەنگ بوو، "لەوێ ئێمەیان فێری ئەوە کرد کە چۆن پێش لە منداڵبوون بگرین. مەترسە منداڵمان نابێت." عارەقەی کرد، گۆناکانی سوور سوور هەڵگەڕان، بێدەنگ بوو، کەمێك دواتر دیسان کەوتەوە قسان: "هیچ مەترسە، کەس لەم دوورگەیە سەبارەت بە پەیوەندیی ئێمە هیچ بە باوکم ناڵێت. ئیدی نابێت، تەنانەت ئەگەر منداڵیشمان ببێت، باوکم ئەمە نازانێت."

لەم کاتەدا لەلای سەرەوە جیکەجیکی فەرخە پەڕەسێلکەکان بەرزبووەوە، هێلانەکە لە گۆشەی لای سەرەوەی پلیکانەکە بوو، هەر پێنج فەرخە پەڕەسێلکەکان سەریان لە هێلانەکە هێنابووەدەرو بە دەنووکە کراوەکەیان جیکەجیکیان دەکرد، پێستی ملی رووتیان... پۆیراز کە هەستابوو و سەیری فەرخە پەڕەسێلکەکانی دەکرد بەسەر بەرداشەکەدا کەوت. دەنکە گەنمی زۆر دەمێك پێشتر هەر لەسەر بەرداشەکە بەجێمابوون. پۆیراز بە روخسارێکی کە دیار نەبوو تووڕەیە یان خەمگین یاخود عاشقە سەیری زەهرای کرد، زەهرا بە زەردەخەنەوە گوتی: "ئێزدیەکان بۆ پاراستنی گیانیان پەنایان بۆ چیاکان..."

پۆیراز هەستایەوە، لێوو روخساری شین هەڵگەڕابوون. زەردەخەنەکەی زەهرا لەسەر لێوانیەوە وشك بوو. پۆیراز دەتگوت دەوروبەری خۆی نابینێت، بە دەستەکانی بەدوای دەرگای ئاشەکە دەگەڕا، سەرەنجام دەرگای دۆزیەوە، دەرگای کردەوە، بەلەتردان چووە دەرەوە، زەهرا هێز و توانای جووڵە و هەستانی نەبوو، تا هەوا تاریك داهات نەیتوانی لەشوێنی خۆی هەستێت، تا ئەودەمەی کە نەسیبە نیگەرانی بوو و بەدوایداهات.

نەسیبە گوتی: "زوو هەستە زەهرا، بابە لە نیگەرانیان خەریکە دەمرێت، هەر لەتۆ دەپرسێت. منیش پێمدەگوت لای شەریفە خاتوونەوە و پێکەوە جاجم دەچنن. بە تووڕەییەوە گوتی بڕۆ بیهێنەوە، خۆ تا نیوەشەو ناکرێت هەر جاجم بچنن. منیش بەلەز هاتم، چیبوو؟"

"هیچ، هیچ نەبوو. هەر سەیری هێلانەی ئەم پەڕەسێلکانەی دەکرد."

رێك لەم ساتەدا داکانەی پەڕەسێلکەکان لە پەنجەرەکەوە هاتەوە ژوور، لە سەرەوە جاكوجیکی فەرخەکان بەرزبووەوە. نەسیبە سەری هەڵبڕی و سەیرێکی هێلانەکەی کرد:

"دەنووکیان زەردو گەورەیە، هەمووشیان دەنووکە گەورەکانیان کردۆتەوە، دەنووکە زەردەکەیان. چ هەرایەکیشیان ناوەتەوە. ملیان درێژ کردووە، ملی رووتیان، تیکە گۆشتێکی درێژووکانە."

نەسیبە بازووی زەهرای گرت، لەسەر بەردەکە بەرزی کردەوەو پێیگوت: "سەیرکە زەهرا، دەنکە گەنمەکانی سەر بەرداشەکە سەیرکە. خوا دەزانێت لە کەیەکەوە لێرەن. پەروانەی ئاشەکە دەخولێتەوە، لەگەڵ ئەوەیدا کە نیوەی کەتانی یەکێك لە پەروانەکانیش دڕاوە، هێشتاش دەخولێتەوە."

چوونە دەرەوە. هەوا خەریك بوو تاریك دادەهات. نەسیبە دەستی خستبووە قۆڵی زەهرا. بە هەنگاوی هێمنانە هاتنەوە ماڵەوە، موسا ئاغا بە جۆش و شادمانیەوە کچەکانی گرتە ئامێز: "زۆر کارت کرد کچەکەم؟ زۆر ماندوو بوویت؟"

نەسیبە کە تێگەیشتبوو. زەهرا ناتوانێت قسان بکات یان قسەکردن سەختە بۆی، گوتی: "بابا، بەزەحمەت لە پەنا دارتەونەکەم دەرهێناوە. مەلەك خانم بە دارتەون دەڵێت دار مافوور. جاجم و کلیمی هێندە جوان دەچنێت کە هەر کەسێك بیانبینێت ناتوانێت دەستیان لێهەڵبگرێت. شەریفە خاتوون و زەهراشم ئەگەر هەڵنەستاندبوان نەیاندەتوانی لە شوێنی خۆیان هەستن، هەردووکیانم لە پشت دارتەونەکە هەستاندن. ئەگەر من نەچووبوام رەنگ بوو هەروا لە پشت دار تەونەکە وشك هەڵاتبوان و نەیانتوانیبوا هەستنەوە. لە جاجمەکە رامابوون کە چنیبوویان و نەدەجووڵان. هەم ماندوو بووبوون، هەم جاجم و هەم فەرخە پەڕەسێلکە رووت و بێپەڕ و باڵەکان جادوویان لێکردبوون. ئێستا من، (پێکەنی) زەهرا و شەریفە خاتوونی جادوولێکراوم لەو شوێنە هەستاندن. ئێستا زەهرا دەبەمەوە سەر جێگای خۆی، ئەوەندە ماندووە کە بە پێوە خەوی لێدەکەوێت. هەر لەخەو هەستا ئەوسا خواردنەکەی..."

"جاجمەکانی شەریفە خاتوون نەك هەر زەهرا بەڵکو من و تۆ و هەموو کەسێك ئاوا سەرسام و هێدمەگرتوو دەکەن. رەنگەکانیان هێندە جوانن کە مرۆڤ دەتاسێنن، وەك جادووت لێبکەن ئاوا. بیبە بیخەوێنە، وەرەوە نانەکەمان بخۆین."

پۆیراز کە بەلەتردانو سەرەنگریێ لە ئاشەکە چووبووەدەر و فەرخە پەڕەسێکەکان گوێیان کاس کردبوو و سەدان پەڕەسێلکەش هەراو جاكو جیکێکیان نابووەوە مەپرسە. پۆیراز نەیزانی چۆن لەنێو ئەو سەرو سەداو جاكو جیکەی پەڕەسێلکەکان چۆتەوە ماڵ و چۆن جلەکانی گۆڕین

و چۆتە نێو جێگاوە. لێنا هیچشتێك لەو حاڵ و رەوشەی ئەو تێنەگەیشتبوو، لەنێو ئەو سەرو سەداو جاك و جیکەدا، لە بەرزایی دارئەسپینداریێك شەهێنێك بەسەر سەری پۆیرازدا دەفڕی و شاپەڕەکانی تەواو لێککردبوونەوە. کە پۆیراز گەیشتەوە ماڵێ و چووە ژوورەوە شەهێنەکەش بەرەو سەرەوەو هەر لەسەر ئاسمانی ماڵێدا درێژەی بە خولانەوەو فڕینەکەیدا و سینگیشی دایە ئەو بایە کە لە باشوورەوە هەڵیکردبوو.

پۆیراز لەنێو جێدا دەمنادەمێك بەدەم ناڵەوە خۆی وەردەسووڕاند، هەڵۆ سوورەکان بەدەم خشەخشکردنەوە وەکو تۆپەڵێك ئاگر دادەبەزینە سەر لمی لێوار زێی گەورە، کە لەزەوی نزیك دەبوونەوە باڵە پان و پەڕەکانیان دەکردنەوەو لەسەر چەولمەکان هەڵدەبزینەوە. هەڵۆی سوور تا سیوادی بەیانی لەسەر لمی لێوارەکانی فورات دەنیشتنەوەو ئەو بیابانە بەهەڵۆی سوور دادەپۆشرا. بلێسەی سوور بێپسانەوە لەئاسمانڕا دادەڕژانە سەر بیابان، خۆر هەر لە شوێنی هەمیشەیی خۆی بوو و تەکانی نەدەدایە خۆی. لەئاسمانەوە لێکدا لێکدا هەڵۆی زەرد بە ورشە ورشەوە شۆڕدەبوونەوەو پێکدا هەڵدەپژان و وا بەدەنووك و چڕنووکەکانیان پەلاماری یەکدیان دەدا کە هەندێکیان پەڕو باڵیان دەردەهات و باڵیان بە تەرۆکیانەوە دادەکەوت و هەندێکی دیکەیان چاویان دەردەهات، بەرەبەیان بوو پۆیراز بە هاوارکردنەوە لەخەو راپەڕی و بە چاوانی بێهەستیەوە لەدەوروبەری خۆی راما. لێنا تا بەیانی نەنووستبوو، کورسییێکی لەتەك تەختەخەوی ئەو دانابوو و خۆی گرمۆڵە کردبوو.

لێنا گوتی: "کوڕەکەم چیبوو؟" و هەستایەوە و چووە بان سەری پۆیراز. پۆیراز شەلاڵی ئارەقە بووبوو.

پۆیراز ئەودەمەی سەری دادەنایەوە سەر بالیف، لێنا گوتی: "رۆڵەگیان تۆ نەخۆشیت؟ بچم دکتۆرەکان بێنم؟ ها، چیدەڵێیت؟"

دەستی دانایە سەر نێوچاوانی ئارەقەداگرتووی پۆیراز:

"کوڕەکەم هەموو گیانت ئارەقەیە، هەموو گیانت تەڕ بووە. دەتەوێت بچمە لای دکتۆرەکان؟" لێنا ئەوەندە ئەم قسانەی دووبارەو دووبارەکردنەوە کە پۆیراز سەری لەسەر بالیفەکە هەڵبڕی و گوتی:

"دایکە، من هیچم نیە، لێمبگەڕێ بابنووم. هەڵۆکان، هەڵۆ سوورەکان."

ئەو رۆژە بەیانی وەك ئەوەی هیچشتێك روونەدابێت زەهرا زوو لەخەو هەستا، چووە گەرماوەکە، سەرو پرچی خۆی شانەکرد، ددانەکانی بە فڵچە پاککردنەوە، قسەی لەگەڵ نەسیبە کرد. باوکیان زۆر دەمێك بوو هەستابوو. لەسەر کورسی لەبەردەم پەنجەرەدا دانیشتبوو و سەیری دەریای شەپۆڵهەڵگرتووی دەکرد.

"سەیرکە نەسیبە، ئێستا کاتی خۆیەتی، ماوەیەکە نە هەواڵێك لەئەستەنبۆڵەوە هاتووەو نە لەهیچ جێگایەکی دیکە، بابە نیگەران دەبێت. دوو رۆژ جارێك سێ رۆژ جارێك بەستەزمانە قەدریی بەلەموان دێتە ئێرە، هەر بەلەموان قاچی خستە ژووری بابە لەجێی خۆی هەڵدەستێت، بە وروژانەوە دەڵێت ئینشاللا هەواڵێکی خۆشت هێناوە قەدریی بەلەموان. قەدری بە کەساسی و خەمناکیەوە سەری نەوی دەکات و دەڵێت نەخێر قوربان. بابە ئەبرۆی تێکدەنێت و دەڵێت واتە هیچشتێك؟ و حاڵی تێکدەچێت و لەسەر کورسی دادەنیشێت، دەمی دەکاتەوەو دایدەخاتەوە بە چەشنێك تۆ دەڵێی هەوزینگان دەکات و خەریکە دەمرێت. ئێستا دەمێکیشە قەدریی بەلەموان نەهاتووە. ئەم بەیانیەش تەواو تێکچووە، زۆری نەماوە باڵ بگرێت و بفڕێت. ئێستا کاتی خۆیەتی."

نەسیبە گوتی: "ئێستا کاتی خۆیەتی."

"بەڵکو لێشبگەڕێت باولەکانمان بکەینەوە."

نەسیبە گوتی: "لێدەگەڕێت، بۆ لێنەگەڕێت، خۆ تازە ئیدی ناگەڕێینەوە کرێت. بابە ئیدی بێهیوا بووە، بۆیە تەنها باسی کێڵگەکەی ئێرە دەکات و هیچشتێکی دیکە نالێت. باولەکانمان بکەینەوەو جلوبەرگە رێكو پێکەکانمان بکەینەبەر. هەریەکەو دوو دەستە جلوبەرگمان هەن."

"ئەوانیش کۆن بوونە، وەکو قەرەجانمان لێهاتووە."

"بابە بەکردنەوەی باولەکانمان رازی دەبێت."

"دەزانم. تەنها تۆ ئەمەی پێبڵێ."

"من ناتوانم پێیبڵێم زەهرا، تۆ خوشکی گەورەتریت، خۆت پێیبڵێ."

"من پێیدەڵێم، بەڵام نابێت، کێشەی پۆیراز لە گۆڕێیە."

"بابە بەمە نازانێت."

"ئەو هەموو شتێك دەزانێت، بە چاوترووكاندنێك هەمو شتێك تێدەگات. ئەو لەهەنگاوهەڵێنان و شێوەی سەیرکردن لە هەموو شتێك دەگات. بەردەوام بەپۆیراز دەڵێت دەبێت لەگەڵ ئێمە بێیتە کرێت، مەگەر تۆ خۆت چەندجار لەدەمی خۆیت نەبیستووە؟"

نەسیبە گوتی: "بیستوومە. بیستوومە وەلـێ گوایە ئەگەر پۆیراز لێرە بمێنێتەوە دێن و دەیکوژن. لەکرێت کێ دەتوانێت بیکوژێت؟"

"لەکرێت کەس ناتوانێت بیکوژێت بەلـێ بابە لەبەر ئەوەی کە خۆشیدەوێت و نایەوێت بکوژرێت دەیەوێت لەگەڵ خۆیدا بیباتە کرێت."

"مەگەر ئێمە پێکەوە نەبووین کە بابە ئەمەی گوت؟"

"راستە، بیستم، بەڵام ئەو بە پەیوەندیی نێوان من و پۆیراز دەزانێت. من ناتوانم پێیبڵێم. ئەگەر من ئەمەی پێبڵێم وایلێکدەداتەوە کە دەمەوێت لەگەڵ پۆیراز لێرە بمێنمەوە. مەگەر دایکە ئەستەنبۆڵیەکەی ئێمەش کاتێك کەوتۆتە داوی ئەڤینی باوکمان کەسوکار و خێزانی خۆی جێنەهێلاوەو نەهاتۆتە کرێت؟ ئەگەر نەمردبوا لەگەڵ ئێمە نەدەگەڕایەوە کرێت؟"

"دەگەڕایەوە."

"کەوایە تۆ بە بابە بڵێ دەمانەوێت باولەکانمان بکەینەوە، پێیبلێ، جلوبەرگمان نەماوە."

ئەو مشتومڕە تا بەرەبەیان بەردەوام بوو، دواجار نەسیبە قبوڵی کرد بە باوکی بڵێت. باوکیان هێشتا لەهەمان حاڵەتی هێدمەو تاساندا بوو. بێئەندازەش نەرم و نیان بوو. هیچکات باوکی خۆیان ئەوەندە تژی میهرو خۆشەویستی نەبینیبوو. ئەو بە چەشنێك بوو کە عەشق لەهەموو گیانی دادەچۆڕا. دیاربوو کە باولەکان دەکەنەوەو جوانترین جلوبەرگەکانیان دەپۆشن. لەئەسیناش کچانی ئاوا شیکپۆش بەدی ناکرێن. هەردوو کچەکە لەئەسینا لەخوێندنگەی ئینگلیزەکان دەرسیان خوێندبوو. هەمیشە شارەزاترین بەرگدرووی ئەسینا جلوبەرگی بۆ دووریبوون، ئەگەر باوکیان بە کردنەوەی باولەکانیان رازی بێت، زەهرا جوانترین جلوبەرگی خۆی دەپۆشێت و دەچێتە لای پۆیراز. نەسیبە ئەمەی دەزانی، بەڵام باوکی خۆیشی دەناسی. باوکیان هەرچەندەش رەفتاری نەرم و نیان بێت و هەرچەند میهرەبان و کەیلی سۆزو خۆشەویستی بێت، دواجار وەك هەمیشە، باوکی ئەوانە.

موسا کازم ئاغا لەسەر ئەو کورسییە نەرم و نۆڵە دانیشتبوو و سەیری دەریای دەکردو دەگژ فکران رۆچووبوو.

"باوکە!"

((چییە کچم.))

"باوکە، من و زەهرا پێکەوە قسەمان کرد، دەمانەوێت باولەکان بکەینەوە. تۆ ئێرەت زۆر پێخۆشە. ئێرە تۆی مەفتوون کردووە. لەهیچ جێگایەکیش نە هەواڵێکت بۆ هاتووەو نە نامەیەك. جلەکانی ئێمەش تەواو کۆن بوونە و رەنگیان پێوە نەماوە. نازانین چیبکەین، ئەگەر دەتەوێت لێرە بمێنینەوە، رێگە بدەن باولەکان بکەینەوە."

موسا ئاغا ماوەیەکی درێژ لەبەرامبەر نەسیبە بێدەنگ بوو و لێوی لێکنەکردنەوە، بووبووە بەرد و چاوی لە دەریا نزکردبووەنەوە.

"باوکە..."

درێژەی بە قسەکانیدا. ئێستا کە دەیانەویست لێرە بمێننەوە، دەبوا کێڵگەکە لەکێڵگەی کرێت جوانتر بوایە. زەهرا و خودی ئەویش خەڵکی دوورگەکەیان کەوتبووە بەر دڵ، ئەدی چما نابێت باولەکان بکەنەوە.

"بابە، قسە بکە."

موسا ئاغا وەکو بەردی لێهاتبوو و نەیدەتوانی دەمی لێکبکاتەوە.

"باوکە شتێك بڵێ."

زەهرا کە لە رۆخ دەرگاکە لەسەر کورسیەك دانیشتبوو و لەنێو خۆیدا خڕ بووبووەوە گوتی:

"باوکە بەقوربانت بم قسەیەك بکە. تۆ هەرچی بڵێیت ئێمە بەگوێت دەکەین. تەنها قسەیەك بکە."

موسا ئاغا ئارام ئارام سەری خۆی بۆ لای هەردووکیان وەرسووڕاند:

"مەگەر ئەوکاتەی دایکتان هێشتا زیندوو بوو ئێمە هەرچوارمان بەدرێژی قسەمان نەکرد، مەگەر نەمانگوت تا ئەو کاتەی نەگەڕێینەوە کرێت نابێت ئەم باولانە بکرێنەوە؟ ئەگەر خۆتان دەتانەوێت، باولەکان بکەنەوە، یەکەمجار باولەکەی دایکتان بکەنەوە. هەرچی هەیەتی و نییەتی... قسەی من ئەمەیە. چۆنی پێتانخۆشە."

هەستا، بەرەو دەرگا رۆیشت. کچەکان چوون رێگەیان لێگرت.

"ئێمە بیرمان کردەوە تۆ چونکە زۆر لێرە خۆشت هاتووە..."

"من لێرە نامێنمەوە، ئەگەر ڕۆژێکم لەتەمەندا مابێت ڕێگایەك دەدۆزمەوەو دەگەڕێمەوە کرێت. وەسیەتم بۆ ئێوە ئەمەیە ئەگەر لێرە مردم تەرمەکەم ببەنەوە بۆ وڵاتی خۆم، بۆ کرێت. ئەگەر ئێوە نەتانتوانی لەتورکیا بڕۆنەدەر کاکە پۆیراز، کوڕەکەمان ئەفسەرە، ئەویش ئەفسەرێکی خاوەن مەدالیای سەربەخۆیی. با تەرمەکەم هەڵبگرێت و بیباتە کێڵگەکەمان، لەوێ لە تەك گۆڕی باوك و دایکمدا بمنێژێت. پارەکەشم هەموو لانییە، لەژێرەوەی باولی من و دایکتانە. بنەوەی باولەکە دوو بەشە، زێڕەکان لەنێو پەمۆکانی نێوان هەردوو لای تەختەی باولەکەن. لەنێو باولی ئێوەشدا زێڕ هەیە. هەموو ئەم قسانەتان بیستم و تێبیگەیشتن، بەهیچشێوەیەك دڵگران مەبن کە ڕەنگە لێرە بمرم. لەماوەی چەند ساڵی داهاتوودا ڕێگایەك دەدۆزمەوە کە بتوانم بگەڕێمەوە کرێت. بەڵکو سبەی یان ئەم هەفتەیەی دادێت دەروێك ببێتەوە. ئامادەبن دەمەوێت پێکەوە بچینە ئەستەنبۆڵ. لای ناسراوترین بەرگدرووی ئەستەنبۆڵ، دەمەوێت جلوبەرگی تازەتان بۆ بە ڕادان بدەم، پێویست ناکات باولەکانتان بکەنەوە."

کچەکان تاسا بوون. باوکیان نە هاواری بەسەردا کردبوون و نە تووڕە بووبوو. ئارام و خوێنسەرد بوو.

زەهرا گوتی: "زۆر باشە بابە."

نەسیبە گوتی: "زۆر باشە بابە."

لە باوکیان دوورکەوتنەوە.

"ئێمە تا دەمرین باولەکان ناکەینەوە."

ئەودەمەی لە پلیکانەکان دەچوونە خوار باوکیان ئاوڕی لێدانەوەو گوتی:

"ئەستەنبۆڵ شارێکی جوانە، چەند باشە کە ئێمە پێکەوە پایتەختی عوسمانی و بیزانس و ڕۆم دەبینین."

کچەکان هەریەکەو لەلایەك گوتیان:

"چەند باشە بابە، سوپاس بابە."

دوای ڕۆیشتنی باوکیان، کچەکان لەسەر کورسی بەرامبەر یەکدی دانیشتن.

نەسیبە گوتی:

"بۆم باس بکە، دوێنێ شەو وەکو مردوان بوویت، نەتدەتوانی لەشوێنی خۆت هەستیتەوە."

"هیچشتێك نییە باسی بکەم، دەزانیت کە من زۆر زوو چوومە ئاشەکە، وامدەزانی ئەو زووتر لەمن دێتە ئەوێ. گەیشتمە ئەوێ سەیرمکرد نەهاتووە. لەسەر بەرداشەکە دانیشتم و چاوەڕێم کرد. هەوا رووناك داهات، خۆر لەکەل هاتەدەر، مەلانی نزیك نیوەڕۆ تێیانچریکاند. چاوەڕێم کرد، لە چاوەڕوانیان خەریك بووم دەمردم. وەکو کەوانێك وابووم کە کشرابێت. لەپڕێکدا دەرگاکە کرایەوە، ئەو بە لەرزینەوە هاتە ژوورەوە، وەکو هەمیشە سەیری روخساری نەدەکردم. لەتەنیشتمدا لەسەر بەرداشەکە دانیشت. چەند دەنکە گەنمێك لەسەر بەرداشەکە بوون، ئاوڕی دایەوەو سەیری دەنکە گەنمەکانی کردو ژماردنی. فەرخە پەڕەسێلکەکان کە دایکیان دەهاتەوە دەیانکردە جاكو جیکێك ئەو سەری دیار نەبوو، ئەویش ئاوڕی لێدەدانەوەو سەیری دەکردن و هەر جارێك کە سەیری دەکردن روخساری شین دادەگەڕا. پاشانیش هەستا، بە دەستکوتان دەرگای ئاشتی دۆزیەوە."

"ئەو کێشەیەکی دیکەی هەیە کە پەیوەندیی بە تۆوە نییە مەترسە، رۆژێك بۆت روون دەکاتەوە، دوای ئەوەی ئیدی هەموو شتێك تەواو دەبێت، تۆ نیگەران مەبە، تێگەیشتیت؟ ئەو وەکو شێتان تۆی خۆشدەوێت."

"بەڕاستتە نەسیبە؟ کێشەکەی خۆی بەمن دەڵێت؟"

"چارەیەکی دیکەی نییە. رۆژێك بۆت روون دەکاتەوە، ئینجا دوای ئەوە هەموو شتێك چارەسەر دەبێت. بە بڕوای من بابە دەردو کێشەی ئەو دەزانێت. ئەویش ناتوانێت بە بابەو کەسانی دیکەش بڵێت، دواجار هەر بەتۆی دەڵێت، دوای ئەوە هیچ کێشەیەك نامێنێت."

"منیش هەمیشە لەخوا دەپاڕێمەوە کە مۆڵەتی گەڕانەوە بە بابە بدەن و بگەڕێینەوە. پۆیرازیش خۆشحاڵ دەبێت بهێتە کرێت."

## بەشی پێنجەم

ئەفە خەنجەرلی لەیەکێك لەخانووە هەرە جوانەکانی دوورگە نیشتەجێ بووبوو. هیچ یەك لەخەڵکی دوورگە لەدۆستایەتی و رێزگرتنی ئەو تەقسیریان نەدەکرد. ئەو لەچیای خوارەوە هاتبوو، ژمارەیەك پیاوی چەکداری لەدەوری خۆی کۆکردنەوە، لەگەڵ دەستەکەیدا یەکەمین کەس بوون کە رووبەڕووی یۆنانییەکان بوونەوەو وەکو ئەفە دەمیرچی نەبوو جیاوازی بە تاوانبار

و بێتاوان نەکات، کە قسەی دەکرد هەر ئەو بیرەوەریانەی خۆی لەبارەی چیاو خۆڕاگرتن لە بەرامبەر یۆنانییەکان دەگێڕانەوە. لەوە بترازێت هەمیشە بێدەنگ بوو. کە وەقسە دەهات هەموان پێیان سەیر دەبوو. هەموان دەیانزانی کە ئەو پۆیرازی خۆشدەویست و لەبەر خاتری ئەو متمانەیەی بەوی هەیە ژن و منداڵەکانی هێناوەتە دوورگە. هەندێکجار دەیانبینی بە تفەنگەوە لە دەوری ماڵی پۆیراز دەسووڕێتەوەو دەیەوێت پارێزگاری لێبکات. لە جەنگی سەربەخۆییشدا، بە هەمانشێوە، بە خاکەڕایی و بەبێهیچ خۆنواندنێك دژی یۆنانییەکان جەنگابوو و لەکۆتایی جەنگیشدا خۆی دەرنەخستبوو. سەرەنجام، ئەم دوورگەیەی دۆزیبووەوەو لەگەڵ پۆیراز و موسا ئاشنا بووبوو و بیری کردبووەوە دوورگەکە بچووکە و لە رووی ئەمنیەوە شوێنی گونجاو نییە، بەڵام هەرچۆنێك بووە رۆژێك ژن و منداڵەکانی هەڵدەگرێت و گەڕاوەتەوە دوورگە. هێشتا گەنج بوو، هیچ کارێکی نەدەزانی نە ماسیگری دەزانی و نە کێڵگەداری. سەری لەهونەرو پیشەیەکیش دەرنەدەچوو. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك پاشەکەوتی کردبوو و بەو بڕە پاشەکەوتەی، ڤاسیلی خانووێکی بۆ پەیدا کردبوو بە مافوور، جاجم، کورسی و مۆبلی بە مەخمەڵ رووپۆشکراو و رازێندرابووەوە. جلوبەرگی جوان و پاك و خاوێنی بۆ ژن و منداڵەکانی دابین دەکردو دەیکردنە بەریان. کە خانووەکەی کڕیبوو داوای لەپۆیراز کردبوو یارمەتی بدات، بەڵام کیسەی پارەی پۆیرازی بەدەستی چەپ کشاندبووەوە پێش پۆیراز و پارەی لەکیسەکەی خۆی دەرهێنابوو و داینابووە بەردەم وەهاب بەگ. ئەفە خەنجەرلی نەیدەزانی دوای ئەمە دەبێت چیبکات، نەخۆی دەیزانی و نە هیچکەسی دیکەش. دکتۆرەکان بڕیاریاندابوو ئەو خوێندنگەیەی کە لەپاش یۆنانییەکان بەجێمابوو بخەنەوە کار و بیکەنەوە. لەئێستاوە سەردانی والیگەریان لەئەنقەرە کردبوو، ئاشناکانی خۆیان ئەوانەی گەلیبۆلۆ و ئەفسەرانی دێرین کە هاوڕێی سەردەمی جەنگیان بوون و ئێستا بووبوونە نوێنەری ئەنجوومەن بۆ یارمەتیدانیان بانگهێشتی دوورگەیان کردبوون و نەخشەو چۆنیەتی دروستکردن و خستنەوەگەڕی خوێندنگەکەیان بۆ روون کردبوونەوە. بڕیاریان ئەوە بوو کە بەیارمەتی ئەوان منداڵەکان قۆناغە باڵاکانی خوێندن ببڕن. ئەفە خەنجەرلیش بڕیاری دابوو کە منداڵەکانی خۆی بنێرێتە ئەو خوێندنگەیە.

ئەفە کارێکیشی بۆ خۆی لەبەرچاو گرتبوو. نیازی وابوو لەو زەویە هەموارەی کە لەبن گردەکەوە تا دۆڵی دارزەیتوونەکان درێژ بووبووەوە کشتوکاڵ بکات. لە جۆخینەکانڕا دیاربوو

یۆنانییەکان لەو شوێنە کشتوکاڵیان کردوە. هەندێك بەروبوومی دروێنەکراو لەو گۆڕە بەجێمابوو و هەڵنەگیرابووەوەو لەنێو باقەبێن و مەڵۆی پەرش و بڵاوبووەوە پەڵە پەڵەی سەوزایی بەدی دەکران. نۆ دانە جۆخین لەو زەویە هەموار و تەختانییە هەبوون. ئەفە خەنجەرلی دەیتوانی لەو زەویە کاکی بە کاکییە پارچە زەوییێك لەدەوڵەت بکڕێت. هەروەها لەو زەویانەی کە پڕ بوون لە دارزەیتوون، زەوییێك کە هی یۆنانییەکان بوو و زۆرترین دارزەیتوونی تێدابوون بکڕێت. ئەگەر دارزەیتوونەکانی یەك کەس بەشی نەکردبوان دەیتوانی دارزەیتوونی پێنج کەسان بکڕێت. دامانبا بەخێوکردن و بەرهەمهێنانی زەیتوون کارێکی سەخت بێت، ئەدی باخی هەنجیران، هەنجیری زەرد چی؟... ئەگەر دە پازدە هەزار مەتری چوارگۆشەی لەو باغانە بکڕیبوا بە ئاسانی دەیتوانی ماڵ و منداڵی خۆی بەخێو بکات. یان بۆ نموونە ئەگەر باخی هەنارانی بکڕیبوا، یان هی خۆخان، یان باخی هەنجیری زەرد و یەك بە لەپی دەستی کە شیلە و ڕەواجیان لە قوونکێ دێتەدەر.

ئەفە خەنجەرلی لەدۆڵی هەنجیرانەوە دەچووە نێو باخی خۆخان. دارهەنجیرەکانی دۆڵەکە لە دارهەنجیری جێگاکانی دیکە ڕەگاژۆتر و قایمتر و هەنجیریشیان گەورەتر بوون. هەنجیری جۆراوجۆر بوون. دارهەنجیری وا گەورە بە دەگمەن لە جێگاکانی دیکە هەبوون. هەنجیرەکان بە دە ڕۆژان دەگەیین و شیلەیان لێدەچۆڕا. لە دڵی خۆیدا گوتی تۆ بڵێیت خەڵکی دوورگەی ئێمە چیبکەن، ئەگەر هەنجیرەکان ئاوا پێگەیشتوون کەواتە خۆخەکانیش دەبێت ماوەیەك پێش ئێستا گەیشتبن. ئۆقرەی لێهەڵگیرا. بەدەم بۆڵە بۆڵەوە لەبەرخۆیەوە گوتی ئەمانە هیچشتێك نازانن و بەرەو لای دارخۆخەکان ڕۆیشت، سەیری کرد خۆخەکان پێگەیوون. گوتی، وای، وای باش نەبوو هاتمە باخچە، دەبێت یەکسەر ئەو خۆخانە کۆبکەمەوە. لەم ڕۆژانە دەتوانم پارەیەکی باشیان پەیدا بکەم. بە هەمان خێرایی بۆ لای پۆیراز چوو و گوتی:

"پۆیراز، برا، دەزانیت ئێستا من لەکوێوە دێم؟"

"لە کوێوە دێیت؟"

"لەنێو باخی خۆخان، خۆخەکان پێگەیوون، هەفتەیەك نابات هەڵدەوەرن و ئیدی بە کەلك نامێنن. دەبێت لەماوەی دوو ڕۆژان کۆیان بکەینەوە، کەس هەیە کۆیان بکاتەوە؟"

پۆیراز گوتی: "نازانم."

"ژن و منداڵەکانی من هەن، تۆ هەیت، من هەم، موسا ئاغا و کچەکانی هەن، دکتۆرەکانیش هەن. باخەکان گەورەن، بەڵام ئێمەش ژمارەمان زۆرە. دەتوانین پارەیەکی باش بە فرۆشتنی خۆخان پەیدا بکەین. یان خۆمان کۆیان دەکەینەوە یان دەیاندەینە دەڵاڵان ئەوان کۆیان دەکەنەوەو هەڵیاندەگرن و دەیانبەن. ئەگەر خۆمان کۆیانبکەینەوە دوو بەرامبەر پارەمان دەست دەکەوێت. ئەگەر ئێمە پێڕانەگەین ئەو کارە بکەین، دەچم لەشارۆچکە و دێهاتەکان کرێکاران دێنم. ئێمە خۆمان دەیانبەین دەیانفرۆشینە دەڵاڵەکان چیدەڵێیت؟"

پۆیراز تاوێك بیری کردەوە، ئینجا گوتی:

"بابچین لە دکتۆرەکان بپرسین. بە وەلی نیشانچی و حیسام و حەسەنی راکردووش بڵێین با بێن. بە مەلەك خانم و موسا ئاغاش..."

"هەفتەیەکی دیکەش هەنجیرەکان پێدەگەن، دواتریش هەنارەکان، ئینجا تریێ. دوورگەیەکی چەند دەوڵەمەندە ئەم دوورگەیەی ئێمە."

پۆیراز موسا گوتی: "دەوڵەمەندە. یۆنانییەکان هەر جێگایەك هەڵببژێرن لێیبژین خاکێکی بە پیت و بەرەکەت دەبێت. هەستە با بچینە لای دکتۆرەکان نابێت کات بەفیڕۆ بدەین."

ئەفە گوتی: "راستە." هەستە بە چاوترووکانێك گەیشتنە لای دکتۆرەکان، دکتۆرەکان خەریکی مشتومڕ بوون. لەگەڵ بینینی ئەوان بێدەنگ بوون و گوتیان: "فەرموون دانیشن."

دایکە لێنا کەمێك دواتر ئەو کەسانەی هێنان کە بۆ دانیشتنەکە بانگهێشت کرابوون. هەر کەسەو جێگایەکی بۆ خۆی پەیدا کرد و دانیشت. پۆیراز باسی خۆخەکانی لەسەری تا بنی بۆ باس کردن: "ئێستا گەرەکمە لە ئێوە بپرسم، خۆمان خۆخەکان لێبکەینەوەو کۆیان بکەینەوە یان هەروا بە دارەوە بیانفرۆشینە دەڵاڵەکان؟ ئێمە سەرمان لەکاری خۆخچنین دەرناچێت. ئەفە خەنجەرلی برامان پێیگوتم کە خۆخەکان پێگەیشتوون. لە راستیدا کاتی لێکردنەوەیان خەریکە تێدەپەڕێت. لە راستیدا من نەمدەزانی خۆخ چۆن پێدەگەن و کەی کاتی لێکردنەوەو کۆکردنەوەیانە."

دکتۆر سەلمان سامی گوتی: "با ئەفە بە ئێمەش بڵێت بەکێ دەڵێن دەڵاڵ و هەر بە دارەوە فرۆشتن چۆن چۆنیە تاکو ئێمەش فێری بین." ئەفە خەنجەرلی گوتی: "بەڵێ قوربان، بەڵێ، عەرزی بە خرووری گەورەی خۆم بێت، ئێمە ئاگاداری ئەوانە دەکەینەوە کە لە شارۆچکە سەوزەو میوە کۆدەکەنەوە، ئەوان دێن سەیری باخەکان دەکەن، نرخێك بۆ هەموو بەرەکە دیاری دەکەن.

ئێمەش یان ئەو نرخە قبوڵ دەکەین یان قبوڵی ناکەین. ئەگەر قبوڵمان کرد پارەکەی لەپێشدا وەردەگرین، ئەگەر قبوڵیشمان نەکرد دەچینە لای دەلاڵێکی دیکە و لەسەر نرخێك لەگەڵیدا رێکدەکەوین، کابرای دەلاڵ لەگەڵ کرێکارەکانی خۆی دێت خۆخەکان کۆدەکاتەوەو دە سندوقانیان دەکات و بێئەوەی تەنانەت یەك دانە خۆخیشمان بداتێ هەڵیاندەگرێت و دەیانبات. منداڵەکانیش بە بینینی خۆخی گەیشتوو ئاویان لە زاری دێت."

"ئیدی؟"

"ئیدی ئەوەی کە دەتوانین خۆخان بفرۆشین، خۆمان کۆیان بکەینەوە، بیانخەینە نێو سەبەتە و سەندوقان، بیانبەینە شارۆچکە، لەوێ دیسان بیاندەینە دەلاڵەکان و تەنانەت بە گرانتریشیان بفرۆشین. خۆخی دوورگەی کارینجا زۆر بەناوبانگن، تا بڵێیت یەك و دوو هەموویان دەکڕن."

"کۆکردنەوەی خۆخ کاری ئێمە نییە، لەکاتی کۆکردنەوەیان ناتوانین پێش بە خۆمان بگرین، نیوەیان دەخۆین و تووشی سکچوونیش دەبین."

"سکچوون چییە، سکچوون؟"

"سکچوون واتە وەبەرخۆ رانەگەیشتن، واتە رەوانی."

ئەفە گوتی: "تیگەیشتم، راستە."

"هەموو بەروبوومەکە بفرۆشین. خەیری ئەفەندی دەلاڵێکی ئابڕومەندمان بۆ دەدۆزێتەوە. تازە مەگەر ناتوانین رێگایەك پەیدا بکەین ئاوی دەمی منداڵەکانمان نەرژێت؟"

ئەفە خەنجەرلی بە دەنگێکی گڕ و تژی لە شادمانییەوە گوتی: "پەیدای دەکەین، پەیدای دەکەین، دە پازدە دارخۆخێکی باش لەگۆشەیەك دەدۆزینەوەو بەرەکەیان دەخەینە لاوەو نایفرۆشین. ئینجا عەرزم بە حزووری جەنابت بێت، نە ئاوی دەمی منداڵەکانمان دەرژێت و نە هی خۆمان."

دکتۆر سەلمان سامی گوتی: "نە هی خۆمان با یەکێکمان بچێت و بە خەیری ئەفەندی بڵێت دەلاڵێکی ئابڕوومەندمان بۆ بدۆزێتەوەو دەشیدۆزێتەوە."

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "من دەچم، ئێمە لە وان زۆر دارگوێزمان هەبوون، باخیشمان هەبوو. ئێمەش گوێزەکانمان هەر ئاوا بە دارەوە دەفرۆشتن."

گوتیان: "کەواتە تۆ خۆت بڕۆ. بەلەمیشت هەیە، جا چ بەلەمێك، پزیشکی ئاژەڵان، دوای ئەم قسانە یەکسەر چووە دەر، هەر زوو خۆی گەیاندە ئەسکەلە. بەلەمەکەی بە ئەسکەلە

بەسترابووەوە، کندرەکەی کردەوە، سرکێتی بەنزینی تا ئاخیری داگرت. بەلەم دەفڕی. کە گەیشتە ئەسکەلەی شارۆچکە، خۆر خەریك بوو ئاوا دەبوو، یەکڕاست چووە ماڵی خەیری ئەفەندی. خەیری ئەفەندی لە ماڵەوە بوو، بە گەرمی پێشوازی لێکرد: "ئەمشەو لە ماڵی ئێمە دەمێنیتەوە، پشوو دەدەیت."

"سوپاست دەکەم قوربان." تا کاتی نانخواردن لە بالکۆنەکە دانیشتن و قسەیان کرد. خەیری ئەفەندی بێپسانەوە لە بارەی بەرەی رووسەکان پرسیاری دەکرد و ئەویش بە دەنگێکی خەمگین و چاوانی ئەشکتێزاو، باسی کۆمەڵکوژییەکەی ساری قامیشی دەکرد.

"کەوایە بەرەی رووسان لە چاناك قەڵاش ترسناکتر بووە."

خەیری ئەفەندی تووڕە بووبوو و دەستەکانی دەلەرزین:

"هەموو شەڕو شۆڕو جەنگەکان پەڵەی رەشی مرۆڤایەتین. هەموو شەڕو شۆڕ و جەنگەکانی رابردوو و ئەوانەی داهاتووش روو رەشین."

"لەلای پۆیراز ناتوانین لەبارەی جەنگەوە قسان بکەین، رەنگی هەڵدەبزرکێت، لێوەکانی شین دادەگەڕێن، دەشڵەژێت. بۆیە ئێمەش قەت لەلای وی باسی شەڕ ناکەین. زۆر گەنج بووە، تەمەنی هەر شازدە حەڤدە ساڵ بووە کە بۆ شەڕ چۆتە ساری قامیش. وەك ئەوەی لێنا، ئەو ژنەی کە لەلایەتی دەڵێت شەوان هەمیشە مۆتەکەی ساری قامیش سواری سەر سنگی دەبێت و لەبەرخۆیەوە وڕێنە دەکات."

خەیری ئەفەندی ئەبرۆکانی تێکنان، ماوەیەك ئاوا دەگژ فکران راچوو: "تۆ چیتدەگوت، دەتگوت خۆخەکان پێگەیشتوون؟"

"پێگەیشتوون قوربان. ئەگەر کۆیان نەکەینەوە هەفتەیەك دە رۆژی دیکە نابات هەموویان هەڵدەوەرن و لەنێو دەچن. لەنێو ئێمەدا کەسانێك هەن کە تەنانەت خۆخیان هەر نەبینیوە. تەنانەت ئەگەر کۆشیان بکەینەوە نازانین چۆنیان بفرۆشین. خەڵکی دوورگە بۆیە منیان ناردۆتە لای تۆ کە کەسێك بدۆزیەوە هەر ئاوا بە دارەوە خۆخەکانمان لێبکڕێت. منیش یەکسەر هاتمە لای تۆ."

"کارێکی باشت کردووە هاتوویتە لای من. یەکێك هەیە ناوی شوکری ئەفەندیە. خزمایەتییێکی دووریشمان لەگەڵ یەکدا هەیە. ئەو کاتەی یۆنانیەکان لێرە بوون شوکری ئەفەندی فرۆشیاری سەوزەو میوەی هەرێمی ئێمەو ئزمیر بوو، بەڵام شتێك هەیە کە نابێت لای

ئەو باسی چاناك قەلاّو گەلیبۆلۆو جەنگ بکەیت، چونکە سێ براو سێ ئامۆزای لە چاناك قەلاّ نەگەڕانەوە، هەموو هاوشاریەکانیشی لە چاناك قەلاّ کوژران و نەگەڕانەوە. ژنانی گەنجی گوند هەموویان بوونە بێوەژن. لەو ڕۆژەوە تا هەنووکە شەو و ڕۆژ هاوارو گریان و نووزانەوە لەم گوندە نەبڕاوەتەوە. دەبێت کەسێکی عاقڵ لەگەڵ دەلاّلان قسە بکات. شوکری ئەفەندیش پیاوێکی سەر ڕاست و تەواوە، دوای تاوێکی دیکە دەڵێم بچن پێیبڵێن سبەی سەر لەبەیانی زوو لەگەڵ کرێکارەکانی بهێتە دووکان، بەلاّم نەچن باسی جەنگ و ئەو شتانەی بۆ بکەن، ئەو شتانە باس بکەن یەکسەر دوورگە بەجێدێڵێت و بە بۆڵە بۆڵ دەگەڕێتەوە."

"باشە قوربان، بەسەرچاو، هیچکەس باسی جەنگ و چاناك قەلاّو گەلیبۆلۆی بۆ ناکات..."

"کەسێکی دڵبریندارە.ئەو ئێستا لەم دنیایەدا تاكو تەنیایە."

"بەڵێ، بەلاّم قوربان ئێمە داواکارییێکیشمان لەجەنابتان هەیە. لەنێو ئێمەدا کەسانێکی واهەن کە هەرگیز خۆخیان نەبینیون، تۆبڵێی شوکری بەگ نەتوانێت یەکێك لەباخچەکان کە لەهەموویان بچووکتر بێت بۆ خۆمان لێبگەڕێتو پارەی کەمترمان بداتێ؟ منداڵەکان ئاو لەدەمیان دێتەخوار، هەروەها ئەوانەیش کە خۆخیان نەبینیوە."

"باش بوو ئەمەت پێگوتم. من ئەمە بەشوکری ئەفەندی دەڵێم، ئەو دەیپەژرێنێت نیگەران مەبە."

"بەیانیەکەی زوو، شوکری ئەفەندی لەگەڵ چەند کەسی دیکە هاتە ماڵی خەیری ئەفەندی. خەیری ئەفەندی باسەکەی لەگەڵ شوکری ئەفەندی کردەوە.

شوکری ئەفەندی گوتی: "باشە. خۆخەکانی دوورگەی کارینجا لە خۆخی هەموو ئەو ناوچەیە باشترن. هەنجیر و هەنار و ترێکەشی هەروایە. خاکەکەی زۆر باشە. لە پێدەشتەکانیش بەروبووم هێندە زۆر کە پڵنگ بچێتە ناوی لێیدەرناچێت. من هەموو مێوەو بەروبوومەکەیان هەڵدەگرمەوەو وادەکەم کە پارەیەکی باشیان پێببڕێت."

پزیشکی ئاژەلاّن لەدڵی خۆیدا گوتی شوکری ئەفەندی مرۆڤێکی هێمنە، شارەزا، نەرمونیان، خاکەڕایە، کە بە هێمنی قسە دەکات، دەنگی بەرز ناکاتەوەو مرۆڤ دڵنیا دەکاتەوە. خەیری ئەفەندی دوو کچی جوانی هەبوون کە مێزی نانخواردنی بەیانیان ڕازاندبووەوە. شوکری ئەفەندی تەنانەت جارێکیش سەری هەڵنەبڕی سەیر بکات. پیاوێکی شەرمن بوو. ڕووباری هێمن و مرۆڤی بێدەنگ هەردووکیان ترسناکن، نەکا شوکری ئەفەندی

لەو جۆرە مرۆڤانە بێت؟ دەشڵێت بەرهەمەکان هێندە زۆرن ئەگەر پڵنگیان بچێتە ناو ناتوانێت بهێتەدەر. ئەمە رەنگە وەنەبێت. ئەم قسانە هەڵبەت لەبارەی بەرهەمەکانی دوورگە زیادن. شوکری ئەفەندیش ئەمەی کردۆتە بنیشتەخۆشەی سەر زاری. پێنج شەش جار لەنێو قسەکانیدا دووبارەی کردنەوە.

"من لە کارینجا گەنمێکی زۆرم کڕیوە، لەئاشدا هاڕیومە و کردوومەتە ئارد و بردوومەتەوە شارۆچکە. لەو دوورگەیە بەروبووم هێندە باش بوو کە بە قەد بەژنی مرۆڤ بەرز دەبووەوە. پڵنگ بچێتە ناویەوە ناتوانێت بهێتەدەر."

دوای بەرچایی پێکەوە چوونە دووکانەکەی خەیری ئەفەندی. شوکری ئەفەندی زۆر لە دووکانەکە نەمایەوە، لەکاتی رۆیشتنندا گوتی: "سبەی نا دووسبەی دێمە دوورگە، سڵاوم بگەیەنە برادەران، دکتۆر."

"سەرچاو شوکری ئەفەندی."

"با نیگەران نەبن، باغچەیەکی جوانیان بۆ جیا دەکەمەوە کە هەم ئەوانەی خۆخیان نەبینیوە بیانخۆن هەم منداڵەکان. پارەی ئەو باغچەیەش دەدەم، بەخێری گۆڕی باوکم، با ئەوەندە خۆخان بخۆن تا زگتان رەپ دەبێت."

هەر کە ئەو لە دووکانەکە دەرچوو، پزیشکی ئاژەڵانیش هەستاو گوتی:

"زۆر سوپاست دەکەم خەیری ئەفەندی کە ئەم پیاوەت بە ئێمە ناساند. ئەم پیاوە فرت و فێغ نازانێت."

"تۆش بژیت کاکە جەمیل. تەنها لای ئەو نابێت باسی شەڕو چاناك قەڵاو گەلیبۆلۆ بکەن. واز لە کارەکەی دێنێت و دەگەڕێتەوە بۆ شارۆچکە. خۆخەکانی ئێوەش بە دارانەوە دەمێننەوەو لەنێو دەچن. نەبادا، نەبادا، نەبادا. بە هەمووان بڵێ، ئاگایان لێبێت باسی شەڕ و ئەو شتانە نەکەن."

"خواحافیز."

"خوا حافیز، بەخێر چیت" شوکری ئەفەندیش کارەکەی سەختە، نیوەی زیاتری قسەکانی لەبارەی جەنگ و چاناك قەڵاو گەلیبۆلۆ بوون. بەتایبەت ئەو ساڵانەی کە تازە جەنگ تەواو بووبوو هەر تەنها باسی جەنگ و چاناك قەڵاو گەلیبۆلۆی دەکرد. شوکری ئەفەندی یان لە ماڵێ

نەدەهاتەدەر یان ئەگەر بهاتبوایە دەرێ شێت دەبوو و دەگەڕایەوە ماڵێو ماوەیەکی زۆر لە ژوورێ نەدەهاتەدەر.

پزیشکی ئاژەڵان تا گەیشتەوە دوورگە هەر بیری لەو بەڵاو نەهامەتیانە کردەوە کە بەسەر شوکری ئەفەندی هاتبوون. ئازار دڵی گرتبوو. ئەو خۆیشی چەند ساڵ پێش ئێستا کە وشەی جەنگی دەبیست شێت دەبوو. چی بەسەر باوك و دایك و دەستگیران و براکانی هاتبوو، بۆ کوێ چووبوون؟ یان شارەکەی کە چۆڵ و هۆڵ بووبوو، چی لەشارێکی چۆڵ ترسناکترە، کش و مات، بێئەوەی بنیادەمێکی لێبێت، لە دنیایەکی بێماناو خاڵی، ئەگەر لە ناوەڕاستی شاردا سۆفی نەدەبینی لە خەمان دیقی دەکرد.

بەو داڵغە و بیرکردنەوانە هاتەوە دوورگە، بەلەمەکەی لە ئەسکەلە بەستەوە، هات لەژێر چنارەکان دانیشت. سەیری ئەملاو ئەولای کرد، کەس لەو دەوروبەرە نەبوو. لەهەموو جێگاکانی روانی، ڤاسیلیش دیار نەبوو. هەستاو چووە لای دکتۆرەکان، دەرگای نۆرینگە داخرابوو. کارگەی وەستا ئارسۆن سێ دووکان لەولاتر بوو، سەرێکی لەوێدا، دەرگای کارگەی ئەویش داخرابوو. پاشان یەك بە یەکی خانووەکان گەڕا، خانووەکانیش چۆڵ بوون. سەیرە، چی بەسەر ئەم خەڵکە هاتووە؟ ئەو رۆژەش کە بەنێو واندا دەگەڕا لەوێش ئاوا تاك و تەنیا لەنێو دنیایەکی چۆڵ و هۆڵ و خاڵیدا مابووەوە. بەخێرایی بەرەو دۆڵی دارزەیتوونەکان چوو، لەکاتێکدا بەسەر درەخت و دەوەنەکاندا هەڵدەنگوت بە هەناسە بڕکێ چووە سەر تەپۆلکەکە. چوو لە رۆخ بەردەنووسەکە راوەستا، سەیری دەوروبەرەکەی کرد، هیچکەس لەو ناوە نەبوو. لە دەوری بەردە نووسەکە یەکەمجار رووی کردە لای رۆژئاوا، پاشان بەرەو رۆژهەڵات، ئینجا باشوور و باکووری تەماشا کرد، هیچ کەسی نەبینی نەیبینین، بەڵام نائومێدیش نەبوو.

زۆر بە وردی لەسەر تەماشاکردن و پشکنینی هەموو شوێنە نزمەکان بەردەوام بوو. هیچ زیرۆحێك لە دوورگە نەبوو. لە بەردەم بەردەنووسەکە دانیشت، پشتی بە بەردەکەوەداو کەوتە بیرکردنەوە. دەبێت ئەمانە چووبنە کوێ. هەموو ئەگەرەکانی لێکدانەوە، بیری لە باخەکان، لە دۆڵی دارهەنجیرەکان، شوێنی غەڵیفەی هەنگان کردەوە، لە دوورگە زۆر جێگا هەبوون کە لەسەر ئەم تەپۆلکەیە نەدیو بوون. لەپڕ بە زەینی داهات کە لە کوێ بن، بەلەز هەستا، لە تەپۆلکەکە سەرەوژێر بووەوە، لەکاتێکدا رك‌و رك لە داران هەڵدەنگوت بەرەو لای باخی خۆخان رۆیشت. چووە دۆڵی دارهەنجیران. لە باخی هەناران وایهاتە بەرچاو کە جووڵەجوولێك بەدی

بکرێت. ئەودەمەی بۆ لای باخی خۆخان دەچوو لەناکاو راوەستا، ئا لەو ساتەدا چاوی بە کۆمەڵە خەڵکێك کەوت کە لەوپەڕی بەردەڵانەکە، لە رۆخ باخی خۆخان راوەستابوون. لە ماندوێتیان دەمرد. هەموو خەڵکی گوند لەوێ بوون. دوای ئەوەی پشووێکی دا، هەستاو وەڕێکەوت، ئەوان یەکسەر ئەویان بینی و بە شادیەوە پێشوازیان لێکرد: "پزیشك، پزیشك هاتەوە." پزیشکی ئاژەڵان تواناو برستی راوەستانی نەمابوو، لەسەر بەردێك دانیشت، یەکسەر لە دەوری کۆبوونەوە.

"بوەستن با یەکەمجار من لە ئێوە بپرسم، خەریك بوو لە نیگەرانیان دەمردم، ئێوە لێرە چ دەکەن؟"

وەلی نیشانچی لە نێو خەڵکەکە هاتەدەر:

"لێرە؟"

"لێرە."

"ئێمە لەو کاتەوەی تۆ چوویتە شارۆچکە هاتووینەتە ئێرە."

"هاتوون کە چیبکەن؟"

"هیچشتێك."

"ئەمە یانی چی؟"

"هەر ئاوا."

"نەکا خۆخەکان گەیشتبن و هەمووتان خواردبن؟"

"چما کەس هەیە بتوانێت دەست بۆ ئەم خۆخانە ببات؟"

"ئەی کەوایە بۆچی هاتوونەتە ئێرە؟"

"هیچ. سەیر دەکەین."

"یانی دانەیەکیشتان نەخواردووە بزانن چ تامێکیان هەیە؟"

"بۆچی؟"

لەم ساتەدا، پۆیراز، کە کاسەی سەبری پڕ بووبوو، هاتە پێش و گوتی: پزیشك، براکەم، لێرە هیچکەس، نەك هەر دەستی لە خۆخێکیش نەداوە بەڵکو تەنانەت پەلکی دارەکانیشیان بۆن نەکردووە. لەو کاتەی تۆ چوویتە شارۆچکە، ئێمە ئاوا لە خۆخە گەیشتووەکان نزبووینەتەوەو ئاو چیە لە دەممان نەماوە. ئەم وەلی نیشانچیە هات و گوتی دەست لە خۆخان

نادەن، چونکە دەمانەوێت هەموویان ئاوا بدەینە دەست کڕیار. کڕیارەکە ئەگەر هات و بەری دارخۆخەکان کەم بوو، یان لە کڕینیان پەشیمان دەبێتەوە یان پارەیەکی وامان ناداتێ، بۆیە ئێمەیش تەنانەت تاکە خۆخێکمان لێنەکردۆتەوە، هیچ نەبێت بۆنی بکەین. لەگەڵ سیوادی بەیانی دەهاتین و تا رۆژئاوا دەبوو ئاوا سەیری خۆخەکانمان دەکردو دەگەڕاینەوە. تۆ ئەگەر مانگێکیش لەوێ مابوایتەوەو دیسان ئێمە دەهاتین و بێئەوەی خۆخێکیش چییە بۆن بکەین دەگەڕاینەوەو دەڕۆشتینەوە، تۆ ئێستا لە شارۆچکە چیت بۆ کردین، چیت بە خەیری ئەفەندی گوت و خەیری ئەفەندی چی پێگوتی؟"

پزیشکی ئاژەڵان هەروەك لەسەر بەردەکە دانیشتبوو، هەرچی لەوی بیستبووی و دیتبووی بەوردی بۆی باسکردن. باسی شوکری ئەفەندی و خوڵق و خوو و گوند و ترسەکانی کرد. خۆخ و هەنار و هەنجیر و هەموو بەروبوومەکانی ئێمە لەنێو ناوچەکانی دەوروبەر باشترین و پەسندترینیانن، ئەو بەرهەمەکانی ئێمە بە نرخێکی باش دەکڕێت و بە نرخی باشیش دەیفرۆشێت.

"جگە لەوەش بەری باشترین باخی خۆخان لەبەر خاتری ئەوانەی کە بە تەمەنی خۆیان خۆخیان نەبینیوەو نەیانچەشتوە، هەروەها لەبەر خاتری منداڵەکان ناکڕێت، بەڵام پارەی ئەو بەرهەمانەش دەداتە خەڵکی دوورگە. وەك چۆن خەیری ئەفەندی دەیگوت شوکری ئەفەندی لەو جۆرە کەسانەیە کە خاوەنی قسەی خۆیانن، تا ئێستا کەس نەیبینیوە لە قسەی خۆی پەشیمان ببێتەوە."

"واتە دوای ئەم جەنگەش کەسانی ئاوا هێشتا لەم دنیایەدا هەن؟"

وەلی نیشانچی گوتی: "هەن، ئادەمیزادە ئەمە، هەڵبەتە ئادەمیزادە، هەڵبەت لەم دنیایەدا کەسانی باشیش هەن."

پۆیرازا گوتی: "دەبێت هەبن. مرۆڤەکان رەنگاو رەنگن و زەوی رەگ رەگ. کەسانی ئاوا لەنێو ئێمەشدا دەبن. دیسان هەر ئادەمیزادیشە کە کۆتایی بەم جەنگە دێنێت. ئەگەر کەسانی ئاوا نەبن چۆن دەکرێت کۆتایی بە جەنگ بهێندرێت؟"

"کێن جەنگ تەواو دەکەن، ئەم مرۆڤانە؟ کێ؟"

پزیشکی ئاژەڵان گوتی:

"سەبرتان هەبێت، هێشتا قسەکانم تەواو نەکردوون. چەند وشەیەك هەیە شوکری ئەفەندی بیانبیستێت شێت دەبێت، سەیری ئەو کەسەش ناکات کە ئەو وشانەی بەزاردا بێن، لەوانەش دڵگران دەبێت کە ئەو وشانە ببیستن و خۆیان لێبێدەنگ بکەن، کە ئەو قسانەی بیست دەچێتەوە ماڵەوەو ماوەیەك قاچی لە ژووریّ ناهێنێتەدەر، گوایا بەمشێوەیە ئەوە نیشان دەدات کە لە دنیا تۆراوە."

نیشانچی گوتی:

"بێژە جەنابی پزیشکی ئاژەڵان، سوەزگمان دەکەیت، بێژە ئەو وشانە چین، بێژە با دەممان کلۆم بکەین و ئاگامان لە قسەکانمان بێت."

"تۆش سەرزەنشتمان مەکە سەرۆك نیشانچی، زارمان کردۆتەوە کە هەموو شتێك روون بکەینەوە."

ئەوانی لەویّ بوون گوتیان: "بێژە، بێژە."

"نەوەك هەڵەیەك بکەین و خۆخەکانمان بە درەختەکانەوە بڕزن و لەنێو بچن. زوو بۆمان باس بکە تا ئاگامان لە قسەکانمان هەبێت."

پزیشکی ئاژەڵان گوتی:

"یەکەم، وشەی جەنگ نابێت لە دەمی هیچکەس دەربچێت. کاتێك لای ئەو دەبن تەنانەت لەنێو دڵی خۆشتان نابێت ئەو وشەیە بڵێن. دووەم، گوایە کاتێك باسی چاناك قەڵا دەبیستێت شێت دەبێت، هەروەها وشەی گەلیبۆلۆش."

مەلەك خانم، بە روخسارێکی سوور سوورەوە چەند هەنگاوێك بۆ پێشەوە چوو، دەست و قاچی دەلەرزین:

"شوکری ئەفەندی هەقیەتی، زۆریش هەقیەتی. منیش کە گوێم لەم وشانە دەبێت مووی تەنم وەکو شیش راست دەبنەوە. وای شوکری ئەفەندی وای! دوو دانە برا، سێ دانە کوڕە مام، هیچکام لە دێهاتیەکانی گوندەکەیان نەگەڕاونەتەوە، وای شوکری ئەفەندی وای!"

یەکسەر بەرەو گوند گەڕایەوە، نێوچاوانی لۆچاوی بووبوو، فرمێسك لە چاوانی قەتیس مابوو. ئاپۆرەی خەڵکەکەی سمی، وەك لەدەست گورگێك رابکات، خێرا خێراو بە نیگەرانی، بە راکردن و لەتربردنەوە دەڕۆیشت. خەڵکەکەش بەدوای ئەودا لەکاتێکدا بە دەنگی بەرز قسەیان لەگەڵ یەکدیدا دەکرد، وەڕێکەوتن. هەر کە گەیشتنە ژێر دارچنارەکان هەموویان لەسەر تەخت

و نیوتەختەکان دانیشتن، لەبارەی جەنگ و چاناك قەڵاو ساری قامیش کەوتنە قسان. لەنێو هەموویاندا کەسێك نەبوو لەگەڵ ئەو جەنگەدا نەژیابێت، یان لانیکەم یەکێك لە کەسە نزیکەکانی لە جەنگ نەکوژرابێت. هەموویان شوکری ئەفەندیان لەسەر هەق دەزانی، بەڵام دەیانتوانی چیبکەن، بەزەحمەت بەرگەی ئەمەیان دەگرت.

شەو داهات، خۆر لەکەل ئاوابوو، وەکو ئەوانەی دەتۆرێن بڵاوەیان کرد و چوونەوە ماڵەکانیان. لەسەر کانییەکە تەنها دەنگبێژەکە مابوو، ئەوەندە نیگەران بووبوو کە نەیدەتوانی لەجێی خۆی هەستێت. کاتژمێرێك لەشەو تێپەڕیبوو، مانگ بەرەو لای خۆرئاوا سەرەوژێر بووەوە، دەنگبێژ بە زەحمەت توانی هەستێت، قاچەکانی بە دوای خۆیاندا بردیان و گەیاندیانە سەر تەپۆلکەکە، لەژێر تریفەی مانگدا چاوی بە بەردە نووسەکە کەوت، یەکەمجار لاواندنەوەیەکی سەبارەت بە جەنگ لەبەرخۆیە زەمزەمە کرد، پاشان دەنگی زیاتر هەڵبڕی، لاواندنەوە گۆڕا بۆ لاوك، دەنگبێژ ئارام و ئۆقرەی لەدەست دابوو. لەودیوی دنیاوە هاتین، لە قۆنتاری پڕ گوڵە وەنەوشەی چیای جودی، مرۆڤەکان شادو بەختەوەر بوون، باڵندەکانی ئاسمان، مێروولەکانی سەر زەوی بەختەوەر بوون، بەختەوەر بوون، مرۆڤەکان بەختەوەربوون، لە ناخی دڵەوە پێدەکەنین، تۆ ئادەمیزادیت، تۆ عاقڵ بوویت، ویژدانت هەبوو، دڵت پڕ بوو لەمیهر و خۆشەویستی، جەنگت هەڵگیرساند، بریا ئەوەت نەکردبوا. ئادەمیزاد لە راستیدا لەو رۆژەی لەدایك بووبوو، مردبوو. دەیگوت ئەمە یەکەمین و دواجار نییە دێمە سەر دنیا، مرۆڤ لە رۆژی ئەزەلەوە هاتووەو رۆیشتووە هەر بەو ئاواتەوە بووە کە تەمەنێك لەنێو ئاشتی و شادمانیدا بباتە سەر و بە هەر نرخێك بێت بیپارێزێت، بۆچی بەدەستی خۆی کۆتایی بەو شادی و بەختەوەرییە دێنێت؟ دەیگوت ئایا کە یەکێکی دیکە دەکوژیت ئەمە بە واتای خۆکوشتن نایەت، کاتێك دەبیتە مایەی برسیبوونی کەسانی دیکە و گوڕ و تینی ژیانیان لە ناخەوە هەڵدەکەنی، هاوکات گوڕوتینی ژیانی خۆشت لە دڵدا هەڵناکەنیت؟ تۆش دەتزانی، دەتزانی ئەو مرۆڤەی کە دەیکوژیت لە رۆژی ئەزەل تا ئەبەد تەنها جارێك دێتە سەر دنیا، تەنها یەکجار دەتوانێت بگاتە شادمانی ژیان، بەختەوەر ببێت، دوای چێژوەرگرتن لە ژیان و تامی خۆشی ئەم دنیایە بڕوات، بۆچی، بۆچی، بۆچی ئەو، ئەو ئادەمیزادەی کە بە چاوانی کراوە، تێر نەبوو لە خۆشییەکانی ژیان و عەشق و شادمانی، واتە خۆت لەنێودەبەیت و دەیخەیتە ژێر گڵەوە، ئەو دەبێتەوە بە خاك، ئیدی هەرگیز، هەرگیز چاوی بەم دنیایە ناکەوێتەوە، ئایا ئەم

عەقڵ و دڵە تژیەی عەشقی بۆ کوشتن بەتۆ بەخشیوە؟ دەیگوت ئەی ئادەمیزاد ئەمە شایانی تۆیە کە بەر لەوەی لە عەشق و دنیا تێر ببیت خۆت بدەیتە دەست مەرگەوە؟ دوای، دوای جەنگ لە کێو و دەشتانرا هاتین، کوشتمان، هەستی میهر و خۆشویستمان کوشت. ئەم دنیایە لێوانلێو بوو لە گوڵ، رۆشنایی خۆرەتاو و هەزار رەنگ، ئەم دنیایە پڕ بوو لە هەزاران تیشك، پەڕەندە، دەنگ، بۆن، عەشق و هەزاران بەزەیی و دڵنەوایی، ئوسوی دەنگبێژ دەیگوت ئایا ئێمە هەموو ئەمانەمان نەکوشت؟ خاکی باو و باپیرانمان، ئاسمانی بان سەرمان، هەوری سپی ئاسمانەکان، پۆلە باڵندەی رێچکە بەستوو لە ئاسمانەوە بۆ سەرزەوی و هەرچی شتێك کە دنیای پێدەزایەوە کوشتمان. مامزو گەوەزنە چاوڕەشە جوانەکانی دنیاشمان کوشتن. خۆزی بە خۆزیداران نەهاتبواینەتە دنیاو نە ئاوا خۆمان بکوشتبواو نە نوور و ئاسمانو مامزەکان. دەیگوت ئایا دنیا هەر بۆخۆی جوانتر نەبوو؟ لێرە دەنگی دەبووە دوو بەش، دەیگوت دنیای بێمرۆڤ و عەشق بە چ دەردێك دەخوات؟ دنیای بێرۆشنایی بە دەردی چی دەخوات؟ تۆ چیتکرد ئەی ئادەمیزاد، چیتکرد، چیتکرد کە دنیات لێکوشتین، نوور و گوڕ و تینت لێخامۆش کردین، لەجیاتی جوانترکردنی دنیا، هێزو توانای خۆت لە جەنگ و وێرانکاری بەخەرجدا. چ دەبوو ئەگەر توانای خۆت لە رێگای عەشق و خۆشویستندا دەخستە کار، ئەی ئادەمیزاد لە ناخی تۆدا هەستی کوشتن نییە، تا مۆخی ئیسقانەکانت پڕ بێت لە عەشق و میهرەبانی. ئایا ترسان لە مەرگە تۆی خستۆتە ئەم حاڵ و رۆژگارە؟ ئەی ئادەمیزاد، ئەگەر مرۆڤایەتیت لەبیر نەدەکرد، ترس لە مەرگ نەیدەتوانی ئەوەندە داتوەشێنێت و خۆی بخزێنێتە دڵتەوەو هێلانەی تێدا بکات و بتخاتە حاڵ و رەوشێك کە ئاوا ببیتە دوژمنی خۆت و ببیتە نزمترین بوونەوەری ئەم دنیایە. تۆ ئەم کارەت کرد، تۆ ئەم کارەت لەگەڵ خۆتدا کرد. تۆ بوویت کە ئەو کەسانەی لە هەموان زیاتر مرۆڤیان کوشت وەك قارەمان ناوزەدت کردن. ئایا ئەو کەسانەی کە لە هەموان زیاتر مرۆڤیان کوشت و خوێنی مرۆڤەکانیان خوارد بەختەوەر بوون. تۆ ئەوانت کردە قارەمان و تاجی سەرت، ئایا بەختەوەر بوویت؟ دەیگوت بکوژەکانت وەکو سەرمەشق نیشانی ئادەمیزاد دا. خۆت و سەرت بخوات ئەو سەر مەشقە.

کاتێك ئەم دەنگە نزمە گۆڕاو بووە ستران یەکەمجار دکتۆرەکان بێداربوونەوە، هەستان جلەکانیان پۆشی، دەنگ رۆدەچووە قووڵایی دڵیانەوە، دەنگەکە وردە وردە زیاتر دەخرۆشا و

تووڕەتر دەبوو. پزیشکی ئاژەڵانیش وابوو، پۆیرازی کە لە خوارەوە بوو بانگ کرد، پێکەوە چوونە لای موسا ئاغا. موسا ئاغا لەگەڵ کچەکانی چووبووە نێو باخچە.

"دەمانەوێت بچینە لێوی کانیەکەی سەرێ، لەوێ کڕو کپ دابنیشین. لە سەرەوە ناتوانێت ئێمە ببینێت، دەتوانین بەبێئەوەی پێبزانێت گوێی بدەینێ."

لە ماوەیەکی کورتدا نزیکەی هەموو خەڵکی دوورگە بە ڕێگەی دارزەیتوونەکان کە ڕێگاکە زۆر باش شارەزا بوون، بە هێمنی و بێدەنگی گەیشتنە ڕۆخ کانیەکە و هەروا بە بێدەنگی لەبن بەردەکە ریزیان بەست. موسا ئاغا گوتی: "ئەگەر جگەرەیەك دابگیرسێنین ئوسوی دەنگبێژ دەمانبینێت؟ هەر بەڕاست بۆچی ئاوا خۆمان دەشارینەوە؟"

پزیشکی ئاژەڵان گوتی:

"دەنگبێژەکان لەنێو خەڵکدا جۆرێك دەخوێنن و بە تەنیایی جۆرێکی دیکە. من زۆر گوێم لە دەنگی ئوسوی دەنگبێژ گرتوە، لـێ هیچکات دەنگ و سەداو وشەکانی بەم جۆرە نەبوونە، دڵی مرۆڤ لە سینە دەردێنێت."

دکتۆر سەلمان سامی لە پزیشکی ئاژەڵانی پرسی: "کاك جەمیل، دەتوانیت لە سەرەتاوە بۆمان وەربگێڕیت؟"

"بێگومان قوربان، کاتێك دەنگبێژ دەستی بە خوێندنی لاوکەکە کرد، من کتێبم دەخوێندەوە، هەر کە گوێم لە دەنگی ئەو بوو کتێبەکەم دانا ئەولاو گوێم لە ناوەڕۆك و وشەکانی گرت. یەکەمجار لاوکێکی چڕی کە باسی لە سەربازێك دەکرد لە جەنگدا کوژرابوو و جەرگی دایکی سووتابوو. دەنگی کە لەگەڵ دەنگی دەریا تێکەڵ بوو دەمبیست و لە وشەکانی حاڵی دەبووم. دواتر کە داستانەکەی دەست پێکرد، دەنگی هەڵبڕی، پاشان دەنگەکەی گڕتر و قەبەتر کرد. دەتانەوێت وشەکانی هەر لە سەرەتاوە کە دەستی پێکرد بۆتان وەربگێڕم؟"

سەلمان سامی گوتی: "لەمەش بە دواوەی، تائیرەی کورت بکەرەوە، پاشماوەکەشی..."
جەمیلی پزیشکی ئاژەڵان دەستی بە وەرگێڕانی ناوەڕۆکی لاوکەکە کرد.

داستانەکە، کەمێك پێش بەرەبەیان کۆتایی هات. هەر لەگەڵ تەواوبوونی لاوکەکە، دەنگبێژ ئەمجارە دەستی بە نەیژەنی کرد. تا ئەودەم کەمترین دەنگ لەبەر هیچکامیان نەهاتبووەدەر، هەروەها هیچ یەك لە منداڵەکانیش کە هاتبوونە سەرکانی نەخەوتبوون.

هێشتا خۆر لە سەرانی نەدابوو کە دەنگی نەی وردە وردە دوور و دووتر کەوتەوەو ئیدی نەما. دەنگبێژ نەیەکەی خستەوە نێو کیفی، بە زەحمەت لە شوێنی خۆی هەستایەوە، قاچەکانی گۆد بووبوون، چووە دۆڵی دارزەیتوونەکان، هاتە ژێر دارچنارەکان، لەسەر یەکێك لە نیوتەختەکاندا دانیشت. گوێی بۆ شوڕە شوڕی ئەو ئاوە راگرت کە لە شێرەکە دەڕژا. هیچ دەنگێك لە دەوروبەر نەدەهات. ئاوی لە کانیەکە خواردەوە، دووبارە هات لەسەر شوێنی خۆی دانیشتەوە. لەپڕ کەسوکارەکانی خۆی کەوتەوە بیر. ئەگەر ئەو لاوکەی کە تازەی دانابوو لە شارەکەی خۆی بیگوتبوا هەرا بەرپا دەبوو، ئەوانەی کە منداڵەکانیان لە چاناك قەڵاو ساری قامیش و جەنگی دژی یۆنان کوژرابوو فرمێسکیان هەڵدەڕشت، دەنگبێژە گەنجەکان لاوکەکەیان لەبەر دەکرد و دیار بە دیار دەگەڕان و بۆ هەموو خەڵکی دەیانگوتەوە...

شادیەك لە پای دانانی ئەم لاوکە تازەیە لەنێو دڵی ئوسوی دەنگبێژ تا بەیانی شەپۆلی دا. هەر دەنگبێژێك ئەم لاوکە لەبەر بکات، لە هەر جێگایەکی دیکە بیخوێنێت، شتگەلی تازەی بۆ زیاد دەکات، جگە لەوە بیسەرانیش شتی دیکەی دەخەنە سەر. هەرجارێك لاوك و سترانە کۆنەکانی لە بەرامبەر ئەو بیسەرانە کە بە دڵ و گیان گوێیان بۆ رادەدێرا، دەخوێند لای ئەو سترانەکە جوانتر دەبوو و دەڤەر بە دەڤەر و دیار بە دیار دەگەڕاو بۆ هەر جێگایەك بچووبوا دووبارەو دووبارە تازەتری دەکردەوەو جوانتری دەکرد و سەرەنجام لاوکەکە لە پێشتر جوانتر دەبوو. بە دانانی ئەم لاوکە حەسرەتئامێز و تووڕەییە دڵی هەم تژی دەبوو لە عەشق و بەختەوەری و هەم دەشبووە کوورەی ئاگر و وەکو دۆزەخ هەڵدەقرچا. ئەگەر هەڵنەقرچابوا چیکردبوا، رێی تێنەدەچوو بیسەرانی ئاوا بباتە دنیایەکی دیکە. دەبوا تا زووە ئەم دوورگەیەی جێهێڵابواو وەرێکەوتبوا بۆ شارەکەی خۆیان و لاوکەکەی بۆ هەموو خەڵکی دەڤەرەکەی خۆیان بخوێندبوا... لەو بەرەبەیانەدا ئاگرێکی وای بەربووبووە هەناوان کە لەم دنیا گەورەیەدا تاك و تەنها مابووەوە. دەبوا گۆڕەپانێك هەبوا، گۆڕەپانێکی گەورە، پڕاوپڕ لە خەڵك، تاکو لاوکە تازەکەی بۆ گوتبوان، پاشانیش دەبوا نەی بۆ لێدابوان. خەڵکەکە بێجووڵە، تەنانەت کۆکەیەکیش بکەن گوێیان بۆ رادەگرت، کاتێك کە شنەبای بەیانی هەڵیکرد، لەپڕ گوڕو جۆش و خرۆشێك دڵی داگرت، کاری لە مۆخی ئێسقانەکانی کرد، ئەو دۆزەخەی لە دڵی هەڵگیرسابوو نەما. کاتێك خۆرهەڵات شادمانیەکە هێشتا زیاتر دڵی داگرت. لاوکەکەی بۆ گیانداران، پەڕەندەو زیندەوەر و جڕو جانەوەر و شەو و دەریا و تریفەی مانگ و باو گوڵان خوێندبوو.

ڕۆژێکیش بۆ خەڵکەکەی هەر دەخوێنێت و خەڵکەکە لەوە بەدواوە، بە ئەندازەی کە خودی ئەو ئەمشەو هەستی بە بەختەوەری کردبوو هەست بە خۆشی و بەختەوەری دەکەن.

ئاسۆ روون بووەوە، دەریا ئەوددەمەی بەسەر سپیدا روانی کەوتە شەپۆلان. کەس لەو نێوە نەبوو. کەسیش بۆ بردنی ئاو نەدەهاتە سەرکانی. هیچ دەنگێك نەدەبیسترا. نە پەنجەرەیەك دەکرایەوە، نە دەرگایەك جیڕەجیڕی دەکرد و نە دەنگێك دەهات، ئەگەر دەنگی دەریاش نەبوا... هەستا، بەرەو لای ماڵی شەریفە خاتوون کەوتەڕێ، دەرگایان کراوە بوو، بە دەنگی بەرزەوە گوتی، شەریفە خاتوون، شەریفە خاتوون، لە کوێن؟ هیچ دەنگێك نەهات، چووە ژووری، کەس لەوێ نەبوو، چووە سەرەوە، لەوێش هیچکەس نەبوو. بە پەلە بای دایەوە لای پۆیراز، تەنانەت دایکە لێناش لەوێ نەبوو. سەری لە موسا ئاغاو دکتۆرەکان و پزیشکی ئاژەڵانیشدا، لەنێو گوند تەنانەت یەك کەسیش دیارنەبوو. چوو لە ژێر دارچنارەکان دانیشت. خەڵکی دوورگە بۆ کوێ چووبوون؟ بەلەم و کەلەکەکانی سەر ئەسکەلەی بەسەرکردنەوە، هەموویان لە شوێنی خۆیان بوون. دەبێت چووبنە کوێ؟ تادەهات زیاتر سەری سووڕدەما. سەری نزیکەی لە هەموو ماڵەکاندا بوو، بەڵام ماڵی خۆیانی لەبیرکردبوو. لە ئەسکەلەوە بە هەناسە سوارییەوە خۆی گەیاندەوە ماڵی خۆیان، پلیکانەکانی سێ دانە سێ دانە بڕین، بانگی ژنەکەی کرد، سەری بە ژووری داگرت. شەمچەی لە گیرفان دەرهێناو لامپاکەی داگیرساند، ماڵ چۆڵ و هۆڵ بوو. بۆ چۆڵبوونی ماڵەکان و بە بێئیزن رۆیشتنی ژنەکەی نەیدەتوانی هۆکارێك بدۆزێتەوە., چەند جارێکی دیکە سەری بە ژوورەکاندا گرت، نەیدەزانی چیبکات.

کەمێك زیاتر لەنێو ماڵەکاندا ئەملاو ئەولای کرد، دووبارە هات لە لێوی کانییەکە لەسەر تەختەکان دانیشت. لەلای سەرەوە بتەوێت نەتەوێت گوێی لە دەنگە دەنگێك بوو، گوێی خەواند، هەستا، دەنگێکی بیست، دەنگ تا نزیکتر دەبووەوە زیاتر دەبوو. ماوەیەك ئاوا بە پێوە چاوەڕێ ما. دەنگەکان وردە وردە نزیکتر دەبوونەوە. لەنێو دەنگەکاندا یەکەمجار دەنگی دکتۆر سەلمان سامی، پاشان دەنگی پزیشکی ئاژەڵان، دوای ئەویش دەنگی مەلەك خانمی ناسیەوە. بۆی دەرکەوت کەسانێك لەوێن. نەکا دەنگی ئەویان لەوێ بیستبێت و چووبنە رۆخ کانییەکە و گوێیان لێگرتبێت؟ لە پەنا دەوەنێك کە خۆی تێدا شاردبووەوە، بەخۆ کووڕکردنەوە بەنێو دەوەنەکاندا چووە باخی هەناران. خۆر دەرکەوت، تەمێکی تەنك رووی دەریای داپۆشی، جاڵجاڵۆکەیەك لە دەوەنێکەوە بۆ دەوەنێکی دیکە تەونێکی راچاندبوو و خۆی لەلای هەرە

سەرەوەی تەونەکە موچراندبوو و وەك بڵێیت سەیری ئەو چەند مێشانەی دەکرد کە بە تەونەکەوە بووبوون.

دەنگی خەڵکەکە ماوەیەکی زۆر دوای ئەوەی گەیشتنەوە نێو گوند نەما. دەنگبێژ لەبەرخۆیەوە گوتی تەواوە، هاتبوون گوێ لەئاوازی من بگرن، بریا چووبوامە نێو قامیشەکان و گوێم لە قسەکانیان راگرتبوا تا بزانم سەبارەت بەو لاوکەی ئەمشەو گوتم چ دەڵێن.

تا نیوەڕۆ لەنێو باخی هەنار مایەوە، حەسرەتێکی لەبەرگەگرتننەهاتووی لە دڵدا بوو کە ئازاری دەدا. شەو ئەو کاتەی سەرگەرمی دانانی لاوکە تازەکەی بوو، ئەو حەسرەتەی لە ناخی دڵەوە هەست پێکردبوو. دیسان لەنێو دەوەنەکان بە ئارامی و نهێنیەوە چووەوە ماڵەوە. ژنەکەی بە میهر و محیبەتێکی زۆرەوە پێشوازی لێکرد و گرتییە ئامێز، تا ئێستا ئەوی ئاوا عاشقانە لە ئامێز نەگرتبوو.

"کە گوێیان لە دەنگت بوو، کەس خۆی پێنەگیرا، دوای ئەوەی کەمێك لێرە گوێمان لێگرتی، پاشان بەلای دارزەیتوونەکاندا بە بێدەنگی تا ئەوێ چووین، تۆ بە کوردی دەتچڕی و پزیشکی ئاژەڵان بۆی دەکردنە تورکی. منداڵەکان و هەمووشمان یەکبەر دامانە پڕمەی گریان. خۆت لەکوێ شاردبووەوە، خواردنی خۆش خۆشم بۆ لێناویت. دکتۆرەکان گۆشتی بەرخیان بۆ ناردین. دکتۆرە بە تەمەنترەکە لە هەموان زیاتر گریا."

سفرە لەسەر عەرز راخرابوو. ژنەکە هەندی بڵێیت یەك و دوو خواردنەکانی هێنان و دایاننانە سەر سفرە، بەرامبەر یەکدی دانیشتن، بە بێدەنگی نانەکەیان خوارد، لەنێو کوردان و تورکان و لە زۆربەی ناوچەکانی ئەنەدۆڵدا کاتی نانخواردن کەس قسەی نەدەکرد. دوای نانخواردن ژنەکەی ئوسوی دەنگبێژ جێگای راخست، ئوسو جلەکانی داکەند و چووە سەر جێگا، ماوەیەکی درێژ ئەم تەنیشت و ئەو تەنیشتی کرد، نیوە شەو بوو بە ئاگا هات و رۆشنایی خۆری بەدی کرد و وایزانی بەیانی داوە، لە ژنەکەی پرسی: "شەو چیلێهات؟"

ژنەکەی گوتی: ((منداڵەکان و هەموان گریان.)) بێدەنگ بوو، ئیدی هیچ قسەی نەکرد.

"هەموان گریان؟"

"هەم هەردوو دکتۆرەکە، هەم مام ئاغا، ئەویش بەو سەرو کەللە گەورەیەوە، هەم مەلەك خانم، هەم شەریفە خاتوون... فرمێسکەکانی شەریفە خاتوون هەر وشك نەدەبوونەوە، هەم گشت منداڵەکان... ئەوان کاتێك تۆ نەبییت دەژەنی زۆر زۆر گریان."

"ئەمە باشترین هەواڵ بوو پێتدام. کەواتە، منداڵەکان، چڵمیان هەڵدەکێشایەوەو دەگریان."

"بەڵێ ئاوایە، لەکاتێکدا چڵمیان دەسڕیەوە لە دەستپێکەوە تا کۆتایی فرمێسکیان هەڵڕشت."

"ئەمە مانای وایە ئەم لاوکەی کە دامناوە ناوبانگ دەردەکات. دەنگبێژان تا ڕۆژی قیامەت شار بە شار و دێ بەدێ دەگەڕێن و دەیڵێنەوە. ئاوازێك کە لە دڵی من سەرچاوە بگرێت هەر دەنگبێژێك هەر جارێك کە بیڵێتەوە جوانکارییەکی تازەی دەخاتە سەر. ئیدی جەنگێك ڕوونادادتەوە. کەسانێك کە گوێیان لەو لاوکەی من دەبێت تەنانەت لە بیرکردنەوە لە جەنگیش بەسەرخۆیاندا تەریق دەبنەوە. منداڵەکان بەرلەوەی بخەون لاوکەکەی منیان بیست، گەورەترین پێوەری دەنگبێژان ئەمەیە. تورك قسەیەکی هەیە دەڵێت -هەواڵ لە منداڵ وەربگرە-.

کوردیش مەسەلەیەکی هەیە دەڵێن -زارۆك عاقڵترن-. من زۆر متمانەم بە منداڵان هەیە. ئاگرێکی حەسرەت ئامێز بەربۆتە دڵم خەریکە دڵم شەق بکات."

"دڵی منیش."

"منیش، ئێمە ناتوانین لێرە بمێنینەوە. ئەگەر دەنگبێژێکی تورك ئەم سترانەی من بڵێتەوە خوا دەزانێت چۆنی دەڵێتەوە، چۆن دەیەوێت جوانکاری زیاتری تێدا بکات. ئەگەر ئەوەندە ئەم لاوکەی منیان کە لەدەمی پزیشکی ئاژەڵانەوە بیستووە پێخۆش بووە، کێ دەزانێت ئەگەر لە دەمی دەنگبێژێکی تورکەوە گوێبیستی ببن چەندیان پێخۆش دەبێت. دەنگبێژانی تورك بە زوویی... زارۆك عاقڵن. من لە عەقڵ و دڵە پاك و بێگەردەکانی منداڵان دڵنیام. لەمە بەدواوە هەموان لەبارەی جەنگەوە سترانان دەڵێن، دەنگبێژانی حەفتاو دوو میللەت. خەڵکی حەفتاو دوو میللەتیش گوێ لە سترانەکانیان دەگرن و ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت جەنگ هەڵبگیرسێنن بە ئادەمیزادیان دانانێن، هیچکەس تەنانەت تفیشیان لێناکات. کەسێك ناڵێت کە هەر چوار کتێبی ئاسمانی کوشتنی مرۆڤکوژانیان بە واجب داناوە، لەبەر ئەوەی مرۆڤیان کوشتووە، لەبەر هەرچیەك بێت، تەنانەت بە هزریشیان داناهێت. بەمشێوەیە مرۆڤ دەبێتە مرۆڤ."

ژنە گوتی: "ئەم شوێنە بە دەردی ئێمە نایەت. سازەکەت هەڵبگرە بڕۆ بۆ ئێران، توران، بڕۆ تێکەڵی حەفتاو دوو میللەت ببە، ئێستا بیری لێدەکەمەوە ئەمشەو کە گوێم لێتبوو، ئەگەر لێرە بمێنینەوە، دڵی منیش دەتەقێت. بڕۆ بۆ حەفتاو دوو میللەت بخوێنە."

ژن و مێرد تا بەترێکی شەو راشکا پێکەوە قسەیان کرد. بەیانی بەوپەڕی شادمانیەوە لەخە و هەستان. چەندین ساڵ بوو بەیانییێکی وا شادیبەخشیان نەبینیبوو. چوون لەژێر دارچنارەکان دانیشتن. ئەو کەسانەی ئەوانیان ئاوا دەبینی کە ئاوا گۆڕانیان بەسەردا هاتووەو روخساریان لەشادمانیان دەبرقێتەوە نەیاندەزانی چیبلێن. لەلایەکی دیکە، منداڵان، یەك یەك دەهاتنە ژێر چنارەکان و بە چاوانی گەش و کراوەیانەوە بەسەر سامی لە ئوسوی دەنگبێژ رادەمان و زەردەخەنەیان دەکەوتە سەر لێوان. لەو ساتەدا سێ بەلەمی ماتۆڕدار، یەك بە دوای یەك دەرکەوتن و لە ئەسکەلە لەنگەریان گرت، لە بەلەمی یەکەم شوکری ئەفەندی دابەزی. پزیشکی ئاژەڵان ئەوی بەوانەی بۆ پێشوازی هاتبوونە ئەسکەلە ناساند، هەموان چوونە ژێر چنارەکان. ئوسوی دەنگبێژ هەستا، دەستی شوکری ئەفەندی گرت و ویستی ماچی بکات، بەڵام شوکری ئەفەندی بەخێرایی دەستی خۆی کێشایەوەو نەیهێشت ماچی بکات. ئوسوی دەنگبێژ دڵگران بوو، دەبوا ئەو دەستە پیرۆزانەی ماچ بکردبوان. ئایا دەستی کەسێك کە نەیدەویست وشەی جەنگ ببیستێت هی ئەوە نییە ماچ بکرێت؟ ئوسوی دەنگبێژ بەلایەوە سەیر بوو. کەمێك لەژێر چنارەکان دانیشتن. قاوەکانیان خواردەوە. بەلەمەکان خاڵی بووبوون و کرێکارەکان دابەزیبوون. شوکری هەستایە سەرپێ، لە پزیشکی ئاژەڵانی پرسی: "لێرە لەبارەی باخچەکە دەتوانم لەگەڵ کێ قسە بکەم؟"

پزیشکی ئاژەڵان، پۆیراز و نیشانچی و هوسمەن و ئەفە خەنجەرلی نیشاندا. شوکری ئەفەندی گوتی: "بابچینە نێو بەلەمەکەی ئێمەو لەوێ قسە بکەین."

پۆیراز گوتی: "بابچینە ماڵی ئێمە."

شوکری ئەفەندی گوتی: "باشە، بابچینە ماڵی ئێوە."

چوونە ماڵی پۆیراز، لەسەر مۆبلە جوانەکان دانیشتن. شوکری ئەفەندی چاوەڕێی نەدەکرد لە دوورگەیەکی وادا ماڵێکی ئاوا ببینێت.

پزیشکی ئاژەڵان ئەم سەرسامیەی شوکری ئەفەندی لە چاوانیەوە تێگەیشت و گوتی: "کاك پۆیراز ئەفسەرە شوکری ئەفەندی. ئەو یەکێکە لەو چەند سەربازەی کە لە ساری قامیش لە

دەست ئەسپیٚ و سەرما و سۆڵە و ڕەقبوونەوە بە زیندوویی ماوەتەوە. جگە لەوە قارەمانیٚکیشە کە مەدالیای سەربەخۆیی هەیە."

نەیگوت مەدالیای جەنگی سەربەخۆیی. نەیویست بە گوتنی وشەی جەنگ ڕەوشی تیٚکبدات. لەگەڵ ئەوەشدا دیسان شوکری ئەفەندی ئەبرۆی گرژکردن و ویٚکیهیٚنانەوە.

پۆیراز گوتی: "باخچەی خۆخان لەملایەیە."

"من ئیزن دەخوازم بچم باخچەکان بگەڕیٚم، دەمەویٚت لیٚکیبدەمەوە بزانم خۆخەکان بایی چەند دەبن، باخچەکەیەکیش دیاری بکەم بۆ ئەوانەی خۆخیان نەخواردووەو پیٚتانی نیشان بدەم. ئەم دەورو زەمانە مرۆڤەکان سەیریان لیٚهاتووە، نەخۆش بوونە، مرۆڤبوونی خۆیان لەدەست داوە."

پۆیراز لە دڵی خۆیدا گوتی شوکری ئەفەندیش وەکو ئوسوی دەنگبیٚژ قسان دەکات. دەنگبیٚژ ویستی دەستی ئەو ماچ بکات چونکە ئەو وشەی جەنگ بەکار ناهیٚنیٚت. پۆیراز هەروا لەو هرزو لیٚکدانەوانە دابوو کە شوکری ئەفەندی گەیشتبووە نیٚو باخچەکان و بە تەنیا سەیری خۆخەکان و بەری دارخۆخەکانی دەکرد. پۆیرازو ئەوانی دیکە هەر بەتەنها لەویٚ ڕاوەستانو سەیری ئەویان کردو پاشان بەرەو لای بەردەڵانەکەی ئەولا ڕۆیشتن و لەویٚ لەسەر تاتە بەردەکان دانیشتن. ماوەیەك دواتر شوکری ئەفەندی گەڕایەوە، کەیفی سازی ساز بوو. پۆیراز و ئەوانی دیکە کاتیٚك بینیان وا شوکری ئەفەندی بەرەو لای ئەوان دیٚت لە بەردەکان هاتنە خوارو بە پیریەوە چوون.

شوکری ئەفەندی گوتی:

"زۆر باشە، زۆر باشە، خۆخەکان باشن، پیٚگەییون، بۆ ئەوانەی کە تا ئیٚستا خۆخیان چ خواردبیٚت و چ نەخواردبیٚت هەروەها بۆ مندالەکانیش باخچەیەکی باشم دیاریکردووە. جاریٚکی دیکەش پیٚتان بڵیٚم، هەموو دنیا بگەڕیٚن خۆخی لەم جۆرە کەم دەست دەکەویٚت. قەدری خۆخەکانتان بزانن."

چوونەوە لای بەردەڵانەکە، هەر کە شوکری ئەفەندی ئەو نرخەی کە بۆ بەرهەمەکەی دانابوو پیٚیگوتن پۆیراز زمانی گیرا. نرخیٚك بوو زۆر دوور لە چاوەڕوانی. نرخیٚکی زۆر بەرز بوو.

"کریٚکارەکان هەر لە ئیٚستاوە دەست بە کۆکردنەوەی خۆخان دەکەن. بە دوو ڕۆژان تەواوی دەکەن، پارەکەی دەبیٚت بدەینە کیٚ؟"

"کاك پۆیراز."

"کاك پۆیراز دەتوانیت لەجیاتی ئەو پارەیەی لەمنی وەردەگریت نووسراوێکم بدەیتێ؟"

"بێگومان دەیدەم. سەرچاو. بابچینەوە نێو گوند، لە نۆرینگەی دکتۆرەکان هەم کاغەز هەیە و هەم قەڵەم."

چوونە لای دکتۆرەکان، دکتۆرەکان لەسەر کورسیان لەبەرامبەر یەکدی دانیشتبوون و قسەیان دەکرد. هەر کە ئەوان گەیشتنە لایان هەستان، گوتیان: "بەخێر بێن!" و جێگایان نیشاندان.

"دەمەوێت لەبری پارەی خۆخەکان نووسراوێك بدەمە شوکری ئەفەندی."

"فەرموو بۆ پشت مێز، هەم کاغەز هەیە، هەم قەڵەم. فەرموون."

دکتۆر خەلیل رەفعەت هەستا، کورسی بۆ پۆیراز دانا. پۆیراز لەسەر کورسیەکە دانیشت، بڕی ئەو پارەیەی کە لە شوکری ئەفەندی وەریگرتبوو لە کاغەزێك نووسی، نووسینەکەشی خوێندەوە.

دکتۆر سەلمان سامی پێکەنی: "هەموو باخچەکانی دوورگەت بەم پارەیە کڕیون؟"

"نەخێر قوربان، تەنها بەری درەختەکانی ئەمساڵم کڕیوە."

"پارەیەکی چەند زۆرە!"

"خۆخەکان لە جۆرێکی زۆر باش و بەنرخن. جۆرێکی زۆر بەتام. هەر کەسێ دانەیەك لەم خۆخانە بخوات هەموو جەستەی بۆنی خۆشی ئەو خۆخانە دەگرێت. ئینجا وەکو دارخۆخێکی گوڵگرتووی لێدێت. قوربان من بچم بە کرێکارەکان بڵێم دەست بە لێکردنەوەی خۆخان بکەن. دەبێت ئەوەشیان پێبڵێم دەست لە خۆخی ئەو باخچەیەی کە بۆ منداڵان و خۆخ نەخواردووەکانم داناوە نەدەن. بە منداڵەکانیش بڵێم با زۆران نەخۆن، هەموو دوورگە بۆنی خۆخ دەگرێت، جگە لەوە سکچوونیش دەگرن، بەجۆرێك کە دکتۆرەکان ناتوانن کارێك بکەن. خەڵکی ئەم ناوە وشەی سکچوون نازانن. لە ناوچەی ئێمە پێیدەڵێن ڕەوانبوون. ڕەوانبوونی خۆخان هەزارجار لە ڕەوانبوونی ترێ خراپترە."

پێکەوە چوونە ئەسکەلە. کرێکارەکان لەسەر نیوتەخت و تەختەکان و لەو گۆڕە راکشابوون و دانیشتبوون و چاوەڕێی شوکری ئەفەندیان دەکرد. لەگەڵ بینینی ئەو یەکپێ هەستانەوە.

شوکری ئەفەندی دەستووریدا:

"سندوقەکانی میوەو سەبەتە و تریانەکانی ئەسکەلە هەڵبگرن بابچینە نێو باخی خۆخان و لێکردنەوەو کۆکردنەوەیان دەست پێبکەین." کرێکارەکان بەخێرایی سەبەتە و سەندوقەکانی کە لە بەلەم دایانبەزاندبوون هەڵگرتن و چوونە نێو باخەکان و یەکسەر دەستیان بە لێردنەوەو کۆکردنەوەی خۆخان کرد. کرێکارە بالاّبەرزەکان خۆخیان لە درەختان دەکردنەوەو دەیانخستنە نێو تریانەکان کە بەدەستیانەوە بوون و دەیاندانە کرێکارە هاوڕێکانیان، کرێکارە بەردەستەکانیش خۆخی تریانە بچووکەکانیان وەردەگرتن و دەیانخستنە نێو سەبەتە و تریانی گەورەترو سەندوقەکان. کرێکارەکان بە شارەزاییەوە خۆخیان لە لکی دارخۆخەکان دەکردنەوە.

لەپڕێکدا لە باخچەکەی ئەولاتر دەنگی زاك و زیکی منداڵان و ژنان بەرزبووەوە. هەموو خەڵکی دوورگە کیسە و مەنجەڵ و تەنەکە و هەرچی لەبەر دەستیان بوو هەڵگرتبوو هاتبوونە نێو باخچەی خۆخان. ژمارەیەك منداڵ بەسەر درەختەکانەوە بوون، هەندێکیان لەژێر درەختەکان بەشێکی دیکەیان خەریکبوون بە قەدی دارەکان هەڵدەگەڕان. ژنان ئەو لکانەیان شۆڕکردبووەوە کە خۆخیان پێوە بوون، هەندێکیان بە دارقامیشەکان خۆخەکانیان هەڵدەوەراندن. ئەو هەراو هوریایە تا رۆژ ئاوابوو بەردەوام بوو. کرێکارەکان نیوەی باخچەکانیان رنیبوو و کۆیانکردبوونەوەو ئێستا لەسەر تاتە بەردەکان دانیشتبوون و خەریکی پشوودان بوون. بڕیاریان وابوو دوای تاوێکی دیکە ئەو خواردنانەی هێنابوویان بخۆن، هەر لەو گۆڕە رابکشێن و بنوون و بەیانی زووش لەخەو هەستن.

شوکری ئەفەندی لەگەڵ دکتۆرەکان، موسا ئاغا، نیشانچی، پزیشکی ئاژەڵان، ئەوانی دیکە، لەپێش هەموویان مەلەك خانم، ژنەکانی دیکە، بە تەنیشت کرێکارەکان، بەرەو سەرەوە، بۆ نێو ئەو باخچەیەی خۆخان دەچوون کە بۆ خەڵکی دوورگە جیاکرابووەوەو دەنگە دەنگ و زاك و زیکی ژنان و منداڵان ئەو ناوەی داگرتبوو. کە لە باخچەکە نزیك بوونەوە سەیریانکرد نەخۆخێك ماوە، نە گەڵاو لکی درەختێك، دەتگوت باخچە کەوتۆتە بەر هێرش و پەلامارەوە.

دکتۆر سەلمان سامی بە حاڵەتێکی دڵگرانانە سەری راوەشاند، دەم و چاوی گرژ داهاتن و گوتی:

"سوپای چەنگیزخان بەنێو ئەم باخچەیەدا ڕەت بووە. سەیرکەن ئەو باخچەیەی کە کرێکارەکان کاریان تێدا کردووە تەنانەت گەڵایەکیش هەڵنەوەریوە، ئەمەش باخچەی ئەمانە..."

ژن و منداڵان بە پشتی داهاتووەوەو بە سەبەتە و گونیە و تەنەکەی پڕ لە خۆخ بە تەنیشتیاندا تێدەپەڕین.

دکتۆر سەلمان سامی گوتی:

سەیری ئەمانە بکەن، دەڵێی سەربازی چەنگیزخانن. باخچەی خۆخان وێران دەکەن، بەزوویی دەیبینن. چیدەگوت بەو سوپایەی چەنگیزخان؟ پێیدەگوت سکڕەوان. "ڕەوان دەبن، ڕەوان."

دکتۆر زۆر لە وشەی سکڕەوان خۆشی هاتبوو.

"ڕاستە سبەی دەبنە هۆی ئەوەی هەموو دوورگە بۆن بگرێت. خەریکە چ بەڵایەکمان بەسەر دێت!"

چوونە ژێر دارچنارەکان.

موسا ئاغا گوتی:

"ئەمشەو تەشریف ناهێننە ماڵی ئێمە؟ دەتوانن ئەمشەو لە ماڵی ئێمە بمێننەوە. ئێمە ژووری میوانانیشمان هەیە. کاکە پۆیراز، دکتۆرە هێژاکان، کاکی پزیشکی ئاژەڵان، ئێوە تەشریف ناهێنن؟"

گوتیان: "سەرچاو."

موسا ئاغا خۆشحاڵ بوو.

"نیشانچی تۆش، ئەفە تۆش."

"ئێمە کارمان هەیە قوربان."

شوکری ئەفەندی گوتی:

"ئێمە ببوورە قوربان، من تەنها لەنێو کابینی بەلەمەکەی خۆمدا دەتوانم بنووم." بۆ نانخواردن بانگهێشتی ماڵی موسا ئاغا کران و چوونە ئەوێ. ئەفە خەنجەرلی دەستی نیشانچی گرت، دانەوی و چرپاندیە گوێی:

"ئەوم بینی. ئەو پیاوە."

"ئەوەی بەدوای عەباسدا دەگەڕا؟"

"شێوەی لەو دەچوو."

"بۆ کوێ چوو؟"

"لەنێو کرێکارەکان بوو."

"ئەوانە هەر دێن و دەچن. هەر جارێکیش کە دێن بەدوای عەباسدا دەگەڕێن. عەباس کێیە؟"

"نازانم، بەڵام هەموو ئەوانەی دەهاتنە ئێرە، لەیەك دەچوون، وەك ئەوەی لە کارخانەیەك دروستکرابن. جارێك پێنج یان شەش یان حەوت کەس هاتن، هەمووشیان رەشپۆش بوون، روخسارێکی بۆر و چاو و گوێ و لووت و موو و سمێڵ و دەستیشیان وەکو یەك بوو. شێوەی ئاخاوتن و رۆیشتن و پێکەنین و هەموو جووڵەیان وەکو یەك بوو. ئەوانەی کە یەك یەکیش دەهاتن هەر لە یەك دەچوون. موو و سمێڵ بۆر و لووتی چەماوە. پێموایە هەمووشیان بیابانشین بوون. بەدوای کەسێکی گرنگدا دەگەڕان. مەگەر پۆیراز دوای ساری قامیش لە ئورفا دژی فەرەنسییەکان نەجەنگاوە؟"

"جەنگاوە."

"مەدالیای جەنگی سەربەخۆیی لەوێ وەرنەگرتووە؟"

"لەوێی وەرگرتووە."

"کێ ناوی لە پشیلەکە ناوە عەباس؟"

"پشیلە هی عەباسە، بەرلەوەی کە پۆیراز بێتە دوورگە، ئەو پشیلەیە و ڤاسیلی لە دوورگە بوونە، لێرە خۆیان شاردبووەوە، لەنێو قامیشەڵانەکە. پۆیرازیش هات و هەرسێکیان لێرە یەکدیان بینیوە، پشیلەکە و ڤاسیلی و پۆیراز بوونە برادەری یەکدی."

"وایە، ئەمە ئاشکرایە، پۆیراز بۆچی پەنای هێناوەتە بەر ئەم دوورگە چۆڵە؟ پۆیراز کە ئەفسەر بووە، قارەمانێك بووە کە مەدالیای سەربەخۆییشی وەرگرتووە دەیتوانی هەر کوێیەکی پێخۆش بێت بچێتە ئەوێ و لەوێدا بژیت و کار بکات. تازە، تەمەنیشی کەمە، بۆچی هاتۆتە ئەم دوورگە چۆڵ و هۆڵە؟"

لەسەر تەمەنی پۆیراز زۆر قسەیان کرد، سەرەنجام لەسەر بیست ساڵی رێککەوتن.

بەرەو باخی خۆخان بەڕێکەوتن. کرێکارەکان لەنێو باخەکان بەوپەڕی خێراییەوە سەرگەرمی کاری لێکردنەوەو کۆکردنەوەی خۆخان بوون. خۆخەکانیان دەخستنە نێو سەبەتە و سەندوقەکان و دەیانگواستنەوە نێو بەلەمەکان. چەند ساتێك لە دەرەوەی باخچەکان راوەستان، پاشان چوونە نێو کرێکارەکان، یەك یەك سەیری کرێکارەکانیان کرد. ئەو کەسەی لەو پیاوە دەچوو لەنێو کرێکارەکاندا نەبوو. لە باخەکان بەرەو لای سەرەوە، بۆ ئەو باخچەی کە بۆ خەڵکی دوورگەکە تەرخان کرابوو کەوتنەڕێ. هێشتا منداڵان بەسەر درەختەکانەوە بوون. ئەگەری ئەوە هەبوو کە لە درەختەکان بکەونە خوارێ، رەنگبوو زیانیان پێبگات، بەڵام قەیدی ناکات، گرنگ نەبوو. خێزانەکان خوا دەزانێت لە هەر جەنگێکدا چەند تەلەفاتیان دابوو. منداڵێك کە بەسەر درەختێکی گەورەوە بوو خێرا خێرا خۆخی لە لکی درەختەکە دەکردنەوە، بەهەمان خێرایی دەیخستنە نێودەمی و ناوکەکەیشی دوور دوور تێهەڵدەدا. ماوەیەك هەر لەوێ مانەوە، بە حەپەساویەوە سەیری منداڵەکەیان کرد، دەست و دەمی منداڵەکان وەکو مەکینە کاری دەکرد.

خەنجەرلی گوتی: "ئەم منداڵە حاڵی باش نییە. نیوەی شەوێ لەخەو هەڵدەستێت یەکڕاست دەچێتە لێواری دەریا."

نیشانچی گوتی: "لێوار بۆچی؟"

"بۆچی پێناوێت، ئەم منداڵە تا عەسر دادێت خۆخێك چییە بە دارخۆخەکەوە ناهێڵێت، هەموویان ئاودیو دەکات و دەچێتەوە ماڵ، نیوەشەو ژانە سك و سکڕەوانی دەگرێت، تا بەیانی لێوار خۆت بگرە هەر دەچێت و دەگەڕێتەوە."

"بۆچی بۆ لێوار، خاوێنکردنەوەی خۆی؟"

"نە گیانم، بۆ ئەوەی قوونی بە بەردان پاك بکاتەوە."

"بۆ چما بە ئاوی دەریا خۆیان ناشۆن؟"

لە گوند کە ئاوی رەوان و جۆگە و رووباریش هەن، ئەگەر تەنانەت بەردیشیان دەست نەکەوێت بە گیاو گۆڵ و پەلکی دارو دەوەنان خۆیان پاك دەکەنەوە، تەنها ئەو پیرەمێردانەی کە دەستنوێژ دەگرن بە مەسینە دەچنە سەر پێشاو."

لە کاتێکدا بە دەم پێکەنینەوە دەگەڕانەوە نێو دێ پیاوێکیان بینی کە لە نێوان دوو بەردان دانیشتبوو، یەکسەر بەرەو لای چوون، کابرای کەلەبۆر ئەوانی بینی، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەوان

چوون لەسەر سەری راوەستان کەچی کابراکە چەناگەی کە لەسەر ئەنۆکانی دانابوو، سەری بەرز نەکردەوە.

"سەلامو عەلەیکوم."

"عەلەیکومەسەلام."

کابرا هەر خۆیشی نەجوولاند، سەری هەڵنەبڕی.

ئەفە خەنجەرلی پرسی: "بەدوای کەسێکدا دەگەڕێیت؟"

کابرا بێئەوەی وەڵامبداتەوە هەستایەوە.

"تۆمان پێشتریش بینیبوو کە هاتبوویتە ئێرە، بەڵام لێمان ون بووبوویت."

"من یەکەم جارمە دێمە ئێرە."

"منیش دووەم جارمە کە دەتبینم. ئێستا کە تۆ دەڵێیت یەکەمجارتە، باوابێت."

ئەفە خەنجەرلی گوتی: "من کە تۆم لەنێو کرێکارانی کە خۆخیان کۆدەکردەوە بینی پێموابوو سەر گروپی کرێکارنیت."

کابرا لە ئەفە خەنجەرلی رامابوو و سەراپای ئەوی بە نیگاکانی دەپشکنی.

"تۆ بۆچی هاتوویتە دوورگەی ئێمە، ئەگەر پێویستیت بە شتێك هەیە، بڵێ."

"هەربژین برادەران، بە ئێوە نەڵێم بەکێ بڵێم، من بە دوای ئەفسەرێکدا دەگەڕێم."

"هۆووی، تۆ بەدوای عەباسدا دەگەڕێیت، ئەو پیاوەی جاری یەکەم هات هاوشێوەی تۆ بوو، وەکو سێوێك لەنێوەڕاستەوە دوولەت کرابن، چ کارێکت بە عەباسە؟"

پیاوەکە ماوەیەك بێدەنگ بوو، بیریکردەوە، پاشان هاتە قسە:

"عەباس لە دایك و باوکی زیز بووە، پاشان شارەکەی جێهێڵاوە."

"تۆ چ خزمایەتییێکت لەگەڵ ئەودا هەیە؟"

کابرا ئامادە بوو یەکسەر وەڵامی دایەوە:

"ئامۆزای ئەوم."

"ئەو پیاوەی جاری پێشوو چی؟"

کابرا کە نەیتوانی یەکسەر وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە، کەمێك بەدوو دڵییەوە داما، پاشان گوتی: "ئەویش، ئەویش." بێدەنگ بوو، بیریکردەوە، "ئەویش، ئەو ناناسم، نازانم."

"دەتەوێت عەباس ببینیت؟"

کابرا وروژا، خۆشحاڵ بوو، نەیدەویست خۆشحاڵبوونەکەی دەربخات:

"دەمەوێت." کەمێك دواتر هاتەوە سەرخۆی، "ئەگەر بیدۆزمەوە باوك و دایك و براو خوشکەکانی، بە کورتی هەموان خۆشحاڵ دەبن."

"یاڵلا با بڕۆین."

نیشانچی لە پێشەوەو ئەوانی دیکەش بەدوایدا بەرەو لای چنارەکان ڕۆیشتن، ڤاسیلیان بینی وا لەلای کانیەکە دانیشتووە. هەر کە نزیك بوونەوە عەباسیشیان بینی وا خۆی لە قاچەکانی ئەو هەڵدەسوێت.

"ڤاسیلی، عەباس لە کوێیە؟"

ڤاسیلی داهاتەوەو عەباسی هەڵگرتەوە کە خۆی لە قاچەکانی ئەو هەڵدەسوو و لە باوەشی نا:

"بیگرە ئەمەش عەباس. ئەگەر دەتەوێت ژنی بۆ بێنیت، درەنگە، عەباس زۆر دەمێکە ژنی خۆی هێناوە، ژنێك هەر دەڵێیت دەستەگوڵە. بەزووییش دەبێتە خاوەن منداڵی خۆی. ئەگەر دەتەوێت یەکێکیشی دەدەمە تۆ. چ کارێکت بە عەباسە؟"

نیشانچی بەدەستی ئەو پیاوە شیکپۆشەی کە سمێڵی نووکتیژ و چاوانی سەوز و قەدو باڵایەکی بەرزی هەبوو نیشاندا:

"ئەم هاوڕێیە کاری بە عەباس هەیە."

"چ کارێکی پێهەیە؟ ئەم برادەرە جارەکەی دیکەش کە هاتبوو دەیەویست لەگەڵ عەباس ئاشنا بێت، منیش بە یەکدیکەم ئاشنا کردن، ئەویش خۆشحاڵ بوو و ڕۆیشت."

"ئەمەیان ئەو نییە. دەبینیت چەند لە هاوەڵەکەی دەچێت؟"

دەستی بۆ لای چاکەتی پیاوەکە درێژکرد، لاچکی چاکەتەکەی گرت و هەڵیدایەوەو گوتی: "سەیرکە دەمانچەکەشی تەواو وەکو ئەوەکەی پێشووە."

ڤاسیلی گوتی:

"کابرای جاری پێشوو پرسی کێ ناوی لەم پشیلەیە ناوە عەباس، ئەمەشیان ئەو پرسیارەی کرد؟"

"کەواتە منیش ئێستا دەپرسم." بە جووڵەیەکی چاوەڕواننەکراو خۆی راستکردەوە، "ئێستا دەپرسم، پشیلەکە هی کێیە؟"

ڤاسیلی هەستاو لەپێش کابرا راوەستاو گوتی:

"بەتۆ چی من ناوم لەم پشیلەیە ناوە، بەتۆ چی برا."

حاڵەتی ڕەقڕاوەستان و ئامادەباشی کابراکە نەما، دەنگەکەی نزم بووەوەو شانەکانی داکەوتن:

"ببوورە براکەم، هەر لە کونجکۆڵی خۆمەوە پرسیم."

"کابرای پێشووش کە هەر دەڵێیت تۆ بوو ئەم پرسیارەی کرد"

"ئەویش کە بینیوویە ناوی مرۆڤیان لە پشیلەیەك ناوە کونجۆڵ بووە. مەگەر کێشەیەکی تێدایە؟"

"ئەگەر تەنها کونجکۆڵی بێت باشە پێتدەڵێم. کونجۆڵی کونجکۆڵیە. بەو پیاوەی کە دەمانچەکەی ڕێك وەکو دەمانچەی تۆ بوو گوتم و بەتۆش دەڵێم، من ئەوکاتەی لە چاناك قەڵا لە مەیدانەکانی جەنگ بووم، برادەرێکم هەبوو زۆر یەکدیمان خۆش دەویست، ڕۆژێك من بریندار بووم، خەریك بووم دەمردم، گوایە خوێنم لەبەر دەڕۆیشت، ئەو لە کۆڵی کردووم و گەیاندومیەتە نەخۆشخانەیەك کە زۆر دوور بووە. لە نەخۆشخانەکە خوێنڕێژیەکەیان ڕاگرتووم و لە مردنیان ڕزگار کردووم، ناوی ئەو برادەرە ئەرزەرۆمیەشم چ بووە؟ ناوی ئەو پیاوەی کە لە مردن ڕزگاری کردم عەباس بوو، عەباس، تێگەیشتیت؟ ناوی ئەم پشیلەیەش عەباسە. بۆ ئەوەی کە بەردەوام ناوەکەی بهێنم ناوی پشیلەکەمم ناوە عەباس. هەرجارێك کە پشیلەکە بە عەباس بانگ دەکەم، عەباسی برادەرەکەم بیردەکەوێتەوە."

"تێگەیشتم برا، سوپاس برا."

"فەرموو دانیشە."

نیشانچی گوتی:

"ئێوە دانیشن، با ئێمە بچین سەرێك لە باخی خۆخان بدەین و بگەڕێینەوە، ببینین بزانین منداڵەکان چیان لەگەڵ باخەکانمان کردووە."

بەرێکەوتن:

"بێژە ئەفە، ئەم پیاوە ڕێك دەڵێی ئەوەی پێشووە، بەڵام ئەویش نییە. ئەو کابرایە دەستمان لێهەڵناگرێت. بۆی هەیە لە شوێنێك پۆیراز غافلگیر بکات و بە حسابی بگات. یان دیسان کەسانی هاوشێوەی ئەمانە دەنێرن کە لە دەرفەتێکی گونجاودا دەستی لێبوەشێنن. ئەم پۆیرازەش خۆ هەموو شتێکی خۆی بە هەموان دەڵێت، بەڵام ناڵێت ئەم پیاوانە کێن، چ کارەن، ئەو پیاوە

هاوشێوە ڕەشپۆشانە، ئەو پیاوە بۆر و ڕەشتاڵانە دێن و دەڕۆن، هەمووشیان دەمانچەیان پێیە، هەمووشیان سۆراغی عەباس دەگرن، ئەمە بۆچی، عەباس کێیە؟"

ئەفە خەنجەرلی ماوەیەك كپ و بێدەنگ بوو، لەگەڵ پیاوە باڵابەرزەکان بەرەو لای باخی خۆخان چوو، نیشانچی بەدوای ئەودا دەڕۆیشت. کەمێك دواتر، ئەوددەمەی لە دار خۆخەکان نزیك دەبوونەوە، ئەفە خەنجەرلی ڕاوەستا، ئاوڕی لە دواوە دایەوە: "ئەم بابەتە زۆر جیدیە، من دەزانم، ئەمانە تێنووی خوێنی عەباسن. ئەوان بەر لەمنیش دەهاتنە ئێرە. تۆ ناوت عەباسە، زۆر لە گوینە کە ناوت عەباس بێت."

"من ناوم عەباس نییە، قەتیش عەباس نەبوومە."

"ئەم عەباسە کێیە، لەم دوورگەیە هەست بە عەباس ناوێك دەکەم."

"بەڵکو ناوی یەکێك لە دکتۆرەکان بێت، ئەگەر ناوی ئەوان عەباس نییە، بۆچی ئەو دکتۆرانە بەو گەورەبییەوە هاتوون لەم دوورگەیە کە هەر هێندەی لەپی دەست دەبێت نیشتەجێ دەبن؟"

"ئەوان لێرە کاری نۆشدارییان کردووە، ئێرەشیان زۆر پێخۆش بووە."

"شار و مەملەکەتی خۆیان جێهێڵاوە، تەنها لەبەر خاتری ئەمە هاتوونەتە ئێرە، ئەریٚ؟"

"داخۆ بۆچی هاتوونەتە ئێرە، ئەمەیان نازانم."

"بابچینە لای ئەو بەردانەی ئەولا، لەژێر ئەو درەختە دابنیشین و قسان بکەین."

بەرەو لای بەردەڵانەکە چوون، دانیشتن، پشتیان بە بەردەکانەوەدا و کەوتنە قسان. وا سەرگەرمی قسان بووبوون هیچ ئاگایان لەکات نەمابوو.

ئەفە خەنجەرلی گوتی: "قبوڵە، قبوڵە، ئێستا دەچینە لای ئەو پیاوە، دەیبەینە سەر کانیەکە، لەوێ داوای لێدەکەین بۆمان ڕوون بکاتەوە، ئینجا تێدەگەین ئەو پیاوانە چ کارێکیان لێرە هەیە."

نیشانچی گوتی: "باشە، قبوڵە. من دەیدوێنم و داوای لێدەکەم بۆمان ڕوون بکاتەوە. هەر زوو وەقسەی دێنم. بەبێلێدان و ئەشکەنجە و جنێوپێدان، وادەکەم کە وەکو بولبول قسە بکات."

"چۆن چۆنی دەتەوێت بە قسەی بێنیت نیشانچی؟ وادەزانی بە قسەهێنانی خەڵك هێندە ئاسانە؟"

"من مرۆڤەکان دەناسم. دەزانم ئەو کەسە بەرامبەرمە چۆن و بۆچی دەدوێت."

"تۆ ماسیناس و دەریاناسیشی نیشانچی. گوایە لەگەڵ ماسی و دەریا رووبەڕوو دادەنیشیت و قسان دەکەیت. جا چ شتێك لەبارەی تۆ ناڵێن. تازە، سوڵتان خاتوونی تۆ زۆر شتی بە خانمەکەی ئێمە گوتووە، تۆ جادوگەری، هەر کەسێکی بتەوێت ئەفسوونی دەکەیت. مارو پڵنگ و والی و پاشاو شاکان ئەفسوون دەکەیت، ئەویش هەروا لێدەکەیت. دکتۆرەکانیشت چونکە ئەفسوون کردن لێرە مانەوە."

نیشانچی گوتی: "ئەم قسانەی کە دەیانکەیت راست نین. تەنها ئەفسوونکردنی دەریا راستە کە ماسییەکانی خۆیم بۆ دەنێرێت."

"تازە، کە لەگەڵ دەریاش دەدوێیت، دەریاش ئەو شوێنانەت نیشان دەدات کە ماسیان زۆر لێیە. تۆش دەچیت دەیانگریت، زۆر زیاتر لە خدر سڵاوی خوای لێبێت، ئەو عارفەی دەریاکان، بەلەمەکەت پڕ دەکەیت لە ماسی. وادیارە، دەریات بەو هەموو گەورەییەوە ئەفسوون کردووە ها؟"

"من ئەفسوون دەکەم، خدری عارفی دەریاکان دەستی خۆی دایە دەستم و منیش دەریاکانم ئەفسوون کردن."

"بەه، بەه، بەه، ئافەرین، خدر ئەم هێزەی پێدایت، وایە؟"

"وادەڵێن."

"بەه، بەه، بەه، ئافەرین بۆ تۆ."

"ئێستا من ئەو پیاوە وەقسە دێنم، لە مەبەستەکەی دەگەم."

"ئێستا کە دەستت کەوتووە، ئەم پۆیرازەش بە قسە بێنە با تێبگەین ئەو مەترسیانە چین هەڕەشەی لێدەکەن."

"ئەمە هەر زۆر ئاسانە."

"دەبێت یەکسەر ئەو پیاوە لەگەڵ خۆمان ببەینە سەرکانی."

ئەفە خەنجەرلی تەواو متمانەی بە نیشانچی دەکرد و باوەڕی وابوو کە ئەو پیاوە مووبۆرە بە قسە دێنێت و بەمشێوەیە راز و نیازەکەی تێدەگەن. بە پەلە چوونە ژێر دارچنارەکان، پیاوەکە لەوێ نەبوو. ڤاسیلیان کە لەسەر تەختەکان راکشابوو هەستاند. ئەفە خەنجەرلی بە نەڕاندنێکەوە پرسی:

"ئەو پیاوە کوێوە چوو؟"

ڤاسیلی لە کاتێکدا چاوەکانی هەڵدەگلۆفی، بە بێتاقەتیەوە گوتی: "لێرە بوو."
"بۆ کوێ چوو؟"
"کێ؟"

"هەمان ئەوەی کە سۆراغی پشیلەی دەگرت. خۆت پێتگوت عەباس ناوی پشیلەکەتە، ناوی دۆستە ئەرزەڕۆمیەکەت بووە کە گیانی رزگارکردوویت. ئەمانە خوێنگەرمانە بەدوای عەباس ناوێکدا دەگەڕێن، هەموو لەگەڵ پشیلە عەباسی خواڵوو رووبەڕوو دەبنەوە. بۆ کوێ چوو؟"

"چەند ساتێك بەر لە نووکە لێرە بوو، دەبێت بۆ کوێ چووبێت؟ خۆ باڵی لێنەڕواون. مەگەر لەگەڵ ئەو کرێکارانە نەهاتووە؟"

ڤاسیلی گوتی: "لەگەڵ وان هاتووە. من خۆم لە ئەسکەلە لەنێو کرێکارەکاندا بینیم، لام سەیر بوو، ئەمە لەنێو ئەم کرێکارانە چ دەکات. پاشان گوتم، رەنگبێت شەریکی شوکری ئەفەندی بێت، شەریکیشی نەبێت مسۆگەر خزمیەتی. دەبێت لە شوکری ئەفەندی بپرسین. دەبێت سەرێکیش لە کرێکارەکانی ناو باخان بدەین، ئەگەر لەوێ نەبوو، دەبێت لە شوکری ئەفەندی بپرسین. دەبێت بۆ کوێ چووبێت، هەر لەم ناوەیە."

هەرسێکیان لەگەڵ پشیلەکە کە ناوی عەباسە و بەدوایانەوە بوو، بۆ لای باخەکان رۆیشتن، لە سێ لای جیاواز چوونە نێو کرێکارەکان. خۆخەکان کە لێدەکرێنەوە بۆن و بەرامەیەکی خۆش ئەو ناوە پڕ دەکات. نەوەك کابرا جلەکانی گۆڕیبێت یەك یەك لە کرێکارەکان وردبوونەوە. کرێکارەکان بە نابەدڵیەوە سەیری ئەو سێ پیاوەیان دەکرد.

هەسێکیان بە شڵەژاویەوە لە باخەکان چوونەدەر، کاتێك چوونە ژێر دارچنارەکان، سەیریانکرد شوکری ئەفەندی و دکتۆر سەلمان سامی لە تەنیشت یەکدیەوە دانیشتوون، یەکسەر سۆراغی کابراکەیان پرسی، شوکری ئەفەندی گوتی کەسێکی ئاوای نەبینیوە. کابراکە لەگەڵ ئەوان لە یەکێك لە بەلەمەکان دابەزیبوو، لە عەباسی پرسیبوو، ئەوانیش پشیلەکەیان نیشان دابوو. نیشانەکانی کابرایان لە جلوبەرگەوە بگرە تا موو و سمێڵ و چاوەکانی باسکرد، شوکری ئەفەندی کەسێکی لەو چەشنەی هەرگیز نەبینیبوو.

کاری لێکردنەوەو کۆکردنەوەی خۆخەکان تەواو بوو. یەکێك لە بەلەمەکان پڕ کرابوو لە سەبەتەو تریان و سەندوقی مێوە. ئەو بەلەمانە دەبوا چەند جارێکی دیکەش بهاتبوانەوە بۆ دوورگە و ئەو خۆخانەی مابوون بار بکەن.

ئەو پیاوە بۆ کوێ چووبوو؟ کەسێکی وەکو ئەو دەبێت لە کوێی دوورگە خۆی شاردبێتەوە؟ لە دوورگە هەموو خەڵکەکە، ژن و منداڵەکان گشتیان دەستیان لە کاروبارەکانی خۆیان هەڵگرتبوو و بەنێو شوێنەکانی دیکەی دوورگەدا بڵاوبووبوونەوە. لێگەڕان سێ ڕۆژ درێژەی کێشا. ئاشە هەواییەکان، ژێر دەوەنەکان، سەر درەختەکان، ئەشکەوتە بچووك و گەورەکان، هەموو خانووە چۆڵەکان و هەموو کونج و کەلەبەرەکانی دوورگەیان پشکنی. وەك ئەوەی زەوی دەمی کردبێتەوەو پیاوەکەی قووت دابێت. هەموو ئومێدێکیان بۆ دۆزینەوەی کابراکە لەدەست دابوو، تەنێ ئەفە خەنجەرلی کەمێك ئومێدی مابوو. دواجار لە شوێنێك سەروکەللەی هەر بەدەردەکەوێت. هەموو ڕۆژێ بەیانیان زوو لە ماڵ دەردەچوو، بە نیگاکانی هەموو شوێنێکی دەپشکنی، گوێقوڵاغ بوو، کاتێك بچووکترین دەنگی دەبیست، بە هەڵەداوان بەرەو لای دەنگەکە دەچوو.

هەموان لە ژن و پیاو، پیرو گەنج، تەنانەت ژنێکی وەکو شەریفە خاتوونیش دەستی لە کاری چنینی جاجمی موسا ئاغا هەڵگرتبوو و بەدوای ئەو پیاوە دادەگەڕان کە بۆ کوشتنی پۆیراز مووسا هاتبوو و لە دوورگەدا ون بووبوو، ئەو واتەواتە کە پیاوەکە لە دوورگەدا ون بووە بەسەر زاری هەموو خەڵکەوە بوو، بەزوویی ئەمە ئەم بابەتە لە سەرجەم شارۆچکە و گوندەکانیشدا بڵاودەبووەوە و خەڵکەکە چاوەڕوانی کوشتنی دەبوون، هەندێکیان دڵگران دەبوون و هەندێکی دیکەیان خۆشحاڵ، تەنها پۆیراز لەو بابەتە نیگەران بوو. زەهراش دڵی بە دەریا دەداو هەموو ڕۆژێ بەیانیان زوو بە ڕوخسارێکی خەمبارانە لەگەڵ نەسیبەی خوشکی لە ماڵێ دەردەچوو و تەنها جارێك سەری بەرزدەکردەوەو سەیرێکی ماڵەکەی ئەوانی دەکرد و پاشان یەکسەر سەری نەوی دەکردەوە. پۆیراز دەیزانی ئەم کچە بەو کارانە خەم دایدەگرێت و ئازار دەکێشێت. سوپاس بۆ خوا کە کاری دابەشکردنی پارەی خۆخەکان بووبووە مایەی ئەوەی پشکنین و بەدواداگەڕان بۆ دۆزینەوەی کابراکە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر لەبیر بچێتەوە.

لەسەر داوای پۆیراز، پیاوەکانی دوورگە -تەنها یەك ژنیان لەگەڵدا بوو ئەویش مەلەك خانم بوو- لە نۆرینگەی دکتۆرەکاندا لە دەوری یەك کۆبوونەوە. لەو دانیشتنەدا هیچ باسی کابرای ونبوو نەهاتە گۆڕێ. لە دانیشتنەکانی پێشتر بەردەوام باسی ئەو کابرایە دەکراو هەریەکەو لەبارەی ئەوەی داخۆ دەبێت لەکوێ بێت و بۆ کوێ چووبێت، ڕای خۆیان دەردەبڕی.

یەکەم هوسمەن قسەی کرد:

"ئەو پارەیەی کە لە شوکری ئەفەندی وەرگیراوە لەنێو خەڵکی دوورگە دابەش دەکرێت، بەڵام کێشەکە ئەوەیە داخۆ ئەو دابەشکردنە بە چ شێوەیە بێت." هوسمەن وا قسەی دەکرد کە پۆیراز فێری کردبوو. "یەکەم دەبێت بیر لەوە بکەینەوە کە نابێت لەنێو تاك تاکی مرۆڤەکان دابەش بکرێت، دامانناا لە ماڵێکدا نۆ کەس دەژین، ئەگەر بەپێی ژمارەی کەسەکانی ئەو ماڵە بێت دادگەرانە نابێت، چونکە وادەبێت لە ماڵێکدا کەسێك بژیت و لە ماڵێکی دیکە دوو کەس. منیش پێنج سەر خێزانم هەیە. بۆیە ناکرێت وابکەین. دەبێت چی بکەین؟"

باسەکە لە ماوەیەکی کورتدا کۆتایی هات، بڕیاردرا پارەکە لەسەر ماڵەکاندا دابەش بکرێت، بەڵام حەسەنی راکردوو یەکەمین کەس بوو دژی ئەو بڕیارە راوەستا، "لەم دوورگەیەدا خەڵکی زۆر چاکەیان لەگەڵ مندا کردووە. پشکی من بخەنە سەر ئەو بڕە پارەیەی کە بڕیارە لەنێو برادەراندا دابەش دەکرێت."

دکتۆرەکانیش گوتیان: "پشکی ئێمەش هەروا لێبکەن."

موسا ئاغا گوتی: "ماڵی ئێمە لە لیستەکە بسڕنەوە."

مام شێخ موسیش گوتی: "ئێمەش بسڕنەوە."

هوسمەن گوتی: "ناتوانین ئەمە قبوڵ بکەین."

ئەوانی دیکەش یەکدەنگ گوتیان: "ناتوانین ئەمە قبوڵ بکەین."

مەلەك خانم گوتی: "هێشتا جاجمەکان نەفرۆشراون، بەڵام دەفرۆشرێن."

دوای ئەو هەموو مشتومڕە شیرینیان خوارد.

شوکری ئەفەندی لەبەر ئەوەی دەیزانی ئەو پارەیەی دەیداتە خەڵکەکە لەنێو هەمواندا دابەش دەکرێت پارەی خوردەی دابوونێ. هوسمەن پارەکەی ماڵ بە ماڵ دابەش کرد.

هەفتەیەك دواتر هەنجیرەکانیش پێگەیشتن، شوکری ئەفەندی دیسان بە سێ دانە بەلەمەوە لە دەریادا دەرکەوت. بەلەمەکان هاتن و لە ئەسکەلە راوەستان. نیشانچی لەلای دەستە راستی ئەسکەلە، ئەفە خەنجەرلی لە دەستە چەپ و ڤاسیلی لەو شوێنەی کە کرێکارەکان لە بەلەم دادەبەزین، راوەستابوون. ئەو سێ پیاوە بە چاوانی وەك چاوی هەڵۆ ئومێدەوار بوون کە بتوانن پیاوە بۆرەکە دەمانچە بە کەمەرەوە لەنێو کرێکارەکاندا ببینن. بەلەمەکان بەتاڵ بوون، بەڵام کابرای گۆرین دیارنەبوو.

خەنجەرلی چوو لەسەر نیوتەختەکەی رۆخ کانی دانیشت، نیشانچی و ڤاسیلیش چوونە لای ئەو. ئەفە خەنجەرلی گوتی: "ڤاسیلی تۆ ئەو بەلەمە بگەڕێ، نیشانچی تۆش ئەوەیان." بەلەمەکانی بەدەست نیشاندان. "دەبێت هەموو کونج و کەلەبەری بەلەمەکان بگەڕێین، رەنگە خۆی لەو شوێنانە شاردبێتەوە." هەرسێکیان لە سێ لای جیاوە چوونە نێو بەلەمەکان، هیچ جێیەك نەما بۆی نەگەڕێن. بەدەستی بەتاڵ و دەم و چاوی گرژەوە لە بەلەمەکان هاتنەدەر. کەس لێینەپرسین ئێوە لەوێ بەدوای چیدا دەگەڕێن. کەوتنەڕێ و بەدوای ئەو کرێکارانەی کە لەپێش هۆسمەن دەرۆیشتن بەرەو دۆڵی دارهەنجیرەکان رۆیشتن. ئەمجارە زۆربەی کرێکارەکان مێردمنداڵی دە پازدە ساڵەی زۆر لاوازبوون. کاتێك گەیشتنە نێو دارهەنجیرەکان بەخێرایی بەدارەکان هەڵگەڕان و هەر یەکەیان یەکسەر هەنجیرێکی گەورەی زەردی لە دارهەنجیرەکان کردەوەو خواردیان. نیشانچی گوتی: "مسۆگەر ئەمەش نەریت و خووێکی کرێکارە مێردمنداڵەکانە."

مێردمنداڵەکان خێرا خێرا هەنجیرەکانیان کۆدەکردەوە، دەیانخستنە نێو سەبەتەکان، سەبەتەکانیان بە کندر کە پێیانەوە بەستبوون شۆڕی خوارەوە دەکردن، ئەو کرێکارانەی کە سەبەتەکانیان وەردەگرت ئەو هەنجیرانەی لەسەر زەوی دەکەوتن هەڵیاندەگرتنەوە، چینێك هەنجیر و چینێك گەڵایان لە سەندوقەکان دادەنان و سەریان دەگرتن و بە بزمار تەختەیان لە زارکی سەندوقەکان دەکوتاو ئاوا زارکی سەندوقەکانیان قایم دەکرد.

خەنجەرلی لەپێش و ئەوانی دی بە دوایدا، بەخێرایی چوونە سەرەوە، دارهەنجیرەکانی سەرەوە بۆ خەڵکی دوورگە بەجێهێڵدرابوون، کاتێك گەیشتنە ئەوێ سەیریانکرد هەموو منداڵانی گوند کوڕ و کچ بەسەر دارهەنجیرەکانەوەن و هەموو ژنانی گوندیش لەبن دارهەنجیرەکان راوەستاون. مەلەك خانم و شەریفە خاتوونیش لەنێو ژنەکاندا بوون. منداڵانی دوورگە لەم لك بۆ ئەو لکی دارەکان بازیان دەداو لەلایەك هەنجیریان دەخواردن و لەلایەکی دیکە سەبەتەو تریانەکانیان پڕ لە هەنجیر دەکردن. ژنەکانیش لکی دارهەنجیرەکانیان بە گۆچانان تا ئەو رادەیەی دەستیان بگاتێ دادەهێنانەوەو بە ئاسانی هەنجیریان لێدەکردنەوەو دەیانخواردن.

نیشانچی گوتی:

"سەیری ئەو هەنجیرانە بکەن، شیلەیان لێدەچۆڕێت، میوەی بەهەشتە. بەڵێ دەبوا دکتۆرەکان و پۆیراز و موسا کازم ئاغاش بۆ وەها دوورگەیەك بهاتبوان، نەهاتبوان چیانکردبوا؟ ئەو

هەنجیرانەی کە شیلەیان لە قوونکێ دەچۆڕێت، هەنجیری زەرد، وەکو کارەبا، نەهاتبوان چیانکردبوا؟"

نیشانچی لەوکاتەی ئەم قسانەی دەکرد ئاوی لە دەمی دەهات، چەند جارێکی ئاوی دەمی قووت دایەوە، ئەمەش لە چاوانی ڤاسیلی و خەنجەرلی شاراوە نەبوو.

ئەفە خەنجەرلی گوتی: "نیشانچی، دەی هونەری خۆت بنوێنە ببینم، هەروەك چۆن دەریاو ماسیەکانت ئەفسوون دەکرد، ئەم درەختانەش والێبکە با دابێنەوەو ئەو هەنجیرانەمان کە شیلەیان لەبەر دەڕوات پێشکەش بکەن."

نیشانچی گوتی:

"باشە، بۆ کەسێکی گوڵی وەکو تۆ نیشانچی هەموو شتێك دەکات. سەیری بکە، ژنەکان سەیر بکە."

نیشانچی گوتی:

"درێژەی مەدەرێ، بینیم. بجوولێ، دەمم وا پڕ بووە لە ئاو، دوور نییە سێلاو دوورگە راماڵێت. زەردی کارەبایی، مێوەی بەهەشتێ کە لە قوونکیەوە شیلە و رەواق دەچۆڕێت وا ئێستا بەرامبەرمانە."

"ئەگەر بەرامبەرمانە منیش ئەفسوونی خۆم لەدەست خۆمە، ئەو ژنانە نابینیت، خانمەکەی منیشیان لەگەڵ دایە، سەیرکە، سەیرکە، هەر یەکەو سەبەتەیەکی پێیە. بڕۆ یەکێك لەو سەبەتانەیان لێوەربگرەو وەرەوە."

خەنجەرلی چووە لای ژنەکان و گوتی: "لە نێو ئێوەدا خاتوونێك هەیە کە خاتوونی هەموو خاتوونان بێت و یەکێك لەو سەبەتانەم پێبدات؟"

زەهرا گوتی: "هەیە، بیگرە، ئێمە دوو دانەمان هەن، سەیرکە، نەسیبەش پێیەتی."

ئەفە خەنجەرلی گوتی: "سوپاس، هەربژیت کچە گوڵەکەم. خوا بە مرازی دڵی خۆت بگەیەنێت."

زەهرا گوتی: "ئامین."

نیشانچی هەر کە سەبەتەکەی لە ئەفە وەرگرت بەرەو لای دارهەنجیرێکی کەمێك ئەولاتر چوو کە هەنجیرە درشتەکانی لکی دارهەنجیریان داهێنابووەوە، نیشانچی وەکو سمۆرە بە دارهەنجیرەکەدا هەڵگەڕا، لەسەر ئەستوورترین لکی دارهەنجیرەکە دانیشت، دەستەکانی وەکو مەکینە کەوتنە

کار، لەملاو ئەولا هەنجیری لێکردنەوە، دووبارە وەکو سمۆرە بە چوست و چالاکیەوە لە دارهەنجیرەکە هاتە خوار: "فەرموون. زوو بیانخۆن با دیسان بچمەوە سەر دارهەنجیرەکە."

خۆی بۆ ئەو سەبەتەیەی کە بە دەست خەنجەرلیەوە بوو درێژ کرد. هەنجیرێکی لەنێو سەبەتەکە هەڵگرت و بێئەوەی سپی بکات خستییە دەمییەوە و خواردی. ئەوانی دی بە واقوڕماویەوە سەیریان کرد.

"خێرا هەنجیرەکانی نێو سەبەتەکە تەواو بکەن. سەیر بکەن لە خوارەوە پیاوەکانی دوورگە هەموو وا خەریکن بۆ ئێرە دێنن. سەبەتەکەم بدەنێ، بابچم بۆ ئەوانیش لەو هەنجیرە کارەباییانە کە شیلەیان هاتۆتەدەر، لێیکەمەوە بێنم."

خەنجەرلی هەنجیرەکانی نێو سەبەتەی لەسەر چیمەنەکە رووکردن.

"سەبەتەکە هەڵبگرە، بڕۆ بۆ سەر ئەو دارهەنجیرەی کە ئەفسوونی کردووە."

نیشانچی سەبەتەی لە خەنجەرلی وەرگرت، بەرەو لای ئەو دارهەنجیرەی کە کەمێك بەر لە ئێستا لێیهاتبووە خوار رۆیشت، وەکو پشیلەیەکی زیتەڵە لە دارهەنجیرەکە بەسەرکەوت، لەسەر لکێکی لە هەموان ئەستوورتر دەستی بە لێکردنەوەی هەنجیرکرد. هەر لەگەڵ پڕکردنی سەبەتەکە وەرسووڕاو بەخێرایی هاتەوە خوار، سەبەتەکەی لەسەر هەنجیرەکانی رووکراو هەڵڕشت، دیسان بەرەو دارهەنجیرەکە رایکردەوە. خەنجەرلی و ڤاسیلی لەلایەك سەیری نیشانچیان دەکرد لەلایەکی دیکە وەکو برسیساڵی گرانی هەنجیریان دەخوارد.

تا ئەو دەمەی خەڵکی گوند گەیشتنە لای ئەوان نیشانچی چەند جارێك لە دارهەنجیرەکە بە سەرکەوت و هاتەوە نێو چیمەنەکە و لەنێو چیمەنەکە بۆ سەر دارهەنجیرەکە گەڕابووەوە. کۆتەرەیەك هەنجیر لەنێو چیمەنەکە لەسەر یەك هەڵڕژترابوون. ژنان و منداڵانیش وازیان لە کاری خۆیان هێنابوو و لە دەوری ئەو دارهەنجیرە ئەفسوونکراوە راوەستابوون و سەیری نیشانچیان دەکرد کە سەبەتە بە دەست لە دارهەنجیرەکە بۆ نێو چیمەن و لەنێو چیمەنەکە بۆ سەر دارهەنجیرەکە دەهات و دەچوو. دێهاتییەکانیش کە هاتبوون لە دوای موسا کازم ئاغا، دکتۆرەکان، پۆیراز، پزیشکی ئاژەڵان و ئەوانی دیکە لەسەر چیمەنە راوەستابوون و چاویان لەسەر نیشانچی هەڵنەدەگرت.

دکتۆر سەلمان سامی لەنێو ئەو خەڵکەی کە تازە گەیشتبوون، جیابووەوەو پێشی لە نیشانچی گرت کە بەسەبەتەی پڕ لە هەنجیر لەملاو بۆ ئەولا دەهات و دەچوو و گوتی:

((بوەستە بەسە، سەیر بکە کۆتەرەیەك هەنجیرت خڕکردوونەتەوە. کێ ئەو هەموو هەنجیرە بخوات، ئەگەر هەمووشمان کۆ ببینەوە ئەو هەموو هەنجیرانە بخۆین گەدەو هەناومان تێکهەڵدەچن."

"نەکا هەموومان سکڕەوانی بگرین دکتۆر؟"

"دەیگرین، وەلی نیشانچی سکڕەوانی دەگرین."

سەبەتەکەی لە دەستی نیشانچی وەرگرت، بردی لەسەر کۆتەرەی هەنجیرانی رووکرد، لەسەر چیمەنەکە دانیشت، هەنجیرێکی لەسەر کۆتەرەکە هەڵگرت و خستیە دەمیەوە، گوتی: "وەرە ئێرە، لای من دابنیشە نیشانچی." لەکاتێکدا دەستی لە عەرزەکە دەدا، "لێرە دابنیشە" نیشانچیش چوو لە هەمان جێگا دانیشت کە ئەو دەستی لە عەرزەکە دابوو. دکتۆر هەنجیرێکی لەسەر کۆتەرەکە هەڵگرت و بۆ لای نیشانچی راگرت. ئەوانی دیکەش لە دەوری کۆتەرەی هەنجیرەکان دانیشتن و پاشان داگژانە هەنجیرخواردن.

نیشانچی گوتی: "بخۆن دۆستان. یەك لە دەی هەنجیری ئەم دارهەنجیرانەم پێلێنەکراونەتەوە."

هەموان لەلایەك خەریکی هەنجیر خواردنن و لەلایەکی دیکە دەدوێن.

نیشانچی گوتی: "بخۆن دۆستان، بخۆن زگتان پڕ بکەن، من بەم تەمەنە گەیشتووم، لە هیچ جێگایەکی ئەم ئەنەدۆڵە گەورەیە هەنجیری وام نەبینیوە. شیلەیان لەبەر دەڕوا. بیخۆن برادەرینە، نۆشی گیانتان."

هەموان تاتوانیان هەنجیریان خوارد. لەهەموان زیاتر دەست و دەمی شوکری ئەفەندی لە جووڵەدا بوون. هەرجارێك کە هەنجیرێکی بۆ دەمی دەبرد، دەیگوت: "ئۆووە. لە هیچ جێگایەکی دنیا هەنجیری ئاوا پەیدا نابن. مرۆڤ چۆن دڵی دێت شتێکی ئاوا کە هەموو لایەکی بۆتە هەنگوین بفرۆشێت، بەڵام ئێمە دەیفرۆشین. مخابن، مخابن."

موسا ئاغا گوتی: "مخابن، تەنانەت ئێمەش لە کرێت هەنجیری ئاوا کە هەنگوین، هەنگوین، هەنگوین..." دەنگی دەلەرزی، بەزۆردیش بێت دەیویست بڵێت "هەنجیری ئاوا کە هەنگوینیان لەبەر دەڕوات نین." نەیتوانی ئەمە بڵێت.

نیشانچی گوتی: "لە هیچ جێگایەکی دنیا نین."

موسا ئاغا بە زەحمەت توانی بەر بەخری بگرێت، لەبەر خۆیەوە گوتی واباشترە سەبر بگرێت. بە زمانی خۆی کەوتبووە نێو تۆڕی نیشانچییەوە.

"ئێستا دوورگە بەهەشتیەکەی ئێمە ئەوەیە، بەم چەشنەیە. بە زوویی هەنار و ترێکەشی پێدەگەن. ترێ و هەنارەکەشی نەك هەر لە کرێت بەڵکو لە دنیادا هاوتایان نییە."

موسا ئاغا دەیویست وەڵامێکی واتوند بەو پیاوە بێشەرمە بداتەوە کە لە تاوان خۆی بە قاپۆری درەختێکەوەدا بدات. کوڕە هەی بێئەدەب، هاتووینە دوورگە، کوڕە هەی جادوگەر، هەی جادوگەر، سەربازی هەڵاتوو، گەمژە، هاتوویتە دوورگەیەکی بەقەد لەپی دەست پێتوایە سوڵتان سلێمانیت؟ گەمژە تۆ کێیت؟ پشکلێك ناهێنیت، سەرباری ئەوە دێیت سووکایەتی بەمن دەکەیت و باسی کرێت دەکەیت. لێکدا لێکدا بەخۆی دەگوت سەبرت هەبێت، سەبرت هەبێت. موسا ئاغا هێند تووڕە بووبوو کە هەموان تێبینیان کردبوو.

هەموان بێئەوەی هەنجیرەکان سپی بکەن هەروا دەیانخواردن، تەنها موسا ئاغا نەبێت، ئەو بە ئارامی هەنجیرێکی لەسەر کۆتەرەی هەنجیرەکان هەڵدەگرت، بە وردی توێکڵەکەی لێدەکردەوە، دەیکردە دوو لەت و ئینجا دەیخوارد. هەرکە وشەی کرێت لە دەمی نیشانچی دەرچوو حاڵەتی روخساری موسا ئاغا تێکچوو، هەنجیر لەنێو دەستیدا وشك بوو.

تا دەهات رەوشەکە خراپتر دەبوو، ئەم نیشانچیەش وەختی زیادی هەیە، کرێت چ پەیوەندییێکی بەتۆوە هەیە گەمژە. لێکلێکە هەر باسی کرێت و کرێت دەکەیت. چیتداوە لە کرێت؟ نیشانچیش لەو رەوشە گەیشتبوو، بەڵام دەیتوانی چیبکات؟ زۆردەمێك بوو کار لە کار ترازابوو، بە نیگایەکی پڕ لە پاڕانەوە سەیری پۆیرازی کرد.

پۆیراز گوتی:

"دنیا زۆر گەورەیە، ئەوەندە گەورە کە تەنانەت دوورگەی ئێمە لەسەر نەخشەی تورکیا هەر دیار نییە. دوورگەی کارینجا دوورگەیەکی جوانە، بەهەشتە، وەلـێ دوورگەی کرێت لە دنیادا بێهاوتایە."

موسا ئاغا سەری بەسەر سنگی خۆی شۆڕکردبووەوەو بە روخساری خەمبارانە و نیگەرانەوە لە عەرزەکە رامابوو.

دکتۆر سەلمان سامی هەر کە تێبینی ئەو ئازارەی ئەوی کرد و دەستە رەقهەڵاتووەکەی ئەوی بینی زۆر دڵی پێسووتا. زۆر نیگەران بوو بۆ ئەو کەسەی کە رەسەنایەتی لە هەموو بوونیدا دەباری:

"ئەمە لەبەر خاتری ئەوە ناڵێم کە مام ئاغا خەڵکی ئەوێیە، لە راستیدا کرێت لەم دنیایەدا لەگەڵ هیچ پارچەیەکی دیکەی ئەم زەویەدا بەراورد ناکرێت، چونکە کرێت یەکێك لە گەورەترین

شارستانیەتیەکانی جیهانی دروست کردووە، ئەویش دوورگەیەك کە لە ناوەڕاستی دەریای مەدیتەرانەیە. ئەمە واتەچی، واتە خاکی کریت ئەوەندە بەپیزە کە ئەو خاکە توانیویە یەکیك لە شارستانیەتیە دەگمەنەکانی جیهان پیکبهینیت. ئیمە کاتی خۆی کە لە پاریس دەرسی پزیشکیمان دەخویند برادەرە کریتیەکانمان واباسیان لەویٚ دەکرد کە ئیمە وەکو لال بین بە بیدەنگی تەنها گویمان لیدەگرتن. میوەجاتی بۆنخۆشی دەشتە بە گوڵدا پۆشراوەکان، ئاو و هەوا و خەڵکی تەمەندریژ... بۆچی شارستانیەتی میسر ئەوەندە گەورەیە، چونکە خاکی ئەویش وەکو خاکی کریت وایە. هەموو شارستانیەتیەکانی کە مرۆڤیان وەك مرۆڤ راهیناوە لەسەر خاکی بە پیت و بەرەکەت پیکهاتوون. دۆستانی کریتی ئیمە دەیانگوت ئەو کەسانەی کە لە کریت لە دایك دەبن و لەویٚ گەورە دەبن و دەژین بە زەحمەت دەتوانن لە شوینەکانی دیکەدا بژین. کریت، لە روانگەی ئەوانەی بینیویانە و لەویدا ژیاون بەهەشتی سەر رووی زەویە."

دوای دکتۆر سەلمان سامی، پزیشکی ئاژەلان سەر رشتەی قسانی وەرگرت، وا لەبارەی کریتەوە قسەی کرد کە هەموان ئەو هەستەیان بۆ دروست بوو کە ئەوییان لە نزیکەوە دیوە. لەکاتیکدا ئەو شوینەی کە پزیشکی ئاژەلان باسی لیوە دەکرد کریت نەبوو بەڵکو شاری وان بوو، دەریای مەدیتەرانەش دەریاچەی وان بوو. ئەو ئەوەندە بەباشی باسی کریتی کرد کە موسا ئاغاش سەری سوورماو لە ناخی دڵەوە هەستی کرد جاریکی دیکە چۆتەوە کریت و لەویدا ژیاوە. دوای ئەو هوسمەن دەستی بە قسان کرد، سیٚ جاران چووبووە کریت. لە یۆناندا هیچ جیگایەك وەك کریت خۆش نەبوو. ئەویٚ بەهەشت بوو. دوورگەی کارینجای ئیمە هەزار بەرامبەر بکە، هەزار و پینج سەد بەرامبەری بکە، دوو هەزار و پینج سەد جار گەورەی بکە، هەزاران هەزار جار بەرامبەری بکەیت کریت ئەوەندە دەبیت، جگە لە بەهەشتبوونەکەی. ئەم هوسمەنە، ئەم دیهاتییە ناقۆڵایە، چەند باش شارەزای کریتە. هۆسمەن قسەکانی تەواو کردو چوو لە بەرامبەر موسا ئاغا دانیشت کە تا بەر لەوی ئەو قسە بکات سەری بەرزنەکردبووەوە. هەر کە هۆسمەن دەستی بە قسان کردبوو، موسا ئاغا سەری هەڵبڕی و لە روخساری هۆسمەن رامابوو. هۆسمەن چیگوتبوو؟ گوتبووی سیٚ جاران چوومەتە کریت، هەنگوینی لە دەمی باریبوو. دوایین قسەکان مەلەك خانم کردنی کە لەنیو ژنەکانەوە هاتبووە نیو پیاوان، باسی چیایەکی کریتی کرد، چیایەك کە یۆنانیەکان پییدەڵین ئیدا و تورکەکانیش پییدەڵین قازداغی. مەلەك خانم چەندین جار ئەم چیایانەی لە خەودا بینیبوون، موسا کازم ئاغاش لەسەر ئەو چیایە بووە. لەبەر جوانی، بۆن و بەرامە، جوانیی مرۆڤەکانی و چاکەو

باشییەکەی هیچکەس دڵی نەدەهات ئاوڕ لەو چیایە بداتەوە. مەلەك خانم چیای هەزار کانیی پڕ لە بۆنی وەنەوشە و پونگە و مورتکی سەوز نەك لە خەودا بەڵکو بە جۆرێك باس دەکرد وەك بڵێیت خاکەکەی بۆن کردبێت. هەموو ئەو کەسانەی گوێیان لە قسەکانی ئەو گرتبوو وایان هەست دەکرد کرێتیان نەك لە خەونی مەلەك خانم بەڵکو هەر بەڕاستی لە نزیکەوە بینیوەو بیریان لەوە دەکردەوە تۆ بڵێیت مەلەك خانم کەی چووبێتەوە کرێت. دوای تەواوبوونی قسەکان کەس لە مەلەك خانمی نەپرسی کەی چۆتەوە کرێت و چۆن گەڕاوەتەوە. چیایەکەی کرێتی بەشێوەیەکی هێند راستەقینە باسکردبوو کە هەموان خەونبوونی قسەکانی ئەویان لەبیر کردبوو. دوای هاتنی موسا ئاغا تا ئێستا ئەمە یەکەمجار بوو کە هۆی لێکنزیکبوونیان تێبگەن. ئەمانە لە کرێت یەکدیان ناسیوە. ئەدی کەوایە بۆچی مەلەك خانم گوتبووی خەونی بە کرێتەوە بینیوە؟

هەموو ئەو کۆتمەرە هەنجیرەی کە نیشانچی لەسەر چیمەنە سەوزەکە کۆی کردبووەوە خوراو کۆتایی هات. موسا ئاغاش پێکەنیبوو. ژنان و منداڵان سەبەتەکانیان، ئەوانەیش کە سەبەتەیان نەبوو دامەنی کراسەکانیان و هەروەها سەندوقەکانی مێوەیان کە لە شوکری ئەفەندیان بەلاوە نابوون پڕکردبوون و بەدەم قسەکردن و پێکەنینەوە بەرەو دێ دەگەڕانەوە.

دکتۆر سەلمان سامی چووە لای موسا ئاغا و گوتی:

"قوربان ئەمشەو نافەرموون بۆ ماڵی ئێمە؟ ئەو ژنەی لە ماڵی ئێمەیە بۆ ئەمشەو ئەو چێشتانەی ناوچەی دەریای رەشی بۆ لێناوین، خواردنەکانی دەریای رەش باش لێدەنێت، خواردنی وا کە ئێمە نەمانخواردوون. کاك پۆیراز و ئوسوی دەنگبێژیشم بانگ کردوون. جەنابی پزیشکی ئاژەڵان و حەسەنی راکردوو و هوسمەن و مەلەك خانمیش دێن و چەند کەسێکی دیکەش. خانمەکانم بانگ نەکردوون. دەمزانی بانگیشیان بکەم نایەن. شوکری ئەفەندیش دێت. کاك پۆیراز دەیگوت هەنارەکان و باخەکان و هەموو غەلێفەکانیشمان کڕیون. دوای ئەوەی بەشێك لە هەنگوینەکە لەنێو خۆماندا دابەش دەکەین ئەوەی مایەوە دەیفرۆشین. ئەم زستانە زۆر بەباشی دەبەینە سەر، هەموان پارەیان دەست دەکەوێت، تا هاوینی داهاتوو کەس برسی نابێت."

"سوپاست دەکەم ئەگەر بۆ نانی ئێوارە وەلی نیشانچیش بانگهێشت بکەیت."

دکتۆر بە سەیری تەماشایەکی کرد.

"بانگهێشتی بکە، بانگهێشتی بکە تکایە."

"زۆر باشە قوربان."

"سوپاس دکتۆر، من لە هەموو تەمەنمدا کەسێکی وا سەیرم نەبینیوە. هەرکاتێك ئەو پیاوە دەبینم دڵم شاد دەبێت."

دکتۆر سەلمان سامی نزیکەی هەموو پیاوەکانی دوورگەی بانگهێشت کردبوو. یەکێك لەوانەی پێش هەموان هاتبووە ماڵەکەی، وەلی نیشانچی بوو. هەر لەگەڵ ئەوەی وەلی نیشانچی لە دەرگای ماڵی دکتۆر چووە ژووریَ دکتۆر سەلمان سامی قۆڵی گرت و بردیە گۆشەیەك و داهاتەوەو چرپاندیە گوێی: "سەیرکە، من تۆم لە سەرەوەی لیستی بانگهێشتکراوان دانابوو، ئەوەدەمەی دەمەویست بانگهێشتی موسا کازم ئاغاش بکەم داوای لێکردم تۆش بانگهێشت بکەم. ئەو سەبارەت بەتۆ گوتی لە مرۆڤە دەگمەنەکانی سەر رووی زەوییە. گوتی مرۆڤێکی تەواوە، لەگەڵ دڕندە و پەڕەندە و جرِو جانەوەرانی ئەم دنیایە هاوڕێیە، گوتی لەم جۆرە مرۆڤە دەگمەنانەیە کە بەرامبەر بوونەوەران دڵێکی پڕ بەزەیی هەیە. گوتی هەرکاتێك ئەو مرۆڤە هەمیشە چالاك و پڕ جموجۆڵە دەبینم کە لە نێو تاریکی ئەنگوستەچاودا بە دڵی گەرم و پڕ میهرەبانی خۆیەوە دنیا دەگرێتە باوەش، دڵم رۆشن دەبێت. بەڵێ موسا ئاغا لەبارەی تۆوە ئاوای دەگوت. فەرموو بۆ ئەویَ."

داینیشاندە سەر کورسیەکی مەخمەڵی کە لە گۆشەی ژوورەکە داندرابوو. کەمێك دواتر موسا ئاغاش هاتە ژوورەوە، ئامادەبوان هەموو یەکپیَ لەبەری هەستان موسا ئاغا یەکسەر چوو لەلای نیشانچی لەسەر کورسیەك دانیشت. دوای ئەوەی کە هەموان هاتن نانیان خوارد، ژنانی خەڵکی ناوچەی دەریای رەش خواردنی هێند خۆش و بەتامیان لێنابوو کە هەمووان چێژیان لێوەرگرت. موسا ئاغا چاوی لەسەر نیشانچی هەڵنەدەگرت کە لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو: ئەم پیاوە هیچشتێك ئەفسوون ناکات، ئەوە هەر شتێك دەیبینێت ئەفسوونی دەکات، ئەم پیاوە لەو کاتەی لەدایك بووە ئەفسوون کراوە. ئەم پیاوە هەموو رۆژێك لەگەڵ دەرکەوتنی تیشکی خۆر تا خۆرئاوا دەبێت، لەگەڵ هەموو شتێك ئەفسوون دەبێت، کرێتیش پارچەیەکە لەم دنیایە، هەرچی لە هەر جێگایەك بێت، هی ئەو جێگایەیە. گرفتی سەرەکی پەیوەستە بە مرۆڤەکان، بە بوونەوەکانی دیکە و ژیان بەگشتی کە شارستانیەت دێننە ئارا. ئەگەر لە سەردەمێکدا لە سەر خاکێك شارستانیەتێك هاتبێتە ئارا، ئەو سەردەمە بۆ ئەو خاکە، بۆ ئەو مەملەکەتە، ساتەوەختی درەوشانەوەی ئەستێرەکەیەتی ئێستا بۆچی ئەو شارستانیەتیە لەو پارچەیەی خاك نییە؟ دەنگی شوکری ئەفەندی رشتەی هزرو تێڕامانەکانی بڕی.

"دوو وەستام ڕەوانەکردن باخەکانیان بەراورد کرد، گوتیان ئێمە تا ئێستا ترێی وا جوانمان نەبینیوە. گوتیان سەرمان سووڕما، قاشۆی ئەم مێوانەیان لەکوێ هێناون؟ پارەیەکی زۆر زۆر باشمان لەو ڕەزە پێدەبڕێت. ئێستا ناتوانم نرخێك بۆ بەری ئەو ڕەزە دیاری بکەم. ئێستا هەرچی بڵێم ڕەنگە دروست نەبێت، منیش ڕەزەکەم بینیوە، منیش ساڵەهایە لەنێو ڕەزانم و ترێ دەکڕم و دەفرۆشم، بەم تەمەنە گەیشتووم تا ئێستا ڕەزی وام لەهیچ جێگایەك نەبینیوە. لەبارەی دارهەنارەکانیش دەبێت بڵێم جوانترین دارهەنارن و هاوتایان نییە. پەمەیی، گەورە، دەنکپڕ وەکو ددانی وشترن. کاکە پۆیرازی هێژا، دوورگەیەکی زۆر جوانت هەڵبژاردوە. لە هیچ دوورگەیەك هەناری ئاوا نییە. خەڵکی دوورگەی کارینجا نەمامی ئەو دارهەنارانەیان لەکوێ هێناون؟ لەبارەی هەنگ و زەردەواڵەکانەوە دەبێت بڵێین گوڵەکانی ئەم دوورگەیە دەتوانن ئەم هەموو زەردەواڵانە لەخۆ بگرن و تێریان بکەن؟ ناتوانن، کەواتە دوورگەکانی نزیك... ژمارەیەك لە هەنگەکان دەچنە دوورگەکانی نزیك و لە گوڵی ئەو دوورگانە خۆراك و هەڵاڵەی پێویست دێنن و بڕێکی باش هەنگوین دروست دەکەن. ئەم غەڵێفانە هی کاك پۆیراز و کاك جەمیلی پزیشکی ئاژەڵانە، لە دارایی کڕینیان دەیانەوێت هەر ماڵێك یەکێك لە غەڵێفەکانیان بدەنێ. هەنگوینی غەڵێفەیەکیش دەدەنە هەر ماڵێك. پارەی هەنگوینی ئەو هەموو غەڵێفانە. تەنانەت هەموو ماڵەکانیش پڕ بن، بەشی ساڵێکیان دەکات. جگە لە هەنار و ترێ و هەنجیر و خۆخەکان."

"ئێمەش قسەمان لەگەڵ بەڕێز پزیشکی ئاژەڵان کرد، هەموو ئەو پارەیەی کە لە هەنگوین جگە لەوەی بەسەر ماڵەکاندا دابەش دەکرێت، دێتە دەستمان، دەیدەینە دکتۆرە بەڕێزەکان بۆ دروستکردنی خوێندنگە."

"کە ئاوا، چۆنتان زانی ئێمە دەمانەوێت لێرە خوێندنگە دروست بکەین؟"

پۆیراز بە پێکەنینەوە گوتی:

"ئێمە دەزانین قوربان، (ڕوفاعی)[٣]یەکان پێماندەڵێن. دەتانەوێت خوێندنگە کۆنەکە نۆژەن بکەنەوە، تەختە و نیوتەختی نییە قوربان، تەختەڕەش و مێزی نییە قوربان، هەرچی مۆبل و کورسی لە خوێندنگەدا هەبوون، ڕەمزی کاولاك ئۆغلۆ سەرۆکی لقی حزب هەمووی دزین و بردنی قوربان."

---

(٣) ڕوفاعی: یەکێك لە تەریقەتە سۆفیەکانە کە لە سەدەی دوازدەی زایینی لەسەر دەستی ئەحمەد ڕوفاعی دامەزرێندراوە-و.

دکتۆر سەلمان سامی گوتی:

"سوپاسی ئێوە دەکەم بەڕێز. ئێمە سەبارەت بە کردنەوەی خوێندنگە هیچمان بە کەس نەگوتوە."

"ئێمە ئاگادار بووینەوە قوربان."

"ئێمەش سەردانی بەڕێوەبەرایەتی ناحیەمان کرد بەڕێز. چووینە لای والیش، گوتمان هەر لەگەڵ پڕبوونی دوورگە دەمانەوێت خوێندنگە بکەینەوە. داوای مامۆستاشمان کرد، بەڕێز خۆمان یارمەتی مامۆستا دەدەین بەڕێز. جارێ مامۆستایەك بەسە بۆ دوورگە."

"بەسە قوربان. وەلــێ ئایا دوورگەکەمان پڕ دەبێت؟"

"پڕ دەبێت، بەڕێز."

"جا کە دوورگەمان پڕ بوو لە خەڵك، دووبارە دەبێتەوە دوورگەیەکی جوان و دیسان ئێرە دەبێتەوە بە خاوەن باشترین خۆخ و هەنار و هەنجیر و ترێی دنیا؟ جا کە دوورگەمان پڕ ببێتەوە لە خەڵك، هەر کەسێکی خراپ بێتە ئێرە دەگۆڕێت و دەبێتە کەسێکی باش. لە دوورگەی ئێمەش وەکو خاکی بەپیرۆزی وڵاتانی شارستانی هەمیشە کەسانی شایستە پێدەگەن. هیچ شتێکی خراپ لەم دوورگەیە روونادات. ئێستا دکتۆرە بەڕێزەکان بە هاتنیان بۆ دوورگەکەمان گەورەو سەربەرزیان کردین، بۆچی، چونکە ئەمانە هەروەك چۆن لە گەلیبۆلۆ و نەخۆشخانە گەڕۆکەکاندا بەسەر سەربازەکاندا دادەگەیشتن، لێرەش، لەم دوورگەیەش، لەو کڵێسایەی کە بە دەستی رەمزی کاولاك تێکدرا و تاڵان کرا گیانیان خستەوە بەر هەزاران بریندار و کاتێکیش بەهۆی کەمئەندامبوونیانەوە خانەنشین کران هاتنە دوورگەکەمان و لێرە نیشتەجێ بوون، لێرەش ئەرکێکی تازەیان خستە سەرشانی خۆیان و بڕیاریانداوە خوێندنگەیەك بکەنەوەو کەسانی خوێندەوار دروست بکەن و پێبگەیەنن."

هەردوو دکتۆر گوتیان: "تکا دەکەین، ئێمە قارەمان نین، کەسانێکین کە دەیانەوێت کارەکانیان بە باشی ئەنجام بدەن. لەم دوورگە بەهەشتیە دابنیشیت و دەست بخەیتە سەردەست گوناحە، کارکردن واتە ژیان و بەردەوامیدان بە ژیان."

دکتۆر خەلیل رەفعەت گوتی:

"هەردووکمان زۆر بە سەختی بریندار بووین و دەربازبووین و هاتینە ئەم دوورگەیە. ئێوە مرۆڤە باشەکانی ئەم دوورگە بەهەشتیە بوون، ئێمەتان گرتە ئامێزی کراوەی خۆتان و دۆستانە و بە سنگی

فراوانەوە قبوڵتان کردین. ئێمە هەردووکمان تا ماوین لە تەك ئێوە دەبین. ئێمە لە بەرامبەر ئەو کەسە نزم و چەپەڵانەی کە لە پێناو سێ کورسی و کەمێك شووشە و یەك دوو دانە تابلۆ یادگارییە لە بیرنەکراوەکانی ئێمەیان لەنێوبرد، لێرە لای ئێوە دەمێنینەوە. تورکیاییەکی نوێ خەریکە پێکدێت، ئەگەر یارمەتی ئەو وڵاتە نەدەین کە تازە خەریکە دەکەوێتە سەرپێ ئەو نان و ئاوەی دەیخۆین و دەیخۆینەوەو ئەو هەوایەی کە هەڵیدەمژین لێمان حەرام دەبێت. لەم وڵاتەدا ئەم جۆرە شوێنانە زۆرن. ئەودەمەی کە کڵێسامان کردبووە نەخۆشخانە، هەروەها رەشماڵەکان لە هەزاران سەرباز جمەیان دەهات، پڕ دەبوون و خاڵی دەبوون، ژنانی ئەم دوورگەیەش لەگەڵ کارمەند و خۆبەخشەکانی ئەم نەخۆشخانەیە پەیوەست بوون. کاتێك ژنانی ئەم دوورگەیە نەیانتوانی دەرەقەتی ئەو هەموو بریندارە بێن، ژنانی گوندە تورکمەنەکان هاتنە یارمەتیدانمان. مرۆڤەکانی ئێرە لەنێو ئەم دۆزەخە، کارێکیان کرد کە ئێمە هەستمان کرد لەنێو بەهەشتدا دەژین."

ئەوان هەروەك خەریك بوون دەئاخاوتن و دەهاتن موسا ئاغا بیری لە هاوسەرە لەدەستچووەکەی دەکردەوە کە چەند تنۆکێك فرمێسك لە چاوەکانی بەسەر گۆنایدا هاتبوونە خوار. شوکری ئەفەندی کە ئەمەی بینی دڵی پڕ بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی خۆزگە دکتۆرەکان ئەم قسانەیان نەکردبوا، هەوڵیدا بابەتەکە بگۆڕێت. ئەو خۆشی بەو رووداوانەی کە لە رابردوودا روویاندابوو خەمگین دەبوو و لە دەستی قارەمانەکان و کەسە عاقڵ و جوامێرەکان کە ئەو رۆژانەیان تێپەڕاندبوو و وڵاتیان خستبووە ئەم رۆژە تووڕە دەبوو. دروستە ئێمە دوای هەزار ساڵی لە هێلکەی قەقنووس و لەنێو ژیلەمۆی ئاگردا لە دایك بووبووین. کاتێك لە شارۆچکەیەکی ئاوا سەرو کەللەی سەربازێکی هەڵاتوو، تاڵانکەرێك، سووخۆرێك، کەسێکی خوانەناس و باوەڕبەهیچ نا، دەردەکەوێت...

شوکری ئەفەندی گوتی: "ئەگەر لە شارۆچکەیەکی بچووك، کاولاکێك سەرهەڵبدات و بهێت ببێتە سەرپەرشتکاری رێکخستنی میللەتێك کە لە خۆڵەمێشی قەقنوس دروست بووە، ببینە و سەیر بکە لە هەموو تورکیا چ باسە. با ئەوە لێبگەڕێین، ئەمە باسێکی دوورو درێژە، ئێمە دەبێت ئێستا بیر لەم دوورگە بچووکەمان بکەینەوە. ئێستا من ملکەچی فەرمان و بڕیاری دکتۆرە بەڕێزەکانم. لەبارەی کردنەوەی خوێندنگە هەرچی بفەرموون بە دڵ و بە گیان لە خزمەتدام و ئەمە بە ئەرك دەزانم. ئەو پارەیەی کە کاك پۆیراز لە بەشە هەنگوینەکەی خۆم پێیداوم بۆ من وەك سامان و پاشەکەوتێکە. دوای ئەوەی کە غەڵێفەکان بڕدرانەوە، هەنگوینەکەیان دەبەمە ئەستەنبۆڵ و ئزمیر و دەیفرۆشم و هەرچی داهاتی ئەو هەنگوینەیە دەیهێنم و دوو دەستی پێشکەشی بەڕێزان

دکتۆرەکانی دەکەم. باش دەزانم زەیتوونەکان و هەموو باخچەکانی دوورگە ئاوەدان و چۆڵەکانیشم کڕیون. لەبارەی خوێندنگە هەرچی لەدەستم بێت دریغی ناکەم، بەمزوانەش دەچمە لای والی و بۆ خوێندنگەکە داوای مامۆستا دەکەم."

دکتۆر سەلمان سامی گوتی: "نە، نەکەیت داوای دوان بکەیت، دەنا هەر هیچ مامۆستامان نادەنێ. بۆ ئەم ساڵانەی دەستپێك یەك مامۆستامان بەسە."

"زۆر باشە قوربان، چۆنی بەباش دەزانیت، با مۆستایەك بنێرێت. تا ئێستا هەر شتێکم لە والی ویستبێت پێیداوم. جەنابی والی خۆی سەرۆکی حزبی گەلی کۆماریخوازی ویلایەتەکەیە."

"سەرۆکی ویلایەتی حزبی گەلی کۆماریخواز رای لەسەر رەمزی کاولاك چۆنە؟"

"هەموو شتێك دەزانێت بە دوای هەلدا دەگەڕێت. دڵی ئەویش وەکو دڵی هەمووومان پڕ لە خوێنە. گوایە لە شوێنێك لە سەرەوە لە ئەنقەرە پشتیوانی لێدەکرێت."

"سوپاس کاك شوکری. ئێمە دەمانەوێت سبەی شەو میوانداریەك بۆ جەنابت رێکبخەین. وەلی نیشانچی، ئەو جادووگەرەی دەریاکانیش دەنێرین ماسیمان بۆ بگرێت. دگمەنترین ماسی بۆ بەڕێزتان دەگرێت."

ئەفە خەنجەرلی گوتی:

"منیشی لەگەڵدا دەچم بزانم چۆن چۆنی دەریا ئەفسوون دەکات، دەریا چۆن چۆنی ئەو ئەفسوون دەکات؟"

حەسەنی راکردوو گوتی:

"منیش بە بەلەمەکەی خۆم لەگەڵ ئەواندا دەچم بۆ دەریا. بەو بەلەمەی کە لەوسەری دەریای رەش هەروا بە ماسیگرتنەوە هاتم و گەیشتمە ئێرە. دەبێت ببینم ئەم دەریایەش وەکو دەریای رەش بە روومدا پێدەکەنێت و بە سەخاوەتەوە باوەشم بۆ دەگرێتەوە، یان نە."

"ئەم دەریایەی کە بە سەخاوەتەوە باوەشی بۆ من کردۆتەوە بۆ تۆیشی دەکاتەوە. دەریاکان خەڵکی خۆیان لە چاویانەوە دەناسن، حەسەنی راکردوو."

بەیانی زوو حەسەنی راکردوو چووە لای وەستا ئارسۆن. وەستا ئارسۆن چەند سەندوق قولابی ماسیگری هەبوو.

"وەستا، من چەند دانە قولابی نوێم پێویستن. تۆ هەموو ماسیەکانی ئەم دەریایە دەناسێت."

"دەیانناسم. ئێستا سەبرێك بگرە بە تێپەڕبوونی کات فێر دەبیت کامە ماسی لە کام قوولآیی دایە. ئەمە ئەوەندەش کارێکی سەخت نیە."

"کەمێك شارەزای ئەم دەریایە بوومە وەستا. وەستا، ئێستا قولابەکانم بۆ دیاری بکە. بلێ کامە ماسی لە چ شوێنێکەو لە چ قوولآییێکە. جارێك پێمبلێیت بەسە. لەبیر ناچێت. ئەگەر نەتوانم لە کەسیش فێربم کام ماسی لە کام قوولآیی بدۆزمەوە، بە تێپەڕبوونی کات خۆم فێر دەبم. تا ئێستاش هەندێکی فێربوومە."

ئارسۆن جۆرەها قولابی ماسیانی دەرهێنا، لەلایەکی دیکەش دەیگوت کە کام قولاب هی کام ماسیە و ماسی لە چ قوولآییەکدا دەژین و قولابەکانی دە دانە دە دانە دەژماردن و دەیدانە حەسەنی راکردوو. کە کاری ژماردنی قولابەکان تەواو بوو، وەستا ئارسۆن گوتی: "سەرۆك حەسەن، ئەگەر پارەت نیە، پاشان بیدە."

حەسەن لە کاتێکدا سنگی دەرپەڕاندبوو گوتی: "هەمە. من لەوسەری دەریای رەش، لە رۆژهەلآتەوە تا گەیشتمە ئێرە، حەسەنی راکردوو بە برای خۆی بلێت هەر ماسیم دەگرتن و دەمفرۆشتن و بە پارەی ئەو ماسیانە خۆم دەژیاند."

کیسە بە ژەنگیانە دووراوەکەی لە گیرفانی سەرسنگی دەرهێنا. زارکی کیسەکە بە ژەنگیانەی نارنجی چنرابوو و لە نێوەڕاستی ژەنگیانەکانیش دووپشکێك بە ژەنگیانەی شین نەخشێندرابوو کە کلکی قیت راگرتبوو. ئارسۆن ئەو کیسە بە ژەنگیانە چنراوانەی زۆر باش دەناسین. لە دێهاتەکانی ناوچەی توورۆس نزیکەی هەموو کچە گەنجەکان لەو کیسانەیان دروست دەکرد و نەخش و نیگاری باڵندەو پەپوولە و نەخشی جۆراوجۆری دیکەیان لەسەر چێدەکردن. زیاتر تورکمەنەکان و ئەرمەنیەکانی چیاکانی توورۆس ئەو جۆرە کیسانەیان بەکاردەهێنا کە نەخشی دووپشکیان لەسەر دروست دەکرا.

وەستا ئارسۆن ئاهێکی هەڵکێشا: "کەواتە، سەرۆك حەسەنی راکردوو، لە دەریای رەشی ئێوەش لەو کیسە بە ژەنگیانە چنراوانە دروست دەکرێن، ها! لە چیاکانی توورۆسی ئێمەدا کچانی تورکمەن و ئەرمەن لەو کیسە بە ژەنگیانە چنراوانەیان دروست دەکرد."

"وەستا، تۆش ئەو باهۆزە فڕێی داویتە ئەم ناوە؟ تۆش وەکو ئێمە لە ماڵ و مەملەکەتی خۆت ئاوارە بوویت؟ نرخی قولابەکان بلێ وەستا. من لە دەریای رەش لە وڵات و دەڤەری خۆمدا ببینن لە سێدارەم دەدەن وەستا. وەستا، ئەم چاوە زەقانەی من لاوانێکی زۆری بینیون کە لە نێو جەنگەڵدا بە

درەختەکانەوە هەڵواسرابوون. ئەم چاوانە سەربازانێکی راکردووی بینیون کە چاویان لە کاسە دەرپەڕیبوو و زمانیان بستێك راکشابوو. گوتنی ئاسانە، وەرەو لە دڵم بپرسە وەستا. من ئەو کەسەم کە رامکرد تاکو نەتوانن لە سێدارەم بدەن."

وەستا ئارسۆن دەستی دایە ئەو دەفتەرەی لەسەر مێزی تەنیشتیەوە بوو و قەڵەمی کە لە پشت گوێی بوو هێنایە دەرو حسابی کرد، نرخی قولابەکانی پێگوت. حەسەنی راکردوو پارەکەی بە هێمنی ژمارد، خستیە سەر لەپی دەستی وەستا ئارسۆن.

وەستا ئارسۆن بە نیشانەی خوا بەرەکەت بدات، دەستی پڕ پارەی خۆی بە دەوری سەری خۆیدا وەرسووڕاند و بەڕیشی داهێنا.

"سەرۆك حەسەن، حەرەکەت لەتۆ و بەرەکەت لە خوا." وەستا ئارسۆن چاوە پڕ لە میهرەکانی بڕیبووە چاوەکانی حەسەن و بە دەمەبزەوە سەیری دەکرد. حەسەن، دوای ئەوەی کیسەکەی خستەوە گیرفانی، دەستی بردە نێو گیرفانەکەی دیکەی، کیسەیەکی بە ژەنگیانەی شین چنراوی هێنایەدەر، لەسەر کیسەکە نەخشی پەپوولەیەك بە ژەنگیانەی نارنجی دروست کرابوو بە باڵی لەرزانیەوە.

"بیگرە وەستا، پارەکانت بخەرە نێو ئەم کیسەیە. بەرەکەتیان بکەوێتێ."

رێك لەم کاتەدا نیشانچی و خەنجەرلی لە دووکانەکە وەژوورکەوتن، نیشانچی بە بینینی قولابەکانی سەرمێز گوتی: "ئوووەهووو، حەسەنی ئێمە ببینە، هەموو جۆرە ماسییەکانی دەریای خۆمانی ژماردوون و بۆ هەر کامێکیان قولابێکی سەندووە."

رووی کردە وەستا ئارسۆن: "وەستا ئارسۆن قولابی نەهەنگیشت هەیە؟" و پێکەنی.

"نە، بەڵام دروستی دەکەین، سەرۆك نیشانچی."

"دواتر ئەمەت لێداوا دەکەم، ئێستا لەو قولابانەی دروستت کردوون بماندەرێ."

نیشانچی ناوی ماسیەکانی دەگوت و وەستا ئارسۆنیش قولابی ئەو جۆرە ماسیەی دادەنان.

وەستاکان لە ماوەیەکی کورتدا کارەکەی خۆیان تەواو کرد. حەسەنیش قولابەکانی خستبوونە نێو گوینەی مشەمایی.

"لەو گوینانەت هێشتا هەن؟"

"هەمە."

لە گوینەکەی تەنیشتیەوە چەند دانەیەکی بچووکی دەرهێنان و بۆ لای نیشانچی رادان:

"فەرموو نیشانچی، قولابەکانتی بخەرە نێویەوە. ئەم گونیانە کابرایەکی یۆنانی کاتی رۆیشتن دابوونی بە دێهاتییەك، منیش ماسیم دایە کابرای دێهاتی و ئەویش ئەم گونیانە و کۆتێکی مشەمای دامێ."

نیشانچی کاتێك قولابەکانی دەخستنە نێو گونیەکە، گوتی:

"دیسان وەرە نێو بەلەمەکەی من، لەوێ پێکەوە ماسیان دەگرین."

حەسەنی راکردوو گوتی: "باشە، بەڵام..."

"بەڵام چی؟"

"بەڵام من دەمەوێت لە دەوری دوورگەی کابادا بگەڕێم، هەروەها دەشمەوێت سەبارەت بە دوورگەی کابا هەندێك شتت لێبپرسم."

نیشانچی گوتی: "باشە پێکەوە دەچین لەوێ دەگەڕێین."

سواری بەلەمەکەی نیشانچی بوون و رێی دوورگەی کابایان گرتەبەر. بەلەمەکەی نیشانچی زۆر خێرا بوو، هەر زوو گەیشتنە دوورگەی کابا، بە ئارامی بە دەوری دوورگەدا سووڕانەوە. حەسەنی راکردوو زەیتوونستانەکە و خانووێك کە هەر چوار دیوارەکانی رمابوون و هەروەها کەنداوێکی بچووك کە لە بەلەمێك گەورەتر بوو لە دەرەوە بە ئاسانی بەدی نەدەکرا نیشانی نیشانچیدا. پاشان چوونە نێو دوورگەکەو بە لەپی دەستەکانیان ئاویان خواردەوە. لەو ساتەدا بزنە شینەکان ساڵدانە ساڵدانە لەسەر زنارەکانەوە دابەزین و هاتن لە دەوری ئەوان هەڵقەیان بەست، بە حاڵەتێکی ئاشناو خووگرتووانە سەیری ئەوانیان دەکرد.

حەسەنی راکردوو لە نیشانچی پرسی: "تۆ بزنی شینت بینیبون؟"

"هەندێکجار لەنێو مێگەلێکی گەورە بزنە شینێك بەدی دەکرێت. من تا ئێستا نەمبینیبون."

"ئەمانە گشتیان شینن."

"حەسەنی راکردوو، کوڕە، نەتبیستوە ئەمانە بزنی خدرن سڵاوی خوای لێبێت؟ خۆ نابێت بزنەکانی خدر سڵاوی خوای لێبێت وەکو بزنەکانی دیکە بن، مەگەر خدر سڵاوی خوا لێبێت وەلی و عارفی دەریاکان نییە؟ ئەمر بە دەریا بکات بوەستە، دەوەستێت، ساف ساف بێشەپۆل، بێکەف، بێبچووکترین لۆنگ. ئەو کەشتیە گێرخواردووەکانی نێو لافاوی دەریاکان دەرباز دەکات. هەندێك لە کەشتیەکانیش دەرباز ناکات، هەموویان هەڵدەداتە بنی بنەوەی دەریا. بە ئەسپە خاڵدارە

خاکیەکەی خۆیەوە لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، لە باکوورەوە بۆ باشوور دەگەڕێت و بە چاو نابیندرێت. هیچکات ئەسپەکەشی بەر ئاو ناکەوێت و ڕۆناچێتە نێو ئاوەوە."

"واتە هەرگیز لە ئەسپەکەی پیادە نابێت لە شوێنێك دابنیشێت و خواردنێك، شتێك بخوات؟"

ئەفە خەنجەری تووڕە بوو:

"بنیادەمی گێل، نەزان، بنیادەمی گێل، چما پیاوانی خوا نان دەخۆن؟ نان بخۆن، لە کوێی بەهەشت قەزای حاجەت بکەن؟"

"ئەدی ئەگەر نان ناخوات ئەم بزنانەی بۆچی لێرە داناون؟گ

"تۆزێك عەقڵ بەکاربێنە پیاو، ئەم بزنانە بۆچی ئاوا شینن، بۆچی، وەختی حەزرەتی خدر، پیری دەریاکانە، بزنەکانی ئەو چۆن دەکرێت وەکو بزنەکانی خەڵکانی دیکە ڕەش بن؟"

"بزنی زەرد و سووریشی هەن."

"هەر خوا دەزانێت حەزرەتی خدر ئەم بزنانەی بۆچی لەو دوورگە چۆڵ و هۆڵە داناون، نەکا ئەم بزنانە، بزن نەبن و پەری بن و لە شێوەی بزن دەرکەوتبن. کێ دەزانێت، بەڵکو ئەم بزنانە نەزرکردەبن. ئەگەر وانەبێت، ئەم میللەتە برسیە بەهەر نرخێك بوا ڕۆژێك دەهاتن و هەموویان سەر دەبڕین و دەیانخواردن، وانییە؟"

بزنەکان هەروا لە دەوراندەوری ئەوان وەستابوون و گوێیان دابووە ئەو مشتومڕەی ئەوان. نیشانچیش خراپ کەوتبووە بیرکردنەوەو نەیدەزانی چی بڵێت.

"دەڵێن کابرایەکی یۆنانی حەفتاو پێنج ساڵی ڕەبەق هەموو ڕۆژێ شیری ئەم بزنانەی دۆشیوەو خواردوویەتیەوە، هەربۆیەش زیاتر لە سەد ساڵ ژیاوە."

"پاشانیش حەزرەتی خدر، ئەو کابرا یۆنانیەی، ئەوەدەمەی لەسەر زنارەکان خەریکی دۆشینی بزنەکان بووە قاچی هەڵخلیسکاندوەو یۆنانیی پیریش لەو سەرەوەی زنارە نووکتیژەکان غلۆر بۆتەوەو کەوتۆتە نێو دەریاو ئیدی سەر ئاو نەکەوتۆتەوە. ئەوکاتەی ئەو لە بنی دەریا بە جەستەی خوێناوی و هاڕدراویەوە بۆتە خۆراکی ماسیان، دەریاش بەلەمەکەی نوقمی ژێر ئاوخستوە.

بەلەمەکەشی ئیدی سەر ئاوا نەکەوتۆتەوە. ئێمە تەنانەت ئەمەمان لە چیاکانیش بیستوە. حەزرەتی خدر دەرهەق بە بزنەکانی خۆی زۆر قەڵسە. ئەو کەسانەی دەست بۆ بزنەکانی درێژ بکەن یان سەریان ببڕن، خدر بێئەوەی گوێ بە فرمێسکەکانیان بدات، بە بەلەم و گەمی و کەشتیەکانیانەوە فڕێیان دەداتە قووڵایی دەریاو لەنێویان دەبات."

"ئەم خدرە عارفی دەریاکانە یان شوانی بزنان؟ ئەگەر من کاریلەیەکی خرپن و قەڵەوی هاوڕەنگی دەریای ئەو سەربڕم، گۆشتەکەشی بەم دارزەیتوونەوە هەڵبواسم، هەموو ڕۆژێکیش بەدار و چیلکەی وشکی زەیتوون ئاگرێك بکەمەوە، گۆشتی کاریلەکە دابنێمە سەر پەنگران و بیبرژێنم و بیخۆم، خدر چیم لەگەڵدا دەکات؟"

"بێدەنگ بە، بێدینی بێئیمان، بێدەنگ بە."

دەستی بۆ لای خەنجەرەکەی بەر پشتێنی برد، نیشانچی یەکسەر چوو دەستی گرت.

"تۆ ئێستا ئەم خەنجەرە لە ورگی من رادەکەیت، پاشان دەچیت بە دەوڵەت دەڵێیت، ئەو کابرایە، ئەو حەسەنە راکردوە بێدین و ئیمانە، بزنی خدری سەربڕیوە و خدریش خاوەنی ئەسپی خۆڵەمێشی یەکسەر گەیشتۆتە سەری و بە خەنجەرەکەی ورگ و ریخۆڵەکانی حەسەنی هەڵدڕیون."

ئەفە ئەمجارەش دەستی بۆ خەنجەرەکەی بردو گوتی: "ئەی کافر." حەسەنیش دەمانچەکەی دەرهێنا، "یاڵلا وەرە خدر ئاغا، شوانی بزنە شینەکان، وەرە تەکلیفمان یەکلایی بکەرەوە، ئەی شوانی بزنان."

نیشانچی لەکاتێکدا ئەوان ئاوا بە بەر یەك هەڵدەچوون و مشتومڕیان بوو، چوو لە نێوانیان راوەستا:

"دروست بوەستن، کەیفم بەو جۆرە گاڵتانە ناهێت، تۆ دەستت لە خەنجەرەکەت هەڵبگرە، تۆش ئەو شتەی بەدەستتەوەیە بخەرەوە شوێنی خۆی! ئا، ئەو شێوەیە. بەدبەختینە خوایە بزنەکانی پیر خدر چاوەکانتنان کوێر بکەن. ئەگەر پیاون، جوامێرن، لەجیاتی ئەوەی بەر ببنە گیانی یەکدی، سەیر بکەن، هاتوونەتە تەنیشتتان، دەستتان درێژ بکەن دەتوانن بیانگرن، ئەوەندە لێتانەوە نزیکن. یەکێك لە بزنەکان یان کاریلەکانی خدر یەکسەر بگرن و سەری ببڕن. هەم داری وشکی زەیتوون هەیە، هەم نانی تەنووری تازە. یاڵلا دەست هەڵێنن ببینم. ئازان، زووبن. ئەم بزنە شینەی خدر بگرن و سەری ببڕن ببینم. کوشتنی بزن ئاسانترە لەوەی یەکدی بکوژن."

ئەفە خەنجەرلی گوتی:

"هیچکەس ناتوانێت بزنەکانی پیر خدر سەر ببڕێت، نە ڕۆستەمی زاڵ، نە کوێر ئۆغلۆ و نە تەنانەت حەزرەتی خدر خۆیشی."

"ئەگەر نەتوانێت سەریانببڕێت، ئەدی بۆچی بەخێویان دەکات، بۆ جوانی؟"

"خوا دەزانێت، مسۆگەر هۆکارێکی هەیە. ناکرێت دەست لە کارەکانیان وەربدرێت."

حەسەنی راکردوو گوتی: "خوا ئێمەی کە یەکدی دەکوژین بۆچی ئافراندوە؟ ئێمەی سەیرو سەمەرەی بۆچی ئافراندوە؟ بۆچی ئافراندوونی، ئەو مرۆڤانەی کە ئازاری یەکدی دەدەن، ئەو مرۆڤانەی کە یەکدی لە سێدارە دەدەن، لە سێدارە دەدەن و بە تامەزرۆیی و لەزەتبردنەوە دەوەستن و تەماشایان دەکەن؟"

"واز لەو شتانە بێنن، بابچین ماسیان بگرین، ئێوە چیتان بەسەر بزنەکانی خدرەوە هەیە، بەڵکو حەزرەتی خدر هێواش هێواش بزنەکانی بکوژێتەوەو بیانخوات. بەڵکو عارفەکانیش بەهێواشی خواردنی خۆیان بخۆن. چۆن دەزانن خدر خواردن دەخوات یان نا. کە گەڕاینەوە دوورگە دەبێت ئەوە لە دکتۆر سەلمان سامی شێت بپرسین تاکو باش راومان بنێت. تەنها لەخۆی رابکات نەك لە دوورگە. وازبێنن لەو شتانە. هەرکێ دەیەوێت با چەقۆکەی هەڵبگرێت و بچێت بزنێکی قەڵەوو تێر گۆشتی خدر بگرێت و سەری ببڕێتو نۆشی گیانی بکات. لەجیاتی ئەوەی یەکدی بکوژن، بزنەکان لێرەن خۆ."

نیشانچی بە تووڕەیی و هەنگاوی گەورەو خێرا بەرەو لێوار رۆیشت، بزنەکانیش کەوتنە دوای. کەمێك دواتر خەنجەرلی و حەسەنی راکردووش لەکاتێکدا بەنێو بزنەکاندا رەت بوون گەیشتنە لێوار، سواری کەلەکە بچووکەکە بوون و خۆیان گەیاندە بەلەمە ماتۆڕدارەکە. حەسەن بەلەمەکەی لێدەخوڕی. نیشانچی بەدەست شوێنێکی نیشاندا و گوتی: "پێموایە ئەوێ لەرەلەریەتی لە مەرجانە ماسی، بابچین سەیرێکی بکەین."

چوونە ئەو شوێنەی نیشانچی ئاماژەی بۆ کرد، قولابەکەی نیشانچی ئامادەبوو، یەکسەر هەڵیدایە نێو دەریا. خەنجەرلی بەدەستێك داو و بەدەستەکەی دیکەی قولابی گرتبوو چاوەکانی خێرا خێرا لەنێو قوڵتی چاوەکانی دەسووڕان، نەیدەزانی چ بکات. حەسەنی راکردووش قولابەکەی خۆی هەڵدایە نێو ئاو. چاوی بڕیبووە دەستی و بەردەوام دەستی بەرزو نزم دەکردەوە.

ئەفە خەنجەرلی گوتی: "لێرە لە دەریا، تووڕەبوون و مووڕەبوونمان نیە حەسەن ها، ئەو شتەی بەدەستتەوەیە بدە بەمن، هەر کە نووکی لێدا رایدەکێشم. بگرە هەرچۆنێك پێتخۆشە وا بیبەستەوە." داو و قولابی نێودەستی بۆ لای حەسەن درێژکردن. حەسەنی راکردوو لە ماوەیەکی کورتدا داوەکەی لە قولاب گرێدا، دانەخۆرەی بەسەر قولابەکەوە کردو گوتی: "ببینیت دانەخۆرەکەم چۆن بە نووکی قولابەوە کرد؟ سەیر بکە، دانەخۆرەکان لەنێو ئەم کاسە گڵێنە هەڵدەگریت و بەسەر

قولابەکەیەوە دەکەیت، ئێستا قولاب هەڵدە نێو دەریا. هەرکاتێك ماسیەك خۆی لە قولاب داو جووڵاندی، تۆش رایدەکێشیە سەرەوە."

"ئەمەیان ئیدی دەزانم."

رێك لەم کاتەدا نیشانچی یەکەمین ماسی گرت. بریقەی پوولەکەکانی ماسی لە هەوادا پەخش بوون. مەرجانێکی گەورە بوو، بەسەر قولابەکەوە بۆ ئەملاو ئەولا هەڵبەز هەڵبەزی بوو. دواجار نیشانچی بەدەستە زبرەکانی گرتی، ماسی لەنێو دەستە بەهێز و مقاشئاساکانی ئەودا هەوڵی دەدا. نیشانچی ماسیەکەی لە قولابەکە کردەوەو خستیە نێو لەگەنە تایبەتیەکە. ماسی کە کەوتە نێو ئاوی لەگەنەکە بەهەموو هێزو توانایەوە ئاوەکەی بەملاو ئەولادا پرژاند. کە ماسی ماندوو بوو و ئارامی گرت نیشانچی ئاوی لەگەنەکەی نەگۆڕی، بەڵام کاتێك ماسیەکە سست بوو ئینجا ئاوی لەگەنەکەی بەتاڵ کرد و لە ئاوی دەریاکە پڕی کردەوە. ماسی لەنێو ئاوی تازەدا بە ئارامی کەوتە مەلەکردن. دوای ئەوە هەرکاتێك ئاوەکەی دەگۆڕی دیسان ماسی گیانی دەهاتەوە بەرو ئەم رەوشە تا پڕبوونی لەگەنەکە بەردەوام دەبوو.

دوای نیشانچی حەسەنیش مەرجانە ماسییێکی گەورەتری گرت و رایکێشایە دەرەوە. ماسی کە بەسەر قولابەکەوە هەڵدەبزیەوە سێ جار بریسکایەوە، سێ جار هێڵێکی باریك هەوای شەقکرد. پروشەی سوورباو لە ماسیەکە کە لە هەوڵدان و هەڵبەزیندا بوو بەو نێوەدا بڵاوبوونەوە.

دەریا ئەوەندەی ماسی تێدا بوو، کە نیشانچی و حەسەنی راکردوو هەر لەگەڵ ئەوەی قولابیان هەڵدەدایە نێو ئاو ماسی دوای ماسیان کە لەژێر تیشکی خۆر دەدرەوشانەوەو بریسکە و پروشەی سوور و شین و پەمەییان بەو نێوەدا پەخش دەکرد رادەکێشایەدەر. ئەوان تا زیاتر ماسیان دەگرت ئەفە خەنجەرلی زیاتر نیگەران و دڵگران دەبوو. نیشانچی و حەسەنیش بە بینینی ئەو رەوشەی ئەو نیگەران و دڵگران دەبوون. بەردەوام لە بنەوە سەیری قولابەکەی ئەویان دەکرد. سەرەنجام خەنجەرلیش مەرجانێکی گەورەی گرت، ئەو دەستەی کە قولابەکەی گرتبوو بۆ سەرەوە بەرزبووەوە، ماسیەکەی کە دەجووڵاو دەبریسکایەوە ماوەیەك ئاوا بەدەستی بەرزەفتی کرد، لە خۆشحاڵیان لە پێستی خۆی جێینەدەبووەوە، زاری تا بناگوێی کرابووەوە، نیشانچی و حەسەنیش خەریکبوون پێیپێدەکەنین.

خەنجەرلی دوای ئەوە لێکدالێکدا ماسی گرتن. لەگەنەکە لە ماسیە جووڵەدارەکان پڕ بووبوو. نیشانچی گوتی:

"ئەم لەگەنە پڕ بوو کوڕینە، با ماسیە جۆر بەجۆرەکانی دیکە بخەینە نێو لەگەنەکانی دیکە. ئێمە ئێستا سێ ماسیگری کارامەین."

خەنجەرلی گوتی: "سوپاست دەکەم سەرۆك نیشانچی. زۆر سوپاس. دەست بۆ هەرچی ببەیت لەنێو دەستتدا ببێتە زێڕ. ئەگەر پێشتر پێیانگوتبوام رۆژێك تۆ سەتڵێکی پڕ ماسی دەگرێت، تەنانەت حەزرەتی خدریش سلاوی خوای لێبێت کە بەسەر ئاوەکاندا ئەسپ تاو دەدات، نەیدەتوانی وامليێبکات باوەڕ بەوە بێنم، هەمان خدری کە شوانی هەموو بزنە شینەکانی دنیایە."

راکردوو دەستی بە هەموو هێزیەوە دانایە سەر شانەکانی و گوتی:

"ئەفە، ئاشت بووینەوە؟"

ئەفە خەنجەرلی بە پێکەنینەوە سەیری کرد:

"ئێمە کەی لە یەکدی تووڕە بووبووین؟"

"دروستە، کەی تووڕە بووبووین؟ ئاگات لەو ماسیەش بێت کە گرتووتە!"

بۆ خاڵێکی دوور کە نیشانچی نیشانی دابوو رۆیشتن و لەوێ لەنگەریان گرت و قولابەکانیان هەڵدا. لێرە ماسیەکی زۆریان گرت. سەریان لە چەند شوێنێکی دیکەدا، لەگەنەکان پڕاو پڕ بوون لە ماسی. شەیتانە دەریاییەکانی نیشانچیش ئەمڕۆ خەریکی ئەنجامدانی ئەرکی خۆیان بوون. هەر کە نیشانچی فەرمانی دەردەکرد، هەموو ماسییەکانی دەریایان کۆدەکردنەوەو بەلەمەکانیان پڕ دەکردن.

دەوروبەری عەسر گەڕانەوە. نیشانچی لێکلێکە ئاوی لەگەنەکانی دەگۆڕی، بۆیە تا گەیشتنە دوورگە هیچ یەك لە ماسیەکان نەمردن.

هەموو ژنان و کچانی دوورگە دەست بە چەقۆ لەسەر ئەسکەلە چاوەڕێی ئەوان بوون. پۆیراز کە لەبەر ئەو میواندارییەی بە شانازی شوکری ئەفەندی رێکیانخستبوو بە بەلەمەکەی قەدریی بەلەموان چووبووە شارۆچکە و شتە پێویستیەکانی کڕیبوون و هێنابوونی.

ژنەکانی ماسیەکانیان کە لەسەر وردە بەرد و چەوەکە هەڵڕشترابوون پاککردنەوە، پەنگرە گەشاوەکان رێکخران، ماسیە لەشیشدراوەکان خرانە سەر پەنگران. راکی و ئۆزۆ و شەڕابەکان سەریان هەڵپچێندرا. لەسەر سفرەکە هەرچی دڵت دەیخواست داندرابوو.

ئوسوی دەنگبێژ بەخۆیو نەیەکەیەوە هات. لەبەری هەستان و بەوپەڕی رێز و شکۆمەندیەوە لەلای سەرەوە جێیان بۆ کردەوە. خواردن دەستی پێکرد. لەگەڵ خواردندا راکی و ئۆزۆ و شەڕابیش

وەکو ئاو دەخورانەوە. موسا ئاغا داوای لە ئوسوی دەنگبێژکرد نەی بژەنێت. ئوسوی دەنگبێژ دەمێك بوو چاوەڕێی داوایەکی ئاوابوو، سەرەتا سێ جار فووی لێکرد، پاشان دەستی بە ژەنین کرد. یەکەم نەوا غەمگین و دڵسووتێنەر بوو، فرمێسك لە چاوی هەموان ئەڵقەی بەستبوو. پاشان ئاوازەکە گۆڕاو حاڵەتی سەما و هەڵپەڕکێی بەخۆوە گرت. زۆری نەمابوو هەموویان هەستن و دەست بە سەما بکەن. لەم کاتەدا، زەهرا بە هەنگاوی نەرم و نیان وەکو سایە بەرامبەر بە پۆیراز رەت بوو. جامی نێودەستی پۆیراز هەروا لە هەوادا مایەوە.

پۆیراز جامەکەی نێودەستی دانایە سەر مێز، لەنێو خۆیدا گرمۆڵە بوو. زۆری نەمابوو سەری بە مێزەکە بکەوێت. ڤاسیلی بە بێدەنگی لەجێی خۆی هەستاو چوو قۆڵی پۆیرازی گرت و راستیکردەوە. پۆیراز بە ئاسانی هەستایەوە، هیچ کێشی نەبوو، تا گەیشتەوە ماڵێ بەبێگرفت رۆیشت، وەك هیچ رووینەدابێت لە پلیکانەکانیشی بەسەرکەوت، چووە ژووری خەوتنی، بێئەوەی پێویستی یارمەتیدان هەبێت جلەکانی داکەندن و جلی خەوی پۆشین و چووە نێو جێگا، لێفی راکێشایە سەرخۆی و کەوتە خەوێکی قووڵەوە.

نیوەشەو بوو کە میواندارییەکە کۆتایی هات، بەلەمەکەی شوکری ئەفەندی لەنێو سپێتی دەریادا کەوتە جووڵە. شوکری ئەفەندی بەهۆی مەستی و سەرخۆشییەوە ئەو شەوە نەیتوانیبوو بخەوێت، تاکە خۆشییەکی ئەم ساڵانەی دوایی ئەم شەوە بوو. لە ترسی ئەوەی نەکات ئەو خۆشی و شادمانییەی لەدەست بچێت نەیتوانیبوو بخەوێت. بڕیاربوو دوای دوو رۆژی دیکە لەگەڵ موسا ئاغا بچنە ئەستەنبۆڵ. ئاشنایی و هاوڕێیەتی ئەو پیاوە رەسەن و شکۆمەندە خۆی بەختەوەری و شانازیەك بوو بۆ خۆی. دوای ماوەیەکی درێژ بوو کەوا بەخت و ئیقبال جارێکی دیکە بەڕوویدا پێکەنیبوو.

# بەشی شەشەم

کچەکان ئەو دەستە جلەی کە لەناو باولەکان نەبوو و هێشتا قەت نەیانپۆشیبوو خستیانە نێو جانتایەکی بچووك. پێڵاوە زیادەکانیشیان کە مەگەر بە دەگمەن دەنا لە پێیان نەکردبوو. پێڵاوەکان باوکیان کاتی خۆی لە ئیتاڵیا بۆی هێنابوون، هەروا بە قاڵبی خۆیانەوە دەستلێنەدراو مابوونەوە. جانتا چەرمیەکانیشیان دەتوانین بڵێین هەر نوێ نوێ بوون. بڕیار بوو ئەو رۆژەی دەگەنە ئەستەنبۆڵیش بچنە ئاریشگا. قەدریی بەلەموان بەلەمەکەی سازو ئامادەکردبوو و بالیفێکی نەرمی خستبووە پشت سەری موسا ئاغا. بۆ کچەکانیش لە تەك ئەودا نیمدەری پان کردبوونەوە. موسا ئاغا کە خۆی رێك و شیك کردبوو، لەگەڵ کچەکان زۆر زوو چووە ئەسکەلە، قەدریی بەلەموان لە ئەسکەلە چاوەڕێیان بوو. هەر کە سواری بەلەم بوون، ماتۆڕی بەلەمەکە کەوتە کار و بەلەم وەڕێکەوت. بەلەم هێشتا دوور نەکەوتبووەوە کە پۆیراز بۆ بەرێکردنیان بەخێرایی خۆی گەیاندە ئەسکەلە. دەستی بۆ رێڤینگەکان کە هێشتا لەسەر جێگای خۆیان دانەنیشتبوون، راوەشاند. رێڤینگەکانیش دەستیان بۆ ئەو راوەشاند. پۆیراز تا ئەودەمەی ئەوان دوورکەوتنەوە دەستی هەر بە هەواوە بوو. لەگەڵ ئەوەی بەلەم لەبەرچاوان ون بوو، پۆیراز بێدەستی خۆی لەسەر تەختەکانی ئەسکەلە دانیشت و تا ئەودەمەی ڤاسیلی هات سەری لەسەر ئەژنۆکانی هەڵنەبڕی و ئاوا مابووەوە. ڤاسیلی ژێر باڵی گرت و هەڵیستاندەوەو بردیەوە ماڵەوە. پۆیراز بەدەنگێکی هەر ئەوەتا دەبیسترا گوتی:

"دەمەوێت بخەوم ڤاسیلی." لەسەر تەختە خەوەکەی دانیشت. ڤاسیلی جلەکانی لەبەرکردنەوە، پێژامەکەی کردە بەری. پۆیراز، جگە لەم پێژامەیە، دوو دانەی دیکەشی کڕیبوو. دوکاندارێکی یۆنانی پێژامەکانی نێو دووکانەکەی بە نرخێکی زۆر هەرزان دابوونە خەیری ئەفەندی و رۆیشتبوو. پۆیراز هەر سەری خستە سەر بالیف زۆری نەبرد خەوی لێکەوت، سێ رۆژی تەواو لەنێو جیگا نەهاتەدەر.

شوکری ئەفەندی لە ئەسکەلەی شارۆچکەکە چاوەڕێی موسا کازم ئاغا بوو، چووە پێشوازیان، ئەوانی بردنەوە ماڵی خۆیان، ئەو شەوە میوانداری کردن.

دوو رۆژ دواتر گەیشتنە ئەستەنبۆڵ، چوونە پێراپالاس. لەمیوانخانەکە موسا کازم ئاغایان ناسی و زۆر بە باشی پێشوازیان لێکرد. باشترین ژوورەکانی روو لە دەریایان بۆ دانان.

بەیانی، دوای بەرچایی، چوونە لای سەعید رەحمی بەگ، سەعید رەحمی لە ئەوروپا گەڕابووەوە، بە گەرمی پێشوازی لێکردن، بردنیە ژووری کاری خۆی، لەسەر کورسیەکەی هەستاو هات لە بەرامبەریان دانیشت. قاوە هات، خواردیانەوە، موسا ئاغا لە کاتێکدا بە ئومێدەواریەوە سەیری چاوانی سەعید رەحمی دەکرد، پرسی: "لە کارەکانی ئێمە چ هەواڵێك؟ باڵیۆزی یۆنان چیدەڵێت؟ ئەنقەرە چیگوت؟"

سەعید رەحمی گوتی: "مەپرسە، هیچشتێك مەپرسە، لەبارەی کارەکەی تۆ لەگەڵ هەر کەسێك قسەم کرد وەکو دوژمن سەیری کردم. گوتیان، ئەمان ئەمان، گوتیان خەریکە نێوانمان لەگەڵ یۆنانیەکان باش دەبێت، ئیدی باسی ئەم شتانە مەکە. گوتیان، تورکێك، تورکێکی راستەقینە، تورکێك لە یۆنان هاتۆتە ئەم نیشتمانە بەهەشتئاسایە، پێی خستبێتەوە سەر ئەم نیشتمانە بۆچی دەیەوێت بگەڕێتەوەو بچێتەوە بۆ یۆنان. چیوای نەمابوو نوێنەرێك دەمانچەکەی هەڵبکێشێت و بمکوژێت. باوکم زۆر بەتوندی نەڕاندی بە سەرمدا و گوتی ئەمەت جگە لەمن بە کەسی دیکەش گوتوە؟ پێمگوت بەڵێ گوتوومە. گوتی ئایندەی خۆت لەنێو برد. جارێکی دیکە بوون بە باڵیۆزی گەورە ناتوانیت لە خەونیشتدا ببینیت. لە کاتێکدا بە ئەژنۆکانی خۆیدا دەکێشا گوتی وای کوڕی سادەی خۆم وای. کاتێك باڵیۆزی یۆنان هات، رۆژێك بەیانی بە روخسارە سوورەکەیەوە هاتە ماڵەکەم، گوتی لەبەر ئەو هاوڕێیەت دوێنێ شەو نەمتوانیوە بخەوم. گوتی من رەوشی ئەوم بۆ ئەسینا نووسی، ئەوەندە لە پێشنیازەکەی من تووڕە بوون کە رەنگبێت من لێرە نەهێڵن، نەشیانهێشت."

"تکا دەکەم ببووریت سەعیدی هێژا. من چۆن بزانم دەبمە مایەی دەردەسەری بۆ تۆ، ببوورە. لە پای ئەمە تۆ دەرفەتی بوون بە باڵیۆزیشت لە دەستدا، من زۆر نیگەران بووم. چیبکەم، دەزانیت، کاتی خۆی دۆست و برادەری زۆرم لە دەوروبەر بوون، بەڵام تۆ جیاواز بوویت."

سەعید رەحمی گوتی: "نیگەران مەبە. من بەمزوانە لە تراکیا کێڵگەیەك دەکرم، دەمەوێت لە کێڵگەدا کار بکەم، لە پێدەشتدا کێڵگەیەکم دۆزیوەتەوە، لە بناری چیای ئیسترانجا."

"منیش کێڵگەیەکم کڕیوە، جوانە، شوێنێکی فراوانە، نزیك دەریایە، سەرکاری پێشووی کێڵگەکە کارەکانی ئەویم بۆ هەڵدەسووڕێنێت. سەرپەرشتکاری لقی حزبی گەلی کۆماریخوازی ئەوێ، خانوو و تەوێڵەی ئەسپانی کڕیوەو رووخاندوونی. من دەمەوێت جارێ تەوێڵەیەکی بچووك دروست بکەم و ئەسپێك و ماینێك بکڕم."

"ئافەرین، کەواتە دەتەوێت لێرە بمێنیتەوە کازم؟"

"نازانم."

سەعید رەحمی، تا بەردەرگا لەگەڵ موسا ئاغا و شوکری ئەفەندی چوو و بەڕێی کرد، کاتێك کە خەریکبوون لەیەك جیادەبوونەوەو خواحافیزیان دەکرد، موسا ئاغا لەوەی کە سەعید رەحمی شوێنی نیشتەجێبوونی ئەوانی نەپرسی، تووڕە بوو و گوتی:

"دیسان لە پێراپالاس ژوورمان گرتوە سەعید."

هاتنەوە هوتێل، کچەکان بە شەوقەوە چاوەڕوانیان بوون.

"نیگەران مەبن منداڵینە، سەعید ئەمجارەش وەکو جاران پێشوازی لێکردین، دۆستێکی دێرینە. لە دەشتی تراکیا کێڵگەیەکی بۆ خۆی کڕیوە، دەیەوێت ئەسپی رەسەن بەخێو بکات، لەو جۆرە ژیانەی ئێستا بێزار بووە. منیش پێمگوت، منیش کێڵگەیەکم هەیە و هەر بگەڕێمەوە دەمەوێت جووتێك ئەسپ و ماین بکڕم، کاتێك خواحافیزیشمان لە یەکدی دەکرد، پێمگوت لە پێراپالاس دابەزیوین، ئێستا بزانین چۆن دەبێت." رووی کردە شوکری ئەفەندی، پرسی: "ناوی ئەو خانمە بەرگدرووە چیبوو؟"

"مادام ئاتێنا و ئێلێنی، ئەوانیش چاوەڕێی ئێمەن. ئەوان لە ئاشناکانی منن. هاوسەری خاتوو ئاتێنا ئزمیریە. ساڵانە دێتە لای ئێمە، لەوێوە دەچێتە چیای قازداغی، لەوێ خزم و کەسانێکی هەن. تا دوندی چیاکە دەڕوات، لەوێ لەگەڵ عەلەوییەکان زیارەتگای ساری قیز لە رۆژی ئەلیاس زیارەت دەکات. خاتوو ئاتێنا و ئێلێنی لە باشترین بەرگدرووەکانی ئەستەنبۆڵن."

لە هوتێلەکە هاتنەدەر، لە کۆڵانی مزگەوتی ئاسماڵیەوە چوونە نێو شەقامی (ئیستقلال)، بە بەرامبەر خوێندنگای گالاتەسەرایدا تێپەڕین، کاتێك خەریکبوون رووەو مەیدانی تەقسیم دەڕۆیشتن، چوونە پیادەڕۆی دەستەچەپی شەقامەکە، لە ساختومانێکی گەورەی دەرگا ئاسنین چوونە ژوور و چوونە نهۆمی دووەم. خاتوو ئاتێنا ئەوانی لە کاتێکدا دەهاتن بینیبوو و دەرگای

بۆ کردبونەوەو چاوەڕێیان بوو. شوکری ئەفەندی هەستی بە شانازی کرد. لەکاتێکدا کە خاتوو ئاتێنا لەپێش ئەوانەوە دەڕۆیشت بە هۆڵێکدا تێپەڕین کە ژمارەیەك کچ لەوێدا کاریان دەکردو چوونە ژوورێکی گەورە کە کورسی چەرمی سەوزی لێداندرابوون و گوتی: "فەرموون بەڕێزینە، بەخێربێن سەفاتان هێنا. حاڵتان چۆنە شوکری ئەفەندی بەگ، ئێوە چۆنن قوربان؟"

کچێکی قژ بۆری جوان هات کە بەروانکەی کردبووەبەر، پرسی چی دەخۆنەوە، موسا ئاغا گوتی قاوەی سادە، شوکری ئەفەندیش هەر ئەوەی داواکرد. کچەکان داوای هیچیان نەکرد.

خاتوو ئێلێنی هات، خاتوو ئاتێنا ئەوانی بە یەکدی ناساند.

"چۆن دەکرێت شوکری بەگ نەناسم، بەخێر بێن، سەفاتان هێنا، لە خزمەتی ئێوەداین، ئەمر بفەرموون. لە پاریسەوە جلی مۆدێلی نوێ هاتوە، دوایین مۆدێل. ماشەڵڵا کچەکانیشتان زۆر جوانن، ئێمە دوایین مۆدی پاریسیان دەدەینێ، بە دڵیان دەبێت. فەرموون بابچین. قوربان ئێوەش دەتانەوێت ببینن؟"

"نامانەوێت، ئەوان هەمیشە خۆیان جلوبەرگی خۆیان هەڵدەبژێرن."

کچەکان ماوەیەکی درێژ لە ژوورەوە مانەوە، پاشان ماندوو و شەکەت هاتنە دەرێ.

"چیتانکرد کچینە؟"

"زۆر ماندوو بووین بابە. لەو ژووره ئەوەندەمان جل گۆڕین کە ئیدی بڕستمان لەبەر بڕاوە."

خاتوو ئاتێنا و خاتوو ئێلێنی دەست بە جلەوە هاتنە ژوورەکە و گوتیان: "قوربان سەیر بکەن کچەکانتان چەندە بە سەلیقەن، جوانترین جلوبەرگیان هەڵبژاردووە. فەرموون سەیری بکەن قوربان. پیرۆزیان بێت. ئەم جلوبەرگە چەند رۆژێك بەر لە ئێستا لە پاریسەوە هاتوون. لەکاتی خۆی هاتن، ئەگەر کەمێك دەرنگتر بهاتبوان ئەم جلوبەرگانەتان لەدەست دەدات."

موسا ئاغا سەیرێکی لە جلەکان کردو گوتی:

"بیانپێچنەوە خاتوون."

"سەرچاو، گەورەم."

کچێك هات کە بەروانکەیەکی سپی بەستبوو، جلەکانی لە دەستی خاتوون وەرگرت، کچەکانیش بەدوای ئەو لە ژوورەکە چوونەدەر.

"جیا جیا بیانپێچنەوە."

موسا ئاغا بە یۆنانی پرسی: "دەکاتە چەند، خاتوون؟"

خاتوو ئاتێنا نرخەکەی پێگوت. موسا ئاغا بەهێمنی پارەکەی ژمارد و نرخی جلەکانی بە پارەی کاغەز دایە خاتوو ئاتێنا.

بۆ ماوەی سێ رۆژ لە پێراپالاس نەهاتنەدەر، لەکاتێکدا کچەکان حەزیان لێبوو ئەستەنبۆڵ بگەڕێن، بەڵام موسا ئاغا بێئەوەی دەربڕێت چاوەڕێ بوو سەعید رەحمی بەدوایدا بێت. بەیانی رۆژی سێیەم ریشی تاشی، جلەکانی پۆشین، چووە خوارەوە، ئۆتۆمبێلێکی گرت و یەکڕاست چووە لای سەعید رەحمی، وەکو هەمیشە دەرگاوانێکی یۆنیفۆرم لەبەر دەرگای لێکردەوەو گوتی:

"قوربان، سەعید رەحمی چۆتە کێڵگەکەی لە تراکیا."

موسا کازم دەیزانی لەگەڵ ئەو رەوشە رووبەڕوو دەبێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتگوت ئاوێکی ساردیان بەسەردا کردووە. لە کاتێکدا لەبەر خۆیەوە دەیگوت دەمزانی وایلێدێت، بۆچی هاتم، گەڕایەوە هۆتێل. کەمێك بەسەرخۆی زاڵ بوو، چووە سەرەوە. کچەکان جلە تازەکانیان پۆشیبوو و چاوەڕوانی باوکیان بوون، بە خۆشحاڵی و پێکەنینەوە هاتنە پێش. کە موسا ئاغا کچەکانی ئاوا بینی، هەموو شتێکی لەبیر کرد و ئەویش شاد و خۆشحاڵ بوو و هەموویان پێکەوە کەوتنە پێکەنین. لەم کاتەدا شوکری ئەفەندی لە دەرگایدا، کاتێك موسا ئاغای کە چەند رۆژ بوو دەتگوت کەوانێکی کشراوە ئاوا بینی، خۆشحاڵ بوو. شوکری ئەفەندی کە ماوەی سێ رۆژ بوو هەموو شوێنێکی ئەستەنبۆڵ گەڕابوو و دۆست و برادەرەکانی خۆی بەسەر کردبوونەوە بە بینینی شادمانی ئەوان بێڕادە خۆشحاڵ بوو. کچەکان بەو جلە نوێیانەیان دڵگیرتر دەیاننواند. ئەویش پەیوەستی ئەو شادمانیەی ئەوان بوو. بەتایبەتی گۆڕانی رەوش و حاڵی موسا ئاغا ئەوی خۆشحاڵ کرد. کەوتنەڕێ. لە رێگادا موسا ئاغا ئەو پەشۆکاوی و خەمگینیەی پێشانی نەمابوو.

هەر کە گەیشتنە شارۆچکە، موسا ئاغا کچەکانی لە ماڵی شکری ئەفەندی دانا بە هەڵەداوان چووە پۆستخانە، بەڕێوەبەری پۆستخانە بە خۆشحاڵیەوە پێشوازی لێکرد و گوتی:

"قوربان نامەت بۆ هاتوە." پاکەتی نامەکەی دایێ. موسا ئاغا هەر لەگەڵ ئەوەی پاکەتی نامەکەی وەرگرت روخساری زەرد هەڵگەڕا. ماوەیەك لە مۆری سەر پاکەتەکە راما، پاشان چەند جارێك پاکەتەکەی هەڵگێڕو وەرگێڕ کرد، ئەمدیو ئەودیوی خوێندەوە، ئینجا بەدەستی لەرزۆکەوە پاکەتەکەی هەڵپچڕاند و نامەکەی خوێندەوە، روخساری زەرد زەرد هەڵگەڕا،

دووباره نامەکەی ئەمدیو و ئەودیو کرد، دووباره خوێندیەوه، گیانی هەموو بووه ئارەقە. بەڕێوەبەری پۆستخانە ترسا لەوەی ڕووداوێکی خراپی بۆ هاتبێتە پێش، گوتی بابچم ئاوتان بۆ بێنم. چووه ژووری تەنیشتیان، بە جامێك ئاوەوه گەڕایەوه. موسا ئاغا هەموو ئاوەکەی یەکبێن خواردەوه، ئینجا بێئەوەی هیچشتێك بە بەڕێوەبەر بڵێت، هەستاو بەرەو ئەسکەلە ڕۆیشت. لەو ڕۆژەی ئەوان ڕۆیشتبوون، پۆیراز پارەیەکی باشی خستبووه بەردەستی قەدریی بەلەموان و ئەوی ناردبووه ئەسکەلەی شارۆچکە و پێیگوتبوو لەوێ چاوەڕێیان بە. بەلەموان بە بینینی موسا ئاغا بەراکردنەوه بە پیریەوه چوو، دەستی موسا ئاغای گرت و ماچی کرد، موسا ئاغاش دەست بەسەری ئەو داهێنا: "زووبە بەلەموان کوڕم، زووبە، کچەکانم لە ماڵی شوکری ئەفەندین، بڕۆ لەگەڵ خۆتدا بیانهێنە با بگەڕێینەوه بۆ دوورگە. مەلەك خانم چۆنە؟ پۆیراز چۆنە؟ تۆ خۆت چۆنیت؟"

"سوپاس مام ئاغا، هەموومان باشین مام ئاغا، لەو ڕۆژەوەی ئێوه ڕۆیشتوون من لێرە چاوەڕێتانم مام ئاغا."

"بە ماڵی شوکری ئەفەندی دەزانیت کوڕم؟"

"پێدەزانم مام ئاغا، نزیکە مام ئاغا. هەر ئێستا دەچم و دەیانهێنم مام ئاغا. بەخێربێنەوه مام ئاغا."

قەدریی بەلەموان وەکو بروسکە و با ڕۆیشت و کەمێك دواتر لەگەڵ شوکری ئەفەندیدا گەڕایەوه. موسا ئاغا، هەواڵە ناخۆشەکەی نامەی لەبیر کرد، بە هاتنیان خۆشحاڵ بوو، بە ڕووێکی پێکەنیناوی ڕووبەڕوویان بووەوه، سوپاسی شوکری ئەفەندی کرد، دوای ئەوەی گرتیە باوەش، دەستی خستە قۆڵی کچەکانی و شادو خەندان سواری بەلەم بوون.

قەدریی بەلەموان جێگای ئەوانی لە بەشی لای سەرەوه ئامادەکردبوو. "فەرموون قوربان، جێگاکەتانم وەکو هەمیشە ئامادەکردووە، سەرینی نەرم، بالیفی پەڕی مامریشم داناون کە پشتی خۆتانی وێبدەن. بۆ کچە خانمەکانیش لای خۆتان جێم بۆ داناون."

"سوپاست دەکەم کوڕم، بەلەموان، زۆر سوپاس، بۆ ئەوەی کە ئەو هەموو ماوەیە لێرە چاوەڕێم بوویت..."

"منیش سوپاسی ئێوه دەکەم، هەربژیت قوربان، ئەودەستە موبارەکانەت ماچ دەکەم قوربان."

لەوان جیابووەوەو چووە خوارەوە، هندری ماتۆڕەکەی تەنها سێ جاران راکێشا، ماتۆڕەکە کەوتەکار، بەلەم وەرسووڕا و لەکاتێکدا ئاوی دەریای کەفاوی دەکرد ڕێگای دوورگەی گرتە پێش، وەکو سەعات کاری دەکرد. موسا کازم ئاغا نامەکەی لە گیرفان دەرهێناو دایە دەستی زەهرا، زەهرا بەدەستی لەرزۆکیەوە نامەکەی لەنێو پاکەتەکە دەرهێنا، بەدەستی لەرزۆکیەوە خوێندیەوە، واینواند کە نیگەران بووە، نامەکەی دایە دەست باوکی، موسا ئاغا نامەکەی دایە نەسیبە، نەسیبە نامەکەی وەرگرت، بەدەستی لەرزۆکیەوە لە پاکەتەکەی دەرهێناو خوێندیەوە، باوکی لەو ماوەیەی کە ئەو نامەکەی دەخوێندەوە چاوی لەسەر هەڵنەگرت. سیمای نەسیبە هیچ هەست و کاردانەوەیەکی نیشان نەدەدا. موسا ئاغا نامەکەی لە نەسیبە وەرگرت و خستیەوە نێو گیرفانی چاکەتەکەی. بێئەوەی رای کچەکان بپرسێت کەوتە قسەکردنەوە:

"بەڵێ وایە کچەکانی خۆم، برادەرەکانی من ئەو جۆرە برادەرانەن کچەکانی خۆم. پیاو ئەو جۆرە دۆستانەی هەبن تەنانەت دوورخستنەوەشی لەبیر نابێت. تەنانەت گرنگی بە مەرگیش نادات. دەزانن، لە جەنگی ئەنەدۆڵدا تەنانەت گەورەترین جەنەڕاڵە شکستخوادووەکانیشیان خستنە زیندانەوە، تەنها نەیانتوانی هیچ لەگەڵ برادەرەکەی من بکەن کە فەرماندەیەکی شکستخواردووش بوو، چونکە ئەو فەرماندەیەکی مەزن بوو. ئەگەر فەرماندەی گشتی سوپا بوایە نەدەچووە ئەو جەنگەوە. زیندانیکردنی ئەو کارێکی ئاسان نەبوو. ئەو هەقی بوو دژی ئەو جەنگە بێت و ئەمە هەموو یۆنان دەیزانێت و ئەمە گەورەترین هۆکار بوو کە کاریان بەو نەبێت. ئەو جەنەڕاڵانەی کە زیندانی کران یان خرانە ژێر چاودێریەوە جەنەڕاڵی ناشایستە بوون. بینیتان کچەکانی خۆم، باوکتان دۆست و برادەری ئاوای هەن. لەم دنیایەدا مرۆڤ ئەگەر هیچشتێکی نەبێت، برسی بێت، رووت و رەجاڵ بێت، بەڵام دۆستی ئاوای هەبن، ئەمە بۆ ژیانێکی شەڕافەتمەندانە بەسە. قەت بیرم لەوە نەدەکردەوە رۆژێك ئەو نامە بۆ من بنووسێت. کەسێك کە زیندانی بکرێت، چ جەنەڕاڵ بێت، چ سیاسەتمەدار، بەهیچشێوەیەك ڕێگەی پێنادەن نامە بنووسێت. ئەو دۆستەی ئێمە بەهەرحاڵ دەرفەتێکی دۆزیوەتەوەو خۆی خستۆتە مەترسی و ئەم نامەیەی بۆ من نووسیوە، لەگەڵ ئەوەیدا کە زانیوویە من لە چ رەوشێکدام، نامەی بۆ ناردووم. بە خوێندنەوەی نامەکە هەموو شتێکتان بۆ روون بووەوە رۆڵەکانی خۆم. ئێستا پێتاندەڵێم، متمانەتان بە قسەکانی من هەبێت، ئەو دۆستەی من بە زوویی لە زیندان ئازاد دەبێت، منیش دەگەڕێمەوە کرێت. ئێستا تێگەیشتن بۆچی لێنەگەڕام باولەکانتان بکەنەوە."

"باوکە ئێمە باولەکانمان دەکەینەوە، ناشچینەوە کرێت، مەگەر نە؟ ئەو شتانەی لە ئەستەنبۆڵ کڕیمان زۆر جوانن، وەلێ ئێمە جلەکانی نێو باولەکانیشمان دەپۆشین، وایە باوکە؟"

ئەو هەروا کە قسەی دەکرد، موسا ئاغا چاوە شینەکانی بڕیبوونە چاوەکانی ئەو و کپ و بێدەنگ سەیری ئەوی کردبوو. لەپڕ لە کووره دەرچوو و نەڕاندی، تەنانەت قەدریی بەلەموانیش کە لە بەشی خوارەوەی بەلەمەکە بوو بە دەنگی ئەو راپەڕی، یەکسەر هاتە سەرەوەو یەکسەریش گەڕایەوە. موسا ئاغا دەینەڕاند:

"مەگەر من پێمنەگوتن، جەنەڕاڵی برادەرم بەزوویی لە زیندان ئازاد دەکرێت، ئەوانەی زیندانیان کردووە زیندانیان دەکات، ئەو رۆژەی دەستەڵاتیشی گرتەوە دەست بانگهێشتم دەکاتەوە بۆ یۆنان، نەمگوت؟ ئێوە ئەگەر دەتانەوێت لێرە لەم دوورگەیە بمێننەوە بمێننەوەو هاوسەرگیری بکەن، مەگەر دایکتان جێینەهێشتم، وادەزانن من بەتەنێ ناتوانم بۆ وڵاتەکەم بگەڕێمەوە، دووبارە کێڵگەکەم وەکار بخەمەوەو ئەسپی رەسەن بۆ ئەورووپا، بۆ هەموو لایەکی ئەورووپا بەخێو بکەم و رابێنم، وابیر دەکەنەوە ها؟"

کچەکان کە لەوەتەی هەن قەت باوکیان لەو حاڵ و رەوشەدا نەبینیبوو، خۆیان خڕکردبووەو لە شوێنی خۆیان وشکهەڵاتبوون. دەمارەکانی ملی باوکیان هێندەی پەنجەیەك هەڵمسابوون. کچەکان ترس دایانگرتبوو، دەترسان شتێکی بەسەر بێت. قسەکانیشی لەسەرخۆ نەمابوون، کچەکان نەیاندەزانی چیبکەن، زیاتر خڕبوونەوە ناوخۆیان. چاوەکانی باوکیان لە کاسە دەرچووبوون، لە تووڕەییان شەڵاڵی ئارەقە بووبوو.

کچەکان پێکەوە گوتیان: "باشە!" دەنگیان ئەوەندە نائومێدانە بوو کە موسا ئاغا قسەی خۆی بڕی و بێدەنگ بوو. جگە لە وڕە وڕی ماتۆڕەکە و دەنگی شەپۆلەکانی دەریا هیچ دەنگێك لەو ناوە نەما. موسا ئاغا کەمێك دواتر لە دڵی خۆیدا گوتی من چیم بەم منداڵانە کرد، بەو منداڵە بێکەش و تەنیایانە، وای غوربەت گەیاندومیەتە ئەم حاڵ و رۆژگارە. نە دەیتوانی سەیری زەهرا بکات کە لەلای راستیەوە دانیشتبوو و نە سەیری نەسیبە کە لەلای چەپییەوە بوو، کچەکانیش هەروا دانیشتبوون.

هیچکامیان لە شوێنی خۆی تەکانی نەخوارد، تا ئەودەمەی دوورگە بەدەرکەوت نە قسەیەکیان کردو نە توانیان سەریان بەرز بکەنەوە و سەیری ئەملاوئەولا بکەن. تەنانەت دەریاشیان کە بەلەمەکە کەفاوی دەکرد نەدەبینی. هەستێکی ئازاردەرانە ناخی موسا ئاغای

گرتبووه خۆی، ئەو هەستە تا دەهات زیاتر بڕستی لێدەبڕی. چیوابنەمابوو دڵی شەق ببات. وای کچە رندەکانی من، وای سێویەکانی من، من چیم لەگەڵ ئێوە کرد، منی گەمژە، منی بێکەڵك، دوای ئەوە، دوای ئەو کارەی بە سێویەکانی خۆم کردم تازە بە کەڵکی چی ئەوان دێم. خۆزگە منیش لەگەڵ دایکیان دەمردم، دەمردم و منیشیان، منیشیان فڕێدەدایە دەریا تا ئەو رووە دزێوەم نیشان نەدابوان. کچەکانم کوشت، خۆیشم لەگەڵیاندا کوشت، ئەوان و خۆشم. من لەنێو چووم، چۆن دەتوانم ئەوان زیندوو بکەمەوە. زەهرا کچم من بۆچی ئەمەم کرد؟ لە ناخی خۆیدا دەستیکرد بە ئاخاوتن لەگەڵ کچەکانی. دوای مردنی دایکتان قەت کارێکم نەکردبوو دڵتان ئازار بدەم. من لە تەمەنی خۆمدا، نەك بەسەر ئێوەدا، بەڵکو بەسەر هیچ کەسدا ئاوا زاڵمانە هاوارم نەکردووە. ئەو کارەی لەگەڵ ئێوەم کرد تا دەمرم وەکو گرێ بەسەر دڵمەوە دەمێنێتەوە. چیبکەم تاکو بمبوورن؟ ئێوە چۆن دەتوانن ئەمەم پێبڵێن، چۆن دەتوانن رێگاکەیم نیشان بدەن؟ ئەگەر پێتانبڵێم هەر کە گەیشتنەوە دوورگە بڕۆن باولەکانتان بکەنەوە، واتە ئیدی ناچینەوە کرێت، بە قسەم دەکەن؟ چیبکەم کە هەمان باوکی جارانتان بم؟ بەو هزرو داڵغانەی هەولێدەدا ئازارەکەی هێور بکاتەوە. رێك لەم ساتەدا قەدریی بەلەموان بە هەڵەداوان هات:

"سەیری، سەیری دوورگە بکەن، پێم لە بەنزیم نا، پێم لە بەنزین نا، هەولمدا بە رۆژی رووناك بتانگەیەنمەوە دوورگە."

خۆی درێژکرد و دەستی موسا ئاغای گرت و بەرزی کردەوە، کچەکانیش هەستان.

"سەیری بکەن، سەیری بکەن، سەیری بکەن، خەڵکەکەمان هەموو لەسەر ئەسکەلەن. هەموویان هەر بەلەمەکەی من ببینن دەیناسنەوە. ئەوەش دەزانن کە ئێوە بە بەلەمی من دێنەوە، چونکە من لە ئەسکەلەی شارۆچکە چاوەڕێتان بووم."

موسا ئاغاو کچەکان خۆشحاڵ بوون. موسا ئاغا بەدەستی راستی زەهرای گرتە باوەش و بەدەستی چەپیشی نەسیبە و گوتی: "من ببوورن کچەکانم، رەفتارم خراپ بووە لەگەڵتاندا. نازانم چیبکەم تاکو بمبوورن. ئەم غەریبایەتی و ئەو ستەمکاریە وەك بڵێیت مرۆڤایەتی لێسەندووم."

زەهرا گوتی:

"باوکە توخوا. سەیرکە باوکم بە چیەوە نیگەران بووە. لە شادترین ڕۆژی ژیانتدا چیم لەگەڵ کردیت، گومانی تێدا نیە کە برادەرەکەت لە زیندان ئازاد دەبێت، بانگهێشتی تۆش دەکاتەوە بۆ کرێت. کێ هەیە ئەمە نەزانێت. تۆ من ببوورە باوکە، ڕەفتارەکەی من گەمژانە بوو."

نەسیبەش گوتی:

"توخوا بابە!" قسەکانی زەهرای دووبارەکردنەوە، باوکەکە دیسان توند کچەکانی گرتەوە باوەش.

"سوپاستان دەکەم جوانەکانی خۆم، سوپاستان دەکەم ڕۆح و گیانی خۆم. ئەگەر جەنەڕاڵ هەمان ئەو جەنەڕاڵە بێت کە من لە تەمەنی گەنجیەوە دەیناسم، بەزوویی لە زیندان ئازاد دەبێت و یۆنان دێنێتە لەرزە، یەکەمین کاریش کە دەیکات ئێمە دەباتەوە بۆ یۆنان. یەکێك لە خەسڵەتی ڕێبەرە مەزنەکان ئەوەیە کە لەسەر بەڵێنی دۆستانەی خۆیاندا وەفادار دەمێننەوە و ڕاستگۆن. گەورەترین خەسڵەتی ئەو برادەرەی منیش ڕاستگۆ بوو، نیەتی پاك بوو لەگەڵ برادەرەکانی خۆی. ڕێبەرێك، فەرماندەیەك، کاتێك کە دۆستەکانی لەدەست دەدات، بەو واتایە دێت کە هەموو شتێکی لەدەست دابێت. درەختە گەورەکان بە لك و پۆپەکانیانەوە چڕو پڕ و گەورە دەبن." تا دەهات لە دوورگە نزیك دەبوونەوە، خەڵکی ڕاوەستاوی سەر ئەسکەلە تا دەهات باشتر دەردەکەوتن. بەر لەوەی بەلەم لە ئەسکەلە لەنگەر بگرێت، موسا ئاغا هەستایەوە، دەستی ڕاستی دانایە سەر دیوارەی کابینەکە. کچەکانیش هاوکات لەگەڵ باوکیاندا هەستابوون و سەیری خەڵکەکەی سەر ئەسکەلەیان دەکرد. ماندووبوون بە ڕوخساریانەوە دیاربوو. زەهرا بە نیگاکانی بە دوای پۆیرازدا دەگەڕا. کە ئەوی بینی، دڵی بەخێرایی کەوتە ترپە، کاتێك بەلەم لە ئەسکەلە ڕاوەستا، زووتر لە باوکی دابەزی، ڕاست بەرەو لای پۆیراز ڕۆیشت، نیگاکانیان تێکئالا، ڕوخساری پۆیراز هەڵبزرکاو بوو، ئەمە زەهرای زیاتر لەوەی باوکی دڵئێشاوتر کردبوو، نیگەران بوو. بیری لەوە کردەوە کارێك بکات کە جارێکی دیکە بیبینێتەوە.

خەڵکەکە لەدەوری لەسەفەرگەڕاوەکان کۆبوونەوە. چوون لەژێر دارچنارەکان دانیشتن. هەموان، تەنانەت منداڵانیش، بەخێرهاتنەوەیان کردن. هاتنەوەی موسا ئاغا لەگەڵ کچە جوانەکانی زۆر خۆشحاڵیان کردبوون.

سەلمان سامی گوتی: "ئێمە چاوەڕێیتان بووین و هەموومان پێمانوابوو ئێوە شەو دەگەنەوە، کاتێك بەلەمی قەدریی بەلەموانمان بینی، بۆ بینینتان هاتینە ئەسکەلە."

"سوپاستان دەکەم، هەر بژیت جەنابی سەرگورد."

"منیش سوپاسی ئێوە دەکەم."

ماوەیەك لەسەر کانیەکە دانیشتن، یەکەمجار دکتۆرەکان لەبارەی ئەستەنبۆڵ پرسیاریان کرد. ئەمجارە دەتوانین بڵێین نەچووبونە هیچ شوێنێکی ئەستەنبۆڵ. سێ ساڵ بوو کە کچەکان جلوبەرگێکی گونجاویان نەبوو. هەر بۆ ئەمەش چووبوونە ئەستەنبۆڵ، لەلایەن بەرگدروویێکی ئاشنای شوکری ئەفەندی جلوبەرگی تازەیان بۆ کچەکان کڕیبوو. تەنانەت ئەوانەی کە قەت ئەستەنبۆڵیشیان نەبینیبوو لە موسا ئاغایان دەپرسی کە ئەستەنبۆڵ چۆن شارێکە، ئەویش تا ئەوەندەی دەیزانی بۆی باس دەکردن و بۆی روون دەکردنەوە. بەتایبەت لەبارەی مزگەوتەکان قسەی بۆ کردن، سلێمانیە، سوڵتان ئەحمەد، کیز کولەسی، خەلیج کۆپری، مەیدانی ئەسپەکانیش لایەنێك بوو لە باس و گێڕانەوەکانی.

دوای ئەوەی کە ماوەی کاتژمێرێك موسا ئاغا و کچەکانی دانیشتن، دکتۆر سەلمان سامی هەستا و گوتی: "ڕێبوارەکان ماندوون، ئیدی هەستن بچنەوە بۆ ماڵەوە."

موسا ئاغا لەگەڵ ئەم قسەیە یەکسەر هەستا، کچەکانیش هەستان. بەرەو ماڵەوە ڕۆیشتن. بە دواشیاندا قەدریی بەلەموان جانتاکانی بۆ بردنەوە ماڵ.

ئەو شەوە لە دوورگە شادی و خۆشی باڵادەست بوو. ئەوان کاتێك کە موسا ئاغا و کچەکانی دوورگەیان جێهێڵابوو پێیانوابوو ئیدی ناگەڕێنەوە بۆ دوورگە، ئەو بۆچوونەیان تەنانەت لە ناوخۆشیاندا باس نەکردبوو، بێئەوەی لە مەلەك خانم بپرسن چاوەڕێی سەرەنجامیان کردبوو. ئێستا بەو ئەنجامە رازی و خۆشحاڵ بوون.

ئەوان لەوکاتەی کە لەژێر دارچنارەکان لەگەڵ یەکدیدا سەرگەرمی گفتوگۆ بوون مەلەك خانم و لێنا خێرا چووبوونەوە ماڵ تاکو خواردن بۆ موسا ئاغا و کچەکانی لێبنێن. لەو گۆشتە لەمەکینەدراوەی کە پزیشکی ئاژەڵان لە شارۆچکە هێنابووی و ئەوان قیمەیان کردبوو و ئەو تەماتە و بیبەرانەی کە لە باخچەکانیاندا لێیانکردبوونەوە دۆڵمەیان بۆ دروست کردبوون و دیاننابووە سەر ئاگردان، هەروەها ئاشی ماستی بە پوونگەشیان دروست کردبوو. پۆیراز دیارنەبوو لە کوێوە چوار شووتی تاڕادەیەك گەورەی پەیدا کردبوون و هێنابوونیەوە ماڵ.

شووتیەکانی دابووە قەدریی بەلەموان تا بیانباتە ژێر دارچنارەکان. ئاوی کانیەکە زۆر ساردبوو. نەتدەتوانی دەست بخەیتە نێو ئاوەکەی، دەستی سڕ دەکرد. قەدریی بەلەموان لە دڵی خۆیدا گوتی شووتیەکان دەخەمە نێو ئاوی کانی تا سارد بن و پیرە دایکم لەگەڵ کچە جوانەکانی بیانخۆن. پاشان لە رۆخ کانیەکە دانیشت. ئەم پۆیرازە کەسێکی چەند سەیرە، ئەم دکتۆرانە چەند دەوڵەمەند و پوولدارن. مرۆڤ تەنانەت بۆ شوێنێکی دوو هەنگاو دووریش بنێرن چەنگێك پارەی دەخەنە گیرفانیەوە. چەندیان پارە هەیە. پۆیراز کاتێك منی دەنارده شارۆچکە گیرفانی پڕ دەکردم لە پارە. کە گەڕامەوەش گوتم پۆیراز پارەیەکی زۆری دامێ، مام ئاغاش ئەو گیرفانەی دیکەی پڕ کردم لە پارە. دکتۆرەکانیش هەروەها. وەستاکەشم کە ئەم بەلەمە جوانەی دامێ، هەر چیت بکردبوا، ئەم دوورگەیەت لە کۆڵ نابواو بتبردبوا هیچشتێکی نەدەگوت.

خانمەکان پۆیرازایان نارده لای موسا ئاغا.

پۆیراز گوتی: "مامە، زەحمەت مەکێشە، مەلەك خانم و لێنا خەریکن چێشتتان بۆ دروست دەکەن، ئەو بۆتانی دێنن."

موسا ئاغا بە پێکەنینەوە گوتی: "بۆ نانی ئێوارە تۆش وەرە کوڕم. سوپاسی ماندووبوونتان دەکەم."

"بە ئیزنی بەڕێزتان، ئێوەش پشوو بدەن. منیش دێم قوربان."

چاوە شینە کاریگەرەکانی زەهرا لە کاتێکدا بریسکەیان دەدا لە روخساری ئەو رامابوون. پۆیراز تێنەگەیشت ئەو بریسکانە هی خەمن یان هی تووڕەیی. بەرەو لای باخی هەناران رۆیشت. لە کۆنەوە دەیزانی کاتێك هەنارەکان گوڵ دەگرن دنیا جوانتر دەبێت. نەك تەنها چیاکانی تووڕۆس و چوکوراواو ئیدای هەزارکانی بەڵکو هەموو شوێنێك وایلێدێت. سووری گوڵە هەنارە بێکۆتاییەکانی چیاکانی تووڕۆس لەسەر زنارەکانی لێوار رەنگیان دەدایەوە، زنارەکان سوور سوور دەبوون. ئێستاش هەنارەکان خەریکن دەگەن. رەنگی پەمەیی هەنارە درشتەکانی باخە پەمەییەکان لەسەر زنارەکان و لەسەر دەریای ئەو خوارەوە رەنگی دەدایەوە.

خێرا خێرا دەڕۆیشت، باخە وێرانەکانی هەنارانی لە دوای ئەرمەنیەکان بەجێمابوون، کە لە سەردەمی منداڵی ئەودەمەی دەچووە خوارەوە بۆ ئۆزون یایلاو چوکوراوا دەیبینین وێنای دەکردنەوە. بە چاوانی پڕ لە حەپەسان و تاسانەوە گەیشتە نێو باخی هەناران. هەر هەنارێك

هێندەی شووتیەکی نەگەورە نە بچووك دەبوون. هەنارە پەمەییەکانیش هێندە گوڵە سوورەکانیان جوان بوون. لکی دارهەنارەکان بەرگەی باری گرانی هەنارە درشتەکانیان نەبوو و هەندێك لە لکەکان ئەوەندە شۆڕ بووبوونەوە گەیشتبوونە سەر زەوی. پۆپیراز کە نوقمی نێو فکر و داڵغان بوو لەکاتی ڕۆیشتنندا لە داڵغە و بیرکردنەوەیەك دەچووە سەر داڵغە و بیرکردنەوەیەکی دیکە، ئەو مارانەی کەوتبووەوە بیر کە لە چوکوراوا دەهاتنە نێو باخەکان. ئێرە لەبەر ئەوەی دوورگە بوو مارە ڕەشەکان زۆر نەیاندەتوانی بێنە ئێرە. کاتی کە دارهەنارەکان گوڵ دەگرن ئەوکات مارە ڕەشەکان دێنە ناو باخان، لەژێر درەختەکاندا ڕەنگیان دەگۆڕێتە سەر سوورێکی زۆر تۆخ و لێکدەئاڵێن.

دوای ئەوەی ماوەیەکی باش ئاوا عیشقبازی خۆیان دەکەن، لەو گۆڕە درێژاو درێژ لێیرادەکشێن، ڕەنگەکەیان هێواش هێواش لە سووریەوە دەگۆڕێت و دووبارە دێنە سەر ڕەنگە ڕەشەکەی خۆیان، کەمێك پشوو دەدەن و بە ماندوویێتیەوە دەخزن و ئەو ناوە جێدەهێڵن. ئاوا، لەو ڕۆژانەدا لە چوکوراوا، ڕەنگبێت لە شوێنەکانی دیکەشدا هەروا بێت، دیسان ڕەشمارەکان لەنێو باخی هەناران کیفەکانیان دابکەنن. ئەو وشەی کیفداکەندنە لە هەموو جێگاکان نایزانن، ئەوە واتە مارەکە پێستێکی تەنك لەبەرخۆی دادەکەنێت و لە دوای خۆی بەجێیدەهێڵێت. کوشتنی ڕەشمار لە چوکوراوا بە گوناحێکی گەورە دەژمێردرێت. کەسێك لە چوکوراوا ماری ڕەش بکوژێت نەفرەتی لێدەکرێت. ئەو مارە ڕەشەی کە دێتە ژێر درەختەکە یەکەمجار دوولا دەبێتەوە ئینجا خۆی لێکدەکێشێتەوەو دووبارە خۆی وێکدێنێتەوە. پاشان سێ جاران بە سەرخۆیدا لاردەبێتەوەو دیسان دەکشێت و وێکدێتەوە. ئینجا وەکو تۆپ خڕ دەبێتەوە سەریەك، دەنگێکی وەکو فیکە و ناڵە ناڵی لێدەردەچێت، خڕدەبێتەوە، لێکدەکشێتەوە، گینگڵ دەدات، وەك تۆپ خڕ دەبێتەوە، پان دەبێتەوە، دەنگی سەیر سەیر و باوەڕنەکراو دەردەبڕێت. خڕ دەبێتەوە، پان دەبێتەوە، ماوەیەکی درێژ ئەو جوولانە دەکات. بوونەوەرێك چۆن دەتوانیت ئەو هەموو دەردو ئازارانە بەرگە بگرێت، تێگەیشتن لەمە سەختە، بۆیە خەڵکی چوکۆراوا بەو گۆڕانکاریە دەردناکە دەڵێن پێستداکەندن. ئەودەمەی گینگڵ دەدات و دەنگێکی وەك زریکە و ناڵەی دەردناك و گریانئاسا دەردەدات، لەپڕێکدا بێدەنگ دەبێت، لەو گۆڕە پان دەبێتەوە، وەکو مردوو بە درێژایی خۆی لەو گۆڕە رادەکشێت، کەمێك دواتر بتەوێت یان نا جەستەکەی هەڵدەبەزێتەوە، بە ئارامی دەخزێت، کەمێك ئاوا دەخزێت، دوای ئەوەی کەمێك دەڕوات

دەوەستێت، هەر لەوێدا خەو دەیباتەوە. لەوکاتەدا دەتوانیت بچیتو سەری، کلکی یان جێگاکانی دیکەی بگریت و بەرزی بکەیتەوە، مار وەکو مردوو بێجوولّە و بێگیانە، ناتوانێت هیچ کارێك بکات، کەمێك دواوەتر لە مارەکە پێستە داکەندراوەکەی بە درێژایی خودی مارەکە بەجێماوە. پێستەکە یان کیفەکە رۆشن و بریقەدارە، مارەکە دوای ماوەیەك دێتەوە سەرخۆی، دیسان بتەوێت یان نا بە ئارامی دەخزێت و دەچێتە نێو گیاکان و ون دەبێت.

ئێستا کاری من و زەهراش لە کیفداکەندنی رەشمار سەختترە. ئەو کەسەی کە ناهێڵێت کچەکان باولەکانیان بکەنەوە، جەنەراڵە، مارشاڵە، ئەو کەسەیە کە ساڵەهایە لە کەسێك نامەی بۆ نەچووە، لە ئەنقەرە دەرکراوە، لە هاورێکەیەوە هەواڵێك نەبوو... بەردەوام هەر کرێت کرێتیەتی. مرۆیەکی لەخۆ رازیە کە خۆی بە پادشای عوسمانی و کوڕی فیرعەونی میسر دەزانێت، پیرە، عارفە، بە بڕوای مەلەك خانم کوڕی خودی خۆیەتی، لەگەڵ کچە بەدبەختە جوانەکانیدا، وەك ئەوەی لەگەڵ بووکەڵەی منداڵان یاری بکات. مرۆییێکە کە دڵی ژەنگ گرتوویەتی. کوڕە تۆ ئەوەندەش پیر نیت، ئەگەر نەهێڵیت کچەکان باولەکانیان بکەنەوە، ئەوا لە ماڵێدا دەمێننەوەو پیر دەبن و تەواو، خۆشت دەمریت و ئینجا تف دەکەنە تەرمەکەت. کرێت کرێت دەکەیت. ئێستاکە لێتناگەڕێن بچیتەوە کرێت خۆت بکوژە، خۆت ناکوژیت لانیکەم بهێڵە کچەکانت باولەکانیان بکەنەوە با خواش بەهەشتت بە نسیب بکات.

مەلەك خانم و لێنا پێکەوە چێشتیان بە قابلەمەی سەرداخراو بۆ موسا ئاغا برد. موسا ئاغا پێیگوتن: "ئێوەش بمێننەوە، با پێکەوە ئەم خواردنە بەتامەتان بخۆین."

"ئێمە خواردنی خۆمان لە ماڵێ داناوە ئینجا هاتووین. کاك پۆیرازیشت بانگ کردووە. ئەویش خەریکبوو جلەکانی دەگۆڕی و دەهات."

مەلەك خانم و لێنا ئەوکاتەی لە پلیکانەکان دەچوونە خوار، پۆیرازیان بینی کە جوانترین بەرگی پۆشیبوو. پۆیراز کە چووە ژوورەوە سەیریکرد زەهرا و نەسیبە وا مێزی نانخواردن رێکدەخەن. موسا ئاغا بە پێوە پێشوازی لێکردو گوتی:

"فەرموو دانیشە کاکە پۆیراز کوڕم. کاك ڤاسیلیان لەبیر کردووە. نەکا بەتۆم نەگوتبێت کە پێیبلێیت بۆ نانخواردن بهێتە ئێرە؟"

"لەبیرم چوو قوربان، ماڵیان نزیکە، من هەر ئێستا دەچم و پێیدەڵێم."

زەهرا گوتی: "ئەگەر رێگەم بدەن من دەچم بانگی دەکەم."

"کەواتە تۆ بچۆ کچەکەم."

کەمێك دواتر زەهرا و ڤاسیلی هاتن. ڤاسیلی بتڵێکی تۆز لەسەر نیشتووی شەرابی سووری بەدەستەوە بوو. بتڵەکەی بۆ لای زەهرا داگرت و گوتی: "ئەمەم بۆ مام ئاغا هێناوە، لە یەکێك لە کلێساکانی ئورگوپ بۆیان ناردووم. لە ئەنەدۆڵ شەرابەکانی ئورگوپ لە هەموان باشترن."

شەرابەکەی لە ناوەڕاستی مێزەکە دانا. زەهرا بە پارچەیەك بتڵەکەی پاك کردەوە. ڤاسیلی نەیتوانی بە زەهرا بڵێت نابێت تۆزی سەر بتڵی شەراب پاك بکرێتەوە. خواردنەکان هاتن، لەنێو بێدەنگیدا نانیان خوارد. لە ئەنەدۆڵدا واباوە کە نان دەخۆن قسە ناکەن. بتەوێت یان نە موسا ئاغاش ئەو نەریتەی بەجێدەگەیاند، بەڵام هەموو جارێکیش نا. ئەمڕۆ کاتی نانخواردن متەقی لەبەر نەهات. هەر لەگەڵ ئەوەی نانیان خوارد زەهرا بە خاولیەکەوە چووە دەستشۆرگەکە و بە دواشیدا باوکی چوو. کچەکە سابوونی لەنێو سابووندانەکە هەڵگرت و دایە باوکی، بە مەسینە ئاوی لە دەستەکانی باوکی کرد، موسا ئاغا کە لەسەر چینچکان بوو، دوای ئەوەی کە دەستەکانی بە چاکی شۆرین و ناودەمیشی شووشت و هەستا. کچەکە مەسینەی لەوێ دانا و رۆیشت، خاولیەکی دیکەی هەڵگرت و هێنای، ئاوی لە دەستەکانی پۆیرازیش کە لەسەر چینچکان دانیشتبوو کرد، پۆیراز بەترسەوە سەیری چەپ و راستی خۆی کردو بە دەنگێك کە دەبیستراو نەدەبیسترا گوتی: "بەیانی زوو لە ئاشەکە..." ئاوڕی دایەوەو سەیری دواوەی کرد، موسا ئاغا بە یۆنانی قسەی لەگەڵ ڤاسیلیدا دەکرد، ئەو قسانەی بە زهرای گوتبوو نەیبیستبوون. دڵنیا بوو، بە روخسارێکی بە بزەوە چوو لەسەر جێگای خۆی دانیشت.

"باش گوێ بدە قسەکانم کاکە پۆیراز کوڕم. تۆ تا گەیشتوویتە ئەم تەمەنەت کێشە و دەردەسەری زۆرت بەسەرهاتوون و تێتپەڕاندوون. ئێوە لەگەڵ حەسەنی راکردوو لە یەك بەرە، لە چیاکانی ئەللاهوئەکبەر لەنێو ئەوانە نەبوون کە بوونە خۆراکی ئەسپێیان؟"

"لەنێو ئەوان بووین."

"هەروا بێتەوە یەکێك لەو حەوت هەشت کەسانە بوویت کە دەرباز بوون."

"کەسانێکی زۆر بوون قوربان."

"ئاخر بە منیان گوتوە لە سوپایەکی گەورە تەنها چەند کەسێك بە زیندوویی گەڕانەوە."

"دروستە قوربان."

"واتە مەبەستم ئەوەیە کە ناخۆشی و بەڵای زۆرت بەسەرهاتوون."

"هەزار بەڵا. ئێمە خۆ و شانیسی خۆمان رزگارمان بوو."

"کەواتە بەهای ژیان دەزانیت. رێزی یەکدی بزانن. لەم دنیایەدا ڤاسیلیم لە هەموان خۆشتر دەوێت، چونکە تۆ وەکو من مەرگت قبوڵ کردو خاکەکەت بەجێنەهێشت. کاکە پۆیرازی کوڕیشمان چیاکانی توورۆسی بەجێهێشتن، چیاکانی توورۆس واتە هەموو تورکیا، توورۆس هەموو چیاکانی تورکیایە. بەڵام ئەو هەر لەسەر خاکی خۆیەتی."

"عەرزی جەنابتانم کرد قوربان، دێیەکەی من ون بوو، نەما."

"دەمەوێت پێتانبڵێم کە زێدی مرۆڤ لە نیشتمان و قەوم و قیلە و خزم و برا و خوشکانیشی بەنرخترە. رۆڵە پۆیراز، بەخیلی بە دۆستایەتی تۆ و ڤاسیلی دەبەم. من لەوەی کە بیرم کردەوە دۆستێکم نیە خۆمم خواردەوە. سوپاس، هەزار جار سوپاس کە تێڕوانینەکەم راست دەرنەچوو. رێك لەو کاتەی لە دڵی خۆمدا دەمگوت هەموو دۆستەکانم، دۆستە جەنەڕاڵەکەم منی لەبیر بردۆتەوە و لەم دنیایەدا تاك و تەنیا ماومەتەوەو تاڵاوی تەنیایی وەکو شمشێر رۆدەچووە دڵمەوە و لەم دەردو ئازارە بە سوێیە بترازێت هیچم بۆ نەمابووەوە لەلایەن دۆستە جەنەڕاڵەکەم نامەیەکم پێگەیشت."

نامەکەی بۆ لای ڤاسیلی درێژ کرد:

"بیگرە ڤاسیلی، بە تورکی بیخوێنەوە کە پۆیرازی کوڕیشم تێیبگات. دەبێت ئەمە بزانین کە لەم دنیایەدا جگە لەدۆست و برادەر شتێکی دیکە نیە، ئێستا ئیدی لەم دنیایەدا تەنیا نیم و دنیا ئیدی چۆڵ و بەتاڵ نیە. بیخوێنەوە ڤاسیلی."

ڤاسیلی کە لەحوجرەی راهیبەکانی دوورگەی هیبەلی دەرسی خوێندبوو، بە قسەی خۆی بێهۆ و لە هەوەنتە لەوێ دەرکرابوو، بە جوانی نامەکەی وەرگێڕایە سەر زمانی تورکی و ئەشك لە چاوەکانی موسا ئاغا بەسەر گۆناکانیدا غلۆربوونەوە. کە خوێندنەوەی نامەکە تەواو بوو، موسا ئاغا ئاهێکی قووڵی هەڵکێشایەوە.

"ببینە جەنەڕاڵ لە نامەکەدا چیدەڵێت، دەڵێت ناکرێت تۆ پشتگوێ بخەین. لەبەر ئەوەی لە جەنگی ئەنەدۆڵدا شکستی خواردبوو زیندانیان کردبوو، لەکاتێکدا کە ئەو، ئەو دۆستەی من، کاتێك کرابووە فەرماندەی سوپا کە سەربازەکان پاشەکشەیان کردبوو و شکستیان خواردبوو. ئەو لە شکستی سوپاکە هیچ تەقسیرێکی نەبوو. بەزوویی لە زیندان ئازاد دەبێت، هەروەك لە

نامەکەیدا نووسیوویە، دەکرێتەوە فەرماندە و هەر لەگەڵ ئەوەی کرایەوە فەرماندە بانگی من دەکاتەوە. بەڵێ وادەبێت، چونکە دۆستەکەم هەر تەنها جەنەڕاڵ نیە، گلێنەی چاوی یۆنانە."

نامەکەی لە دەستی ڤاسیلی وەرگرت، خستیەوە گیرفانی، بە ڤاسیلی گوت: "ڤاسیلی سبەینێ وەرە ماڵی ئێمە، کارم پێتە."

رووی کردە زەهرا و پرسی:

"کچم قاوەت دروست کردووە؟"

"دروستمان کرد و خواردتانەوە بابە."

"جارێکی دیکەش دروستی بکەنەوە."

موسا ئاغا تا مۆخی ئێسقانەکانی نوقمی نێو شادمانی بوو.

"من لە بەهەشتی ئەم دنیایەم، ئێستا ئەو، ئەو کەسی کە چاو و رووناکیی ولاّتێکە لە دۆزەخی زیندان دایە. ئەو منی بە نووسینی نامەیەك خستە نێو بەهەشتەوە، خۆیشی لە دۆزەخی زیندان دایە. منداڵینە ئەمە چ جۆرە دەورو زەمان و چ جۆرە دنیایەکە؟"

میوانەکان زووتر لە کاتی ئاسایی هەستان و رۆیشتن. موسا ئاغا یەکسەر دوای ئەوان چووە نێو جێگاو راکشا، نوێنەکەی بۆنی پاکی و خاوێنی لێدەهات. تا سەوادی بەیانی دا لە خۆشیان خەوی لێنەکەوت، بەر لەوەی تیشکی خۆر لە دوورگە بدات لە نێوجێ هاتەدەر، ماوەیەك لە لێوار دەریا پیاسەی کرد، کە خۆر لەو ناوەیدا لەنێو باخی هەناران بوو. رەنگی پەمەیی باخەکە لە چەند جێگاوە لە دەریای دەدا. رەنگی هەنارە پەمەییە درشتەکان لەگەڵ شەپۆلەکانی دەریا بەملاو ئەولادا دەڕۆیشتن. چووەوە لێوار، لەسەر بەردێك دانیشت. شەپۆلی دەریا بەسەر لمی لێواردا بەردەوام تا نوکی پێیەکانی دەهات و دەکشایەوە. ماوەیەك دواتر چووەوە ماڵ. ڤاسیلی ئامادەو چاوەڕێی ئەو بوو. کچەکان هەر زوو بەرچاییان ئامادەکرد. مەلەك خانم ئەمرۆش شیری بزنی بۆ ناردبوون. موسا ئاغا شیری خواردەوەو ڤاسیلیش چاو پەنیری رەواندان، کە موسا ئاغا زۆر حەزی لێدەکرد لەسەر سفرە داندرابوو. پۆیرازیش هەنگوینی سپی چیای قازداغی هێنابوو. بەرچاییەکی خۆشیان خوارد. چوونە سەر کانی، لەسەر نیوتەختەکان بەرامبەر یەکدی دانیشتن. موسا ئاغا یەکبێن پرسیاری لە ڤاسیلی دەکرد، تا ئەودەمەی دکتۆر خەلیل گەیشتن.

"فەرموو کاك دکتۆر خەلیل رەفعەت، منیش دەمویست لەگەڵ کاك ڤاسیلی بێمە لای ئێوە، کاك دکتۆر سەلمان سامی لەکوێیە؟"

"ئەو زۆر زوو دەچێتە نۆڕینگە. فەرموون بابچین. کاك دکتۆر سەلمان سامی بتانبینێت خۆشحاڵ دەبێت. دەمێکی چاوەڕێی هاتنی ئێوەین. فەرموون."

دکتۆر سەلمان سامی هەر ئەوانی بینی چووە پێشوازیان و گوتی:

"ئەوە ئێوە لە کوێ بوون، ترساین لە ئەستەنبۆڵ بمێننەوە قوربان فەرموون دانیشن. ئەو ژنانەی لە ماڵی ئێمە کاردەکەن چاو قاوەکەیان زۆر خۆشە. کاتێك پێیاندەڵێین چاو قاوەکەتان خۆشە دەڵێن هەموو شتێك بە داری وشکی زەیتوون ئاوا خۆش دەبێت."

"هەر بژیت دکتۆر، ئێمە هەر کەمێك بەر لە ئێستا بەرچاییمان کردو هاتینە لای جەنابت. من شەیدای دۆستایەتی ئێوە ئەو دوو کەسەم قوربان. لە دنیادا شتێکی بەهادار هەیە، شتێك کە لە ژیان خۆیشی بە بەهاترە، ئەویش دۆستایەتیە. جەنەڕاڵەکەشم کە لە یۆنانە، لەبارەی ئێوەوە بۆم نووسیبوو، نامەیەکی بۆ ناردووم، شەو هات و رابرد لە خۆشیان خەو نەچووە چاوم."

"ئێوەی بۆ یۆنان بانگهێشت کردووە؟"

موسا ئاغا بەرلەوەی وەڵامی دکتۆر بداتەوە، پاکەتی نامەکەی لە گیرفانی دەرهێنا، نامەکەی لە پاکەتەکە دەرهێنا، بۆ لای ڤاسیلی درێژ کرد و گوتی:

"زەحمەت نەبێت نامەکە بە تورکی بۆ بەڕێزان بخوێنەوە."

رووی کردە دکتۆرەکان، گوتی:

"ڤاسیلی لە ئەستەنبۆڵ لە مەکتەبی راهیبەکاندا دەرسی خوێندووە، ئێستا دەبینن کە چۆن نامەکە کە بە یۆنانی نووسراوە وەك ئەوەی بە تورکی نووسرابێت بۆتان دەخوێنێتەوە."

ڤاسیلی دەستی بە خوێندنەوەی نامە درێژەکەی جەنەڕاڵ کرد. نامەکەی وادەخوێندەوە کە وەك تورکی نووسرابێت. ڤاسیلی خۆیشی دەنگەکەی کارتێکەرانە بوو. موسا ئاغا لە دێڕەکانی کۆتایی نامەکە دیسان نەیتوانی بەرگە بگرێت و دوو تنۆك فرمێسك لە چاوەکانی بەسەر گۆناکانیدا هاتنە خوار و تا گەردەنی هاتن. کە نامەکە تەواو بوو رەوش و حاڵ و باری لەوەدانەبوو بتوانێت قسە بکات.

"هەقتە بەڕێزم، لەم دنیایەدا مرۆڤ هیچشتێکی نەبێت تەنێ دۆستێکی وای هەبێت. دۆستێکی ئاوا بەرامبەرە لەگەڵ هەموو تەمەنی مرۆڤ."

"ئەو، رووناکی و چاوی گەشتی یۆنانە."

"کەواتە دۆستەکەتان لە جەنەڕاڵەکانی جەنگی ئەنەدۆڵ، واتە هی جەنگی سەربەخۆییە."

"ئەو هێشتا جەنگی ئەنەدۆڵ هەڵنەگیرسابوو دژی جەنگەکە بوو. کاتێك سوپای یۆنان لە چەند نەبەردیەکدا شکستی خوارد ئەویان نارده بەرەکانی جەنگ. ئەویش بەو شێوەیە، بە بێدەستی خۆی، بەگەڵ جەنەڕاڵە شکستخواردووەکان کەوت."

خوا حافیزیان لە دکتۆرەکان کردو رۆیشتن. شوکری ئەفەندی بە سێ بەلەمەوە هاتبووە ئەسکەلە و کرێکارەکان چووبوونە نێو باخی هەناران. شوکری ئەفەندیش لەژێر دارچنارەکان دانیشتبوو. مەلەك خانم، شێخموس ئاغا، شەریفە خاتوون، هوسمەن، ئەفە خەنجەرلی، قەدریی بەلەموان، سەبیحە و منداڵەکانی، خزمەتکارە ژنەکانی ماڵی دکتۆرەکان کوڕە دوازدە سێزدە ساڵانەکانیان دانیشتبوون و گوێیان لە قسەکانی شوکری ئەفەندی راگرتبوو. هەر کە بینیان وا موسا ئاغا و ڤاسیلی خەریکن دێن هەموان بە کپی لەبەریان هەستان.

"تکاتان لێدەکەم، فەرموون دانیشن." خێرا خێرا چوو لە تەك قەدری بەلەموان دانیشت. جێگایەك لە نیوتەختێکی ئەولاتری کانیەکە بەتاڵ بوو، بەدەستی ئەو شوێنە بەتاڵەی بە ڤاسیلی نیشاندا، ڤاسیلی لەوێ دانیشت. پاشان ئەوانی دیکەش هەر کەسەو لە جێگای خۆیان دانیشتن... دوای چاك و چۆنی ماوەیەك بێدەنگ بوون. هیچکامیان وشەیەکی بۆ کردنەوەی باسێك نەدەدۆزیەوە. لەولاتر حەسەنی راکردوو خەریکبوو دەهات. کابرایەکی بە قسە بوو. لە جێگایەکی بەتاڵی نیوتەختەکە دانیشت. موسا ئاغا چاوی تێبڕی، ئەویش نەیتوانی هیچ قسەیەك بکات. ئەمجارە بە زەردەخەنەوە سەیرێکی شوکری ئەفەندی کرد، ئەویش بە زەردەخەنەیەك وەڵامی موسا ئاغای دایەوە.

"باشە، مام ئاغا ئینشاڵلا کەی دەڕۆیتەوە کرێت؟"

"رۆیشتنی چی کاك شوکری، چیبوو کە ئەم پرسیارەت کرد؟"

"ئاخر نامەیەکتان لە پۆستخانە بۆ هاتبوو."

"(راستە، لەو نامەیەی کە لەلایەن برادەرە جەنەڕاڵەکەمەوە بۆم هات زۆر خۆشحاڵ بووم، گوتبووم ئەو برادەرەم کە لە براش لە پێشتر بوو لەبیری کردووم، منی لێرە بە تەنیا جێهێڵاوە، لەکاتێکدا کە ئەو هیچکات منی بە تەنیا جێنەهێڵاوە. ئێستا کە زانیوتانە داوا لە ڤاسیلی دەکەم با نامەکەتان بە تورکی بۆ بخوێنێتەوە، ئەو نامەیەی کە منی لەگەڵ ژیان ئاشتکردەوەو تێیگەیاندم کە لەم دنیایەدا تاك و تەنیا نیم."

نامەکەی لە گیرفانی دەرهێناو دایە ڤاسیلی.

ڤاسیلی پاکەتەکەی لێوەرگرت، نامەکەی لەنێو پاکەتەکە دەرهێنا، بە کۆکەیەك قورگی پاککردەوە، دەستی بە خوێندنەوە کرد. دەنگی زۆر سەنجڕاکێش بوو. دەتگوت دەقێکی پیرۆز دەخوێنێتەوە. ئامادەبوان لەنێو بێدەنگیدا گوێیان لێگرتبوو. هەر جارێك کە نامەکە دەخوێندرایەوە فرمێسك چاوەکانی موسا ئاغایان دەگرت. هەر لەگەڵ تەواوبوونی خوێندنەوەی نامەکە شوکری ئەفەندی بە تووڕەبییەوە گوتی:

"ئەو بۆچی هاتە ئەنەدۆڵ، هات لەنێومان ببات، قوون سۆر، ببوورن، مەگەر لێیپاڕابووینەوەو نامەمان بۆ ناردبوو کە بهێتە ولاتەکەمان."

"تکات لێدەکەم کاك شوکری، هەموو یۆنان دەزانێت کە ئەو دۆستەی من دژی هاتنی سوپای یۆنان بوو بۆ ئەنەدۆڵ. ئەوددەمەی لەشکری یۆنان خەریك بوو دەشکا، ئەوکات، ئەو دۆستەی منیان رەوانەی ئەنەدۆڵ کرد، دواییش لەگەڵ جەنەڕاڵە دۆڕاوەکان ئاخنیانە زیندان. دەمەوێت پێتانبڵێم دۆستەکەی من بەمزوانە لە زیندان ئازاد دەکرێت و دایدەنێنە پۆستە هەرە بالاکان، تورکیا و یۆنان ئاشت دەبنەوە، دەبنە برای یەك و رێزی یەکدی دەگرن. ئەمەش لەسەر دەستی دۆستە جەنەڕاڵەکەی من دێتەدی، چونکە ئەو کەسێکی ئاشتیخوازە و رووناکی و چاوی یۆنانە. دەبێتە بیلبیلەی چاوان. منیش بەمزوانە دەگەڕێمەوەو دەچمەوە کرێت. کاك شوکری، براکەم، هەر لەبەر گەڕانەوەم ناتوانم ئاوا خۆشحاڵ بم، باڵ بگرم، لەم دنیایەدا دۆستێك کە خۆیشی گرفتاری بەلاو دەردەسەری خۆیەتی، لە پێناو مەرگ و ژیان دەجەنگێت، تەنانەت لە زیندانیشدا برادەرەکانی خۆی لەبیر ناکات، دۆستێك، هاوڕێیەك ئاوا ژیان بە مرۆڤ دەبەخشێت و هێزی ژیانت پێدەدات. دوای ئەم نامەیە ئیدی هیچشتێك ناتوانێت چۆکم پێدابدات. لە هەر جێگایەك بم، لە هەر کوێیەك بمرم حەسرەت ناخۆم. لێم حاڵی بوویت کاك شوکری، براکەی خۆم."

"ببوورە کاك موسا کازم ئاغا، دۆستە گیانی بە گیانیەکەتان هەر دەبوا ئاوا بوایە."

"سوپاست دەکەم کاك شوکری هێژا، رێزت هەیە. ئەمڕۆکەش هاتوویت بۆ کۆکردنەوەی هەنار و بڕینەوەی غەلێفەی مێشەهەنگەکان، وانیە؟"

"ئەم دوورگەیە، پێشتریش چەند جارێك گوتوومە، بەهۆی خاکەکەیەتی یان ئاوەکەیە یان هەرچیەکی دیکە، هەنجیر و ترێ و خۆخەکانی بێوێنەن و هاوشێوەیەیان لە هیچ جێیەکی دیکە پەیدا نابێت. هەنگوینەکەشی هەروایە. بۆ غەلێفەکان پێنج هەنگەوانی شارەزام ناردن.

وەستاکان یەك بە یەکی غەلێفەکانیان سەیر کرد، هاتنەوەو پێیانگوتم هەنگوینی وا لە هیچ جێگایەك دەست ناکەوێت. هەر لەگەڵ کردنەوەی زارکی غەلێفەکان بۆنی گوڵ بە رووی مرۆڤدا دەپژێت، بە چەشنێك کە مرۆڤ کاس دەبێت، گوتیان ئەم هەنگوینە دەرمانی هەموو دەردانە ئەوەی ئەوان گوتیان راست دەرچوو."

پزیشکی ئاژەڵان کەمێك پێشتر ئەوەدەمەی کە نامەکە دەخوێندرایەوە، بە ئارامی هاتبوو لەلای خوارەوە دانیشتبوو، هەر کە شوکری ئەفەندی قسەکانی تەواو کرد، گوتی:

"شوکری ئەفەندی، دەزانیت، ئێمە دوو کەسمان ئەو غەلێفانەمان لە داراییەوە کڕیون. بۆیە، ئێمە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە تۆ ناردبوونت غەلێفەکانمان کردنەوە. هەر بۆنی هەنگوینیان بەر لووت کەوت مات و سەرسام بوون. ئێمەش کاتی خۆی لە وان غەلێفەمان هەبوون، لەنێو هەنگاندا گەورە بووم. منیش هەنگوینی وا و بۆن و بەرامەی وام نەبینیوەو نەبیستوە. وەك دەڵێن لە دوورگەکانی دیکەش گوڵ و گوڵیلکی زۆر هەن کە نەك تەنها بەشی ئەم ژمارە غەلێفەیە بەڵکو بەشی هەزار بەرامبەر ئەمانەش دەکەن. هەنگەکان دەتوانن دە بەرامبەر ئەم هەنگوینە خۆشبۆیە لەو بەرەوە بێننەوە ئێرە. خەڵکی لەم دوورگانە هەروا بێکاروبار لێیدانیشتوون."

کرێکارەکان لە ماوەی سێ رۆژدا هەنارەکانیان لێکردنەوەو خستنیانە نێو سەبەتەکان، بردیاننە ئەسکەلەو بەشێکیان دانانە نێو بەلەم و رەوانەی شارۆچکەیان کردن. بەلەمە پڕ لە سەبەتە هەنارەکان سێ جار رەوانەی شارۆچکە کران و گەڕانەوە. دەستیان لە بەشی لای سەرەوەی باخچەی هەناران نەدا. لەوێ ئەوەندە هەناری دەرشت و پەمەیی بەدرەختەکانەوە مابوون کە وەلی نیشانچی لەبەر خۆیەوە گوتی مرۆڤ چۆن دەتوانێت هەناری وا جوان لێبکاتەوە، مرۆڤ دڵی ناهێنێت لێیانبکاتەوە چ بگات بەوەی بیەوێت بیانخوات. خەڵکی دوورگە بەر لەوەی سەبەتەی پڕ لە هەناری سەر ئەسکەلە رەوانەی شارۆچکە بکرێن خۆیان گەیاندە نێو باخچەکە. زەهراو نەسیبەش بۆ چنینی هەناران هاتبوون، مەلەك خانم یارمەتی دان، سێ سەبەتەی گەورەیان پڕ کردن لە هەنار. قەدریی بەلەموان دوو سەبەتەی گەورەی پڕ کردبوون. نیشانچی لەگەڵ سوڵتانی ژنی هاتبوونە باخچە. سوڵتان وەستای کۆکردنەوەی گوێزی دارگوێزی گەورە گەورە بوو. هەنارەکانی وا بەخێرایی بێگوێدانە دڕك و داڵەکان کۆدەکردنەوە کە هەر کەس بیبینیبوای سەیری پێدەهات. نەوەکانیان لە سێ لای جیادا دوو خورجینیان

پێکەوە پڕکردن لە هەنار، یەکڕاست دەیانبردنەوە ماڵێ و پاشان دەگەڕانەوەو لەو میانەدا، ئەو هەنارانەی کە سوڵتان و نیشانچی کۆیان کردبوونەوە، دەیانخستنە نێو خورجینەکان و دەیانبردنەوە ماڵێ. نیشانچی لەپڕ بەخۆی هاتەوەو سەیری کرد ئەگەر ئاوا بڕوات ماڵ پڕ دەبێت لە هەنار و گوتی:

"منداڵینە ئەمەندە بۆ ماڵی خۆمان بەسە. لەمە بە دواوە بیانبەن بۆ ماڵی مامە پۆیرازتان، تا ئەوەدەمەی خۆی پێتاندەڵێت بەسە. ئینجا بیانبەن بۆ ماڵی شەریفە خاتوونی وەستای چنینی جاجم. لێرە لەوانە زیاتر کەسمان نەبینیوە، دەی شێرەکانی خۆم." تا شەو داهات یەك هەناریش چیە بە درەختەکانەوە نەما، ئەوانەی کە هەناریان زۆر کۆکردبوونەوە دایانە ئەوانەی کەمیان کۆکردبوونەوەو بەو شێوەیە هاوسەنگی لە نێوان هەموان دروست بوو. کاتێکیش غەڵێفەکان بڕانەوەو کاری هەنگەکان تەواو بوو دیسان بەپێی پێویست هەنگوینی شانە سپی بۆ هەر ماڵێك داندرا.

شادمانیەك کە لە ناخی موسا ئاغا دەجۆشا، هەموو دوورگەی گرتبووە خۆ. باڵندەکان بەشێوەیەکی دیکە تێیانچریواندبوو، دەریا بۆنێکی دیکەی هەبوو و با بەجۆرێکی دیکە دەشنا.

زەهرا بێئەوەی خۆی لە کەس دوور بگرێت و خۆی بشارێتەوە، نەك بە ڕێگای زەیتوونستانەکە بەڵکو بە ڕێگایەکی ئاشکرادا بەرەو ئاشەکە ڕۆیشت، بە لێوانی بەبزەوە دەرگای ئاشەکەی پاڵدا و کردیەوە. پۆیراز لەسەر بەرداشەکە دانیشتبوو، یەکسەر لەبەری هەستا، کاتێك ویستی لەسەر بەرداشەکە دابنیشێت دەستی پۆیرازی گرت، بۆ لای خۆی ڕایکێشاو لە تەنیشتیەوە دانیشت. بێئەوەی بتوانن سەیری یەکدی بکەن ماوەیەك ئاوا بێدەنگ مانەوە. دەستی پۆیراز هێشتا لەنێو دەستی زەهرا بوو. دەستەکەی هێواش هێواش وەك ئاگر گەرم دادەهات و دایسا. زەهرا لە دڵی خۆیدا دەیگوت قسەی خۆم دەکەم، هەرچی دەبێت با ببێت. تەنانەت ئەگەر بزانم سەیریشم ناکات، تەنانەت ئەگەر بزانم وا دەمرم هەر قسەکەم دەکەم. هەر بەڵایەکم بەسەر بێت دیسان دەیڵێم. نامەیەك چۆن باوکمی گۆڕی. من هەرگیز باوکی خۆمم وا نەبینیبوو. کاتێك مرۆڤ شادیەکی ئاوا رووی تێدەکات گیاندار و بێگیان لەو شادیەدا بەشدار دەبن، دەریا بە شادی دەکەوێتە شەپۆلان. هەموو ئەو کەسانەی کە لە ڕۆژی یەکەمەوە هاتوونەتە ئەم دوورگەیە پێنەکەنیوون ئێستا گەشاونەتەوەو گشتیان شادمانن.

تەنانەت روخساری ئەفە خەنجەرلیش، ئەو مرۆڤە منجرەش خەندانە، تەنانەت پۆیراز کە ماوەیەك شادبوو، لە رۆژانی دواییدا، تەنها ئەوە لەنێو خەڵکی دوورگە پێکەنینی لەبیر کردووە. کاتێك بیری لەم شتانە دەکردەوە دەستی پۆیرازی کە لە یەکەم ساتەوە لە نێو دەستی بوو بەردا.

"پۆیراز موسا، من و تۆ لەم کارەدا گوناهێکمان نیە. تەنها تۆ کێشەیەکت هەیە کە بە کەست نەگوتوە، ئەمە شتێکە کە دەبێتە مایەی ئەوەی شەرم لە خۆت بکەیت. ئایا تۆ کێشەیەکت هەیە کە تەنانەت ناتوانێت بە خوشتی بڵێیت؟ لە شەڕدا کەسانێکی زۆرت کوشتوون؟ سەری زۆر منداڵت بڕیوە؟ دەستدرێژیت کردۆتە سەر زۆر لە کچان و ژنان و کوشتوونت؟ کە دێیت لە باوەشم بنێیت لێمدوور دەکەویەوە، شەرمم لێدەکەیت؟ دەترسیت؟ دەبێت ئەمە بەمن بڵێیت. دەستدرێژیت کردۆتە سەر سەد کچ و پاشانیش هەر سەد کچەکەت لەتلەت کردوون و کوشتوونت، لەبەر ئەوەیە کە شەرم دەکەیت؟! تۆ منی، منیش تۆم، پێمبڵێ تاکو ئەگەر شەرم دەکەیت پێکەوە شەرم بکەین. ئەگەر ئەو دەردەی کە هەتە لەبەرگەگرتن ناهێت با پێکەوە شانی بدەینەبەر. ئەگەر بەرگەگرتنی لە توانای هەردووکمان بەدەرە با پێکەوە بمرین. مخابنە بۆ تۆ، مخابنە بۆ منیش کە ئەو دەردە بە تەنیا بەرگە بگرین. زەهرا بە قوربانت، پێمبڵێ چ دەردێکت هەیە پۆیراز. سەیر بکە عەزیزم، کاتێك دایکم مرد، کە بە بەرچاوی باوکمەوە تەرمەکەیان فڕێدایە نێو دەریا، وامدەزانی باوکم بەرگەی ئەمە ناگرێت و ناژێت. بەو کارەساتەی لەدەستدانی دایکم نیوە رۆح بووبوو، بەڵام خۆی راگرت و مایەوە. پاشان چاوەڕێی نامەی دۆستەکانی کرد. کاتێك هیچ نامەیەکی بۆ نەهات دەردو ئازارەکەی ئەمجارەی لەوەی دایکیشم بەلاوە سەختتر بوو. شەو و رۆژ بیرم دەکردەوە کە ئەم دەردە باوکم لە پەلوپۆ دەخات و دەیکوژێت. تۆش دەزانیت کە ئەو دەستی بۆ هەر لکە درەختێکەوە برد لەگەڵ دەستی هات. ئیدی توانای ژیانی نەمابوو کە نامەی دۆستە زیندانیەکەی هات. باوکم باسی ئەو نامەیەی بە هەموو خەڵکی دوورگە راگەیاند. نوقمی نێو شادی بوو. ئێستا تا مۆخی ئێسقانەکانی، تا قووڵایی دڵی، نوقمی شادمانیە. شادمانی ئەو دوورگەشی گرتۆتەخۆ. هەموان لە خۆشحاڵیان کاس بوونە. هەموان وەك ئەوەی کوتکی شادیان بەرکەوتبێت. بەهەرحاڵ، ئادەمیزاد ئەمەیە، بەرزی و نزمی هەیە، رێك ئەودەمەی خەریکە دەمرێت پشتی راست دەکاتەوە، هەڵدەستێتە سەرپێ، وەکو باوکم. دەردی خۆتم پێبڵێ عەزیزم، گیانەکەم. لەم

دنیایەدا کە مرۆڤەکان ستەم لە یەکدی دەکەن، ئەوەی کە ئێمە یەکدیمان دۆزیوەتەوەو یەکدیمان خۆشدەوێت شتێك نیە وا بە ئاسانی بەدەست بێت. لەوەی کە لە جەنگدا بەشداریت کردوە شەرم دەکەیت، ئەمە گوناهی تۆ نیە، گوناهی ئەوانەیە کە ئێوەیان نارده جەنگەوە. با ئەوان شەرم لە خۆیان بکەن و تەریق ببنەوە."

زەهرا هەموو گیانی بووبووە ئارەقە و دەلەرزی. دەستی پۆیرازی گرت، دەستەکە هێشتا دەسووتا. لە پڕێکدا باوەشی پێداکرد و بە هەموو هێزیەوە گوشیە نێو ئامێزیەوە، دەمی بۆ بردو ماچی کرد، ماچێکی ماوەدرێژ. هاتەوە سەرخۆی و بە دەنگێکی ئارام گوتی:

"بڵێ گیانەکەم، هەموو شتێکم پێبڵێ با پێکەوە ئەو بارە هەڵبگرین."

پۆیراز لەکاتێکدا بیری لەوە دەکردەوە چۆن سەری قسەی خۆی بکاتەوە، چاوی بڕیبووە دیواری رووبەڕوویان و ماوەیەك دواتر بە ئارامی دەستی بە قسە کرد. لەکاتی قسەکردندا ماوە ماوە بێدەنگ دەبوو، بیری دەکردەوە، پاشان دیسان دەستی بە قسان دەکردەوە. کە قسەکانی تەواو بوون لە تەوقی سەری تا خوارێ لەبەر ئارەقە هەڵاتبوو. زەهرا هێندەی ئەو ئارەقەی کردبوو.

"تۆ هیچ ژن و پیاوێکی ئێزدیت نەکوشت، وانیە؟"

"نەمکوشتن."

"دەستدرێژیت بۆ سەر هیچ ژن و کچێك..؟"

"نەمکرد."

"باشە، ئەدی چدەڵێیت؟"

"من بەشداریی هیچشتێکم نەکرد، لە جێی خۆم وشك هەڵاتبووم."

"نەتدەتوانی رێگەیان لێبگریت؟"

"نەمدەتوانی. ئەوان ژمارەیان زۆر بوو، ئێمە تەنها چەند کەسێك بووین. ئەمە بوو کە نەمتوانیوە لەبیری بکەم و خستوومیەتیە ئەو حاڵ و بارە نالەبارە."

هەردووکیان بە هێواشی دەئاخاوتن تاکو کەس گوێی لە قسەکانیان نەبێت.

چاوەکانی زەهرا کە لەپڕ فرمێسکیان تێزابوو، بریسکانەوە:

"هەمان ئەو قسانەی تۆ مانگێك پێش ئێستا شەریفە خاتوون بۆیکردم، خەریکی جاجم چنین بووین، لەپڕ دەستی لە چنین هەڵگرت و گوتی وەرن کچینە، روخساری تەواو شێوا بوو.

گوتی ئەم چاوانەم چیان نەبینیوە، دەبێت بۆتان باس بکەم کە ئەم چاوانەی من چیان بینیوە. ئەم چاوانە چیان بینیوەو من و شێخمووس لەو دیارە، لە دیاربەکر رامانکرد. رامانننەکرد، نەماندەویست رابکەین وەلـێ رامانکرد. ئێوە بڵێن ئەم چاوانە چیان نەبینی. سەرەتاکانی جەنگ بوو، هەرکێ بچووبوایەتە جەنگ ئیدی نەدەگەڕایەوە. هەموان یەکدیان دەکوشت. لە گەڕەکەکەی ئێمەشدا یەکدیان کەلوکۆم دەکرد. ئەم چاوانەم چیان نەبینی! برا بووبووە دوژمنی براو دۆست دوژمنی دۆست. من کچێکی گەورە بووم، بەڵام هێشتا هاوسەرگیریم نەکردبوو. من و شێخمووس تەنها سەیری یەکدیمان دەکرد. ئەم چاوە کوێر بووەم چی نەبینی! لەگەڕەکەکان ژنان و کچان و پیاوان و پیرو لاوان و مێرد منداڵانیان دانە پێش خۆیان و بردیانن و ئێمەش هێواشۆکە بە دوایاندا چووین. چوونە لێواری دیجلە. ئێمە لەنێو دەوەنەکان خۆمان شاردەوە، لەنێو ژنو کچەکاندا دراوسێی ئێمەش هەبوون، دۆستانێك کە وەکو گیانی خۆمان خۆشماندەویستن. کە گەیشتنە لێواری دیجلە، پیاوان و مێرد منداڵەکانیان لە ژنەکان جیاکردنەوە، ئەوانیان بردە لای سەرەوە. دەستی هەموانیان لە پشتەوە بەستبوون، تەنانەت دەستی منداڵەکانیش. شەریفە خاتوون گوتی هەموویانم نەدەناسین، کەسانێکی وەکو خۆمان بوون، وەکو ئێمە قسەیان دەکرد، دۆستی گیانی بە گیانی ئێمە بوون، زۆربەیان هی گەڕەکی خۆمان بوون."

"قەل و داڵ و هەڵۆکان هاتن و مردووەکانی سەر لم و چەوی لێوارەکانیان هەڵگرتن بردیانن؟"

"شەریفە خاتوون هیچی نەگوت. تەنها یەکرێز دووبارەی دەکردەوەو دەیگوت ئەم چاوانە چیان کە نەبینی! جارێك پێموایە گوتی ئەوان کافر بوون."

"شەریفە خاتوون ئەوەشی نەگوت، گوتی ئێمە لەنێو دەوەنەکان بەهێواشی و لەرزە لەرز و ترساو رامانکرد. پاشان هەموومان هاتینەوە ماڵێ گریاین. پازدە دانە کچ بووین. دراوسێکانیش هاتنە ماڵی ئێمە و گریان. پاشان سەروبەندی عەسر بوو، پیاوەکان بەسەرو گوێلاکی خوێناویانەوە هاتنەوە ماڵێ. ئەوانیش لەگەڵ ئێمەدا گریان. پێیانگوتین ئێوە لەنێو دەوەنەکان چیتاندەکرد. گوتیان ئەگەر ئەو شتانەی بینیوتانە بە بەکرێگیراوێك بێژن ئێوەش دەبەن و دەتانکوژن و تەرمەکانتان هەڵدەدەنە نێو دیجلە. ئێمە دوای ئەوە زۆر گریاین. بە مانگان خەومان نەهاتە چاوان. تاکو هاتین و گەیشتینە ئێرە من ئەمەم بە هیچکەس نەگوتوە. دواتر فرمێسك وەکو تەزرە لە چاوەکانی داباریـن. پاشان گوتی من ئەو شتانەی کە بینیومن تا

ئێستا تەنانەت بە شێخمووسیشم نەگوتوون، بەڵام ئەمڕۆ دەیڵێم. با ئەویش ببیستێت کە ئەم چاوانەم چیان کە نەبینیوە!"

کاتێك لێکجیابوونەوە گوتی:

"مەترسە. بەزوویی حاڵم دێتە سەخۆی و لەم دەردو ئازارە رزگاریم دەبێت."

"پێتوایە ئەمانەی بۆ شێخمووس ئاغا گێڕابنەوە؟"

"نازانم، ئیدی جگە لە چنینی جاجم و رەنگ و تان و پۆ و گوڵ بترازێت باسی هیچشتێکی بۆ نەکردین. هەروەك شەریفە خاتوون دەیگوت دنیا پڕ لە هەزاران رەنگی جیاجیایە. قسەی زۆرم هەن بۆتیان بکەم. من لە ئەسینا لە خوێندنگەی ئینگلیزەکان دەرسم خوێندوە، نەسیبەش هەروا. شتگەلێکی پەیوەست بە پەیوەندیی ژن و پیاویان فێرکردووین، مرۆڤ چۆن دەتوانێت رێ لە منداڵبوون بگرێت یان نەگرێت."

پۆیراز بە بیستنی ئەم قسانە لەجێی خۆی وشکهەڵات، متەقی نەکرد. کچێکی وەکو زەهرا چۆن دەیتوانی قسەیەکی ئاوا بکات؟ زەهرا بە بینینی روخساری پەشۆکاوی ئەو پەی بە سەرسووڕمانەکەی بردو گوتی:

"منیش یەکەمینجار کە ئەمەم لە مامۆستا ئینگلیزیەکەمان بیست وشکهەڵاتم. هەموو شتێکی بە وردی روون دەکردەوە. لە نێوکلاسدا سی و حەوت کچی تورك و یۆنانی بووین، دوانیشمان فەرەنسی بوون. لەبەر ئەوەی نەسیبە هەموو شتێك لەو بارەیەوە لەمن فێر بووبوو، لە خوێندنگە کاتێك بۆیان باسکرد بەلایەوە ئاسایی بوو، مامۆستاکەیان لەو حاڵەتەی نەسیبە سەری سووڕمابوو و داوای لە نەسیبە کردبوو بۆی روون بکاتەوە. ئەویش بە باشی روونی کردبووەوە. مامۆستاکە خۆشحاڵ بووبوو. ژنێکی قەڵەوی جوان بوو."

پۆیراز خۆشحاڵ بوو، زاری تا بناگوێی کرابووەوە. گوتی:

"کە ئاوا!" یەکەمجار پۆیراز لە دەرگای ئاشەکە چووەدەر، زەهرا لەنێو ئاشدا مایەوە، هەروا بە پێوە وەستاو کەمێك بیریکردەوە، پاشان چووە نێو دۆڵی دارزەیتوونەکان، لەنێو درەختە پیرەکانی زەیتوونان کاتی کوشت، ویستی بچێتە سەر کانی، دڵی پاك بووبووەوە، هیچ نیگەرانی و ئازارێکی تێدا نەمابوو. بەر لەوەی هەواڵی دوورخستنەوەیان پێبگات و بهێنە ئێرە ئاوا بوو. لەسەر لێوی کانی دانیشت، روخساری لەنێو ئاوی کانی هەروەك لە ئاوێنەیەکی ساف ببیندرێت ئاوا دەبیندرا. لە دڵی خۆیدا گوتی عەباس ناوێکی چەند خۆشە. سیماو چاوەکانی

رۆشن رۆشن بوون. قسەکانی شەریفە خاتوون، پۆیرازیان لەو بارە نالەبارەی رزگار کردبوو. پوونگە وردیلەکانی دەوروبەری کانیەکە کە تا ئەژنۆ دەهاتن، گوڵیلکی شینباویان دابوون و هەوا بۆنی خەستی پوونگەی لێدەهات. زەهرا بە رێگا ئاویەکەی کە لە کانیەکەوە بەنێو بۆنی توندی پوونگەکان کە گوڵی شینباویان تا دەگەیشتەوە دەریا درێژ بووبووەوە، دەڕۆیشت. ئاوەکەش بۆنی پوونگەی دەدا. هەر کە گەیشتەوە ماڵێ خۆی گەیاندە بەر ئاوێنە. باوکی کە رۆچووبووە نێو مۆبلێك و رۆژنامەی چەند رۆژ پێشتری دەخوێندەوە تەنانەت تێبینی هاتنەوەی زەهرای هەر نەکرد. روخساری گەشتر لەوەی لەنێو ئاوی کانی بینیبووی بەدی دەکرا. چاوەکانیشی درەوشانەوە. هەر بە بیریشی دانەدەهات لە غەریبایەتی سیما و چاوەکانی ئاوا رۆشن و دڵی ئاوا ئارام بێت. باوکی سەری لەسەر ئەو رۆژنامەیە کە بە پیتی عارەبی نووسرابوو هەڵگرت، بینی وا کچەکەی بەرامبەر ئاوێنە نیو قەدیەکە وەستاوەو لە کاتێکدا سەیری خۆی دەکات چۆتە نێو خەیاڵەوەو بە بێدەنگی و هێمنیەوە بە تەماشای کچەکەیەوە دانیشت. بەخۆی گوت قەت کچەکەمم بەو شێوەیە نەبینیوە، کچەکانی کە گرنگی نامە کاریگەرەکەی دۆستەکەیان دەرك کردبوو تا ئەو رادەیە خۆشحاڵ نەبینیبوو. شادیی ناخی تەنانەت دۆستەکانی دوورگەیشی گرتبووەوە.

زەهرا کاتێك ئاوڕی دایەوە، سەیریکرد وا باوکی بە سەرسووڕمانەوە سەیری دەکات، گوتی: "باوکە!" چوو باوەشی پێداکرد. "سوپاس بۆ خوا باوکە. حاڵ و بارمان چەند باشە باوکە."

موسا کازم ئاغا گوتی: "سوپاس بۆ خوا کچم، سوپاس بۆ خوا." ئەویش باوەشی بە کچەکەیدا کرد.

پۆیراز کە لە ئاشەکە چووە دەر، یەکڕاست چووە لای شەریفە خاتوون. شەریفە خاتوون لەبەر دارتەونەکە خەریکی جاجمچنین بوو. هەر کە پۆیرازی بینی هەپکەکەی داناو هەستا و گوتی:

"بەخێرهاتی کاك پۆیراز."

"سوپاس شەریفە خاتوون، شێخمووس ئاغا لە کوێیە؟"

"نازانم، گوتی دەچمە لای هوسمەن."

"فەرموو وەرە ژوورێ."

چوونە ژوورەوە، پۆیراز هەر لەگەڵ ئەوەی چووە ژووریّ تاسا. ژوورەوە ئەوەندە جوان بوو و ئەوەندە پاك و خاوێن و رێكوپێك بوو كە رێز و شكۆمەندی شەریفە خاتوونو شێخمووس ئاغای لەبەر چاوان دوو ئەوەندە بووەوە. جاجمێكی گەورە لە ناوەڕاستی هۆڵی خانووەكە راخرابوو كە هەموو هۆڵەكەی گرتبوو. لە ناوچەكانی تووڕۆس جاجم و لبادی زۆری بینیبوون، بەڵام جاجمێكی وای كە نموونەیەك بوو لە بەهەشت بە هەموو تەمەنی خۆی نەیبینیبوو. لەسەر كورسییێكی نەرم كە شێخمووس ئاغا لە شارۆچكە كڕیبووی دانیشت، بەڵام نەیدەتوانی چاو لەسەر جاجمەكە هەڵبگرێت. شەریفە خاتوون هەر لەگەڵ دانیشتنی ئەودا لەویّ نەمابوو، پۆیراز تەنانەت تێبینی دەرچوونی ئەوی هەر نەكردبوو، وا رۆچووبووە نێو تەماشاكردنی جاجمەكە هەر ئاگای لەدەوروبەر نەمابوو. بە بۆنی خەست و خۆشی قاوە سەری بەرزكردەوە، شەریفە خاتوون بە سینیەكی زیوین و فنجانێك قاوەوە كە هەڵمی لێهەڵدەستا لەولاوە دەهاتەوە. پۆیراز كە فنجانی قاوەی لەسەر سینیەكە هەڵگرت، هێشتا نەیدەتوانی چاو لەسەر جاجمەكە هەڵبگرێت. ئاوا فنجانی قاوەی بەدەستەوە بوو.

"شەریفە خاتوون، من لە هەموو تەمەنمدا جاجمێكی وا جوانم نەبینیوە. ژنانی توركمەن و كوردی چیاكانی ئێمەش كلیم و جاجمی زۆر جوان دەچنن، وەلێ ئەم جاجمە لە باخی بەهەشتیش جوانترە. جاجمێكی وا كە لە باخی بەهەشتیش جوانترە شایستەی دوورگەیەكی ئاوا بەهەشتیە."

بێئەوەی چاوی لەسەر جاجمەكە لابدات قاوەكەی ئارام ئارام خواردەوە.

شەریفە خاتوون گوتی: "منیش لە شارەكەی خۆمان بە چاوی خۆم ئەو كۆمەڵكوژییەم بینی. زیڕەو داد و هاواری ژنان و كچان دەگەیشتە كەشكەڵانی ئاسمان، كاتێكیش خەنجەریان رۆدەچووە نێو دڵەوە دوولا دەبوونەوەو دەكەوتنە سەر لمەكان و پاشانیش سەریان دەبڕین."

شەریفە خاتوون كاتی گێڕانەوەی كارەساتەكە لەرزی، فرمێسك لە چاوەكانی خڕبوونەوە، بێدەنگ بوو. كەمێك دواتر دیسان دەستی بە قسان كردنەوە: "شێخمووسیش ئەو ژنانەی كە بە خەنجەر لەت و پەت دەكران لە دوورڕا بینیبوون، بەڵام نەیتوانیبوو لێیان نزیك ببێتەوەو لەویّ رایكردبوو و هەڵاتبوو. لەوە بەدواوە ئیدی نەچووبووە لێواری دیجلە و ژێر پردی دیجلە."

پۆیراز گوتی: "منیش، منیش نەمدەتوانی بچمە ئەو شوێنانە، نەمدەتوانی پێم بخەمە لێواری دیجلەوە."

دەستیپێکرد ڕووداوەکەی لە هەوەڵەوە تا ئاخیر بۆ شەریفە خاتوون گێڕایەوە. شەریفە خاتوون بە چاوانی گریاناویەوە گوتی:

"وای کاکە پۆیراز، وای. دەردەکەت زۆر گەورەیە، ئێستا تێگەیشتم. شێخمووس کاتێك ڕەفتاری ئەو دڕندانەی لە دوورەوەڕا بینیبوو رایکردبوو، تۆ نەتتوانی رابکەیت؟"

"نەمتوانی رابکەم."

"ئەگەر راتکردبوا ئەو دڕندانە دەیانکوشتیت؟"

"ئەو دڕاندانە دەیانکوشتم."

پۆیراز موسا، دواتر چووە لای دکتۆرەکان. بەجۆرێك سەرگوزەشتی خۆی بۆ ئەوانیش باسکرد. ئەوان گوێیان لە قسەکانی گرت و گوێیان لێگرت، دکتۆر سەلمان سامی گوتی: "جەنگ مرۆڤەکان دڕندەتریش دەکات." دکتۆر خەلیل رەفعەت هیچ قەسەی نەکرد، تفی دەمی قووت دایەوەو هەروا ماڵق رامابوو.

لە ماوەی یەك هەفتەدا لە دوورگەدا کەسێك نەمابوو کە پۆیراز بەسەرهاتی خۆی بۆ باس نەکردبێت. تەنانەت شوکری ئەفەندی گوتی: "من کە گوتبووم ئەو جەنگانە تا زیاتر درێژە بکێشن و بەردەوام بن، مرۆڤبوونی مرۆڤەکان زیاتر لەنێو دەچێت، مرۆڤایەتی دەپووکێتەوە، تەنانەت خراپتریش لە پووکانەوەو بۆگەنبوون، بۆگەن دەبێت. بەدرێژەکێشانی جەنگەکان مرۆڤ توانا و بڕستێکی بۆ نامێنێتەوە تاکو تەنانەت بە خۆیشی دابێتەوەو شەرم لە خۆی بکات، کرمێ دەبێت. وای، وای، وای کاکە پۆیراز وای! ئادەمیزاد چۆن دەتوانێت ئەو هەموو ستەم و بێدادیە ببینێت و هێشتا درێژە بە ژیان بدات و مرۆڤبوونی خۆی بپارێزێت."

شوکری ئەفەندی غەڵێفەکانی بڕینەوەو هەنگوینەکەی لەنێو ماڵەکاندا دابەش کرد. بڕێکی شایانی باسی بۆ بنیاتنانی خوێندنگە دایە دکتۆرەکان. تەنها باخەکە مابوو. بیریدەکردەوە، ئیدی دوای بیستنی بەسەرهاتەکەی پۆیراز، هەر جارێك بهێتە ئەم دوورگەیە گرفتاری دێوەزمە دەبێت. ترێی رەزەکانی دوورگە ترێیەك بوو کە نەدەکرا دەستیان لێهەڵبگرێت. ئەمە ئادەمیزادە، چاوچنۆك و بێعارە، هەر شتێك بە دەردی نەخوات پشتگوێی دەخات و لەبیری دەکات، نەك تەنها ئەو کارەسات و بەسەرهاتە دێوەزمەئاسایەی کە بیستوویە، بەڵکو تەنانەت ئەو ڕووداوەی کە بەسەر خۆیشی هاتوە و تا گەردەنی نوقمی خوێن بووە لە بیر دەکات.

پۆیراز ئیدی خەیاڵی ئاسوودە بوو، بە ئاسوودەیی دەخەوت، ئیدی شەوان هەڵۆ و داڵەکان بە باڵە خشە خشکەرەکانیان دانەدەگژانە سەر لێواری دیجلە و فورات و وەکو هەوری رەش لەسەر ئاسمانی دیجلە و فورات کۆ نەدەبوونەوەو لەو سەرەوە دانەدەبەزینە خوارێ. نەشدەهاتنە دوورگە، ئیدی دەنگی شیوەن و فیغانی کچان و ژنان و خشەخشی باڵی هەڵۆکان شێتیان نەدەکرد. شەریفە کە لەنێو سێلاوی خوێن و سەری براوی کچان و ژنان رایکردبوو، ئەو شتانەی کە بینیبوونی بە هێمنی، وەك ئەوەی چیرۆك بن دەیگێڕانەوەو باسیدەکردن و ئەمە پۆیرازی لە هەندێك لایەنەوە خستبووە گومانەوە کە شەریفە خاتوون ئەمانەی بیستوون یان هەر بەڕاستی بەچاوی خۆی بینیبوونی. ئەگەر وانیە ژنێك چۆن دەتوانێت کارەسات و بەسەرهاتێکی ئاوا بەو شێوەیە باس بکات و بگێڕێتەوە. بەهەرحاڵ پۆیراز خۆشحاڵ بوو، دەستەکانت خۆش شەریفە خاتوون. بەجێماوانی نەبەردەکانی گەلیبۆلۆ و چیاکانی ئەللاهوئەکبەر، دوای ئەو رووداوانە چۆن دەژین، دڵیان ژەنگی هەڵێناوە یان لاپەڕەی بیرەوەریەکانیان بە خاك و خۆڵەمێش داپۆشراوە؟

پۆیراز هەروا کە لە هۆڵەکە لەسەر نیوتەختێکدا راکشابوو و بیرو خەیاڵاتی جیاجیا دەوریان دابوو، لە خوارەوە گوێی لە دەنگی نیشانچی بوو:

"پۆیراز، پۆیراز، لە ماڵێت؟"

پۆیراز هەستا، چووە بەر پەنجەرە، بایەکی توندی دەهات، کەرکەرەکانی بە پەنجەرەکەدا دەکێشان:

"فەرموو نیشانچی، شتێك بووە؟"

"وەرە خوارەوە."

پۆیراز هەروا کە لە پلیکانەکان دادەبەزی لە نیشانچی پرسی:

"چیە، شتێك روویداوە؟"

نیشانچی گوتی: "سەیری ئەسکەلە بکە، چیوای نەماوە دوورگە پڕ بێت لە خەڵك. بەلەمێك مرۆڤ خەریکن پیادە دەبن."

لە بەلەمێکی شینباو کۆمەڵە خەڵکێك لەمنداڵ و پیر و لاوی بار بەکۆڵ دابەزین.

چوونە ئەسکەلە، ڤاسیلی و هۆسمەن بە بینینی بەلەمێك کە نزیك دەبووەوە بەخێرایی چووبوونە سەر ئەسکەلە.

بەڵەم خێرا بەتاڵ بوو. ژمارەیەکی زۆر وەك ئەوەی چاوەڕێیان دەکرد لەو بەلەمە کە لە ئەسکەلە لەنگەری گرتبوو دانەبەزین، بەڵام هەر ئەو ژمارە کەسەش بۆ خۆی کەم نەبوون. نزیکەی هەموو پیاوەکان پیربوون و زۆربەی ژنەکان گەنج. کوڕ و کچۆڵەی زۆریشیان لەنێوان دابوون.

بەڵەم کەسی تێدا نەما، وەرسووڕایەوەو ڕۆیشت، تازەهاتوەکان هەروا لەسەر ئەسکەلە مانەوە. سەیری دەوروبەری خۆیان دەکرد و هەروا بە پێوە وەستابوون. نیشانچی راست بەرەو لایان چوو: "بۆچی لەوێ وەستاون، چیتاندەوێت؟"

پیرە پیاوەکان جووڵەیەکیان تێکەوت. هەر یەکەیان کاغەزێکی بەدەستەوە بوو و کاغەزەکەی بەرز کردبووەوە، پیرەمێردێکی درێژ کە ریشە سپیە درێژەکەی تا سەر سنگی هاتبوو و لە پێش هەموویان وەستابوو هاتە پێش، کاغەز بەدەستەکانی دیکەش بە بینینی ئەو هاتنە پێش.

"ئێمە لەبەر خاتری پۆیراز موسا ئەم دوورگەیەمان هەڵبژاردووە. لە کوێ دەتوانین کاك پۆیراز موسا بدۆزینەوە؟"

پۆیراز موسا گوتی: "منم. بەخێربێن، سەفاتان هێنا."

پیاوە باڵابەرزە ریشدرێژەکەی پێشەوە بۆ لای پۆیراز هات، لەبەردەم پۆیراز بە حاڵەتی ئامادە راوەستا، ئەو کاغەزەی بەدەستیەوە بوو بۆ لای ئەوی درێژ کرد، ئەوانی دیکەش هاتن بە حاڵەتی ئامادە راوەستان، کاغەزەکانیان بۆ لای پۆیراز درێژکرد. پۆیراز موسا گوتی: "قەباڵەی خانووەکان." ئاوڕی دایەوە "بگرە ڤاسیلی، دەستت ماچ دەکەن."

ڤاسیلی قەباڵەکانی لە پۆیراز وەرگرتن و گوتی:

"بە دوامدا وەرن با ماڵەکانتان نیشان بدەم."

کاری نیشاندانی خانووەکان بە خاوەنەکانیان تا عەسر درێژی کێشا. تازەهاتوەکان کەلوپەلەکانیان بە یارمەتی هۆسمەن، ڤاسیلی، منداڵی ژنە خزمەتکارەکانی ماڵی دکتۆرەکان و قەدریی بەلەموان و زۆربەی خەڵکی دوورگە بەخێرایی بردە ماڵەکانیان. نیشانچی و حەسەنی راکردوو یەکسەر بۆ ماسیگرتن چوون. ئەو ڕۆژە لە هەموو ماڵێك خواردن بۆ تازەهاتوەکان لێندرا، خواردنەکانیان بە سینی و قابلەمان بردە ماڵی ئەو خەڵکە تازەهاتوە. ئەمانە کە لە هەموو کارەساتە ناخۆشەکان توانیبوویان دەرباز بن و خۆیان بگەیەننە ئێرەو پەنایان هێنابووە

بەر ئەم دوورگەیە، یەکەمجار بە بینینی ئەو خانووە کۆشکئاسایانە حەپەسان. باوەڕیان نەدەکرد ئەو خانووانە درابنە ئەوان. نیگەران بوون بە زوویی ئاغایەك، بەگێك بهێت و هەموو ئەو خانووە جوانانەیان لێبستێنێت. دوای ئەوەی لە خانووەکانیان جێگربوون، لە هەموو ماڵەکانەوە خواردنیان بۆ هات. زۆر برسی بوون، خواردیان و تێربوون.

نیشانچی و حەسەنی راکردوو بە لەگەن و سەبەتەی پڕ ماسیەوە گەڕانەوە. ئاگرێك لەو ساکەگۆڕەی ژێر دارچنارەکان کرابووەوە، پەنگری گەش لەو نێوەدا هەڵڕژابوون، ماسیەکانیان بە یارمەتی یەکدی لە بەلەمەکان هێنابوونە خوارو بردبوونیانە لێوار. کچان و ژنانی تازەهاتوەکان لەگەڵ کچان و ژنانی دوورگە لە لێواری دەریا ماسیەکانیان پاککردبوونەوە، دیسان هەموان ماسیەکانیان بە شیشانەوە کردن و لەسەر ئاگرەکە برژاندنیان، لەسەر مێز داندران و یەکەم قاپی پڕ ماسی داندرایە بەردەم تازەهاتوەکان.

دووکەڵی چەوری ماسیان بەسەر پەنگرانەوە ئەو ناوەی داگرتبوو، مگێزی کەسانی برسی دوو بەرامبەر کردبووەوە. کشتکارەکان، کرێکارانی پەمۆ، کرێکارانی کۆکەرەوەی هەنجیر، هەنار، ترێ و خۆخ، نیوە برسی، رۆژێك کە هاتبوونە ئێرە ئاوا بە گۆشتی ماسیان میوانیان بۆ رێکخرابوو و خۆیان لەنێو ئەو تامو بۆن و کەش و هەوایەدا سەرسام بینیبوو. لەگەڵ دراوسێ میواندۆستەکاندا، بەشێوەیەك وەك بڵێیت ساڵەهایە لە تەك یەکدا بە خۆشی دەژین ئاوا بووبوونە دۆست و دڵسۆزی یەکدی. ئامینە، خزمەتکارەکەی دکتۆر سەلمان سامی و ئەسمەر خزمەتکاری دکتۆر خەلیل رەفعەتیش هاتبوونە ئەو ئێوارە میوانیە. ئەوان منداڵەکانیشیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوون.

لە میوانیەکە کەس مەی نەخواردەوە. لە ماوەی نانخوادنیشدا کەس قسەی نەکرد. لە هەموان زیاتر شەریفە خاتوون بە شێوازی نانخواردنەکە سەرسام بووبوو، چونکە لە گوندو شارو شارۆچکەکانی ئەنەدۆڵی رۆژهەڵات هەرگیز ژنو پیاو لەسەر یەك سفرە پێکەوە نان ناخۆن. چ پێویست دەکات، شەریفە خاتوون قسەی نەکرد، گوتی ئەمەش داب و نەریتی ئەمانەیە.

کاتێك هەموان تێر بوون لە دەوری مێزەکە کشانەوەو هەستان خۆشحاڵ و بەگوڕ بوون. لەنێو ئەوانە هەمواندا تەنها یەکێکیان لەسەر کورسیەکە دانیشتبوو و هێشتا هەر دەیخوارد، ئەویش عەزیز بوو، واتە هەمان ئەو پیاوە ریشسپیە باڵابەرزە. خەڵکی گوندەکەی ئامینە بوو. لە ماوەی نانخواردندا چاوی لەسەر ئامینە هەڵنەگرت، بەڵام ئامینە نیگاکانی خۆی

لێدەشاردەوە. ئامینە دەستی کوڕەکەی خۆی گرتبوو و بەرەو ماڵ دەچووەوە، عەزیز بەدوایانەوە بووو لێیاننزیك بووەوە، لە کاتێکدا دەستی بە ریشە سپیەکەیدا دەهێنا گوتی:

"ئامینە، ئەمن ناناسیتەوە؟"

ئامینە خراپ هەڵدەلەرزی. بە دەنگێکی گیراوەوە گوتی:

"تۆ کێیت؟، ناتناسمەوە."

"من عەزیزم ئامینە، تۆ کچەکەی تەمەل نیت؟ مەگەر مێردەکەت لە ساری قامیش رەق نەبووەوە و کارتی مردنەکەیتان بۆ نەهاتەوە؟"

"من ئەو ئامینەیە نیم."

"تۆ هەمان ئامینەیت، بۆچی دەیشاریتەوە، بە بیرتە من شاهینێکم هەبوو و باڵندەم پێدەگرت و بۆتم دەهێنان؟ ئەوەی لای تۆیە، ئەسمەیە، کچی کەل موستان هی گوندی یالنیزکوی؟ مەگەر ئەوان دوژمنی ئێوە نەبوون؟ ئێوە سەدو پەنجا ساڵە کە یەکدی..."

"من یەکەمجارمە کە تۆ دەبینم، هەر ناتناسم پیرەمێرد."

کوڕەکەی توند راکێشا، لە ئەسکەلە دوورکەوتەوە.

عەزیز لەهەمان جێگا لەکاتێکدا دەستی بەریشیدا دەهێنا مایەوە. کەمێك دواتر هاتەوە لای ژن و بووك و نەوەکانی کە لە ژێر چنارەکان چاوەڕێیان دەکرد. ژنەکەی گوتی:

"باسی چیتدەکرد لەگەڵ ئامینەی کچی تەمەل، عەزیز؟"

"ئەو منی نەناسیەوە، گوتی یەکەمجارە دەتبینم، سەیرە نامناسێتەوە. منیش پێمگوت، بە بیرت نیە ئەو باڵندانەم بۆ دەهێنایت کە بە شاهینەکەی خۆم دەمگرتن و دەتخواردن، بۆچی من ناناسیت، گوتم مەگەر ئەو ئەسمەیە کە لای خۆتە دوژمنی سەدو پەنجا ساڵەتان نیە؟ مەگەر ئێوە نەبوون کە سەدو پەنجا ساڵ یەکدیتان کوشت؟ گوتم مەگەر کارتی کوژرانی هاوسەرەکەت لە ساری قامیشەوە نەهاتەوە؟ گوتی نەهاتۆتەوە. گوتی من یەکەمجارە دەتبینم و هەر ناتناسم، منیش پێمگوت باشتر کە نامناسیت. گۆشتی ئەو باڵندانەت لێحەرام بێت کە شاهینەکەی من دەیگرتن و بۆم دەهێنایت، گوتم نمەك بە حەرام!"

ژنەکەیشی گوتی: "نمەك بە حەرام!"

بووکەکانیش گوتیان: "خوایە ئەو باڵندانەی کە خواردوونی حەرامی بن."

عەزیز کەسێکی زۆربلێ بوو. لە ماوەی سێ ڕۆژ هەموو خەڵکی دوورگە بێئەمەکی ئامینەی بیستبوو. ئەسمەش نەیدەناسی. گوندەکەی ئەسمەش نزیك گوندی ئەوان بوو بە ناوی کاستال. ئەسمەش وەکو ئامینە لە خۆی بایی بووە، ئەویش عەزیز ریشسپی ناناسێتەوەو تەنانەت سەیریشی نەکردبوو. ئەمە لەکاتێکدا کە عەزیز دۆستێکی نزیکی باوکی بوو. عەزیز کاتێك دەچووە دێی کاستال دەچووە ماڵی ئەوان، باوکی ئەسمەش کاتێك دەچووە گوندی یالنیزکوی دەچووە ماڵی ئەوان و لەوێ دەبوو. ئەم ژنانە کە عەزیزیان نەناسیبووەوە، ڕەنگبوو تەنانەت ئەگەر باوکی خۆشیان نەناسنەوە کەچی عەزیز، ئەویش عەزیزی ریشسپی باڵابەرز هەر بناسنەوە. ئەمە ئەوەندە بەلای عەزیزەوە گران کەوتبوو کە تەواو توورە بووبوو. هەر کەسێکی کە دیبینی، دەیگوت: "واتە، واتە، بوون بە کارەکەری دکتۆرەکان ئەوەندە گرنگە کە وا لە خەڵکی بکات کەسێکی گوندەکەی خۆی نەناسێتەوە، ئەویش دۆستێکی دڵسۆزی باوکی خۆی. هەموو ڕۆژێك دەستی مامەی خۆی ماچ دەکرد و ئێستاش نایناسێتەوە. ئەو دوو ژنە بێناموسە قەت قسەیان لەگەڵ یەکدی نەدەکرد. ئەوان سەدو پەنجا ساڵە ڕەگ و ریشاڵی یەکدی دەردەهێنن. ئەو منداڵانە هەرگیز لەیەك جیانابنەوە. ئەگەر ڕۆژێك پێبزانن کە دوژمنی یەکدین، یەکسەر یەکدی دەکوژن. ئەو قەحپانە وەکو سەگ بۆ دکتۆرەکان کلك دەلەقێنن و سەیری روخساری عەزیز ریشسپیش ناکەن. نیشانیان دەدەم. ئەگەر ڕۆژێك منداڵەکان پێبزانن کێن، ئەوکات دەبینن چ قیامەتێك رادەبێت."

تادەهات عەزیز ریشسپی تووڕەتر دەبوو، خەڵکی دوورگە بەشێوەیەکی سەیر سەیری ئەو دوو ژنە و منداڵە ژیکەلەکانیان دەکرد. هەموان لەنێوان خۆیاندا دەیانگوت، خوا بکات ژنەکان، ئامینە و ئەسمە، خوا بکات منداڵەکان، جەمال و حەمدی، هیچکات بابەتی دوژمنایەتی و خوێنداریی نێوان هەردوو بەرەبابی خۆیان نەبیستن و پێینەزانن.

ئامینە دەردەدڵی لەگەڵ دکتۆر سەلمان سامی کردو گوتی: "من، هەموو ڕۆژێ هەزارجار دەمرم و زیندوو دەبمەوە، ئەگەر ئەم منداڵانە بزانن کە دوژمنی یەکدین، عێل و عەشیرەتیان یەکدی دەکوژن و تۆڵە لەیەکدی دەکەنەوە، یەکسەر یەکدی دەکوژن. پیاوانی ئەو دوو تایفەیە لەوەتەی دنیا هەیە یەکدی دەکوژن."

دکتۆر سەلمان سامی پرسی:

بۆ"چی؟ بۆچی یەکدی دەکوژن؟"

ئامینە گوتی: "نازانم. دەکوژن ئیدی، کەسیش نازانێت بۆچی، دەکوژن ئیدی."
"کەس ناپرسێت بۆچی یەکدی دەکوژن؟"
"نازانم."
"کەس عەقڵی پێداناشکێت ئەم پرسیارە بکات؟"
"من عەقڵم پێنەشکاوە، نەمپرسیوە. کەسیش عەقڵی پێنەشکاوە. ئەگەر منداڵەکان ببیستن، بە عەقڵی ئەوانیشدا ناشکێت بپرسن بۆچی دەبێت یەکدی بکوژن، یەکدی دەکوژن. ئێستا نۆرەی جەمالە."
"نۆرەی چی؟"
"ئەو ڕۆژەی کە مامەی حەمدی لە سەربازی گەڕایەوە، مامەی جەمال لە ناوەڕاستی شارۆچکە ڕێی پێگرت و کوشتی. پاشان جەنگ هەڵگیرسا. هیچ پیاوێك لە ماڵێ نەما، هەموویان بردنە سەربازی. هیچ کامیشیان لە سەربازی نەگەڕانەوە، هەندێکیان لە گەلیبۆلۆ، هەندێکی دیکە لە کانال، ژمارەیەکیشیان لە ساری قامیش کوژران."
"تۆ ئەمانەت لەکێ بیستوە؟"
"لە کەسم نەبیستوە، من دەزانم. دەست و پات ماچ دەکەم جەنابی سەرگورد، منداڵەکان نەبیستن. ئەگەر منداڵەکان لە دێ مابوان، هەرچۆنێك بوا مەسەلەی تۆڵەکردنەوەیان دەکەوتە بەرگوێ و یەکدیان دەکوشت. پاشان منداڵەکانی ئەمانیش دەیانبیست و یەکدیان دەکوشت و دەکەوتنە گیانی یەکدی، پاشانیش منداڵی ئەوان و دوای ئەوانیش... ئێستا منداڵەکان هەموو شتێك فێردەبن و تێدەگەن. ڕەنگبێت بشزانن، ئەو دێوەزمە قالۆرە ریشدرێژە بێدین و ئیمانە باسی ئێوەو منداڵەکانی بۆ هەموو خەڵکی دوورگە کردووە، تەنانەت ئێمەش بیستوومانە. ئەگەر منداڵەکان ببینن..."
"ئەگەر ببیستن بۆی هەیە یەکدی نەکوژن."
"دەکوژن جەنابی سەرگورد، من و ئەسمە زۆر لەو بارەیەوە قسەمان لەگەڵ یەکدی کردووە، بە قەدریی بەلەموانیشمان گوتوە، بڕیارە ئەمشەو بمانباتە شارۆچکە، دەچینە شوێنێك کە دەستی ئەو ئەهریمەنە درێژە ریشسپییەمان نەگاتێ و منداڵەکانمان رزگار دەکەین. ئێمە نەماندەتوانی ئەم شتانە بە ئێوە نەڵێین و لێبدەین بڕۆین. جەنگ کە هەڵگیرسا هاوسەر و براو دراوسێکانمان کوژران و نەگەڕانەوە. بیرمانکردەوە لانیکەم منداڵەکانمان رزگار بکەین. ڕێك لەم

ساتەدا ئەم کافرە سەرو کەللەی بەدەرکەوت. خواخێرتان بنووسێت کاك دکتۆر، خوا منداڵەکانتان بۆ بهێڵێت. دڵی ئێمەتان نەشکاند، لە باوکمان باشتر رەفتارتان لەگەڵ کردین. ئەگەر لەبەر خاتری منداڵەکانمان نەبوا بەجێمانندەدەهێشتن. من و ئەسمە لەبەر ئەوەی دەمانەویت لێرە بڕۆین دوو رۆژە یەکرێز فرمێسك دەرێژین."

دکتۆر سەلمان سامی کە تووڕە بووبوو، گوتی:

"جارێ سەبرێك بگرە کچم. دان بەخۆتدا بگرە، پێویست بکات سبەینێ ئەو ریشسپیە درێژە لە دوورگە وەدەر دەنێم."

"کاك دکتۆر ئەگەر پێیبلێیت ئیدی دەمی نەکاتەوە. ئەو لە راستیدا کەسێکی خراپ نیە. ئەگەر دەری بکەیت و رەوانەی هەر جێیەکی بکەیت دیسان خۆی دەگەیەنێتەوە ئێرەو هەموو شتێك بە منداڵەکانمان دەڵێت."

دکتۆر سەری لەبەر خۆی نایەوە، ئامینە چاوی تێبڕیبوون، ماوەیەك ئاوا بیری کردەوە، سەری بەرزکردەوە، چاوی بڕینە چاوی ئامینە و گوتی:

"ببینە کچم، تا ئەوکاتەی من زیندووم، تا ئەوکاتەی پۆیرازی گەنج زیندووە، ناهێڵین منداڵەکانتان ئەم شتانە بزانن، تا ماون وەکو دوو برا لە تەك یەکدا دەژین. من قسە لەگەڵ نیشانچی و پۆیراز و حەسەنی راکردوو و کابرای ریشدرێژ دەکەم، تۆ هەرگیز نیگەران مەبە."

دکتۆر سەلمان سامی، جەمالی ناردە دوای نیشانچی و بانگی کرد، کێشەکەی بەدرێژی لەگەڵ ئەودا هێنایە گۆڕێ.

نیشانچی گوتی:

"کاك دکتۆر، عەزیز بەمن بسپێرە. ئەگەر جارێکی دیکە عەزیز بابەتی خوێندارییەکەی باسکرد، ئەوا ئامادەم بچمە سەر ئەو گردەو سێ شەوان وەك سەگ بحەپم، پاشان دەچمە دوورگەی کابا. دەچمە سەر دوندی ئەوێ، بە بەرچاوی بزنەکانی خدر سلاّوی خوای لێبێت لەو بەرزاییەوە خۆم هەڵدەدێرم و خۆم فڕێدەدەمە دەریا. ها، سەبرت هەبێت کاك دکتۆر، برام، بەر لەوەی خۆم فڕێبدەمە نێو دەریای دوورگە کابا، پلاپیسێك دێنم، عەزیزە درێژ دەبەمە نێو دارزەیتوونەکان بە کندرێك توند توند لە دارزەیتوونێکی دەبەستمەوەو پاشان بە پلاپیسەکە یەك یەك مووی ریشە درێژەکەی دەردێنم تا دادو هاواری بچێتە ئاسمان. چی خراپە بەسەری دێنم. ئێستا رێگە بدە بڕۆم وا دەمی بە قوڕ بگرم، کە فەلەك ئافەرینم بکات."

نیشانچی به پێکەنینەوە هەستا:

"بوەستە نیشانچی، دانیشە."

نیشانچی دانیشت و گوتی:

"فەرموو."

"عەزیز بۆ تۆ هیچ نیە، دەتوانی بە ئاسانی بیپێچیتەوە، تەنانەت ئەگەر بتەوێت دەتوانیت بشیکوژیت."

نیشانچی بە ئەدایەکی راشکاو و هێمانە گوتی: "من مرۆڤ ناکوژم دکتۆر. ئەگەر چارەم هەبوا ماسیشم نەدەکوشت. مرۆڤ دەبێت مرۆڤ بێت. مرۆڤ نابێت هیچ گیاندارێکی ئافرێندراوی خوا لەنێو ببات، تەنانەت جرو جانەوەرەکانیشی. ئەو عەزیزە درێژە جارێکی دیکە باسی خوێنداریەکە بکات ریشە درێژەکەی بە مووکێش لە بنەوە دەردێنم، لەگەڵ ژن و منداڵەکانی دەنێرمە یەمەن، ئەو شوێنەی کە بە سەربازی لێی هەڵاتم."

دکتۆر سەلمان سامی لەپڕ هەڵچوو:

"بۆچی لە سەربازی هەڵاتیت؟"

"چونکە نەمدەویست مرۆڤ بکوژم."

"تۆ ئەودەمەی کە لە چاناك قەڵا و ساری قامیش هەموان خەریکبوون دەکوژران چۆن توانیت رابکەیت؟"

"من کەسێکی زۆر ترسنۆکم، تەنانەت لە مێروولەش دەترسم. لە کوژران و کوشتنیش دەترسم. هەربۆیەش پەنام هێناوەتە بەر ئێرە."

"یاللا برۆ، زوو ئەو کابرایە لەگەڵ خۆت بێنە بۆ ئێرە!"

"سەرچاو جەنابی سەرگورد، هەر ئێستا دەچم و دەیهێنم."

نیشانچی کەمێك دواتر لە کاتێکدا دەستی عەزیزی گرتبوو، هێنای.

"لێرە دانیشە عەزیز ئاغا، تۆش دانیشە وەلی نیشانچی."

لەو شوێنە دانیشتن کە سەرگورد نیشانی دابوون.

"دەزانیت، ئامینە خانم لە ماڵی ئێمەدا کاردەکات. وەك دیارە تۆ خەڵکی گوندەکەی ئەوانی و هەموو وردەکاریەکانی ژیانی ئەوان دەزانیت. گوایە گوندەکەی ئەسمەش کە لە ماڵی دکتۆر خەلیلی هاوڕێمدا کاردەکات پێدەزانیت."

دکتۆر سەلمان سامی نەرم بووبوو، هێندە نەرم و هێمنانە دەدوا دەتگوت هەنگوین لە لێوی دەبارێت.

"لەبارەی ئەوانەوە داوای زانیاریت لێدەکەم، لەبەر ئەوەی ئەوانە لە ماڵی ئێمەدا کار دەکەن و هاتوونەتە نێو ماڵ و حەرەمی تایبەتی ئێمە، ئێمە دەبێت لەبارەیانەوە هەمووشتێك بزانین. ئەوە خوا تۆی بۆ ئێمە ناردووە."

نیشانچی نیگای بەسەر روخساری دکتۆردا وشك بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی کوڕە ئەوە تۆ چیت.

"من ئەو دوو ژنە باش دەناسم. هاوسەری هەردووکیان چوونە سەربازی و ئیدی نەگەڕانەوە. کارتی کوژرانیشیان هاتەوە. ئەگەر جەنگ نەبواو ئەوان لە پێناو نیشتماندا نەکوژرابوان، یەکدیان دەکوشت، ئەوکات ئیدی شەهید نەدەبوون، بەهۆی مرۆڤکوژیشەوە دەچوونە دۆزەخ و لەنێو ئاگردا دەسووتان. خوا بە هانایانەوە چوو، ئەنوەر پاشا باوکایەتی لەبارەوە کردن، جەنگی هەڵگیرساند، ئەوانیش شەهید بوون و یەکڕاست چوونە بەهەشت. ئەو شەهیدانە لەجیاتی ئەوەی کە بچنە دۆزەخ، هەموو عێل و عەشیرەتیشیان لەگەڵ خۆیاندا دەبەنە بەهەشت. لێرە بیستوومە، ئامینە و ئەسمە بە هەموو خەڵکیان گوتوە. لە دوورگە هەموان ئەوە دەزانن کە ئەو دووانە لە رێگادا یەکدیان بینیوە. ئەو کاتەی سوپای رووس هاتە ناوچەکانی ئێمە، ئێمە گشتمان ماڵ و حاڵی خۆمان جێهێلا و رامانکرد، پاشانیش پرسی گۆڕینەوە هاتە گۆڕێ و حکومەت بڕیاریدا گوندو شارۆچکەکانی کە لە یۆنانیەکان بەجێماون لە نێو ئێمەدا دابەش بکات، ئێمەش هاتینە ئەم دەوروبەرە. ئەوانیش واتە ئامینە و ئەسمەش بڕیاریاندا بوو، لەوێ رابکەن و بچنە شوێنێك کە کەس نەیانناسێتەوە، بۆ ئەوەی منداڵەکانیان پێنەزانن کە دوژمنایەتی خوێنداریان لەگەڵ یەکدا هەیە، بۆ ئەوەی یەکدی نەکوژن، لەوێ رایانکردووەو هاتوونەتە ئەم دوورگەیە. منیان کە بینی نەیانناسیمەوە دکتۆر. خۆیان وا نیشاندا کە نامناسنەوە. من حەوت پشتیشیان دەناسم، وایانزانیوە من رەگ و رەچەڵەکیان باس دەکەم و منداڵەکانیان تێدەگەن کێن و یەکدی دەکوژن، بۆیە خۆیان وا نواند کە من مامە عەزیزە درێژی ریشسپیان ناناسن. من کاتێك بابەتەکەم زانی گوتم وای، من چ کارێکم کرد، پاشان بیرمکردەوە، باشە با ئەوانیش ببنە مرۆڤ و دەست لە گیانی یەکدی هەڵبگرن. بابچنە سەربازی و شەهید بن و ئیدی دایکەکانیان بخەنە سەرکۆڵیان و یەکڕاست بچنە بەهەشت."

"سەبر بگرە، کاك عەزیزە درێژ، سەبر بگرە! تۆش سەیر پێدا دەڕۆیت. حەوت پشتی ئەمانە چیانکردووە؟"

عەزیزە درێژ وروژا، لە دڵی خۆیدا گوتی چەند باش بوو دکتۆر ئەمەی لێپرسیم. "ئەمانە دوو سەدو پەنجا ساڵە پشتاو پشت یەکدی دەکوژن، هەموو دەریای رەشیش ئەو خوێنداری و دەرگیریەی ئەوان دەزانێت. زۆر بەرەباب و خزم و کەسوکاری وەکو ئەمانە لە لێواری دەریای رەشدا هەن کە ئاوا یەکدی دەکوژن."

عەزیزە درێژ تەواو هاتبووە جۆش:

"ئێستا، بڵێم کە جەنابی سەرگورد، کاك دکتۆر، باوکی ئەمە مامی ئەوەی کوشت، مامی ئەویش باوکی ئەمەیان، باپیرە گەورەی زۆر گەورەی ئەمەیان باپیرە گەورەی ئەویان. باپیری باپیری ئەوەیان باپیری باپیری ئەمەیان. باپیری ئەو دووەش یەکدیان کوشتوە. ئەمانە بەر لەوەی تەمەنیان بگاتە وادەی سەربازیان یەکدیان دەکوشت، بۆیەشە هەموویان بوونەتە ئەهلی دۆزەخ. ئەمانە کەسانێکی ئازاو چاونەترسن. دەریای رەش پڕیەتی لەو جۆرە کەسە ئازاو چاونەترسانە. هەروەها کوردەکانیش وان. ئینشاڵڵا ئەم منداڵانە کێشەی خوێنداریەکە نازانن و بۆ خۆیان دەچنە سەربازی و شەهید..."

دکتۆر لەجێی خۆی هەستاو نەڕاندی:

"هەستە هەی گەوجی ناجسن، چەنەباز. هەموو شتەکەت وێران کردووەو ئەو منداڵانەت خستوونەتە سەر زاری هەموو دوورگەییەکان، تازە دێیت ئامۆژگاری منیش دەکەیت، سەگی هار. منداڵەکان یەکدی بکوژن و ئەمە چێژ وەرگرێت بچێت خوێنی منداڵەکان بلێسێتەوە. نیشانچی ئەم سەگە ببەرەو هەرچیەکت پێ باش بوو لەگەڵیدا بکە. ببینە سەگی نارەسەن، باپێتبڵێم، ئەگەر منداڵەکان بەهەر شێوەیەك بێت بۆنی ئەو خوێنداریە بکەن، من خۆم لە هەمانکاتدا دەتکوژم. ئەگەر ناچار ببم سەگێك بکوژم بۆی دڵگران دەبم، بەڵام ئەگەر کرمێکی وەکو تۆ کە حەزی لە مژینی خوێنە بکوژم خۆشحاڵم دەبم و ئاهەنگ دەگێڕم. ئابڕووی دکتۆریەکەمم دەخەمە ژێر پێم و شریقەیەکی ژەهراویت لێدەدەم. نیشانچی ببە و چیت پێخۆش بوو ئەمە بکە."

عەزیزە درێژ زەرد زەرد هەڵگەڕابوو و لێوی لە ددانان رەق بووبوون. یەك دووجار ویستی قسە بکات، چەناگەی کەمێك جووڵا، بەڵام نەیتوانی هیچ بڵێت. ئەگەر نیشانچی ژێر باڵی

نەگرتبواو نەیبردبوا دەرەوە رادەقەنایە بەرپێی دکتۆر. لە دەرەوە قاچەکانی تێکدەئالأن. نیشانچی بە زەحمەت لە کاتێکدا هەناسەی سوار بووبوو بردیە نزیك شێرەی ئاو، لەسەر نیوتەختێك داینیشاند، چەند جامە ئاوێکی بەسەردا کرد و ئاوێکی دایە، رەنگهەڵبزرکانەکەی پیرە پیاو نەما، کەمێکی دیکە ئاوی خواردەوەو هاتەوە سەرخۆی.

نیشانچی گوتی:

"هەستە، تا سەرکانی دەچین. سوپاس بۆ خوا کە حاڵت هاتەوە سەرخۆی. دەی هەستە!"

"لەوێ نامکوژیت، مەگەر نە؟"

نیشانچی گوتی: "ناتکوژم، یاللا هەستە!، هەرگیز ناتکوژم."

نیشانچی تا گەیشتە سەر کانی دەمی لێکنەکردەوە. تا ئەو زیاتر بێدەنگ دەبوو عەزیزە درێژ حاڵی خراپتر و ترسەکەی زیاتر دەبوو. کە گەیشتنە سەر کانی، کەوتە ئەو گۆڕە. گوتی: "ئەمن مەکوژە کاك نیشانچی." دەنگی دەنگی کەسێك بوو کە هاوزینگ بدات. "منت بۆ کوشتن نەهێنانەوەتە ئێرە، وانیە؟ سەرگورد منی سپارە دەستی تۆ کە بمکوژیت، مەگەر نە؟"

نیشانچی بە دەربڕینێکی لێبڕوانە گوتی: "نە." و بە هەمان دەربڕینەوە درێژەی بە قسەکانیدا. هەرچی زیاتر ئەو قسەی دەکرد عەزیزە درێژ زیاتر و زیاتر سوورهەڵدەگەڕا. جارێکیش سێ تنۆك فرمێسك رژانە سەر ریشە سپییەکەی. کەمێك دوای ئەمەش نیشانچی سەری نایەوە بەرخۆی. چاوی بڕیە سێبەری ئەو وردە زیندەوەر و تەپۆیانەی کە بەسەر ئاوەکە بەخێرایی لەم سەر دەخزینە ئەو سەرو سێبەرەکەیان لەژێر ئاوەکە دەهات و دەچوو. نیشانچی ماوەیەك ئاوا مایەوە. عەزیزە درێژ ئیدی توانای قسەکردنی نەبوو. ماوەیەکی درێژ ئاوا دەستی بە ریشە درێژەکەیەدا هێنا. تا ئەوکاتەی وایلێهات بتوانێت قسە بکات. بە راوێژێکی ئارام گوتی:

"برام نیشانچی، بمبە لای سەرگورد."

نیشانچی یەکسەر هەستا، قۆڵی عەزیزە درێژی گرت و هەڵیستاند. ئەوی بە رێگای ئاوی کانیەکەی خوار دارزەیتوونەکانەوە بردە لای دکتۆر سەلمان سامی. وەك پێدەچوو دکتۆر سەلمان سامی چاوەڕێی ئەوان بوو. گوتی:

"فەرموون دانیشن."

یەکسەر لەسەر کورسیەکان دانیشتن و هەر کە دانیشتن عەزیزە درێژ گوتی: "جەنابی دکتۆر، جەنابی سەرگورد، تەواو هەق بەتۆیە. کاك نیشانچی هەموو شتێکی موو بە موو بۆ روون کردمەوە. ئێمە دوای ئەوەی زێدی خۆمان بەجێهێلا، بەڵاو نەهامەتی زۆرمان بەسەر هاتوون، بەڵای زۆر، کە ئەگەر باسیان بکەم دڵی هیچکەسێك بەرگەیان ناگرێت و شەق دەبێت. خەرج و باری ژیان و بژێویمان زیاد بوو. سێ دانە لە کوڕەکانم کارتی کوژرانیان لە بەرەکانی جەنگ هاتەوەو من مامەوەو منداڵە یەتیمەکانیان، هەروەها هاوسەرەکانیان. ئەوەی ناوی پارەیە نەمانبوو. پێیانگوتین خاك و زێدی وشك و برینگ و بێپێز و هەروەها ماڵەکانتان کە سەگیش ناتوانێت تێیاندا بژیت بەجێبێڵن و وەرن خانووی وەکو کۆشك و زەوی پڕ پیت و بەرەکەتتان بدەینێ کە ئەگەر- مرۆڤی تێدا بچێنیت ریواس لەسەریدا بڕۆیت- ئێمەش گوتمان لەوە باشتر، لەوە باشترە کە بچین لە چیاکانی ساری قامیش لەسەرمان رەق ببنەوە، رێگامان گرتەبەر. لەو سەری دەریای رەشەوە تا ئێرە، گەیشتینە هەر گوندێکی چۆڵی یۆنانیەکان و هەر باخ و باخچەیەك و هەر زەویەکی بەرهەمهێنن و هەر شارو شارۆچکەیەك دەریانکردین، ئەوەبوو کە دەیانگوت دەمانەوێت کۆشکتانبدەینێ. لێرەو لەوێ کارمان کرد، شەکەت و برسی، تەنها هەر گەداییمان نەکرد، زۆران گەداییشیان کرد. تا ئەوەی هاتینە ئێرە، خوا خێرتان بنووسێت. بەشێوەیەك کە شایستەی مرۆڤ بێت پێشوازیتان لێکردین، من لەجیاتی ئەوە چیمکرد؟ کاتێك بینیم ئامینە ئینکاری ناسیاویەکەمان دەکات، ئەم زمانە کە ئینشاللا بە برین بچێت چیکرد، ئەگەر ئێوە نەبوان دەبوومە هۆی بەکوشتدانی دوو منداڵ. لەمە بەدواوە بە هەموان دەڵێم کە..."

"وسس، تۆ کارت بەوەی دواوە نەبێت، تۆ تەنها زمانت بگرە."

"دەیگرم، تادەمی مەرگ پێشی دەگرم."

رووی کردە سەرگورد و بە پاڕانەوەوە سەیرێکی کردو گوتی:

"چ دەبێت تۆش لێمەگەڕێ من بکوژن، ببینە جەنابی سەرگورد، ببینە، من چەند سەر خێزانم بە ملەوەن، کێ دەیەوێت چاوی لێیانبێت و گەورەیان بکات." ویستی بڵێت: "بیاننێرێتە سەربازی تا شەهید بن"، بەڵام پێشی بەخۆی گرت. گوتی: "ئەوان چۆن، چۆن، چۆن." نەیتوانی تەواوی بکات. "جەنابی سەرگورد من گوناهەکەم گەورەیە، تۆخوا، مەهێڵە بمکوژن. من

جووجکە باڵندەیەکم تۆ درەختێکی، لەدەستی باڵندەکانی ئیزرائیل هەڵاتووم و پەنام هێناوەتە بەر تۆ."

دکتۆر سەلمان سامی پێکەنی، پێیەوە دیاربوو کە دڵنیابۆتەوەو گەیشتۆتە ئارامی. پرسی: "ئێوە خێزانەکەت چەند سەر کەسن؟" راوێژی قسەکردنەکەی شیرین بوو. ترس و غایلەکانی عەزیز ریشسپی پاککردنەوەو نەهێشتن. عەزیزە درێژ دەستیکرد بە ژماردنیان. بە خۆشحاڵیەوە گوتی: "سێزدە کەس."

"دەبێت خانووێکی دیکەشت بۆ بکڕین. من نامە بۆ وەهاب بەگ دەنووسم تا لە نزیك ماڵەکەتان خانووێکی دیکەتان بداتێ. تۆ رەنج و نەهامەتییێکی زۆرت بینیوە."

"دواجار لەژێر سایەی مرۆڤە باشەکاندا رزگارمان بوو. ئێستا گیرفانمان پارەی بینی و ورگمان چێشتی گەرمی خوارد. ئەو خانووەی کە بە ئێمەیان داوە تازە تازەیە، زۆریش گەورەیە، لە خانووەکەی گوندیشمان گەورەترە. کەسانێکی بێماڵ و حاڵ و بێخانوو لەو دەشت و دەر و بیابانانە زۆرن. ئەم دوورگەیە بەم زووانە پڕ دەبێت لە خەڵك. هەموان بە دوای سەرپەنایەکدا دەگەڕێن کە تیایدا بسترێن. سوپاست دەکەم قوربان، راوەستاو بیت سەرگوردی بەڕێز، خوا تەمەندرێژت بکات، دەست بۆ هەر شتێك ببەیت لەنێو دەستتدا ببێتە ئاڵتوون."

گتۆش هەربژیت کاك عەزیز. تەنها ئەوەندە هەیە کە ئەو قسانەی کردوونت هەموو خەڵکی دوورگە بیستوویانە. ئەگەر منداڵەکان تا ئێستا نەیانبیستوە، لەماوەی یەك دوو رۆژی دیکە دەیبیستن."

گتۆ هیچ نیگەران مەبە، من ماڵ بە ماڵ دەگەڕێم و دەڵێم ئامینەم بە کەسێکی دەچواند، هەڵەبووم وامدەزانی ئەو کەسەیە، بابەتەکە دەبڕێتەوە."

نیشانچی گوتی: "نابێت، ئەگەر تۆ ماڵ بە ماڵ بگەڕێیت بابەتەکە خراپتر دەکەیت، هەموان بە نیگەرانیەوە دەیکەنە مقۆ مقۆ، منداڵەکانیش تێدەگەن، دەکەونە گومان. تۆ ئەم کارە بۆمن لێبگەڕێ، خۆم چارەسەری دەکەم."

دکتۆر گوتی: "نیشانچی چارەی دەکات."

عەزیزە درێژ بۆ یەکەمجار پێکەنی و گوتی:

"نیشانچی برامان بە هێمنی بابەتەکە چارە دەکات."

هەرسێکیان پێکەوە پێکەنین.

نیشانچی و عەزیزە درێژ پێکەوە چوونەدەر.

عەزیزە درێژ بە نیشانچی گوت:

"کاتێك بە سەرگوردم گوت من گەنجانێك پێدەگەیەنم کە شەهید بن تا دەستی ئێمەی گوناهکار بگرن و بمانبەنە بەهەشت، زۆر تووڕە بوو، ئەم قسەیە هیچشتێکی نابەجێی تێدایە کە ئەو ئاوا تووڕە بوو؟ مەگەر ئێمە نەهاتووینەتە دنیا تاکو شەهید ببین؟"

"بابۆت باس بکەم سەرگورد بۆچی ئەوەندە تووڕە بوو کە دەیەویست بتکوژێت. ئەو لە چاناك قەڵاو گەلیبۆلۆ و هەروەها لەم دوورگەیەشدا کاری پزیشکی و برینپێچی کردووەو سەدان سەربازی برینداری دەرمان کردووە و سەربازانێکیش مردوون. خۆشی بە سەختی بریندار بووە. ئەو کەسانەی کە جەنگیان بینیوە، ئەوانەی کە جەنگاون، هەموو ئەو کەسانەی لە دەوروبەر و نزیکی جەنگ بوونە، ئەوانەی کە جەنگ تاقیدەکەنەوە، دوای جەنگ، هەرچیەك بێت، شەهیدبوونیش بێت، دەبنە دوژمنی ئەو کەسەی کە ستایشی جەنگ بکات. ئەو دکتۆرەی دیکەش لە جەنگی چاناك قەڵا بریندار بووە، بەهۆی کەمئەندامبوونیەوە خانەنشین کراوە، ئەویش وەکو سەلمان سامیە. دکتۆرەکان لەبەر ئەوەی لە کڵێسای ئەم دوورگەیە بە بریندارەکان راگەیشتوون، ئەم دوورگەیان کەوتۆتە بەر دڵ، دوای ئەوە هاتوونەتە ئێرەو لێرە نیشتەجێ بوونە. لەلای ئەوان دەبێت تەنها جنێو بە جەنگ و لایەنگرانی جەنگ بدەیت. شوکری خوا بکە کە دکتۆر بە هەرحاڵ تۆی کەوتەبەر دڵ و لێتخۆش بوو. کوشتنی مرۆڤەکانی پێخۆش نیە وەلــێ پێموایە، لەبەر هەرچیەك بێت، دکتۆرەکانی ئێمە ئەو کەسانەی کە ستایشی جەنگ و شەهیدبوون دەکەن، هەتا ئەگەر ئەو کەسە باوك و براشیان بێت دەیکوژن. منیشیان لەبەر ئەوەی سەربازی راکردووم خۆش دەوێت. ئەوان حەسەنی راکردوویان چونکە لە بەرەی جەنگ رایکردووە، لە پەتی سێدارە قوتار کرد. بە بیرت بێت هەرگیز لای ئەو باسی ئەنوەر پاشاو شەهیدبوون نەکەیت. ئەو شەهیدانێکی زۆری بینیوە، سەربازانێکی زۆریان لەسەر دەستان شەهیدبوونە. دڵی بەرگەی بیستنی وشەی شەهیدبوون ناگرێت."

"ئیدی لای ئەو باسی ئەنوەر پاشا و شەهیدبوون ناکەم. تۆ شوێنی منداڵەکانم نیشان بدە، هەر ئێستا دەبێت بیانبینم."

"شوێنەکەیان پێدەزانم، یەکسەر بڕۆ بیاندۆزەرەوە، بیاندۆزەرەوەو قسەیان لەگەڵدا بکە. تەنها ئەمە بزانە کە عەزیزە درێژ، دەتوانێت راستی و درۆ وا رێکبخات و باس بکات کە

باوەڕی پێبکەن. ئێستاکە تۆ دەچیتە لای منداڵەکان دڵ و دەروونت بە باشی پاك بکەرەوە. یەکەمجار خۆت باوەڕ بە راستی قسەکانت بکە. وەختێك دادێت کە خۆشت تێدەگەیت درۆیەکەت راست بووە. سەیرکە منداڵەکان لەو خوارەوە لەسەر زنارەکان دانیشتوون. ئەگەر تا ئەوەدەمەی دەگەیتە لای ئەوان خۆت باوەڕ بەو قسەیەت کە درۆیە نەکەیت ئێستا مەچۆ لایان. هەموو قسەیەکی درۆ هەر وایە، هەر ئاوایە کە من دەیڵێم."

گمن هەر لە ئێستاوە ناخی خۆم پاککردۆتەوە. هەرگیز درۆ لەگەڵ منداڵەکان ناکەم. ئەمە مرۆڤە، منداڵیش بێت، یەکسەر تێدەگات."

"یاللا بەخێر چیت، تۆ دەتەویست ئەم منداڵانە بە کوشت بدەیت، ئێستاش هەر خۆت دەتەوێت رزگاریان بکەیت. ئادەمیزاد بوونەوەرێکی سەیرە چونکە ئەو کاتەی دەکەوێتە تەنگانە درۆ دەکاتە راستی."

بە بڕوابەخۆبوونەوە گوتی: "وایە." بەرەو لای خوارەوە، بەرەو دەریا، بۆ لای منداڵەکان کە لەسەر زنارێکدا لە تەك یەکدی دانیشتبوون وەڕێکەوت.

وەستا ئارسۆن دێتەوە گوند و لەو دووکانەی کە لە پۆیرازی وەرگرتوە کار دەکات، کوورەکەی دادەمەزرێنێت، هەنبانەی پێستی گامێشێکی گەورەی کە کوورەی پێدەدەفێت داناوە، سندانی لە عەرزەکە جێگیر کردووە. لە رێکخستنی ئامێر و کەلوپەلەکانی دیکەی ماسیگرتن و سەندوقی وەردەواڵەکان یارمەتیانداوە. وەستا زۆر سوپاسی منداڵەکانی کرد. پێشنیازی بۆ کردن پێکەوە کاربکەن. منداڵەکانیش گوتیان دکتۆرەکان بەتەمان خوێندنگە کۆنەکەی یۆنانیەکان رێکبخەنەوەو بیکەنەوەو ئەوانیش لەوێ دەرس دەخوێنن. وەستا ئارسۆن ویستی پارەیان بداتێ، لێیانوەرنەگرت. وەستا ئارسۆن گوتی: "بوەستن منداڵینە، ئێوە لێرە زۆر بێتاقەت دەبن، مەگەر نە؟"

گوتیان: "زۆر بێتاقەت دەبین."

"کەوابوو سەبرێك بگرن، تا ئەوەدەمەی خوێندنگە دەکرێتەوە کارێکتان بۆ دەدۆزمەوە کە کەیف بکەن."

ئەو سندوقانەی کە منداڵەکان بەڕیز لە بن دیوارەکە دایاننابوون یەك یەك کردنیەوە. هەر سەندوقێکی دەکردەوە ژمارەیەك قولابی جۆراوجۆری تێدابوو کە دەبریسکانەوە.

وەستا ئارسۆن ئەژنۆی راستی دانایە سەر سندوقی یەکەم، دوو دانە قولابی لێهێنانەدەر، گوتی: "وەرنە ئێرە لای من." قولابەکانی کە بەدەستیەوە بوون بۆ لای منداڵەکانی درێژکردن: گئەم قولابانە هی لۆفەرن." باسی ماسیی لۆفەری بۆ منداڵەکان کرد. پاشان باسی پالاموت، زارگانا، "زارگانا زیاتر لەسەر ئاو دەخولێنەوە، ئەوان وەك مارماسی، ماسی زۆر بەتامن. ماسیەکانی دیکەش بۆ دانەخۆرەو گرتنی ماسیان بەکاردێن، مەرجان، چیپورا." بە درێژی هەموو ماسیەکانی بۆ باسکردن و روونی کردنەوە. لە یەکێك لە سندوقەکانیش دوو قەمیشی خەیزەرانی دەرهێنا. قامیشەکانی پێکەوە چەسپاندن و قامیشێکی درێژی لێدروست کردن، لە سندوقێکی دیکەش داوی دەرهێنان، قولابەکان و دار پەمۆکانی بە داوەکان لێبەستەوە، داوەکانیشی لەسەری قامیشەکەوە گرێدا، گوتی، بگرن، دروست بوو. پاشانیش: "هەر کە ماسیەکان دەمیان لە قولابدا، یەکسەر رایانکێشن بۆ سەرەوە..."

هەر دووانیان لە دوولای جیاوە گوتیان: "ئەمانە دەزانین."

وەستا ئارسۆن پرسی: "لەکوێ فێربوونە؟"

"ئەوددەمەی کە حەسەنی راکردوو بە بەلەم نەدەچووە دەریا، دەچووە سەر بەردەکانی پشت تەپۆلکەکە، لەوێ لەسەر بەردێك دادەنیشت، قولابەکەی هەڵدەدایە دەریا، هەر کە ماسیەك نووکی لە قولابەکەی دەدا وەك بروسك رایدەکێشایە سەرەوە، ماسیەکە کە بە هەواوە هەڵدەبەزیەوە و دەبریسکایەوە دەیگرت بەرزی دەکردەوە ماوەیەك ئاوا سەیری دەکرد، ئینجا لە قولابی دەکردەوەو هەڵیدەدایە نێو قۆڵتە بەردێکی تەنیشت خۆیەوە."

گقولابیشی دەگۆڕی؟"

حەمدی کە تا ئەوددەم قسەی نەکردبوو گوتی:

گحەسەنی راکردوو بە لەبەرچاوگرتنی شوێنەکان دوو سێ جار قولابی دەگۆڕی، ئێمەش سەیرمان دەکرد. ئێمەش ئەو کارانەی کە حەسەن دەیکردن دەزانین."

لەو رۆژە بەدواوە نزیکەی هەموو رۆژێك منداڵەکان دەچوونە راوەماسی، هەندێك رۆژ حەسەنی راکردووشیان دەچووەلا، دەچووە سەر بەدرێك، ئەوان لەملاو حەسەن لەولا خەریکی ماسیگرتن دەبوون. دواجار حەسەنیش چووە سەر ئەو بەردانەی کە ئەوانی لەسەر دانیشتبوون، لەگەڵ ئەواندا ماسی گرتن. شتگەلێکی زۆر سەبارەت بە دەریا، ماسیەکان، تایبەتمەندیی ماسیەکان فێربوون. ئاه ئەگەر خوێندنگە نەدەبوو ماسیگری باشیان لێدەردەچوو، بە هاوبەشی

بەلەمێکی ماتۆڕداریان دەکڕی، ماسیان دەگرتن و دەیانفرۆشتن. دکتۆر سەرگورد دەیگوت دەوڵەمەندبوون شتێکی گرنگ نیە، مرۆڤ ئەگەر بیەوێت ببێتە مرۆڤ دەبێت دەرس بخوێنێت و سەبارەت بە بارودۆخ و رەوشی دنیا هۆشیار بێت. مەگەر خراپ بوو ئەو هەموو شتە لەبارەی دەریاو ماسیەکان فێربووین؟

منداڵەکان لەسەر زنارەکان دانیشتبوون داوی قولابەکانیان هەڵدابووە خوارێ، کەمێك ماسیان پێش ئێستا گرتبوون لەنێو سەبەتەکاندا هەڵدەبەزینەوە. لەم ئانەدا دەنگێك لە دوایانەوە هات:

"سلاوتان لێبێت." سەریان بۆ دواوە وەرسووڕاند، یەکەم کەس جەمال گوتی: "سلاوت لێبێت." ئینجا حەمدی.

هەستان.

جەمال بە هێواشی گوتی:

"دەزانیت، گوایە ئەو پیاوە خەڵکی گوندەکەی ئێمەیە، دایکم ئەوی بینیوەو نەیناسیوەتەوە، ناوی عەزیزە درێژی ریشسپیە. حەسەنی راکردوو هیچ خۆشی لێنایەت. دەڵێت کەسێکی درۆزنە."

عەزیزە درێژ گەیشتە لایان کە جەمال تازە قسەکەی تەواو کردبوو. قولابی منداڵەکان هێشتا لەنێو ئاوەکە بوو. لەوەی کە عەزیزە درێژ وەکو منداڵ نا وەکو پیاوان سلاوی لێکردبوون، پێیاخۆش بوو. "دانیشن هاورێیان، راوتان پڕ بەرەکەت بێت، چۆن دەڕواتە پێش؟" منداڵەکان دانیشتنەوە، ئەویش شوێنێکی پەیدا کرد و دانیشت.

حەمدی گوتی: گباش دەچێتە پێش، ئەگەر وابڕوات شەو دابێت سەبەتەکە پڕ دەکەین." لەم قسانەدابوو کە ماسیەك نووکی لە قولابی جەمال و دانەیەکیش لە قولابی خۆیدا، قولابەکانیان راکێشا. دوو دانە مەرجانی نەگەورە نەبچووك کە رەنگی سوور و شینیان پەخش دەکرد بە قولابەکانەوە بووبوون. یەکەم جەمال و دوای ئەویش حەمدی ماسیەکانیان لە قولابەکان کردنەوە.

"لە ناوچەکانی ئێمەشدا لە دەریای رەش منداڵان دەچوونە راوەماسی و ماسیان دەگرتن، منیش دەچووم سەیرم دەکردن. گوندەکەی ئێمە لە لێوار دەریا نەبوو تا فێری ماسیگرتن ببین. گوندەکەی ئێمە، یالنیزکوی، گوندی باوك و باپیری جەماڵە. گوندەکەی دیکە، واتە گوندی

نزیك گوندەکەی ئێمە، گوندی باوكو باپیری حەمدیە. دایکەکانتان منیان نەناسیەوە. جەنگ مرۆڤەکان دەگۆڕێت. بەر لە جەنگ چما من ئاوابووم، برسیەتی و نەداری خستمیەتە ئەم رۆژە. باشە با نەمناسنەوە، چ حاڵ و بارێکم بۆ نەماوەتە کە بمناسنەوە. ئەگەر باوك و باپیرتان مابان، شەهید نەبووبان، حاڵ و کاروبارمان وای لێنەدەهات. لەم دنیایەدا بوویەرو رووداوگەلێکی ناهەموار روو دەدەن، باوك و باپیرانی ئێوە ئەوەندە دۆست و برادەری یەکدی بوون کە من لێرە ئێوەم بینی ئاوا دەستتان خستۆتە نێو دەستی یەکدی گوتم بەوان چوونەتەوە. یەك دوو بریندار و پەککەوتە لە جەنگ گەڕانەوە، ئەوان گوتیان کە باوکەکانتان شەهیدبوون، لە ساری قامیش لە چیاکانی ئەللاّهوئەکبەر باوەشیان بەیەکدا کردبوو و ئاوا شەهید بووبوون. هاورێکانتان ئەوانیان هەر لەویّ لە تەك یەکدی ناشتبوو."

عەزیزە درێژ چاوی بڕیە چاوی منداڵەکان:

"ئێوە ئەوەتان دەزانی کە ئاوا بوونەتە برادەری گیانی بە گیانی یەکدی؟"

جەمال گوتی:

"نەماندەزانی."

حەمدی گوتی: "نەماندەزانی."

عەزیزە درێژ گوتی: "ئێستا زانیتان."

حەسەنی راکردوو هاتبوو لە پشت سەریان وەستابوو. ئەوان هیچ ئاگایان لەوە نەبوو کەس لە پشت سەریان وەستاوە، هەروەها ئاگایان لەو ماسیانەش نەمابوو کە لەلای خوارەوە بە قولابەکانیانەوە بووبوون.

کاتێك بەر لە هەموویان جەمال سەری هەڵبڕی چاوی بە حەسەنی راکردوو کەوت لە پشت سەریان وەستاوە، گوتی:

"فەرموو مام حەسەن. لە کوێوە دێیت؟ سەبەتەت پڕە."

"ئەویّ، لە دەوری ئەو بەردانەی پێش دارهەنجیرە رەشەکە لەرە لەری ماسیانە، لە چاو قوچاندنێکدا سەبەتەم پڕبوو."

جەمال گوتی: "ئێرەش هەروایە، ئێرەش ئەمڕۆ پڕە لە ماسی."

قولابەکەی کە لەناو ئاو لەبیر کردبوو راکێشا. مەرجانێکی گەورەتر بە قولابەوە بووبوو. مەرجانەکە کە واپێدەچوو مردبێت، دوای ماوەیەکی درێژ یەك دوو جار لەرزی. حەمدیش قولابەکەی خۆی راکێشا. مەرجانێکی گەورەش بە قولابەکەی ئەوەوە بووبوو.

عەزیزە درێژ هەستاو گوتی:

"خواحافیز، ئینشاللا راوەکەتان پڕ بەرەکەت دەبێت، سەبەتەکانتان پڕ بن."

لەگەڵ حەسەن یەکڕاست ڕێی گوندیان گرتەبەر. لە رێگا لەبارەی منداڵەکانیش قسەیان کرد. عەزیزە درێژ راستیەکەی بۆ حەسەنیش روون کردەوە. بڕیاریدابوو لەمەودوا ئەو قسانەی پێشتر ئەگەر بشیکوژن دووبارە نەکاتەوە. ئەوانەی کە لە چیاکانی ساری قامیش لەسەرمان رەق بووبوونەوەو مردبوون وەکو براکانی باوکە شەهیدەکانی جەمال و حەمدی بوون. ئەوان لە چیاکانی ئەڵلاهوئەکبەر باوەشیان بەیەکدا کردبوو ئاوا مردبوون. منداڵەکانیشیان لێرە بوونەتە برادەری یەکدی.

"سەیرکە حەسەنی برا، سەیرکە دۆستی من، ئەم منداڵانەش لێرەن، لەم دوورگە چۆڵە لە برا باشتر رەفتار لەگەڵ یەکدا دەکەن، هەر لێکجیانابنەوە. ئەگەر ئەمانە بچنە سەربازی، بۆ جەنگ دژی رووسەکان بچنە چیای ئەڵلاهوئەکبەر و لەوێ رەق ببنەوەو بمرن باوەش بەیەکدا دەکەن ئینجا دەمرن."

حەسەنی راکردوو چاوی پڕ بوون لە ئاو، دەست و پێی سست بوون، لە یەك چرکەساتدا هەموو شتێکی لەبەر چاوان وێناکرد، دەستی عەزیزە درێژی گرت، چوو لە پێشی راوەستا، چاوە بڕیە دوڕ چاوی، ماوەیەك ئاوا سەیری کرد، پاشان بە دەنگێکی گرگن و لەرزۆکەوە پرسی:

"واتە دیسان لەگەڵ رووسان دەجەنگین؟"

عەزیزە درێژ بە پێکەنینەوە گوتی:

"ئینشاللا ناجەنگین."

"هیچکەس ناچێتە چیای ئەڵلاهوئەکبەر."

"ئینشاللا ناچێت."

"نیوەی لەشکر رەق نابێتەوە؟"

"رەق نابێتەوە."

"نیوەشیان نابنە خۆراکی ئەسپێیان؟"

"نابنە خۆراکی ئەسپێیان."

حەسەن گوتی: "ئوووە، ئینشاللاّ، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، بە تەنیشت یەکدا دەڕۆیشتن. کە خەریك بوون لە گوند نزیك دەبوونەوە حەسەنی راکردوو دیسان راوەستاو گوتی:

"بگرە ئەم سەبەتەیە، هەموو ماسیەکانی ئەم سەبەتەیە بۆ تۆ. هاوسەرەکەت دەزانێت ماسیان لێبنێت؟"

"هەڵبەتە کە دەزانێت، ئێمە خەڵکی ناوچەی دەریای رەشین. دەوروبەرمان پڕبوو لە دێهاتی یۆنانیان، دەریاشمان نزیك بوو. یۆنانیەکان بەردەوام گۆشتی ماسی دەخۆن. ئێمەش لاسایی ئەوانمان دەکردەوەو ماسیمان دەخواردن. با نیوەیان بۆ تۆ و نیوەشیان بۆ من بن."

"نابێت، هەموویان بۆتۆ، من ئەوەندەم گۆشتی ماسی خواردووە لێیبێزار بوومە. تۆ زارۆك و مارۆکت هەن. خوا دەزانێت تاکو گەیشتوونەتە ئێرە چەندە دەردو بەڵاو نەهامەتیتان هاتۆتەڕێ."

"خوا ئەو دەربەدەریە نسیبی هیچکەس نەکات. هەروا ئەو جەنگە، هیوادارم ئەو بەڵایانەی بەسەر ئێمە هاتن بەسەر کەس نەهێن. من دوای تەمەنێك مرۆڤایەتیم لێرە بینیەوە. بۆ یەکەمجاریش لێرە توانیم ژەمە خواردنێکی تەواو بە دڵی خۆم بخۆم. چاوەکانیشم توانیان کەسانێکی باش ببینن."

حەسەنی راکردوو گوتی:

"منیش دوای تەمەنێك مرۆگەلێکی باش و هەروەها بەهەشتێکم لێرە بینین. لە ماڵەوە تاك و تەنیام. ئێوە ژمارەتان لە ماڵەوە زۆرە، ئەم سەبەتەیە بگرە، بیگرە بەیانیش دیسان. بەیانی بڕیارە بۆ دکتۆرەکان بچمە راوەماسی. هەفتەی یەك دووجاریش بۆ تۆیان دێنم. بگرە ئەم سەبەتەیە."

"بیدە."

"ئەم ماسیانە بەشی دوو رۆژانتان دەکەن."

"ئێمەش دوو رۆژ لە تێری گۆشت ماسی دەخۆین. خوا خێرت بنووسێت." دوای ئەوە، لەلایەك نیشانچی، لەلایەکی دی حەسەنی راکردوو، لەلایەکیشەوە عەزیزە درێژ بە هەموو خەڵکی دوورگەیان گوتوە هەڵەیەك روویداوە و عەزیز ئامینەی بە هەڵە بە کەسێکی دیکە شوبهاندبوو. ئیدی هیچکەس لەبارەی ئەو هەڵەیە هیچ قسەیەکی نەکرد.

چەند رۆژێك دواتر منداڵەکان ماسیان کە خۆیان گرتبوونیان بۆ عەزیزە درێژ کە گوتبووی باوکیان دەناسێت بردبوون. عەزیزە درێژ هەرگیز ئەوەی لە منداڵەکان چاوەڕوان نەدەکرد. خۆشحاڵ بوو.

"هەربژین، پایەدار بن، تەمەندرێژ بن. باوکەکانیشتان کە جێگایان لە بەهەشتە، رێك وەکو ئێوە ئەو دوانەتان بوون. ئەگەر باوکەکانتان ئێستا لە بەهەشت نەبوان و لێرەبوان، ئەوانیش وەکو ئێوە بۆ مامە عەزیزی خۆیان ماسیان دەهێنان." ئەوددەمەی خەریك بوو نزای بۆ منداڵەکان دەکرد، نزاکەی کورتکردەوە، بانگی ژوورەوەی کرد وگوتی: "خانم وەرە، وەرە ئێرە، سەیرکە منداڵەکان چەند زۆر، چەند زۆر." لەوکاتەدا هاوسەرەکەی دەرگای کردەوە:

"ماسیان گرتوون و بۆیان هێناوین!"

ژنەکە هات و سەبەتەکەی لە عەزیز وەرگرت و بردیە ژوورەوە، کەمێك دواتر سەبەتە بەتاڵەکەی دایەوە جەمال و رووی کردە هاوسەرەکەی و گوتی: "ئەمانە، منداڵی ئەو شەهیدانە نین کە لە براش نزیکتر بوون بۆ یەکدی و لە ئامێزی یەکدیدا مردبوون؟"

عەزیزە درێژ گوتی: "خۆیانن."

ژنەکە دوای ئەوەی دوعای بۆ کردن، دەستی بە دەم و چاوی داهێنان و گوتی:

"خوا بۆ دایکتان بهێڵێت. سڵاوم بگەیەننە دایکتان."

دووبارە دەستی بۆ نزاکردن بەرزکردنەوە.

منداڵەکان لەوەی کە عەزیزە درێژ و هاوسەرەکەی ئاوا بە سۆزەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئەوان کردبوو تەریق بووبوونەوە، نەیاندەزانی چیان پێبڵێن.

جەمال گوتی:

"مام عەزیز، بیستوومە تۆ خەڵکی گوندەکەی ئێمە نیت و باوکی منیش ناناسیت، ئێمە هەر جارێك ماسی بگرین بۆ تۆیشی دەهێنین."

حەمدی گوتی:

"ئەگەر سبەی ماسی بگرین، سەبەتەیەکی ئاوا بۆ وەستا ئارسۆن دەبەین. دوای ئەویش دیسان بۆ تۆی دێنین."

"سوپاستان دەکەم."

منداڵەکان دوای ئەوەی کە قسەیان کردبوو کەمێك دەم و پلیان کرابووەوە، هەردووکیان پێکەوە گوتیان:

"ئێمەش سوپاستان دەکەین."

کاتێك چوونە دواوەی ماڵەکەو کەمێك دوورکەوتنەوە تا ئەسکەلە رایانکرد. لەوەی کە هەم باوکە شەهیدەکانیان و هەم عەزیزە درێژی ریشسپیان خۆشحاڵ کردبوو دڵیان نوقمی نێو شادومانی بووبوو. بەلەمێکی ماتۆڕداری شینباوی تاڕادەیەك گەورە لە ئەسکەلە لەنگەری گرتبوو. لە ئەسکەلە ڤاسیلی، هوسمەن، شێخمووس ئاغا و چەند کەسێکی دیکەش وەستابوون، پیاوان و ژنان و منداڵی نامۆ و کەلوپەلەکانیانیان لە بەلەم دادەگرت. زەهراش سەتڵەکەی دابووە بەر شێرەی ئاوی کانیەکە و پڕ ئاوی دەکرد.

جەمال بە حەمدی گوت:

"ئەو کچە دەبینیت، لە شوێنێکی زۆر دوور لەگەڵ باوکی دوورخراوەتەوەو هاتۆتە ئێرە. ئەو خوشکێکیشی هەیە. باوکیشی ریشێکی ماش و برنجی بەسەر چەناگەوە هێشتۆتەوە. دایکم بە دایکی تۆی دەگوت دایکی ئەم کچانە ئەو کاتەی بە کەشتییێکی بچووکەوە هاتوون لە رێگادا مردووە، تەرمەکەیشیان هەڵداوەتە دەریا. لەنێو ئەو دەریایە گەورەیە ماسیی گەورە گەورە هەن، ئەو ماسیانەش تەرمی ئەو ژنەیان یەکسەر هەڵلوشیوە."

حەمدی گوتی: "دەزانم. دایکم پێیگوتم. دایکیشم کاتێك دکتۆرەکان پێکەوە قسەیان کردبوو بیستبووی. ئەو کچەی کە ئاو لە کانی دەباتەوە ناوی زەهرایە."

جەمال گوتی: "دەزانم. هەموان دەڵێن کچێکی وا جوان لە دنیادا بێهاوتایە."

جەمال گوتی:

"بێهاوتایە. هەموان ئەمە دەزانن، هەموانیش دەیبینن."

"بەڵێ وایە. پۆیرازیش عاشقی زەهرا بووە. لە عەشقیدا دەمرێت. باوکیشی زەهرا ناداتە پۆیراز."

جەمال گوتی: "راستە. دوورخستنەوەکەیان تەواو ببێت باوکی کچەکەی دەباتەوەو دەچنەوە وڵاتی خۆیان، لەوێ بە مێردی دەدات."

"پۆیراز بە باوکی کچەکەی گوتوە، بەڵێنت پێدەدەم هەر کاتێك دوورخستنەوەکەت تەواو بوو منیش لەگەڵ تۆدا دێمە وڵاتی ئێوە."

"باوکی قبوڵی نەکردوە."

"کچەکە و پۆیراز زۆر عاشقی یەکدیکەن. ئەگەر باوکی زەهرا نەداتە پۆیراز گوایە شەوێك هەردووکیان پێکەوە دەیانەوێت بچنە نێو دارزەیتوونەکان و هەریەکەو پیرە دارزەیتوونێك بدۆزنەوەو خۆیان بە درەختەکە هەڵبواسن."

"پۆیراز بۆ خۆی قارەمانێکە."

"کچەکەش زۆر جوانە."

"ئینشاڵڵا باوکی رازی دەبێت."

"ئینشاڵڵا."

زەهرا کاتێك سەتڵەکەی پڕ ئاو بوو، چووەوە ماڵێ، لە دواوە سەیریان کرد، پاشان لە ئەسکەلە بەرێکەوتن و چوون لەپێش قامیشەڵانەکە راوەستان. پۆیراز هات، ڤاسیلی ئەو کاغەزەی دایە پۆیراز کە پیرەمێردە تازەهاتوەکە دابوویێ، پۆیراز دوای خوێندنەوەی کاغەزەکە دایەوە دەستی ڤاسیلی و پێیگوت: "جێگایان پێبدە. پاشان وەرەوە لای من."

پیاوەکە لە پۆیراز نزیك بووەوە پرسی: "تۆ کاك پۆیرازیت؟"

پۆیراز گوتی: "من پۆیرازم."

"وەهاب بەگ پێیگوتم سڵاوی لێبکە، گوتی بەمزوانە دوورگەکەی پڕ دەبێت لە خەڵك، با خۆی ئامادە بکات."

"بیستت ڤاسیلی، ئەمانە زۆر ماندوون، خەریکە هەر بە پێوە خەو دەیانباتەوە."

پیرەمێردەکە گوتی: "زۆر ماندووین. چەندین ساڵە لە وەتەی لە دەستی سوپای دوژمن رامانکردوە تاوێك چیە ئارامیمان نەبووە. لە هەر جێگایەك پاروە نانێکمان دەست کەوتبێت وەکو کۆیلەی فیرعەون کارمان کردووە. سێ رۆژ بەر لە ئەمڕۆ کارەکەمان تەواو بوو. خاوەن کێڵگەی پەمۆ کابرایەکی زۆر باش بوو. چەند کوڕ و کوڕەمام و هاوشاری گەنج هەبوون هەموویان لە چاناك قەڵاو گەلیبۆلۆ شەهید بوون. ئەوان شەهید بوون و رزگاریان بوو و ئێمە زەلیل و ریسوا لەم دنیایەدا ماینەوە. بڕستمان لێبڕاوە. چەندین ساڵە یەکبەند بە رێگاوەین، ئەگەر کارێکمان دەست کەوتبێت کردوومانە. گیانمان دەرهات. ئەگەر کاریشمان دەست نەکەوتبوا دزیمان دەکرد. زۆر ماندووین زۆر. سەیری ئەم منداڵانە بکەن، ملیان وەکو لاچکی هەرمێ باریکە هەر ئێسك و پێستن. ئێمە پێش جەنگ وەها بووین؟ زۆر ماندوو بووین زۆر."

"ئینشاللاّ له دوورگەی ئێمەدا پشوو دەدەن."

"ئەم دوورگەیە گۆڕستانی هەیە؟"

پۆیراز کە بەم پرسیارە سەری سووڕمابوو ماوەیەك بێدەنگ ما، پاشان خۆی کۆکردەوەو گوتی:

"هەیەتی. گۆڕستانی شەهیدان."

"باشتر، ئێمەش لە گۆڕستانی شەهیدان دەحەسێینەوە."

"ڤاسیلی ئەم کاکەیە ببە خانووەکەی خۆیان، با پشوویێك بدات. ئەگەر شتێکیان کەم بوو یەکسەر وەرەوە پێمانبڵێ."

پۆیراز لە کاتێکدا دەنگەکان لە گوێیدا دەزرنگانەوە چوو لەسەر نیوتەختێکی نزیك شێرە ئاوەکە دانیشت و ئاوی خواردەوە. بەهەرحاڵ، ئەم خەڵکە کە وەکو مردوان بە پێوە وەستابوون ئەویان لە پەلوپۆ خستبوو. هەستا، چووە لای دکتۆرەکان، رەوشەکەی بۆ روونکردنەوە. دکتۆرەکانیش زۆر نیگەران بوون. سەلمان سامی وەکۆکە هات، زۆری نەمابوو بخنکێت، خەلیل رەفعەت جامێك ئاوی هێنا، دکتۆر ئاوەکەی خواردەوە، کۆکەکەی نەما. روخساری دکتۆر سوور سوور هەڵگەڕا، دەتگوت لە هەموو گیانی خوێن دادەچۆڕێت. خەلیل رەفعەت زارکی شووشەیەکی کردەوە، لەپێش لووتی ئەوی نزیك کردەوە، کۆکەکە هێواش هێواش تەواو بوو. سەلمان سامی سەرتاپای شەلاّڵی ئارەقە بووبوو. سەرو قژو روخساری هەموو تەڕ بووبوو. چاوەکانی داخستبوون و پشتی بە کورسییێکەوە دابوو.

کەمێك دواتر چاوەکانی کردەوەو گوتی:

"خەلیل کەمێك ئاوم بدەرێ. من بۆچی واملێهات؟"

خەلیل ئاوی بۆ برد و گوتی:

"لەبەر ئەوەیە کە زۆر نیگەران بوویت. لەو نەشتەرگەریانەش کە لێیان بێئومێد دەبوویت ئاوا کۆکەت دەگرت قوربان."

هەروا کە دکتۆر سەلمان سامی ئاوی دەخواردەوە، پۆیراز کە کەمێك پێشتر چووبووە دەرێ هاتەوە.

خەلیل رەفعەت کورسیی تەنیشتی نیشانداو گوتی:

"فەرموو دانیشە کاك پۆیراز."

پۆیراز کاتی دانیشتن گوتی:

"من ببوورن دکتۆر، من کە ئەوانم بینی ئاوا سەرو دڵم تێکئالآن قوربان، ببوورن."

دکتۆر بەڕاوێژێکی زۆر جیددی گوتی:

"کوڕم، مەگەر تۆ جەنگت هەڵگیرساند کە داوای لێبووردن لەمن دەکەیت؟ لە هەموو شەڕێك هەر تەنها ئەوانەی دەجەنگن ناکوژرێن، ئەوانەی کە ناجەنگن زۆر زیاتر دەکوژرێن. منداڵ و ژن و پیرەکانیش دەمرن. مرۆڤ مرۆڤبوونی خۆی لەدەست دەدات. جەنگ هەر جەنگێك بێت هیچ خێر و چاکەیەکی بۆ مرۆڤ تێدا نیە. هەموو جوانیەکانی مرۆڤ نابوود دەکات. جەنگ، ئایندەی مرۆڤەکانیش لەنێو دەبات. مرۆڤی دوای جەنگ، ئیدی ئەو مرۆڤەی پێش جەنگ نیە. مرۆڤەکان دوای جەنگ برینی وایان تێدەکەوێت کە ئیدی سارێژ نابن. بەهای مرۆڤبوون وا ون دەکەن کە ئیدی هەرگیز ناگەڕێتەوە. ئەگەر ئەو نەفرەتەی کە پێیدەگوترێت جەنگ درێژە بکێشێت، مرۆڤایەتیش لەنێودەچێت. دەڵێن بەدەستی خۆت ماڵی خۆت وێران بکەیت ئێمە چیبکەین، ئەگەر مرۆڤ بیەوێت بەدەستی خۆی خۆی لەنێو ببات، باشە بابیکات، چۆنی پێخۆشە با وابکات، بەڵام دنیاش لەگەڵ خۆیدا وێران دەکات و لەنێو دەبات، ئەگەر مرۆڤ دەهاتەوە سەر عەقڵ و باش دەبوو، زۆر باشتر دەبوو. ئەگەر ڕۆژانە یەك تۆزقاڵ دەبووە مایەی جوانترکردنی دنیا چەند باش دەبوو. ئەم ئادەمیزادە بۆچی هێندە دوژمنی خۆیەتی، بۆچی ئەوەندە دوژمنی جوانیەکانی دنیا، نەیزەکەکان و هەموو شتێکی ئەم دنیا بە گوڵ و بۆنی وەنەوشە و ڕەنگی گوڵان و ئاوازی مەلان و هەڵبەز و دابەز و قەڵەمبازی کارمامزەکانە، بۆچی هێندە دوژمنی ئەو تیشك و ورشە و ڕۆشناییانەیە کە ڕۆژانە هەزاران و ملیۆنانیان لێدەبینین، ئەم ئادەمیزادە، ئایا لەبەر ئەوەیە کە خۆی میوانی ئەم دنیایەیە و فانیە؟ لە کاتێکدا مرۆڤ ئەگەر بیویستبوا تەنانەت دەیتوانی جوانی بە مردنیش ببەخشێت. مرۆڤ دروستکراوە تاکو یەکەمجار جوانی بەخۆی و ئینجا بە هەموو شتێکی دنیا ببەخشێت. واتە دەیتوانی لەجیاتی ئەوەی کە هەموو شتێك ئاوا ناحەز و دزێو دەکات لە نوێوە جوانیان پێببەخشێت. دەیتوانی کاتێك لێرە دەڕۆیشت ئاوا نوقمی نێو خوێن و کۆیلەی هەڵقە لەگوێ نەڕوات. دەیتوانی بە چەشتنی تام و چێژی دنیاو مرۆڤەکان و میهر و خۆشەویستی و جوانی و هاوڕێیەتی بڕوات. ئەودەم مەگەر کەس لە مردن دەترسا، کەسێك کە بێوچان لەگەڵ جوانیەکان دەبوو و بێوچان داهێنانی دەکرد کاتی ئەوەی نەدەبوو بیر لە مردن بکاتەوە، تەنانەت ئەگەر کاتی ئەوەشی

هەبوا ئەوەندە لە مردن نەدەترسا، تاك و تەنیا رووەو مەرگ دەچوو. بۆخۆی بەهەشت و دۆزەخی دروست نەدەکرد."

دکتۆر سەلمان سامی دەتگوت هەموو ئەوانەی دەوروبەی لەبیر کردوون و تەنها بۆ خۆی قسەی دەکرد.

درێژەی دایێ: "ناتوانم باوەڕ بەو رووداوانە بکەم، ناتوانم بەرگە بگرم."

بێدەنگ بوو، دەستماڵی لە گیرفانی دەرهێنا، نێوچاوان و سەرو قژی پاککردەوە.

ڤاسیلی کە بە رەنگهەڵبزرکاویەوە هاتبووە ژوور گوتی:

"قوربان ئەوانە هەموویان نەخۆشن، هەموو گیانیان داڕزاوە، هەموویان دەمرن. تەنها ئەو پیرە مێردە بەسەر پێوەیە، ئەوانی دی توانای بەسەر پێوە وەستانیان نیە."پۆیراز بە ئاماژەی چاو و ئەبرۆ ڤاسیلی تێگەیاند قسە نەکات، ڤاسیلی یەکسەر بێدەنگ بوو. دکتۆر سەلمان سامی کە ئەمەی بینی بە راوێژێکی لێبڕاوانە و فەرماندەرانە گوتی:

"قسە بکە ڤاسیلی."

ڤاسیلی دەستی بە قسەکردن کرد:

"ئەو پیرەمێردە گوتی کە لە حەوشەی باڵەخانەی حکومەتی کەسانێکی زۆر هەبوون. حاڵی هەمووشیان بە بەراورد لەگەڵ ئەمانەی هاتوونەتە ئێرە خراپترە. وەهاب بڕیاربوو لەوانە کەسانێکی زۆر بنێرێتە ئەم دوورگەیە، بڕیار بوو دوورگەکەمان پڕ بکرێت لە خەڵك. دەیانگوت لەم دوورگەیەی ئێمەدا دوو دکتۆری گەورە هەن، ئەو دکتۆرانە نەك تەنها نەخۆش بەڵکو مردووەکانیش زیندوو دەکەنەوە."

سەلمان سامی گوتی: "دەبینین، هەم زیندوان، هەم مردوان مەگەر کارێکی دیکەشمان هەیە؟"

"هەر کارێکی بتانەوێت بیکەن، سەر سەرو سەرچاومان."

دکتۆر سەلمان سامی کە ئارەقەکەی وشك بووبووەوە، هاتەوە سەرخۆی. هەستی دەکرد بۆ هەرکارێك ئامادەیە. دکتۆرەکان شەو کە داهات بۆ ماڵی تازەهاتوەکان چوون لە ماڵەکاندا جگە لە کابرای پیرەمێرد هەموو ئەوانی دیکە لەسەر بەڕەو جاجمی کۆن و نیمدەرو ژێر لێفەی پیس و چڵکاوی و دڕاو خەوتبوون. سوپاس بۆ خوا کە دکتۆرەکان لەبەر ئەوەی رەوشەکەیان دەزانی داو دەرمانێکی زۆریان لەگەڵ خۆیان بردبوو. میوانە تازەکان ناو خانووەکانیان بە بۆنی

گرمخاوی خۆیان وا پڕ کردبوون کە مێشکی مرۆڤیان دەهەژاند. لەگەڵ پیرەمێردەکە لە ماڵ هاتنەدەر.

سەلمان سامی لە کاتێکدا کە رووی ترش کردبوو گوتی: "ئەمە چ رەوشێکە؟ ئەمانە زۆر دەمێکە مردوون کەسێك نیە رۆحی بە ئاگا هاتبێتەوە."

پیرەمێردەکە گوتی:

"راستە کاك دکتۆر، ئێمە مردووین و نەخۆمان ئاگامان لێیە و نە هیچکەسی دیکە. خواخێرتان بنووسێت. جەنگ ئێمەی برسی و رووت و رەجاڵی تا ئێرە هێناو بەنێو ناوچە مەلاریاگرتوەکاندا دووری خستینەوە. کەسانێکی زۆر لە رێگادا مردن. رێگاکان پڕ بوون لە مردووی بێگۆڕ. لەگەڵ هاتنی سەربازانی رووس ئێمەش رامانکرد."

سەلمان سامی گوتی: "پۆیراز هاوڕێم، ئەمجارەش چاودێریکردن و پێڕاگەیشتن بەمانە بە ئەستۆ بگرە. ئەمانە برسی و تێنوون. دەتوانیت ئاشیان بۆ بنێریت؟"

پۆیراز گوتی: "باشە ئاشەکە خەریکە ئامادە دەبێت."

سەلمان سامی گوتی: "تۆ لەگەڵ ئێمە وەرە با ڤاسیلی بچێت ئاشەکە بێنێت. دوورخراوەکانی ئەنەدۆڵ هەزار جار حاڵیان لە دوورخراوەکانی یۆنان خراپترە. نازانم دەبێت چیبکەین." و دەستی خستە سەر شانی پۆیراز و داما.

"ئەگەر وەهاب بەگ ئەوانەی دیکەش بنێرێت؟"

"تۆ دەڵێیت چیبکەین؟"

سەلمان سامی دوای ئەوەی یەك دوو هەنگاو بۆ لای پیرەمێردەکە چووە پێش کە لە تەنیشتی بوو پرسی:

"تا ئێستا لە کوێ بوون؟"

"هەنجیرمان کۆدەکردنەوە، هەنار، خۆخ، پەمۆ، ئەو کارانەمان دەکرد، گوتیان ئیدی ناتوانین کارتان بدەینێ، ئێمەش چووینە لای حکومەت، حکومەتیش ئێمە رەوانەی ئەم دوورگەیە کرد. زۆر ماندوو بووین. خوا لە ئێوەو لەوانیش رازی بێت."

سەلمان سامی بە رووی ڤاسیلیدا پێکەنی:

"تۆ گەنجتری ڤاسیلی، ئەگەر زۆر لەبەرەکانی جەنگ بوویت، گەنجیت، بڕۆ یارمەتی خەلیل رەفعەت بەگ بدە با دەرمان بداتە نەخۆشەکان، دەرزیان لێبدات."

"سەرچاو کاك دکتۆر."

"ئێمەش با بچینە سەرکانی کەمێك پێکەوە قسە بکەین."

پۆیراز گوتی: "بابچینە ماڵەوە قوربان، دایکە لێنا چایەکی بۆنداری دەم کردوە. زۆرباش بوو کە ئێوە لێرەن کاك دکتۆر، نازانم ئەگەر ئێوە لێرە نەبوان ئێمە چیماندەکرد."

چوونە ماڵی پۆیراز، دکتۆر سەلمان سامی ماڵەکەی زۆر بەدڵ بوو، گوتی:

"چەند جوانە، خانووەکانی ئێمەش جوانن، بەڵام ئەمە جوانترە."

پۆیراز گوتی:

"خوا دەزانێت ئەو کەسەی کە ئەم خانوەی دروستکردوە وایزانیوە تا ماوە لێرە دەمێنێتەوە، خوا دەزانێت بە چ کەیف و سەفایەکەوە ئەم خانوەی وا دروست کردوە. ڤاسیلی گوتی خاوەنی ئەم خانوە تەنها هەر ساڵێك تێیدا مایەوە. لێنا دەڵێت کە بۆ یۆنان دەڕۆیشت نەیدەتوانی خانوەکەی بەجێبهێڵێت و دڵی هەر لەسەر خانوەکەی بوو. کە بەرەو بەلەمیش رایدەکرد، لەنیوەی رێگا هەر ئاوڕی لە خانوەکەی دەدایەوە تاوێك ئاوا سەیری دەکرد. کاتێکیش بەلەم وەرێکەوت تا دوا سات بە پێوە بوو و چاوی بڕیبووە خانوەکە. ئێستا ئێمە هاتین لەسەر خانووی ئەوانمان داکوتاوە."

هەموان بۆ میوانەکان نان و ئاویان برد. دکتۆرەکان بە نەخۆشەکانیان راگەیشتن هەم ئەوانەی یارمەتیان دەدا و هەم ئەوانەی یارمەتی دەدران هەموو لایەك خۆشحاڵ بوون.

بۆ ماوەی سێ چوار رۆژ چەندین بەلەمی پڕ سەرنشین هاتنە دوورگە، سەرنشینەکانیان دادەبەزاندن و دەڕۆیشتن، نزیکەی هەموو خانوەکانی دوورگە پڕ بووبوون لە خەڵك، تەنها پازدە خانوو چۆڵ مابوون. رێڤینگە تازەهاتوەکان ماندوو بوون. ژمارەیەکیان نەخۆش بوون، جلی شڕو دڕاویان لەبەر بوو. هەمووشیان بڕە پارەیەکی زۆر کەمیان پێبوو. پێش ئەوەی بێنە ئێرە، هەندێکیان لە کاری کشتکاری و بەرهەمهەڵگرتنەوەی خۆخ، هەنار، هەنجیر و پەمۆ کاریان کردبوو. دەستیان بە داهاتەکەیانەوە گرتبوو و توانیبوویان کەمێك پارە پاشەکەوت بکەن. لەنێو ئەو خێزانانەی هاتبوون تەنها رەوشی پێنج خێزان باش بوو. ئەوان چونکە گۆڕدرابوونەوە حکومەت بڕە پارەیەکی نەختی پێدابوون.

دوای ئەوەی کە ئەوان هاتن و لە خانوەکاندا جێگیر بوون، شوکری ئەفەندیش لەگەڵ هەژدە کەس بۆ بڕینەوەی هەنگەکان هات. هەرکاتێك کاتی بڕینەوەی غەڵێفەکان دادەهات شوکری ئەفەندی ئەو وەستایانەی بڕینەوەی هەنگوینی بۆ بڕینەوەی ئەو غەڵێفانەی دەیکڕین، دەبردن.

وەستاکان یەکەمجار سەرێکیان بەسەر غەلێفەکاندا گرت و پاشان هاتنەوە لای شوکری ئەفەندی، گوتیان ئێمە تا ئێستا غەلێفەی وا پڕ هەنگوینمان نەبینیوە. غەلێفەی وا کە بۆنی هەزار و یەك جۆرە گوڵ و کوریکان دەدەن. شوکری ئەفەندی زۆر خۆشحاڵ بوو و پۆیراز و موسا کازم ئاغا و ڤاسیلی و نیشانچی لەگەڵ خۆ هەڵگرتن و لەگەڵ هەنگوینفرۆشەکان بۆ لای غەلێفەکان چوون. موسا ئاغاش شتگەلێکی لەبارەی هەنگان دەزانی. ئەویش لە کێڵگەکەی خۆیدا هەندێك غەلێفەی هەبوون. پزیشکی ئاژەڵان کاتێك بیستی ئەوان بۆ لای غەلێفەکان رۆیشتوون. بەدوایاندا رایکردو گوتی: "منیش لەوەتەی بە بیرمە لە هیچ جێگایەك غەلێفەی وا پڕ هەنگوین و هەنگوینی وا سپی شانەم نەبینیوە. من لەنێو هەنگاندا گەورە بوومە."

پۆیراز گوتی:

"سەیری ئەم دوورگەیە بکە، هاوین وا رەت دەبێت، هێشتا دوورگە پڕ لە گوڵە. بڕۆنە ئەو دوورگە بچووکانەی کە تا ئێستا کەس پێی تینەناون سەیر بکەن، ئەوێش ئاوا پڕ لە گوڵن."

وەستای هەنگوینفرۆش گوتی:

"تێناگەم یۆنانیەکان بۆچی هەنگی زیاتریان بەخێو نەکردوون، کارێکی دروستیان نەکردوە، سەرم لەو کارەیان دەرناچێت. ئەم دورگانە پڕن لە گوڵ، نەك تەنها ئەم غەلێفانە بەڵکو سەدان غەلێفەش پڕ دەبن لە هەنگوین."

پۆیراز گوتی: "خوا دەزانێت، دڵنیابە هۆکارێك هەیە."

هەموان پێکەوە گوتیان: "هەر خوا دەزانێت." ئەو غەلێفانەی کردبوونیانەوە بۆن و بەرامەیەکی وایان دەدا مرۆیان مەست و کاس دەکرد و کەس نەیدەویست لەبارەیانەوە قسە بکات.

کاتێك خەریك بوون لە شوێنی هەنگەڵانەکان دەچوونە خوارێ پۆیراز راوەستاو گوتی:

"شوکری ئەفەندی، دکتۆرە بەڕێزەکان، وەرن کارێك بکەین." ئەوانی دیکەش راوەستان، دکتۆر سەلمان سامی پرسی: "چ کارێك؟"

پۆیراز کەوتەوەڕێ:

"لەو خوارە دابنیشین و قسە بکەین."

شوکری ئەفەندی گوتی: "لەوە باشتر نابێت." پاشان پرسی: "ئێوە لەگەڵ بەڕێز پزیشکی ئاژەڵان ئەم غەلێفانەتان لە فەرمانگەی دارایی کڕیون، وایە؟"

پۆیراز گوتی: "بەڵێ."

دکتۆر سەلمان سامی پرسی: "ئێوە مووچەکەی خۆتان هێناوەتە شارۆچکە؟"

پۆیراز لە دڵی خۆیدا گوتی ئەم پیاوە بۆچی ئەو پرسیارەی کرد. بە پێکەنینەوە گوتی: "هێناومە."

دکتۆر گوتی: "ئێمەش هێناومانە. لێرە مووچەوەرگرتن ئاسانە."

سەرەوژێر بوونەوە، چوونە نۆرینگەی دکتۆرەکان.

لەگەڵ دانیشتن سەلمان سامی گوتی:

"دەزانن دەمەویست چی بە ئێوە بڵێم، چیتان لێبپرسم؟"

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "نازانین."

"ئێستا لە شوکری ئەفەندی دەپرسم، دەتوانین چەند هەنگوین لەو غەڵێفانە بەدەست بێنین؟"

شوکری ئەفەندی گوتی: "زۆر."

"چەند خێزان هاتوونەتە ئێرە؟"

ڤاسیلی گوتی: "زۆرن، نەمژماردون، وەلـێ تەنها پازدە خانوو بە چۆڵی ماونەتەوە."

"تازەهاتوەکان زۆر پەرێشانن، نەخۆشن، هەژارن، سەرو بەرێکی بێسەرو بەریان هەیە، لێف و دۆشەکیان نیە. ئەگەر یارمەتیان نەدەین ناتوانن ئەم زستانە بەرێ بکەن. دوورگە بەهەشتیەکەی ئێمەش پڕ دەبێت لە گۆڕستان. ئەمانە، گوتم کە زۆر بێچارەو هەژارن."

ڤاسیلی گوتی:

"جەنابی سەرگوردی بەڕێز، ئەوان ئەوەندەش کە پێدەچن هەژار نین. ئەوان لەسەر کارەوە دێن. ژێر بالیفەکانیان نەك بۆ زستانێك بەڵکو بۆساڵێکیش پارەیان تێدایە."

دکتۆر سەلمان سامی پێکەنی:

"ئەوان بالیفیان هەر نیە کە ژێر بالیفیان هەبێت." هەموان پێکەنین. "راستە کە بالیفیان نیە، لەناو ئەو کیسانەی کە بە شەمێی هەنگوین بەژێر کورسیەکانەوە چەسپاندوویانن پارەیان داناوە. ئەو بڕە پارانە نەك بۆ زستانێك بۆ ساڵێکیش زیاتر بەشیان دەکات."

سەرگورد گوتی: "بە یەکێکیان بڵێین بابێت قسەی لەگەڵدا بکەین بزانن حاڵ و رەوشیان چۆنە."

پۆیراز گوتی: "با لێیانبپرسین. ڤاسیلی بڕۆ یەکێکیان کە عاقڵ و هۆشیار بێت بانگ بکەو بیهێنە بۆ ئێرە."

ڤاسیلی گوتی: "یەکێکیان پێدەچێت کەسێکی زۆر وریا بێت، عوسمان چاوەش یەك قاچ، لە زیندووماوەکانی ساری قامیشە."

سەرگورد گوتی:

"تۆ چی دەڵێیت ڤاسیلی؟ چی دەڵێیت؟ واتە هەم کەسێکی زۆر گرنگە و هەم قارەمانیشە، تەنانەت قارەمانی قارەمانانە. یەکێك لەو کەسانەی کە لەبەرەی ساری قامیش بەبێئەوەی ببێتە خۆراکی ئەسپێیان و لە چیادا رەق ببێتەوەو شەهید بێت بە تەنها یەك قاچەوە خۆی دەرباز کردووە. من لە ناخی دڵەوە ئەو کەسانەم خۆشدەوێن کە گیانی خۆیان لە ساری قامیش و چاناك قەڵا دەرباز کردوە. ئەوان بەڕاستی کەسانێکی زۆر تایبەت و گرنگن. ڤاسیلی زوو بچۆ ئەو پیاوە نموونەییەم بۆ بێنە تاکو روخساری پیرۆزی ببینین."

ڤاسیلی و عوسمان یەك قاچ لە چاوتروکانێکدا هاتن.

دکتۆر سەلمان سامی گوتی: "فەرموون دانیشن. بەخێر بێن، سەفاتان هێنا. عوسمان چاوەش، بەرلەوەی خۆت بێیت ناو و ناوبانگت گەیشتبووە ئێرە. بەخێر بێیت بۆ دوورگەکەمان."

"سوپاست دەکەم جەنابی سەرگورد. هەر بژیت، بەڵام ئێمە کەوتووینەتە دەردەسەریەوە."

"چیبووە؟"

"نزیکەی هیچکەس نەچۆتە ناو خانووەکان هەر کەسێك چۆتە ژووریّ، یەکسەر هاتۆتەدەر. نیمدەر و لێفە و قاپ و هیربار و کەلوپەلەکانی دیکەشیان هێناونەتەدەر."

"بۆچی؟"

"ئێمە لەوەتەی هاتووین، لە دەرەوە دەخەوین."

"بۆچی؟"

"دەڵێن حکومەت ئەم خانوانە بە ئێمە نادات، بڕیارە هەر لەگەڵ ئەوەی گۆڕدراوەکان لە یۆنان بێن حکومەت ئێمە لە خانوەکان وەدەر بنێت و ئەوان بخاتە نێو خانوەکان."

سەلمان سامی کە دەستپاچە بوو بوو و ئارەقەی کردبوو گوتی:

"یانی چی؟ چۆن؟ چۆن؟ چۆن؟ زۆرباشە، عوسمان چاوەش تۆ پێتنەگوتن ئیدی گۆڕدراوەکان هەموویان هاتوون؟ ئەوان هەموویان نیشتەجیّ کراون. ئیدی کەس نەماوە تاکو بهێت."

"گوتم. هەموو شتێکم پێگوتن، باوەڕیان نەکرد. سێ خێزانی گۆڕدراوەمان لەگەڵدان. زۆربەی ئەو کەسانەی کە لێرەن ئەوانەن کاتێك کە گۆڕدراوەکان هاتن لە گوندەکانیان وەدەرنران."

دکتۆر سەلمان سامی سەری خۆی گرتە نێو هەردوو دەستی و کەوتە بیرکردنەوە: "ئێستا چیبکەین؟" دەستەکانی خۆی لەسەری کردنەوە. "بێژە عوسمان چاوەش، ئێستا چیبکەین؟"

"ژنەکان ناچنەوە ژووری. منیشیان بە زۆری هێنایە دەرەوە. ژنەکەی منیش لەگەڵ ئەوان دایە. دەڵێن ئەگەر ئەم زستانە وەدەریمان بنێن زەلیل و ماڵوێران و پەرێشان دەبین، دەڵێن لەنێو دەشتی ئایدیندا بێماڵ و حاڵ و بێسەرپەنا دەمێنینەوە. دەڵێن هەر ئێستا ئەم دوورگەیە بەجێبهێڵین و بچین بۆ خۆمان نەك کۆشك بەڵکو سەرپەنایەك لە کوخی بە قامیشان دروستکراو پەیدا بکەین."

"باشە عوسمان چاوەش ئێمە ئێستا دەبێت چیبکەین؟ ئێمە چەند بیرۆکەی باشمان بۆ ئێوە هەبوون. ئێستا دەتوانین چیتان بۆ بکەین، من دەتوانم چیبکەم؟"

" دەتوانیت زۆر شت بکەیت، دەتوانیت بچیت قسەیان لەگەڵدا بکەیت."

"چی؟"

"دەتوانیت بچیت قسەیان لەگەڵدا بکەیت."

"کەواتە، خێرا پێیانبڵێ با هەموویان بێنە ئەسکەلە، ژێر دارچنارەکان."

ڤاسیلی گوتی: "پێویست ناکات. زۆر لەمێژە بەخۆیانو کۆڵەبارەکانیانەوە چوونەتە ئەسکەلە، لەژێر چنارەکانن."

"هەستن بابچین. من قسەیان لەگەڵدا دەکەم، رازیان دەکەم. گوتت هیچ ناڵێن؟"

ڤاسیلی گوتی: "ئەم دیوارە قسە بکات ئەوان نایکەن."

سەلمان سامی گوتی: "دەبێت لە خەڵکی بێدەنگ بترسیت، مرۆڤ کاتێك بێدەنگ بێت، ناتوانێت هیچشتێك بکەیت."

عوسمان یەك قاچ بە دڵنیاییەوە گوتی: "دەتوانیت."

"چۆن؟"

"سەرگورد جلەکانت دەپۆشیت و بە شێوەیەکی فەرمی قسەیان لەگەڵدا دەکەیت. کاراجا ئەلیف، سەرە ژنێکە و کەمێکی بەسەروبەرە، رووبەڕوو قەسەت لەگەڵدا دەکات، ژنێکی بەزار و پل و بەسەروبەرە. تۆ هەرچی پێیبڵێیت ئەو تووڕە نابێت، دەبێت بە زمانێکی نەرم بیدوێنیت و

تێیبگەیەنیت. ژنێکی میهرەبانە. ئەگەر بتوانیت رازی بکەیت، ئەوکات ئێمەش ئەم بەهەشتەی خوا و ئەم مرۆڤە نموونەییانە بەجێناهێڵین."

"ئێوە بڕۆنە ئەسکەلە، من خێرا دەچم جلە سەربازییە فەرمییەکەم دەپۆشم و دێمە ئەوێ. دڵم بۆ یۆنیفۆرمەکەم تەنگ بووە. جلە سەربازییە خوێناویەکەم ناپۆشم، ئەو جلەم یادگارییە. جلێك دەپۆشم کە قەت نەمپۆشیبێت."

هاتنە سەر ئەسکەلە، هەموو خەڵکی دوورگە، کۆنەکان و تازەهاتوەکان، منداڵ و پیر و گەنج لە ئەسکەلە لەژێر چنارەکان بوون.

سەرگورد بە یۆنیفۆرمی نوێ و چەکمەی بریقەداریەوە وشك و لێبڕاوانە هات لەسەر ئەسکەلە راوەستا، دەستەکانی خستنە سەر تەرۆکی، دوای ئەوەی سەری خۆی بەنێو خەڵکەکەدا سووڕاندو سەیری ئەو خەڵکەی بەرامبەر خۆی کرد، گوتی:

"هاتن بە منیان گوت ئێوە بۆچی لێرە کۆبوونەتەوە. بۆچی نەهاتن کێشەکەتان لەگەڵ مندا باس بکەن، دەبوا هاتبوان بەمنتان گوتبوا، دەبوا بتانگوتبوا. چونکە ئێمە لە جەنگی چاناك قەڵا." دەستی بۆ لای کڵێسای وێرانکراو درێژکرد، "ئێمە ئەو کڵێسایەمان کردبووە نەخۆشخانە، کڵێساکە ئەو کات ئاوا وێران نەکرابوو، دوای رۆیشتنی یۆنانیەکان، کافرێك هات و وێرانی کرد. کەرپووچ و تەختە و وێنەکانی حەزرەتی عیسا و هەرچی لەنێو کڵێسادا هەبوو هەڵیگرت و بردی فرۆشتی. ئێمە هەموو ئەو بریندارانەی لە چاناك قەڵاوە دەیانهێنان دەرمانمان دەکردن. ئێمە چواردە دکتۆر بووین، بە مانگان نەخەوتین. ژنەکانی ئەم دوورگەیەش لەگەڵ ئێمە بوون و بێئەوەی کە بخەون شەو و رۆژ کاریان دەکرد، چاودێری نەخۆش و بریندارەکانیان دەکرد. ئێمە دوای تەواوبوونی جەنگ لەگەڵ هاوڕێمان کاك دکتۆر خەلیل رەفعەت هاتینە ئەم بەهەشتەی کە خۆمان پێمانخۆشە و نیشتەجێ بووین. ئێستا کە ئێوەیان ناردۆتە ئێرە، قەباڵەشتان پێیە، هیچکەس ناتوانێت خانوە جوانەکانتان لێبستێنێتەوە. سەیرکەن، ئەم پیاوە، پۆیراز، لەبەرەی ساری قامیش دژی رووسان، لەبەرەی ئورفا دژی فەرەنسییەکان جەنگاوە، بریندار بووە، ئەو بەو تەمەنە گەنجیەوە بەهۆی کەمئەندامبوونیەوە خانەنشین کراوە. قارەمانێکە کە مەدالیای جەنگی سەربەخۆیی هەیە. من و ئەم کاك دکتۆر خەلیل رەفعەتە لە چاناك قەڵاو لەم دوورگەیە پێکەوە کارمان کردوە. ببینن لێرە ژمارەمان یەکجار زۆرە، باوەڕ بە ئێمە بکەن، هیچکەس ناتوانێت ئێوە لەم دوورگەیە بۆ جێگایەکی دیکە بنێرێت. زووبن یەکڕاست بڕۆنەوە ماڵەکانتان، بڕۆنەوە بۆ

ئەو خانوانەی کە هاوڕێی هێژامان کاك ڤاسیلی نیشانتانی داون، حەمام بکەن، پشوو بدەن. هەموو خانوەکان گەرماوی خۆیان هەیە. نەخۆشەکانیشتان ئێمە چاودێریان دەکەین. تەنانەت ئەو شارۆچکەیەی کە ئێوەی لێهاتوون دوو دکتۆری نیە. ئێمە لێرە هەم نۆژداری دەکەین و هەم بۆ منداڵەکانتان خوێندنگە دەکەینەوەو وادەکەین دەرس بخوێنن. یاڵلا بڕۆنەوە بۆ ماڵەکانتان."

"ببینە دکتۆر، بەقوربانت بم، تۆ کەسێکی باشیت، قسەی باش دەکەیت، بەڵام لێناگەڕێن ئێمە لەو خانوانەی کە هەر یەکێکیان دەڵێیت کۆشکێکە دابنیشین. چلەی زستان دێن و دەڵێن ئەی قەرەجینە، ئێوە شایستەیی ئەم خانوانەتان نیە، گۆڕتان گوم بکەن و بڕۆن. دەمانبەنە بناری چیایەکی رەق و رووتەن و لەوێ ئاکنجیمان دەکەن. تۆ دەزانیت ئاکنجیکردن واتە چی، دکتۆری میهرەبان؟"

سەلمان سامی هەموو توانای ئاخاوتنی خۆی خستەکار و بۆ کاراجا ئەلیف و خەڵکەکەی دیکە قسەی کرد.

کاراجا ئەلیف گوتی:

"تۆ نەتبینیوە ئاکنجیکردن چیە کاك دکتۆر، ئەوان بشمرن ناهێڵن ئێمە لەم خانوانەدا نیشتەجێ ببین. ئەوەندە بەسە ئەو هەواڵەیان بکەوێتە بەرگوێ کە ئێمە لەم دوورگە جوانە لەنێو ئەم خانوانەی کە دەڵێیت کۆشکن نیشتەجێین، هەر ئەوە بزانن یەکسەر دێن وەدەرماندەنێن و خانووەکانمان لێدەستێننەوە، هەر خواش دەزانێت بەو چلەی زستانە رەوانەی کوێمان بکەن. کاك دکتۆر، بەقوربانت بم، بهێڵە بەر لەوەی زستانمان لێدابێت بۆ خۆمان بچین بەو بڕە پارەیەی بە هەزار کوێرەوەری بەدەستمان هێناوە کۆڵێتە ڤامیشێك پەیدا بکەین. تۆ مرۆڤێکی باش و بێغەل و غەشی دکتۆر، کارێك مەکە کە لە ناوەڕاستی زستاندا لێرەمان دەربکەن و بە کوشتنمان بدەن. ئێمە کە ئێستاکەش نیوە گیانین."

دکتۆر لە کاتێکدا شەلاڵی ئارەقە بووبوو و روخساری سوور سوور هەڵگەڕابوو قسەی دەکردو بیڕاوەستان دەستەکانی بۆ ئەملاو ئەولا تەکان دەدان و لەملاشەوە کاراجا ئەلیف و ژنەکان و منداڵەکانی دیکە وەڵامیان دەدایەوە:

"لێمانگەڕێ با ئێمە بڕۆین."

"ئێمە هەموومان نیوە گیانین."

"بە چلەی زستانێ لێرەمان دەردەکەن و ئێمەش دەمرین."

"کێ ئامادەیە ئەو جۆرە خانوانە بە ئێمە بدات؟"

"هەڵەیان کردوه."

"بە هەڵە ئێمەیان..."

"ئێمە، لێناگەڕێن ئێمە لەم خانوانە بمێنینەوە."

"لێبگەڕێ با بڕۆین."

"بەڵکو بەر لەوەی کە هەمووومان بمرین..."

"ئێمە بۆ خۆمان..."

"ئەوەی کە کەس ئێمە بۆ هیچ جێگایەك نانێرێت..."

"جێگایەك دەدۆزینەوە."

"ئەوە چەندین ساڵە بۆ ئەملاو ئەولامان تێهەڵدەدەن."

"لێمانبڕا، مردین."

"بەزەییت پێمان دابێتەوە، دەست بە دامێنت."

"مەبە باعیسی مردنمان."

"باعیسی مردنی هەمووومان..."

دکتۆر سەلمان سامی بێدەنگ بوو، چاوەکانی ئەوەندە دەرپەڕیبوون و سەیری ئەو خەڵکەی دەکرد کە دەپاڕانەوە، دڵی پڕبووبوو لە خوێن. لە پڕێکدا گوتی:

"بڵێم خوا چیتان لێبکات" پشتی کردە خەڵکەکە، یەکڕاست بەرەو لای نۆڕینگەکەی رۆیشت، لەبەرخۆیەوە قسەی دەکرد: "هۆکاری هەموو شتێك هەر خۆتانن، بەهۆی گەوجی و دەبەنگیی خۆتان، بەهۆی ترسنۆکیتان کەوتوونەتە ئەم حاڵ و رۆژگارە. بڵێم خوا چیتان لێبکات."

دەرگاکەی کردەوە، خۆی بەردایەوە سەر کورسیەك. بەخێرایی بیری دەکردەوە، ئایا تەنها ئێمە کەمتەرخەمین؟ ئەوان هیچ تەقسیریان نیە؟ تا زیاتر بیری دەکردەوە زیاتر دەهاتەوە سەرخۆی، ئارەقەکەی وشك بووەوە.

دوای رۆیشتنی دکتۆر، نیشانچی هاتەپێش. ئەبرۆی تێکنابوون و نێوچاوانی گرژبوو. تا ئەودەمەی ئەو خەڵکە لە دەنگەدەنگ کەوتن سەیری کردو چاوەڕێی کرد. زۆری نەبرد کە بێدەنگ بوون. نیشانچی بەدەست خانوەکانی نیشاندان:

"زووبن هەمووتان بڕۆنەوە ماڵەکانتان. نابێت هیچکەس لە دەرەوە بمێنێتەوە، دەمەوێت لەگەڵتان بدوێم."

قاچی راستی بە توندی لە تەختەکانی ئەسکەلە راکێشا. لەو بێدەنگیەدا دەنگی پێداکێشانی قاچی دەنگی دایەوە. بەبێئەوەی سەیری کەس بکات قیتاو قیت بەرەو خوارەوە چوو، بەرەولای خانوەکان چوو. کاراجا ئەلیف لە دواوە سەیری کرد، دەستێکی بۆ بووك و نەوەکان و مێردەکەی راوەشاند، رووەو ماڵەکەی رۆیشت، دوای ئەوەی بە بەردەم سێ خانوودا تێپەڕی نیشانچی بینی کە لەبەردەم ماڵی خۆیان راوەستاوە. خەڵکەکەش خەریکبوون بەرەو ماڵەکانیان دەڕۆیشتن. کەمێك دواتر کارا ئەلیف سەیری کرد وا خەڵکەکە بەوێدا تێدەپەڕن و بووکەکان و نەوەو هاوسەرەکەی شتومەکەکانی دەرەوە دەبەنە ژوورەوە. نیشانچیش لە گۆشەیەکی باخچەکە وەستابوو و سەیری ئەوانی دەکرد شێوازی رەفتاری کارا ئەلیف و رەوشی نیشانچی لەو ساتەدا بەوپەڕی خێرایی لە سەرانسەری گونددا بڵاوبووەوە. دکتۆر سەلمان سامیش کەمێك دواتر رووداوەکەی بیست. گوتی: "ئەو پیاوە بڕبڕەی ماری پێیە." دوای ئەوەی شمەکەکانیان بردە ژوورەکان نیشانچیش چووە ژووریێ. بەڕێزەوە پێشوازیان لێکرد. پۆیراز ئەم هەواڵەشی بە دکتۆرەکان راگەیاند. لەلایەکەوە پۆیراز باسی نیشانچی دەکرد و لەلایەکی دیکە هەرسێکیان پێکەوە بە حاڵ و رەوشی ئەو مرۆڤەی کە پەرچووی دروست دەکرد پێدەکەنین.

لە ماوەی سێ رۆژاندا نیشانچی لەگەڵ تازەهاتوەکان بووە دۆست و هاتە لای دکتۆرەکان و گوتی:

"کارەکە تەواوە، هەموان لە هەموو شتێك رازین. بە تۆپ و تفەنگیش بەسەریان دابدەین و ماڵەکانیان وێرانیش بکەین، کەسیان قاچیان لە ماڵی خۆی ناباتەدەر. تەنها ئەوە هەیە کە نیوە زیاتریان نەخۆشن. پێموایە ئەمانە لە برسان ئاوا نەخۆش کەوتوون. هیچکەسی وایان لەگەڵدا نیە چاوەڕێی مردنی لێبکەین. تا ئێستا مردەنیەکان مردوون و ئەوانی دیکە زیندوون."

دکتۆر سەلمان سامی گوتی: "تێگەیشتم چیدەڵێیت. باش لە زمانیان دەگەیت نیشانچی."

"تۆش زۆر باش تێدەگەیت دکتۆر. ئەگەر بەر لەمن تۆ بە جلە فەرمیەکەت نەچووبوایتە ئەوێ، ئەوان تەنانەت سەیری روخساریشیان نەدەکردم. تائێستاش نەچووبوونەوە ماڵەکانیان و هەر لەسەر ئەسکەلە مابوونەوەو پشتیان بە پشتی یەکدی دەدا. تا هاتنی بەلەم هەر لەوێ دەخەوتن و هەر لەوێش نانیان دەخوارد لەوێش..."

دکتۆر گوتی: "تێگەیشتم چیدەڵێیت."

"من ئەوەشیان فێردەکەم کاك دکتۆر. مەبەستم جێی دەست بەئاوگەیاندنە. دەڵێم نیشاندەدەم، ناتوانم رازیان بکەم. دوورگە بۆنی گرتوە."

"نەهاتۆتە ئەم دەوروبەرە."

"ئەگەر ئاوا بڕوات، ئەوانەی دێنە دوورگە، هەر لێرە نزیك ببنەوە لەبەر بۆن بۆگەنیو گێژ دەبن."

"دەڵێی چیبکەین؟"

"نازانم دەبێت چیبکەین. رەنگبێت دیسانیش یۆنیفۆرمی سەرگورد و ملازم و فەرماندە پێویست بکات، نازانم. پێموانیە واز لەناو باخچەکان بێنن."

لەوە بەدواوە، لووتی دکتۆرەکان و پۆپیراز و مەلەك خانم و موسا ئاغا و کچەکان هەمیشە روو لە هەوا ئامادەبوو. لەو رۆژانە کاتێك بایەکی توند هەڵیکردبوا بۆنێکی ناخۆش بەو ناوەدا بڵاودەبووەوە.

شوکری ئەفەندی هەنگبڕەکانی هێنایە دوورگە. کاری بڕینەوەی غەڵێفەکان زیاتر لە حەفتەیەکی درێژەکێشا. ئەو هەنگانەی لە غەڵێفەکان سەرپەڕ بووبوون بەنێو گوندیان وەرکردبوو و هەر کەسێکیان بکەوتبوایە پێش پێیانوەدەدا. لەو دواییەدا تەنانەت هەندێك لە خەڵکەکە نەدەوێران لە ماڵێ بێنە دەرەوە. ئەوانەی دەشهاتنەدەر هەرە ئازا و منداڵەکان بوون. دەست و روومەتی زۆربەیان پفدرابوو. نیشانچی و حەسەنی راکردوو بە روخسار و دەستی هەڵاوساویانەوە سواری بەلەمەکانیان بوون بۆ نێو دەریا تێیانقوچاند. هەنگوینێکی زۆریان لە غەڵێفەکان دەرهێناو خستیانە نێو بۆشکە و دەبەی گەورە. شوکری ئەفەندی شاگەشکە بووبوو. کاتێك هەنگوینەکەیان تامکرد، باوەڕیان نەدەکرد. شوکری ئەفەندی لەبەر چاوی دکتۆرەکانەوە پارەکەی ژمارد و دایە دەستی پۆپیراز و گوتی: "خواحافیز، من دەڕۆم. هەفتەیەك پێناچێت دێمەوە بۆ تامکردنی ترێکانتان. ئەوەندە باش بە رەزەکانتان راگەیشتوون و خزمەتتان کردوون کە ترێکەتان بێوێنەیە. ئەوەندە ترێ لەو رەزانە دەکەینەوە کە سەرسام ببن. پارەیەکی زۆرتان پێدەبڕێتو دەوڵمەند دەبن. ترێی رەزەکانی ئێوە لەنێو باخی خۆمدا دادەنێم و وشکی دەکەمەوەو دەیکەمە مێوژ و دەیبەمە ئزمیر دەیفرۆشم."

لە کاتێکدا دەمی لە خۆشیان بەشبووبووەوە چووە دەرەوە، دکتۆرەکان و پۆپیراز بۆ خواحافیزی لەگەڵی چوون و بەرێیان کرد.

شوکری ئەفەندی گوتی:

"ئەو هەموو ساڵە لەو کارەدام نە غەڵێفەی وام بینیون کە ئەو بۆن و بەرامەیان هەبێت نە باخی ئاوا کە واباش خزمەتتان کردوون. ئەمە چ دوورگەیەکە کە ئێمە ئاگامان لێینەبووە." سواری بەلەمەکەی بوو، ئەوانی دیکەش سوار بوون. داوای لێکردن لەسەر کورسییەکان دابنیشن، ئەو خۆیشی دانیشت، لە گیرفانیدا کیسەیەکی دەرهێنا، پارەکانی هەڵڕشتە سەر مێزێك و گوتی:

"فەرموون ئەمە بۆ خوێندنگەکە."

دکتۆر سەلمان سامی گوتی:

"قسەم لەگەڵ خەلیل رەفعەت بەگدا کردووە، خوێندنگە هەموو شتێکی هەیە، ئێمە دەمانەوێت ئەو پارەیە بۆ تازەهاتوەکان خەرج بکەین، زۆربەیان هیچ پارەیەکیان نیە، نیازمەندی نانی شەون، لەجیاتی ئەوەی بە یەکسانی لەنێوانیاندا دابەشی بکەین، دەیدەینە هەرە پێویستەکان. زستانی ئێرە زۆر بە سەختی تێدەپەڕێت. دەڵێن وەکو سێبریای لێدێت، دەبێت لە زستاندا چاودێریان لێبکرێت. ئەوانە بەو جلە شڕانەیان ناتوانن بەرگەی زستان بگرن، جلوبەرگیان پێویستە. بۆ ئەوانەی نەخۆش دەکەون دەرمانمان پێویستە، ئێمە لەبارەی داو و دەرمانەوە یارمەتیان دەدەین، بەڵام تا چەند دەتوانین ئەمە بکەین. زۆر شتیان پێویستە. شتومەکێکی زۆریش بۆ خوێندنگە و منداڵەکان پێویستە. ئێوە ئەو پارەیەی کە دابووتانە دارایی لەو پارەیە هەڵتانگرتەوە؟"

"هەڵمانننەگرتەوە قوربان. لەگەڵ پزیشکی ئاژەڵان بڕیارماندا وەرینەگرینەوە. مووچەکەی خۆمان زیادیشە."

"ئێمەش کۆمەك دەکەین. ئێمەش مووچەکەی خۆمان گواستۆتەوە ئێرە. لەلایەکی دیکە، ئەگەر پارەی ترێیەکانیش وەربگرین، ئیدی پێویست بە کۆمەکی ئێمەش ناکات. کەوابوو لەم دنیایەدا کەسانێکی وەك شوکری ئەفەندیش هەن. بەڵکو پارەیەکی باشمان لە ترێیەکە بۆ بمێنێتەوە، ئەوسا کەس سەختی ناکێشێت. رەزەکانیش هەر خۆتان کڕیوتانن؟"

"نەخێر قوربان. رەزو باخەکان، خۆخ و هەنار و هەنجیرەکان هی دوورگەن."

"بەخێر و خۆشی بێت. مامۆستایەك پێویستە بۆ خوێندنگەکە، دەتوانیت مەدالیای سەربەخۆییەکەت بە ملتەوە بکەیت و لەگەڵ ئێمەدا بهێنتە بەڕێوەبەرایەتی ناحیە؟"

"بەسەرچاو، دێم، بەڵام مەدالیا بۆچی؟"

"بۆ ئەوەیە، کە واتاکەی ئەمەیە جەنابی بەڕێوەبەری ناحیە، ئەوە ئێمەین کە دەوڵەتمان پێکهێناوە، ئەم داخوازییە بچووکەمان بۆ جێبەجێ بکە."

"ئێوە راست دەکەن قوربان، مەدالیاکەم بە ملمەوە دەکەم. دەڵێم ئەم دەوڵەتە ئێمە پێکمانهێناوە، قوربان. بەڕێوەبەری ناحیەش هەر کە مەدالیا زێڕە پڕ هەیبەتەکەم بەسەر سنگمەوە ببینێت، زەندەقی دەچێت. دەڵێت کەسانی بچووکی وەکو ئێمە ناتوانن دەست لە کاری گەورە پیاوانی وەکو ئێوە وەربدەن، کێشەی ئێوە تەنها والی دەتوانێت چارەسەری بکات و بە ئاسانی توانای بەسەردا بشکێت. لەبەر ئەوەی والی ئەم ویلایەتە سەرۆکی تەشکیلاتی حزبی گەلی کۆماریخوازە. بەمشێوەیە بە بینینی مەدالیای ئەم ئەفسەرە بچووکە، یەکپێ سڵاو دەکات و دەڵێت ملکەچم قوربان، ئێوەش جلە فەرمیەکە و ئەستێرەکانی سەر شانت لەبەر دەکەیت، قوربان؟"

"کامەیان دەڵێیت کاك پۆیراز، خوێناویەکەی یان تازەکەی کە خوێنی پێوە نیە؟"

"ئەمەیان ئیدی نازانم دکتۆر. هەر کامەیان کاریگەرترە ئەویان بپۆشە."

"خوێناویەکە کاریگەرە وەلـێ ئەمە واتاکەی ئەوەیە کە لە جەنگ و ئۆپەراسیۆنی زۆردا بەشداریم کردووە، مەدالیای سەربەخۆییەکەم بەسە."

"کەی دەچین؟"

"یەکەمجار دەچینە لای بەڕێوەبەری ناحیە، پاشانیش لای والی، هێشتا زۆری ماوە تا خوێندنگەکان بکرێنەوە. ئێمە ئێستا دەبێت بە حاڵی تازەهاتوەکاندا رابگەین."

چەند رۆژێك بە هێمنی تێپەرین، لەگەڵ ئەوەشدا، ژنەکان و کچانی تازەهاتوو کۆبوونەوەو سەتڵە مسیە بچووکەکان و گۆزەو هیرباری دارینیان بەدەستەوە بوو، لەسەر ئاوهێنان لەگەڵ یەکدا کەوتنە پێشبڕکێ و پێکداهەڵشاخان. لەکاتێکدا یەکدیان پاڵدەدا هەر کامەیان هێزو توانی زیاتر بوا سەتڵە مسی و قاپ و لەگەنە دارینەکەی خۆی زووتر پڕ ئاو دەکرد. پاشان پێکداهەڵشاخان و قژی یەکدیان راکێشاو دەستیان لە تیتکی یەکدی نا. ئەمجارەش هوسمەن و پزیشکی ئاژەڵان چوونە نێوانیان و رێکیانخستنەوە. بەتایبەتی ئەو پێکهەڵشاخانەی ژنەکان بە چەکمەی ئاوەزێنەداری بریقەداری پزیشکی ئاژەڵان دامرکێندرایەوەو ژنەکانیان خستە ریزەوە، ئەوانەی درەنگتر هاتبوون لە دوای ریزەکە راوەستان. لەگەڵ ئەوەشدا ژنانی بەهێزتر هەوڵیاندەدا خۆیان رەپێش بکەن و نۆرەبڕی بکەن، ماوەیەکی کەم دواتر رێیان لەو کارەش گرت. پاشان کاری ئاوکێشانەوە رێکخرا، کەس هەوڵی نەدەدا نۆرەی کەسێکی دیکە ببڕێت. خەڵکە کۆنەکەی دوورگە بەمە زۆر خۆشحاڵ بوون.

ڤاسیلی و پۆیراز کاتێك لە نێو قامیشەڵانەکە رووەو دەریا دانیشتبوون و پێکەوە دەئاخفتن بینیان بەلەمێکی ماتۆڕدار لە دوورەوە بەرەو لای دوورگە دەهات.

ڤاسیلی بە پێکەنینەوە گوتی:

"کوڕ و کاڵەکانی ئێمە خەریکن لە بازاڕ دێنەوە."

"بەچی دەزانیت، بەڵکو ئەفە خەنجەرلی بێت بەخۆیو دوو جووت گاو گسنێکەوە بێتەوە. دەوروبەری داوێن زەویە کشتوکاڵیەکە کە یۆنانیەکان پێیاندەگوت باخ دروستیانکرد و رووەو لای باکوور درێژ دەبێتەوە..." بەدەست نیشانیدا، "سەرتاسەری ئەو پێدەشتەی بە نرخێکی هەرزان کڕی و خەریکە دێتەوە. چەند ساڵێکی دیکە نابات ئەفە خەنجەرلی بەو کێڵگەیە ئەوەندە دەوڵەمەند دەبێت کە لەجیاتی ئەفە خەنجەرلی پێیدەڵێن خەنجەرلی ئاغا."

لەو شوێنەی پێدەشتەکە دەگاتەوە تەپۆلکەکە ئاوێك لە زەوی دێتەدەر و بەرەو خوار دەڕوات. لە ئاوی کانیەکەی ئێمە زیاترە کەمتر نیە. کوڕو کاڵەکانی ئێمە بەر لەوەی بڕۆن ئاوی ئەو کانیەیان راکێشاو بەرەو کێڵگەکانیان هێنا، لەویّ بێستانیان چاندبوو و بەو ئاوە ئاودێریان دەکردن. کاڵەك، شووتی، باینجان، تەماتە، بامیە و بیبەری لەویّ بەدەست دەهاتن لەهیچ جێگایەکی دیکە بەدەست نەدەهاتن. خۆزگە ئێمە کێڵگەیەکمان لەویّ بکڕیبوا."

"بەڵکو هەموویشی نەکڕیبێت ئەو رێگرە چەپەڵە، سبەی دەچم ئەوەی ماوە خۆم دەیکڕم، نیوەیشی بە بەڵگەنامەی نووسینگەوە دەفرۆشمەوە بەتۆ."

ڤاسیلی گوتی: "باشە. باوکم لە دەریا نقوم بوو. لەوەتەی هەم بەترسەوە دەچمە نێو دەریا، ئەگەر کەمێك لەو زەویانە بکڕم، منیش بۆخۆم بێستانێك دروست دەکەم و بە ئاسوودەیی ژیان و بژێوی خۆم هەڵدەسووڕێنم. هەر ئێستا ئەم کارە دەکەیت؟"

"دەیکەم، بەڵام دەمەوێت پرسیارێکت لێبکەم."

"بپرسە."

"ئەوکاتەی بۆ دەربازکردنی من هاتیت، شەپۆلەکانی دەریا شەڕیان لەگەڵ ئاسمان دەکرد نەترسایت؟"

"نازانم، ئەوکاتە تەنانەت ترسم بە زەینیشدا نەدەهات، بیرم لە هیچشتێك نەدەکردەوە."

بێدەنگ بوو، کەوتە بیرکردنەوە. پۆیراز چاوی بڕیبووە روخساری ئەوەوە. ماوەیەکی درێژ تێپەڕی!

"کاتێك بینینم وا خەریکە دەمرێت هیچ هەستم بە ترس نەکرد. هەستی برا، دایك، دۆست و هاوڕێم نەبوو، دەتگوت ئێمە هەردووکمان یەك کەسین. وەك ئەوەی بووبینە یەك کەس. وەك ئەوەی

ئەوە تۆ نەبوویت لە دەریا نقوم ببیت و بخنكێیت، من بم. ئەوەدەمەی هەوڵمدەدا تۆ دەرباز بکەم وەك ئەوە وابوو خۆم دەرباز بکەم. بۆیە ئەوەدەمەی خەریك بوویت دەمردیت خۆم بە دەریادادا. چ بڵێم بۆ هیچ نەدەترسام. نازانم، بۆچی هیچ هەستم بە ترس نەدەکرد. رەنگبێت ئەو کەسەی کە رووبەڕووی مەرگ دەبێتەوە نەترسێت. چ بڵێم، نازانم."

ئەوان هەروا کە سەرگەرمی قسان بوون ئەو بەلەمەی لە دوورەوە بینیبوویان لە دوورگە نزیك بووبووەوە. دووبارە دەستیان بە قسان کردەوە، قسە قسەی رادەکێشاو لە باسکردنی کەسێکەوە دەچوونە سەر باسکردنی یەکێکی دیکە، لە هەموان زیاتر لەبارەی حەسەنی راکردوو قسەیان کرد. ئەو تەنها لە مل بەپەتەوەکردن دەترسێت، سەربازانێکی زۆری بە زمانی راکشاو و لەسەرمان رەقبووەوە بینیبوون، هەمیشە خۆی لە شوێنی ئەوان دانابوو. ئەو لە مردن ناترسێت. زۆر دەمێکە مردنی لەبیر کردووە. ئەو تەنها لە بەدارەوەکردن زەندەقی چووە. ئێستا کارتی کۆتاییهاتنی سەربازی تەواو کردووە. بەڕاستیش سەربازی راکردوو نەبوو، خۆیشی ئەمە دەزانێت کەس ئەو بە دارەوە ناکات، کەس ناتوانێت بچووکترین ئازاری ئەو بدات، خۆیشی ئەمە باش دەزانێت، کەچی ئێستاش وەك جاران نا، بەڵام هێشتا هەر لە بەدارەوەکردن دەترسێت. هەمیشە شەو و رۆژ، هەرکاتێك بە تەنیا دەمێنێتەوە لێکدا لێکدا بەخۆی دەڵێت مەترسە حەسەن مەترسە برا، گیانی شیرینی خۆت لە داری سێدارە رزگارکرد، ئیدی بڕیار نیە بە شێوەیەك بمریت کە زمانت لە دەمتەوە رابکشێت. چەند رۆژێك ئاوا بە شادی و خۆشحاڵیەوە دەگوزەرێنێت، دیسان ترس، دارستانی بەفرداشیو، دەرەختانی بە سەهۆڵبووی سپی سپی، سەربازانی بەدارەوە هەڵواسراو، بە زمانی راکشاویانەوە، پێ و پلی پێخاوس، چاوانی لە کاسە دەرپەڕیو... یەکێك لەو درەختانە دێت، لەجیاتی دارچنارەکەی ناوەڕاستی گۆڕەپانی شارۆچکە شین دەبێت. حەسەن خۆی دەبینێت وا بەو درەختەوە هەڵواسراوە.

"حەسەن لەمە دەربازی دەبێت؟"

"ئەگەر کارتی کۆتاییهاتنی سەربازی وەرنەگرتبوا و رایکردبوا زووتر رزگاری دەبوو. دوای ئەمە ئیدی سوودی نیە."

بەلەمەکە هات لە ئەسکەلە راوەستا. کابرایەکی قەڵەوی سەرتاس و چاوەکانی خێرا خێرا دەکوتا و شەلوارێکی فش و چاکەتێکی شینی لۆچاوی لەبەر بوو دابەزی، بە کابرای بەلەموانی گوت کە دوای ئەو هاتە سەر ئەسکەلە:

"هەر لێرە چاوەڕێم بە، خێرا کارەکەم ئەنجام دەدەم و دەڕۆین."

"سەرچاو." بەلەموانەکە چووەوە نێو بەلەم، بەڵام کابرای شەلوارفش بەرەو لای پۆیراز و ڤاسیلی چوو:

"سڵاوتان لێبێت، وەهاب بەگی هێژا، منی ناردۆتە ئێرە. پێیگوتم بڕۆ دوروگەی کارینجا، کاك پۆیراز بدۆزەرەوە. منیش هاتم دەتوانن پێمبڵێن لەکوێ دەتوانم ببیینم؟"

پۆیراز هەستایە پێ:

"فەرموو قوربان، من پۆیرازم، بەخێر بێیت."

جێگایەکی لە تەك خۆی نیشاندا. کابرا کاتێك لە تەك پۆیراز دادەنیشت گوتی:

"من ناوم ساڵحە."

"وەهاب بەگ چۆنە، حاڵی باشە؟"

"زۆر زۆر سڵاوی هەبوو بۆتان."

پۆیراز گوتی: "پایەدار بێت."

"قوربان چونکە نامەوێت زۆر کاتتان بگرم، یەکسەر دێمە سەر بابەتی سەرەکی، بەخێرایی داوایەکەم دەخەمەڕوو."

"فەرموو قوربان، بڵێ، هەر کارێك لە دەستی ئێمە بێت درێخی ناکەین."

"دوێنێ وەهاب بەگ داوای کرد بچمە لای. دەزانیت کە ئەو یەکێکە لە قارەمانە گومناوەکانی جەنگی سەربەخۆیی کە غەدرێکی زۆری دەرهەق کراوە. ئەو لەو کەسانەیە کە دەزانێت منداڵەکانی من دیل کراون. ئەوکاتەی منداڵەکانی من لە جەنگی ساکاریا دیل دەبن ئەویش لەوێ بووە، منداڵەکانی من لە کاتێکدا قارەمانانە شەڕ دەکەن لەلایەن سەربازانی دوژمن گەمارۆ دەدرێن و دیل دەکرێن. کەس نەیزانیوە منداڵەکانی ئێمە بۆ کوێ بردراون. ئێمەش بێئاگاین. پار منداڵەکانمان لە بەندی دیلی رادەکەن و دێنەوە. وەهاب بەگ لەوەی کە هاوڕێکانی سەردەمی جەنگ لە دیلی رایانکردوەو هاتوونەتەوە زۆر خۆشحاڵ دەبێت. بۆ خۆشحاڵ نەبێت، هاوڕێکانی لە زیندانەکانی یۆنان رایانکردوە. ئەو دەزانێت راکردن لە زیندان و دیلیی دوژمن زۆر سەختترە لە نەبەردی رووبەڕوو لەگەڵ دوژمن. منیش لەو ماوەیەی کە جەنگ درێژەی هەبوو ئەوەندەم قەرز دابووە خەڵك کە پارەیەکم بۆ نەمابووەوە. خەڵکی لەجەنگدا ئەوەندە کەوتبوونە نێو هەژاری و دەستکورتیەوە کە من نەمتوانی داوای هیچ یەك لە قەرزەکانم بکەمەوە، ناچار بووم دووکانە بەقاڵیەکەم دابخەم. کاتێك

منداڵەکان لە دیلی گەڕانەوە، منداڵەکانی من خوێندن و نووسین دەزانن، ئەوانم لە شارە گەورەکان لەبەر خوێندن دانابوون و دەرسیان خوێندبوو، هەردووکیشیان هەر زوو لە ئەنقەرە لە پۆستی بەرز کاریان وەرگرت. بڕێك لە مووچەکەیان بۆمن دەنارد. بڕێکیشم لە دۆستەکانم وەرگرتەوە، ڕێك لەو کاتەی دەمەویست لە شارۆچکە دووکانێك بکەمەوە، کاك وەهاب بەگ ئەمە دەبیستێت. ئاخر من باوکی هاوڕێکانی سەردەمی سەربازی ئەوم و لە چاناك قەڵا پەنجا هەزار لە دەرچوانی هونەرە جوانەکان شەهید بوون و تەنها ئەو کەسانە کە خوێندەوار بوون شەهید نەبووبوون. شوکر بۆ خوا کە منداڵەکانی ئێمە شەهید نەبوون و دیل کران... ئەگەر لە وڵاتێکی وەکو ئەمەی عوسمانی تەنها لە شەڕێکدا پەنجا هەزار دەرچووی هونەرە جوانەکان شەهید بن لەو وڵاتەدا مەگەر کەسێکی خوێندەوار دەمێنێتەوە. وەهاب ڕێك لەوکاتەدا هاتە لای من، گوتی لە دوورگەی کارینجا قارەمانێك دەژیت کە مەدالیای جەنگی سەربەخۆیی هەیە، گوتی ئەو بۆ هەر دووکانێك، کاش پارەی زێڕی ژمارد و کڕینی، گوتی تۆ بڕۆ لای ئەو، با دووکانێکت پێبدات، بەبێ دواکەوتن دووکانەکەت بکەوە. گوتی ئەو ڕێگاو وردەکاریەکانت نیشاندەدات. ئێستا من هاتووم ئەم داوایەت لێبکەم، گوتی ئەگەر دەزانیت ئەمەت بە کەڵك دێت بڕۆ لای کاك پۆیراز. ئێستاش بۆ ئەمە هاتووم و بوومەتە مایەی سەرئێشە بۆ بەڕێزتان."

"من لەگەڵ بەڕێز پزیشکی ئاژەڵان پێکەوە دووکانەکانمان لە فەرمانگەی داراییەوە کڕیون. ئێستا بانگی دەکەم."

پۆیراز بە ڤاسیلی گوتی:

"سەیرکە پزیشکی ئاژەڵان وا لە قامیشەڵانەکەوە دێتەوە."

ڤاسیلی گوتی: "خۆیەتی."

کاتێك پزیشکی ئاژەڵان لە چنارەکان نزیك بووەوە پۆیراز گوتی: "وەرە ئیدی، چاوەڕێی تۆ بووین. ئەم بەڕێزە هەندێك داواکاری لە ئێمە هەن، بەڕێزیان دەیانەوێت دووکانێکی بەقاڵی بەکرێ بگرێت و بیکاتەوە."

پزیشکی ئاژەڵان لەسەر نیوتەختێکی بەرامبەریان دانیشت و گوتی: "بە خۆشحاڵییەوە داواکەیان جێبەجێ دەکەم، بەڵام..."

"بەڵام چی؟ ئەم دۆستەمان کاك ساڵح لەلایەن کاك وەهاب بەگەوە نێردراوە، هاتوە تاکو دووکانێکی بەقاڵی لێرە بکاتەوە."

"باشە، باشە، بەڵام کاك ساڵح لێرە دەیەوێت چی بفرۆشێت و بەکێی بفرۆشێت؟"
کاك ساڵح گوتی:

"سوپاس بۆ خوا کەوا دوورگەکەتان پڕ بووە لە خەڵك جەنابی پزیشکی ئاژەڵان. بەرلەوەی یۆنانیەکان بڕۆن، ئێرە نەك هەر یەك دوو دووکان بەڵکو بازاڕێکی هەبوو. ژمارەی خەڵکەکەش ئەودەم هێندەی ئێستا نەدەبوو. دووکاندارەکانی ئێرە شتومەکیان لە شارەکانی وەکو ئەستەنبۆڵ و ئەسینا و پاریس و لەندەن دەهێنا، خەڵکی شارۆچکەکان و ویلایەتەکانی نزیك بۆ کڕینی پێداویستیەکانیان دەهاتنە ئێرە." "تێگەیشتم کاك ساڵح، خەیری ئەفەندی و جەعفەر زۆریان سەبارەت بە بازرگانیی ئەو کاتی ئەم دوورگەیە بۆ باسکردووم. ئێوە ئێستا دوای ئەوەی کە دووکانەکە دەکەنەوە دەتانەوێت کاڵا لەك بکڕن و بەکێی بفرۆشن؟"

"پێمگوتن، دوورگە پڕ بووە لە خەڵك، بەو هەموو خەڵکەی ئێستا لە دوورگەدا نیشتەجێ بووە دووکانێك هیچ دە دووکانیش دەتوانن کارو کاسبی خۆیان هەبێت."

پزیشکی ئاژەڵان بە حەپەساویەوە پرسی: "ئەم پێپەتیانە؟ ئەم رووت و رەجاڵانەی کە وەهاب بەگ بۆی ناردووین؟ ئێمە چۆن دەتوانین زگی ئەمانە تێر بکەین، لانیکەم نیوە زیاتریان دەمرن، بۆ ئەوەی رێگە لە مردنیان بگرین کۆبوونەوە لە دوای کۆبوونەوەمان ئەنجامدا وەلـێ تا هەنووکە رێگەچارەیەکی گونجاومان بۆ نەدۆزراوەتەوە."

ساڵحە فەندی دەستی کرد بە پێکەنین:

"بەمانە دەڵێین رووت و رەجاڵ، بەمانە دەڵێین برسی؟ ئێوە وابیردەکەنەوە؟ دەزانن ئەمانە لە کوێوە دێن ئەمانە لە دەشت، لەنێو کێڵگە و بێستانان، لەسەر کاری دروێنە و شینابیان، لەنێو کێڵگەکانی چنینی پەمۆ، لە لێکردنەوەی خۆخ و هەنجیر و لە کارکردنی نێو باخی هەنارانەوە دێن. چەندین ساڵە حکومەت شوێنانیان بۆ دیاری دەکات و ئەوان پەسندی ناکەن، مسۆگەر ئەو وەهابە زۆریان خەریك بوو تا توانیویە بیاننێرێتە ئێرە. نازانن ئەمانە چەند دەستقایمن، ئەمانە بە پارەکانیان دەتوانن من و تۆش بکڕن."

پزیشکی ئاژەڵان زۆر خراپ لە قسەکانی ئەو کۆنە بەقاڵە تووڕە بووبوو، بەڵام هەوڵیی دەدا بەسەرخۆی نەهێنێت:

"ئێستاکە ئەوان کەسانی ئەوەندە دەست قایمن و دەتوانن ئێمە و ئێوە بە بەر پارە هەڵبکێشن، تۆ دووکانەکانی ئێمە پێدەزانیت، دەتەوێت مانگانە چەندمان بدەیتێ؟ لە شارۆچکە کرێی دووکانێك چەندە؟"

ساڵحە فەندی کرێی مانگانە و ساڵانەی دووکانەکانی شارۆچکەی پێگوتن.

ئەوێ شارۆچکەیەکی قەرەباڵغ و پڕ جووڵە جووڵ بوو، نەدەکرا لەگەڵ دوورگەیەکی لاپەڕگە بەراورد بکرێت. ئەو بڕە پارەیەی کە لە ماوەی مانگێك یان ساڵێك دەیتوانی بیانداتێ پێیگوتن. ئەوان کرێی ساڵانەیان پێباشتر بوو، چونکە بیریان لەوە دەکردەوە بەر لەوەی کە هەموو تازەهاتوە رووت و برسیەکان بمرن ژمارەیەکیان تا بەهار دادێت لە مردن رزگار بکەن. بۆیە کرێکەیان ساڵانە و بە پێشینە داواکرد. ساڵحە فەندی گرێبەستی لەگەڵ خۆی هێنابوو، خوێندیەوەو واژۆیان کرد. ساڵحە فەندی پارەکەی لەبەرچاوی ئەوانەوە ژمارد و دایە پۆیراز و گوتی: "باشە بابچین دووکانەکەمان ببینین. ئەو کاتەی یۆنانیەکانیش لێرە بوون ئەم دووکانە هەر هی بەقاڵی بوو."

بەرەو دووکانەکە رۆیشتن. جاران بە ئێرەیان دەگوت بازاڕ. ساڵحە فەندی گوتی: "ئینشاللا دیسان پێیدەگوترێتەوە بازاڕ. ئەو دووکانەی من بەکرێم گرتوە سێیەمین دووکانی بازاڕەکەیە، دووکانی بەقاڵی دەبێت لەو شوێنانە بێت کە قەرەباڵغی و هاتن و چوونی زۆری بەسەرەوە بێت."

ڤاسیلی دەرگای دووکانەکەی کردەوە، ناو دووکان زۆر تەڕو تەمیز بوو. رەفەکان، مێزو کورسییەکان، تەرازو و سندوقەکان نوێ نوێ بوون.

ساڵحە فەندی گوتی: "گەسکدان و خاوێنکردنەوەی پێناوێت، لەگەڵ ئەوەشدا شاگردەکەم هێندە وەسواسە هەر خاوێنی دەکاتەوە. خانووش با کاك ڤاسیلی بۆم هەڵبژێرێت. وەك بیستوومە وەستای ئەم گوندە کاك ڤاسیلیە."

ڤاسیلی پرسی: "هەڵیدەبژێرم ساڵحە فەندی. دەتەوێت بیکڕیت یان بە کرێی بگریت؟"

رووی کردە پۆیراز:

"رای ئێوە چیە؟"

ڤاسیلی گوتی: "گەورەم، ئارەزووی خۆتە. باسوق و شیرنەمەنیش دێنیت؟"

"هەموو شتێك، هەموو شتێك لەم دووکانە دەست دەکەوێت، تەنها شیری مامر نەبێت. ئاوا."

پۆیراز گوتی: "پایەدار بیت، لەبارەی خانوەکەش پێتبلێم بۆچی دەتەوێت بەکرێی بگریت، بیکڕەو بیبڕێنەوە، ئێستا خانوو زۆر هەرزانە."

"دواتر بەمسۆگەری نرخیان بەرز دەبێتەوە. تۆ راست دەکەیت، ئێستا واباشە کە نرخەکە هێندە هەرزانە بیکڕم."

چوونە دەرەوە:

"دەڕابەی دووکانەکە دابخەمەوە؟"

ڤاسیلی چوو دەڕابەی دووکانەکەی بە سەرو سەداوە هێنایە خوارێ. سالْح لە پێش هەرسێکیان راوەستاو دوای ئەوەی سەیری چاوی یەکە یەکەیانی کرد بە ئارامیەوە گوتی: "دەمەوێت شتگەلێك هەیە پێتانی بێژم. رەنگە بە کەلْکتان بێت، دەتوانین بچینە جێگایەکی چۆلْ و بێدەنگ؟"

پۆیراز گوتی: "جێگای چۆلْ کەمێك دوورە. تۆش دەبێت جێگای چۆلْ و دوورمان ببینیت. کاتێك بهێیتە ئێرە و لێرە نیشتەجێ ببیت، لانیکەم رۆژی جارێك تۆش دەچیتە ئەو جێگا دوور و خەلْوەتانە و دەیانبینیت."

"دەی کەواتە وەپێشکەوە بابچینە ئەوێ."

پۆیراز گوتی: "بابچین" و وەپێشکەوت. بە رۆخ جۆگەیەکی باریك کە لە کانیەکە دەهاتە خوار، بەنێو پوونگەجارێك کە گوڵی شینباویان دابوو و پنجەکانیان تا ئەژنۆ دەهات، بەنێو ئەو بۆن و بەرامەیەدا وەك ئەوەی مەست بووبن تێپەڕین و چوونە سەرکانی. لە لێوی کانیەکە دانیشتن و پشتیان بە بەردێکەوەدا کە رەگی سووڕباوی تێدابوون.

"ئەو قسانەی کە دەمەوێت بیانکەم ئەوەندەش شاراوە نین، وەلێ رەنگبێت لانیکەم بۆ یەکێك لە ئێوە سوودیان هەبێت. قسەکانم ئەوەن کە ئەم رۆژگارە هەم دنیاو هەم وڵاتیش شێواوە. کەسانێکی زۆر روویانکردۆتە ئەم دوورگەیەی ئێوە. لەنێو ئەوانەشدا هەم کەسانی باش هەن و هەم هی خراپ. بۆیە دەبێت زیاتر هۆشیار بن و وردبین بن. بەبیری کێ دادەهات کەسێکی وەکو ئەفە خەنجەرلی کە بە ساڵان بە چیاکانەوە بوو و تەنگی بە یۆنان هەڵچنیبوو بهێت بۆ دوورگەیەکی لاپەڕگە و لەو سەرەوە پارچە زەوییێك وەربگرێت و کێڵگەیەك دروست بکات... بەهەرحاڵ، خەنجەرلی پیاوێکی باشە. ئەو ئەفەیەکە کە قەت نەیویستوە ئازار بە کەس بگەیەنێت. لەنێو ئەو کەسانەی دێن بۆ ئێرە پیاوی واشیان لەگەڵ دان کە ئەوەندە مایەی رەزامەندی و پەسند نین، لەلایەکی دیکە کەسانێکی وان کە مرۆڤ شەیدای خۆیان دەکەن. لەم دنیایەدا مرۆڤ ئەوەندەی دەتوانێت مرۆڤێکی دیکە بناسێت هیچشتێکی دیکە ئاوا ناناسێت. لەم دنیایەدا هەرچی لە هەموو شتێك زیاتر بناسێت، دیسان مرۆڤ هەزار بەرامبەر بەو شتە زیاتر دەناسێت. قسەکەی من ئەوەیە،

سەیری دەوروبەری خۆتان بکەن، ئەگەر کەسێك تێکەڵی ئێوە بوو کە چاوی بڕیە گیان و ماڵ و نامووسی ئێوە بتوانن بیدۆزنەوە. بەڵکو بە تەنها سەیرکردنێك بتوانن بیدۆزنەوە. شتێك کە من دەمەوێت پێتانی بڵێم ئەوەیە کە هاوڕێیەتی من بەرامبەر ئێوە بەڕاستی هاوڕێیەتی و دۆستایەتیە، چونکە دەمەوێت بێم بۆ ئێرەو لای ئێوە بژیم."

پۆیراز بە جۆشێکەوە گوتی: "بەخێر هاتیت، سەفات هێنا."

نیشانچی لە دڵی خۆیدا گوتی هەر کە خەڵکانێك بێنە ئێرە، کەسێکیان لەنێودا دەبێت بە مەبەستی کوشتنی پۆیراز هاتبێت، بۆیە چاوی هەر لەسەر حەرەکات و سەکەنات و روخساری ئەو کەسانە دەبوو کە لە بەلەمە ماتۆڕدارەکان دادەبەزین. پۆیراز و ڤاسیلیش بیریان لە هەمان ئەو بابەتە دەکردەوە. ئەوانیش تازەهاتوەکانیان خستبووە ژێر چاودێریەوە. ڤاسیلی لەوەش زیاتر پێیهەڵبڕی و چوو لە بەرامبەر باخچەی ماڵی کوڕە گەنجێکی هەڵکەوتوو کە قژێکی بۆر و قەدو باڵایەکی بەرزی هەبوو و کەمێك پێشتر بینیبووی دانیشت و چاوەڕێی کرد تا لە ماڵ دێتەدەر. ئەو کوڕە گەنجە کیژۆڵەیەکیشی لەگەڵدا بوو کە شێوەی لە شێوەی کوڕەکە دەچوو و پێکەوە لە بەلەم دابەزیبوون. کچەکە زۆر لە گەنجەکە دەچوو، هەم رەنگ بوو هاوسەری بێت و هەم بۆی هەبوو خوشکی بێت. خوا دەزانێت بەڵکو هەمان ئەو گەنجە بێت کە کاتی خۆی بە بەلەمە بچووکەکە هاتبووە دوورگە، لە ماندوێتیان لە خوار بەردەڵانەکەی لای باخی هەناران خەوتبوو، لەگەڵ ئەوەشدا مارە شینەکە کە پنك پنكی سپی تێدابوون بەسەر قاچەکانیدا خشیبوو هێشتا بە ئاگا نەهاتبوو، کە بە ئاگاش هاتبووەوە لە حەپەساویان شڵەژابوو و بە ترس و هاوارکردنێکەوە گوتبووی: "ئێوە کێن؟"

ڤاسیلیش پێیگوتبوو: "ئێمە خەڵکی ئێرەین، تۆ کێیت؟"

"من ناوم کەریمە."

"بۆ ئاوا بە دزیەوە هاتوویتە ئێرە؟"

"لە لێوار بەدوای کەسێکدا دەگەڕام کە بمهێنێتە ئەم دوورگەیە، بەڵام کەس ئامادە نەبوو بمهێنێت. من کۆنە بەلەمێکم کڕی و بەدەم سەوڵلێدانەوە خۆم گەیاندە ئێرە."

"هاتوویت لێرە نیشتەجێ ببیت؟"

"بە دوای کەسێکدا هاتووم، بە نهێنی نەهاتووم، بەدوای عەباسدا هاتووم، کەوتۆتە کێشەوە. ئەگەر بیدۆزمەوە پێیدەڵێم لێرە نەمێنێت، رابکات و بچێتەوە قەفقاز. ئەگەر خۆی لەژێر باڵی مەلی ئاسمانیش بشارێتەوە یان بچێتە کونی ماریشەوە، سەرەنجام هەر دەیدۆزنەوەو دەیکوژن."

هیچیان لەبارەی ئەوەی کە تۆ عەباس چۆن دەناسیت، چ خزمایەتییێکت لەگەڵیدا هەیە کە ئاوا بەدوایدا دەگەڕێیت، نەکات هاوڕێی سەردەمی سەربازیت بێت، پێنەگوتبوو.

کاتێك هاتبووە ئەسکەلە پێیانگوتبوو: "لەم دوورگەیە تەنها یەك عەباس هەیە، بەڵام ئەویش بە دەردی تۆ ناخوات."

"کوێر و شەل و پیریش بێت بەمنی نیشان بدەن."

کاتێك گەیشتبوونە ژێر دارچنارەکان ڤاسیلی گوتبووی، عەباس وەرە، عەباس یەکسەر بەڕاکردن و میاوە میاوەوە هاتبوو و کەوتبووە خۆتێهەڵسوون بە قاچەکانی ڤاسیلی. ڤاسیلی گرتبوویە باوەش و دەستی بەسەر و پشتی داهێنابوو.

ئەو گەنجە هەمان ئەوەی ئەو رۆژەیە، مەگەر نە؟ بێئەوەی لە بەلەم داببەزێت یەکسەر گەڕابووەوە. نیشانچی وەکو جنۆکە وایە، دەیزانی ئەو پیاوە هەمان ئەوەیە کە نیگاکانیان تێکهەڵنگوتبوو یان نا. ئەودەم تێدەگەیشت داخۆ خۆیەتی یان نا. ئینجا پۆیرازیش خۆی کۆدەکردەوەو ئاشکرا دەبوو کە کێ دەبێت بڕواتەوە بۆ قەفقاز و کێ هەڵبدرێتە ژێر دەریاوە.

لەسەر کانیەکە هاتنە خوار، لەژێر دارچنارەکان دانیشتن. "کوڕینە ئەم چەند رۆژانە وریا بن، کاولاکزادە زەندەقی لە ئێوە چووە، دوژمنی سەرسەختی ئێوەشە. من شارەزای ئەم شارۆچکەیەم، هەموان دوژمنی یەکدیکەن و بەخوێنی یەکدی تێنوون، جگە لە خەیری ئەفەندی و جەعفەر و ئیسماعیلی بەخێوکەری ئەسپان نەبێت. ئەوان کەسانێکی باش و سەر راست و جوامێرن. دووڕوو نین."

پۆیراز هەستا:

"ئافەرین ڤاسیلی، ئافەرین کاك ساڵح. خانوومان هەر بەبیر نەبوو. یاللا هەستن خانووێك بۆ کاك ساڵح هەڵببژێرین دەنا وەهاب بەگ شەپۆلێکی دیکەی خەڵکمان بۆ دەنێرێتو خانووێك نامێنێتەوە بیدەینە ئەمانە..."

"وەهاب بەگ دوای ئەمە ئیدی خانوو ناداتە هیچ کەس وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە بچین خانوەکەمان هەڵببژێرین، وەستا ڤاسیلی خۆشمان لەگەڵدایە."

هەستان، یەك بە یەکی بەنێو خانوە چۆڵەکاندا گەڕان، هەموو خانوەکانیان بەباشی سەیرکردن. سەرەنجام خانوێکیان کە باخچەکەی پڕ بوو لەدارپڕتەقاڵ هەڵبژارد. دارپرتەقاڵەکان هێندە بەریاندابوو کە گەڵاکانیان دیار نەبوون.

ساڵحە فەندی هەمان ڕۆژ گەڕایەوە شارۆچکە، دوای چەند ڕۆژێك بە سێ بەلەمی ماتۆڕدار و پازدە کرێکاری گەنجەوە هاتەوە. یەکەمجار لەگەڵ تاپۆی خانووەکە، قەباڵەی پارچە زەوییێکیشی بۆ دروستکردنی کێڵگە لە زەوییەکانی لای سەرەوەی گوند بە پۆیراز و ڤاسیلی نیشاندان.

هەموو ئەو شتانەی هێنابوونی بە یارمەتی کرێکارە گەنجەکان دایبەزاندن و لە دووکاندا جێی بۆ کردنەوەو ڕێکیخستن. هیچ جێگایەك لە دووکانەکە بە بەتاڵی نەمایەوەو هیچ شتومەکێکیش لەدەرەوە نەمایەوە.

ساڵحە فەندی لەبن ئارەقە هەڵاتبوو و کاتێك هاتە سەر کانی جامە ئاوێکی پڕ کرد و یەکبێن دەسەری کرد.

ڕۆژی هەینی بەڕێوەبەری ناحیە، سەرۆکی شارەوانی، ڕەمزی کاولاکزادە، سەرۆکی هۆبەی سەربازی، عوزێر خان، وەهاب بەگ، بەرپرسی نووسینگەی زەوی زار، خەیری ئەفەندی، جەعفەر و چەند کەسایەتی دیکەش لە گەورە پیاوانی شارۆچکە هاتن و لە ڕێوڕەسمی کردنەوەی دووکانەکە بەشداریان کرد. مێزیان لەژێر دارچنارەکان بۆ میوانان ڕازاندبوونەوە. خواردنەوەی جۆراوجۆر خورایەوە و شەو بە بەلەمە ماتۆڕدارەکەی قەدریی بەلەموان کە کورسی نەرم و هی ئاسایی لێداندرابوون گەڕانەوە بۆ شارۆچکە. خەڵکی دوورگەی کارینجا بەوەی کە هەموو گەورە پیاوانی شارچکەکە هاتبوونە دوورگەکەیان هەستیان بە سەربڵندی دەکرد، تەنانەت تازەهاتوەکانیش... دووکانەکە کە بە فەرمی کرابووەوە دەستی بەکاری خۆی کرد. ساڵحە فەندی سەری لەو هەموو کڕیار و سەردانیکەرانە سووڕما. هیچکەس نازانێت ئیمان و پارە لەلای چ کەسێك هەیە.

کەسە گرنگەکانی دوورگەش لەوەی کە ئەو هەموو پیاوە ناودارو کەسایەتیانە هاتبوونە دوورگەکەیان بەخۆیان دەنازی. پۆیراز لەگەڵ ئەوانەی هاتبوونە دوورگە بە بەلەمەکەی قەدریی چووە شارۆچکە و لە ماڵی عوزێر خان مایەوە. بەیانی زوو پێکەوە چوونە بازاڕ. لە قاوەخانەیەکدا کە بۆ خواردنەوەی پاوە چووبوونە ئەوێ لە شوکری ئەفەندی ڕاست هاتن، پۆیراز بە شوکری ئەفەندی گوت: "باش بوو ئێوەم بینی، لە ڕاستیدا دەمەویست بتانبینم."

"خێر دەبێت."

"دەمەویست پێتبڵێم دوورگەکەمان پڕ بووە لە خەڵك."

"دەزانم."

"دەمەویست بێژم ئیدی پێویست ناکات لێرەوە کرێکار بێنین بۆ دوورگە، هەموویان لە دوورگەی خۆمانن. هەمووشیان چەند ساڵ لەو دەشتانەی نزیك کرێکاریان کردوە."

"ئەوان بە کەڵکی کاری ئێمە نایەن."

"بۆ بە کەڵك نایەن؟ ئەوان عەمەلە نین؟"

"بە کەڵك نایەن، چونکە پێشینەیان هەیە."

"چ جۆرە پێشینەیەك؟ رێگریان کردووە، خەڵکیان رووت کردوە؟ دزیان کردوە؟"

"هیچکام لەمانەیان نەکردوە، چووبنە هەر باخێك وێرانیان کردوە، ترێی رەزەکانیان فلیقاندۆتەوە، رستەی مێو و لك و کەدی درەختەکانیان شکاندوون، پێیانەنابێتە هەر باخێك ئیدی ئەو باخە گیاشی لێنەڕواوەتەوە. لە ئزمیرەوە تا ئایدین، لە ئایدینەوە تا مانیسا، لەوێوە تا شارۆچکە و دێهاتی کۆچبەرەکانی ئەنەدۆڵ هیچ باخدارێك رێگەی پێنەداون بچنە نێو باخەکەی، لە کاری رەزو باخەکاندا تەنێ کار بە کرێکارە خۆجێیەکان دەکرێت."

"ئەم کۆچبەرە ئەنەدۆڵیانە لە باخەکاندا چیانکردووە کە ئاوا باخەکان تەنانەت گیاشی لێنەڕوێت؟"

"وەڵڵا من نازانم کاکە ئەو کۆچبەرە ئەنەدۆڵیانە چیان بەو باخانە کردوە. من بۆ هیچ باخێك کارم پێنەکردوون، لەمەودواش کاریان پێناکەم."

پۆیراز زۆر نیگەران بوو، بەڵام بەسەر خۆیدا نەهێنا. هەر کێن گرنگ نیە، قەیدی ناکات با باخەکان تێکوپێك بدەن بەجۆرێك کە قەت پنجە گیایەکیان لێشین نەبێت، ئەو کە دەیبینی دوورگە پڕ دەبێت لە خەڵك هەستی بە لە خۆباییبوون دەکرد، ئەگەرچی کەسێك لە نێو ئەوانەدا بۆ کوشتنی ئەو هاتوە. پێویست بوو لەو بارەیەوە جارێکی دیکە بە وردی لەگەڵ نیشانچی قسە بکات.

شوکری ئەفەندی هەستاو گوتی: "لەماوەی هەفتەیەك دە رۆژدا لەگەڵ کرێکارە خۆجییەکاندا دێمەوە بۆ دوورگەی ئێوە. خۆتان دەیبینن، ئەو رەزانەی من لە دوورگەی ئێوەدا بینیوومن ترێی وا دەدەن کە هەموان سەرسام بن. لێمبوورە برا، من رێگە بەو کەسە نادەم کە لە هەموو تەمەنی خۆیدا رەزی ئاوای نەبینیوە ترێی وای نەخواردوە، پێ بنێتە ئەم رەزانە. خۆم لەبەرچاوی خەڵك و خوا کەم ناکەمەوە."

نزیکەی نیوەڕۆ لەگەڵ قەدریی بەلەموان بە ڕێکەوتن. نیشانچی و ڤاسیلی لەسەر ئەسکەلە پێشوازیان لێکردن. هەردووکیان نێوچاوانیان تێکنابوو.

ڤاسیلی گوتی: "بەخێر بێن. بابچینە سەرەوە، لای کانی."

نیشانچیش گوتی: "بەخێر بێن، بابڕۆین."

بەرۆخ باریکە جۆگایەکدا کە لە کانیەکەوە سەرچاوەی گرتبوو بۆ لای سەرەوە چوون، لە لێوی کانیەکە لە نێو پوونگەکان دانیشتن. کاتێك لەنێو گوڵەشینەکان دانیشتن، بۆنێکی خۆش لە گوڵە چرمسێندراوەکان بەرزدەبووەوە.

نیشانچی گوتی: "لەگەڵ ڤاسیلی باسی ئەوەمان کرد. ئەو کابرایە کە لەگەڵ سەرنشینەکانی دیکە لە بەلەم دابەزی یان ئەوەتا بە ڕێگایەکی دیکە هاتۆتە دوورگە؟"

"چیتانگوت؟ لەو بارەیەوە قسەتان کرد؟ لەگەڵ سەرنشینەکان لە بەلەم دابەزی یان لە شوێنێکی دیکەوە هاتە دوورگە؟ لەو بارەیەوە قسەتان کرد؟"

"باسی زۆرشتمان کرد، هەڵبەتە باسی ئەو بابەتەشمان کرد."

"چیتانگوت؟"

"من گوتم ڤاسیلی ئەو پیاوەی، ئەو کوڕە قژ ڕەشەی نەبردە ماڵی خۆیان؟ ئەویش گوتی پێموابێت من بردمە ماڵی ئەوان، بەڵام باش بەبیرم نیە، ڕەنگبێت زۆر لێیورد نەبووبمەوە. من چوومە ماڵی ئەوان. بۆ ئەوەی بۆنی هیچ نەکات یەکەمجار سەرم لە چەند ماڵە دراوسێیاندا. پاشانیش چوومە ماڵی ئەوان. ئەو بەڕێزەوە منی بردە ماڵەکەی. قاوەشیان لە ماڵەوە هەبوو، بە کوڕو کچێکی گوت قاوە دروست بکەن. کچەکە بە لێزانیەوە قاوەی لە هاوەن کوتا. نیمدەرێکی بۆ دانام، بالیفێکیشی دانا کە پاڵی پێوەبدەم. کوڕەکەش لە رۆخ من دانیشت. کچەکە هەر زوو ئاگری کردەوەو دوو دانە فنجانی قاوەی هێنا. بۆنی قاوە نێو ماڵی پڕ کرد. تەنها قاوەی تازە هاڕدراو و کوڵێندراو ئەو جۆرە بۆنە دەدات. پێمگوت خانمەکەت زۆر بە باشی قاوە دروست دەکات. گوتی ئەو هێشتا هاوسەری من نیە، ئەو هێشتا بچووکە. لە ڕێگادا لەگەڵیدا ئاشنا بووم. گوتم، هاوەنەکە هی ئێرەیە؟ هەستا، چوو هاوەنێکی سووری هێنا کە لە داری درەختێکی تایبەت دروستکرابوو و تەنها لە ماڵی بەگ و سەرۆکەکان هاوتای پەیدا دەبێت. پێمگوت باوکت فەرماندە بوو؟ پێکەنی. گوتم لەکوێ سەربازبوویت؟ گوتی خوا نەیویست لە سەرمان ڕەق ببینەوە. گوتم خەڵکی کوێیت؟ گوتی ئەرزەڕۆم. کە وایگوت یەکسەر سەرم هەڵبڕی و سەیری روخساریم کرد، شێوازی ئاخاوتنی

هیچ بە ئەرزەڕۆمیان نەدەچوو. کاتێك سەرم هەڵبڕی بینیم وا لێوەکانی دەلەرزین، قسەکانی بە پچڕ پچڕی و ناتەواو لەدەم دەردەهاتن. گوتم چ کارێکت دەکرد؟ گوتی باوکم کێڵگەی هەبوو. پاشان نەیهێشت قسە بکەم و یەکرێز لە پرسیارانی گرتم. گوتی کاتێك ئێمەیان نارده ئەم دوورگەیە گوتیان لە هەر کێ بپرسی، نیشانچی پێشانتان دەدات. پاشانیش باسی کرد کە لە بارەی نیشانیەکان چەندی شت بیستوە. ئاوا رایکردووە، ئەم کارەی کردوە، ئەو کارەی کردوە. لە یۆنانەوە شارۆچکەیەکی کۆچبەران هاتۆتە ئێرە، خەڵکی ئێمە ستەمیان دەرهەق کردوون، ئەوان نیوەیان زیاتر بەهۆی نۆبەتێوە لەنێوچوون، هیچ یەك لە منداڵەکانیان نەماوە، ئەوانیش گوتوویانە وا هەموو منداڵەکانمان بە نۆبەتێوە مردن، ئێمە لەم وڵاتە نامێنینەوە. ئێمە ئەگەر ئەم وڵاتە بەجێنەهێڵین دەمرین و لەگەڵ هیچکەس دەم لێکناکەینەوە. ئەوانیان لە شارۆچکەیەکی یۆنانیان نیشتەجێ کرد، ژمارەیەك تورکیش لەو شارۆچکەیە هەبووە، ئەوان لەگەڵ ئەو تورکانە بە هیچشێوەیەك نەدواون، تەنانەت سەیریشیان نەکردوون. تەنانەت بە مانگان، بە ساڵان لەگەڵ پیاوانی حکومەتیش نەدواون. هەموویان کەڕو لاڵ بووبوون. خدری زیندەیەکیان لێڕاست هاتوە بەناوی نیشانچی کە ماسیگربووە، ئەسپە خاڵدارە بۆزەکەی، سێ بزنی شینی، دەڵێن لەم دەوروبەرەدا دوورگەیەك هەیە بەناوی دوورگەی کابا، ئەوانی لەوێ بەرەڵلا کردوون، لە دوورگە چۆتە لای کەڕو لاڵەکان، سڵاوی لێکردوون، پێیگوتوون لە ماڵەکانتان وەرنەدەر، بڕۆنە ماڵی دراوسێکانتان، پێکەوە قسان بکەن. ئەوانیش بە منداڵ و پیرو لاو و نەخۆش و ساخەکانیانەوە هاتوونەتە دەرێ و چوونەتە ئەسکەلە و مەیدانی شارۆچکەکە، خەڵکی شارۆچکە بە بینینی ئەوان رژاونەتە کووچە و کۆڵانەکانو هەموویان یەکدیان گرتۆتە باوەش. ئەم نیشانچیە هەمان ئەو نیشانچیەیە، وایە؟ گوتم من هەوم. رەوشەکە ئاوایە، چیدەڵێیت؟"

پۆیراز گوتی: "چیبڵێم؟ دوای ئەو شتانەی کە باست کردن ئێمە دەتوانین چی لەگەڵ ئەو پیاوە بکەین؟"

ڤاسیلی گوتی:

"ناتوانین بیکوژین، ناتوانین دەری بکەین، تەنها دەتوانین لە کەمیندا بین و بەردەوام چاودێری بکەین."

نیشانچی گوتی: "ئێوە ئەو بۆ من جێبێڵن. ئەو وادەزانێت من خدری زیندەم. دەبێت تا ئەودەمەی بەباشی دەیناسین کەمێك دەرفەتی بدەینێ. ئینجا بڕیاری لێدەدەین، با ئێستا پۆیرازیش ئەو، کەریمە، ناوی چیە ببینێت و رای خۆمان لەبارەیەوە پێبلێیت. لێنا کەریمی بینیوە؟"

ڤاسیلی گوتی: "بینیویە."

"کەواتە، تەواوە. ژنانی بە تەمەنداچوو ئەگەر پیاوێکی گەنج ببینن و بکەوێتە بەردڵیان شێوەو قەدو قیافەکەی لەبیر ناکەن. وێنەکەیان لەودیوی چاوەکانیان دەمێنێتەوە. لێناش هیچکات لەبیری ناکات ژنی حەوت دەریاو چوار هەرێمانە، هەمووشیان هەروان."

پۆیراز گوتی: "ئەمڕۆ من دەیبینم. ڤاسیلی، بە قەدریی بەلەموان بێژە بابهێتە لای من."

ڤاسیلی گوتی: "بەسەرچاو."

کەمێك دواتر ڤاسیلی قەدریی هێنا.

"وەرە قەدریی بەلەموان، بڕۆ لەوێ پیاوێکی گەنجی رەشتاڵە هەیە، ڤاسیلی ببە ماڵەکەیت نیشاندەدات، لەگەڵ خۆت بیهێنە بۆ لای من."

ڤاسیلی و قەدریی بەلەموان پێکەوە بەرەو لای ماڵەکان چوون.

نیشانچی گوتی:

"کە هات باش سەیری دەستەکانی بکە، دەستەکانی دەستی کارنەکردەکانن، وەکو لۆکەن. دەستانێك کە هەنجیر و هەنار و پەمۆ و ترێیان چنیبێت مەگەر رێی تێدەچێت ئاوابن؟ پێمبڵێ."

پۆیراز گوتی: "ئەگەر وەك تۆ دەڵێیت وابێت، نا."

"ئەو کابرایە لێرە چ دەکات؟ تەنانەت ئەگەر ئەو کەریمەی بەدوای عەباسیشدا دەگەڕێت نەبێت، دیسان هەر کەریمە. تۆ دەزانێت کاولاکزادە بۆچی ئەوەندە لە تۆ دەترسێت؟ هیچ بیرت لەوە کردۆتەوە کاولاکزادە کە خۆی بە شای ئەم ناوە دەزانێت، پێشتر کە هات، بۆچی باوەشی بە تۆدا کردو زمانلووسی و مەرایی کرد؟ وایدەزانی تۆ لە ئەرکدارە نهێنیەکانی دەوڵەتیت، پێتوایە راستە، راست نیە. کاولاك چۆن تۆ دەناسێت لێتدەترسێت. ئەو کوڕە رەشتاڵەیە بە هیچکام لەم بەلەمانە نەهاتۆتە ئێرە. من خۆم زۆر بەوردی لەم بابەتەم کۆڵیوەتەوە. لەپڕ لەنێو خەڵکەکە بەدیارکەوت. کێ ئەو خانوەی بۆ کڕیوە؟ ئەگەر ئەمە کاری کاولاك نەبێت بەم ناوە بانگم مەکە."

"ئەگەر ئاوایە چیبکەین، تۆ دەڵێیت بەر لەوەی ئەو کاری خۆی بکات دژی ئێمە، ئێمە کاری ئەو یەکلایی بکەینەوە؟"

"جارێ سەبر بگرە، وادێن."

هاتن، گەنجە رەشتاڵەکە سڵاوی کرد و گوتیان: "سڵاو لە تۆش. فەرموو وەرە ئێرە دانیشە." گەنجە رەشتاڵەکە بە ترسەوە، دانیشت.

"ناوت چیە؟"

"ناوم کەریمە."

وەك ئاوێکی ساردت بەسەردا کردبن وابوو. سەیری یەکدیان کرد. پۆیراز یەکسەر خۆی کۆکردەوە:

"پێشتریش هاتبوویتە ئەم دوورگەیە، بە بەلەمێکی بچووك؟"

"بەڵێ."

"بەدوای عەباس ناوێکدا دەگەڕایت؟"

پێکەنی و گوتی:

"راستە، ئێوەش پشیلەیەکتان نیشاندام کە ناوی عەباس بوو."

دیسان پێکەنی، ڤاسیلی نیشاندا:

"عەباس پشیلەکەی ئەم هاوڕێیەمان بوو. پشیلەیەکی زۆر جوانیش بوو، ژنتان بۆ هێنا؟"

ڤاسیلی گوتی: "بۆمان هێنا. لە شارۆچکە بووکێکی زۆر جوانکیلەکان بۆ هێنا. بووکەکە ئێستا ئاوسە. بەمزوانە پێنج بەچکەی جوانکیلە دێنێتە دنیا."

"جگە لە عەباسەکەی ئێمە هیچ عەباسی دیکەت دۆزیەوە؟ ئەو عەباسەی کە بە دوایدا دەگەڕایت، جگە لە عەباسەکەی ئێمە؟"

"دۆزیمانەوە، بەڵام هاوڕێکانی ئێمە دڵیان نەهات بیکوژن."

"بۆچی دڵیان نەهات؟"

"ئەمەیان نازانم، تەنها خوا خۆی دەزانێت."

دوای کەمێك ئاخاوتن کاتێك کەریم هەستا بڕوات، نیشانچی گوتی:

"چەند باش تورکی دەزانیت."

"دایکم ئەستەنبۆڵیە."

"کەی یەکەمین ئاهەنگی بووکگواستنەوە لە دوورگە ئەنجام دەدرێت؟"

"هەر کاتێك خوا بیەوێت. خواحافیز."

که گەیشتەوە ماڵێ کچەکە پرسی: "بۆچی ئەبرۆکانت تێکناوە؟"
کەریم گوتی:

"مەپرسە. ئەو کەسەی کە بانگی کردم عەباس بوو. منی ناسیوە، ناوی پرسیم، من گوتم ناوم کەریمە. عەباس لێیپرسیم پێشتریش هاتبوویتە ئەم دوورگەیە؟ گوتم هاتبووم. پرسی عەباست دۆزیەوە؟ گوتم هاوڕێکانم دۆزیانەوە، بەڵام نەیانتوانی بیکوژن. پرسی بۆ نەیانتوانی؟ گوتم چونکە ئەو کەسەی کە بۆ کوشتنی ناردرابوو دایکی چەرکەس بووەو کاتێك زانیویە عەباس چەرکەسە و کەسێکی هەڵکەوتووو میهرەبانە نەیتوانیوە بیکوژێت، عەباسیش ئەمەی زانیوەو دڵی نەهاتوە بیکوژێت و وازی لێهێناوە."

"عەباس بەوەی زانی کە تۆ هەمان ئەو کەسەی کە ویستووتە بیکوژیت، بەڵام دڵت نەهاتوە."

"ئەمەیان نازانم وەلــێ ئەو دێوەزمەیەی کە پێیدەگوترێت نیشانچی کەسێکی ترسناکە. نیگایەکی هەیە کە ناوەڕاستی دڵی مرۆڤ دەسمێت. بە یەك نیگا تێدەگات چی بە مێشك و دڵتدا دەگوزەرێت. جاری یەکەم کە هاتم، تێگەشتم ئەم پۆیرازە هەمان ئەو عەباسەیە و ئەوکات لە دوورگە نەبوو، دواتر هاتە دوورگە. ئەگەر ئەوکات لەوێ با هەر یەکسەر دەیکوشتم و دەیخستمە نێو گونیەیەك و بە ئەندازەی کێشی خۆشم بەردی پێوە دەکردم و دیبردم فڕێیدەدامە تەنگەبەری چاناك قەڵاو منیان لێرە لە گۆڕێکی کۆندا دەناشت و کەس پێینەدەزانیم. ئەو کابرایە لەوە بەدواوە منی ناسی و چاودێری کردم. بە هەبوونی کەسێکی وا بەدیار سەرمەوە، من لەم دوورگەیە ناتوانم بەردێکیش لە چۆلەکەیەك بگرم تا بگات بەوەی کەسێکی وەکو پۆیراز بکوژم. ئەو کابرایە تا دەمرم دەستم لێهەڵناگرێت. ئەو جۆرە مرۆڤانە وا بەئاسانی نامرن. بڵێ بزانم، ئێمە چۆن دەتوانین خۆمان لە دەستی ئەو کابرایە دەرباز بکەین؟ ئەگەر ئەوان بڕیار بدەن من بکوژن، بەرلەوەی من عەباس بکوژم ئەوان هەردووکمان لەنێو دەبەن. دوای کوشتنی من ئەگەر کاریان بەتۆ نەبێت ئەمە واتایە مردنی ئەوانە. عەباس بۆ ماوەیەکی زۆر خۆی دەگرێت کە من نەکوژێت، وەلــێ دواجار بەرگە ناگرێت. ئەو جەلادە عەباس دەپەرستێت."

"دەڵێم وەرە بالێرە رابکەین، بەڵام ئێستا نابێت. چاوی ئەو جنۆکەیەمان لەسەرە. هەرچۆنێك بێت دەبێت ئێمە وریا بین و ئاگامان لەخۆ بێت. ئەگەر بۆ ساتێك غافڵ ببین و چاوی لەسەر هەڵبگرین، ئەوە بزانە کە مردووین."

"پێمونەبوو ئاوا زوو بمناسنەوە، وامدەزانی لەبیریان کردووم."

کچەکە گوتی: "وەکو رۆژی روون وایە کە ئێمە بۆ کوشتنی عەباس هاتووینەتە ئێرە. نابێت کەس پێبزانێت کە دەمانچەت پێیە. دەمانچەکە لەژێر باڵتەوە بشارەوە. منیش بەبێ دەمانچە ناچمە هیچ جێگایەك تاکو لەجیاتی کوشتن نەشکوژرێین."

"بەزوویی لەگەڵ تازەهاتوەکان یەکدی دەناسین و لەگەڵ کەسە بە تەمەن و خاوەن ئەزموونەکانیان ئاشنا دەبین کە هەزار نیشانچی دەخەنە گیرفانیان. کەوتووینەتە گێژەنێك کە رێگای دەربازبوونمان نیە. بۆ راو هاتبووین وەلـێ خۆمان راو دەکرێین."

"با جارێ سەبر بگرین ببینین چی روودەدات، ئەوان هێشتا دوودڵن، ناتوانن وا بەئاسانی لەنێومان ببەن. تۆ چەند فیشەکت هەن؟"

"زۆر."

"منیش زۆرم هەن. ئەو کیسەیەش هێشتا پڕە؟"

"هێشتا پڕە."

"دەزانیت چیدیکەیان دەگوت، گوتیان یەکەمین ئاهەنگی بووکگواستنەوە کەی لە دوورگە دەکرێت؟ منیش گوتم هەر کاتێك خوا بیەوێت. شتێکت پێبڵێم، ئەگەر ئەوان هێندە نەترسێن، ئامادەن باوەشمان بۆ بکەنەوە."

"کەواتە لەمە بەدواوە نابێت لە هیچ جێگایەك خۆمان شڵەژاو و ترساو نیشان بدەین."

"بچووکترین ترس و شڵەژان دەبێتە مایەی مردنمان."

کچەکە گوتی: "باشە، تەنانەت ئەگەر کەسیشمان لەلا نەبێت و تاك و تەنهاش بین لەجیاتی ترس و شڵەژان دەبێت شاد بین و بەجۆرێك رەفتار بکەین وەکو ئەوەی کە بە هیچشێوەیەك نامانەوێت دوورگە بەجێبێڵین، خۆمان بە باخچە و گوڵان سەرقاڵ دەکەین، لە هەفتەی دووجار دەست دەخەینە نێو دەستی یەکدی و وەکو دوو عاشق و ماشوق بە خەیاڵی ئاسوودە بەنێو دوورگەدا دەگەڕێین، هەموو رۆژێك لە دووکانەکەی ساڵحە فەندی کڕینی خۆمان دەکەین. رۆژێکیش سەر لەبەیانی سواری بەلەمە ماتۆڕدارەکەی قەدریی بەلەموان دەبین و دەچینە شارۆچکە و خۆمان ون دەکەین."

"وادەزانیت نیشانچی دەستمان لێهەڵدەگرێت؟"

"هەڵناگرێت، دەزانم. داخۆ کێمان بەدوادا دەنێرێت نازانم. لە دوورگە ئەرك بە منداڵان دەسپێرن."

"چۆن دەزانیت؟"

"دەزانم، چونکە هەمیشە ئەوە دەکەن، کەس گومان لە منداڵان ناکات."

"تۆ ئەمە چۆن دەزانیت؟"

"چونکە کاتێك کە منداڵ بووم، ئێمەیان بەدوای زۆر کەساندا دەنارد..."

کچەکە گوتی: "سەبرێك بگرە. پاشان دەچینە ئەستەنبۆڵ، ئەوان وادەزانن راماننکردوە لە چۆکی خۆیان دەدەن و ئێمەش دیسان دەگەڕێینەوە. ئەوکات ئەوان نەرم دەبن. دوای ماوەیەکی کورت سەرلەبەیانیەکی زوو بە بەلەمەکەی قەدریی بەلەموان دەچینە شارۆچکە، شتومەکێکی زۆر دەکڕین و بەرلەوەی رۆژ ئاوا ببێت دەگەڕێینەوە دوورگە. تەخت و دۆشەك و لێفەی ئاوریشمیو پەڕی مریشك لە بەلەمی قەدریی بەلەموان دادەگرین. هەموان دەبینن."

"لەو شارۆچکە بچووکە کوا لێفەی پەری مریشك دەست دەکەوێت؟"

"لێفەی ئاوریشمیو پەڕی مریشك، کورسی مەخمەلّی، مافووری گرانبەها و قاپ و هیرباران دادەگرین و دایاندەنێینە سەر ئەسکەلە، پاشان بە یارمەتی خەڵکەکە دەیانبەینەوە ماڵەوە، دواتریش هاوسەرگیری دەکەین، زەماوەندێکی شکۆدار دەکەین. دوای ئەوە هیچکەس بە عەقڵی داناهێت ئێمە دەمانەوێت کەسێك بکوژین."

"کەس بە عەقڵی داناهێت."

لەوە بەدواوە نیشانچی، کەریم و کچۆڵەکەی بە وردی خستە ژێر چاودێریەوە. لەو ماڵەدا مێش باڵی لێکدابوا نیشانچی دەم و دەست دەیزانی.

کچەکانی هوسمەن هەوڵیاندەدا درێژە بە یاریکردن بە ماران بکەن، لە ترسان خەریکبوو زراویان بڕژێت، بەڵام لەبەر ئەوەی لە مارە شینە خاڵخاڵیەکە بترازێت مارێکی دیکەیان نەبینیبوو و لەگەڵ ئەمەشدا نەوەکانی نیشانچی لەو یاریکردنەدا بەشداریان کردبوو چەندی دەیانویست بترسن بۆیان نەدەکرا و ئەو یاریکردنە بە ماران وردە وردە جۆش و خرۆشی پێشانی نەدەدما.

کاتێك منداڵانی تازەهاتوەکان دوورگەیان پڕ کرد، خۆری کچەکانی هۆسمەنیش درەوشایەوە. بەر لە گەورەکان منداڵان بوونە دۆست و هاوڕێی یەکدی و دەستیان کرد بە یاریکردن. چەند رۆژێك دواتر، سێ کوڕیژگەی شەرمن لەو منداڵانەی تازەهاتوەکان لە لێوار دەریا لەگەڵ کچەکانی هۆسمەن دیداریان کرد، قاچەکانیان بە رۆخی هەڵدێرگەکەدا شۆڕ کردەوەو کەوتنە سەیرکردنی دەریا، دەریا چۆڵ چۆڵ بوو، بچووکترین و جووڵە و دەنگێکی لێوە نەدەهات. سەیرێکی دەریایان دەکرد و

سەیرێکی یەکدی، وەلـێ بابەتێکیان نەدەدۆزیەوە بۆ پێکەوە ئاخاوتن. کچە گەورەکەی هۆسمەن گوتی:

"ئێمە یارییێك دەزانین کە لەگەڵ هەموو منداڵانی دوورگە دەیکەین. یارییێکی هێندە خۆشە کە ئێمە بەردەوام هەر ئەو یاریە دەکەین. جگە لە منداڵانی دوورگەی ئێمە منداڵی هیچکام لە دوورگەکان نایزانن. چۆن بیزانن، خۆ لە دوورگەی ئەوان ماری درێژی شینی خاڵداری خاڵسپی نیە تاکو یاریکردن بە مار بکەن."

کچێکی هاوتەمەنی کچەکەی هۆسمەن کە لە تەك ئەو دانیشتبوو و قاچەکانی بە ڕۆخی هەڵدێرگەکە شۆڕکردبوونەوە گوتی: "ئەو یاریکردن بە مارە چ جۆرە یارییێکە، نیشانی ئێمەشی بدە با فێری ببین."

"یارییێکی سەختە. یاریە سەختەکان خۆشترن."

"کاتێك دارهەنارەکان کروکەیان دان دەچیت لە بەرامبەر باخی هەناراندا دەوەستیت، ئەوسا مارێکی شینی درێژ، کە خاڵخاڵی سپی پێوەن بە گینگڵدان لەژێر بەردی ئەولاوە دێتەخوار، دەچێتە لای منداڵەکان، درێژووکە سوورە دووسەریەکەی بەرەو چاوە زەقبووەوەکان با دەدات... منداڵەکان هەر ئەوە نیە هەترەشیان نارێژێت، هەڵدێن دەچنە نێو باخی هەناران، مارەکەش بەلۆنگان بە دوایاندا دێت. خۆیان بگەیەنێتێ چزەیان لێهەڵدەستێنێت و دەیانکوژێت."

کچێکی دیکەی هاوتەمەنی کچە بچووکەکەی هۆسمەن کە لە تەنیشتییەوە دانیشتبوو، گوتی:

"بڕۆ جانم، ئەمەش بووە یاری."

قاچەکانی هەڵکێشانەوە، هەستا، ئەوانی دیکەش هەستان، کچەکانی هوسمەن بەرەو لای ئەسکەلە ڕۆیشتن، منداڵەکانی دیکەش بەرەو لای خوارێ، چوونە سەر لێواری دەریا. لێوار وردەبەردی ڕەنگاوڕەنگی هەبوون، ئەو وردە بەردانەیان فڕێدەدانە نێو ئاو. ناشیرترین منداڵ تەنانەت کچەکانیش، ئەو وردە بەردەی هەڵیاندەدا لانیکەم سێ جار لە ئاوەکە هەڵدەقۆزیەوەو بەرزدەبوو و دیسان بە ئاو دەکەوتەوە. پێشبڕکێیەکە درێژەی کێشا، دواجار ئەوانیش بەرەو سەوزەزاری دامێن گردە بەرزەکەی بەرامبەریان ڕۆیشتن. هاتنە سەوزەزارەکە و بینیان لەوێ تا چاو دەبنێت ڕەزی ترێیە. مێوەکان هێشووە ترێی زەردیان شۆڕبووبوونەوە سەر زەوی و هەر هێشوێك سەدان دنکە ترێی شیرینی پێوە بوو. زەرد و گەردگرتوو. منداڵەکان بەرامبەر ڕەزەکان ڕاوەستان و چاویان بڕیە دنکە ترێیەکان کە دەتگوت ڕەواقی هەنگوینن. تا ئێستا هەمیشە لە بەرامبەر ڕەزەکان وەستاون و

چاویان بڕیوەتە هێشوە ترێیەکان و ئاوی دەمیان قووت داوەتەوە، بەڵام کەس ڕێگەی پێنەداون توخنی ناو ڕەزەکان بکەون. ئێستا لەنێو ڕەزەکە بوون، هێشووەکان هەڵمیان گرتبوو. یەکەمجار ئاوی دەمیان قووتدایەوە، پاشان دیسان دەمیان پڕ بووەوە لە ئاو، دەترسان هەنگاوێکی دیکە بچنە پێش. پێشان کەسانی تفەنگ بەشان هەر کەس تەنانەت ئەگەر لە ڕەزەکان نزیکیش بووبوایە وایان لێدەدا بمرن. سەیری خوارەوەیان کرد، دەریای گەورە تا چاوبڕ بکات درێژ بووبووەوە، سەیری لای باکووریان کرد زەویە هەموارەکە وەکو کلکە مراکێك ڕاست بەرەو دەریا کشابوو، لەلای باشووریش هەڵدێرگەیەك هەبوو سەرسووڕهێنەر و بەسەر دەریایدا دەڕوانی. سەیری لای دەستە ڕاستیان کرد، سەیری لای دەستە چەپیان کرد، نەکۆڵیتێك دیار بوو، نە کەپرێك، نە پەرژینێك و نە چیلەو دیوارێك. نیگاکانیان وەرسووڕایەوە سەر هێشووە هەڵمگرتوەکانی ترێیەکە. دووبارەو دووبارە ئاوی دەمیان قووت دایەوە، زاریان وشك کردەوە. دووربارە بە وردی سەیری دەوروبەری خۆیان کرد، کەس لەو نێوە دیار نەبوو، بەرەو ڕەزەکان چوون. هەر یەکە و لە ڕۆخ ڕەزێك دانیشت. لە دەرەوە نەدەبینران. دەستیان بۆ هشیوە ترێیەکان دەبرد و دانە دانە دنکە ترێی پشت سەریان لێدەکردنەوە و هەڵیاندەدانە دەمیان. ئەوان هێندەیان ترێ خوارد کە لە ماوەیەکی کەمدا ورگیان ڕەپ بوو، ماوەیەك نەیانتوانی لە شوێنی خۆیان بجوولێن. هەروا بە دانیشتنەوە لە شوێنی خۆیان مانەوە. خۆر خەریك بوو ئاوا دەبوو ئەوان هێشتا نەیاندەتوانی لە جێی خۆیان هەستن.

یەکێك لە منداڵەکان گوتی:

"ئەم ڕەزە بە مسۆگەری خاوەنی نیە. سەیر بکەن هیچکەس لێرە نیە."

منداڵێکی دیکە گوتی: "هەیەتی، مەگەر دەکرێت ڕەز خاوەنی نەبێت."

"دەکرێت، ناکرێت؟ خاوەنەکانیان زیندانی کراون. خانوەکانیان و کێڵگە و ڕەزو باخ و باخچەکانیان و هەموو شتێکیان، ئاشەکانیشیان ئاوا ماونەتەوە. ئاشەکانی ئەوان لەجیاتی ئاو با هەڵیاندەسووڕێنێت. نەتانبینین وەکو باڵی هەڵۆ دەخولێنەوە، ئەمانە پەروانەی ئاشەکان بوون. ئەوانەش کەسێك کڕیونی و گەنم و گەنمە شامیان لێدەکاتە ئارد."

"کەوایە ئەم ڕەزەشیان کڕیوە."

"مەگەر دەکرێت نەیانکڕیبێت، سەیر بکەن چ ترێیەکی شیرینە."

منداڵێکی دیکە گوتی: "من تا ئێستا ترێم نەخواردبوو."

منداڵەکانی دیکە یەکسەدا گوتیان: "ئێمەش نەمانخواردبوو تەنانەت ڕێگەیان پێنەدەداین بە ڕۆخ ڕەزەکانیشدا ڕەت ببین."

مشتومڕی ئەوەی داخۆ ئەم ڕەزە خاوەنی هەیە یان نیەتی درێژەی کێشا، هێزی خۆیان زۆر لەمە بەهەدەردا. دیسان هەر یەکە و لەبن دارمێوێك دانیشتن، کەوتنەوە خواردنی ترێ، بەڵام ئەمجارە زوو تێر بوون. بەر لەوەی لەوێ هەستن، لەبارەی ئەوەی داخۆ ترێ لەگەڵ خۆیان بۆ ماڵەوە ببەنەوە یان نا مشتومڕێکیان کرد، هەندێکیان دەیانگوت دەیبەینەوە، بەڵام کە شەو داهات ئەوسا دەیبەین. بەشێکی دیکەیان دەیانگوت ئەگەر خاوەنەکەی بمانبینێت بۆ کوێ رابکەین، دەمانگرن و زیندانیمان دەکەن. بۆچی لەو ڕەزانە پەرژین و کەپر و چادران دروست ناکەن، بۆچی؟

بچووکترین منداڵ وەڵامی ئەو پرسیارەی دایەوە:

"چونکە ئەم دوورگەیە جگە لە ئێمە کەسی تێدانیە."

بیریانکردەوە، بیریانکردەوە، پاشان گوتیان: "وایە."

"کەوایە، ئێمە ترێی خۆمان خوارد و زگمان پڕبووەو هەڵمساوە، ئەوانەی ماڵەوەش لە برسان مردن. لە ئێوە دەپرسم، ئەوان دەبێت بمرن؟ ئەوان ئەگەر لە جێی ئێمە بوان، بەر لە ئێمەش ئەم ڕەزانەیان بینیوە، بەر لەوەی تەنانەت دنکە ترێیەکیش بخۆن هەموویان کۆنەدەکردەوە نەیاندەهێنا بۆ ئێمە؟"

هەموان پێکەوە گوتیان: "دەیانهێنا."

"ئەویش بەر لەوەی بەخۆیان تەنانەت دنکە ترێیەکیشی بخۆن."

منداڵی یەکەم بڕیاریدا:

"ئەگەر وایە با کراسەکانمان دابکەنین، یەکسەر خۆمان ڕووت بکەین باشترە. سەردەست و یاخەی کراسەکانمان دەگرین، پڕیان دەکەین لە هێشوە هەرە گەورەو هەرە شیرینەکانیان."

باڵابەرزترین کچیان گوتی:

"ئێمە هیچ کراسمان نیە کە دایبکەنین. ئێمەش ڕۆیان دەکەینە دامەنی کراسەکانمان."

یەکێك لە کوڕەکان گوتی:

"ئێمەش کراسمان نەبوو، ئێمەش وەکو ئێوە کراسە شۆڕمان لەبەر بوو، کە گەورە بووین کورتەك و شەلواریان بۆ کڕین. ئێمەش ئەگەر ئێستا هەر ئەو کراسە شۆڕانەمان لەبەربوان، پڕمان دەکردن، ئەوەندەمان پڕدەکردن کە ئەوانەی ماڵەوە ئەوەندەیان ترێ خواردبوا ورگیان ڕەپ بووبوا."

"یاللا هەستن درەنگە."

هەریەکەیان لە کاتێکدا فوویان لە لەپی دەستەکانیان دەکرد بە زەحمەت توانیان هەستن. ئەمجارە لەو سەری رەزێك دانیشتن و هەر یەکە و یەك دوو هێشوویان لێکردەوە و خستیانە نێو کراس و دامەنەکانیان.

"ئێستا دەبێت ئارام ئارام برۆین و بچینە دۆڵی دارزەیتوونەکان و لەوێ خۆمان بشارینەوە، تا خۆر ئاوا دەبێت و تاریك دادێت لەوێ دەمێنینەوە، دوای ئەوەش ئیدی کێشە نابێت."

بەنێو دەوەنەکان بە دۆڵی دارزەیتووناندا چوونە خوار، ئەو ئاوەیان کە لە کانیەکەوە سەرچاوەی گرتبوو بینی، لە هەردوولای جۆگە ئاوەکە پوونگە بە گوڵە شینباوەکانیان روابوون کە رەنگ و بۆن و بەرامەیان بەم نێوەدا پەخش دەکرد. لەنێو ئاوەکە لە هەندێك جێگادا وردە بەردی وا هەبوون کە دەدرەوشانەوەو ئاوی ئەو جێگایانە دەلەریەوە.

"مندالێنە ماندوو بووین. با لێرە کەمێك ئاو بخۆینەوە و ئینجا دابنیشین پشووێك بدەین."

کوڕەکان هەموویان رووت بوون، کورتەکەکانیان لەژێر درەختەکان راخستن و کچەکان هەرچی لەنێو دامەنەکانیان بوو هەڵیانڕشت و دایاننایە سەر چیمەنەکان، روویان دایە ئاوەکە و تا تێربوون ئاویان خواردەوە پاشانیش چوونە ئەو شوێنەی کە درەخت و دەوەنی کەمتری لێبوون و لەوێ لەسەر چیمەنەکان دانیشتن.

کچە بالابەرزەکە گوتی:

"ئەم ئاوە لە کوێوە دێت، ئاوێکی چەند سازگارە، مرۆڤ وادەزانێت لەجیاتی ئاو بۆنی پوونگە دەخواتەوە."

کوڕی یەکەم گوتی:

"من نازانم ئەو ئاوە لە کوێوە دێت، وەلێ بێگومان لەلای سەرەوە، لەژێر زنارێکەوە دەردەبێت و بەرەو خوارەوە لێژ دەبێتەوە. بەمزوانە من و تۆ سەرچاوەکەی دەدۆزینەوە. ئاوێکی بەو سازگاریە کە بۆنی هەزار گوڵ دەدات دیارە لەنێو زنارەکاندا سەرچاوە دەگرێت. کانیەکانی کوێستانی ئێمەش لەنێو زنارەکاندا دەردەبن و کە دەبنە رووباریش هەمان ئەم بۆنەیان لێوەدێت."

پشتیان بە درەختەکانەوەدا، هەریەکەو چەند جارێك ئاوی خواردەوەو هەموویان پشوویان داو حەسانەوە، بەدەم یاری و پێکەنینەوە گەیشتنە نێو دەوەنەکان و لەوێ چاوەڕێیان کرد تا هەوا تاریك داهات. لە بێئۆقرەییان خەریکبوون دەمردن. ئەگەر هەوا تاریك دادەهات و ئەوان دەچوونەوە ماڵێ

خوا دەزانێت ئەوانەی ماڵەوە کاردانەوەیان چ دەبوو؟ منداڵێك کە لە پێش هەموویان بوو بەر لە هەموان گەیشتەوە ماڵێ، هەر کە هەوا تاریك داهات پێی بە غاردانێ کرد، بەدوای ئەویشدا منداڵەکانی دیکە... روخساری دایکی منداڵەکە بە بینینی هێشووە ترێیەکانی ناو کورتەکی کوڕەکەی زەرد زەرد هەڵگەڕاو بەدەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

"ئەم ترێیەتان لە کامە رەزدا دزیوە، ماڵوێرانتان کردین. ئەمجارەش بەهۆی دزینی ترێوە لێرە دەردەکرێین، ئەم خانوە جوانە لە دەست دەدەین."

لێوەکانی باوکیشی لەرزین. لە تووڕەییان رەگی ملی رەپ بووبوون، لە کاتێکدا ددانی لەسەریەك دەگیرساندن، گوتی:

"بەڵای گیان، تەنها ئەوەمان کەم بوو کە ئەو بەڵایەمان بەسەر بێنیت. تف لە رووت." دەستەکانی بە تەرۆکیدا کەوتن، بەناچاری، "ئێرە دوورگەیە، هەر چواردەوریشی دەریایە و هیچ رێگایەك بۆ راکردن نیە. ئێستا دەبێت ئێمە چیبکەین؟"

بێدەنگ بوو، دەستی خستنە سەر دەم و چاوی، دوای بیرکردنەوە وەك بڵێی تووڕەییەکەی کەمێك دامرکایەوە، بە خوێنساردیەوە گوتی:

"یاللا ئەم ترێیە هەڵبگرەو بیبەروە بۆ ئەو شوێنەی لێتهێناوە!"

"بوەستە بابە، مەترسە بابە، مەگەر من لە دەشتی ئایدین گفتم پێتنەدا ئیدی دزی نەکەم؟"

"گفتت دا، بەڵام ئەمە چیە؟"

"ترێم نەدزیوە."

"کێ ترێی داونەتێ."

"کەس نەیداوە."

"کەس نەیداوە، ئەدی ئەمە چیە؟"

کوڕەکە هەمووی بۆ باسکردن.

"گوتت خاوەنی نیە؟"

"لە گەردی بەیانیەوە تا شەو داهات لەنێو رەزەکە ماینەوە، ئەوەندەمان ترێ خوارد کە زگمان بای کرد، دوای ئەوەش کورتەك و ئێلەگەکانمان داکەندن و پڕمانکردن لە ترێ. چاوەڕێمان کرد تا شەو داهات، ئاومان خواردەوە. بوەستە بابە زگم قۆڕە قۆڕ دەکات." وەکو تیر لە دەرگای ماڵەوە رایکردە دەرەوە، کەمێك دواتر بە روخسارێکی شینهەڵگەڕاو گەڕایەوە.

"ئەوەندەت ترێ خواردووە زگچوونت گەیشتوەتێ کوڕە؟"

"سگچوونم گرتوە بابە."

"گوتت ئەم رەزە چیلەی بەردو پەرژینیشی نیە؟"

"نیەتی بابە. لەو گردەی سەرەوە تا دەگاتە دەریا هەموو رەزو باخە."

"گوتت رەزەکە دیدەوان و کۆڵێتی رەزەوانیشی لێنیە؟"

"کەسی لێنەبوو بابە."

"رەزو باخی ئەوانەن کە لێرە رۆیشتوون. باشتانکرد کە ئەو رەزانەتان دۆزیەوە."

"دۆزیماننەوە بابە، هەر کە بینیمان پەرژینیان نیە..."

"پێویست بە پەرژین ناکەن کوڕم، هەرچوار دەوری ئێرە دەریایە. کێ دەتوانێت لە دەریاڕا بهێت و بچێتە نێو ئەو رەزو باخانە."

لەودەمەدا منداڵەکە رایکردە دەرەوە، هاوکات، ژمارەیەك ژن و پیاو بەدەستپاچەیی و شڵەژاویەوە وەژوورکەوتن. پیاوێك کە ریشێکی پڕی هەبوو و لەپێش هەموویان بوو گوتی: "کوڕەکەی تۆ ئێمەی لەناوبرد و مەحفی کردینەوە."

"کوڕی ئێمە چیکردوە، ئێستا وەرن دانیشن."

دانیشتن و پشتیان بە دیوارەکانەوەدا و قاچیان راکێشان.

"کوڕەکەی تۆ منداڵەکانی لەگەڵ خۆی بردوەو هەموو رەزەکانیان پێکەوە تاڵان کردوون. وەهاب بەگ متمانەی بە ئێمە کرد و ناردینی بۆ ئێرە کە دەڵێی بەهەشتە، ئێستا چیبکەین؟"

"ئێمە کە هاتینە ئێرە خەڵکی ئێرە وەکو سەربازانی پاشا پێشوازیان لێکردین."

"سبەی ئەگەر پێمانبڵێن منداڵەکانی ئێوە رەزەکانی ئێمەیان غارەت کردوە چیانپێبڵێین؟"

"ئەگەر لێرەش دەرمان بکەن..."

"دەبێت پەنا بۆ کوێ ببەین؟"

"ئێمە چ گوناهێکمان کردوە؟"

"ساڵەهایە بە ئاوارەیی..."

"وەکو سەگ جێگەیەکمان بۆ نەماوەتەوە."

"جێگایەکمان بۆ خۆمان پەیدا کردبوو."

"ئەویش بەهۆی کوڕەکەی تۆ..."

"ئێستا سەری زستان بۆ کوێ بچین، چیبکەین، ئەویش بە تۆمەتی دزیەوە."

"دزیمان کرد کە کردمان..."

"برسی بووین..."

"مرۆڤی برسی دزیش دەکات."

"هەتا ئەگەر پاشاش بێت."

"هەتا ئەگەر خودی وەهاب بەگیش بێت."

"هەتا هەموو..."

"کوڕی تۆ برسی بوو کە دزی کرد؟"

"تێنوو بوو؟"

"بووە باعیسی ئەوەی منداڵەکانی ئێمەش دزی بکەن..

"لەمە بەدواوە بە چ رووێکەوە سەیری روخساریان بکەین؟"

"ئێمە سەیریان دەکەین، بەڵام ئەوان چی، سەیری روخساریشمان دەکەن؟"

"من کە گونیە ترێیەکم لەنێو دامەنی کراسی کچەم بینی زراوم رژا. گوتم، کچێ ئەو هەموو ترێیەت لەکوێ هێنا؟ منە منی کرد. من ترێیەکەم هەڵگرت و بردم و هەڵمڕشتە نێو دەریا. ترێیەکی چەند جوان بوو، زەرد زەرد وەکو کارەبا. هەر دنکە ترێیەك دەتگوت شیلەی هەنگوینە، کە هەڵمدەڕشتە نێو دەریا حاڵەتێکی سەیرم بەسەرهات. مردم و زیندوو بوومەوە. لە ترسان نەمتوانی دنکێکی لێبکەمەوە و بیخەمە زارمەوە."

"داخ بۆ ئەمە دەخۆیت، یان بۆ ئەوەی کە دزیمان کردوە، ئاه لە دەستی کوڕەکەی تۆ."

باوکی کوڕەکە هاواری کرد و گوتی: "بەسە ئیدی. بەسە، کوڕی من چیکردوە کە هەموومان بووین بەدز. منداڵەکان هەموو پێکەوە چوونە رەزێکی بێخاوەنیان دۆزیوەتەوە. رەزەکە ئەوەندە گەورەیە کە تا ئەو سەرەوەی گردە بەرزەکەی بەرامبەر درێژ بۆتەوە. نە دیدەوانی هەیە و نە پەرژین. ئاگاتان لەخۆتان بێت و ئەوەندە مەڵێن کوڕی تۆ، کوڕی تۆ. منداڵەکان کارێکی باشیان کردوە. رێگا بە ئێمە نیشان دەدەن. تا ئێستا کەس رێگەی پێداوین لە رەزێك، باخێك کار بکەین، رێگەیان پێداوین بە رۆخ باخێکدا تێبپەڕین؟ دوای ئەو هەموو ساڵە توانیمان دنکە ترێیەك بخەینە دەممانەوە، مەگەر ئەم دوورگە بەهشتیە و ئەو خانوە کۆشکئاساییانە، خوا خێریان بنووسێت، لە یۆنانیەکانەوە

بۆمان نەماونەتەوە؟ مەگەر ئەو ترێیە کە هەر دنکێکی دەڵێیت هەنگوینە هی یۆنانیەکان نیە؟ خوا خێریان بنووسێت."

بانگی کوڕەکەی کرد:

"کوڕم وەرە لێرە دانیشە، ڕووداوەکە بۆ خاڵ و پوورەکانت باس بکە."

"من با جارێ بچمە دەرەوە، ئینجا."

یەکسەر چووەدەر.

"منداڵەکانی ئێمەش لەو حاڵەدان، هەر لەدەرەوەن." "کچەکەی ئێمەش."

"ئەوەندەیان ترێ خواردووە کە سکچوونیان گرتوە."

"ترێیەکە هێندە شیرینە ناکرێت نەیخۆیت."

منداڵەکە لە کاتێکدا دۆخینی شەلوارەکەی بەدەستەوە بوو و گرێی دەدا هاتەوە ژوور، هات و لە تەنیشت باوکیەوە دانیشت، دەستی بە قسان کرد، هەموان بە حەپەساویەوە سەیریان دەکرد کوڕیژگەکە بۆی باس دەکردن کە چۆن ڕەزەکەیان دۆزیوەتەوە، هێشووە ترێیەکان چۆن بوون و چۆن ترێیان خواردووەو ورگیان بای کردووە. لە ماوەی گێڕانەوەی ئەم قسانەی سێ جاران چووە دەرێ و هاتەوە ژوورێ.

"سبەینێش ئێمە بچینە ناو ڕەزەکە."

"کاتێك دەچین با خەڵکی پێشتر نەمانبینن."

"با نەبینن، دیار نیە چ دەبێت."

"بە دڵی خۆمان لەوێ ترێ دەخۆین، ترێی وا کە لەوەتەی هەین تامەزرۆی خواردنی هەین."

"دەیخۆین دۆستان."

"ئەمەش بە سای سەری منداڵەکان."

"ئەگەر منداڵەکان نەبوان تا دەمردین تامی ترێمان نەدەزانی."

"تەنانەت بۆ لێکردنەوەی ترێش لێنەدەگەڕان بچینە نێو ڕەزان، وایاندەزانی هەموو ترێیەکەیان دەخۆین و هیچ بۆ ئەوان ناهێڵینەوە."

"باش بوو، ڕەزە ترێیەکانمان دۆزیەوە کە هەم ترێی پندرو تازە دەخۆین و هەم دۆشاو دروست دەکەین و هەم شتی دیکە."

"بژیت کوڕەکەی تۆ، هەر بژین منداڵەکان."

"تەمەندرێژبن، تەمەندرێژبن منداڵەکان، بەڵام ئەگەر لەکاتی ترێڕنیندا بمانگرن تەنانەت بەو سەرما و سۆڵەیە وەدەرمان دەنێن. پاشان ئیدی ئاوارەیی دوای ئاوارەیی."

کابرایەکی سەرڕووت گوتی: "بێکاری و ئاوارەیی، ئەگەر دەتانەوێت بزانن ناوم چیە ناوم عەلیە کەچەڵە. بەهۆی سەرە تاسەکەم عەقڵ و هۆشم زۆرە. بۆیە، ئەوکاتەی حکومەت بۆ سەربازێك دەچووە ئاسمان، منی نەبردو گوتی ئەمە بە دەرد ناخوات و نەیانبردمە سەربازی. نووسراوێکیشیان دامێ کە تێیدا نووسرابوو هۆی چیە نایانەوێت ئەو کوڕە کەچەڵە ببەنە سەربازی. ئەگەر منیان بردبوایە بۆ سەربازی، ئەنوەر پاشا نەیدەتوانی ئەو هەموو گوللەیە بخاتە نێودەمی سەربازەکان. ئەگەر منیان بە سەرباز گرتبوا ئەنوەر پاشا نەیدەتوانی ئەو هەموو سەربازە کە خواش لەبیری کردبوون بەپێی پەتی هەڵبگرێت و بیانباتە سەرچیای سەخت و عاسێی ئەڵلاهوئەکبەر هەموویان بە کوشتن بدات. هەموویان لەوێ رەق ببنەوە. ئەگەر بیانزانیبوا لەناو ئەو کەللە تاس و کەچەڵەکەی مندا چ عەقڵ و هۆشێك هەیە و دەیانبردمە سەربازی، ئەنوەر پاشا زاتی نەدەکرد لەشکرێکی وا مەزن بەو چلەی زستانە رەوانەی سەر دوندی چیاکان بکات و بیانکات بە خۆراکی ئەسپێیان و لەنێو بەفر و سەرما و سۆڵەدا رەق ببنەوە و ببنە یەکپارچە سەهۆڵ. ئێستا با عاقڵانە بیری لێبکەینەوە، ئێستا ئەو کەللەیەی من.. باوك و دایکی ئەو منداڵانەی کە دوێنێ ئەو رەزە گەورەیان دۆزیوەتەوە لێرەن؟"

هەموویان یەکدەنگ گوتیان: "لێرەن."

"کەواتە کاتی بانگی کەڵەشێران، هەر منداڵە و سەبەتەیەك یان تریانێکی بدەنە دەست و بیانێرنە بن ئەو دارهەرمێیە گەورەیە، بەڵام نابێت کەس پێبزانێت. دارهەرمێیەکەتان بینیوە، شارەزای هەن؟"

هەموان یەکدەنگ گوتیان: "پێیدەزانین."

"منداڵەکان لە چاوەڕوانی دامەنێن، رێك کاتی بانگی کەڵەشێران دەبێت سەبەتە بەدەست لەژێر دارهەرمێیەکە بن."

هەموان یەکدەنگ گوتیان:

"کاتی بانگی کەڵەشێران دەبێت لە بن دارهەرمێیەکە بن، دروستە؟"

عەلیە کەچەڵ گوتی: "دروستە."

"ڕۆژی دواتریش هەموو ئەم کەسانەی کە لێرەن لەگەڵ بانگی کەڵەشێران پێکەوە دەچینەوە ناو ڕەزەکە، بەڵام هەموومان پێکەوە. یەك کەس لەم ژمارەیەی ئێستا نابێت کەم بێت. ئەگەر نەخۆشێکیشمان هەبوو بە کۆڵ هەڵیدەگرین و دەیبەینە ئەوێ، لەوێ ترێ لێدەکەینەوەو کە هاتینەوە دەیبەینەوە ماڵ. ئێستا کە خوا ئەو ڕەزەی بۆ دیاریکردووین دەبێت کەڵکی لێوەربگرین. واتە درستان، ئومێدەوارم بە کامی دڵی خۆمان بێت و لێمان تاڵ نەبێت. توانیم مەبەستەکەی خۆم بگەیەنم؟"

هەموان یەکدەنگ گوتیان: "بە باشی ڕوونت کردەوە."

"جارێکی دیکە سبەی من..."

"سبەی کاتی کەڵەشێر دەخوێنن لەژێر دارهەرمێیە گەورەکە..."

"بە سەبەتەی گەورە چاوەڕێم بن. ئەمە لەلایەك. پاشان، ئەوانەی کە بۆ ترێ لێکردنەوە درەنگ دێن..."

"هەموومان پێکەوە، بێئەوەی کەسمان کەم بێت دەچین بۆ لێکردنەوەی ترێ و خواردنی و دروستکردنی دۆشاو و مێوژ و باسوق.."

"تا ئێستا کاتی لێکردنەوەو کۆکردنەوەی مێوە تەنانەت لێنەگەڕاون بە تەنیشت ڕەز و باخەکانیشدا تێبپەڕین."

"تەنانەت لێنەدەگەڕان لە دەرەوەش سەیریان بکەین."

"ئێستاش ئێمە ڕێگە بەوان نادەین. ئەوانیش تەنانەت بۆیان نیە لە دەرەوەش سەیری بکەن."

گفتوگۆکەیان ئاوا بە خۆشی کۆتایی هات. هەستان، هەروا کە لە پلیکانەکان دەچوونە خوار یەکێکیان گوتی:

"سبەینێ منداڵەکان ببەینە لای دکتۆرەکان. ئەوەندەی بچنە دەرێ و بچنە سەرپێیان هەر ئێسك و پێست ماونەتەوە. باخچەی ماڵەکانیش پڕ بووە."

یەکێکی دیکە وەڵامی دایەوە:

"نە، ئەمە نابێت، دکتۆرەکان تێدەگەن ئەو هەموو منداڵە بۆچی سکچوونیان گرتوە، واتە تێناگەن هەموویان ترێیان خواردوە؟ مرۆڤ بۆچی تووشی سکچوون دەبێت، بە خواردنی ترێ سکچوون ناگرێت؟ تۆ هەرچەند بڵێیت منداڵەکان ڕەوان بوونە دکتۆرەکان تێدەگەن ڕەوانبوون هەمان سکچوونە و ئەگەر ڕەزەکان خاوەنیان هەبێت هەر زوو هەواڵەکەیان پێڕادەگەیەنن و ئەوانیش

بەخۆیان و پاسەوان و تۆپ و تفەنگەکانی کە لە چاناك قەڵاو گەلیبۆلۆ و ساری قامیشەوە بۆیان بەجێماون دێن و پاسەوانی لە رەزو باخەکانیان دەکەن، دنکە ترێیەکیشی نادەن، مەگەر ترێی خۆیان نیە و هێندەی گیانی خۆیان دڵیان پێیەوە نیە؟ بۆیە ئێمە دوای ئەوەی کاری لێکردنەوەی ترێمان تەواو کرد ئەوکات دەتوانین منداڵەکان ببەینە لای دکتۆرەکان. دەتانەوێت ئێستا بیانبەین و بەپێ و زمانی خۆمان خۆمان بخەینە داوەوە؟ ئەو باخدارانە ئەوەندە دڵڕەقن کە ئەگەر کەسێکی نامۆیان لەنێو رەزو باخەکانیان بینی، دەیگرن و تێروپڕ تێیهەڵدەدەن. یاللا وەرێکەون، سبەی دەچین بۆ ترێ لێکردنەوە."

چەند رۆژێك تێپەڕی، دوورگە وەکو رابردوو رۆچووەوە نێو کپی و بێدەنگیەوە. لە کاتێکدا کە دوورگە تەنانەت لەو رۆژانەش کە کۆچبەرە ئەنەدۆڵیەکان تازە گەیشتبوون تەواو ئاوەدان بووبوو و لە گۆشە و کەناری دوورگە دەنگی گۆرانی و هاوارو گریانی منداڵ و لانیکەم گمەگمێکی وەکو سەردولکەی ژنان دەبیسترا. هەموو دەنگەکان بە یەکجاری کپ بووبوون و نەمابوون. نیشانچی دەمێك بوو بە ئاگا هاتبوو و لە دەنگی دەریا بترازێت کە خووی پێوەگرتبوو هیچ دەنگێکی دیکەی نەدەبیست. ئەمە لەکاتێکدا کە دوای هاتنی کۆچبەرە ئەنەدۆڵیەکان ئەو بێدەنگیەی دوورگە شکابوو. تەنانەت شەوانیش هەندێکجار لەملاو ئەولا دەنگێك دەبیسترا. چەند رۆژبوو... نیشانچی لەنێوجێ هاتەدەر، سوڵتانی هاوسەری و نەوەکانی لە شیرینە خەودا بوون، چوو لەبەردەم پەنجەرە راوەستا، تێر بەسیەکانی هەوای پاکی هەڵمژی. هەوا وەکو هەمیشە بۆنی دەریای دەدا، بەڵام لەنێو ئەو بۆنەدا بۆنێکی ناخۆش هات. نیشانچی لەبەرخۆیەوە گوتی ئەم بۆنە بۆنی چیە. لەوەتەی هاتۆتە دوورگە بۆنی وای بۆ نەهاتوە. کونە لووتەکانی وەك تفنکی ئەسپێکی لە حاڵەتی غاردان کرانەوە و داخرانەوە، ئیدی هەستی بە بۆنەکە نەدەکرد. ئەو لە دیاریکردنی بۆندا پسپۆڕ بوو، بە زەینیدا گوزەرا، پیر بوومە؟ سەردەمێك لەکاتی تاریکیدا کە بەشوێنێکدا تێدەپەڕی دەیتوانی بۆنی گیاکان، درەختەکان و بەروبوومەکانی ئەملاو ئەولای رێگاو ناو و جۆری ئەو گیاوگۆڵ و دارو درەخت و بەروبوومانە بەباشی دیاری بکات و لە یەکدیان جیا بکاتەوە. بە چاوبەستراویش شارەکانی بە بۆنیانەوە دەناسیەوە. چونکە هەر شارێك بۆنی تایبەتی خۆی هەیە. هەروەها هەر بەرد و کانیاوێك. کانیاوەکانی نێو دەشت و چیاکان و نێوان زنارەکان بۆنی جیاجیایان هەیە. نەیتوانی ئەو بۆنە ناخۆشەی کە لەگەڵ بۆنی دەریا دەهات دووبارە هەست پێبکاتەوە، ئەمەش لە غروری و فیزەکەی دا. لە ئاسۆگەی رەنگاوڕەنگدا شنەی سپێدە دەهات و ئەو لەبەر خۆیەوە گوتی خۆزگە بە ئاگا

نەهاتبوامەوە کە لە هەموو لایەکی دوورگەکە یەکدەنگ و پێکەوە دەنگی خوێندنی کەڵەشێران بەرزبووەوە. گوتی چەند باش بوو، دڵی وەکو جاران تژی بووەوە لە شادی و شاگەشکە بوو. شنەی بەرەبەیان هەڵیکرد. نیشانچی لە خۆشیان نەیدەزانی چیبکات. لە خۆشحاڵیان جێی لەنێو پێستی خۆی نەدەبووەوە. قووقەی کەڵەشێران تا دەهات زیاتر دەبوو، ئاسۆ خەریکبوو رووناك دەبووەوە، بە هەڵەداوان خۆی گەیاندە لێواری دەریا، چوو لەسەر رۆخی هەڵدێرگەکە دانیشت، قاچەکانی شۆڕکردنەوە. چاوی بڕینە ئەو ئاسۆیەی کە خەریکبوو رووناك دەبووەوە، کە خۆر لە ئاسۆدا سەری دەرهێنا کەڵەشێرەکان هەموویان کڕو بێدەنگ بوون، ئەویش گەڕایەوە ماڵێ. سوڵتان لە خەو هەستابوو، جلەکانی پۆشیبوون، کورسی لەبەردەم پەنجەرە دانابوو و چاوی بڕیبوونە تیرێژەکانی ئاسۆگە. هەر لەگەڵ بیستنی دەنگی پێ کە لە پلیکانەکانەوە دەهات یەکسەر هەستاو گوتی:

"وەلی، وەلیی خۆم." بەوپەڕی شەوقەوە پێدەکەنی: "لێرەش، لێرەش کەڵەشێرەکان دەخوێنن، بیستت؟"

"ئەدی بیستم، بیستم و لە خۆشیان باڵم گرت و فڕیم. نەمدەتوانی لەسەر جێی خۆم بوەستم. نەمدەزانی چیبکەم، بە باڵەکانمەوە کەوتمە نێو دەریایەك لە شادمانی. ئەو دەمەش دەنگی کەڵەشێران وەستا، هەستام و هاتمەوە بۆ ئێرە لای تۆ."

هەردووکیان ئاوا نوقمی نێو شادمانی لە ماڵێدا بۆ سەرەوە دەچوون و دەهاتنەوە خوارێ.

"من لە گەڕانەوەم بۆ دێ زۆر پەشیمان بوومەتەوە. کوڕەکانمان ساخ بن ئێستا گرنگ نیە لە هەر جێگایەك بن. ئەوەندە بەسە کە ساخ بن. ئەوان لە هەر جێگایەك بن، بانگی کەڵەشێرەکان دەبیستن، مەگەر نە؟ کەڵەشێرەکانی ئەوێش دەخوێنن، مەگەر نە؟"

"دەبیستن، هەڵبەتە کە دەبیستن، مەگەر دەشێت کەڵەشێرەکان نەخوێنن؟"

"لە گوندەکەی ئێمەدا هیچ کەڵەشێرێك نەمابوو. ئێمەش پەشێوحاڵ مابووینەوە. سوپاس بۆ خوا، لەم دوورگەیە توانیمان دەنگی قووقەی کەڵەشێران ببیستین. ئینشاڵلا، کوڕەکانمان لە هەر جێگایەکی ئەم دنیایە بن گوێیان لە بانگی کەڵەشێرەکان بووە. لە جێگاکانی دیکەش کاتێك ئاسۆ رووناك دەبێتەوە کەڵەشێرەکان وەکو ئێستا دەخوێنن؟"

نیشانچی گوتی: "دەخوێنن. یەمەن لەوسەری دنیایە. لە دەربەند و بیابان و ئەودیوی دنیاش بەر لە رووناکبوونەوەی ئاسۆ کەڵەشێرەکان دەخوێنن. هەروەها رێك سەروبەندی نیوەڕۆ، نیوەشەوانیش دەخوێنن."

سولّتان ئاهێکی هەڵکێشا.

"لەوسەری دنیا و هەموو لایەکی دنیا هاوکات دەخوێنن، مەگەر نە؟ ئێستا منداڵەکانی ئێمە، بە روناکبوونی ئاسۆ لە خەو هەستاون و گوێیان لەو بانگەی کەڵەشێران گرتوە، مەگەر نە؟"

"گوێیان گرتوە."

"منداڵەکانی ئێمە ئەودەمەی کە شنەی بەرەبەیان هەڵیدەکرد، دوندی چیاکان رووناك دەبوون و نوقمی نێو شادمانی بوون باڵیان لێڕواو هاتنە ئێرەو پاشانیش گەڕانەوە، مەگەر نە؟"

نیشانچی گوتی: "وایە."

لێناش دەنگی کەڵەشێرەکانی شنەفت، خێرا پۆیرازی بێدار کردەوە.

"بانگی کەڵەشێران، دایکە، سوپاس بۆ خوا بانگی کەڵەشێران، لە کوێوە دێت، دایکە؟"

"لە کولانەی تازەهاتوەکان. بەرلەوەش، بەر لە رۆیشتنی منداڵەکانی ئێمە لەم دێیەش کەڵەشێرەکان دەیانخوێند. کەڵەشێرەکانی ئێمە کەڵەشێری دەریایی بوون. لە هەرماڵێکدا لانیکەم سێ چوار دانە کەڵەشێری دەریاییان بەخێو دەکرد. دەڵێن کە، لە هیچ جێگایەکی دنیا دەنگێك لە دەنگی کەڵەشێری دەریایی جوانتر و خۆشتر نیە. ئەمڕۆ کاتێك کەڵەشێرەکان دەیانخوێند دەنگی پێنج دانە لەو کەڵەشێرانەی دەریایش دەهات."

"کاتی خوێندنی کەڵەشێرەکان موسا ئاغا بێداربوو، لەگەڵ بیستنی بانگی کەڵەشێرەکان یەکسەر بەرەو لای پەنجەرە رایکرد، سەیری چیاکانی دەوروبەری کرد و زۆری نەمابوو ئاسۆ رووناك ببێتەوە، وەك دیاربوو لە هەموو دنیاو لە هەمان چرکەسات و هەمان سەعات و هەمان خولەك، هاوکات کەڵەشێرەکان دەیانخوێند. لەبەر خۆیەوە گوتی چەند سەیرە.

حەسەنی راکردوو گوتی: "هێی، هێی، ئەمانە هاتنە دوورگەی ئێمە، خێرو بەرەکەتیان هێنایە دوورگە. دەبێت لەنێو دەریا گوێ لەدەنگی ئەمانە بگریت، ئەم دەنگە مرۆڤ خەنی دەکات، دەیخاتە سەر باڵەکانی و دەیباتە بەهەشت و لەوێ دەیگەڕێنێت، کە ئاسۆ رووناك دەبێتەوە، کاتی تێپەڕین بەنێو تیشك و رۆشناییەکان. مرۆڤ وەك ئەوەی لە حاڵەتێکی داماوانە دابێت ئاگای لەخۆی دەبڕێت. زام و چێژێك کە تا قووڵایی دڵی، تا مۆخی ئێسقانەکانی رۆدەچێت و ئیدی لەنێو ناچێت، هەرجارێك کە بەبیری دێتەوە نوقمی نێو شادی و بەختەوەری دەبێت.

ئەوان لە کاتێکدا کە بەدەنگی کەڵەشێرەکان خەبەریان بووبووەوەو هەستیان بە شادی و بەختەوەری دەکرد، تازەهاتوەکان بەخەبەر هاتبوون و دەست و دەم و چاویان شووشتبوو و

جلوبەرگیان پۆشیبوو، سەبەتە و تریان و گونیەکانیان هەڵگرتبوون، یەك یەك بە دۆڵی دارزەیتوونکاندا، بێدەنگ و کش و مات بەرەو رەزەکان دەچوون. کە خۆرهەڵات هەموویان لە گۆڕەپانەکەی ناوەڕاستی رەزەکان لە دەوری یەکدی کۆبووبوونەوە، بێئەوەی لەگەڵ یەکدا بدوێن چوونە نێو رەزەکان. ئەوانیش وەکو منداڵەکان هەریەکەو لە ناو رەزێکدا دانیشتن و بە هەشتاویەوە کەوتنە ترێ خواردن. تا نیوەڕۆ ئەوەندەیان ترێ خواردبوو کە بە زەحمەت دەیانتوانی لەجێی خۆیان هەستن.

تا عەسر لەنێو رەزەکان لەسەر ئەو خاکە داغبووە راکشان، کەمێك پشوویان دا، پاشان دەستیان کرد بە پڕکردنی سەبەتە و زەنبیل و توورەگە و گونیەکانیان. کارەکەیان تا تاریك داهات درێژەی کێشا، دووبارە لە یەك جیابوونەوەو زەنبیل بەدەست و سەبەتە بە کۆڵ و بە توورەگە و گونیەکانیانەوە پەرتەیان لێکردو بە ئەسپایی و نهێنی بێئەوەی هیچ رووداوێکی ناخۆشیان بۆ بێتەپێش گەڕانەوە نێو گوند. بڕیاربوو هەندێکیان بەو ترێیەی هێنابوویانەوە دۆشاو و هەندێکیشیان باسوق دروست بکەن و بەشێکی دیکەشیان بە تەمابوون مێوژان بکەن، ئەگەرچی لەنێویاندا هەندێکیان لەو کارانەدا تەواو شارەزا بوون، بەڵام خاوەن باخەکان رێگەیان پێنەدەدان کار لەنێو رەز و باخەکانیاندا بکەن و تەنانەت لێنەدەگەڕان بە تەنیشت رەزو باخەکانیاندا تێشبپەڕن، بەڵام ئێستا، دەیانتوانی ئەم زستانە بە ئاسوودەیی بەڕێبکەن.

کاری لێکردنەوەی ترێ تا هاتنی سێ بەلەمی ماتۆڕدار و نزیکەی سی کرێکار بەخۆیان و ژمارەیکی زۆر زەنبیل و سەبەتە و شوکری ئەفەندی بەردەوام بوو. شوکری ئەفەندی، کرێکارەکان، موسا کازم ئاغا، مەلەك خانم، دکتۆر سەلمان سامی، نیشانچی، حەسەنی راکردوو و پزیشکی ئاژەڵان لەگەڵ پۆیراز بەرەو لای رەزەکان بەڕێکەوتن. شوکری ئەفەندی بە جۆش و خرۆشەوە بە پێش هەموان کەوتبوو، جار جار ئاوڕی دەدایەوەو دەیگوت دەبینن کە رەزو باخی ئاوا باش و بەرگر لە هیچ جێگایەکی ئەم دنیایەدا دەست ناکەون، ئەگەر ئەو باخدارانەی کە کاریان لەو باخانە کردوە و پێیان راگەیشتوون لێرە بوان بەرێزەوە نێوچاوانم ماچ دەکردن. تا زیاتر لە رەزو باخەکان نزیکتر دەبوونەو وروژانەکەی زیادی دەکرد، خێرا خێرا و بەراکردنەوە هەنگاوی دەنان و دەچووە پێش، رادەوەستا، ئاوڕی لە دواوە دەدایەوە، چاوەڕێی دەکرد تا ئەوانی دیکە دەگەیشتن، بەمشێوەیە گەیشتنە نێو رەزەکان.

شوکری ئەفەندی چووە نێو رەزێك، لە بن بەردێك چاوەڕێی کرد تا ئەوانی دیکەش بگەنە ئەوێ. کەمێك دواتر ئەوانیش گەیشتن. لە نزیك دارتووییێك لە دەوری یەکدی کۆبوونەوە. نزیکەی پەنجا هەنگاوێك نێوانیان لەگەڵ رەزەکان هەبوو، خەڵکی دوورگە، خێراتر لە شوکری ئەفەندی ئەو مەودا پەنجا هەنگاوەییەیان تەی کرد و چوونە نێو رەزەکان. کەمێك دواتر شوکری ئەفەندی دیسان بەپێش هەموان کەوتبووەوە. بەخێراییەکی زیاتر رێگاکەی دەبڕی، لە پڕێکدا راوەستا، هەندێك دەنگی نزم و نووزەئاسای لە قورگیەوە دەرچوو. ئەوانەی دواوەتر پێیگەیشتنەوە، شوکری ئەفەندی تەنها هەر توانی ئەوەندە بڵێت، پەنا بەخوا، پەنا بەخوا، پاڵی بە پۆیرازەوەدا کە لە تەنیشتیەوە بوو.

"پەنا بەخوا، پەنا بەخوا، چیبووە؟ چیبووە؟"

پۆیرازی بەجێهێشت، بەدەم ورتە ورت و بۆڵە بۆڵەوە بە راکردن چووە نێو رەزەکە، هەندێکجار رادەوەستاو دادەهاتەوە، سەیری ئەملاو ئەولای دەکرد. لەم ساتەدا پۆیراز لە پێشتر و ئەوانی دیکەش بەدوای ئەودا دەڕۆیشتن. رەز پایەماڵ بووبوو و هیچی تێدا نەمابوو، رستەی مێوەکان پچڕاو و خۆڵاوی و رەگی مێوەکان هەڵکەندراو... شوکری ئەفەندی بە بینینی ئەودیمەنە پێیوابوو لەوەش خراپتری بەسەر دێت و هەر ئێستا نا ئێستا لە هۆش خۆی دەچێت، بەڵام هیچی لێنەهات، روخساری زەرد زەرد هەڵگەڕا، نێوچاوانی گنج گنج بوو، لێوەکانی شین هەڵگەڕان، دەستەکانیشی دەلەرزین. دەینەڕاند و دەڕۆیشت و دەیگوت: "پەنا بەخوا، پەنا بەخوا، هەموو رەزەکانیان هەڵلۆشیون، کێ ئەم کارەی کردوە؟" بەهەر لایەکدا دەڕۆیشت لەلایەکەی دیکە خراپتر بوو:

"پەنا بەخوا، پەنا بەخوا، خوایە کێ ئەم کارە کردوە؟ کێ ئەم کارەی کردوە."

نزیکەی نیوەی رەزەکەیان بەسەرکردبووەوە. تا زیاتر دەچوونە پێشەوە رەوشەکە خراپتر بوو. هێشوەکان لەو گۆڕە بەسەر یەکدا رۆکرابوون و پێشێل کرابوون. سێ کرێکار بە راکردنەوە رووبەڕوویان هاتن، هەناسەیان سوار بووبوو، لەبەردەم شوکری ئەفەندی راوەستان و گوتیان:

"ئێمە بە راکردن و خێرا خێرا هەموو رەزەکە گەڕاین. توخوا ئەو جێگایانەی ئێمە چووینێ ئێوەی نەچنێ، رەزەکە هیچی نەماوە، زۆربەشیان لە رەگ و ریشەوە دەرهێناوە. لەهیچ یەك لە رەزەکانیشدا هێشووە ترێ هیچ تەنانەت دنکە ترێیەکیش نەماوە. هەموویان زەقن کردوە. با بگەڕێینەوە جەنابی شوکری ئەفەندی."

"بابگەڕێنەوە کوڕینە، راکەن راکەن بۆ خوارەوە، بەلەموان بدۆزنەوە، زەنبیل و سەبەتەکان هەڵبگرن و بیانخەنە نێو بەلەمەکان، خێرا بن بابڕۆین."

شوکری ئەفەندی دووبارە کەوتەوە ڕۆیشتن، کەمێك دواتر گەیشتەوە کرێکارەکانی، لەگەڵ ئەوان پێی پێوەنا بۆ خوارێ، هەموو شتەکان داندرابوونەوە نێو بەلەمەکان، خۆشی سواری بەلەمێك بوو، ماوەیەك بیری کردەوە، لە بەلەم هاتەدەر، هات لەسەر تەختەکانی ژێر دارچنارەکان دانیشت، سەری خستە نێو لەپی دەستەکانی. کەمێك دواتر ئەوانی دیکەش هاتن، لە بەرامبەری دانیشتن.

شوکری ئەفەندی دەستەکانی لادان و گوتی:

"لەبەر ئەوەبوو لە هیچشوێنێك ڕێگەیان پێنەدەدان توخنی ڕەزو باخەکان بکەون. لە هەموو جێگایەك هەر ئەو کارەیان کردوە. بێوێژدانانە، خوانەناسانە، فڕیان بەسەر مرۆڤەوە نیە."

"ئێمە ببوورە شوکری ئەفەندی، ئێمە ئاگامان لە هیچشتێك نەبوو."

دکتۆر سەلمان سامی گوتی:

"ئەوە دەبێت کەتنی کی بێت شوکری ئەفەندی؟"

شوکری ئەفەندی گوتی:

"بۆچی لەمن دەپرسیت، ئەمە تۆڵەکردنەوەیە کاك دکتۆر، هەر سبەینێ یەکەم کەس تۆ تێدەگەیت کاری کێ بووە. خواحافیز، ئومێدەوارم دارزەیتوونەکان بە دەردی ئەمانە نەبەن."

هەموان پێکەوە هەستان و تا سەر ئەسکەلە لەگەڵیان چوون و بەڕێیان کردن. دوای دوورکەوتنەوەی بەلەمەکان چوونە ژێر دارچنارەکان، هێشتا لەسەر تەختەکان دانەنیشتبوون کە دکتۆر سەلمان سامی گوتی:

"شوکری ئەفەندی، مەبەستی شوکری ئەفەندی لەوەی گوتی ئومێدەوارم دارزەیتوونەکانیش بە دەردی ئەم دارمێوانە نەبەن چیبوو؟ واتە ئێمە بووین ئەم ڕەزانەمان ئاوا لێکردوون؟ دەیەویست چیبڵێت؟ بەمنی گوت یەکەم تۆ دەزانیت دزەکان کێ بوونە، مەبەستی چیبوو؟ واتە دەیەویست بڵێت سەردەستەی دزەکان من بوومە؟"

پۆیراز گوتی: "هەرگیز کاك دکتۆری هێژا، هەرگیز قوربان، مەبەستی ئەوە بوو کە کەسانی وەك ئێوەی ساردیو گەرمی چەشتوو دەتوانن بیاندۆزنەوە. ڕەنگبێت بشیویستبێت بڵێت تۆ دەتوانیت یەکەمجار ئەو گورگانە ئاشکرا بکەیت."

دکتۆر سەلمان سامی لە کاتێکدا دەئاخاوت موسا ئاغا وەکو تۆپەکێك شادمانی هاتە نێو و گوتی:

"باشە کە لێرەیت ڤاسیلی" پاکەتێکی بەدەستەوە، دایە ڤاسیلی، "نامەکە دەربێنە و بۆ هاوڕێیە زۆر بەڕێزەکانم بیخوێنەوە. ئەوانە هەمیشە بە مرۆڤبوونیانەوە بوونەتە هاوبەشی ئێش و ئازارەکانی من. ئێستا واباشە ئەو شادی و خۆشیەی من شادتان بکات."

ڤاسیلی لە کاتێکدا نامەکەی بۆ تورکی وەردەگێڕا، بۆ ئامادەبوانی خوێندەوە. نامەیەکی پڕ سۆز و برایانەی هاوڕێی موسا ئاغا، واتە جەنەڕاڵە زیندانیەکەی بوو. چیدی نەیانتوانی لە زیندانم بهێڵنەوەو ئازادیان کردم. دەپرسێت ئەو هەموو دۆست و ئاشنایەم هەبوون کەچی نەیانتوانی رێگە لە دوورخستنەوەم بگرن، فلانەکەسیش، بەهەمان کەسیش، ناوی ژمارەیەکی دیکەشی هێنابوو، نووسیبووی بە زوویی یەکەمجار لە کرێت و پاشان لە ئەسینا یەکدی دەبیننەوە. دوای تەواوبوونی نامەکە ئەوانەی لەوێ بوون هەموویان پێدەکەنین. پۆیرازیش ئەگەرچی دڵی تژی بووبوو لە خەم و کۆڤان ئەویش پێکەنی. هەموویان یەك بە یەك دەستی موسا ئاغایان گوشی و پیرۆزباییان لێکرد. پۆیراز زیاتر و بە جۆشتر لە هەموان پیرۆزبایی لێکرد. پۆیراز لەلایەکەوە دڵی پڕ بوو لە خەم و گریان لەناخیدا سەری هەڵدابوو و لەلایەکی دیکە لە خۆشحاڵیان شێت بووبوو.

رۆژی دواتر، کاتی بانگی کەڵەشێران، ئەودەمەی شنەی بەرەبەیان هەڵدەکات نیشانچی هاتە سەر ئەسکەلە. ئەحمەد لەنێو بەلەمدا خەوتبوو. نیشانچی بانگی کرد، ئەحمەد گوتی: "لێرەم وەستا."

"جلەکانت پۆشیوون؟"

"هەر ئێستا دەیانپۆشم و دێم وەستا."

کەمێك دواتر ئەحمەد بە بەلەمە بچووکەکەی هات و گوتی:

"فەرموو قوربان."

"وەرە ئەحمەد، وەرە سەیر بکە ئەمرۆ بۆنێکی ناخۆ لە دوورگە دێت، وەرە بزانم تۆش ئەم بۆنە ناخۆشە دەکەیت؟"

ئەحمەد گوتی: "دێت وەستا، دێت بۆنێکی گەنیو دێت."

"نەکا لە دەریاوە بێت، ئەحمەد؟"

ئەحمەد رووی کردە دەریا، بایەکی نەرم لە دەریاوە دەهات، کەپووی روو لە دەریا راگرت و گوتی:

"نا وەستا، بۆنی دەریا خۆشە."

ئەحمەد چەند جارێك بە دەوری خۆیدا وەرسوورِا:

"دەریا بۆنی خۆشە، دەریا بۆنی دەریا دەدات ، وەستا ئەم بۆنە ناخۆشە لە دوورگە دێت، وەستا."

نیشانچی بێئەوەی هیچ بڵێت چوو لەژێر دارچنارەکان دانیشت. ئەحمەدیش هات لە تەك ئەودا دانیشت. بۆنەکە هەندێکجار دەهات و هەندێکجار نەدەهات. "ئەحمەد ئەمرۆ ناچینە راوەماسی زانیم بۆنەکە لە کوێوە دێت. تۆ برِۆ لەنێو بەلەم بنوو. کەڵەشێرەکان دەنگیان نەما، زۆری نەماوە ئاسۆ رووناك ببێتەوە. منیش دەچمەوە ماڵێ. دەتەوێت بچینە ماڵی ئێمە پێکەوە بەرچاییمان بخۆین."

"باشە وەستا."

چوونەوە ماڵ، سوڵتان بەیانی زوو لە خەو هەستابوو و بەرچایی ئامادەکردبوو. ئاسۆ خەریك بوو رووناك دەبوو. بۆنی چا ماڵی پرِ کردبوو، بەڵام بۆنی گەنیویش لە دەرەوە دەهات.

"پێشتر هیچ بۆنێك لە دوورگە نەدەهات نیشانچی، ئێستا دوورگەکەت بۆ وای لێهاتوە؟ ئەو بۆنە سەرو دڵی مرۆڤ تێکهەڵدێنن."

نیشانچی بە بێتاقەتیەوە گوتی: "دوورگەیە بۆنی لێدێت ئیدی."

سوڵتان گوتی: "با بۆنی لێبێت. لە گوندی ئێمەدا، کاتێك با هەڵیدەکرد لە هەموو لایەکی گوند بۆن دەهات."

"دەزانم، گوندی ئێمە بۆنی لێدەهات، بۆنی لێدەهات، وەلـێ بن هەر بەردێك خەلەخانەیەك بوو. هەموان قوونیان بە پلووکە بەردان دەسرِیەوە. لێرە خەلەخانەکان لە نێو خانوەکان دان و مەسینەش لەبەردەستی هەموان هەیە."

"سوپاس بۆ خوا کە خانوەکان خەلەخانەیان تێدایە، ئاویش لە مەسینان، سوپاس بۆ خوا، سوپاس بۆ خوا، هەزارجار سوپاس بۆ خوا."

بەرچاییەکی تێروتەسەلیان خوارد. لەسەر سفرەدا هەنگوینیش هەبوو. نەك هەنگوینی دوورگە... لەوکاتەوەی سوڵتان و نەوەکان هاتبوون هەنگوین لەسەر سفرە نەبرِابوو.

"ئەحمەد من دەچمە لای پۆیراز. هەڵیشنەستابێت بە نەرِەیەك هەڵیدەستێنم."

ئەحمەد گوتی: "منیش دەچم ماسیان دەگرم."

نیشانچی گوتی: "زۆر باش دەکەیت برِۆ."

چووە لای پۆیراز، ئەوان زۆر دەمێك بوو لە خەو هەستابوون، ڤاسیلیش هاتبوو، دایکە لێنا لە دەوری مێزەکە بوو، دانیشتبوون و بەرچاییان دەخوارد.

"نۆشی گیان."

"ئێمەش خواردوومانە، فەرموون دانیشن." کورسیەکەی نێوەڕاستی نیشاندان. خۆیشی لە کورسیەکەی تەنیشت نیشانچی دانیشت.

نیشانچی گوتی:

"ئاگاداری رووداوەکەیت؟"

پۆیراز پرسی: "چیبووە؟"

"لووتی تۆ هەست بە هیچ بۆنێك ناکات؟"

"با، جار بە جار بۆنێکی زۆر ناخۆش دێت، دێت، بەڵام یەکسەر نامێنێت. ئەوە بۆنی چیە؟"

ڤاسیلی گوتی:

"من ئێستا بۆنی وام لەم دوورگەیە نەکردوە. وامزانی بۆنی کەلەشی مانگا یان هی ئەسپ یان هی وشترێکە کە ئاو هێنابێتیە لێوار، دوێنێ لە گەردی بەیانیەوە تا ئێستا هەموو لێواری دوورگەم لێکداوە، بەڵام هیچ کەلەشێکم نەبینی. دیسان جارێکی دیکەش هەموو دوورگە دەگەڕێم بزانم ئەو کەلەشە لە هەر جێگایەك بێت دەیدۆزمەوە."

نیشانچی گوتی: "زەحمەت مەدە بەر خۆت کاکۆ، خۆت ماندوو مەکە. ئەوەندە ئەو لێوارانە گەڕاویت لێتبڕاوە ڤاسیلی. مرۆ ئەوەندەش ناتوانێت بە دوای بۆنێکدا بگەڕێت بزانێت لە کوێوە دێت کاکی خۆم، مخابن نیە بۆ تۆ؟ دواتر پێکەوە دەچین دەیدۆزینەوە. ئەو دکتۆرە شێتە دەمانچەی پێیە، ژەهری کردۆتە نێو بتلان؟"

"مانگامانزان، بەبیرتە شوکری ئەفەندی چیگوتبوو؟"

"چیگوتبوو؟"

"لەبارەی کۆچبەرە ئەنەدۆڵەیەکان گوتبووی، خەڵکی ئەو ناوچەیە نەك هەر نایانەوێت بۆ کارکردن بیانبەتە نێو باخەکانیان، بەڵکو تەنانەت هەر بشیانبینن. گوتبووی بچنە نێو هەر باخێك سێ بەرامبەر زیاتر ئەو مێوەیە دەخۆن کە کۆی دەکەنەوە."

"ئەمەم بیستبوو."

"کەواتە بابچین کەلاکە بۆگەنیوەکە بدۆزینەوە."

گوتیان: "بابچین."

نیشانچی بە پێشکەوت و ئەوانی دیکەش کەوتنە دوای. نیشانچی هێندە بەخێرایی دەڕۆیشت کە پۆیراز و ڤاسیلی بە زەحمەت دەیانتوانی پێیبگەن. دوای ڕەت بوون لە چەند خانووێك، نیشانچی بەرامبەر دیواری باخچەی خانووێکی قاوەیی لەجێی خۆی ڕەقهەلات. پۆیراز و ڤاسیلیش لە تەك ئەو ڕاوەستان، لە هەموو لایەکی باخچەکە لەنێو بڕکی تەماتە وشکبووەکانەوە بۆن دەهات. سەیری یەکدیان کردو پۆیراز گوتی:

"بۆنێکی زۆر دێت."

ڤاسیلی لەکاتێکدا ڕووی گرژ کردبوو گوتی: "زۆر."

نیشانچی گوتی: "ڕەوانی، ڕەوانیان گرتوە. نەمدەزانی ڕەوانی ئەوەندە ئەو بۆنە پیسەی هەیە."

ڤاسیلی گوتی:

"هەناویان بۆنگرتووبووە."

ڕوخساری هەرسێکیان کوریشکی کردبوو. لە پێش ئەو خانووەدا ڕەتبوون، گەیشتنە هەندێك خانوو کە بەڕیز لە ڕۆخ یەکدیەوە هەلکەوتبوون، بەرامبەر پەرژینی باخچەیەك ڕاوەستان. لە هەموو لایەکەوە بۆنێکی تاقەتپرووکێن دەهات. ئەو بۆنەی کە لای بڕکە تەماتە وشکەکان دەهات زۆر هەراسانی دەکردن. پۆیراز بە پێشکەوت. دەستماڵەکەی دەرهێنا بە بەردەم لووتیەوە گرت. بە کەمبوونەوەی بۆنەکە هەنگاوەکانی خێراتر کردن. تا لێوار دەریا چووە پێش.

پۆیراز بە ڕووێکی گرژەوە گوتی:

"بابچینە لای دکتۆرەکان، نەوەك ئەم دۆخە ببێتە مایەی نەخۆشیەکی بەربلاو و لێکگرتنەوە. لە مەیدانی جەنگی دوملوپینار، وەك دەیانگوت، لەو سەربازانە پڕبووبوو کە یان بەسەریەکدا کەوتبوون یان پشتیان بەیەکەوە دابوو. بۆنێکی وا لە تەرمی مردووەکان دەهات کە هەرکەس بۆنەکەی بکردبوا یەکجێ دەمرد."

ڤاسیلی گوتی:

"من لەوێ بووم، دەتزانی؟"

پۆیراز گوتی:

"منیش ئەو شتانەی بیستوومە باس دەکەم. تۆ لەوێ هەندێك کارت دەکردن، وانیە؟"

"له فەوجی سەربازە کرێکارەکان بووم، تەرمی سەربازە یۆنانیەکانمان هەڵدەگرتن و دەمانبردن فڕێمان دەدانە دۆڵێك. بۆنی ئەو تەرمانە وەکو تیزاب وابوو، جەرگی مرۆڤی کون دەکرد. ئەگەر تەرمەکانمان فڕێنەدابان و رامانەکردبوا سەرچیاکان، لەبەر ئەو بۆنە گەنیوە دەخنکاین و دەمردین. زۆرانم بینین کە لەبەر چاوی خۆم ئەو بۆنە قورگی گرتن و هەناسەی راگرتن و خنکان و مردن."

"نەکا ئێمەش وامانلێبێت و لە مەیدانی جەنگی دوورگەی کارینجا لەبەر ئەو بۆنە بخنکێین و بمرین؟"

ڤاسیلی بە ترسەوە گوتی: "خوا ئەو رۆژە نەهێنێت."

ئاوا بەدەم قسەکردنەوە چوونە لای دکتۆرەکان. دکتۆرەکان لە نۆڕینگەکەیان بوون. نیشانچی کە جارێك کەمێك پێشتر خۆی ونکردبوو لەبەر ئەو بۆنە و لەترسی ئەوەی بخنکێت گیانی خۆی قوتار بکردبوو و پەنای بردبووە بەر دکتۆرەکان، هێشتا نەیتوانیبوو هیچ بڵێت.

دکتۆر سەلمان سامی گوتی:

"فەرموون، فەرموون دانیشن." دکتۆرەکان هەستان و جێگایان بۆ ئەوان کردەوە. کوڕە گەنجێکی نامۆشیان لەگەڵدا بوو:

"جەنابی والی مامۆستای بۆ خوێندنگەکەمان ناردوە. ئێمەیش هاوکاریی دەکەین، دەرس دەڵێینەوە. کاك پۆیرازو کاك جەمیلیش جار بەجار هاوکار دەبن و دەبنە مامۆستا. ڤاسیلی دەتوانێت خوێندنگە نیشانی کاك سودقی بدەیت؟"

کاك سودقی و ڤاسیلی هەستان و رۆیشتن.

پۆیراز دوای ئەوەی کە کەمێك هاتەوە سەرخۆی گوتی:

"بەڕێزان، دکتۆرینە شتگەلێك هەیە دەمانەوێت عەرزی بە خزمەتتان بکەین."

"چیە؟"

پۆیراز و نیشانچی کێشەکەیان لە هەوەڵ تا کۆتایی باسکرد.

دکتۆر گوتی:

"پێشتریش شتەکە تێگەیشتبووم، بەڵام ئێستا باشتر تێگەیشتم کە شوکری ئەفەندی بۆچی دەیگوت لێناگەڕێن کۆچبەرە ئەنەدۆڵیەکان نزیکی باخەکان بن.

دیارە، ئەودەمەی کە شوکری ئەفەندی لێرە دەڕۆیشت، دەیزانی کێ باخ و ڕەزەکانی بەو دەردە بردوون. بە بیرمە گوتی یەکەم تۆ تێدەگەیت. ئێوە هەر دەڵێن ڕەوانبوون، ڕەوانبوون، ڕەوانبوون ئیدی چیە؟"

نیشانچی سەری باسەکەی گرتەوە دەست:

"ئێوە دەڵێن سکچوون، ئێمە دەڵێین ڕەوانبوون. ئەمانە چۆن ئەو ڕەزانەیان بەو گەورەییە بەجارێك هەڵلوشین؟ بەشێوەیەك پەلاماریان بۆ بردوون کە هەموو ترێیەکەیان خواردوە، ورگیان وەکو هەنبانەی لێهاتوە. ئەمە کاری ڕۆژێك و دوو ڕۆژان نەبووە. ئەوانە بە چەند ڕۆژێك ئەوەیان کردوە."

"ئێمەش لە پشت بەردی کەڕ بووین و ئاگامان لە هیچ نەبووە."

"هەڵلوشین یانی چی؟"

"واتە لە ڕەگ و ریشەوە دەرهێنانی دار و درەختی دارستانێك، تەفرو توونا کردنی کەدو لك و پەلکی داران. واتە هەڵکەندنی تەنانەت بن دارانیش، واتە گۆڕینی دارستانێك و ڕەزو باخێك و کردنی بە بیابان، واتە هەموو شتێکیان بۆ سەردەمی یەکێك بوو یەکێك نەبوو گەڕاندۆتەوە."

"خوایە ڕەزەکانی دوورگەی ئێمەیان هەڵلوشین. نەکات ئەمانە ڕۆژێك بێت ئەم دوورگەیەش بە یەکجاری هەڵلوشن. یاللا هەستن بابچینە لای ئەو هەڵلوشکەرانە."

هەموان پێکەوە هەستان، سەلمان سامی بە پێشکەوت و ئەوانی دیکەش کەوتنە دوای، سەلمان سامی تووڕەبوو، هەر بۆڵە بۆڵی بوو. هاتنە ماڵ.

پۆیراز گوتی:

"با لێرە بوەستین قوربان. بۆن دێت." سەلمان سامی ڕاوەستا. "بۆن دێت." کونە لووتیان دەکرایەوەو دەبەسترا. "بۆن دێت." ڕۆیشت ئێستا خێراتر دەڕۆیشت. "بۆنەکە زیاتر بوو، زۆر زیاد." بەرامبەر پەرژینی باخچەیەك، بەرامبەر دیواری باخچەیەك ڕادەوەستا، سەیرێکی باخچەکەی دەکرد، بۆڵە بۆڵی نەدەما، "بۆن دێت، بۆن دێت، بۆن تا کەشکەلانی ئاسمان دەچێت. گەدەو هەناوی ئەمانە بۆنگرتووبووە، بۆنی لاشەی لێدێت." دیسان دەڕۆیشت، کەمێك دواتر لەبەردەم چیلەی باخچەیەك دەوەستا، بۆڵە بۆڵەکەی دەبڕی، دەیگوت: "ناو کەپووم دەزووڕێتەوە، دەزووڕێتەوە." دیسان دەڕۆیشتە پێش. سەرەنجام گوتی: "ئەم بۆنە جەرگ و هەناوم لە دەمم دەردێنێت، هەموو گیانم بۆنگرتوو بوو، بۆنگرتووبوو. لە چاناك قەڵاو لێرەش زۆرجار بۆنی پێ لە کەللەی داوم، هیچ بۆنێك وەکو ئەم بۆنە جەرگی هەلا هەلا نەکردووم. بۆن دێت، بۆن دێت." بۆ دواوە گەڕایەوە.

بەراکردنەوە دەڕۆیشت و تاسمەیەکی برد، لەو کاتەدا پۆیراز دەستی گرت، گوتی: "کاك دکتۆر کەمێك بوەستە، لەو شوێنەی کە بۆنەکەی لێدێت خەریکین دوور دەکەوینەوە. کەمێك دان بە خۆتاندابگرن. کاك دکتۆر." تا دەهات لە چەقی بۆنەکە دوورتر دەکەوتنەوەو تا دوورتر دەکەوتنەوە خێراییان کەمتر دەبووەوە.

کە گەیشتنە نۆڕینگەی دکتۆرەکان هیچ کامیان شەنگ و بڕستی تێدا نەمابوو. دکتۆر سەلمان سامی هەر کە هاتەوە ژوورەوە، یەکسەر بۆ لای رەفەی دەرمانەکان چوو، یەك یەك سەیری دەرمانەکانی کرد.

"نیە، لێرە بەپێی پێویست دەرمانی سکچوونمان نیە کە بتوانین ئەو هەموو خەڵکە دەرمان بکەین، ئەگەر هەشبوا بە دەردی چی دەخوارد."

بە دکتۆر خەلیل رەفعەتی گوت: "با ئاو بکوڵێنن و بەردەوام ئاوی کوڵاو بخۆنەوە، رات چیە؟"

"ئاوی کانیەکە زۆر پاکە، دەتوانن هەر ئاواش بیخۆنەوە قوربان."

"چ پێشنیازێکی دیکەت هەیە خەلیل، بۆ وشکە پڵاو رات چیە؟"

"ئەمانە برنجیان نیە قوربان."

"ناتوانین بکڕین؟ ناتوانین قەدریی بەلەموان بنێرینە شارۆچکە؟"

"رەنگە نەتوانین لە شارۆچکە برنج بۆ ئەو هەموو خەڵکە فەراهەم بکەین."

"نەتوانین؟"

پۆیراز گوتی:

"قوربان، دەبێت عەرزت بکەم کە لە ئەنەدۆڵ دەتوانم بڵێم هیچکەس برنج ناخوات."

"هەر نایخۆن؟"

"زۆربەیان نایخۆن."

"شتێکی دیکەت بە مێشکدا ناهێت خەلیل؟"

"بەدی قوربان."

"چی؟"

"پەتاتە قوربان. بەراورد بە برنج هەرزانتریشە."

"نەمدەزانی پەتاتە هێندە هەرزان بن."

نیشانچی چووە نێو گفتوگۆی دکتۆرەکان و گوتی:

"جەنابی دکتۆر، من ئەودەمەی سەربازی راکردوو بووم چوومە ئەمسەر تا ئەوسەری ئەنەدۆڵ. چەندین مانگ و ساڵ بوو بە قاچاغی لە ئەنەدۆڵ دەسووڕامەوە. خەڵکی ئەنەدۆڵ گەر بزانن سەربازێك رایکردوە پەنای دەدەن و دەستی دەگرن. لە هەندێك شوێندا وەکو زاهید و پیاوچاك سەیری سەربازی راکردوو دەکەن. لە هەندێك شوێنی ئەنەدۆڵیش دەیانگرن و رادەستی حکومەتیان دەکەنەوە."

"ها نیشانچی، تۆ مەگەر نەتدەویست سەبارەت بە برنج و پەتاتە شتێك بڵێیت؟"

"ببووره دکتۆر، دەڵێن پیاو کە پیر بوو زۆر بڵێی دەکات. دەمەویست بێژم، لە ئەنەدۆڵ لە هەر گوند و شارۆچکەیەك بە مەنجەڵان پڵاوساواری بەگۆشت لێدەنێن، برنج تەنها لە ماڵی دەوڵەمەند و ئاغا و بەگان لێدەندرێت، ئەویش بە دەگمەن."

"تێگەیشتم نیشانچی."

"سوپاست دەکەم سەرگورد."

"ئێستا ئێمەش لە بودجەی دوورگە پارە بە قەدریی بەلەموان دەدەین بابچێتە شارۆچکە فەردە فەردە پەتاتە بکڕێت و بە بەلەمەکەی بیانهێنێتەوە. تۆ بڵێی سبەی تا دەمە دەمی نیوەڕۆ بتوانێت خۆی بگەیەنێتەوە ئێرە؟"

"ئەگەر بیەوێت دەتوانێت."

"ئێستا، تازووە پێیبڵێن با بێتە لای من."

هۆسمەن هەستا، گوتی: "هەر ئێستا کاك دکتۆر." چووە دەرەوە، هەر زوو گەڕایەوە: "وادێن، کاك دکتۆر."

"کێ دێن؟"

لەو دەمە هۆسمەن دەچووەوە دەرێ بۆیە گوێی لە پرسیارەکەی دکتۆر نەبوو.

نیشانچی گوتی: "دەتەوێت کێ بن، جگە لە رەوانیەکان، ئەو سەرو سەدانانەوە لەوان بترازێت دەبێت هی کێ بێت."

کەمێك دواتر سەرو سەداکە زیاتر بوو، پاشان تاوێك بێدەنگ بوون، دەنگی هەندێك پیاو و ژن تا نێو نۆڕینگەکە هات، ئەوانەی کە لە ژوورەوە بوون، بەر لە هەموویان دکتۆر سەلمان سامی، هەموویان چوونە دەرەوە. پیاوان، ژنان، منداڵان، مەودای نێوان دەریاو نۆڕینگەیان پڕ کردبوو. نیشانچی کورسییێکی لە نۆڕینگە هەڵگرت و بردیە دەرەوەو چوو لەسەر کورسیەکە راوەستا:

"دراوسێیان، بەخێربێن، سەفاتان هێنایە دوورگەکەمان، دەزانن جێتان سەر سەرو سەر چاوانە، چیبووە کە هەمووتان پێکەوە و بە یەکجاری هاتوونەتە ئێرە، کێماسیەك، یان داخوازیەکتان هەیە؟ ئەو پیاوەی کە لە رۆخ من راوەستاوە ئەوە دکتۆر سەرگورد سەلمان سامیە، ئەم بەرێزەش کە لەلای چەپمەوەیە دکتۆر خەلیل رەفعەتە. هەردووکیان ئەودەمەی کە ئێمە لە جەنگ بووین دژی ئینگلیزەکان، خەریکی دەرمانکردنی نەخۆش و بریندااران بوون. پاشان کە ئەوانیش بریندار بوون دکتۆرە برادەرەکانیان ئەوانیان دەرمان کرد. فەرماندەکانیان ئەوانیان ناردۆتە ئێرە. ئەو شوێنە گەورەیەی کە رماوە ئەوکاتەی دەهاتن بینیتان ئەوە کاتی خۆی کلێسای ئەم دوورگەیە بوو. لەبەر ئەوەی ئێرە لە چاناك قەلاوە نزیکە، سوپا ئەم کلێسایەی کردبووە نەخۆشخانە، بریندارەکانیشی دەناردنە ئێرە. بەکورتی، دکتۆرەکان نەخۆش و بریندارگەلێکی زۆریان لێرە دەرمان کردن و ناردنیانەوە بۆ شارەکانی خۆیان. دەڵێن دکتۆرەکانی ئێرە شەو و رۆژ بێوچان کاریان کردووەو هەزاران سەربازیان چارەسەر کردوە. ژنان و پیاوانی دوورگەش هاوکاری دکتۆرەکانیان کردوە."

دکتۆر سەلمان سامی گوتی:

"بەسە، کاکە، بەسە نیشانچی. من و دکتۆر خەلیل رەفعەت ئەوان رۆژان پێکەوە بڕیارماندا ئەگەر زیندووماین بێینە ئەم دوورگەیە و تا ماوین لێرە بژین، بۆیە هاتینە ئەم بەهەشتە. ئێوەش بەخێر بێن. هەمووتان پێکەوە هاتوون، ئایا داخوازیەکتان لە ئێمە هەیە؟ یەکێکتان بێتە ئێرە لای من، داواکەتانمان پێبڵێت."

ژنێکی بالابەرز بە شاڵێکی لاهووریەوە لەنێو خەڵکەکە هاتەدەر و تا نزیك دکتۆر هاتە پێش، لەوێ راوەستا، پرچی لاجانگەکانی سپی سپی بوو و خەزێمێکی ئەڵقەداری نەخشێندراوی زۆر جوانی بە پەڕەی لووتیەوە بوو.

"ئێمەیان ناردە ئێرە دەستیان خۆش بێت. ها، لەبیرمکرد ناوی خۆمتان پێبڵێم، پێمدەڵێن کاراجا ئەلیف. ئێوەش بە باشی پێشوازیتان لێکردین. لەو کاتەوەی لە شارەکانمان، دوای تەفرو توونابوون و لەنێوچوونی سەربازەکانمان، رامانکرد، چەندین ساڵە لە هیچشوێنێك وەکو مرۆڤ هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا نەکردووین تەنها لێرە نەبێت. ئێمە چیمانکردبوو کە لێنەدەگەڕان لە رەزو باخەکانیاندا کاربکەین، لێنەگەڕان تەنانەت بە تەنیشت ئەو رەزو باخانەشدا تێبپەڕین، لەو شوێنانەی کە تەنانەت دنکە ترێیەکیشمان نەخواردبوو، هوروژممان کردە سەر ئەو رەزانەی کە

منداڵەکانمان دۆزیبوویاننەوە، یەکبێن و شەو و ڕۆژ ترێمان خوارد، هەمووشمان تووشی ڕەوانی بووین و بووینەتە ئێسك و پێست."

لەودەمەی هاتبوونە ئەوێ لێکدا لێکدا پیاوان و مێردمنداڵانی دۆخین بەدەست و ژنان و کچۆڵەی دامەنی کراسەکان بەدەست نێو قەرەباڵغی ئەو خەڵکەیان شەق دەکرد و ڕایاندەکردە لێوار دەریا و نێو دەوەنە گەزەکان و لەوێ دادەنیشتن. دەنگی سکچوونی هەندێکیان تا ئەوێ دەهات. ئەم ڕەوشە پسانەوەی نەبوو.

"ئێمە بەچی بزانین ڕەزەکان هی دوورگەن، ئێمە بەچی بزانین ڕەزەکان هی ئێمەشن. وامانزانی بێخاوەنن، شەو و ڕۆژ لەنێو ئەو ڕەزانە لە ترێ بترازێت هیچی دیکەمان نەخوارد. چیبکەین، ترێیەکە زۆر خۆش بوو. خواردمان و خواردمان و ورگمان هەڵمسا. ئێمە بەچی بزانین، هەموومان تووشی ڕەوانبوون بووین. ئەگەر فریامان نەکەون ئەو ڕەوانبوونە هەموومان دەکوژێت. گوتمان ڕەزێکی بێخاوەنمان دۆزیەوە، لەوێ دامانکوتا.

ئێمە نەخۆشانی نیوە ڕۆح، ڕەوانیمان گرت. هەم ترێی دوورگەمان گشتی هەڵلوشی، هەم هەموومان دۆخین بەدەست رادەکەین و رادەکەین بۆ نێو دەوەنە گەزەکان و چاوەڕوانیشمان لە ئێوە هەیە کە فریامان بکەون. ئێستا کەوا خەریکم لەگەڵ ئێوەدا قسە دەکەم، بە سەختی پێش بەخۆم دەگرم، قسەکانی ئێوە تەواو بێ دەبێت هەموومان خێرا بڕۆین خۆمان بگەیەنینە دەوەنە گەزەکان، ئێوەش لەبەر ئەو بۆنە ناتوانن لە دوورگە بمێننەوە. دەرمانمان بدەنێ، ئێوەو خوا دکتۆرە بەڕێزەکان، ئەو سەربازانەی کە ئێوە دەرمانتان کردن و نەتانکردن ئێمە هێناومانەتە دنیا، ئێمە ئەوانمان گەورە کرد، ئێوەو خوا دەرمانمان بدەنێ."

دکتۆر سەلمان سامی بە دەنگێکی ڕەساوە گوتی:

"باش گوێ لە قسەکانم بگرن، کەمێك دان بە خۆتان بگرن، پاشان کە قسەکانم کرد دەڕۆن و هەرچەندە بتانەوێت بچنە دەرەوە. دەچن لە کانی ئاو دەبەن و دەیکولێنن. ئاوی کانیەکە ئەوەندە پاکە تەنانەت دەتوانن نەشیکولێنن. لە بەیانیەوە تا شەو دادێت لە شەویشەوە تا بەیانی دادێت یەکڕیز ئاوبخۆنەوە. هەروەها پەتاتەش بخۆن. ڕەنگە بڵێن پەتاتە لەکوێ بێنین، من لە ساڵحە فەندیم پرسی، ئەو لە دووکانەکەیدا تەنها یەك فەردە پەتاتەی هەیە. ئێستا قەدریی بەلەموان دەنێرمە شارۆچکە، پێیدەڵێم هەرچی پەتاتە لە شارۆچکە هەیە بیانکڕێت و بیانخاتە نێو بەلەمەکەی و

بیانهێنێتەوە. تا سبەینێ پەتاتەکانمان دەگەیەنێتێ، کوڕێکی باشە، تاکو سبەینێ دەمە دەمی نیوەڕۆ پەتاتەکان دێنێت."

کاراجا ئەلیف پرسی: "ئەی دەرمانەکان چی؟"

"باشترین دەرمان ئەوەیە کە شەو و ڕۆژ ئاو بخۆنەوە، هەروەها پەتاتە. پەتاتەکان لەنێو ئاودا دەکوڵێنن، خوێیان پێدا دەکەن و دەیانخۆن. تاکو باش دەبن ئەوە دەکەن. دەمەویست بڵێم برنجیش بێنن، بەڵام لە شارۆچکە برنج بۆ ئەو هەموو خەڵکە کوا دەست دەکەوێت. ئەگەر هەشبێت زۆر گرانە، جگە لەوە برنج بەبێ ڕۆن زۆر بێتام دەبێت. بێدەنگ بوو، پشووێکیدا، گوتی: "تاوێك سەبر بگرن."

لەنێو خەڵکەکە دەنگ بەرزبووەوە:

"ناتوانین سەبر بگرین."

"شەلوارەکانمان پیس دەکەین."

"هەموو گیانمان پیس دەبێت."

"ڕێگە بدە بڕۆین."

"دەچین لەدەم لێوارەکە دادەنیشین و شەپۆلەکان رایدەماڵن و ئەم دوورگە بەهەشتیەش بۆنگرتوو نابێت و چیدیکە کەپووی ئێوەش نازوورێتەوە."

"بڕۆن و خێرا وەرنەوە. هێشتا قسەم ماوە لەگەڵتان. خێرا، خێرا، خێرا بڕۆن و بگەڕێنەوە."

لە چاوتروکانێکدا بڵاوەیان لێکرد. هەر زووش کاری خۆیان ئەنجامدا لەکاتێکدا دۆخینی شەلوارەکانیان بەدەستەوە بوو هاتنەوە و لە بەردەم سەلمان سامی راوەستان.

دکتۆر سەلمان سامی ماوەیەك ئاوا سەیری کردن، پاشان بە راوێژێکی میهرەبانانە گوتی:

"هیچکامتان نەتانپرسی لێرە ئاودەست هەیە یان نا. ئەگەرچی هەشبێت دەبێت ریز بگرن و تا نۆرەی ئەوانی لە دواوەی ریزەکە بگات سێ رۆژ و سێ شەوی پێدەچێت ئەویش داخۆ نۆرەی دەگاتێ یان نا. تا ئەوەدەمیش، رەنگبێت لانیکەم حەوت هەشت جار دامەن و شەلوارەکانتان پیس بکەن. خانووی هەمووتان ئاودەستخانەی خۆی هەیە، قەت چوونەتە ئاودەستی ماڵەکانتان؟"

چەند دەنگێك پێکەوە:

"چۆن دەبێت ئاودەست لەنێو ماڵدا هەبێت؟"

"ئەگەر هەشبێت مەگەر ئێمە دەتوانین لەوێ...؟"

"ناشیرین نیە؟"

"مرۆڤ چۆن دەتوانێت لەماڵێدا بژیت؟"

"ئەویش لە خانوێکی وا جوان کە حکومەت پێیداوین. ئێمە شەرم دەکەین."

"ئەوە بکەین وا هەست دەکەین لەنێو کۆشك و ژووری پاشاکانی عوسمانی دانیشتووین و خراپەکاری تێدا دەکەین."

"نە، نە، ئەمە رێی تێناچێت. هیچکەس ناتوانێت لەسەر تەختی زێڕینی پادشا کاری وا بکات. بابچێتە دەرەوە، لەوێ بڕی، ناشیرینە."

"یانی تەنانەت ناتوانێت بشمیزێت."

"ئێمە لە زوقم و سەقەمی زستانیشدا ئامادە نین لە ئاودەستخانەی ماڵەکانماندا دابنیشین."

"زۆر باشە، تێگەیشتم، زۆر باشە، نەتانپرسی کێ دەبێت پارەی ئەو هەمو پەتاتانە بدات؟"

کاراجا ئەلیف گوتی: "نەمانپرسی. وامانزانی بە قەرز لەسەرمان حساب دەکەن."

"لە پارەی دوورگە دامان، دوورگە پارەی هەیە. بۆ نەخۆشان پارەی داو دەرمان و بۆ برسیەکان پارەی خواردەمەنیمان بەلاوە ناوە."

پاشان بۆی باسکردن کە ئەو پارەیان چۆن بەدی هێناوە، ئەوەی کە شوکری ئەفەندی، ئەو مرۆڤە چاکە، لەبری بەروبوومی باخی هەنجیر و هەناران، بڕە پارەیەکی چەند زۆری پێداون و ئەو پارانەیان بۆ رۆژێکی ئاوا داناوە. گوتی ئەگەر رەزەکانی ترێش ئاوا پایەماڵ نەدەکران، ئێستا بڕە پارەکە زۆر لەمەی هەیە زیاتر دەبوو.

کاراجا ئەلیف گوتی:

"کاك دکتۆر، ئێستا کە ئەو لوتفەتان دەرهەق بە ئێمە کردوە بڵێ با چایشمان بۆ بکڕن. دوعا بۆ هەمووتان دەکەین،ساڵی داهاتوو وەکو چاومان پارێزگاری رەزو باخەکان دەکەین."

دکتۆر گوتی: "باشە. ئەگەر قەدریی بەلەموان تا ئێستا نەڕۆیشتبێت پارەی دەدەمێ تا شەکر و چاتان بۆ بکڕێت، جارێ باشتر وایە چای تاڵ بخۆنەوەو شەکری تێنەکەن. کاتێك چاك بوونەوە ئەودەم دەتوانن چای شیرین بخۆنەوە."

نیشانچی گوتی: "قەدریی بەلەموان لێرەیە. چاوەڕێی تۆیە، کاك دکتۆر."

دکتۆر گوتی: "کەمێکی دیکە سەبر بگرن." پاشان رووی کردە خەڵکەکە:

"ببوورن کە ئێوەمان بەو رەوشە ناهەموارەوە لێرە راگرتوون. ئەمساڵ بێئەوەی پێبزانن کارێکی خراپتان کردوە، خۆتان سلامەت بن. ساڵی داهاتوو هەموومان پێکەوە چاودێری رەزو باخەکانمان دەکەین و قەرەبووی ئەمساڵیش دەکەینەوە. سکچوون دوای وازهێنان لەترێ خواردن خۆی چاك دەبێتەوە. بۆ ئەوەی زووتر چاك ببنەوە دەبێت بەردەوام ئاو بخۆنەوە، ئەمە لەبیر نەکەن. ئەگەر ترێتان بۆ مێوژان هێناوە کە زستان بیانکەنە خۆشاو، ڤاسیلی برامان فێرتان دەکات چۆن مێوژ بکەن. ئێستا بڕۆن، خوا ئاگادارتان بێت، ئەو ترێیەی کە خواردووشتانە لە گیانتان خۆش بێت. هیوادارم زوو چاك ببنەوە."

کاراجا ئەلیف گوتی: "سوپاس بۆ خوا کە خواردمان، سوپاس دکتۆر بە زووی بە ئاوی پاك و دیشلەمە و پەتاتەی کوڵاو دێینەوە سەرخۆ و چاك دەبینەوە، بەڵام ترێمان خوارد نەك گەمە."

لە ماوەی چەند رۆژدا هەموویان چاك بوونەوە. ڤاسیلی چۆنیەتی دروستکردنی مێوژی پێگوتن. ترێیان لە هەیوان و نێو باخچەکان لەسەر ئەو حەسیرانە کە ساڵحە فەندی هێنابوونی رۆکرد و پانیان کردەوە. زستان، چ خراپ تێپەڕیبوا و چ باش، هەموان لە ماڵی خۆیاندا مێووژیان هەبوو.

نزیکەی پایز بوو شوکری ئەفەندی لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوڕێیانی خۆی هاتە دوورگە، چوو نێو دارزەیتوونەکان، پاشان هاتە ژێر دارچنارەکان دانیشت. خەڵکی دوورگە دەوریان لێدان.

"زەیتوونەکانتان هێند باشن کە وێنەیان لەم نێوە تەنانەت لە ئزمیر و ئیدرەمیت پەیدا نابێت. ئینشاللا ئەو بەڵایەی بەسەر رەزەکان هات بەسەر زەیتوونەکان نەهێت."

کاراجا ئەلیف گوتی:

"ناهێت، زەیتوون بە چ دەردمان دەخوات؟"

"ئێوە تا ئێستا زەیتوونتان کۆکردوونەتەوە؟"

"بێگومان کردوومانە، ئێمە تا گەیشتینە ئێرە بەردەوام زەیتوونمان لێکردوونەتەوەو کۆمانکردوونەتەوە. هەموومان تەنانەت منداڵەکانیشمان شارەزاییان لەو کارەدا هەیە. ئەوانەی کە رێگایان پێنەدەدراین بچینە نێو باخەکانیان و لێنەدەگەڕان بە رۆخ باخ و رەزەکانیاندا رەت ببین بۆ لێکردنەوەو کۆکردنەوەی زەیتوونان هەموو سەرە پایزان لە بەرمان دەپاڕانەوە."

"کەواتە، خۆتان زەیتوونەکانی خۆتان کۆبکەنەوە. سەبەتە و گۆچانە تایبەتەکانی لێکردنەوەی زەیتوون و هەرچی پێویستە ئامادە بکەن. لەبیرتان نەچێ، ئەمجارە پشکی خۆتان بەخۆتان کۆبکەنەوە، بەبێئەوەی بەخەساری بدەن."

"بەبێئەوەی تەنانەت دانە زەیتوونێکیش لەدەست بدەن."

شوکری ئەفەندی چەند جارێکی دیکە هات . خەڵکی دوورگەی کارینجا دوا دواییەکانی پایز لە چاوەڕوانی ئەودا بوون. ڕۆژێکی هەتاوی بەلەمە ماتۆڕدارەکانی شوکری ئەفەندی لە ئەسکەلە لەنگەریان گرت. هەموو خەڵکی گوند هاتنە سەر ئەسکەلە.

شوکری ئەفەندی قاچی خستە سەر ئەسکەلە:

"یاللاّ بتانبینم زەیتوونکارەکان، زەنبیل و گۆچان و سەبەتە و گونیە و تریانەکان لە بەلەمەکان بێنەدەرو، پاشان وەرنە ئێرە لای من."

هەموویان یەکسەر بۆ لای بەلەمەکان رایانکرد، بەلەمەکان بەتاڵ کران، ئەو شتانەی کە لە بەلەمەکانیان دابەزاندبوون ئەو شتانە بوون کە پێشتریش بەکاریان هێنابوون. جگە لەوە، قەپانێکی نوێ نوێشیان هێنایە دەر. شوکری ئەفەندی لەگەڵ پێنج پیاو دابەزیبوو. دوای ئەوەی کە کاری کرێکارانی خەڵکی دوورگە تەواو بوو، شوکری ئەفەندی گوتی:

"وەرن بزانم." یەکسەر لە دەوری کۆبوونەوە، گەنجێکی کە لەلای دەستە راستیەوە وەستابوو باسکی تا هەنیشکی بڕابووەوە نیشاندا و گوتی:

"ئەمە سەرکارگەرە. ئەو هەر چەندەی کە کۆدەکرێنەوە لە دەفتەر دەیاننووسێت. لەبری هەر کیلۆیەك و دووسەد گرامی زەیتوون کە کۆی دەکەنەوە پارەتان دەدەمێ. لەم نێوە ئەو رێسایە نیە، ئەمە من خۆم بۆ ئێوەم داهێناوە."

کەسێکی نیشاندا کە لەلای دەستە چەپی بوو و گوتی:

"ئەمەشیان قەپاندار دەبێت."

کابرای قەپاندار شەلەیەك بوو کە دەڕۆیشت بەملاو ئەولادا دەهات. ئەویش وەکو سەرکارگەرەکە یەکێك لەو ژمارە کەمە سەربازانە بوو کە لە جەنگی چاناك قەلاّ بەزیندوویی گەڕابوونەوە.

چاوی دوو کەس لەوانەی لە دواوە وەستا بوون کوێر بوو، کەسی سێیەمیش دوای جەنگی چاناك قەلاّ دەستگیر کرابوو و رەوانەی جەنگی سەربەخۆیی کرابوو، واتە قارەمانێکی نەتەوەیی بوو کە لە سێ جەنگاندا بەشداری کردبوو.

"ئەمانەش وەکو سەرکارگەر بەدیارتانەوە دەبن. ئێوە خۆتان خاوەنی بەروبوومەکەن، پێویست ناکات سەرکارگەرتان بە دیار بن، بەڵام ئەمە ئیدی نەریتێکە و بۆتە شتێکی باو."

"شوکری ئەفەندی، شوکری ئەفەندی، واز لەم نەریتە بێنە، با کاراجا ئەلیف ببێتە سەرکارگەر."
هەموان پێکەنین.
کاراجا ئەلیف گوتی:
"خوێتان لێبدەم تاکو بۆگەن نەکەن رەوانیەکان. ئێستا بوونەتە ئەو مرۆڤە گاڵتەمان پێبکەن. نەفرەتیەکان چما ئێوە کێن تاکو گاڵتە بە ئێمە بکەن. رەوانیەکان. دزانی ترێی خۆتان..."
"دزیمان کرد، راستە، هەق بە تۆیە، بەڵام مەگەر خۆشت دزیت نەکرد، تۆش ترێیەکەت هەڵلوشی..."
"وەکو ئەو ژنانەت لێنەهات کە تازە دووگیان دەبن؟"
"نەبوومە دزی ماڵی خۆم و نە تووشی رەوانبوونیش بووم."
"کاراجا ئەلیف دزی نەکرد."
"نەهاتە نێو رەزەکان."
"نەك هێشووێك بەڵکو گەڵا مێوێکیشی لێنەکردەوە."
"چۆن دەکرێت ببێتە دزی ماڵی خۆی؟"
"ئەو بە خواردنی هی خۆی..."
"مەگەر دەکرێت ورگی وەکو دەهۆڵ لێبێت وتووشی رەوانی ببێت؟"
"ناکرێت."
"ئەو نەخۆشە."
"خوا لەم رۆژانەدا ئەوی نەخۆش کرد تاکو نەبێتە دزی ماڵی خۆی."
"هەر کەسێك ماڵی خۆی بدزێت دەچێتە دۆزەخ."
شوکری ئەفەندی لەکاتێکدا سکی خۆی بەرز و نزم دەکردەوە هەستا.
"ئێستا کە خۆتان دەتانەوێت، منیش کاراجا ئەلیف دەکەمە سەرکارگەر. دەستهەقی ئەمانە چەند بێت هی کاراجا ئەلیفیش ئەوەندە دەبێت، بەدیارتانەوە دەوەستێت."
گوتیان: "بیستمان، بیستمان."
کاراجا ئەلیف گوتی: "ئەگەر بیستتان، ئەمەش ببیستن. خۆیتان لێدەدەم تاکو بۆگەن نەکەن."
"ئەمەت لەکاتێکی چەند لەجێی خۆیدا گوت کاراجا ئەلیف."
"هەڵبەتە، لەمڕۆوە سەرکارگەرتانم، چاوی بەخیل بتەقێت."

کچەکە ناوی پەری بوو. کەریم زۆر لە ماڵێ دەرنەدەچوو، بەڵام کچەکە خەڵکی دوورگە لە کوێ بوان ئەویش لەوێ دەبوو. رەزەکانی دوورگەیان پێکەوە هەڵلوشیبوو، بەڵام لە هێشووە ترێیەکی زیاتر نەخواردبوو. کاتێك خەڵکەکە بۆ قەزای حاجەت دەچوونە نێو دەوەنەگەزەکان، ئەگەرچی ئەو تووشی رەوانی نەبووبوو چوو لە پشت دەوەنێك میزی. کاتێك هاتەوە ماڵ هەموو رووداوەکەی بۆ کەریم گێڕایەوە.

"هیچیان بەوانە نەگوت کە ئاوا رەزەکانیان هەڵلوشی."

"هیچیان پێنەگوتن. تازە، دکتۆرە گەورەکە، سەرگوردە چیە، کڵێسای ئەم دوورگەیەی کردبووە نەخۆشخانە، هەموو ژنە یۆنانیەکانی دوورگەش پەرەستاریان لەو نەخۆش و برینداراانە دەکرد کە لە گەلیبۆلۆ دەهاتن. دکتۆرەکان هەردووکیان چونکە ئێرەیان زۆر پێخۆش بووە دوای داخستنی نەخۆشخانەکە لێرە ماونەتەوە."

لەگەڵ خەڵکەکە چووبووە لای دکتۆرەکان و وەکو رەوانیەکان لەنێو کرێکارەکاندا دانیشتبوو. هیچ لە خەڵکەکە جیانەدەبووەوە.

"کاتێك هەموان ئەوانەیان گرتە باوەش کە باخ و رەزەکانیان ئاوا پایە ماڵ کردبوو، کەس تێبینی تۆی نەکرد؟"

"نەیانبینی. تەنها ئەو تفەنگچیەیە کێیە، نیشانچی، چاوی لەسەر من هەڵنەدەگرت. ئەوەکەی دیکە پۆیراز، عەباسە کێیە، منی بینی وەلێ هیچ سەیری نەکردم. پێموایە ئەو کورتە باڵایە چاوشینە کە چاوەکانی دەڵێیت قۆپچەن بە تەمایە تۆ بکوژێت. بڕیاری خۆی داوە. لێناگەڕێت منیش بە زیندوویی بمێنمەوە. جۆرێك سەیری دەکردم دەتگوت بەخوێنم تینوە. ئەو پیاوە لەو جۆرە کەسانیە کە مرۆڤ وەکو مێش دەکوژن، پاشان هەڵدەستن و دەچن دەستنوێژ دەگرن و دروست لە پشت پێشنوێژیکەر دەوەستن و نوێژی مردوو بۆ کوژراوەکە دەکەن."

"تۆ چیدەڵێیت، دەتوانین لێرە بمێنینەوە؟"

"پێموایە کەم کەم خەریکە نەرم دەبن. لە نیشانچی دەترسم، جەنەی لە ئێمە گرتوە. جارێك برۆ قسەی لەگەڵدا بکە. لە سالێکدا نەتکوژێت تێدەگەیت سەبارەت بە ئێمە چۆن بیر دەکەنەوە."

"من ئێستاش دەزانم ئەوان چۆن بیر لە ئێمە دەکەنەوە. نیشانچی بیرکردنەوەکانی لە بیلبیلەی چاوەکانیدا نووسراون، هیچکەس نیە سەیری چاوەکانی بکات هەر هزرێکی لە مێشکدا بێت لە چاوەکانیدا نەخوێنێتەوە."

"لە بیلبیلەی چاوەکانیشیدا نووسرابوو کە ئێمە دەکوژێت؟"

"نووسرابوو لە یەکەم دەرفەتدا."

"ئێمەش لە یەکەمین دەرفەت بە یەکەم بەلەم کە لێرە دەڕوات دەڕۆین، ناتوانن ڕێگامان لێبگرن. خانوەکەش نافرۆشین، قەباڵەکەی لامانە. دەبێت گورگێکی پیر بهێتە شوێنی ئێمە. ژمارەیان زۆرە. کەس گومانیان لێناکات."

"با جارێ من بچمە دەرێ، مێشك و ناخی عەباس و عەباسی پشیلە و نیشانچی و ڤاسیلی دەخوێنمەوە. پێشینان گوتوویانە، لەم دنیایەدا مرۆڤ تاکە گیاندارێکە کە مرۆڤ دەیناسێت. مرۆڤ لە رۆژێ بەڕێوە هەمیشە هەر لەگەڵ مرۆڤەکان بووەو زیاتر بیری لە مرۆڤ کردۆتەوە."

"دکتۆر داوای لە ڤاسیلی کرد کە ئەوانەی لەگەڵ ئێمە هاتن فێری دروستکردنی مێووژیان بکات."

"بڕیارە ڤاسیلی بهێتە ماڵی ئێمەش."

"پێیبلێم ئێمە ترێمان نیە؟"

"هەرچی بکەین هەر دێت. نەك جارێکیش چەند جار لە دوای یەکدا. ئەو دەڕوات بەدوای ئەودا نیشانچی دێت، تا ئەو کێشەیە چارەسەر دەکەن. چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە بۆ ئەوان ئاسانە. پشیلەکە ناوی عەباسە وەلێ چونکە پیاوەکانی ئێمە هاتن و بەوردی لە عەباسیان پرسی، منیش هەروا پرسیم، ئەوکات کارەکەمان خراپ کرد. لەمەودوا هەرکەسێك بهێتە ئێرە لەژێر چاودێری دادەبێت. زەحمەتە بە ساغی لێرە دەربچێت. با جارێ بچم هەستێك رابگرم بزانم چ باسە. بەڵکو ئەمانە عەباس و مەباس بن، بەڵکو تەنانەت واش نەبێت و ئەوەی ئێمە بیری لێدەکەینەوە ئەوان بیری هەر لێنەکەنەوە. کارێك نەکەین بڕۆین دەست لە ئەژنۆوان درێژتر ببینە گاڵتەجاڕی خەڵکی. ئەوکات لەم دنیایەدا ئابڕوومان دەچێت. عەباس ناوی پیاوانە، دەشێت ناوی پشیلەش بێت؟ رێی تێناچێت نیشانچی کە دەڵێی جنۆکەیە ئەم شتانە نەزانێت، وانیە؟ ئەگەر کەسێکی نامۆ لە دوورگەیەکدا پشیلەیەك ببینێت و ناوی ئەو پشیلەیەش عەباس بێت ئەو ناوەش ناوی دۆستێکی کەسێکی دیکە بێت بۆچی دەبێت بەدوای عەباسێکی دیکەدا بگەڕێت؟ ئێستا بابچم سەیرێکیان بکەم. کاتمان زۆر لەبەردەمە."

کەریم هەموو رۆژێك لە ماڵێ دەردەچوو. سڵاوی لە هەموان دەکرد، لەگەڵ زۆربەشیان قسەی نەدەکرد. پۆیراز، واتە عەباس هیچ بایەخی پێنەدەدا، ئەوی بە کەسێك دەزانی کە وەکو خۆی پەنای

هێناوەتە بەر ئەو دوورگەیە. قسەی لەگەڵ دکتۆرەکان کرد. ئەم دکتۆرانەی جەنگی چاناك قەڵا کەسانێکی باش، بە ئەزموون، بەخشندەو نەرم و نیان بوون. کاتێك لە کڵێسای وێرانکراو، واتە نەخۆشخانەکەی جاران، قسە دەهاتە گۆڕێ هەردووکیان ئاخیان هەڵدەکێشا.

هەموان وەکو دۆستێکی دێرین رەفتاریان لەگەڵ دەکرد. نیشانچی ئیدی نەدەهات، بەڵام هەر جارێك ئەوی بینیبوا لێیدەپرسی، دەیگوت پەری چۆنە، وەکو باوکێکی دڵسۆز و گەرم و گوڕ بوو.

کەسانێك کە هاتبوونە دوورگە، لەگەڵ سەرکارگەرەکانیان دەچوونە نێو زەیتوونستانەکە، زەیتوونە لێکراوەکانیان لەسەر حەسیران رۆدەکردن، رۆژی یەکەم، دوروبەری عەسر، سەرکارگەرەکان شوکری ئەفەندیان ئاگادارکردەوە کە کرێکارەکان زۆر شارەزان. شوکری لە بیستنی ئەم قسەیە زۆر خۆشحاڵ بوو. لە ماوەی یازدە رۆژان کاری لێکردنەوەو کۆکردنەوەی زیتوونەکان کۆتایی هات. بڕیاربوو لە دوو جێگای دیکەش کاربکەن، بەڵام ئەمە گرنگ نەبوو. کاری هەر یەکێکیان چەند رۆژ درێژەی دەکێشا.

ئەو زەیتوونانەی کە هەریەك لە ماڵەکان کۆیانکردبوونەوەو لەسەر حەسیرەکان رۆیانکردبوو، ئەمجارە رۆکرانەوە نێو سەبەتەی گەورەو کێشران، کابرای کاتب پارەی زەیتوونەکانی لەسەر بنەمای هەر کیلۆیەك و دووسەد گرام دایە کرێکارەکان.

کرێکارانی زەیتوون لەوەتەی هاتبوونە ئەم ناوچەیە، زۆر باخی زەیتوونیان رنیبوون و زەیتوونیان کۆکردبوونەو، بەڵام قەت ئەوەندەیان پارە پێنەدابوون. کاراجا ئەلیفیش نوقمی شادی و خۆشحاڵی بوو. ئەویش لەماوەی ساڵانی رابردوو ئەوەندە پارەی وەرنەگرتبوو. سەرکارگەرەکانیش چ پارەیەکی باشیان پێبڕابوو. هەموویان خەنی بووبوون. ئەگەر بەگوێی ڤاسیلیان کردبێت ئێستا ترێیەکەیان وشك بووەتەوەو زۆری نەماوە ببێتە مێوژ و گونی گونی مێوژان دابنێن. جگە لە هەقدەستی کرێکارەکان شوکری ئەفەندی کە ترێیەکەی کڕیبوو کۆشە پارەیەکی پڕیشی دایە دوورگە. ئەو پارەیەش داندرابوو بۆ نەخۆش و ئەو کەسانەی پارەیان نیە و نیازمەندن.

وەستا ئارسۆنیش کە ماوەیەکی باش بوو دەرنەدەکەوت ئێستا هاتبووەدەر. بەیانیان زوو، ئەودەمەی خۆر دەردەکەوت کوورەی وەستا ئارسۆنیش وەکاردەکەوت و هاوکات لەگەڵ دەنگی چەکوچ کە بە سندانەکە دەکەوت دەنگی کوورە دەبڕاو دیسان دەهاتەوە.

وەستا ئارسۆن لەوەتەی هاتبوو بەردەوام کاری دەکرد. سوپاس بۆ خوا پارەیەکی باشی دەستکەوتبوو. نیشانچی لە هەر جۆرە قولابێکی ماسیان دوو دەرزەنی کڕیبوو پارەیەکی زۆری

هەڵڕشتبووە سەر سندانە پیرۆزەکە. لە دێهاتەکانی خوارێی لێوار دەریاش ماسیگرانێکی زۆر هاتبوون و داوای قولاب و نێزەیان کردبوو. زۆربەیان کەسوکار و رەچەڵەك و هاوپشکەکانی ئەو یۆنانیانە بوون کە لێرە رۆیشتبوون. ئەوانەی کە نێزەیان بەرادان دابوو، بۆ راوی شمشێر ماسی مانگی چوارو پێنجی ساڵی ئایندەیان بوو. وەستا بەر لە بەڕاداندانی ئەو نێزانەش نێزەی دیکەی دروستکردبوون و بە دیواری دووکانەکەی هەڵواسیبوون. لەکاتی راوی شمشێرماسیدا نێزە فرۆشێکی باشی هەبوو. دوای رۆیشتنی یۆنانیەکان هیچ ئاسنگەرێك لەم نێوە نەمابووەوە. دروستکردنی نێزە کارێکی سەخت بوو. هەموو ئاسنگەرێك نەیدەتوانی نێزە دروست بکات. تەنێ ئاسنگەرە شارەزاکان دەیانتوانی نێزەی باش دروست بکەن.

پۆیراز و وەستا ئارسۆن، هەر لەو رۆژانەی وەستا هاتبووە دوورگە لەگەڵ یەکدا ئاشنا بووبوون، ئەم دووکانەشیان بەبێ بە بەریەکهەڵچوون پێدابوو. لەهەمان رۆژیشدا دۆستایەتی و هاوڕێیەتیەکی گەرم و گوڕیان کەوتبووە نێوان.

ئەو رۆژە پێکەوە چوونەوە ماڵی پۆیراز، دانیشتن، سەبارەت بە نۆژەنکردنەوەی ئاشەکە پێکەوە راوێژیان کرد. قاوەی سەر بە کەفیان کە لێنا لێینابوو خواردەوە. پۆیراز هەستاو چووە ژوورەکەی و گەڕایەوە پێنج سکەی زێڕی دانانە سەر لەپی دەستی وەستا ئارسۆن.

وەستا ئارسۆن گوتی: "ئەم هەموو پارەیە زۆرە."

"باقیەکەی بێنەوە وەستا."

چوونە دەرەوە، چوونە ژێر دارچنارەکان. وەستا ئارسۆن چووەوە شوێنی کارکردنی خۆی، پۆیرازیش لەسەر یەکێك لە تەختەکان دانیشت، چاوی بڕیە ماڵی موسا ئاغا، دەستی دانایە سەر دڵی تا دەرگا دەکرێتەوەو زەهرا لە پلیکانەکان دێتە خوار. ئارام بوو، جار بەجارێك سەیری دەریای دەکرد، رووی دەریا ساف وەکو ئاوێنە وابوو، بیری کردەوە، باران دەبارێت. لە کاتە کۆتاییەکانی رۆژێکی ئاوا بوو کە رووی دەریا ئاوا وەکو ئاوێنەی لێهاتبوو و دواتر باران و لافاو هەستابوو و پۆیراز لەژێر ئەو بارانە وەکو شێتان ملی لێنابوو و خۆی بە دەریادا دابوو. ئێستا بیری لەو رۆژە دەکردەوە، بەڵام بەبیری نەدەهاتەوە چۆن دەرباز بووبوو. ڤاسیلی لەو باوەڕە بوو کە زەهرا دەربازی کردبوو. دوور نیە، دوور نیە. رەنگبێت ئەودەمەی لەژێر ئەو ڕێژنە بارانەدا هەنگاوی دەنا ئەوی بینیبێت، ئەودەمەی خەریك بووە خۆی بە دەریادا بدات خۆی گەیاندبێتێ و ئامێزی لێدابێت و ئاوا گەیاندبێتیەوە ماڵێ. کە دەڵێن عەشق، ئەمەیە. حاڵ و هەوایەکی سەیر بەسەر مرۆڤدا زاڵ دەبێت.

حاڵ و هەوایەکی سەیرکە بەردەوام نوێ دەبێتەوەو رەگاژۆ دەبێت. دەرگاکە کرایەوە، پۆیراز گوێی لە دەنگی پێی زەهراش بوو کە سەتڵی بەدەستەوە بوو و خێرا خێرا لە پلیکانەکان دەهاتە خوارێ. تەنانەت ئەگەر دەنگی پێی راستەقینەش نەبووبێت ئەو لە زەینی خۆیدا ئەو دەنگەی دروست کردبوو. زەهرا خەریك بوو دەهات، دەستپاچە بوو. نەیدەزانی چیبکات. زەهرا هات، سەتڵەکەی خستە بەر شێرەی ئاوەکە. پۆیراز کاتێك توانی بە قسە بێت کە سەتڵەکە پڕ بووبوو و زەهرا دەستی بۆ سەتڵەکە بردبوو هەڵیبگرێت. پۆیراز گوتی:

"گوتوومە ئاشەکە نۆژەن بکەنەوە، وەستا ئارسۆن بەمزوانە دەستبەکار دەبێت پەروانەکان." بێدەنگ بوو، دەنگی دەلەرزی. "بڕیارە پەروانەکان شین بکات، کاتێك با لێیان بدات ئەو رەنگە شینە وەکو ئاسمان شین دادێت." دوا وشەکانی خێرا خێرا دەربڕین. "ئێمە جارێکی دیکەش پێکەوە لەسەر بەرداشەکە دادەنیشین... پەرەسێلکەکان... هێلانەکانیان... زاك و زیك دەنێنەوە."

زەهرا پێکەنی. پۆیراز خۆشحاڵ بوو. لە خۆشیان خەریك بوو باڵ دەربکات و بفڕێت.

"دەریا دەڵێی ئاوێنەیە، باران بڵێم وەکو چی دەبارێت. من بۆ دەریا... تۆش دێیتە ئاشەکە؟"

زەهرا لەکاتێکدا سەتڵی هەڵگرتبوو و دەڕۆیشت بە زەردەخەنەوە سەری خۆی بە نیشانەی بەڵێ دانەواند.

پۆیراز هەستا، پەروانە نارنجی، سپی و شینە ئاسمانیە درەوشاوەکان بەسەر سەریەوە دەخولانەوە. رێگاکەی ون کردبوو. هەستا، نیگای کەوتە سەر هێلانەی ئەو باڵندانەی کە لەنێو لکی دارچنارەکە هێلانەیان چێکردبوو، سەری لە خۆشیان دەخولایەوە.

هەڵۆیەك کە مەمکێکی غەڵتانی خوێن و تێکەڵاوبوو بە لمی لێواری بە دەنووکەوە بوو بە وشە وشەوە لە ئاسمانەوە بەرەو لای ئەو دەهاتە خوار. چەند هەنگاوێك چووە پێش، پشتی بە قاپۆری دارچنارێکەوەدا، چاوەکانی داخستن. هەزاران سەربازی بە سەهۆڵبوو لە دەوروبەریدا مابوونەوە، خودی ئەویشیان لەژێر بەفردا دەردەهێنا. هاوکات لەگەڵ ئەمانە فەوجێك سەربازیش... هێشتا وشە وش و زریکەی گوێکەرکەری ئەو هەڵۆیانەی لە گوێدا دەزرنگانەوە کە لە ئاسماندا خۆیان وشت کردبووەوەو بە شێوەی تۆپێك خۆیان خڕکردبووەوەو بەرەو زەوی دادەبەزین.

ئاوا بەپێوە تاوێك بیری کردەوە، پاشان بڕیارێکیدا و بەرەوماڵی کەریم بەرێکەوت. لە ماڵی کەریمدا مافووری ئیسپارتا، کورسیی مەخمەڵی، مێزی لە دارگوێز دروستکراو، وێنە و دیمەنی سەر

دیواران و هەروەها گرامافۆنێکی شەیپوردار هەبوون و هەر ئەو شتانەش ماڵەکەیان بۆ ژیان و حەوانەوە گونجاو کردبوو. پەری و کەریم ئەویان لە پەنجەرەوە بینی و لەبەر دەرگا پێشوازیان لێکرد.

"ببوورن کە درەنگ هاتم، دەبوا زووتر هاتبوام بۆ بەخێرهاتنتان."

"قوربان، ئێستاکەش سەر سەرو سەرچاومان هاتی."

کەریم بەترسەوە سەیری روخسارو چاوەکانی ئەوی دەکرد، یەکەمین کەریم ناوێك کە هاتبێتە ئەم دوورگەیە ئەم کەریمە بوو. هەمان ئەو کەریمەی کە سۆراغی عەباسی گرتبوو و لەجێی ئەو لەگەڵ پشیلەیەك رووبەڕوو بووبووەوە هەمان ئەو کەریمە بوو. ئەوکات ئەو کەریمی بەخشیبوو کاتێك بۆ جاری دووەم هاتبوو لەگەڵ نیگاکانی نیشانچی رووبەڕوو بووبوو، بێئەوەی کە لە بەلەم داببەزێت گەڕابووەوە. کەس نەیدەزانی ئەو پێنج کەسە رەشپۆشە چیاندەویست. بۆچی بەو سەرو بیچمە سەیرەوە هاتبوون، بۆچی ئاوا هەڵسوکەوتیان کردبوو، بۆچی بەو شێوازە خۆنواندنەیان رۆیشتبوون. کەریم بۆچی لەکاتێکدا باش دەزانێت ئەگەر بناسرێت بەرلەوەی بتوانێت کەس بکوژێت خۆی دەکوژرێت لەگەڵ کچێك هاتوەتەوە ئێرە؟ سەرو بیچمی هیچ لە سەرو بیچمی کەسێك نەدەچوو کە بیەوێت مرۆڤ بکوژێت، ئارام، لەخۆ بە متمانە، دوور لە هەر نیگەرانیەك بوو. کەسێك لەو تەمەنەدا کە بە تەما بێت کەسێك بکوژێت و هەمان ئەو کەسەش لەپڕ بەرامبەری دەربکەوێت چۆن دەتوانێت ئاوا رەفتار بکات؟ هیچ نیشانە و ئاماژەیەك لەو شتانە بە رواڵەتی کەریمەوە بەدی نەدەکران. چاوەکانی کچەکە جار جار دەبریسکانەوەو هەندێکجاریش خامۆش بوون، روخساری حاڵەتێکی بەخۆوە دەگرت کە داوای پاڕانەوە بکات. ئایا ژنان بەو شێوەیە ناخی خۆیان ئاشکرا دەکەن؟ ژنەکان ئەگەر بیانویستبوا زۆر باشتر لە پیاوان دەیانتوانی نیاز و مەبەستی خۆیان بشارنەوە. بە بینینی ئەو روخساری گۆڕابوو هەر رەنگێکی هێنابوو رەنگێکی بردبوو، یان پۆیراز وای بە زەیندا هاتبوو. بۆنی قاوەی کوتراو ماڵەکەی پڕ کردبوو. پۆیراز هەوڵیدەدا هزر و لێکدانەوەی باش لە مێشکیدا جێبکاتەوە. قاوەکە بەیانی گەرم کرابوو و لە هاوەندا کوترابوو. بە مسۆگەری چاوەڕوانی نیشانچی بوونە. یان کەسێکی دیکە بڕیار بووە بهێت؟"

پۆیراز لە بارەی هەموو شتێك گفتوگۆی لەگەڵ کردن و ئەوانیش جگە لە کوشتنی ئەو باسی هەموو شتێکیان بۆ کرد. بەرلەوەی پۆیراز پرسیارێك بکات، ئەو گوتی کە هاتە دوورگە و سۆراغی عەباس ناوێکی گرتوەو پشیلەیەکیان نیشانداوە ناوی عەباس بووە. گوتی خاوەنی پشیلەکەش کەسێکی زۆر باشە. دووبارە بەرلەوەی پۆیراز پرسیار بکات، ئەو گوتی: "ئەودەمەی کە دەمەویست

سواری بەلەمێکی ماتۆڕدار ببم کە بۆ ئێرە دەهات، سەیرم کرد منداڵەکان و نزیکەی هەموان لەسەر ملی یەکدی سوار بووبوون. لەبیریشم چوو بوو کە دوورگە ئەوەندە نزیکە. لە ئەسکەلە بەلەمێکم بەکرێ گرت. دوای ئەوەی ئەوان لەسەر ئەسکەلەی ئەم دوورگەیە راوەستان، ئێمەش بەلەمەکەی خۆمان لەوبەر راگرت." پۆیراز دوودڵ بوو، لەلایەك ئەوی بە کەسێك کە بۆ مرۆڤکوشتن هاتبێت نەدەبینی، لەلایەکی دیکە، نەیدەتوانی دڵنیاش بێت و بیر لەوە نەکاتەوە کە بۆ کوشتن نەهاتبێت. دەبێت لەو بارەیەوە بە وردی قسە لەگەڵ نیشانچی بکات. هەستا، کەریم و پەری تا دەرگای دەرەوە لەگەڵی چوون و بەرێیان کرد. شەو گوللەیان بە دوژمنەوە ناو رۆژی دواتریش تابووتیان هەڵگرت و بە گریانەوە بردیانە گۆڕستان ئەم بەرێکردنو بەدرەقەکردنە تا بەردەم دەرگای حەوشە ئەو واتایەی هەیە.

پۆیراز پەرێشان بووبوو، بە هەڵەداوان چووە لای نیشانچی، نیشانچی چووبووە لای دکتۆرەکان. ئەویش چووە لای دکتۆرەکان، دکتۆر سەلمان سامی بۆ پێشوازیکردنی تا بەردەرگا هات:

"نیشانچی لێرەیە، مامۆستاش، با یەکسەر بچینە خوێندنگەکە. ئەو مامۆستایە کەسێکی زۆر بە تواناو سەرنجڕاکێشە، خوێندنگەی وابەباشی رێکخستوە کە باس نەکرێت، بە تابلۆی ئەلفوبێ، دەفتەرەکان، قەڵەمەکان، نیوتەختە نوێیەکان، کتێبەکان، تەختە رەشەکان، تەباشیرەکان. ئەویش وەکو تۆ لە جەنگی سەربەخۆییدا بەشداری کردوە، ئەفسەری یەدەك بووە. یاللا دۆستان، کاك پۆیرازیش هات، بابچین سەرێك لە خوێندنگە بدەین."

بەنێو دەوەنە گەزەکاندا تێپەڕین و گەیشتنە خوێندنگە. "ئەم دەوەنە گەزانە دەبێت لە باخچەی خوێندنگە بمێننەوە. سەیریان بکەن، دەوەنی وا جوانی وەك ئەم دەوەنە گەزانەتان بینیوون؟ بەریان نیە، هیچشتێکیان نیە، تەنها گوڵی بچووك بچووکی پەمەیی و سپی... خوێندنگەکەمان لە ماوەی چەندساڵێکدا ناوبانگ دەردەکات."

چوونە ناو خوێندنگە، پلیکانەکان و هەموو جێگایەك شورابوو و تەڕو تەمیز بوو. زۆربەی نیوتەختەکانیش نوێ نوێ بوون. بۆنی تەختەو دار هەموو لایەکی پڕ کردبوو.

مامۆستا گوتی:

"سەرەتای ئەم مانگە ئێمە دەست بە دەرسەکانمان دەکەین، لە هەموو جێیەکی تورکیا ئاوایە."

"من و کاك دکتۆر، من و جەنابی مامۆستا، کاك پۆیراز و جەنابی پزیشکی ئاژەڵان پێکەوە هەموو رۆژێك دێین لە تەك منداڵەکان لەسەر نیوتەختەکان دادەنیشین و گوێ لەوانەکان دەگرین."

نیشانچی گوتی: "منیش دێم."

"دواتریش وردە وردە کە کلاسەکان ڕێکخران، ئێمەش وانە بە منداڵان دەڵێینەوەو یارمەتی ماموّستا دەدەین."

"پزیشکی ئاژەڵانیش دەیگوت دەیەوێت لێرە وانە بڵێتەوە، تا ئەودەمەی ماموّستاکان خۆیان ڕێکدەخەن و کاروبارەکانی خوێندنگە بەباشی وەڕێ دەخەن."

دکتۆر سەلمان سامی بە دەنگی بەرز گوتی: "پزیشکی ئاژەڵان مانگای زا، واتە گەرەکیە تا ماوە هەر ماموّستا بێت و وانە بڵێتەوە. ڕێك ئەودەمەی دەمانگوت ماموّستایەکمان دەستکەوتوەو دەبێت سوپاسی خوا بکەین..."

"کەواتە، ئەمە واتاکەی ئەوەیە کە ئێمەش چونکە بەهۆی کەمئەندامبوونمان خانەنشین کراوین کارێکی باشمان دەستکەوتوە. ئاە، ئاە." پۆپیراز ئاهێکی هەڵکێشا: "ئەگەر نیشانچی خوێندەواری هەبوا خوا دەزانێت دەبووە چ ماموّستایەك!"

دکتۆر سەلمان سامی گوتی: "خوا دەزانێت نیشانچی چ جۆرە ماموّستایەك دەبوو."

"بەڵکو باشتریشە کە خوێندەوار نیە. ئەویش وانەی ماسیگرتن فێری منداڵە گەورەتر و گەنجان و تەنانەت پیرەکانیش دەکات، دوورگەمان دەبێتە دوورگەی ماسیگران. ئەو هەروا کە چاوی بەسەر دەریادا دەگێڕێت دەڵێت، لەوێ لۆفەر، لەوێ پالامونت، لەولاتر مەرجان هەیە، دەڕۆین ئەو ماسیانەی ناوی هێنان دەگرین. نیشانچی تەنانەت جارێکیش هەڵەی نەکردوە."

"چۆن چۆنی ئەم کارە دەکات؟ لە دوورەوە ژێر دەریا دەبینێت؟"

"بڵێم چی بەڵکو بەهۆی تەکانەکانی رووی دەریا، هەڵم، ڕەنگەکان، من چوزانم... پێمگوت مەگەر تۆ باشترین هاوڕێی من نیت، باشە دەمنیش فێر بکە. گوتی گیانیشم لە پێناوی تۆ دادەنێم، بەڵام ناتوانم ئەمەت فێر بکەم، گوتی من خۆشم نازانم چۆنە و چۆن لەو شتانە دەگەم جا چۆن تۆ فێر بکەم. ئەو شوێنەی کە پێموایە ماسی لێن سەیر دەکەم، بیر دەکەمەوە، وەلێ لەوە دەترسم کە ئەو ماسیە لەوێ نەبێت. کاتێك دەچم دەبینم لەوێ ماسی حەشر دەکەن. ئەم کارەی من پەیوەندی بە شارەزاییو کەرامەتەوە نیە. مرۆڤ لەنێو دڵیدا هەندێك شت تەکانی دەدەن، سەراپای ناخ و دەمارەکانی مرۆڤ پڕ دەبن لە بۆن و ڕۆشنایی دەریا. من چوزانم چی ڕوودەدات. ئەم شتانە چۆن دەکرێت فێری کەسێك بکرێن؟ لەبارەی ئەو شتانە زۆرمان قسە کردوە، تێگەیشتووم هەرگیز ناکرێت ئەم هونەرە فێری هیچکەس بکرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ماسیگر دەتوانێت زۆر هونەر و

شارەزایی ماسیگرتن فێری ئەو کەسانە بکات کە دەیانەوێت ببنە ماسیگر. لە ماوەی چەند مانگێکدا ئەو ئەحمەدەی برازای عەلیی چاوەشە شەلەی وا لێکرد و ماسیگرێکی وای لێدەرچوو کە تەنانەت سەرۆکی ماسیگرەکانی یۆنانیش تۆزی لە دوو بکەن."

پۆیراز بۆ ئەەوی باسەکە بگۆڕێت لە مامۆستای پرسی:

"تا ئێستا چەند منداڵ ناوی خۆیان نووسیوە، مامۆستا؟"

مامۆستا گوتی: "شەست و پێنج منداڵ."

سەلمان سامی گوتی: "هێشتاش دەبن. هێشتا پازدە بیست خانوو چۆڵە. دوای ئەمە، تەنانەت ئەگەر هیچکەسی دیکەش نەهێتە دوورگە، ژمارەی ئەو منداڵانەی لێرەن لە سەد منداڵیش زیاتر دەبن، دەگەنە سەدو پەنجا. نەکات کچەکان حسێب نەکەن، جەنابی مامۆستا ناوی چەند کچێکیشت نووسیوە؟"

"ناوی هیچ کچێکم نەنووسیوە کاك دکتۆر."

"ئێمە کاتی خۆی کە لێرە بووین ئەم شوێنە خوێندنگەی کچان بوو. خوێندنگەی کوڕان نزیکی کۆشکە تێکدراوەکەی چێشتلێنەران بوو. ئێمە هەموو کچەکانیش دێنینە ئێرە."

مامۆستا گوتی:

"ناهێڵن بیانهێنن کاك دکتۆر."

دکتۆر بە هێمنی دەئاخفت لەپڕ تووڕە بوو: "حەدیان چیە ناهێڵن، ئەگەرنا دەبێت لێرە بڕۆن. ئێمە ناتوانین لەنێو ئەو خەڵکە خۆمان وەکو کەر بە نەزانی بهێڵینەوە. یان دەبێت لەنێو بچین یان وەکو ئەوروپییەکان دەرس بخوێنین و شت فێر ببین. ئەم وڵاتە زۆر دواکەوتوە، زۆر."

پۆیراز گوتی: "کاك دکتۆر راست دەکات، کابرا ژنەکەی نەخوێنێت و خۆی بخوێنێت بە کەڵك ناهێت. وڵاتێك کە ژنەکانی نەخوێندەوار بن، پیاوەکان هەرچەندە بخوێنن بە هیچ ناگەن."

دکتۆر بە هەڵچوونەوە گوتی: "ناگەن. لێرە بۆ ئەو ژن و پیاوانەی خوێندەواریان نیە کلاسی فێربوونی خوێندەواری دەکەینەوە. لەم سەردەمەی ئێستادا، ئەگەر وڵاتێك بیەوێت ببێتە وڵات دەبێت هەموو خەڵکەکەی خوێندەوار بێت، بەتایبەت نابێت هیچ ژنێکی نەخوێندەوار بێت."

کاك دکتۆر خەلیل رەفعەت گوتی: "هەوا خەریکە سارد دەبێت، سبەی دووسبەیش خوێندنگە دەکرێتەوە چەند سۆپایەکمان بۆ خوێندنگە پێویستن. داریان دەبێت لەکوێ بۆ بکڕین؟"

"پارە بۆ کڕینی سۆپا هەیە. تازە، دەتوانین سۆپای چینی کە لە یۆنانیەکان ماونەتەوە بدۆزینەوە. سەبارەت بە داریش، دایکە لێنا و ڤاسیلی دەڵێن یۆنانیەکان ساڵانە بەر لەوەی زستان دابێت بە ئەندازی پێویست داری وشکیان لەنێو دارسنۆبەر و دارزەیتوون و نێو باخەکانی هەناران کۆدەکردنەوەو دەیانهێنانەوە ماڵەوە. ئێمەش دەتوانین بەپێی پێویست دار لە دوورگە کۆبکەینەوە، کێماسیشمان هەبوو، دەچین لە دوورگە دەکڕین."

دکتۆر گوتی: "باشە، کێشەیەکی دیکەشمان چارەسەرکرد. زەیتوونستانەکە وەکو جەنگەڵ وایە. ناو دارسنۆبەر و هەنار و دەوەنە گەزەکانیش دەڵێی جەنگەڵستانە. دار و چیلکەی وشکی ئەم دوورگەیە نەك هەر بۆ خەڵکی ئەم دوورگەیە کەم نین بەڵکو زیادیشن."

هەموان لە کۆکردنەوەی داران ئاگاداربوونەوە، خەڵکی دوورگە لە حەوت ساڵیەوە تا حەفتا ساڵی، جگە لە دکتۆرەکان و موسا ئاغا و کچەکانی و پزیشکی ئاژەڵان و پۆیراز و شێخمووس ئاغا، ئەوانی دیکە گشتیان، بۆ کۆکردنەوەی داری وشك و چیلکان چوونە نێو زەیتوونستانەکەو نێو دارسنۆبەر و باخەکان، نیشانچیش چووە نێو دارهەنجیرەکان. بە هاوسەرەکەشی گوت:

"سەیرکە سوڵتان، هیچکەس بۆ کۆکردنەوەی داران ناچێتە نێو دارهەنجیرەکان. ئەوان دەزانن دەست بۆ هەر لکێك ببەن و قاچ دابنێنە سەر هەر کەدێك دەیشکێنن، بەڵام شتێك هەیە نایزانن، ئەگەر بشیبیستن باوەڕ ناکەن. ئەویش ئەوەیە دارهەنجیر کە وشك بوو وەکو مەڕمەڕی سپی قایم و پتەو دەبێت، پەنگری ئەو دارەش لە پەنگری دارەکانی دیکە خۆڕاگرترە."

سوڵتان بە حەپەساویەوە پرسی: "بەڕاستتە؟ قەدی دارهەنجیر گەندەڵ نابێت، نارزێت؟"

"لکی تەڕی درەخت نەرم و شلکە، کە وشك بوو سفت و قایم دەبێت، لە دارگوێزیش قایمتر دەبێت، وەکو بەردی مەڕمەڕ پەنگریشی لە دارزەیتوون و دارگوێز و داری لێڕەواران درەنگتر دادەمرکێن."

"وای، نابێت ئەمە بە کەس بڵێم نیشانچی. وای بە قوربانت بم نیشانچی، کەس با نەزانێت ئێمە دارهەنجیران کۆدەکەینەوە. ئێستا با من و تۆ و منداڵەکان بچینە ناو دارزەیتوونەکان لەوێ داران کۆبکەینەوە. با هەموان بمانبینن کە دارزەیتوون و دارسنۆبەر کۆدەکەینەوە."

"پێویست ناکات وا خۆمان بنوێنین، چڵوچێوو پووشووی دارسنۆبەر بۆ هەموو زستان پێویستن، بۆ داگیرساندن و کردنەوەی ئاگر."

دوو سێ ڕۆژ لەسەر یەك دارسنۆبەر و دارگوێزیان کۆکردنەوە، دارەکانیان کردنە پشتی و بەکۆڵ پشتی پشتی گواستیانەوە ماڵەوە، لەوێوە گەڕانەوە نێو دارهەنجیرەکان. بەر لەوەی تیشکی خۆر دەربکەوێت، ئەودەمەی کەڵەشێرانی بەرەبەیان دەخوێنن دەچوون و دوای خۆرئاوابوون دەگەڕانەوە نێو گوند.

دێهاتیەکان لە ماوەی هەفتەیەکدا هەموو وشکە دارەکانیان کۆکردنەوە. مامۆستاش لەگەڵ دێهاتیەکان بە تەنیٚ بۆ ماڵی خۆی داری کۆکردنەوە.

پۆیراز گوتی: "نیشانچی دەڵێت ئەمساڵ زستانێکی سەختمان لە پێشە. باشترە هەر لە ئێستاوە داری وشك و گزرە لە شارۆچکە بکڕین، ڤاسیلی دەڵێت لە زستاندا داری پەنگران دەست ناکەون."

"ئەگەر داوا لە قەدریی بەلەموان بکەین دەتوانێت دارمان بۆ بکڕێت؟"

پۆیراز گوتی:

"دەکرێت، بەڵام دەبێت ڤاسیلیشی لەگەڵ بنێرم. ئەو لێیدەزانێت ڤاسیلی لە خەڵکە ڕەسەنەکەی دوورگەیە، وانیە؟"

"بیرۆکەیەکی زۆرباشە، زۆرباش."

پۆیراز لەوێدا چووە لای موسا ئاغا، زەهرا دەرگای لێکردەوە:

"فەرموون بەڕێز، بابە لە ژوورەوەیە." لە دەرگاکە کشایەوە، پۆیراز چووە ژوورەوە.

موسا ئاغا بە بیستنی دەنگی ئەو لە ژووریٚ هاتەدەر.

"بەخێر بێیت، فەرموون قوربان..."

"عەرزێکم هەیە."

"تکا دەکەم، تۆ جاریٚ فەرموو دانیشە."

بەرامبەر یەکدی دانیشتن.

"ئێمە لەگەڵ دکتۆرەکان بڕیارمانداوە بۆ کڕینی داری سووتان ڤاسیلی و قەدریی بەلەموان بنێرینە شارۆچکە. هاتبووم بزانم ئێوەش دەتانەوێت پێیانبڵێم دارتان بۆ بکڕن؟"

"سوپاست دەکەم. بەخێر بێیت. من نازانم بۆ ئەم زستانە چەندمان دار پێویستن."

"منیش نازانم قوربان، بەڵام وەك دایکە لێناو ڤاسیلی دەڵێن زستانی ئێرە سەخت و دژوارە، هەندێك ساڵان بەفر تا بەهاریش دادێت هەر دەمێنێتەوە."

"کچینە کیسەی پارەم بۆ بێنن."

"قوربان جاریٚ پێویست ناکات. بڕیار وایە ڤاسیلی بۆ هەموومان وەك یەك بکڕێت. دوای ئەوەی کە دارەکان گەیشتن ئەوسا پارەکەی حساب دەکەین."

لە پڕێکدا بۆنی خەستی قاوە نێو ماڵی پڕ کرد. بۆنی قاوەی تازە بوو کە لە هاوەندا کوترابوو.

نەسیبە یەکەمجار قاوەی بۆ پۆیراز راگرت، پۆیراز هەڵێنەگرت، نەسیبە لەسەر پێداگری پۆیراز قاوەی بۆ باوکی دانا، سینی قاوەکە ماوەیەك ئاوا لەنێوان پۆیراز و موسا ئاغا هاتوچوو تا دواجار موسا ئاغا ناچار بوو یەکەمجار قاوەکە هەڵبگرێت. پۆیراز لەگەڵ تەواوکردنی قاوەکەی هەستا، موسا ئاغا تا بەردەرگا بەڕێی کرد، زەهراش بە لێوانی بە بزەوە دەرگای کردەوە، پۆیراز لە پلیکانەکان چووە خوار و لە دەرگای ماڵەکە چووەدەر، هەستی دەکرد دەروونی خاڵی بووە. چووە نزیك شێرەی ئاوەکە، دانیشت. هەستیکرد هۆیشی لە جێی خۆی نیە، بۆ لای زەیتوونستانەکە چوو، بە رۆخ جۆگەی ئاوی کانیدا لە کاتێکدا ئەو پونگەیەی کە گوڵە شینباوەکانیان پشکوتبوو دەپلیشاندەوە چووە پێش و گەیشتە کانیەکە. هەستیدەکرد شتێکی لێکەم بۆتەوە، لە پڕێکدا ئەوەی بە زەیندا هات کە دوای بینینی زەهرا، دوای زەردەخەنەکەی زەهرا ئیدی مەمکە خوێناویەکان و هەڵۆ چرنووکتیژەکان هێرشیان بۆ هزر و یادەوەرییەکانی نەهێنابوو. نوقمی نێو شادمانی بوو، بە راکردن بۆ لای خوارەوە رایکرد. هەروەك لەکاتی چوونیشدا هەستی بە بۆنی پونگە پلیشاوەکە نەکرد بوو لە گەڕانەوەشدا هەستی بە بۆنیان نەکرد، لووتی دەتگوت هەستی بۆنکردنی لە دەستداوە. قاچەکانی هەڵیانگرت و بردیانە ماڵی موسا ئاغا. لەنێوشادی و خۆشحاڵیدا نوقم بووبوو. ئەو شادمانیەی کە لە هەموو گیانی هەڵدەقولاّ نەك تەنها مرۆڤ بەڵکو مێروولەی سەر زەوی و پەڕەندەی ئاسمانانیش دەیانتوانی هەستی پێبکەن. موسا ئاغا و زەهرا و نەسیبەش هەستیان بەو شادی و سەرمەستبوونەی کرد.

موسا ئاغا، کاتێك پۆیراز دانیشت پرسی: "کوڕم، دەتەوێت کەمێك بخۆیتەوە؟"

پۆیراز بەخێرایی هەستا و گوتی: "دواتر دێمەوە قوربان، دواتر."

"نەمبینین، نەمبینین، ئەو هەڵۆیانەش بە وشە وشەوە لە ئاسمان نەهاتنە خوار، هیچ شتێکیشیان نەڕفاند."

لە پلیکانەکان چووە خوار. بە ورتە شتگەلێکی لەژێر لێوەوە دەگوت، بەڵام ئایا هیچشتی بە موسا ئاغا گوتبوو، ئەگەر دەیگوت چیدەبوو، کێ تێدەگەیشت داخۆ هەڵۆ و مەمك و خوێن و ترپە چین. دیسان زەهرا دەرگای کردبووەوە، ئەو بەدەمی تەواو کراوەیەوە پێدەکەنی. لە دڵی خۆیدا گوتی

تێپەڕی، هەموو شت تێپەڕی. چەند وششششش... هەڵۆکان هەموو شتێکیان قاپاند و بردیان. هیچ هەڵۆیەك لە دوورگە نەماوەتەوە.

بە بیانووی جیاجیا سێ جار چووە لای موسا ئاغا، هەموو جارێکیش زەهرا دەرگای لێدەکردەوە، لە هیچ یەك لەو سەردانانەیدا هیچ هەڵۆیە لە ئاسمانەوە دانەبەزین و تنۆکێك خوێن لە دەنووکیان نەچکا. ئەو شەوە هەر لەگەڵ ئەوەی سەری نایە سەر بالیف، خەوی لێکەوت. بەیانی زوو، لەگەڵ بانگی کەڵەشێران بە ئاگا هات. بۆ یەکەمین جار بوو لە دوورگە گوێی لە بانگی کەڵەشێران دەبوو. سەردەمی منداڵیی خۆی کەوتەوە یاد، دەتگوت چیای ئەللاهوئەکبەری نەبینیوە، بەهۆی سەرماوە نەمردووە، لە کۆمەڵکوژیی ئێزدیەکاندا بەشدار نەبووە، ئێستاش تۆڵەستێنەکان بە دوایەوە نین. وەك بڵێیت هێشتا کەسێکە هیچ ئەزموونێکی نیە و ساردی و گەرمی رۆژگاری نەچەشتوە. دنیا دنیایەکی جوان و رۆشن رۆشن بوو. دەتگوت تازە لەدایك بووە. پاك پاك. لە گەرد و گوڵی بەیاندا لە لێوار دەریا بەسەر وردە بەردەکاندا دەڕۆیشت، بەڵام گوێی لە دەنگی وردە بەردەکانی ژێر پێی نەدەبوو. کە هەتاو هەڵات بە بەردەم ماڵی زەهرادا رەت بوو، تەنانەت تێبینی ئەوەشی نەکرد. بە بیستنی دەنگی موسا ئاغا هاتەوە سەرخۆی، راوەستا، رووی بۆ لای دەنگەکە وەرگێڕا، موسا ئاغا پەنجەرەی کردبووەوەو بانگی ئەوی دەکرد:

"پۆیراز کوڕم، کچەکان بەرچاییان ئامادەکردووە، فەرموو با پێکەوە بەرچایی بخۆین."

لە پلیکانەکان وەسەرکەوت و گەیشتە نێو هۆڵەکە، چاوەکانی موسا ئاغا بە بینینی مۆڵەق مان:

"کوڕم پۆیراز، چیت لێهاتوە، تۆم قەت ئاوا نەبینیوە، سیمات وەکو سیمای منداڵان ساف و گەش و بریقەدارە. وەك ئەوەی تازە لەدایك بوویت، چیبووە؟"

پۆیراز گوتی: "هەڵۆکان رۆیشتن، هەڵفڕین و چوونە پشت چیای ئاگری و پشت چیای قاف."

زەهراو نەسیبەش وەکو باکیان بوون. زەهرا کاتێك پۆیراز لە پلیکانەکان بەسەرکەوت، بە بینینی ئەو دڵی کەوتە لێدان، شنەیەکی شادیبەخش لەنێو ماڵەکە هەڵیکرد.

"دانیشە کوڕم ئێستا، چیتلێهاتوە؟ هەواڵی خۆشت پێگەیشتوون؟ ئێستا سیمات جۆرێکی دیکەیە، نووری لێدەبارێت. لە هەموو تەمەنمدا سیمایەکی ئاوام کە شادی تێدا قوڵپ دەدا نەبینیوە. ببوورە کوڕەکەم کە ئاوا لە پرسیارانم گرتوویت، کونجکۆڵ بووم، بۆ واتلێهاتوە؟"

"شتێك بووە، بەڵام نازانم چیە. هەڵۆكانیش ڕۆیشتن، دڵیشم پاك بووەوە، منیش پاك و تەمیز بوومەتەوە."

نەسیبە چرپاندیە گوێی زەهرا، موسا ئاغا و پۆیراز پشتیان لەوان بوو و ئاوا ڕاوەستابوون.

"بیستت چی دەڵێت، دەڵێت من و دڵم پاك بووینەتەوە، مەبەستی چیە؟"

"مەبەستی ئەوەیە كە ئیدی بۆتە مرۆڤێكی دیكە."

"ئەوە چی دەڵێیت؟"

گوتی: "كە ئەوم بینی منیش بوومە كەسێكی دیكە. مەگەر بابەت نەبینی، باوكیشم بۆتە كەسێكی دیكە. ئێستا دەیبینیت، ئەمشەو باوكم بە خەیاڵی ئاسوودە دەخەوێت. لەمە بەدواوە باوكیشم دەبێتە كەسێكی دیكە."

"كچەكان وەرنە سەر سفرە."

"وا هاتم باوكم، چای وا دەم دەكێشێت."

پیاڵەكانی سەر سینیە زیویەكە پڕ كران لە چای، چایەكە كە لەنێو پیاڵەكاندا هەڵمی لێهەڵدەستا، بۆنێكی هێند خۆش لە چایەكە دەهات كە هیچكامیان تا ئێستا بۆنێكی وا خۆشی چایان نەكردبوو.

بەرچایی تەواو بوو. لە ماوەی بەرچایی خواردندا هەر سەیری یەكدیان كردبوو و زەردەخەنە كەوتبووە سەر لێویان.

چەندین ساڵ بوو كە بەرچاییەكی وایان نەخواردبوو.

پۆیراز ئارام لە پلیكانەكان هاتە خوار و بەرەو لێوار، لەوێش بەسەر وردە بەردەكاندا چووە ئەسكەلە، لەوێ دەستیكرد بە چوونە سەرێ و هاتنە خوارەوە. بەدرێژایی تەمەنی هێندە هەستی بە بارسووكی نەكردبوو. دوای كەمێك ڕۆیشتن، چوونە سەر كانی و دەستەكانی كردنە كۆتیلە و ئاوی خواردەوە. ئاوی كانیەكەش بۆنی پونگەی لێدەهات. دوای ئاوخواردنەوە خۆی لە لێوار دەریا بینیەوە، دەریاش بۆنێكی جیاوازی لێدەهات، هاتەوە ماڵ، لێنا دەستی كردە ملی. خەوی هات، بە شێوەیەك كە خەریك بوو بە پێوە خەوی لێبكەوێت، چووە دەرێ، سەرێكی لە شەریفە خاتوندا. لە كاتێكدا هاتبوو كە نۆرەی ریس و ڕەنگرێژیی ئەو جاجمانەی دروستی دەكرد هاتبوو، لەبەردەم ئەو جاجمانە دانیشت كە بە دارتەونەكە هەڵواسرابوون و لە بەیانیەوە تا شەو هەر سەیری جاجمەكانی

دەکرد. بە بینینی پۆیراز نیگەران بوو، بە هەڵەداوان چووەوە ماڵ و کورسییێکی هێناو لە تەك کورسیەکەی ئەوی داناو گوتی:

"دانیشە برا، بەخێر بێیت."

پۆیراز دانیشت، شەریفە خاتوونیش لە تەنیش ئەو لەسەر کورسیەکەی دانیشت، هەردووکیان چاویان بڕیە ئەو جاجمانە کە بە دارتەونەکانەوە هەڵواسرابوون. تا شەو داهات چاویان لەسەر جاجمەکان لانەبرد. کاتێك هەوا تاریك داهات و ئیدی نەیانتوانی جاجمەکان ببینن دیسان هەروا لە شوێنی خۆیان سەیری جاجمەکانیان دەکرد.

کە هاتەوە ماڵێ، لێنا گوتی:

"ئەو دکتۆرە بچووکە کە بە دواتدا دەگەڕا. گوایە بۆ نانخواردنی ئێوارە بڕیارە بچنە ماڵی دکتۆرە گەورەکە، ماسی بۆ دروستکردیت."

"ماسیت لەکوێ هێنا؟"

"نیشانچی هێنای. زۆر چاوەڕێی کردیت، کە دیتی ناهێیت ڕۆیشت. دەیەویست قسەت لەگەڵدا بکات."

"چیبکەم، واتە با من بڕۆم."

"خواحافیز کوڕەکەم. ئەو نامەیەی کە دەتەویست بۆ مستەفا کەمال پاشای بنووسیت، نووسیت؟"

"ئێستا دەچمە لای دکتۆرەکان، لەبارەی ئەو نامەیە کە بڕیارە بۆ مستەفا کەمال پاشای بنووسین راوێژیان لەگەڵ دەکەم..."

"بۆ مستەفا کەمال پاشا بنووسن، پێیبڵێن، ئەگەر منداڵەکانم بۆ دوو سێ ڕۆژیش نەتوانێت بنێرێتە ئێرە، فەرمان بدات، تەنها بۆ ڕۆژێك بیاننێرێتە لای من، تەنها تێر بۆنیان بکەم، هەر ئەوەندە. بە مستەفا کەمال پاشا بڵێن کە لێنا بۆ بینین و تەنها یەکجار بۆنکردنی کوڕەکانی لە تاراوگەی یۆنانەوە رایکردوەو خۆی هەڵداوەتە نێو دەریا، پێیبڵێن ئەودەمەی خەریك بوو لەنێو دەریادا نوقم ببێت و بخنکێت، بەلەموانێکی لاز فریای کەوتوەو قوتاری کردوەو بردوویەتی بۆ دوورگەی خۆیان." لێنا جووڵەیەکی دایە خۆی، دەنگی بەرزتر کردەوە، پۆیراز یەکەمینجار بوو لێنا ئاوا ببینێت، لێنا وەکو پڵنگ لە بەرامبەریدا وەستا بوو. "لێنا دەڵێت کە، پێیبڵێن، ئەگەر من لە تاراوگەی یۆنان خۆم بە دەریا دادا و هاتمەوە ئەنقەرە، یاخەی کەمال پاشا دەگرم. پیاوی گەورەن،

ئەم قسانەم بنووسن." یەکەمجار بە تورکی دەدوا، پاشانیش بە یۆنانی. کاتێك بە یۆنانی دەئاخفت دەنگی کاریگەرانەتر بوو، مووی جەستەی پۆیرازی راست دەکردنەوە. لێنا لەو کاتەوەی هاتبوو بەردەوام دەیگوت کوڕەکانی لای مستەفا کەمال پاشان، دێنەوە، دێنەوە، دێنەوە، دێنەوە، بەڵام پۆیراز لە جیهانێکی دیکە بوو و ئەوەندە لەسەر ئەو رستەیەی لێنا هەڵوەستەی نەدەکرد. دەیانگوت ئەم قسانە بوونەتە وێرد و ئومێدی دڵی لێنا.

پۆیراز بە حاڵەتیکی پەرێشان چووە ماڵی دکتۆرەکان. دکتۆرەکان بەر لەوەی بەخێرهاتنی بکەن و پێیبڵێن کە دابنیشێت، هەردووکیان گوتیان:

"ئەمە چ حاڵ و بارێکە، چ حاڵ و بارێکە؟"

پۆیراز لەسەر کورسییێك کە دکتۆرەکان نیشانیاندابوو دانیشت، خەریك بوو لەبارەی لێناوە لە گەڵیان دەدوا کە نیشانچی هاتەژوور. نیشانچی لە حاڵێکی سەیر دابوو.

دکتۆر سەلمان سامی پرسی: "چیبووە نیشانچی، تۆ چتە؟"

"چووم پۆیراز ببینم لێنا گوتی چووەتە لای دکتۆرەکان. لە پڕیکدا دەربووەوە، گوتی بە مستەفا کەمال پاشا بڵێن ئەگەر کوڕەکانم بۆ نەنێرێتەوە خۆم دەزانم چیلێدەکەم."

پۆیراز گوتی: "منیش خەریك بووم ئەوەم باس دەکرد." هەموو بەسەرهاتەکەی راکردنی لێنای لە یۆنانەوەو هاتنەوەی بۆ دوورگە بە وردی گێڕایەوە. گوتی: "من لە تەمەندا هیچکەسم وەکو لێنا نەبینیوە. ئەوم بە ئەندازەی دایکم خۆشدەوێت. پڕە لە میهر و خۆشەویستی. لەگەڵ هەموان بە روخساری گەش و سۆزەوە رووبەڕوو دەبێتەوە. ئەمڕۆ کاتێك خەریك بووم دەهاتمە ئێرە هاواری کرد و گوتی ئیلاوبیلا کوڕەکانم دەوێن. نازانم چیبکەم."

دکتۆر سەلمان سامی گوتی "سەختە."

دکتۆر خەلیل رەفعەت گوتی: "سەختە."

پۆیراز پرسی: "سەختە، بەڵام هیچ رێگایەك نیە؟"

نیشانچی بە ئەدایەکی دڵنیایانەوە گوتی: "هەیە."

"چ رێگایەك؟"

"ئێوە بۆ منی لێبگەڕێن. من لەگەڵ لێنا قسە دەکەم."

"دەتەوێت چۆن؟"

"ئەمەیان بۆ من لێبگەڕێن. کاتێك دەهاتمە ئێرە هەوڵمدا لینا لەو رەوشە دەربێنم. لینا زۆر باوەڕ بە مەرگی کوڕەکانی ناکات. ئەگەرنا ئاوا یاخەی مستەفا کەمال پاشا ناگرێت و پێیەوە ناچەسپێت."

دکتۆر سەلمان سامی گوتی: "باشە. ئەم گرفتە چارەسەر دەبێت. نیشانچی خۆی دەزانێت چۆن یارمەتی ئەو خاتوونە بدات. با ئێستا ئێمە بچینەوە سەرکاری خۆمان. ناو خوێندنگەکەتان بینی؟"

پۆیراز گوتی: "بینیمان، جوانە. ئەو نیوتەختە دارگوێزیانەتان لەکوێ پەیدا کردن؟ تەختەڕەش، مێزەکان، مێزەکانی ژووری مامۆستا و بەڕێوەبەر، کورسیەکان. کەلوپەلی هەر پێنج پۆلەکانتان ڕێکخستوون. دەستتانخۆش."

"ئێوە زەحمەتێکی زۆرتان کێشاوە. گوتمان کاری خوێندنگەکەش ئێمە بیکەین، ئەوەی کە ئێوە پەسندی دەکەن نیشانەی ئەوەیە کە ئێمە سەرکەوتووین. هەموو شتێك، قەڵەم و دەفتەر، تەباشیر، پاککەرەوەو هەموو شتێك ئامادەیە، تەنها کتێبی ئەلفوبێ کەمە."

"بە کچەکانیشەوە ژمارەی خوێندکارەکان لە سەدو پەنجاش تێدەپەڕێت. تا ئێستا ژمارەیان ئەوەندەیە، رەنگە زیاتریش ببێت. رەنگە هەندێکیان ناوی منداڵەکانیان بۆیە نەنووسیبێت بۆ ئەوەی ئاگایان لە کاریلە و بەرخەکانیان بێت."

"لە دوورگە بەرخ و کاریلە نین کە ئەوان چاودێریان بکەن..."

"با نەبن، ئەمە عادەتە. سێ پۆلمان دروست کردوون. لە یەکێکیان مامۆستا وانە دەڵێتەوە، لە هی دووەم خەلیل رەفعەت و لە هی سێیەمیش بەندە."

پۆیراز گوتی: "پیرۆزە."

"خولێکیش دەکەمەوە بۆ ژنان و پیاوانی بەساڵاچوو و لەم دوورگەیە هیچکەس نامێنێت کە نەخوێندەوار بێت."

"زۆر باشە، دوای ئەمە ئیدی بۆ من گرنگ نیە. تازە من ناتوانم فێری خوێندەواری ببم."

دکتۆر سەلمان سامی گوتی: "چی تێدایە دەتۆ یەکێك بە لەوانەی خوێندەواریان نابێت. تۆ حەوت مەملەکەت و چوار ئالی دنیات خستە ژێر دەستی خۆت، تۆ دەریاکان، دەشتەکان، چیاکان، دارستانەکان، دڵی حەفتاو دوو میللەتت داگیرکردوون، ئیدی چیتدەوێت، ئەوە نیە دنیا لە چەنگی خۆت دایە."

نیشانچی گوتی: "سوپاست دەکەم. پایەدار بێت کاك دکتۆر، ئێمە چکارەین، بنیادەمێکی بێچارە، ئادەمیزادێك کە بە گەمژەیی هات و بە گەمژەییش دەڕوات."

پۆیراز گوتی: "بەو شێوەیەش نیە وەلی نیشانچی."

نیشانچی بە خاکەڕایی و شەرمینەوە گوتی:

"ئەم دنیایە دنیایەکی هێند پڕە لە ڕەمزو ڕاز، هێند پڕە لە ڕەمز و ڕاز کە ئێمە تێیدا هیچ نین، ئێمە تەنانەت خۆشمان ناناسین. ئەمڕۆ هەین، ئەگەر بەڕاستی هەشبین، سبەی نین، ئەویش ئەگەر بەڕاستی نەبین. سەرباری ئەوەش جەنگ هەڵدەگیرسێنین و یەکدی دەکوژین، وەك ئەوەی بڕیاربێت قەت نەمرین. تەمەنی مرۆڤ هەر هێندەی چاو تروکانێکە، مەگەر نە؟"

دکتۆر سەلمان سامی گوتی: "یونس ئەمرە وا دەڵێت."

نیشانچی گوتی: "وایگوتوە. بیڵێی چیدەبێت، نەیڵێی چی، وەك چاوتروکانێکە، هەمووی پووچ."

دکتۆر سەلمان سامی بە هەڵچوونەوە گوتی:

"ڕاستە نیشانچی ڕاستە، هەروەك چاولێکنانێکە، ڕاستە، وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا پێشتوانیە هەڵەیەك لە کاردا هەبێت، برام نیشانچی؟ من لەنێو ئاگر و دۆزەخ و خوێنەوە هاتمە ئەم دوورگەیە. ئەو ڕۆژەی کە هاتمە ئێرە دەتگوت لە ناخەوە تێکشکاوم و داڕماوم. لەنێو تاریکی و زوڵمەتەوە لە پڕێکدا کەوتمە نێوەڕاستی ڕووناکی. ئەم دوورگەیە بۆنی بارووت و خوێنی لێنەدەهات، بۆنی وەنەوشەو پونگە و گوڵەکێویلکەی لێدەهات. لەو سەروبەندەدا بەلەمی ماسیگران و کەشتیە بچووکەکان بریندارە خوێناوی و کەلوکۆمبووەکانیان هێنان، دوورگە بۆنی خوێنی لێدەهات. هەرکەسێك کە لەوێ بوو بە پازدە دکتۆرەوە شەو و ڕۆژ دەستبەکاربووین و بە بریندارەکان ڕادەگەیشتین. هیچکام لە بریندارەکان نەیاندەویست بمرن. چاو و دەست و هەموو گیانیان کون کون و دابێژرابوو لەگەڵ ئەوەشدا هیچکامیان نەیاندەویست بمرن. تەنانەت ئەوانەش کە دەیانگوت ئێمە بکوژە ئەوانیش نەیاندەویست بمرن، بە هەموو هێزیانەوە هاواریان دەکرد ئێمەش ڕزگار بکەن دکتۆر، منیش ڕزگار بکەن. تەنانەت هەندێکیان لە دواساتەکانی ژیانیاندا کاتێك هاوزینگیان دەدا دوا قسەیان- ڕزگارم بکەن- بوو. لەم دنیایەدا لە ڕوانگەی مرۆڤەکان هیچشتێك پووچ و بەتاڵ نیە. لەم دنیایەدا مرۆڤەکان وەك چۆن جێگای خاڵی دروست دەکەن، هەرواش پڕی دەکەنەوە. بۆیە، پڕکردنەوەی جێگا خاڵیەکان شادیبەخشترین ئافراندنە. مرۆڤ لەم دنیایەدا تەنها جارێك لە دایك

دەبێت. هەمووشیان ئەمە دەزانن کە ئیدی لەدایك نابنەوە. دەزانن کە ملیۆنان ساڵ، ملیاران ساڵیش ئاوابووە، دڵیان پڕ دەکەن لە هەستی بەختەوەری. بەر لە ئێستا نەهاتبووین و دوای ئەمەش هەرگیز ناهێین. جارێك هاتین وەلـێ خۆزگە نەدەهاتین و ئەم نوور و ئەم دەریاو ئەم رووناکیەمان نەدەبینی."

پۆیراز هاوسەنگی خۆی لەدەستدا و گوتی: "ئەم عیشقەو."

"ئەم دڵسۆزیەی مرۆڤەکان، ئەو خۆشەویستییە، ئەو هاوڕێیەتییە، ئەو ئومێدە، ئەو تام و چێژەی ژیانە، ئەو ئاسۆیەی دەم کەلە، جووڵە و چالاکی و فڕینی ئەو دەمانەی شنەی بەرەبەیان هەڵیدەکرد، ئەمانەمان نەدەبینی و پێماننەدەزانی. چەندە خۆشە کە هاتووینەتە ئەم دنیایە. ئەگەر جارێك نا هەزار جار هاتبووین دیسان ناخمان دەیەویست لە شێوەی مرۆڤ بین. سوپاس بۆ خوا کە هەر ئەم یەکجارە هاتین. ئەگەر بمانەوێت دەتوانین تام و چێژی هەزار جاری ژیان بکەین."

سەلمان سامی گوتی: "ناتوانین ئەم نائومێدی و رەشبینیە قبوڵ بکەین. کاتێك تەنێ جارێك هاتووین و دەتوانین بە ئەندازەی هەزارجار چێژ لە ژیان وەربگرین ئیدی ئەم بەدبینیە..."

دکتۆر خەلیل رەفعەت گوتی: "ئەوان، ئەوان، ئەگەر تەنها جارێك دەیانبینی مرۆڤەکان چۆن چەنگاڵیان لە ژیان گیردەکەن تێدەگەیشتن ژیانی یانی چی."

"ئەگەر ئێمە جەنگی چاناك قەڵاو هەزاران کوژراو و بریندارمان نەدەبینی، لەکوێ دەمانتوانی تێبگەین مرۆڤەکان ئاوا دوو دەستی باوەش بە ژیان دادەکەن؟ پیاوانی گەنجی ناکام... مەگەر ئێمەش لەگەڵ ئەواندا بە دوو دەست ژیانمان نەگرتبوو؟"

"من سێ کوڕم ناردنە جەنگ کە نەگەڕانەوە. من رامکرد و گیانی خۆم دەربازکرد. من چونکە کەسێکی ئازاو بوێرم چێژ لە دنیا وەردەگرم. کوڕەکانم ئەوەندە ئازا نەبوون کە بتوانن بە ئەندازەی پێویست چێژ لە جیهانی خۆیان وەربگرن، لەبەر ئەوە زۆریان تاسە دەکەم و دڵم بۆیان تەنگ دەبێت. من ژیان بەشتێکی وەك چاولێکنانێك نازانم. بێبەختترین کەس، تەمەنی هەرچەندە بێت، بەهەمان ئەندازە دەتوانین بڵێین، بەهەر حاڵ، چێژ لە دنیا وەردەگرێت. فەرماندەکەی ئێمە لە یەمەن دەیگوت ژیان لە دنیادا لەژێر هەر هەلومەرج و بارودۆخێکیش دابێت، وەك ئەوە وایە کە مرۆڤ ژیانێکی بێپایان تاقی بکاتەوە. لەبەر ئەوەی فەرمانده‌کەی ئێمە کەسێکی زۆر ژیر بوو پادشا زەندەقی لێچووبوو، ئەوی کردبووە فەرماندەی گشتی سوپای یەمەن. لە راستیدا بە جۆرێك دووری خستبووەوە."

سەلمان سامی گوتی: "بەڵێ، ئەوە راستە، راستە، هاتنەدنیا، تێپەڕاندن و گوزەراندنی ژیانێکی بێپایانە. ئەو پادشایەی کە فەرماندەکەی تۆی بۆ یەمەن و بە فەرماندەیی سوپا دوورخستبووەوە، وای بیردەکردەوە کە رەنگبێت ببێتە بەلایەك بۆ گیانی ئەو."

دکتۆر خەلیل رەفعەت گوتی:

"بەڵێ هەروایە. جەمشیدی ئەرزەڕۆمی، ئەو بریندارەی کە برینەکەی قووڵ بوو و لە کلێسا تێکدراوەکە خەوێندرابوو و رۆژ بە رۆژ زیاتر لە مردن نزیك دەبووەوە و دەیزانی لەنێو داو و لەفافدا دەژیت و ئێمە سات بە سات چاوەڕێی مردنی بووین، بێجووڵە و بێدەست و پێ و بێهەناسە، بە چەشنێك تێنووی ژیان و مانەوە بوو کە کاتێك پێمانگوت لە مەرگ دەربازبوویت و مەترسیت لەسەر نەماوە، گوتی دەمزانی، گوتی دەمزانی مەرگ بوونی نیە. ئەوکات بوو کە بە دڵ و گیان تێگەیشتین ژیان بۆ مرۆڤەکان چ واتایەکی هەیە. ئەوانەی کە باوەڕێکی پتەویان بە ژیانی بێکۆتایی و لە تەواوبوونەهاتوو نیە، ئەگەر جەمشید ئەرزەرۆمیان بینیبوا نەك لەبەر ئەوەی هاتوونەتە دنیا کە لە ترسی مردن و ئەوەی کە باش بوو دنیایان بینی یەکڕیز و بەردەوام لە خۆشحاڵیان شاگەشکە دەبوون.)

پۆیراز گوتی: "شاگەشکە دەبوون."

سەلمان سامی گوتی: "هەموو خراپەکاریەکانی مرۆڤ لە پای ئەو ترسەیە لە مەرگ." تووڕە بوو.

پۆیراز گوتی: "چاکەکاریەکانیشیان هەر لە پای ئەو ترسەیە لە مەرگ..."

سەلمان سامی بە هاوارکردنێکەوە گوتی: "بێدەنگ بە پیاوی سادە" و پۆیراز سەری نایەوە بەرخۆی.

"ببوورە پۆیراز، چۆن دەشێت ترس لە مەرگ ببێتە مایەی چاکەکاری، پۆیراز هەموو ئەو شێتایەتی و خراپەکاری و جەنگ و سووکایەتی و ستەم و بەرژەوەندخوازیانە بەهۆی ترسانە لەمردن. مرۆڤ لە ناخ و زاتو ئافراندنیدا دۆستی و خۆشەویستی هەیە. مرۆڤ بوونەوەرێکە کە سەراپای پڕە لە هەستی خۆشویستن. ترس لە مردن زۆر ستەمکارانەیە، دەنا جەنگ کە گەورەترین خراپەکاریەکانی مرۆڤە، مەگەر بۆ خۆشویستن هاتۆتە ئاراوە؟ چۆن دەشێت مرۆڤ کە پڕە لە هەستی خۆشویستن و خۆشەویستی، بیەوێت دنیاو مرۆڤەکان لەنێو ببات، پۆیراز، هاوڕێی من؟"

"هەموو لەپای ئەو ترسەیە لە مردن، هەروایە؟"

دکتۆر بە ئارامی گوتی: "وایە، بەداخەوە کەوایە پۆیراز، هاوڕێی من. ئێستا ئێمە دەبێت دەست بە دەرسەکان بکەین. لەوێ دەبێت بە منداڵەکان بڵێین مرۆڤەکان تا زیاتر یەکدی و تا زیاتر دنیایان خۆشبووێت، بەهەمان ئەندازە لە جاویدانی نزیك دەبنەوە. ببوورە پۆیراز، هاوڕێی خۆم، زۆر بڵێییمکرد."

"ئاوا مەڵێ، قوربان."

"ئێستا هاوڕێم، بۆ ئەو منداڵانەی دەخرێنە بەر خوێندن جلوبەرگمان پێویستە. کچۆڵەکان و کوڕەکان گشتیان پێخاوسن، دەبێت ساڵحە فەندی رابسپێرین جلوبەرگ و پێڵاو بۆ منداڵەکان بێنێت. هەر منداڵە و جووتێك پێڵاوو دەستە جلکێکی بدەینێ. دەفتەر، قەڵەم وردەواڵەی دیکە، پاککەرەوە... من و خەلیل رەفعەت بەگ بڕیك پارە دەدەین، ئێوە؟"

"پێویست ناکات ئێوە پارە بدەن کاك دکتۆر، ئێمە پارەی هەنگوینەکەمان لایە. شوکری ئەفەندی بۆ هەنگوینەکە پارەیەکی باشی داینێ. بەو پارەیە دەتوانین بۆ سەدو پەنجا منداڵ جلوبەرگ و پێڵاو بکڕین. پارەی زەیتوونەکانیش بەمزوانە دێت و دەتوانین سۆپای چینی و دار و چیلکەش بەو پارەیە دابین بکەین."

"دەتوانین ئەم شتانە هەموو بە ساڵحە فەندی بسپێرین؟"

"هەڵبەتە، هەڵبەتە قوربان. ساڵح لە پارەی کڕینی شتەکان زیاترمان لێوەرناگرێت. بە یارمەتی!..."

"خوا حافیز."

دکتۆرەکانیش لەگەڵ ئەوان هەستان، تا قامیشەلانەکە لە گەڵیان چوون، تۆقەیان کردو گەڕانەوە.

خوێندنگە وەکو کوورەی هەنگ کاری دەکرد، هەموان کچ و کوڕەکانی خۆیان ناردبوونە بەرخوێندن، بەڵام هەموو منداڵەکان پێپەتی بوون، زۆربەی ژنانی تازەهاتوەکانیش پێپەتی بوون. پۆیراز ئەمەی بە دکتۆر سامی راگەیاند.

سەلمان سامی گوتی:

"دەزانم، دەزانم. من ژنانی پێخاوسم بەر لەوەوی ئەمانەش بێنە ئێرە بینیبوون. دوو لە ژنە خزمەتکارەکانی ئێمەش پێخاوس بوون. ژمارەی پێمانگرتن و کاتێك قەدریی بەلەموان پێڵاوی بۆ هێنان ئەوەندە خۆشحاڵ بوون کە نەیاندەزانی چیبکەن و زمانیان لە خۆشیان نەدەگەڕا.

منداڵەکانیان دەیانگوت دایکیان لە خۆشحاڵیان شەو تا بەیانی نەخەوتوە. بە منداڵەکانم گوت دەبێت پێڵاو بۆ ئێوەش بکڕم. بە هیچشێوەیەك قبوڵیان نەکرد. ئێستا بۆ یەکەمجار خۆشحاڵ دەبن. بۆ ژنەکان چیبکەین، پۆیراز؟"

"جارێ ناتوانین پێڵاویان بۆ دابین بکەین."

"بۆ، لەبەر ئەوەی رانەهاتوون؟"

"نە، چونکە جلوبەرگ و پێڵاومان بۆ منداڵەکانیان کڕیون قبوڵ ناکەن. کەم کەم پارە پەیدا دەکەن، یەکەمجار کچەکان، پاشانیش پیرەکان پێڵاو دەکەنە پێیان، ئیدی رادێن."

"تێگەیشتم کارەکان باش دەچنە پێش. تۆ کەی دەچیت بۆ وانەوتنەوە؟"

"هەر کاتێك تۆ بڵێیت."

"کەواتە پزیشکی ئاژەڵانیش لەگەڵ خۆتدا ببە. تۆ ئەو دەرسە بڵێوە کە من پێیاندەڵێم، پزیشکی ئاژەڵانیش با هی خەلیل رەفعەت بڵێتەوە. دوای ئەوەی کە منداڵەکان چوونە پۆلی دووەم هەموومان وانە دەڵێینەوە."

منداڵەکان جلوبەرگە شینەکەیان کردەبەر و یاخەی سپیان کردە ملیان. دوای بانگی کەڵەشێران، دەنگی زاك و زیکی منداڵان دوورگەی پڕکرد. دوورگە گیانی هاتەوەبەر، شادو پڕ بوو لەسەفا.

دوورگە هەمیشە بای دەهات. پەروانەی ئاشەکان دەتوانم بڵێم هیچکات رانەدەوەستان. بایەکی توند هەڵیکرد. پەروانەی ئاشەکە هەندێکجار هێندە بەخێرایی دەخولانەوە کە بە چاو نەدەبیندران، دەیانلووراند. لە باشوور و بەشی رۆژئاوا، بای باشوور و بای قیبلە هەڵیدەکرد، لە باکوور بای باکوور و رەشەبا. رەشەباکان ئیدی گەڵا زەرد و سوورەکانیان پەراگەندە دەکرد. لە ماوەی چەند رۆژێکدا ئەو زەویە بە گەڵای زەرد و سوور داپۆشرا. دوورگەی سەرسەوز زەرد زەرد هەڵگەڕا. کەندڕ و چاڵاوەکان، پەرژینەکان، بن دیوار و پەرژینەکان پڕ بوو لە کەرەنگر و گەڵای زەردو سووری درەختان. هەوری رەش ئاسمانی دوورگەیان داپۆشی، تۆف و باوبۆران هەڵیکرد، شەپۆلەکانی دەریا هەڵکشان، شەپۆلەکان تا بن دارچنارەکان هاتن. ئاو نیوەی ئەسکەلەی داپۆشی. سەرمایەکی شێدار ئەو ناوەی گرتەوە، ئاگردانەکان داگیرسێندران. دووکەڵکێشی هەموو ماڵان دووکەڵیان لێهەڵدەستا، بەڵام دووکەڵکێشی ماڵی ئەوانەی پێش ئێستا لە دوورگە ئاکنجی بووبوون وانەبوون، نیوەی دوکەڵەکەیان دەدایەوە ژوورەوە. ئەو خەڵکە چاویان دەزوورایەوەو ئاویان لە چاوان رانەدەوەستا.

دکتۆرەکان، خواخێریان بنووسێت، کەسانێکیان ناردبووە ئەو ماڵانە تاکو فێریان بکەن چۆن بچنە ئاوەدەستەکان.

شەپۆلەکان چەندین ڕۆژ لێواری دوورگەیان کوتا، بایەکان لە چەپ و ڕاستەوە هەڵیاندەکردو لك و پۆپی درەختەکان شکان، دوای بایەکان نمەی باران وردە وردەو بە پەرش و بڵاوی و ئارام ئارام دابارین، پاشان بۆنی مەستکەری خاك و خۆڵی بارانپێکەوتوو سەرتاسەری دوورگەی داگرت. ئەوانەی هاتبوونە دوورگە بۆنی خاکی بارانپێکەوتوویان دەناسیەوە، بەڵام ئەم خاکە بۆنێکی جیاوازی هەبوو. تەنانەت ئەوانەی بەو بۆنەی خاکە ئاشناش بوون بەو بۆنەی خاکە مەست بووبوون و لە دڵی خۆیان دەیانگوت خۆزگە ئەوەندە تەمەنەی ماویانە لەم خاکە جوانەی ببەنە سەر، پاشان هەر زوو پەشیمان بووبوونەوە.

دوای زریانی تووڕە و ئەو دڵۆپە بارانانەی کە کەمێك پێشتر لێرەو لەوێ بە زەوی دەکەوتن، هەورە ڕەشەکان بارانێکیان بەسەر دوورگە داباراند ئەمما باران، کڵوە بەفر و ڕێژنەی باران لە هەر چوار لاوە دابارینە سەر دوورگە، هەوا کەمێك زیاتر تاریك داهات، دەتگوت شەو داهاتوە، سێ شەو و سێ ڕۆژ دەگ باران باری. هیچکەس نەیتوانی سەر لە ماڵەوە وەدەرنێت و هەموان ناچاربوون بێدەستی خۆیان بچنە ئاودەستی ماڵەوە. نزیکەی هەموو ئەو کەسانەی لە دوورگە بوون دەیانزانی بەو بارانەی کە وەکو سێڵاو دایدەکرد چوونە نێو قوڕ و لیتەی دەرەوە زۆر سەخت و دژوارە. ئەو خەڵکەی لە ماڵەکانیاندا ئاودەست و دووکەڵکێشیان هەبوو دوعایان بۆ دکتۆرەکان، نیشانچی، هوسمەن، پزیشکی ئاژەڵان و ئەو کەسانەی کە ئەم خانووانەیان دروست کردوون دەکرد، بەڵام باران وادەباری و ئاسمان وادەیگرماند کە وایان هەست دەکرد ئەم بارانە دوورگە لەگەڵ خۆیدا دەبات. ئاسمان ڕێك بەسەر ئەواندا دەیگرماند و بروسکە و چەخماخەی دەدا، هەورەتریشقە زرمەی لەو ناوە هەڵدەستاند و دوورگەی بەجارێك رادەهەژاندە سەریەك.

بارانبارینەکە زۆری لێکێشایەوە. تەنانەت دکتۆر سەلمان سامی کە بارانبارینی زۆری بینیبوو لێکدا لێکدا دەیگوت: "ئەمە چ جۆرە بارانێکە، چ جۆرە بارانێکە." و هیچی دیکەی نەدەگوت. تەنانەت پۆیرازیش کە بارانبارینەکانی ماوە درێژەکانی چوکوراوای بینیبوون، لە بینینی ئەو بارانە مات و تاسابوو.

نیشانچی دەمە دەمی عەسری ڕۆژی دووەمی بارانبارینەکە ئەوەدەمەی ئاسمان دەینەڕاند و هەورەتریشقە و بروسکەی دەدان، تا ئەوەدەمەی خۆی گەیاندەوە ماڵی خۆیان کە نزیك ماڵی پۆیراز بوو هەموو هێز و توانای لەدەست دابوو.

لێنا کاتێك نیشانچی بینی وا ڕۆدەچێتە نێو ئاو و دێتەوەدەر، گوتی: "وای وای کاك نیشان، وای وای کاك نیشان."

یەکسەر چاکەتەکەی لەبەر کردەوە، ئێلەگ و کراسەکەیشی لێوەرگرت و یەکێك لە کراس و ئێلەگەکانی پۆیرازی بۆ هێنا، لەسەر کورسیەك داینیشاند.

پۆیراز بە پێکەنینەوە گوتی: "چ بارانێکە بەڕێز نیشانچی."

نیشانچی هێشتا هانکە هانکی بوو.

"لە ترسان خەریك بووم دەمردم، دەمگوت ئەم بارانە دوورگە لە شوێنی خۆی رادەماڵێت."

بارانبارینەکە بەیانی کە خۆرهەڵات راوەستا. هەموو شتێك پاك و خاوێن بووبووەوە. هەتاوێك بوو دنیا دەبریسکایەوە. هەموو خەڵکی دوورگە لە ماڵەکانیان هاتبوونەدەر. منداڵانی خوێندنگە، لە ترسی ئەوەی پێڵاوەکانیان قوڕاوی ببێت پێڵاویان نەکردبوونە پێ. هەرکە لە ماڵێ چوونەدەر، گەڕانەوە ماڵ. تەنانەت تێبینی کەفی کۆڵانەکان و رێڕەوە بە بەردە ڕەنگاو ڕەنگ داپۆشراوەکانیشیان نەکردبوو. ئەو کەسانەش کە بەوەیان زانیبوو لەبیریان چووبوو. دوای لێکردنەوەی باران پێڵاوە نوێیەکانیان کردنە پێ، لەکاتی رۆیشتندا سەیری پێڵاوەکانیان دەکرد، بەر لە رۆیشتن بۆ خوێندنگە لە مەیدانی گونددا چاویان بڕیبووە پێڵاوەکانیان و پیاسەیان دەکرد. دیمەنی رۆشن و بێگەردی دوای بارانبارین جیاوازترین و جوانترین دیمەن بوو. مرۆڤ هەموو شتێك لەبیر دەکات تەنها ئەو رۆشناییەی دوای بارانبارین نەبێت. ئەمڕۆ دەریا بۆنێکی دیکەی لێدەهات و بەو رۆشناییە پاك و بێگەردە ڕۆدەچووە مۆخی ئێسقانەکانی مرۆڤ.

کەس لە ماڵەوە نەمابوو، هەموان خۆیان دابووە دەست ئەو رۆشناییەی دوای باران و بۆن و بەرامەکان. لە هەموو لایەك هەر دەنگی پێکەنین دەهات. دکتۆر سەلمان سامی بە موسا کازم ئاغای گوت:

"کاك موسا کازم ئاغای بەڕێز، سەیری ئەو مرۆڤانە بکە، هیچیان نیە، لەنێو برسێتی و ستەم و مەرگەوە دێن، بەهۆی ئەو رۆشناییەوە ئاگایان لە خۆیان نەماوە، سەیری خۆشحاڵیەکەیان بکە، هەر یەکێکیان بۆتە پەیکەرێکی شادی، سەیریان بکە چۆن قاقا پێدەکەنن. ئەمانە لەنێو ئەو رۆشنایی و

ئەو بۆن و بەرامانەدا هەم ستەم دەکوژن و هەم مەرگ. ئەو شتەی کە دوێنی بە هاوڕێیانم دەگوت ئەوە بوو. شادیی ئەوان بۆ ئێمەش دەگوازرێتەوە، ئێمەش دڵمان شاد دەبێت. مرۆڤێك کە لە دۆزەخی چاناك قەڵاوە دەربازی بووبێت دەتوانێت شاد بێت، دەتوانێت. ئەم رۆشناییە تەواوە، ئەم بۆن و بەرامە تازە و بێگەردە، ئەم مرۆڤانەی نوقمی نێو بەختەوەری، نەك تەنها مرۆڤەکان، بەڵکو مێرووله و باڵندەکانی ئاسمانیش شادمان دەکەن. ببینن چۆن هەموو خەڵکی دوورگە و زیندەوەر و گیاندار و باڵندەکانیشی خستۆتە هەڵەکەسەماو نێو رۆشناییەوە."

بێدەنگ بوو، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.

خەڵکەکە تا خۆرئاوابوو و شەوداهات نەچوونەوە ماڵەکانیان و هەر لەدەرەوە مانەوە.

تا چەند رۆژ دواتر بایەکی باشوور شەپۆلەکانی دەریایان بەرەو لای دوورگە پاڵ دەنان و دوای ئەوەش بایەکانی باکوور هەڵیانکردو دواتریش بارانە چەند رۆژیەکان دایاندەکرد.

ئیدی نەتدەتوانی ئاسمان ببینیت، ماوەیەك باران لێیکردەوە. بەیانیەك لە خەو هەستان و سەیریانکرد دوورگە هەموو سپی هەڵگەڕاوە. لکی درەختان، لێواری دەریا، سەر وردەبەردەکان وەك شیر سپی دەچوونەوە. کلۆوە بەفر رەنگیان دەدایەوە ئاسمان و دەریا. جارێکی دیکە باو زریانەکانی لای باشوور و باکوور و رۆژهەڵات و رۆژئاوا هەڵیانکرد و دەریایان خستە شەپۆل و لۆنگان. هاوکات لەگەڵ هەڵکردنی بایەکان، بەفریش دەستی بە بارین کرد، بەلەمەکان نەیاندەتوانی بچنە نێو دەریا. ئەو مێوژانەی کە پێشتر کردبوونیان لەو سەرمایەدا بە کەڵکیان هاتن. ئەو کاتەی دەهاتنە دوورگە لەو شوێنانەی کاریان دەکرد خواردنی زستانەیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، لەو رووەوە کێشەیان نەبوو. تا بەفر زیاتر دەباری سەرماو سۆڵە و سەهۆڵبەندانەکەش زیاتر دەبوو. خەڵکی دوورگە چاوەڕێی ئەو جۆرە سەرمایەیان نەدەکرد. ڤاسیلی هەر کەسێکی دەبینی پێیدەگوت:

"ئەمە سەرمای تورکیایە، تورکیا ئەوەندە ساردە کە باڵندە لە ئاسمانەوە رەق دەکاتەوە."

سەرمای دوورگە رۆدەچووە سیەکانی مرۆڤ. ئەو دارانەی کە لە زەیتوونستانەکە، لەنێو دارسنۆبەرەکان، دەوەنە گەزەکان، باغەکانی هەناران و باغەکانی دیکە کۆیان کردبوونەوە لەو سەرمایە سەخت و تاقە تیرووکێنە سووتێندران و تەواو بوون.

کە دارەکانیان تەواو بوون. ماوەیەك لەنێو نوێنەکانیان نەهاتنەدەرو خۆیان گنخاند. نانیان دەخوارد، ئاویان دەخواردەوەو یەکسەر دەچوونەوە نێو نوێنەکانیان.

ژمارەیەکیان گوتیان باشە ئەو هەموو دارکاج و زەیتوون و دەوەنانە لەو پەنایەمان هەن و ئێمەش ئاوا لەسەرمان هەڵبلەرزین.

حەسەنی راکردوو بەنێو گونددا گەڕاو هەموانی لەنێوجێ هێنایەدەر. دەیگوت:

"من بەچی بزانم. من بە زەبری نوقڵ و نەباتان لە سەهۆڵبەندانی ساری قامیش قوتارم بوو، سەرمای ئەم دوورگەیە لە سەرمای ساری قامیشیش سەختترە. ئەودەمەی دەچوومە ساری قامیش باوکم پارەیەکی باشی دابوومێ کە نەبات بکڕم. منیش هەموو گیرفان و جلەکانم پڕکردبوون لە نەبات و نوقڵ. لەشکرێکی بەو گەورەییەوە لە بناری چیای ئەڵلاهوئەکبەر لەسەرمان رەق بووەوە و تێداچوو. ئەوانەیش کە توانیبوویان تا دوندی چیاکە بچن باوبۆران و کرێوە لەو سەرەوە پەرت و پەلای خوارێی کردبوون ئەوانیش لە دامێنی چیا لە سەرمان رەق بوونەوە. من چووزانم، منیش بۆ خۆم دوورگەیەك و هەروەها ژمارەیەك خەڵکی باشم بۆ خۆم پەیدا کردن و ئەوانیش منیان لە پەتی سێدارە رزگارکرد و ماڵ و خانوویان دامێ. من چوزانم، من هەرچەندی نەباتیش بخۆم دیسان سەرمای ئێرە هەر دەمکوژێت، دەزانم. سەیری دەریا بکەن، نەك هەر تەنها بەلەمەکانی ئێمە کە دەڵێی توێکڵە گوێزن، تەنانەت کەشتیەکانیش نوقم دەکات. من لە دەریای رەشەوە تائێرە خۆ بە مەلەکردن نەهاتم، بە بەلەمەکەمەوە هاتم، ئەگەر ئێستا بەلەم نا کەشتییێکیشم بدەنێ ناتوانم بەسەر ئەو شەپۆلانەدا بڕۆم. سەرما لێرە منی زیندانی کرد. توانیم لە ئەڵلاهوئەکبەر خۆم دەرباز بکەم، بەڵام لێرە مەحاڵە. ئەو هەموو دارو درەختە لە دوورگە هەن و ئێمەش دەبێت لە سەرمان رەق ببینەوە، ئێستا من کە دەریا ئارام بووەوە سواری بەلەمەکەم دەبم و بە لێوارەکاندا بۆی دەردەچم و رادەکەم، ئێوە دەتانەوێت چیبکەن، چی لە منداڵەکانتان بکەن، ناتانەوێت لەنێو نوێنەکانتان بێنەدەر، منداڵەکانتان چیان لێدێت، لە خوێندنگە لە سەرمان رەق نابنەوە؟ دکتۆرەکان و موسا ئاغا کەسانی باشن، دارەکانی پۆیراز و نیشانچیش تەواو بوون. مانگێك نابات ئێمە لێرە رەق دەبینەوەو دەمرین. تا بەهاریش کەس بە دوای تەرمەکانیشماندا ناهێت. وای لەو سەرە پڕ دەرد و بەڵایەی من، ئەو سەرە پڕ لە بەفر و بۆرانەی من."

قسەکانی حەسەنی راکردوو هەموانی خستە ژێر کاریگەریەوە. حەسەن ئەم قسانەی نەك هەر بەوانەی لەم دواییە هاتبوونە دوورگە بەڵکو بە دکتۆرەکان، بە پۆیراز کە زۆر خۆشیدەویست، بە نیشانچی کە عارفی هەموو عارفەکان بوو و دنیای بە باشی دەناسی، دەگوت. هەموانیش ئەگەر تەنانەت بە خۆشیان نەگوتبوا، کەچی لە دڵەوە ئەویان بە راست و لەسەر هەق دەزانی. بەر لەوەی

رەق ببنەوەو بمرن دەبوا ڕێچارەیەك بدۆزنەوە. هەموو ڕۆژێك کەمێکی دیکە بەفر دەباری، کاتێك دەریا تێکئالاّو تووڕە بوو دووکەڵکێشی هەندێك ماڵان دووکەڵی لێبەرز بووەوە. ڕۆژبەڕۆژ ژمارەی دووکەڵکێشی ئەو ماڵانەی دووکەڵیان لێبەرزدەبووەوە زیاتر دەبوو. دووکەڵ لە دووکەڵکێشی ماڵی حەسەنیش بەرزبووەوە. حەسەن بۆ ماوەیەکی باش بەدیار نەکەوت.

هیچکەس نەیدەتوانی بە بیور بچێتە نێو دارکاجەکان. هەموان گوێیان لە دەنگی بیور دەبوو. لە یەکێك لە ماڵەکان کۆنەداربڕێکی پیر هەبوو، مشارەکەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو. دراوسێکان چوونە لای، ئامادە نەبوو دارکاجەکان بە مشارەکەی ببڕێتەوە. دراوسێکان گوشاریان بۆ هێنا، داربڕی گۆرین بە هیچ کلۆجێك ئامادە نەبوو بچێتە ژێربار. سەرەنجام هەڕەشەیان لێکرد. گوتی: "من لە ڕاستیدا هەر خۆم مردووم. مرۆڤ لەگەڵ هەشت نەوەی چکۆلە چکۆلە هێشتا پێیدەوێت بمرێت؟" داوایانلێکرد مشارەکەی بفرۆشێت، هەرچەندی پارەیان خستە بەردەم، مشارەکەی نەفرۆشت. تا بڵێیت لە دکتۆرە ئەفسەرەکان، پۆیرازی ئەفسەر و جەمیلی ئەفسەر دەترسا. لەو سەروبەندەدا حەسەنی ڕاکردوو دەرکەوت، پرسی: "مشاری ئەو پیاوەتان دەوێت؟"

گوتیان: "دەمانەوێت."

"نیشانچی بدۆزنەوەو بەو بڵێن، بینێرنە لای کابرای داربڕ، وەك ئاوخواردنەوە مشارەکەی لێوەردەگرێت و دەیهێنێت. ئەگەر ویستتان داوای لێبکەن دارەکانیشتان بۆ دەبڕێتەوە."

چوار پیاوی بەساڵاچوو بێگوێدانە ئەو قیامەتەی بەفر و باوبۆرانە چوونە ماڵی نیشانچی، کێشەکەیان یەك بە یەك بە نۆرە بۆ نیشانچی باسکرد.

نیشانچی گوتی:

"زووبن دۆستان بابچین ببینین داربڕ بۆچی مشارەکەی نادات، با بچین لە خۆی بپرسین."

چوونە ماڵی کابرای داربڕ. چوون سەیریانکرد وا هەشت مندالّ، سێ دانەیان گەنج، لەگەڵ ژنێکی پیر لێفەکانیان بەسەرخۆیاندا هەڵکێشاون و لە سەرمان هەڵدەلەرزن. داربڕیش پاڵتۆیەکی کۆنی تیتڕ تیتڕ و دڕاوی سەربازی بە خۆیدا پێچاوەو لە گۆشەیەکدا گرمۆڵە بووە. هەر لەگەڵ بینینی ئەوان هەستا: "فەرموون بەرێزینە، وەرن دانیشن، بەخێربێن."

نیشانچی گوتی: "سوپاست دەکەین." چوو لەو جێگایە دانیشت کە داربڕ نیشانی دابوو، پشتیشی بە بالیفەوەدا. نیشانچی دوای ئەوەی هاوڕێکانی ناساند گوتی: "ئەو مشارەمان بدەرێ. دەڵێن منجرێت کردووەو مشارەکە نادەیتە کەس."

"منجریم نەکردوە وەلــێ نایدەم."

"سەیرێکی بارودۆخی خۆت بکە، ببینە ئەم مندالآنە لەژێر لێفەدا هەڵدەلەرزن، سەیر بکە. ئەو مشارەمان بدەرێ، ئەمانە داربڕن، تۆش ئاگردانەکەت گەرم دەکەیت، ئەم مندالآنە و خۆشت ئیدی وەکو سەگ هەڵنالەرزن، هااا، چیمدەگوت، ئا ئەم مشارەمان پێبدە. تا ئەو کاتەی ئەم ئەفسەرانە لێرەن، بیورمان بە کەڵك ناهێت، چونکە هەرچەند بە سەبریش بیور لە کەدی درەختەکان بدەین تا ئێرە دەنگی هەر دێت، ئەفسەرەکانیش بەدەست بە دەمانچە یەکسەر دەگەنە سەرمان. تاکو پۆیراز لێرە بێت هەروەها ئەو دکتۆرە شێتە، هەر لەگەڵ ئەوەی گوێیان لە دەنگی بیور بوو بە دەمانچەوە دێنە وێزەمان، هەمووومان لەنێو دەبەن و دەمانفەوتێنن. ئەمانە لەبەرەی چاناك قەڵاو ساری قامیش بوون، لەنێو خوێندا راهاتوون، بەلای ئەوانەوە کوشتنی مرۆڤێك باشترە لە برینەوی درەختێك. ئەگەر هەموو دارسنۆبەرەکانی لای سەرەوە بە مشار ببڕدرێن هیچکەس گوێی لە دەنگی مشارەکە نابێت وەلــێ دەنگی بیور لە هەموو لایەکەوە بلاودەبێتەوە. کوڕەکانت لە جەنگدا کوژران، شەهید بوون، نەوەکانیشت لە سەرما دەمرن، لەنێودەچن. مشارەکەمان وێبدە."

"ناتوانم وێتانبدەم."

"نەوەکانت دەمرن، لەنێو دەچن. تۆ و ژنەکەشت لە سەرمان لەخۆ دەچن."

"دەزانم. ئەگەر ئەم زستانە ئاوا بڕوات وامان لێدێت کە گوتت."

"کەواتە مشارەکەت بدە با لەجیاتی یەك مرۆڤ هەزار دارستان لەنێو بچێت."

داربڕ گوتی: "لەنێو بچێت لەنێو بچێت، بەڵام کێشەکە ئەوە نیە."

"بڵێ با ئێمەش بزانین کێشە چیە."

"دەیلێم. دەیلێم، بەڵام دەبێت دواتر دەستم لێهەڵبگرن."

"بیلێ، زۆر کونجکۆێ بوومە."

"کاتێك گەنج بووم، هاوڕێیەکم هەبوو، پێکەوە دارسەورمان لە دارستانێکی چڕ کە دەریاوانەکان داوایان لێدەکردین، دەبڕینەوە، ئێمە خەریکی داربڕینەوە بووین کە پیرە پیاوێك لەبەردەممان راست بووەوە کە ریشێکی سپی درێژ و قەدو بالآیەکی زراو و چاوانی درەوشاوەی هەبوون. گوتی دەست هەڵبگرن، دەمەوێت دوو قسەتان لەگەڵ بکەم. دەستمان لەکار هەڵگرت. پیر کەوتنە قسەکردن، دەنگی رۆدەچووە دڵی مرۆڤەوە. گوتی گوێم لێبگرن، درەختیش گیاندارە، رێك وەکو مرۆڤە. دوای وشك بوو ئەوکات بیبڕنەوە. کەسێك کە درەختی تەڕ ببڕێت خێرو خۆشی لە خۆی نابینێت،

نەوەکانی دوای ئەویش خێر لە خۆیان نابینن. ئێستا ئیدی بڕۆن، خواتان لەگەڵ من ئەو شتەی کە دەمەویست پێتانبڵێم گوتم. سەیرمکرد، دەتگوت باڵی لیڕوان و هەڵفڕی و ڕۆیشت. دوای ئەوە من هەر لەسەر بڕینەوەی درەختان بەردەوام بووم، تا گەیشتمە ئەم تەمەنەم. براکانم چوونە جەنگ و نەگەڕانەوە، کوڕەکانم، برازاکانم کە نەگەڕابوونەوە، هیچکام لە کەسوکارەکانی خێزانەکەمان کە چووبوونە جەنگ نەگەڕانەوە. هەموو گەنجەکانی گوندەکەمان چوونە سەربازی، تەنها سێ دانەیان گەڕانەوە. ئەوانیش شەل و کوێر. هیچ کارێکیان پێناکرێت. من ناتوانم مشارتان پێبدەم. ئەگەر بڕیار وابێت نەوەکانم بمرن باشترە لانیکەم لێرە لەبەرچاوی خۆم بمرن."

"مشارەکەمان پێبفرۆشە، چەندی دەتەوێت پارەت دەدەینێ."

"ناتوانم بیفرۆشم. ناتوانم بیفرۆشم و نەوەی داهاتوو بە کوشتن بدەم. ئەم مشارە چەندین ساڵە بە پشتی خۆم دەیگوازمەوە چونکە نامەوێت هیچکەس درەختانی پێببڕێتەوە."

نیشانچی گوتی: "یاللا هەستن کوڕینە بابڕۆین: ئەو پیاوە عەقڵی خۆی لەدەست داوە. هیچ چاکەیەك لەو پیاوە چاوەڕێ ناکرێت، بۆ ئەوەی زیان بە نەوەی داهاتوو نەگات دەیەوێت نەوەکانی بە کوشت بدات، مشارەکەیمان ناداتێ."

رووی کردە کابرای داربڕ:

"داربڕی، هەر کەسێکی، ئەگەر قسەکانت راست بن، کە نەتدەویست بە بڕینەوەی درەخت تووشی هیچ گوناهێك ببیت بۆچی مشارەکەت نەدایە کەسێك و لە کۆڵ خۆتت نەکردەوە، ئەی بۆچی فرێت نەدایە نێو دەریا؟ دامنا دەریات نەدۆزیەوە، بۆچی نەتشکاند و پارچە پارچەت نەکرد و تا ئێرەت هێناو وەکو شای ئێران لە کونجی ژوورەکەتت دانا؟"

"ئەو خزمەتکاری منە. ئەمە نەدەدەمە کەس و نە فڕێشی دەدەمە نێو دەریا، من ببوورە نیشانچی. پیاوێکی باشیت وەلێ تۆش گوناهی زۆرت کردوون. کێ دەزانێت چەندت ماسی لە دەریا گرتوون و کوشتوونت. من چەندم درەخت بڕیونەتەوە، تۆ زۆر زیاتر لەوە ماسیت گرتوون، لەبەر ئەوەیە منداڵەکانت..."

"ئێستاش دەیانگرم، هەم دەیاندەمە نەوەکانم بیخۆن، هەم دەیانفرۆشم. بە پارەی فرۆشتنی ماسییەکانیش نوقڵ و نەبات و داری وشك دەکڕم. ئەوان وەکو تۆ لە سەرمان ناکوژم. تێگەیشتی تارمایی پیر، تارمایی ستەمکار."

بە تووڕەیی چووەدەر.

دوای ئەوەی لە ماڵی داربڕەکە چووەدەر، لەژێر بەفر، خۆی خڕکردبووەوەو چووە ژێر دارچنارەکان. بەفر دەتگوت لەسەرەدو بێژنگ دەدرێت ئاوا دەباری و دەریا شێت و هار بووبوو.

نیشانچی گوتی: "هەموان با کێشەکانیان بەخۆیان چارەسەر بکەن. من ئێستا دەچمە لای وەستا ئارسۆن. ئێستا کە کابرای داربڕ بیوری نیە، دەچمە لای وەستا ئارسۆن پێیدەڵێم با بیورێکم بۆ دروست بکات."

"بۆ ئێمەش بەرادانی بدە نیشانچی، هەرچۆنێك بێت پارەکەیت رۆژێك دەدەینەوە."

نیشانچی گوتی: "باشە، چەند بیورێك ئەوەندە گرنگ نیە، هەرکاتێك پارەتان هەبوو دەیدەنەوە. یاللا با هەموومان پێکەوە بچینە لای وەستا ئارسۆن، بەڵکو بیورێکی هەر هەشبێت. وەستاکارانی بە ئەزموونی وەك ئەو بەبێ قولاب و بیور ناهێنە دوورگەیەکی ئاوا. وەستا ئارسۆن چەخماخساز بووە. تۆپ و تفەنگی دروست دەکردن."

کاتێك لە مەیدان تێپەڕین و گەیشتنە دووکانی ئاسنگەری، هەموویان شێوەی مرۆڤە بەفرینەیان گرتبوو. نیشانچی پێشتر و ئەوانی دی بەدوایەوە چوونە نێو دووکانی ئاسنگەری. بەر لەوەی سڵاو و چاك و چۆنی بکەن بەفرەکەیان لە خۆ داتەکاند. وەستا ئارسۆن بەدەستێك هەنبانی کوورەکەی رادەکێشا و نێو دووکانەکەی پڕدەبوو لە پروشکەی ئاگر، ئینجا هەنبانەکەی بەردەدا و ئاسنی سووربووەوەی لەنێو کوورەکە هەڵدەگرت و دایدەنایە سەر سندان و دەیکوتا. کە چاوی بەوان کەوت، ئەو ئاسنەی کە کوتابووی خستیەوە نێو پەنگران، دەستگیری هەنبانی کوورەی بەرداو گوتی:

"فەرموون برادەران، شتێکتان دەویست؟"

نیشانچی گوتی: "شتگەلێکی زۆرمان دەوێت وەستا ئارسۆن. بیورمان پێویستن."

"بیور شتێکی هێندە گرنگ نیە نیشانچی، لەنێو سندوقدا زۆر بیور هەن. ئاسنگەرێکی شارەزا هیچکات بەبێ بیور ناهێتە ئەم شوێنانە."

بۆ لای سندوقەکە چوو و کردیەوە:

"چی زۆرە بیور زۆرە. ئەوکاتەی لە ئەستەنبۆڵ بووم ئەو بیورانەم بە دڵەڕاوکێوە دروست کردبوون. لە گەلیبۆلۆ بریندار بووبووم، هێنابوومیانە ئێرە. کە چاوم کردنەوەو چوومە دەرەوە لە ئاشە هەواییەکەوە تا سەرکانی چووم. هەموومان دەزانین ئاشەکە بۆنێکی هێند خۆشی دەدا کە هێشتا نەگەیشتبوومە کانیەکە مەست بووم. لە دڵی خۆمدا گوتم ئەگەر مامو چاك بوومەوە دێمە

ئێرەو لێرە دەژیم. ئەم ڕۆژانە خەریکم ئاشەکە نۆژەن دەکەمەوە، پەروانەکانی لە ئەتڵەسی شین چێدەکەم. ئەمساڵ کاتێك دەغڵ و دان کۆکرایەوە ئاشەکە دەکەوێتە کار. بڕۆن لە سندوقەکە هەریەکە و بیورێك بۆ خۆتان هەڵبگرن. چەند دانە کلکە بیوریشم هێنابوون، دانەیەکیش بێت بەسە بۆ ئێوە، دەتوانن بەو دانەیە زۆر کلکە بیوری دیکە ببڕن. سەیر بکەن سێ دانەشم دۆزینەوە." لەم کاتە حەیدەر بە دەرکەوت گوتی:

"یەکێك لەو کلکە بیورانە بدە من. من خەڵکی چیاکانی بین بوغام. ئەوودەمەی سەرباز بووم بە چیاکانی بین بوغایان دەگوت چیاکانی تووڕۆس. لەو چیایانە بە ئێمەیان دەگوت دەروێشەکانی درەخت، ئێستاش پێماندەڵێن تەختەچی[٤] ئێمە لەوەتەی بە بیرمانە خەریکی ئەو کارەین، تەختەو دار دەبڕین. کارو کاسبی باپیرانیشمان هەر ئەوە بووە. ئێوە هەر ئەوەندە بیورێك وەمن بدەن، ئیدی کارتان بەسەرمەوە نەبێت. ئەو داربڕەش ببوورن، ئەو دەروێشی ڕاستەقینەی درەخت نیە، جۆرە بەردەستکارێکە. بەردەستکارەکان هەر زوو لە کارەکەیان ماندوو دەبن، لە لایەکی دیکە پیرێکی ریشسپی بۆ خۆیان دروست دەکەن، دوای ئەوە هیچکات دەست بۆ ئەو کارەیان نابەن. دەروێشەکانی درەخت کەسانێکن کە نەوە دوای نەوە ئەوکارە ئەنجام دەدەن.

چەکوچێك و چەند دانە بزمارێکی هەڵگرتن و چووە دەرەوە، کلکی خستە سەر بیورەکە و هاتەوە:

"ئیدی هەرچەند بەفر ببارێت یا ببارێت، دەریا چەندی دەیەوێت ڕێگە نەدات کەس بچێتە نێویەوە با ڕێگە نەدات. تاکو ئەم درەختانە لەم دوورگەیە هەبن و ئەم بیورەش بە دەستی منەوە بێت، ئیدی لەهیچ ماڵێك کەس سەرمای نابێت. من دەبڕمەوە و ئێوە بۆ ماڵەکانتان دەیگوازنەوە."

"وەلـێ ئەگەر دکتۆرەکان و ئەفسەرەکانی دوورگە گوێیان لە دەنگی بیور بوو..."

"بیوری من دەنگی لێوەناهێت. کە دەنگیشی نەهات نایبیستن. ئێستا من دەچمە نێو دارە کاجەکان، هەرکەس دەیەوێت با بەدوامدا بێت و داران کۆبکاتەوە."

وەستا ئارسۆن گوتی: "ئەفسەرەکان توانایەکیان بۆ تووڕە بوون نەماوە، دوو ڕۆژە خوێندنگەش داخراوە. دوو ڕۆژە کە دکتۆرەکان لێویان لەسەر ددانان ڕەق بووە. تەنانەت لە ماڵەوە دار و چیلکەیان بۆ چێشتلێنانیش نەماوە، گوێیان لە دەنگی بیور ببێت لە خۆشیان هەڵدەپەڕن، حەیدەر

---

(٤) Tehteci: تەختەچی نازناوێکە کە بە بەشێك لە عەلەوییە تورکەکانی ئەنەدۆڵ دەگوترێت کە کاری زۆربەیان تەختە بڕی یان دار بڕی بووە. و. ف.

بیور بەدەست لە دووکانی ئاسنگەری چووەدەر، چووەوە ماڵەوە، جلەکانی داکەند، جلی کاری کردنەبەر و پاڵتۆیەکی سەربازیشی کردە بەر. حەیدەر پیاوێکی رەشتاڵە بوو بە ئەبرۆی پڕ و پەیوەست، لووتێکی هەڵۆیی، چاوانی بەرِوویی، نێوچاوانێکی پان، چوار شانە، باڵابەرز، بازندە ئەستوور، دەستی گەورە. بە نیگایەك دەکرا تێبگەیت کە پیاوێکی بەهێز و بە تاقەتە. یەکەمین شت کە لە روخساریدا دەکەوتە بەرچاو سمێڵە پڕەکەی بوو. نیشانچی ئەوی لەو کاتەدا بینی کە بیور لەسەر شان بۆ نێو دارستانی دارکاجەکان دەچوو.

سەرلەبەیانی رۆژی دووەم دووکەڵ لە دووکەڵکێشی سێ ماڵی رۆخ ئاشەکە بەرزبووەوە. رۆژی سێیەم ژمارەی ئەو دووکەڵکێشانەی کە دووکەڵیان لێبەرز دەبووەوە گەیشتە نۆ دانە. هەوا وشك و برینگ بوو، بەو تیشکی خۆرەی کە لە بەفرەکەی دەدا دوورگە یەکپارچە بوو بووە رۆشنایی و دەبریسکایەوە. تا دەهات ژمارەی ئەو دووکەڵکێشانە زیاد دەبوو کە دووکەڵیان لێهەڵدەستاو خەڵکەکە کەم کەم لە ماڵان دەهاتنەدەر. ستوونی دووکەڵی شین لەو هەوایە ساردو وشکەدا بۆ ئاسمان هەڵدەکشان. دوورگە لەم رۆژانە نوقمی نێو شادی بوو. سەرەنجام لە دووکەڵکێشی ماڵی دکتۆرەکانیش دووکەڵ بەرز بووەوە. پۆیراز و نیشانچی بە بینینی ئەو دیمەنە زۆر خۆشحاڵ بوون. هەروەها پزیشکی ئاژەڵانیش... خوێندنگە دووبارە کرایەوە. لە دووکەڵکێشی خوێندنگەش دووکەڵ بەرزبووەوە. رێڕەوەکانی ناو گوند و رێگای بەرەو دارچنارەکان دەچوو کە بە خڕکە بەردی رەنگاو رەنگ رووپۆش کرابوو هەر لە ژێر بەفر دابوون. منداڵەکان لە ماڵە گەرم و گوڕەکانیان دەردەچوون و بەنێو ئەو بەفرەدا وەکو چۆلەکە بە رێگادا دەرِۆیشتن و بەدەم یاری بەفرینە دەچوونە خوێندنگە. خەڵکی دوورگە لەوەتەی ئاوا ئاوارە بووبوون هەرگیز زستانێکی ئاوا ساردیان نەبینیبوو و ژمارەیەکی زۆریان لە رێگاو لەنێو کەلاوە رووخێندراوەکاندا لەسەرمان و لە برسان تێداچووبوون، بە دڵی تژی خەم و شەرمەوە دەستیان دابووە دزیکردنەوە، ئەو شەرمەزاریە بۆ زۆربەیان لە مردنیش خراپتربوو. لێرە دارستانێکی گەورەی دار کاجو خانووی دوونهۆمی وەکو کۆشکیان بە سەربانی سواخدراو بۆ مابووەوە و تێیدا ئارامیان گرتبوو، خانووەکان وەکو کۆشك بوون، ئەویش نەخشێندراو بە گەوڵی جۆراوجۆر، هەروەها بە وێنەی دەریا و چیاو باڵندەی جیاجیا. لەلایەکی دیکە نان و ترێ بۆ زستان و دکتۆریان هەبوون کە هەر منداڵێك یان پیرێك یان هەر کەسێکی دیکە نەخۆش کەوتبوا دەگەیشتنە سەری و دەرمانیان دەدایێ و چارەسەریان دەکرد. لەم ساڵانەی دواییدا، تەنانەت لە زێد

و مەملەکەتی خۆشیاندا کە دەربەدەربووبوون، تا ئەو رادەیە هەستیان بە ئاسوودەیی و بەختەوەری نەکردبوو. هەرگیز بە میهر و خۆشەویستیەوە یەکدیان نەگرتبووە باوەش.

هەوری چڕ کە لە باکوورەوە هاتبوون ئاسمانی دوورگەیان داپۆشی. تروسکەی بەفرەکان کە ئاویان لە چاوان دەهێنا، نەما، لە هەر چوارلاوە بایەکان هەڵیانکرد. ئەو دووکەڵانەی کە لە دووکەڵکێشی ماڵەکان راست بەرەو ئاسمان بەرزدەبوونەوە، بەو بایانە بەرەو لای باشوور و باکوور و رۆژئاواو رۆژهەڵات پەرش و پەلا دەبوون، لێکجیادەبوونەوەو تێکەڵ دەبوونەوە، بڵاودەبوون، پاشان نەدەمان. بەفر دیسان دەستی پێکردەوە، هەوا کەمێك گەرم داهات. بە راوەستانی بەفر بارینەکە جارێکی دیکە بایەکان هەڵیانکردەوە. عارد و بەردی لێکدا و ئەو ناوە یەکپارچە بووە سەهۆڵبەندان. دیسان دووکەڵکێشەکان وەستان. ئەو هەواڵە ناخۆشەی کە دارکاجەکان تەواو بوون لە دوورگە دەنگی دایەوە. خەڵکەکە جارێکی دیکە خۆیان خستەوە ژێر لێفەکانیان. هیچکەس بیری لەوە نەدەکردەوە کە دار کاجەکان تەواو بن، یەکەمجار سەریان سوڕما، پاشان باوەڕیان هات. هیچ یەك لەو خەڵکە زاتی ئەوەی نەدەکرد سەرێك لە دارکاجەکان بدات. تەنانەت نەیاندەتوانی سەریشیان هەڵبڕن و سەیری لای دارکاجەکان بکەن. کاتێك حەیدەر تەختەچی و بیور بەدەستەکانی دیکە هاتن و بە ملی لار و دەم و چاوی داکەوتوو و ناوئومێدانە لەسەر نیوتەختەکانی ژێر دارچنارەکان دانیشتن، ئەوانەی هەواڵی هاتن و دانیشتنی ئەوانیان لەژێر دارچنارەکان بیست، لێفەکانیان لەسەر خۆیان لاداو چوونە ژێر دارچنارەکان. هەواڵە ناخۆشەکە بەخێرایی بە نێو هەموو دوورگەدا بڵاوبووەوە، لە ماوەیەکی کەمدا هەر لە ژێر دارچنارەکان تا ئەسکەلە پڕ بوو لە خەڵك.

حەیدەر تەختەچی هەستاو گوتی:

"برادەران، زستانی ئێرە زستانێکی سەختە. کێ بیری لەوە دەکردەوە ئەم دوورگەیە زستانێکی وای هەبێت، کێ بیری دەکردەوە دارستانێکی وا گەورەی وەك دارستانی دارکاجەکان ئاوا زوو تەواو ببێت. ئەم سەرمایە لە تراکیاوە دێت، سەرمای تراکیا لە سەرمای ئەرزەڕۆمیش سەختترە. سەرمای ئەم دوورگەیە لە سەرمای تراکیاش زیاترە. چیبکەین، ئێمەش تازە ناچارین تا بەهار دادێت لەبن لێفەکانمان نەهێینەدەر، ئاودەستی نێو ماڵان بە کەڵکمان هات. هەر کاتێك پێویست بکات لەو ئاودەستانە قەزای حاجەت دەکەین. دەستمان لە پێنج دارکاجی گەورە نەداوە، گوتمان ئەگەر داری تەڕمان بەکارهێنان و دەستمان کەوتن بە پووشووی ئەو دارکاجانە نەبێت داری تەڕ

داناگیرسێت. بۆ داگیرساندنی داری تەڕ دەبێت پووشووی دارکاجەکان دابگیرسێنین و بیانخەینە ژێر داره تەڕەکان. هەروەها داره وشکەکانیش. کارێکی دیکەمان لەدەست ناهێت."

بەسەر پەنجەی پێیەکانی هەستاو چاوێکی بە خەڵکەکە داگێڕا.

"گوێ بدەنێ بزانن چیتان پێدەڵێم. ئێستا لای خۆتان دەڵێن ئەم دارستانە گەورەیە چۆن بوو ئاوا زوو تەواو بوو. من کە باو و باپیرم پشتاو پشت دەرویشی تەختە و داربڕبوونە پێتاندەڵێم کە ئاگری دارکاج زوو دادەمرکێت، زوو دادەگیرسێت و زووش دادەمرکێت و دەبێتە مشکی و خۆڵەمێش. لەبەر ئەوەی زستانەکە زۆر سەخت بوو دارکاج زۆر بەکارهێندران بۆیە زوو تەواو بوون. ئەگەر لەجیاتی دارکاج ئەم دارستانە دارستانی درەختەکانی دیکە بوا، تا بەهاریش دارمان سووتاندبوان، نیوەی ئەم دارانەمان نەدەسووتاند."

بێدەنگ بوو، سەری نەوی کرد، ماوەیەك داماو کەوتە بیرکردنەوە:

"من دەمەوێت چەند ساتێك بچمە شوێنێك، زوو دەگەڕێمەوە."

بەنێو خەڵکەکەدا تێپەڕی، چووە دەرەوە، لە پشت قامیشەڵانەکە لەبەر چاوان ون بوو، دکتۆرەکان لەبەری هەستان، کورسیان بۆ دانا کە دابنیشێت.

"بەڕێزان، دکتۆرینە، هاتووم قسەتان لەگەڵدا بکەم. ئاگادارن کە دارکاجەکان تەواو بوون، تەنها پێنج درەختمان هێشتوونەتەوە. دەبێت داری تەڕ پەیدا بکەین، داری تەڕ بەبێ پووشووی دارکاج داناگیرسێت، بەڵام قسەکەم لەگەڵ ئێوەدا ئەمە نیە، تەنانەت ئەگەر بشمکوژن نەخۆم ئەو دارکاجانە دەبڕمەوە نە لێدەگەڕێم کەس بیانبڕێتەوە، بەڵام قسەم لەگەڵ ئێوەدا ئەوە نیە. دارکاجی تەڕو ئاودار وەکو دارزەیتوونی تەڕ و ئاودار دادەگیرسێت و دەسووتێت. دارزەیتوونیش دارێکی کەتیرەدارە. دارزەیتوونی تەڕیش دەسووتێت و وەکو دارکاج پەنگرەکانی زوو ناکوژێنەوە."

سەلمان سامی پرسی: "ئیدی چی؟"

"ئیدی ئەوە کاك دکتۆر، ئێوە دەزانن. هەموو خەڵکەکە لە ئەسکەلە چاوەڕێن. ئەگەر ئاوا بچێتە پێش ئێوە تووشی زەحمەتێکی زۆر دەبن. ساڵەهای ساڵە هەموان لاواز و بێهێز بوونە، لەمە بەدواوە دەرد و مەرگیشمان رووتێدەکات. بەدبەختانە هەمیشە دەیانگوت هاتوونەتە بەهەشت و نێو کەسانی پیاوچاك ورگیان تێر دەکەن و پێکەنین کەوتۆتە سەر لێوەکانیان."

هەردوو دکتۆر لەپڕ سەیری روخساری حەیدەر تەختەچیان کرد:

دکتۆر سەلمان سامی پرسی: "بەچی دەزانیت دارزەیتوونی تەڕ وەکو دارکاجی تەڕ دەسووتێت؟"

"دارزەیتوون دارێکی زەیتدارە. ئەگەرچی پووشووەکەی وەکو هی دارکاج نیە و وەکو پووشووی دارکاج ناسووتێت، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ درەختەکانی دیکە باش دەسووتێت، ئێمە خەڵکی ناوچەکانی توورۆسین. لەو بنارانەی کە بەسەر دەریای میدیتەرانەدا دەڕوانن دارزەیتوونی زۆر هەن. ئەودەمەی دەچووینە چوکوراوا دارزەیتوونی تەڕمان بۆ سووتاندن بەکاردەهێنا. ئەو دارزەیتوونانە خۆڕسکن، بەریان نیە."

سەلمان سامی گوتی: "لێرە بوەستە ئێستا دەگەڕێینەوە."

دکتۆرەکان هەردووکیان چوونە دەرەوە، دوای چەند ساتێك گەڕانەوە، روخساری هەردووکیان رەش هەڵگەڕابوو، هەر کەس ئەو روخسارەی بینیبوان یەکسەر دەیزانی ئەمانە زۆریان دەردو ئازار چەشتوە. حەیدەریش بە بینینی ئەوان نیگەران بوو، بیری کردەوە، بریا بەو دۆستانەی نەگوتبوا دارزەیتوون دارێکی رۆندارە.

"نیگەران مەبن دکتۆرە بەڕێزەکان، چیبکەین. خەڵکەکە لە دەوروبەری چنارەکان چاوەڕێن، هیچم پێنەگوتن. پێمگوتن لێرە چاوەڕێم بکەن و هاتمە لای ئێوە. ئەوەندە خۆتان ئازار مەدەن و نیگەران مەبن."

دکتۆرەکان دیسان چوونە دەرەوەو دوای تاوێك گەڕانەوە.

سەلمان سامی گوتی: "وەستا حەیدەر." ئیدی ناوی حەیدەر بووە وەستا حەیدەر، "وەستا حەیدەر چارەیەکی دیکەمان نیە. دەست بدەنە بیورەکانتان و بڕۆنە نێو دارزەیتوونەکان، ئیدی چیبکەین چارەنووسمان ئاوایە."

"منیش دەزانم کاك دکتۆر، زەیتوون مێوەی بەهەشتە. ئەو درەختانەی کە ئێمە لەناوچەی توورۆسی خۆمان دەمانبڕینەوە لەم درەختە نەبوون. خۆڕسك بوون. خوا حافیز."

"یەکەمجار پووشووی دارکاج و ئینجا دارە باشەکان بۆ خوێندنگە بێنن."

"سەرچاو کاك دکتۆر."

دڵی وەستا حەیدەر پڕ بووبوو لەخوێن، بەڵام دەیتوانی چیبکات، هیچ چارەیەکی دیکەیان نەبوو.

هاتەوە ژێر دارچنارەکان، خەڵکەکە کپ و بێدەنگ چاوەڕێی ئەو بوون. ئەویان بینی، بەڵام هیچ نەجووڵان. هاتەوە شوێنی خۆی دانیشت، هەستایە سەر پەنجەی پێیەکانی، دیسان چاوێکی بە

خەڵکەکەدا گێڕا: "هەر کێشەیەك ڕێگاچارەیەکی هەیە. ئێمەش دۆزیمانەوە. دارزەیتوونیش کە دارێکی رۆنداره لەگەڵ پووشووی دارکاج یەکسەر گڕ دەگرێت."

دواتر گوتی پەنگری دارزەیتوون لە هەموو درەختەکانی دیکە خۆڕاگرترە و هەموو ئەو شتانەی بە دکتۆرەکانی گوتبوو بۆ ئەوانی باسکرد:

"ئەگەر نەمانزانیبوا کە دارزەیتوون ئەو تایبەتمەندیەی هەیە نەماندەتوانی ئەم زستانە بەڕێ بکەین، هەموومان نا، بەڵکو زۆربەمان لەسەرمان تێدەچووین. یاللا یەکسەر بڕۆنەوە ژێر لێفەکانتان. یەکەمین دووکەڵ سبەینێ لە دووکەڵکێشی خوێندنگە بەرزدەبێتە. پاشان وەکو جارانی لێدێت. وابڕیارە یەکەمجار دار بدرێتە ئەو ماڵانەی کە نەخۆش و پیر و پەککەوتەیان هەیە."

خەڵکەکە سەرمایان بوو یەکسەر بڵاوەیان لێکرد، تەنانەت یەك کەسیش لەوێ نەما.

دوای ئەوەی خەڵکەکە بڵاوەیان لێکرد رێك پازدە داربڕی بیور بەدەست لەوێ مابوون. هەموویان داربڕی شارەزاو وەستا بوون لە کاری داربڕین و تەختەکاریدا پسپۆڕ بوون. کاتێك خەریك بوون بۆ دروستکردنی پووشووی دارکاج دەچوونە نێو دارکاجەکان ڤاسیلی بەڕاکردنەوە خۆی گەیاندنێ. وا بە رك و دوژمنانە سەیری کردن کە زەندەقیان لێچوو.

"بەڕێزان دکتۆرەکان کاریان پێتانە، پێنج خوولەك وەرن ئینجا بگەڕێنەوە سەرکارەکەتان."

گەڕانەوە لای دکتۆرەکان.

وەستا حەیدەر گوتی:

"بە درێژایی تەمەنم دارم بڕیون، باو و باپیرانیشم داریان بڕیون. کاریان ئەوەبوو. کاری منیش هەر ئەوە بووە. کەس ناتوانێت ژمارەیان دیاری بکات. دەزانم، هەر درەختێك گیانێکە لە نێو ئێوەدا تا ئێستا کەس ئاگر کەوتنەوەی دارستانی بینیوە؟ درەختەکانیش کاتێك دەسووتێن وەکو مرۆڤ دەزیرێنن. خەریکین دەچین یەکێك لە دارکاجە جوان و بەرچاوەکانی دوورگە دەبڕینەوە وەلـێ لە دڵی خۆمدا دەڵێم خۆزگە لە جیاتی بڕینەوەی ئەو درەختە خوا منی دەکوشت."

هاتنە لای دکتۆرەکان. دکتۆر سەلمان سامی گوتی:

"درەختەکانی دارستانی کاجەکانتان بڕینەوە، ئەگەر ئێوە نەبوان تا ئێستا نیوەی ئەم خەڵکەی ئێرە مردبوون و نیوەشیان نەخۆش بوون. نەخۆشەکانیش چاك نەدەبوونەوە. ئێوە لەبری ئەو کارەی کردووتانە هیچ پارەتان لە کەس وەرنەگرتوە؟"

وەستا حەیدەر بە دەنگێکی کە هەر ئەوەتە دەبیسترا و نەدەبیسترا، گوتی:

"هیچمان له کەس وەرنەگرتوە."

دکتۆر سەلمان سامی یەکێك له پاکەتەکانی سەر مێزی بەردەمی هەڵگرت، بۆ لای حەیدەری ڕاگرت، وەستا حەیدەر منگە منگێکی کرد، سەلمان سامی بەڕاوێژێکی فەرماندەرانە گوتی:

"وەریبگرە، وەریبگرە، مافی خۆتە. یەك لەدەی مافی خۆشت نیە، وەریبگرە!"

وەستا حەیدەر بە دوودڵیەوە هەڵیگرت و ئەوانی دیکەش هەڵیانگرت.

وەستا حەیدەر گوتی:

"من دڵم ناهێنێت ئەو دارکاجە ببڕمەوە، ئێوە بیبڕنەوە."

هەموان یەکدەنگ گوتیان:

"دەیبڕین وەستا حەیدەر. ناتەوێت لەگەڵ ئێمەدا بهێیت، بڕۆ لای دکتۆرەکان دابنیشە، دوای تاوێکی دیکە دوو سێ لکی دارکاجەکەتان بۆ دەنێرین، ئێوەش بیانسووتێنن. لەو سەرمایەدا ناکرێت دەست لە کار بکێشینەوە."

وەستا حەیدەر هاتەوە لای دکتۆرەکان، شتەکەی بۆ باسکردن، دکتۆر خەلیل ڕەفعەت گوتی:

"کەواتە بڕیارە یەکەم دووکەڵ لە دووکەڵکێشەکەی ئێمە بەرز ببێتەوە."

وەستا حەیدەر گوتی:

"یەکەم دووکەڵ لە دووکەڵکێشی ئێوە بەرزدەبێتەوە."

کەمێك دواتر دوو کەس هەر یەکەو بەباوەشێك دارەوە هاتن، چەند دارێکیان خستە سۆپاکە و کە دەڕۆیشتن وەستا حەیدەر پێیگوتن:

"بوەستن دەمەوێت شتێکتان پێبڵێم، لەنێو ئێوەدا کەس هەیە شێوازی خۆشکردنی پووشوو بزانێت؟"

ئەوەی کە باڵای بەرز بوو گوتی: "دەزانین وەلـێ بڵێ."

"دوای بڕینەوەو پارچە پارچەکردنی دارەکان نۆرەی خۆشکردنی پووشوو دێت. درێژایی پووشووەکان نابێت لە دوو قولانج زیاتر و ئەستوورایییەکەشیان یەك دوو پەنجە بێت." بیوردارە باڵابەرزەکە گوتی: "من ئەوە دەزانم وەستا حەیدەر. باپێتبڵێم بەر لەوەی بچمە سەربازی کارم دروستکردن و خۆشکردنی پووشووی ئاگرکردنەوە بوو."

ڕۆیشتن.

سۆپای دکتۆرەکان چینیەکی شینباو بوو، کە گەرم دەبوو بە ئاسانی سارد نەدەبووەوە.

دوای وەستا حەیدەر، پۆیراز هاتە لای دکتۆرەکان. کەمێك دواتر ڤاسیلی و دوای ئەویش نیشانچی هاتن. نیشانچی کە هات سەری سوورما، جێی دکتۆرەکان گەرم گەرم بوو، لەکاتێکدا ئەو کەسانەی لە دەرەوە بوون دەستیان لە سەرمان گۆد و لێویان شین هەڵگەڕابوون.

دکتۆر سەلمان سامی گوتی:

"ڤاسیلی، دەتوانم داوات لێبکەم بچیت بانگی مام ئاغا بکەیت بهێنە ئێرە، ئێستا لە سەرمان هەڵدەلەرزێت. زوو بچۆ بیهێنە. پێیبڵێ سۆپامان ورمە ورمیەتی."

"باشە کاك دکتۆر، هەر ئێستا دەچم دەیهێنم. لە سەرمان مردووە."

موسا ئاغا و ڤاسیلی هاتن. قسە لە بەفر و سەرماو داری سووتاندن و چاناك قەڵاو ساری قامیشەوە گەیشتە سەر یۆنان. لە گەرمەی ئاخاوتن دابوون لەپڕ دەنگی بیورەکان کە لەو ناوە دەنگی دەدایەوە بڕا.

"ئێستا کە دەنگی بیورەکان بڕاوە، مسۆگەر کاری پووشووی دارکاجیان تەواوکردووە و چوونەتە وێزەی دارزەیتوونەکان. دارزەیتوونە پیرەکان دیاری دەکەم و ئەوان دەبڕمەوە."

"پێویست بەوە ناکات، بە هەرحاڵ، ئەگەر زستانەکە ئاوا بڕوات ناچار دەبێت هەموویان ببڕینەوە."

"من دیسان دیاریان دەکەم و دەیانبڕمەوە، بەڵکو هەوا خۆش بکات و ناچار نەبین هەموو زەیتوونەکان ببڕینەوە. خواحافیز."

لەلای دارزەیتوونەکانەوە دەنگی بیور دەهات، وەستا حەیدەر راستەو راست رووی کردە لای دەنگی بیورەکان، داربڕەکان حەوت دارزەیتوونیان بڕیبوونەوەو خستبوویانە ئەو گۆڕە، لکەکانیان لێکردبوونەوە، لکەکانیان دادەنانە سەر سۆپا. دوای تەواوکردن و بڕینەوەی لکەکان، کەد و قاپۆرەکانیان قەد قەد دەکردن. وەستا حەیدەریش لەسەر عەرزەکە دانیشت، بیورەکەی زۆرباش سووی و تیژی کردەوە، پاشان دەستیکرد بە بڕینەوەی دارزەیتوونێکی گەورەی پیرو خوار و خێچ. زۆری پێنەچوو دارزەیتوونە پیرەکە لەو گۆڕە راکشابوو. حەیدەر بە غەمباریەوە سەیرێکی دارزەیتوونە کەوتوەکەی کرد، گوتی تەمەنت تەواو بوو دۆستی من، پیر بوویت، زەیتوونەکانت هەر هێندەی دەنکە نۆکێك دەبن، ئیدی بە دەردی کەس ناخۆیت.

دوای ئەوە نە بەفر لێیکردەوەو نە دەنگی بیوران راوستاو نە دووکەڵی دووکەڵکێشەکان. بەهار بە نوور و گوڵ و بۆن و بەرامە و بارانە گەرمەکان و تەواوی شکۆ و رازانەوەی خۆی گەیشتە دوورگە.

برادەرایەتی نێوان حەسەنی راکردوو و نیشانچی تا دەهات پتەوتر دەبوو. کاتێك هەردوو رۆژ جارێك دەچوونە راوەماسی سەرێکیشیان لە دوورگەی کابا دەدا، ئاویان لە کانیەکەی ئەوێ دەخواردەوە. ژمارەی دارزەیتوونە خۆرسکەکان و دارچنارەکانی ئەوێیان بۆ زستانی داهاتوو دەژمارد و لێکیان دەدانەوە داخۆ زستانی ساڵی داهاتوو بەشی گوندەکەیان دەکەن یان نا. بە بۆچوونی ئەوان درەختەکانی ئەوێ نەك بۆ زستانێك بەڵکو بەشی دوو زستانیشیان دەکرد، وەستا حەیدەر ئەوەندە لە داربڕینەوەدا شارەزا بوو و هاوڕێکانیشی والێدەکردن کە وا داربڕنەوە تەنانەت یەك بیور وەشاندنیش بە هەدەر نەدەن.

نیشانچی گوتی: "باش کاردەکەن، بەڵام لە شیوی دارزەیتوەکانەوە بگرە تا بن گردەکە تەنها پازدە بیست دارزەیتوون ماون. لە نێو دارکاجەکانیش تەنها یەك دارکاج ماوە. زستانی داهاتوو ریشەی باخەکان..."

"زستانی داهاتوو هیچ درەختێك لە دوورگە نامێنێت. رەگ و ریشاڵی باخەکان لە هاویندا بپچڕێنین تا زستان وشك دەبن."

لەم کاتەدا بزنە شینەکان لەسەر زنارەکان هاتنە خوار و تا نزیك ئەوان هاتن. کاریلەکانیشیان لەگەڵ بوون.

"سەیر بکەن، هاوڕێکانمان هاتن."

"بەخێر بێن، سەفایان هێنا. من جاران پێموابوو بزنەکان کە دێنە ئێرە بۆ ئاوخوارنەوە دێن، مەڵێ بۆ بەخێرهاتنی ئێمە دەهاتن. باشە خدر سلاوی خوای لێبێت ئەم بزنانەی بۆچی هێناوە و لێرە بەرەڵای کردوون؟"

"من ئەوە نازانم. تەنها وەکو ئەوەی کە باوك و باپیرانمان دەیانگوت خدر سلاوی خوای لێبێت بزنەکانی خۆی بردۆتە هەموو دوورگەکانی حەوت دەریایان بەرەڵای کردوون."

حەسەنی راکردوو گوتی: "چەند بزنی خۆشویستوون ئەو حەزرەتی خدرە."

"ئەوەیان نازانم وەلـێ حەزرەتی خدر لە هەموو دوورگەکان بزنگەلی بە رەنگی جیاجیای هەن."

"سەیرە، ئێستا هەموو دوورگەکانی دنیا دەبێت پڕ بن لە بزن، وانیە؟"

"بەڵێ، هەموو دوورگە چۆڵەکانی دنیا پڕن لە بزنەکانی خدر. خدر دوورگەکانی پڕ کردوون لە بزنی رەنگاو رەنگو جیاجیا. پێشینانی ئێمە وایاندەگوت. سەوز، سوور، نارنجی، رەنگی بزنی هەر دوورگەیەك جیاوازە لە هی دوورگەیەکی دیکە.

حەسەنی راکردوو حەپەسابوو، گوتی:

"منیش بزنی قاوەییم بینیوە، هەروەها هی رەش، هی سپی."

نیشانچی گوتی:

"ئەو بزنانە هی خدر نین."

"ئەی چی، واتە خدر بزنە حەوت رەنگییەکانی دەخوات، شیرەکەیان دەخواتەوە، خدر چی لەوانە دەکات، چی لە پێستەکەیان دەکات، جلوبەرگیان لێدروست دەکات و دەیانپۆشێت، لە مووەکەیان رەشماڵ دروست دەکات و دەچێتە ژێریەوەو لەوی دەخەوێت؟"

"من ئەمانە نازانم، ئەگەر زۆر حەزت لێیە بزانیت بڕۆ لەگەڵ حەزرەتی خدر سڵاوی خوای لێبێت قسە بکە."

"جێگای لە کوێیە بچم قسەی لەگەڵ بکەم، جێگاکەیم نیشان بدە."

"کەس بەجێی ئەو نازانێت. حەزرەتی خدر بە سواری ئەسپە بۆزەکەیەوە بەسەر رووی دەریاکان ئەمسەر و ئەوسەر دەکات."

"لە هیچ جێگایەك ناوەستێت؟"

"ناوەستێت."

"ناخەوێت، ناخوات، ژنی نیە؟"

"ئەو زاهد و پیاوچاکە. ئەو کەسانەی لەنێو دەریا گرفتاری بەڵایەك دەبن دەرباز دەکات. گەورەکانمان بە ئێمەیان نەگوتوە داخۆ ئەو دەخەوێت یان ناخەوێت، نان دەخوات یان ناخوات، ماڵی هەیە یان نیەتی، لە شوێنێك دادەنیشێت یان دانانیشێت. بە بڕوای من حەزرەتی خدر سڵاوی خوا لێبێت لە بەهەشتدا دەژیت. ئەو کەسانەی لە بەهەشتیشدا بژین خواردن ناخۆن. ئەگەر نان و ئاو بخۆن و بخۆنەوە بەهەشت بۆگەن دەکەن. خوا بۆچی ئادەمی باوکمانی کە لە خاك دروستی کرد لە بەهەشت وەدەرنا؟"

"خۆی ئەو چیرۆکە دەزانێت. منیش بەشێکی ئەو چیرۆکەم لەو بیستوە. ئەو چیرۆکی ئەو مرۆڤەش کە گوڵی جاویدانی دۆزیبووەوە دەزانێت."

"نیشانچی بە فیزێکەوە گوتی منیش دەیزانم."

حەسەنی راکردوو گوتی: "مسۆگەر چیرۆکەکەی تۆ لەگەڵ هی ئەو جیاوازە."

"ئەگەر بتەوێت بزانی چیرۆکەکەی من چۆنە بەمشێوەیە، حەکیمێك دەرمانی هەموو دەردانی دۆزیبووەوە، دواجار دەچێتە دوای بەدەستهێنانی دەرمانی جاویدانی. رۆژێك لە قەدپاڵی کێوێك لەبن دارچنارێك خەوتبوو کە خەبەری بۆتەوە سەیری کردوە هەزاران هەزار گوڵ بەرامبەری سەریان دەرهێناوە. یەکێك لە گوڵەکان هاتۆتە قسە و گوتویە من دەرمانی جاویدانیم. پیاوەکە خێرا بۆ لای گوڵەکە چووە، بەسەر گوڵەکەدا داهاتۆتەوە، گوڵەکە ئەوەندە بریقەدار و درەوشاوە بووە کە رۆشناییەکەی بۆتە مایەی ئەوەی کابرا چاوەکانی بنووقێنێت، چەند ساتێك دواتر چاو دەکاتەوە دەبینێت گوڵەکە تێکەڵی گوڵەکانی دیکە بووەو لە جێی خۆی نەماوەو رۆیشتوە."

حەسەنی راکردوو ئاهێکی قووڵی هەڵکێشا:

"هەمیشە هەر ئەوا دەبێت، ئەو کەسەی کە ئەسپی کوێر ئۆغلۆی تیمار کردووە ئاوی ژیانی دۆزیوەتەوە، لەو ئاوە دەداتە قیرات. بۆ لێکردنی پەڕو باڵی ئەو کەوانەی کە کوێر ئۆغلۆ راوی کردوون دادەنێتە نێو ئەو ئاوە. کەوە مردووەکان زیندوو دەبنەوەو لە شەقەی باڵان دەدەن و دەڕۆن. کوێر ئۆغلۆ دەڵێت ئەوە ئاوی ژیانە، ئێستا ئیدی قیرات بە نەمری دەمێنێتەوە، بە هەڵەداوان رادەکاتە لای کانیەکە دەبینێت کانی بۆتە هەزار کانی."

لەو ماوەیەدا بزن و کاریلەکان کە لە زنارەکان دابەزیبوونە خوارێ هاتبوون لە دەوری ئەواندا بازنەیان بەستبوو و چاویان بڕیبووە ئەوان.

"خۆزگە یەکێك لەو کاریلانەمان سەردەبڕی و لەسەر پەنگری دارزەیتوونان دەمانبرژاند و دەمانخوارد."

"کڕ بە کافر، مەگەر دەکرێت سەری کاریلەی خدر ببڕدرێت و بخورێت؟"

"خدر ئەم بزنانە دەخوات؟"

"دەردی تۆ خواردنی ئەم کاریلانەیە. ئەو هەموو ماوەیە من بۆ خواردنی کاریلەکان دێنیتە ئێرە؟"

"من تۆم هێنایە ئێرە کە درەختەکانت نیشان بدەم. تۆ گوێت لە بانگی کەڵەشێران بوو؟"

"بیستم، ئەمە چ پەیوەندیەکی بە بزنەکانی خدرەوە هەیە؟ گوێ بگرە چیتپێدەڵێم، ئەگەر دەست لە بزنەکانی خدر بدەیت، خدر چاوەکانت کوێر، گوێیەکانت کەڕ، قاچەکانت فەلەج دەکات، پاشان

ئاوارەو دەربەدەرت دەکات، دوای ئەوەش هەڵتدەگرێت و دەتباتە نێوەڕاستی حەوت دەریایان و لەوێ فڕێت دەداتە نێو زاری گەورەترین ماسی."

"ببینە، نیشانچی، ئەگەر ئەوکارە بکات بێویژدانیم لەگەڵدا دەکات. خدر بەو گەورەییەوە چۆن دەتوانێت لەبەر خواردنی بزنێکی رەفتارێکی وا خراپم لەگەڵدا بکات؟ سزاو تۆڵەی خواردنی بزنێك؟ خوا رێگە دەداتە کەسێك کە ستەمێکی وا لە کەسێکی دیکە بکاتو بچێتە بەهەشتەکەیەوە رێگەی پێنادات، واتە خدر ئەمە نازانێت؟ دەزانێت. من بە ساڵان لەنێو دەریا ماومەتەوە، ئەوەندەم ماسی خواردوون کە خۆم بوومەتە ماسی. بە ساڵان بەنێو دەریاکاندا گەڕاوم، گوێم لە دەنگی کەڵەشێران نەبوو. ئێستاش کە گوێم لێبوو و دەمەوێت خۆشحاڵ ببم خدر...؟"

نیشانچی سەری نابووە بەر خۆی، رۆچووبووە فکران. ئیدی هیچی نەگوت، بەلەمە بچووکەکەی کە لە لێوار بوو بردە نێو دەریا، سوار بوو. حەسەنی راکردووش بە دوایدا چوو.

بەرەبەیان لەگەڵ بانگی کەڵەشێران دوورگەمان بووە دوورگە و گوندمان بووە گوند.